د. ئەورەحمانی حاجی مارف



# بەرهەمە زمانەوانییەکانم

((نووسین و وەرگێڕان))

بەرگی دووەم

(کتێب و نامیلکە)

سلێمانی - ٢٠٠٤

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# بەرهەمە زمانەوانیەکانم

((نووسین و وەرگێڕان))

## بەرگی دووەم

( کتێب و نامیلکە )

سلێمانی – ٢٠٠٤

## ناوەرۆكی ئەم بەرهەمە :

١- ڕابەری سەرچاوە.

٢- ڕەخنەی نارەختە، بەرگی یەكەم.

٣- ڕەخنەی نارەختە، بەرگی دووەم.

٤- واتەواتە و وڕێنەی وریا.

٥- فەرهەنگی زمانناسی.

(كوردی – عەرەبی – ئینگلیزی)

کۆماری عێراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە ( ٢٢٢ )

دوکتۆر
ئەورەحمان حاجی مارف
بەشی کوردی - کۆلێجی پەروەردە
زانکۆی بەغدا



# ڕابەری سەرچاوە

## لەبارەی زمانی کوردی یەوە

چ بە کتێب و لەناو کتێب و گۆڤارەکاندا

بەهەر زمانێك لەبارەی زمانی کوردی یەوە نووسراوە

- لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی سالی ١٩٨٥ -

بەغدا - ١٩٨٩

کۆماری عێراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە ( ٢٢٢ )



دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف
بەشی کوردی - کۆلێجی پەروەردە
زانکۆی بەغدا

# ڕابەری سەرچاوە

# لەبارەی زمانی کوردییەوە

## چ بە کتێب و لەناو کتێب و گۆڤارەکاندا

بە هەر زمانێك لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە

- لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ -

بەغدا - ١٩٨٩

## پێشـــەكی

بە مەبەستی نیشاندانی ئەوەی لـە مەســـەلەی لێكۆڵینەوەی زمانی كوردیدا چی نووسراوە ، لـە چەنـد ژمارەیێكی ڕۆژنامەی « برایەتی »ی مانگی مایس‌و حوزەیرانی ساڵی ۱۹۷۳دا زنجیرەیێك وتارم بڵاوكردەوە[۱]. پاشان لەسەر داوای چەند دۆست‌و برادەرێك ، كە داوایان لێ‌كردم ئـەو وتارانەم كۆبكەمەوەو پاش ئەوەش كە هەندێ سەرچاوەی ترم دۆزی‌یەوە ، ساڵی ۱۹۷٤ بە شێوەی كتێبێك پێشكەشم كرد[۲] .

ئەگەرچی لەو كتێبەدا باسی ( ۱۲۰ ) ســـەرچاوەیێكم كردووە ، كـە لەبارەی زمانی كوردی‌یەوە نووسراون ، بەڵام لە ڕێی خەریك‌بوونی كاری زمانەوانی‌یەوە هەندێك بەرهەمی دیشم دی‌یەوەو هەروەها لە ماوەی ئـەم ساڵانەی دواییشدا گەلێ شتی‌تر نووسراوە ... جا ویستم ئەو كارانـەی

---

(۱) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، مێژووی لێكۆڵینەوە لە زمانی كوردی ، ڕۆژنامەی « برایەتی » ، بەغدا ، ۱۹۷۳ ؛ بەشی یەكەم ، ژ ٥۳ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥٥ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٥۷ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٥۸ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٦۰ .

(۲) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، چی لـەبـارەی زمانی كوردیـــیەوە نووسراوە ، بەغدا ، ۱۹۷٤ .

ناویان له كتێبی « چی لەبارەی زمانی كوردییەوە نووسراوە »دا نەهاتووە ، بخەمە سەر خەرمانی ئەو نووسینەمو بە چەند وتارێك خستمە پێش چاوی خوێنەری بەڕێز[٣] .

بەدوا ئەمەدا هاتمە سەر ئەو ڕایەی ڕابەرێكی تێرو تەسەلو بەرفراوان سازبكەمو بە هەر زمانێك شتێك دەربارەی زمانی كوردی وترابێت ، تۆمار بكەم . بۆ گەیاندنە ئەنجامی ئەمكارە ، جگە لە چەندین ساڵ خەریكبوون بە لێكۆڵینەوەی زمانی كوردییەوەو هەوڵو كۆششو گەڕان بەدوا بەرهەمی زمانەوانیدا ، بەتایبەتی ماوەیەك زۆربەی كتێبخانەكانی كوردستانو بەغدام پشكنیو گەلێ كتێبو نامیلكەی دیم دۆزییەوە . ئەنجا هەرچی گۆڤارێك هەیە ، یەكە یەكە تەماشـــــام كردنو ئەوەی لەبارەی زمانی كوردییەوە نووسراوە تێیاندا لێم دەرهێنان ... وێڕای ئەمە ، ســوودو كەڵكم لــەو

---

(٣) بـڕوانــە :

أ ـ بیبلیۆگرافیای ئەو وتارانەی لە ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٧٩ دا لەبارەی زمانی كوردییەوە بە كوردی لــە گۆڤارەكاندا بڵاوكراونەتەوە ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی كورد » ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٠٧ ـ ١٥٧ .

ب ـ بیبلیۆگرافیای وتاری زمانەوانی لەبارەی زمانی كوردییەوە لــە گۆڤارە كوردیو بێگانەكانی ساڵانی ١٩٤٠ ـ ١٩٧٠دا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەكەم ، ژ ١٠٥ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٢١ ـ ١٣٤ ؛ بەشـــی دووەم ، ژ ١٠٦ ، بەغـدا ، ١٩٨٥ ، ل ٩٠ ـ ١٠٢ .

جـ ـ چیتریش لەبـارەی زمـانی كوردییەوە نووسراوە ، گۆڤـاری « كاروان » ، بەشـــی یەكەم ، ژ ٢٣ ، هەولێر ، ئابی ١٩٨٤ ، ل ١٦ ـ ٢٢ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢٤ ، هەولێر ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل ١٤ ـ ٢٦ .

... هتـد .

نووسینانەش وەرگرتووە کە باسی بەرهەمی کوردناسی دەکەن[٤] ...
لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ڕابەرە تەنها کتێبو نامیلکە[٥]و وتاری تێو

(٤) بۆ نموونە :

أ ـ د . جەمال نەبەز ، کورتە مێژوویێکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤١٣ ـ ٤٨٩ .

ب ـ د . جویس بلۆ ، پرتووکێن نوو ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٥٩ ـ ٦٢ ؛ ژ ١ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٨٧ ـ ٩٢ ؛ ژ ٤ ، پاریس ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ٦٢ ـ ٦٨ .

ج ـ مستەفا نەریمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

د ـ ژ . س . موسیلیان ، بیبلیۆگرافیای کوردناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .

هـ ـ میریللا غالیتی ، التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٢٢٥ ـ ٣٠٠ ( ترجمة يوسف حبي ) .

و ـ هەندێ کتێبی ڕێزمانی وەك ( قەناتی کوردۆ ، چەرکەزی بەکۆ ، ئەرنست مەکارۆس ... ) .

... هتد .

(٥) لەم ڕابەرەدا ئەو کتێبانەمان تۆمارنەکردووە ، کە بۆ خوێندنی زمانی کوردی لە قوتابخانەکانو زانستگاکان دانراون ، چونکە ژمارەیان هێندە زۆرەو هەندێکیشیان هێندە چاپکراونەتەوە ، کە پێویستیان بە ڕابەرێکی سەربەخۆیە ... هۆی تۆمارکردنی چەند کتێبێکی قوتابخانەش ، ئەوەیە کە کۆنن یان کەم ناسراون ...

گۆڤار[٦] دەگرێتە خۆ ، پتر لە هەزار سەرچاوە دەبێ[٧] ، کە ئەمەش بۆ خۆی کەرەستەیێکی باش‌و لەبارە بۆ لێکۆڵینەوەی هەر باسێکی نوێ لەبارەی زمانی کوردیی‌یەوە ، وەك ئاشکراشە لە لێکۆڵینەوەی هەر کارێکی نوێدا ئاوڕدانەوە لە کاری پێشوو بایەخ‌و سوودی خۆی هەیە ... ئەو سەرچاوانەش کەمێ لە ناوەڕۆکیان دواوین‌و بەپێی زمان دابەشمان کردوون : « بە زمانی کوردی » ؛ « بە زمانی عەرەبی » ؛ « بە زمانی تورکی » ؛ « بە زمانی فارسی » ؛ « بە زمانی ڕووسی » ؛ « بە زمانە ڕۆژئاواییەکان » ؛ « فەرهەنگ‌و فرەزمان » . لە کۆتاییشدا بۆ پتر ئاسانکردنی بەکارهێنان‌و دۆزینەوەی سەرچاوە ، بەگوێرەی نووسەرو ساڵ‌و شوێن ... چەند پێڕستێکمان کردووە .

ئەگەرچی لەوە بێ‌گومانم ، کە ئەم ڕابەرە کەم‌وکورتی‌و ناتەواوی‌و کەلێنی گەورەی تێدایە[٨] ، بەڵام لەوەش دڵنیام ، کەڵکی بۆ ڕووناکبیر

---

(٦) بەداخەوە لە توانستدا نەبوو نووسینی نێو ڕۆژنامەکانیش بخرێتە سەر ئەم خەرمانە . هیوادارم لە دەرفەت‌و بوارێکیتردا بتوانم ئەو ئەرکەش بەجێ‌بێنم‌و ئەو کەلێنەش پڕبکەمەوە .

(٧) بەڵام کتێبی « چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە » ، نزیکەی ( ١٢٠ ) سەرچاوەی تێدا باس‌کراوە .

(٨) من خۆم پەنجە بۆ چەند کەلێنێکی گەورەی ئەم نووسینەم ڕادەکێشم :
ا ـ لەگەڵ هەموو گەڕان‌و سۆراخ‌و پشکنینێکی زۆریشدا هەندێ گۆڤاری کوردیم دەست‌نەکەوت‌و ، بێ‌گومان ئەمەش بووەتە هۆی ناونەبردنی نووسینەکانی ئەو گۆڤارانە .
ب ـ بێ سێ‌و دوو دەڵێم : بە زمانی غەیری کوردی نووسین لەبارەی زمانی کوردیی‌یەوە گەلێك لەوە زیاترە کە من باسم‌کردووە ، بەڵام من هەر ئەوەندەم لەدەست‌هاتووە .
جـ ـ چەند کتێب‌و نامیلکەو وتار هەن ، کە بینیومن‌و خوێندوومنەتەوە ،

بەگشتیو زمانەوانو زماناسو تۆژەرو قوتابیی بەشی کوردی زۆرە • من بەش بەحاڵی خۆم لەو ڕۆژەوەی دەستم داوەتە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیو لە بەردەوامیو خەریکبوونی ئەو ساڵانەداو تا ئەمڕۆش گەڕان بەدوای سەرچاوەدا کێشەیێکی یەکجار گەورە بووەو کاتێکی زۆری لێ زەوتکردووم • جا ئومێدەوارم بەم کارە توانیبێتم ئەرکی زمانەوانی خۆو بێگانە ؛ هەڤاڵانی ئەمڕۆو ڕۆڵەی دوارۆژم کەمێ ئاسان کردبێو بەری ڕەنجی نووسەرانی کوردو بێگانەشم لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی شیرینی کوردیدا خستبێتە پێش چاو •

مایەی بەختەوەریم دەبێو هیواو ئاواتێکی گەورەم دێتەدی ، ئەگەر بەم کارە خزمەتێکی بچووکم پێشکەش بە زانیاریی گەلەکەمان کردبێو تکاش لە گشت دڵسۆزێکی وشەی پیرۆزی کوردی دەکەم ، لەم نووسینەدا هەر ناتەواویو هەڵەیێك دەبینن ، چاو نەپۆشنو دۆستانە ڕاستیبکەنەوە •

**د • ئەوڕەحمانی حاجی مارف**

---

بەڵام ئێستا لە بەردەستمدا نینو ناوونیشانی تەواویانم لەیاد نییە ، بۆیە نەمتوانیوە ناویان بەرم .

د ـ نووسینی ئەوتۆ هەیە خۆم نەمبینیوەو لەم کتێبو ئەو کتێبدا باسیانم خوێندۆتەوە ، بەڵام لەبەرئەوەی گومانم لە تەواویی ناوونیشانی هەندێکیان هەبووە ، تۆمارم نەکردوون .

... و هەندێکی تر .

## بــه زمانی کوردی

أ· ت· :

**١ ــ له ژوور یەکگرتنا زمانێ کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٣٧ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٥ ــ ٨ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا باسی کێشەی له یەکتر نەگەیشـــتنی ناوچەی سۆرانو بادینان دەکا ٠

ئاراس عەزیز عەبدوڵڵا :

**٢ ــ پرپاسکەیەك ســـەرنج ، گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٧ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٥٢ ــ ٥٤ ٠**

ئەم وتاره هەندێ سەرنجو تێبینیی‌یە دەربارەی چەند بابەتێکی رێزمانی کتێبی « زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی » ٠

م· ئارام :

**٣ ــ هەندێك دەنگیتر ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٩ ، سالی ٣ ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ل ٥٧ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ وشەی وەك : « کورکەکورکی پیرێژن ؛ خەپەی پێ ؛ هەنسکی گریان ؛ شیرەی دادڕین ••• »ی خستووەتە پێش چاو •

أ• م• :

**٤ ـ یەکگرتنا زمانێ کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٣٨ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ ـ ٢ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو گلەیی‌یە لە خوێندەوارانی ناوچەی سۆران ، کە شێوەی کوردیی ژووروو نازانن •

ت• ئامینیان :

**٥ ـ ئامۆژگاریو کوردیو ئاوێستا ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١١٩ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٣ ؛ ژ ١٢٠ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ١٧ ؛ ژ ١٢٢ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ٧ ؛ ژ ١٢٣ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ١٤ ؛ ژ ١٢٦ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ٦ •**

نووسەر لە سەرەتای ئەم زنجیرە وتارەدا هەندێ پەندی بۆ ئامۆژگاری هێناوەتەوەو ئنجا لیستەیێکی ڕێکخستووە بۆ بەرانبەر یەکگرتنی وشەکانی ئاوێستاو کوردی •

**٦ ـ ئاوێستا ـ پەهلەوی ـ کوردیی ئێستا ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٠٨ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٨ ؛ ژ ١١٠ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٥ ؛ ژ ١١١ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٧ ؛ ژ ١١٤ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٧ •**

ئەمە بەراوردکردنی هەندێ وشەی ئاوێستاو پەهلەویو کوردی‌یە ، بە مەبەستی نیشاندانی ڕەسەنیی زمانی کوردی •

ئاوێ بالی :

**٧ ـ ئەلفابێیا کوردی ، وەشـــــانێن کۆمکار ، ژ ١٥ ، ئەلمانیـا فیدێرال •**

ئەم کتێبە بۆ خوێندنی زمانی کوردی‌یەو ( ٧١ ) لاپەڕەیە •

ئەبوبەکر ماوەتی :

**٨ ـ چەند سەرنجێك دەربارەی بەشی فەرهەنگ ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٨ ، ساڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ل ٣٣ ـ ٣٤ •**

نووســـــەر لەم وتارەدا دەربارەی ئەو زاراوانەی لـە بەشــی « فەرهەنگ »ی ژمارە (١)ی ساڵی (٢)ی گۆڤاری « دەنگی مامۆستا »دا بڵاوکراونەتەوە ، دواوەو ڕای خۆی لەبارەی هەندێکیانەوە دەربڕیوە •

ئەحمەد تاقانە :

**٩ ـ لقە کۆمەڵە چاوگی ( ست )ی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٩ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٥٩ ـ ٦٢ •**

نووسەری ئەم وتارە لەنێو کۆمەڵـە چاوگی ( ت )یدا ، کۆمـەڵـە چاوگێکی ختووەتە پێش چـاو ، کــە لەپێش ( ت )ی نیشـــــانەی چاوگەکانیانەوە ( س )ێك هەیەو بەدوورو درێژی لێیان دواوە •

**١٠ ـ لـەبارەی هەندێ لـە زاراوەو ئیدیۆمی کوردی‌یەوە ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٣ ـ ٤٤ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٧ ـ ٥٩ •**

ئەم وتارە دەربڕینی هەندێ سەرنج و تێبینی‌یە لەبارەی ئەو وتـارەی د • نەسرین فەخری‌یەوە ، کە لە لاپەڕە ( ٧١ ـ ١١٥ )ی ژمـارە ( ١٨ )ی « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات »دا بەناوی « هەندێ زاراوەو ئیدیۆمـەی

کوردی ـ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە »دا بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٤٩ ) •

ئەحمەد حەسەن ئەحمەد :

**١١ ـ ئەلفوبێو ڕێنووسی کوردی ئەبێ چۆن بن ؟ ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٤٤ ـ ٤٥ •**

نووسەر لەم کورتە وتارەدا کەمێ لە گیروگرفتی نووسینی کوردی دواوەو وا دادەنێ ، کە نووسینی کوردی پێویستە دوو مەرجی تێدابێ :

١ ـ دەبێ سوودبەخش بێو کێشەی تێدا نەبێ •

٢ ـ دەبێ لەگەڵ پیری بیرتیژیدا ڕێ‌بکەوێ •

**١٢ ـ دابڕەدەنگ بە چی دەوترێ ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٨ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣١ ـ ٣٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی بڕگەی لە زمانی کوردیدا کردووە •

**١٣ ـ پێشگرو پاشگر ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣١٩ ـ ٣٥٧ •**

دەربارەی پێشگرو پاشگر لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا وتارێکی د • نەسرین فەخری ( بڕوانە : باسی ژ ٦٣٦ )و لە بەرگی دووەمی هەمان گۆڤاردا وتارێکی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ( بڕوانە : باسی ٢٩٢ ) بڵاوکراونەتەوە • ئەمەش دواکەوتنێکە بەدوا ئەو وتارانەداو باسی ئەو پێشگرو پاشگرانە دەکات کە کرداری ناسادە سازدەکەن •

**١٤ ـ ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •**

ئەم کتێبە ( ٢٩٦ ) لاپەڕەیەو بە کوردیو عەرەبی‌یە • جگە لە سەرەتاو کەمێ باسی فۆنەتیك ، ئەوی دی هەمووی دەربارەی بەشە

جۆربەجۆرەکانی ئاخاوتنە ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٢٣٤ ، ٢٣٥ ) •

ئەحمەد سەلام :

**١٥ – بەشـــە کوردییەکەی ژمـارەی پێشووم خوێندەوە ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٦٢ – ٦٨ •**

نووســـــەر لـەم وتـارەدا ، کـە تێـکڕای وتارەکـانی بەشــە کوردیەکەی ژمارە ( ٥١ )ی گۆڤـاری « ڕۆژی کوردســــتان » هەڵدەسەنگێنێ ، لە وتاری « لێکۆڵینەوەیێك لەسەر پاشگری ( کە ) لـە زمانیکوردیدا »ی مامۆستا عەبدولقادر محەمەد ئەمینیش دواوەو هەندێ لە ناتەواویو کەمو کورتییەکانی نیشانداوە ( بڕوانە : باسی ژ ٣٦٣ ) •

**١٦ – جووتەناو یان ناوەڵوشە ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤٤ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥١ – ٥٣ •**

ئەم وتارە هەندێ سەرنجو تێبینییە لەبارەی ئەو وتارەی مامۆسـتا موکەڕەم ڕەشیدەوە ، کە لە ژمارە ( ٤٠ – ٤١ )ی ساڵی ١٩٧٧ی گۆڤاری « بەیان »دا بە ناوی « دەربارەی جووتەناو لە زمانی کوردیدا »وە بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٨٠ ) •

**١٧ – چەند لایەنێکی زمانەوانی لـە کۆمەڵە چیرۆکی ( شەمامە )دا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٥٧ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٠١ – ١٠٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی نادروستی بەکارهێنانی هەندێ وشەو دەستەواژەو ڕستە دواوە لە کۆمەڵە چیرۆکی ( شـــەمامە )ی مامۆسـتا جـەزا عەلیدا •

**١٨ – دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی لامی قورسو لامی ســـووك لە وشەدا ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ١ ، ســـاڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٩ ، ل ٨٨ – ٨٩ •**

ئەم وتارە باسی ئەو ( ل )انە دەکات ، کە بەدوا دەنگە بزوێنەکانـدا دێنو لەو ڕێیەوە قورسیو سووکییان دیاری دەکات ••• نووســەری

ئەم وتارە وا ڕادەگەیەنێ ، کە مامۆستا طاهیر صادق ئەو وتارەی خوارەوەی هەیە :

طاهیر صادق ، پیتی لامی قەڵەوو لامی لەڕ ، نامیلکەی « گزنگ » ، کە بریتی‌یە لە کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی ، ساڵی ١٩٧٢ لە کەرکووك بە سەرپەرشتی ( ڕەزا شوان ) بڵاوکراوەتەوە .

## ئەحمەد نەقشبەندی :

**١٩ - زمانەوانی - فیلۆلۆجیا ، گۆڤاری « هەولێر » ، ژ ٤ - ٥ ، ساڵی ١ ، هەولێر ، ١٩٧١ ، ل ٣١ - ٣٣ .**

نووسەر بە کورتی وەڵامی ئەو بیروڕا هەڵانە دەداتەوە ، کە زمانی کوردی بە شێوە زمانێکی تێکچووی فارسی یان زمانێکی پڕ لە وشەی بێگانە دادەنێن .

## ئەحمەد عەزیز ئاغا :

**٢٠ - ئەلفبای کوردی ، چاپی سێیەم[1] ، چاپخانەی فورات ، بەغدا ، ١٩٣٦ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٤٠ ) لاپەڕەیە ؛ ئەلفبایەکە بۆ خوێندنی منداڵانی کورد دانراوە . شایانی باسە ، نووسەر لە سەرەتادا لە هەندێ کێشەی

(١) ئەو کتێبەی ئەحمەدی عەزیز ئاغا من تەنیا ئەو بەرگەیم دیوە ، کە لەسەری نووسراوە چاپی سێیەم . بێگومان دەبێ چاپی یەکەم‌و دووەمیشی هەبێ . جا چاپی سێیەم ، کە لە ١٩٣٦دا چاپکرابێ ، ئەوە دەبێ چاپی یەکەم‌و دووەم بەر لەو ساڵە دەرچووبێ . وەك مامۆستا نەریمان‌و مامۆستا سۆران ڕایدەگەیەنن چاپی یەکەمی ئەو بەرهەمە ، ساڵی ( ١٩٢٩ ) بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : أ - نەریمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٥ ؛ ب - سۆران ، کتێبخانەی سۆران ، لەندەن ، ١٩٧٩ ، ل ٢٢ ، ژ ١٠٦ .

پیتەکانی کوردی دواوەو ئەو گیروگرفتانەی لـە نەبوونی هەندێ چاپـدا هەبووە دیاری کردووە ... سەرنجڕاکێش ئەوەیە ، کە مامۆستا ئەحمەدی عەزیز ئاغا ( د )ی کلۆر نەکردووە ...

## ئەحمەد هیرانی :

**٢١ ـ وشـــــەیەك لەنگە لـە ترازووی بەکاربردنیـــدا ، گۆڤاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ٢ ، سالی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ١٣٢ ـ ١٣٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە دوورودرێژی لەو وشانە دواوە ، کە لە زمانی کوردیدا بۆ سەرسامبوون بەکاردەبرێن .

## ئەرنست مەکارۆس :

**٢٢ ـ لاڕستە لـە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ٢ ، سالی ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ٨٤ ـ ٨٩ .**

ئەم باســـە مامۆستا غازی فاتیح وەیس لە لاپەڕە ( ٩٦ ـ ١٠٣ )ی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »ی ئەرنست مەکارۆس (بڕوانە: باسی ژ ٩٤٥)ەوە وەرگرتووەو کردوویە بە کوردی .

**هەروەها ژ ( ٩٢١ ، ٩٤٥ ، ١١٠٣ ) .**

## ئەکرەم جەمیل پاشا بورجو چەند هەڤال :

**٢٣ ـ ئەلفابێیا کوردی ، شـام ، ١٩٤٥ .**

سالی ١٩٤٥ لە شام ئەکرەم جەمیل پاشـــا بورجو چەند هەڤالێکی نامیلکەیەکیان بـە نـاوی « ئەلفابێیا کوردی »یـەوە بلاوکردەوە . ئـەم نامیلکەیە بۆ فێرکردنی مندالانی کورد دانراوە . لە سەرەتادا ( ل ١ ـ ٣٦ ) پیتەکانی زمانی کوردیان بە نموونەو وێنەوە نیشانداوە . لـە کۆتاییشدا ( ل ٣٧ ـ ٥٦ ) هەندێك چیرۆکی کوردیو چەند شیعرێکی قەدری جانو عوسمان صەبرییان تۆمارکردووە .

ئەكرەم قەرەداغی :

**٢٤ - چاوخشـاندنێك بـە هەندێ لە گرفتەكانی زمـانی كوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی كوردسـتان » ، ژ ٥ - ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ - ٤١ .**

باسـەكانی ئەم وتارە ئەمانەن : « ١ - زۆربوونی شێوە زمـان لـە كوردیـدا » ؛ « ٢ - بانگەوازی كەمكورتیی زمـان » ؛ « ٣ - گـرفتی كوردیی نوێ » ؛ « ٤ - گیرەشێوێنیی زاراوە زانسـتییەكان » ؛ « ٥ - نووسینی زمانەكە » .

ئەمین بۆز ئەرسەلان :

**٢٥ - ئەلفابێ ، ئەستەمووڵ ، ١٩٦٨ .**

ئەم بەرهەمە ( ٦٤ ) لاپەڕەیەو وێنەدارەو بە ئەلفوبێی لاتینی‌یەو بـۆ فێربوونی زمانی كوردی دانراوە . نووسەر لە پێشـەكی‌یەكەیدا دەڵێ : « ئەم هیڤی بكن كو بـ ئالیكاریا ڤێ ئەلفابێ خوەندنو ئیسـین د ناڤا خەلكێ مەدا بەلاڤ ببەو گەلێك خۆرتێن مەو دەمەكی كورتدا بـ ناڤباریا ڤێ ئەلفابێ خوە ژ تاریتیا نـەخوەنـدنی‌و نەزانییـا دەرخینن ، بـ گیـژن رۆناهیا خوەندنو زانینێ » ( ل ٣ ) .

**٢٦ - ئەلفابێ ، سوید ، ١٩٨٠ .**

ئەم كارە چاپی دووەمی ئەو ئەلفوبێ‌یەیە ، كـە سـالی ١٩٦٨ لـە ئەستەمووڵ بلاوی كردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٢٥ ) .

ئەمین زەكی بەگ :

**٢٧ - ئامۆژگارییەكی دڵسۆزانە ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٤ ، سالی ٨ ، بەغدا ، ١٩٤٧ ، ل ١ - ٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی نووسینی كوردییەوە هەندێ ئامۆژگاری

کردووە ، بەتایبەتی وای بە باش زانیوە وشەی عەرەبی لـە زمانی کوردی دەرنەهاوێژرێ و لە چۆنیەتی نووسینیشدا پەیڕەوی ئەسڵەکەی بکرێ •

## ئەمینێ عەڤدال :

**٢٨ - خەبەرناما کوردیا ڕاستنڤیساندنە ، یەریڤان ، ١٩٥٨ •**

ئەم کتێبە ( ٢١٤ ) لاپەڕەیەو برتییە لە : پێشەکی ( ل ٥ ) ؛ پیتەکانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی سلاڤی ( ل ٧ ) ؛ باسی وێنەی دەنگەکـانو چونیەتی نووسینی وشەکانو خـالبـەنـدی ( ل ٩ - ٥٣ ) ؛ فـەرهـەنگی ڕاستنووسینی وشە ( ل ٥٤ - ١٨١ ) ؛ کۆمەڵێ تێکست بۆ خوێندنـەوە ( ل ١٨٢ - ٢١١ ) ؛ فەرهەنگی زاراوەی کوردی - ئەرمەنی ( ل ٢١٢ ) • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣١ ) •

**٢٩ - میتۆدیکا زمانێ کورمانجی ، یەریڤان ، ١٩٥٠ •**

**٣٠ - میتۆدیکا زمانێ کورمانجی ، یەریڤان ، ١٩٧٣ •**

**٣١ - نقتك دانین ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٠٣ - ٣١٨ •**

ئـەمـە کـــە باسی خالبەندییـە لـــە کتێبی « خەبەرنامە کوردیـا ڕاستنڤیساندنە » ، کە ئەمینی عەڤدال ســــــاڵی ١٩٥٨ لە یەریڤان بلاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٢٨ ) ، مامۆستا شوکور مستەفا لە ئەلفوبێی سلاڤییەوە هێناویەتییە سەر ئەلفوبێی عەرەبی •

## ئەمینێ عەڤدالو ش• ئەمین :

**٣٢ - کتێبا زمانێ کوردی ، یەریڤان ، ١٩٥٧ •**

بۆ فێرکردنی زمانی کوردی نووسراوەو بە ئەلفوبێی سلاڤییە •

## د. ئەمین عەلی مۆتابچی :

**٣٣ ـ زمانی نالی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٦٧ ـ ١٠٦ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا بەکورتی لەوە دواوە ، کە چۆن لە ڕێگای شاعیرەکانمانەوە شێوەی جزیرو هەورامانو بابان بوون بە زمانی ئەدەبیو ئنجا بە دوورودرێژی باسی دەوری نالیو هەندێ شاعیریدی کردووە لە گەشەپێدانی زمانی ئەدەبیو نووسین بە کوردیدا .

## ئەنستاس کەرمەلی :

**٣٤ ـ بڕوانە : باسی ژ ٢٧٦ .**

**٣٥ ـ زمانی ئێستای کورد ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٦ ، هەولێر ، کانوونی دووەمی ١٩٨٤ ، ل ٤٥ ـ ٤٩ .**

ئەمە دەستنووسێکی ئەنستاس کەرمەلیە کە بە عەرەبی نووسراوەو مامۆستا غەفووری میرزا کەریم کردوویە بە کوردی . ئەم نووسینە لەبارەی ئەسلی کوردو لێکۆلینەوەی زمانی کوردی لەلایەن زانایانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواوەو باسی دیالێکتەکانی کوردییەوە ... دەدوێ .

## « ئەنستیتووی کورد » :

**٣٦ ـ تالیکاری ژ بۆ فەرهەنگا کوردی ـ فەرەنسزی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٤ ، پاریس ، ١٩٨٥ ، ل ١٤ .**

ئەمە کە لە بەشی کرمانجیی ژووروی گۆڤارەکەدایە ، بانگەوازێکە لە ئەنستیتووی کوردەوە . لەم بانگەوازەدا ، کە داوایان کردووە وشەی کوردیان بۆ بنێرن ، باسی گرنگیو بایەخو پێویستیی فەرهەنگی کوردیان کردووەو ئەوەشیان ڕاگەیاندووە کە فەرهەنگی ناوبراو پیتی ( A, B, C ) ی تەواو بووەو ( ٥٥ ) هەزار وشەیە .

ئەنوەر مائی :

**٣٧ ـ لە ژوور یەلاگردنا زمـانێ کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٣ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٤ ، ل ١٢ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٤ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٤ ، ل ٥ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ١٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٤ ، ل ٤ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٢٢ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٥ ، ل ١٣ ـ ١٤ .**

ئەم وتارە کە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوە ، باسـی پێویستیی یەکگرتنی زمانی کوردی دەکا . نووسەر بۆ بەجێهێنانی ئـەم ئەرکە لەو ڕایەدایە ، کە یەکەم هەنگاو دەبێ یەکخستنی ئەلفوبێ بێت . لەدوایشدا بە دوورودرێژی لە دەنگەکانی زمانی کـوردیو گونجـانی ئەلفوبێی لاتینی دواوە .

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف :

**٣٨ ـ با ڕێزی لێکۆلینەوەی زانستی بگرین ، گۆڤاری « ڕۆشـنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٧٢ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٧ ـ ٢٥ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٧٣ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٩ ـ ٢٩ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٧٤ ، بەغـدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٦ ـ ٢١ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٧٥ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٤٧ ـ ٥٣ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٧٦ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١١ ـ ١٧ .**

ئەگەرچی ئەم زنجیرە وتارە وەلامی تێکڕای ئەو هێرشو قسـە ناڕەوایانەی د . جەمال نەبەزە ، کە لە وتاری « سـەرنجێك لـە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد » ( گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ، ژ ٢٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٧٩ ـ ١١٥ )دا کردوویەتی ( بڕوانە : باسی ژ ١٨٩ ) ، گەلێ باسی زمانەوانیشـی ، وەك ( فەرهەنگی کوردی ، ڕێزمان ، زاراوە ... ) تێدایە .

**٣٩ – بزانین یەگیزاڕۆف دەربارەی کورد چی نووسیوە ؟ ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٣٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١ – ٥ ٠**

ئەم وتارە کە بەگشتیی باسی کتێبی « مێژوویێکی ئەتنۆگرافیی کورتی کوردی پارێزگای یەریڤان » دەکات ، کە س ٠ ئا ٠ یەگیزاڕۆف بڵاوی کردووەتەوە ، لەو دوو فەرهەنگۆکە ( یەك : کوردی – ڕووسی ؛ دوو : ڕووسی – کوردی )ش دواوە ، کە بوونەتە پاشکۆی ئەو بەرهەمە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٩٦ ) ٠

**٤٠ – بنچینەی دانانی فەرهەنگێکی کوردی – عەرەبی بۆ قوتابخانە ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٥٧ – ٨٤ ٠**

ئەم وتارە لە دوو بەش پێکهاتووە : بەشی یەکەم – باسی مێژووی ڕێکخستنی فەرهەنگە کوردییەکانە ٠٠٠ بەشی دووەم – دەربارەی چۆنیەتی دانانی فەرهەنگەکەیەو لێرەدا بایەخ بە سێ باس دراوە : ١ – هەڵبژاردنی وشە ؛ ٢ – سازکردنی بەشە عەرەبی‌یەکەی ؛ ٣ – هونەری ڕێکخستنی ٠

**٤١ – بەرکولێکی هەڵە زانستی‌یەکانی کورتەی نامەی دوکتۆری‌یەکەی د ٠ کوردستان موکریانی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٠ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١١ – ١٨ ٠**

ئەم وتارە نیشاندانی هەندێ سەرنجو تێبینی‌یە سەبارەت بە پێشەکی‌و بەشی دووەمی کورتەی نامەی دوکتۆری د ٠ کوردستان موکریانی ، کە بە ناوی « دیارخەرو شێوەکانی دەربڕینی پەیوەندی‌یە دیارخەری‌یەکان لە زمانی کوردیدا ( دیالێکتی سۆرانی ) »وەیە ( بڕوانە : باسی ژ ٨٥٧ ) ٠

**٤٢ – بیبلیۆگرافیای ئەو وتارانەی لە سالانی ١٩٧٠ – ١٩٧٩دا لەبارەی زمانی کوردییەوە بەکوردی لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ١٣ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٠٧ – ١٥٧ ٠**

نووسەر لەم نووسینەدا باسی ( ٢١٧ ) وتاری کردووە ، کە لە گۆڤارە کوردیو بێگانەکانی نێوان سالانی ١٩٤٠ - ١٩٧٠دا لەبارەی زمانی کوردییەوە بلاوکراونەتەوە •

**٤٣ - بیبلیۆگرافیای وتاری زمانەوانی لەبارەی زمانی کوردییەوە لە گۆڤارە کوردیو بێگانەکانی سالانی ١٩٤٠ - ١٩٧٠دا ، گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٠٥ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٢١ - ١٣٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٩٠ - ١٠٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ( ٢٣٨ ) وتاری کردووە کە لە سالانی ١٩٧٠ - ١٩٧٩دا لەبارەی زمانی کوردییەوە بەکوردی لە گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە •

**٤٤ - پێداچوونەوەیێکی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەممەد ، گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٩٠ ، کانوونی دووەمو شوباتی ١٩٨٢ ، ل ١٠ - ١٥ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٩٢ ، نایاری ١٩٨٢ ، ل ١٣ - ١٨ •**

ئەم وتارە هەندێ سەرنجو ڕوونکردنەوەیە دەربارەی وتاری « ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە »ی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، کە لە ژمارە ( ٨٠ )ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا بلاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩٦ ) •

**٤٥ - جێناوی کەسیی جودا لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٤٥ - ٩٥ •**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا بەکورتی باسی ئەو کارانەی کردووە ، کە لەبارەی جێناوی کەسیی جودای زمانی کوردییەوە نووسراون • دوایی بۆ لێکۆلینەوەی ئەو مەبەستە گەشتی بە دیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا کردووەو دوو دەستە جێناوی کەسیی جودای بۆ دیالێکتی ژووروو و یەك دەستەی بۆ دیالێکتی خواروو دیاری کردووە •

١٠٨١٠

**٤٦ ـ جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا ، گۆڤاری « کاروان » ، بەشـــی یـەکـەم ، ژ ٣٢ ، هەولێر ، حوزەیرانی ١٩٨٥ ، ل ٢٧ ـ ٣٨ ؛ بەشـــی دووەم ، ژ ٣٤ ، هەولێـر ، تـەمووزی ١٩٨٥ ، ل ١٦ ـ ٢٥ .**

نووسـەر لەم وتارەدا بە بەڵگەو نموونەی زۆرەوە دەربارەی هەردوو دەستە جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی خوارووی کوردی دواوە .

**٤٧ ـ جێناوی کەسیی لکاو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٣٨ ، هەولێر ، تشرینی دووەمی ١٩٨٥ ، ل ١٣ ـ ٢٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە کێشەو شێوەو دەستنیشان کردنو جۆری دەربڕین ... ی جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی ژووروی کوردی دواوە .

**٤٨ ـ چۆنیەتی لکانی جێناوی کەسیی لکاو بە کردارەوە لـە دیالێکتی خوارووی کوردیدا ، گۆڤاری « نوسەرنوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٢ ، ســالی نۆیەم ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ١١٢ ـ ١٢٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٣ ، ســالی نۆیەم ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ٧٢ ـ ٨١ .**

• نووسەر لەم وتارەدا شوێنو دەورو ئەرکی هەر یەك لە دوو دەســتە جێــاوە لکاوەکانی دیالێکتی خوارووی لەگەڵ کرداری تێپەڕو تێنەپەڕی سادەو ناسادەدا دیاری کردووە .

**٤٩ ـ چەند وشەیەك دەربارەی کۆمەڵە دەســــتنووسە کوردییەکانی ئەلێکساندر ژابا ، گۆڤاری « بەیان » ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٠ و ١٣ .**

نووسەر لەم وتارەدا کە لە تێکڕای ئەو دەستنووسانەی ئەلێکساندر ژابا دەدوێ ، کــە لــە کتێبخـانـەی گشـتیو کتێبخانـەی ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستیی سۆڤێت لـە لینینگراد هەڵگیراون ، باسی چەند دەستنووسێکی کردووە کە پێوەندیان بـە زمـانو فەرهەنگی کوردییەوە هەیە .

**٥٠ ـ چەند وشەیەك دەربارەی ( لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا ) ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٩٠ ، بەغدا ، ئەیلوولی ١٩٨٣ ، ل ٦٢ ـ ٦٩ .**

ئەم وتارە وەڵامی ئەو نووسینەی مامۆستا مەسعوود محەمەدە کە بەناوی « لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا » ( گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧ - ٣٣ )وە بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٠٣ ) • ئەم باسە بە زۆری دەربارەی بزرۆکە ( کسرة مختلسە )ی ( i )و هەمزەیە •

**٥١ - چی تریش لەبارەی زمانی کوردییەوە نووســـراوە ، گۆڤاری « کاروان » ، بەشی یەکـەم ، ژ ٢٣ ، هەولێر ، ئابی ١٩٨٤ ، ل ١٦ - ٢٢ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢٤ ، هەولێر ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل ١٤ - ٢٦ •**

نووســـەر لەم دوو وتارەدا باسی ئەو کتێبانەی هەر لە زووەوە تـا ئـەمڕۆو ئـەو وتـارانـەی هـــەر لــە کۆنـەوە تـا ســـالی ١٩٣٧ لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراونو ناویان لـــە کتێبی « چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووســـراوە »دا ( بڕوانە : باسی ژ ٥٢ ) نەهاتووە ، خستووەتە سەر خەرمانی ئەو نووسینەی •

**٥٢ - چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ، بەغدا ، ١٩٧٣ •**

ئەم کتێبە ( ٧٠ ) لاپەڕەیەو باسی ئـەو کتێبو نامیلـکەو وتـارانـە دەکات ، کە هەر لە زووەوە تا ســالی ١٩٧٤ لەبارەی زمانی کوردیـیەوە نووسراون • ئەم بەرهەمە بریتییە لەو باسانە : پێشەکی ( ل ٥ - ٧ ) ؛ لـە سەرەتاوە تا شەڕی یەکەمی جیهان ( ل ٨ - ٣١ ) ؛ پاش شەڕی یـەکـەمی جیهان : لە کوردستان ( ل ٣٢ - ٤٦ ) ؛ لە یەکێتی سۆڤێت ( ل ٤٦ - ٦٠ ) : لە ئەورووپا ( ل ٦٠ - ٦٥ ) ؛ ئەنجام ( ل ٦٦ - ٦٨ ) • ( بڕوانـە : باسی ژ ٧١١ ) •

**٥٣ - ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ( مۆرفۆلۆژی ) ، بەشی یەکـەم ( ناو ) ، بەغدا ، ١٩٧٩ •**

ئـەم کتێبـە ( ٢٨٤ ) لاپەڕەیەو ئەرکی ســـــەرەکی تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕووی مۆرفۆلۆژیو زانستی زمانەوە

پێوەندیان بە بەشە ئاخاوتنی ( ناو )ەوە هەیە لە زمانی کوردیدا ، بەتایبەتی وەك : پێناسەی ناو ؛ ناو لـە ڕووی ناوەرۆکەوە ـ ناوی تـایبەتیو ناوی گشتیو نـاوی کۆمەڵ ؛ نـاو لەڕووی هەبوونەوە ـ ناوی مادیو نـاوی مەعنەوی ؛ ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە ـ ناوی سادەو ناسادە ••• جنسەکانی ناو ؛ ژمارەی ناو ، نیشانەکانی ئیزافە ••• ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسـی ژ ۳۱۸ ، ۵۱۷ ، ۵۱۸ ) •

**٥٤ ـ ڕێنووسی کوردی لـە ڕۆژنامەی ( تێگەیشـتنی ڕاستی )دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، بەرگی دەیەم ، بەغدا ، ۱۹۸۳ ، ل ۷٦ ـ ۱۳۲ •**

ئەو زانیارییانەی لەم وتارەدا دەربارەی ڕێنووسـی کوردی لـە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا خراونەتە پێش چاو دەبن بە سـێ بەشەوە : « ۱ ـ وێنەی دەنگەکان » ؛ « ۲ ـ نووسینی وشـەکان » ؛ « ۳ ـ خاڵبەندی » •

**٥٥ ـ ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشـەوە ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٤ ، هەولێر ، کانوونی دووەمی ۱۹۸۳ ، ل ۳۹ ـ ٤۷ •**

ئەم وتارە نرخاندنێکی ئەو بەرهەمەی مامۆستا مستەفا نەریمانە ، کە ساڵی ۱۹۸۱ بە ناوی « ڕێنووسی کوردی لە ڕەگو ڕیشـەوە »وە بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ۵۷۳ ) •

**٥٦ ـ زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ۱۹۷٦ •**

ئەم بەرهەمە ( ۸٦ ) لاپەڕەیە ، بریتییە لە پێشەکی ( ل ۳ ـ ۱۳ )و ئەو کێشانەی پێوەندیان بە فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە هەیە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ۳۱۷ ، ۷۱٤ ) •

**٥٧ ـ کارە زانسـتییەکانی ( پیۆتەر لێرخ ) ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ۳۲ ، بەغدا ، ۱۹۷٥ ، ل ۱ ـ ٥ •**

نووســـەر لەم وتارەدا کە باسی کتێبە سێ بەرگی‌یەکەی پ • لێرخ ـ« لێکۆڵینەوە لەبارەی کوردەکانی ئێرانو خالدیکانی باوباپیرانیانەوە »ـ دەکات ، ئەو شوێنانەی خستووەتە پێش چاو کە دەربارەی زمانی کوردی دەدوێ ( بڕوانە : باسی ژ ٨٦١ ) •

**٥٨ ـ کاریگەری گەورە لە باسی ئیدیۆم لە زمانو فەرهەنگنووســـیی کوردیدا » ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٦٣ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢ ـ ٦ •**

ئەم وتارە دەربارەی ئەو « فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی ـ ڕووسی »یە دەدوێ ، کە د • مەکسیمی خەمۆ سالی ١٩٧٩ لە یەریڤان بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٨٦ ) •

**٥٩ ـ کاریگەری گەورە لـە باسی ئیدیۆم لـە زمـانو فەرهەنگنووسیی کوردیـدا » ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نـوێ » ، ژ ٨٤ ، بەغـــدا ، ١٩٨١ ، ل ١ ـ ٤[٢] •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەو فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی ـ ڕووسی‌یەی خستووەتە پێش چاو ، کە د • مەکسیمی خەمۆ ســـالی ١٩٧٩ لە یەریڤان بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٨٦ ) •

**٦٠ ـ کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی ( جێناوی کەسیی لکاو )دا کراون ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٩ ، شـــوباتی ١٩٨٥ ، ل ٢٢ ـ ٣٣ •**

نووســـەر لەم وتارەدا گەشـــتێکی بەو کتێبو نامیلکەو وتارانـەدا کردووە ، کە باسی « جێناوی کەسیی لکاو »یان کردووەو ڕووی بـاشو سەرکەوتوویی‌و ناتەواوی‌یانی خستووەتە پێش چاو •

**٦١ ـ کورتەیەك لە زانستی ڕێزمان ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٧ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٤٥ ـ ٤٨ •**

---

[٢] ئەم وتـارە ، کـە بۆ جاری دووەم بڵاوکراوەتەوە ، هەڵەی برادەرانی « دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی »یەو لەکاتی خۆیدا گلەیی دۆستانەم لێ کردن .

نووسەر لە سەرەتادا وەك زانستێك بەگشتی لە ڕێزمان دواوەو دوایی باسی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی کوردی کردووە •

**٦٢ – کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، بەرگی هەشتەم ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٦٦ – ١٢٠ •**

ئەم وتارە باسی مێژووی بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی دەکات لەلایەن کوردەوەو لە دەستکاری کردنیو دانانی هەندێ پیتو نیشانەی نوێ دەدوێو لەو کارانەی دەربارەی ئەو ئەلفوبێیەو گیروگرفتەکانی نووسراون ، دەکۆڵێتەوە •

**٦٣ – کۆی ناو لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٨٥ – ٢٢٢ •**

ئەم وتارە لە سێ بەش پێکهاتووە : « ١ – چاوگێڕانێك بەو هەوڵانەدا کە نووسەران لەم ڕووەوە داویانە » ( ل ١٨٥ – ١٩٧ ) ؛ « ٢ – کۆ لە چەند زمانێکی بێگانەو هاوڕەگەزی کوردیدا » ( ل ١٩٨ – ٢٠١ ) ؛ « ٣ – کۆی ناو لە زمانی کوردیدا » ( ل ٢٠١ – ٢٢٥ ) •

**٦٤ – گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، بەرگی نۆیەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٦ – ٧٧ •**

ئەم وتارە لە پێشەکییەكو دوو بەش پێکهاتووە : بەشی یەکەم – گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان ( ل ٢٠ – ٣٨ ) ؛ بەشی دووەم – گیروگرفتی نووسینی وشەکانو تێكبەستنیان ( ل ٣٨ – ٧١ ) •

**٦٥ – لەبارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە ، گۆڤاری « بەیان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٢ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٤ و ٢٦ – ٢٧ ؛ بەشی دووەم ژ ١٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢ – ٤ ؛ بەشی سێیەم ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٣ – ١٥ •**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا کەمێك لەو کارانە دواوە ، کە لەبارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە نووسراونو ئنجا بیروڕای خۆی

ســـەبارەت تێکڕای دەنگە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانو دابەش‌کردنیـــان خستووەتە پێش چاو ••• لەدوایشدا کورتە بەراوردێکی لەنێوان دیالێکتی خوارووو و ژووروودا کردووەو هەندێ تایبەتێتی فۆنەتیکی زمانی کوردی نیشانداوە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٢٨ ) •

**٦٦ – لەبارەی کوردناسییەوە لە ڕووسیاو یەکێتی ســــۆڤیت ، « گۆڤاری کۆڕی زانیـــاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغـــدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤٩٩ – ٥٦٨ •**

ئەم وتـارە جگە لـە باسی ئەو کارانەی دەربارەی مێژوو و ئەدەبو فۆلکلۆرو ئەتنۆگرافیای کورد لە ڕووسیاو یەکێتی سۆڤێت نووسراون ، هەروەها باسی ئەو بەرهەمانەش دەکا کە لەبارەی زمانی کوردییەوەن •

**٦٧ – لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »، بەشی یەکەم ، ب ٢ ، ژ ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٨١ – ١١٦ ؛ بەشی دووەم ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠٧ – ٢٤٠ •**

بەشی یەکەمی ئەم وتارە لەبارەی ( واتاناسی )یەوەیەو باسی « وشە ؛ جۆری وشە ؛ جۆری مانا ؛ پێوەندیی نێوان وشە ؛ وشەی هاوبێژ ؛ وشەی هاوواتا ؛ وشەی دژواتا ••• »ی تێدا کراوە ••• بەشی دووەم بـەنـاوی ( ئێتیمۆلۆژی )یەوەیەو لەبارەی « خێزانی زمانە ئێرانێکان »و « وشـەی کوردی پەتی »و « وشەی ئێرانی »و « وشەی بێگانە »و « وشەی مردە »و « وشەی نوێباو »ەوەیە ••• ئەم دوو بەشە بوونەتە بەشـێك لە کتێبی « وشەی زمانی کوردی » ( بڕوانە : باسی ژ ٧٠ ) •

**٦٨ – مووررووی مالاوسێ مەگەر بـە شــەو بکرێتە مل ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٩ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥١ – ٧٤ •**

ئەم وتارە ڕەخنەیە لە وتاری « خالبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی »ی د • کامیل بەسیر ( بڕوانە : باسی ژ ٤٤١ ) •

**٦٩ ـ وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ۱۹۷۷ ٠**

ئەم کتێبە ( ۱۰٤ ) لاپەڕەیەو برتییە لە تۆژینەوەو لێکۆڵینەوە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕووی وشەڕۆنانەوە پەیوەندییان بە وشەی کوردییەوە هەیە ، بەتایبەتی وەك : ( مۆرفێم ؛ جۆرەکانی مۆرفێم ؛ شێوەی مۆرفێم ؛ پێشگرو پاشگرو نیشانە ؛ ئینتەرفیکس ؛ ناوگر ؛ وشەی دارێژراو ـ ناوی دارێژراو ، ئاوەڵناوی دارێژراو ، کرداری دارێژراو ، ئاوەڵکرداری دارێژراو ؛ وشەی لێکدراو ـ ناوی لێکدراو ، ئاوەڵناوی لێکدراو ، کرداری لێکدراو ، ئاوەڵکرداری لێکدراو ... ) ٠

**۷۰ ـ وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ۱۹۷٥ ٠**

ئەم کتێبە ( ۱۲۷ ) لاپەڕەیە ٠ برتییە لە پێشەکی ( ل أ ـ ح ) و دوو بەش :

۱ ـ لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی :

أ ـ واتاناسی ( ل ٤ ـ ۲٤ ) ٠

ب ـ ئیتیمۆلۆژی ( ل ۲٥ ـ ٥۸ ) ٠

ج ـ فرێزیۆلۆژی ( ل ٥۹ ـ ٦۸ ) ٠

۲ ـ فەرهەنگنووسی و کاری فەرهەنگنووسیی کوردی ( ل ٦۹ ـ ۱۰۲ ) ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٥٥ ) ٠

**۷۱ ـ ( هەڵسەنگاندن ) ... بەڵێ ، بەڵام بەکام تەرازوو ؟ ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٦۱ ، بەغدا ، ۱۹۸۱ ، ل ٦٤ ـ ۷۱ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦۳ ، بەغدا ، ۱۹۸۱ ، ل ۸٤ ـ ۹۸ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٦٤ ، بەغدا ، ۱۹۸۱ ، ل ٥٤ ـ ٦۱ ٠**

ئەم نووسینە وەڵامی ئەو ڕەخنەیەی مامۆستا سەباح غالبە ، کە لە ژمارە ( ۸۱ )ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا بەناوی « کورتە

هەڵســـــەنگاندنێکی کتێبی ڕێزمانی کوردی »یەوە بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٣١٨ ) •

**٧٢ ـ هەوڵێکی سەرەتایی بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی ناســـیاوی‌و نەناسیاوی لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا ، گۆڤاری « زانکۆ » ، ب ٣ ، ژ ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٧ ، ل ١٢٢ ـ ١٦٦ •**

ناوەرۆکی ئـەم وتـا ، بـەم جۆرەیـە : « پێشـــــەکی ـ کورتـە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لەم مەیدانەدا کراون » ( ل ١٢٢ ـ ١٣٥ ) ؛ « پێشگرو پاشگرو نیشانە » ( ل ١٣٥ ـ ١٣٨ ) ؛ « نیشانەی ناسیاوی » ( ل ١٣٨ ـ ١٤٨ ) ؛ « نیشـــانەی نەناســـیاوی » ( ل ١٤٩ ـ ١٥٥ ) ؛ « پەراوێزو سەرچاوەو کورتە » ( ل ١٥٥ ـ ١٦٦ ) •

**٧٣ ـ هەوڵێکی مەزنی نوێ لە جیهانی فەرهەنگنووسیی کوردیـدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٧ ، شوباتی ١٩٨٤ ، ل ٢٢ ـ ٢٩ •**

ئەمە خستنە پێش‌چاوو لێدوان‌و هەڵســـــەنگاندنی ئەو فەرهەنگە کوردی ( کرمانجیی خواروو ) ـ ڕووســـی‌یەیە ، کە د • قەناتی کوردۆو د • زارێ یووســـف سالی ١٩٨٣ لە مۆســـــکۆ بڵاویان‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٥٢ ) •

**هـەروەهـا ژ : ٤٢٠ ، ٤٣٤ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ٧١١ ، ٧١٢ ، ٧٦٢ ، ٧٦٣ ، ١٠٧٣ ، ١٠٧٤ •**

## ئیبراهیم ئەمین باڵدار :

**٧٤ ـ ئەگەر گوڵ نەبیت ، دڕکیش مەبە ، گۆڤاری « پێشکـەوتن » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٤ ـ ١٧ •**

ئەمە وەڵامی وتاری مامۆستا ( ن )ە ؛ کــە لــە کتێبی « ئەلفوبێی نوێ »ی گرتبوو ( بڕوانە : باسی ژ ٦١٦ ) •

**٧٥ ـ خوێندن بە زمانی کوردی ، گۆڤاری « هیـوا » ، ژ ١١ ـ ١٢ ، ساڵی ٢ ، بەغدا ، ١٩٥٩ ، ل ٦ ـ ١٧ .**

ئەم وتارە لەم باسانە پێکهاتووە : « بۆچی ئەبێت بە زمانی کوردی بخوێنین » ; « زمانی شیری هۆی تێگەیشتن‌و دەربڕین‌و پێ‌گەیشتنە » ; « لەگەڵ خوێندن بە زمانی شیری ، کەی باشە دەست بە فێرکردنی زمانێکی دووەم بکرێت ؟ » ; « ئەوانەی دوور لە وڵاتی خۆیان ئەژین‌و بە زمانێکی‌تر قسەئەکەن‌و ئەخوێنن » ; « خوێندنی پلەی سەرەتایی بۆ پەروەردەکردن‌و پێ‌گەیاندنە ، نەك بۆ فێرکردنی زمانێکی دووەم » ; « زمانی کوردی زمانی گەلەکەمانە ، زمانی باووباپیرو گەنجینەکانی زانســـتی‌و مێژوومـانـە » ; « زۆری ڕۆڵەکانی کورد کۆڵن لە نووسین‌و خوێندنەوەی زمانەکەیانـدا » ; « بۆ ژیانەوەو پێش‌خستن‌و پەرەپێدانی زمانەکەمان » .

**٧٦ ـ زەنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیـــاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، بەرگی نۆیەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٧٨ ـ ١١١ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا بەناوی « ســــــەرگورشتەیەکی مێژوویی نووسین »ەوە هەندێ لە پەیدابوونی پیتە کوردییەکانی ئەلفوبێی عەرەبی دواوەو ئنجا باسی ئەو گیروگرفتانە دەکات ، کە ئەمڕۆ لە نووسینی هەندێ پیت‌و وشەدا هەیەو ڕای خۆی لەبارەیانەوە دەردەبڕێ .

## ئیبراهیم عومەر قازی :

**٧٧ ـ چاپەمەنیی تازە ، گۆڤاری « سلێمانی » ، ژ ١٠ ، ســـالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٩ ، ل ٢٥ ـ ٣٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا نامیلکەی « دەستووری نووسینی کوردی بـە پیتی عەرەبی »ی هەڵسەنگاندووە ، کە مامۆستا أ . ب . هەوری ساڵی ١٩٦٨ بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٧٨ ) .

د· ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم :

**٧٨ ـ ئامرازی گەیەنەر ( کە ) لە زمانی ئەدەبیی ئیمڕۆی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٨ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٦٦ ـ ٧٦ ·**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا کورتە گەشتێکی بەو کارانەدا کردووە ، کە لەبارەی ئامرازی ( کە )وە نووسراونو ئنجا لێکۆڵینەوەی خۆی لەم لایەنەوە : « ئامرازی گەیەنەر ( کە ) لە پێکهێنانی ئامرازی لێکدراو » ؛ « جێگای ئامرازی گەیەنەر ( کە ) لەناو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخوازدا » دامەزراوە ·

**٧٩ ـ تێبینێك لەعاست نووسین بە دیالێکتی سۆرانی زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨١ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣٦ ـ ٣٨ ·**

نووسەر لەم وتارەدا لەوە دواوە ، کە لە زۆر نووسیندا نیشانەی ( ˇ ) لەسەر یان لەژێر پیتەکانی ( و ، ی ، ل ، ر ) ، کە ( ۆ ، ێ ، ڵ ، ڕ ) دروست دەکات ، دانانێنو ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای وشە ·

**٨٠ ـ دەربارەی لێکۆڵینەوەی سینتاکسی زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧٠ ـ ٧٤ ·**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی لە زوربەی ئەو کارانە دواوە ، کە هەر لە زووەوە تا ئەمڕۆ لەبارەی سینتاکسی زمانی کوردییەوە نووسراون ·

**٨١ ـ ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٠ ·**

ئەم کارە ( ٢٠٤ ) لاپەڕەیەو دەربارەی بابەتێکی سینتاکسی زمانی کوردییە · لە بنچینەدا نامەی دوکتۆرییەکەیەتی کردوویە بە کوردی · ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٤٠٤ ) ·

**٨٢ - زاناى مەزنو ئێرانشناسى بەرز ف • س • ڕەســـتەرگویێڤەو كۆڕى كۆلینەوە لە زمانى كوردى ، گۆڤارى « ڕۆشنبیرى نوێ » ، ژ ٦٠ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٩ ـ ٦٠ •**

ف • س • ڕاستۆرگویڤا لەو كتێبەیدا كە ساڵى ١٩٧٦ لـە مۆسـكۆ بە ناوى « زانســـتى زمانى زمانـە ئێرانییەكان »ەوە بڵاوىكردووەتەوە ، بەتایبەتى لە باسى دیاردەى سوانو قرتاندندا نموونەو بەڵگەى زۆرى لـە زمانى كوردییەوە هێناوەتەوەو د • ئیبراهیم عەزیزیش ئەو بەشەى كردووە بە كوردىو بەم وتارە بڵاوىكردووەتەوە •

**٨٣ ـ كورتە پێش چاوخستنێكى نامەى دوكتۆراى كوردســـــتان عەبدولڕەحمان لەتیف ، گۆڤارى « ڕۆشـــنبیرى نوێ » ، ژ ٥٧ ، بەغـدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٣-ـ ٥٥ •**

ئەم وتارە نیشاندانێكى ناوەرۆكى نامەى دوكتۆرى د • كوردســتان موكریانىیە ، كە بە ناوى « دیارخەرو شــێوەكانى دەربڕینى پێوەندىیە دیارخەرىیەكان لە زمانى كوردیدا ( دیالێكتى ســــــۆرانى )یەوەیە • ( بڕوانە : باسى ژ ٨٥٧ ) •

**٨٤ ـ گیروگرفتى نووســـینى فرمان لەگەڵ ڕاناو ، « گۆڤارى كۆڕى زانیارى عێراق ـ دەســــتەى كورد » ، بەرگى نۆیەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٠ ـ ٤٨٨ •**

ئـەم وتـارە برىتىیە لە : « پێشـــــەكى » ( ل ٤٥٠ ـ ٤٥٢ ) ؛

« ١ ـ دەستنیشان كردنو دیارخستنى ڕاناوى لكاو » ( ل ٤٥٢ ـ ٤٥٩ ) ؛

« ٢ ـ چى لەبارەى ڕاناوى لكاوەوە نووسـراوە » ( ل ٤٥٩ ـ ٤٦٥ ) ؛

« ٣ ـ ئـەركى ڕانـاوى لـكاو لـەنـاو ڕســتەدا » ( ل ٤٦٥ ـ ٤٦٩ ) ؛

« ٤ ـ شـــوێنى ڕاناوى لكاو لەنـاو ڕستەدا » ( ل ٤٦٩ ـ ٤٧٨ ) ؛

« ٥ ـ جێگۆڕكێى ڕاناوە لكاوەكان لەناو ڕستەدا » ( ل ٤٧٨ ـ ٤٨٠ ) ؛

« ٦ - پێوەنـدی ڕانــاوی لـکاو بـە فرمـانـەوە » ( ٤٨٠ - ٤٨٢ ) ؛
« ٧ - پێوەلکانی ڕانـاوی لـکاو بـە فرمـان پێویـستـە » ( ل ٤٨٣ ) ؛
« ٨ - پێوەلکانی ڕاناوی لکاو بە فرمان پێویست نی‌یە » (ل ٤٨٣ - ٤٨٤) ؛
« ٩ - ئەنجام » ( ل ٤٨٤ - ٤٨٨ ) •

**٨٥ - نووسینی پیتی ( ڕ ) بە گرافیکای عەرەبی لـە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٦٣ - ٦٤ •**

ئەم وتارە باسی جیاوازیی چۆنیـەتی دەربڕین و بەکارهێنانی ( ر )ی لاوازو ( ڕ )ی قەڵەو دەکات •

**٨٦ - وردبوونەوە لـە چەنـد ئامرازێکی زمـانی کوردی ، گۆڤـاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ١ ، سالی ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ٧١ - ٧٤ •**

نووسەر لەم باسەدا دەربارەی هەندێ ئامرازی وەك : ( ب ، دە ، دا ، رێ ، ە ، ر ، راو ، بۆ ، ە ، لەگەڵ ، لـە ، بـە ، خۆزگە ، بریـا ، کاشکی ، ئەرێ ••• )ی کردووە •

**٨٧ - هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبیی ئیمڕۆی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٠ •**

ئەم کتێبە ( ٩٣ ) لاپەڕەیەو لە پێشـــــەکی‌و چوار بەش‌و ئەنجام پێکهاتووە : بەشی یەکەم سەبارەت مێژووی باســەکەیە ( ل ٥ - ٢٠ ) • بەشی دووەم لە ئامرازەکانی سینتاکسی بەگشتی دەدوێ‌و باسی ئەم بابەتانە : ( زاراوەی ئامراز ؛ پێناسەی ئامراز ؛ لەڕووی دروست‌بوون‌و ئەرکەوە ) دەکات ( ل ٢١ - ٢٩ ) • بەشی سێیەمی دەربارەی ئامرازی پەیوەستدارە لەڕووی زاراوەو جۆرەکانییەوە ( ل ٣١ - ٤٩ ) • بەشی چوارەمی لەبارەی ئامرازی گەیەنەرەوە دەدوێ‌و زاراوەو جۆرەکانی دەخاتە ڕوو ( ل٥١-٧٢ ) ••• ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٥٧ ) •

**٨٨ ـ هەندێ بابەت لە سینتاکسی زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٣ ، هەولێر ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٢ ـ ١٠ .**

ئەم وتارە بەکورتی باسی ئەم بابەتانە : « ١ ـ ڕستە ؛ ٢ ـ ڕستەی یەك بناغەیی ؛ ٣ ـ ڕستەی دوو بناغەیی ؛ ٤ ـ بەشەکانی ڕستە ؛ ٥ ـ بکەر ؛ ٦ ـ فرمان ـ گوزارە ؛ ٧ ـ بەرکار ؛ ٨ ـ دیارخەر ؛ ٩ ـ ئاوەڵناو ؛ ١٠ ـ بینای بەرکار ؛ ١١ ـ جیاوازیی نێوان بینای بکەرو بینای بەرکار » دەکات .

**هەروەها ژ : ٤٢٣ ، ٤٢٤ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ .**

## ئیبراهیم محەمەد کەریم :

**٨٩ ـ وردبوونەوەیەك لە فۆنەتیکی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٥٥ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٨٥ ـ ٨٩ .**

ئەم وتارە بریتییە لە هەندێ سەرنجو تێبینیو ڕوونکردنەوە دەربارەی کتێبی « فۆنەتیکی زمانی کوردی »ی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی ( بڕوانە : باسی ژ ٥٣٧ ) .

**٩٠ ـ « ( برایەتی ) یا ( برایی ) » ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٥ .**

لەم وتارەدا ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە بۆ « التآخی » عەرەبی ، وشەی « برایەتی » لە « برایی » لەبارترو ڕاسترە .

## ئیسماعیل تاها شاهێن :

**٩١ ـ ڕەوشا هەر زمانەکی سڤکییە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١١٦ ـ ١٢٠ .**

ئەم وتارە باسی تێداچوونو سوانو بە یەکتر گۆڕینەوەی هەندێ دەنگ دەکات لە زمانی کوردیدا .

ب . :

**٩٢ ـ چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤاری « هیوا » ، بەشی یەکەم ، ژ ٤ ، سـالی ١ ، بەغـدا ، ١٩٥٧ ، ل ١٠ - ١٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ٨ ـ ١٩ .**

نووسەری ئەم وتارە دەربارەی جۆری لێکۆلینەوەی ڕێنووسی کوردی دواوەو باسی ئەو مەرجانەی کردووە کە دەبێ لە چاکترین ئەلفوبێدا هەبن . دوای لێکۆلینەوە لە نووسین بە پیتی عەرەبی‌و لاتینی ، بە بەلگەی ڕاست‌و زانستی ئەوەی نیشانداوە کە ئەلفوبێی لاتینی لەگەل زمانی کوردیدا پتر دەگونجێ .

**٩٣ ـ فرمانی ئێستەمان ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٩ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٧ - ١٨ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی پەیدابوونی چوکلەو پیت بۆ دارشتنیانی کردووەو ئەو قۆرتانەشی نیشانداوە ، کە لە ڕێنووســـی کوردیدا هەن ؛ لەبارەی ئەو فرمانانەشەوە دواوە ، کە لەســـەر شـانی خوێندەوارانن .

( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ١٥١ ) .

**هەروەها : ژ : ١٠٠ ، ١٠١ .**

## بائیز عومەر ئەحمەد :

**٩٤ ـ ( را )و ( ڕا ) ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٣ ، هەولێر ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٢١ - ٢٣ .**

ئەم وتارە باسی زوربەی ئەو حالەتانەی کردووە لە زمانی کوردیدا ، کە ( را )و ( ڕا )یان تێدا بەکاردەهێترێ .

باخەوان :

**٩٥ ـ کوردیی پەتی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٤ ، ســـالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٣٨ ـ ٣٩ •**

ئەم کورتە وتارە باسی دەولەمەندیی زمانی کوردی دەکـاتو گلەیی لەو بارە دەکا ، کە بووە بە هۆی ئەوەی هەندێ فەرمانبەران ئاخاوتنیـان پڕ وشەی عەرەبی بێت •

ڕ• بارناس :

**٩٦ ـ ڕاستنفیسینا کوردی ، گۆڤـاری « هیـوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٢٥ ـ ٢٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو ئەلفوبێیانەی کردووە ، کـە کورد بەکاریاندێنن‌و بایەخی بەوەی میر جەلادەت بەدرخان داوەو لـە چۆنیەتی نووسینی هەندێ کرداری کۆلیوەتەوە •

باوکی شوان :

**٩٧ ـ زمانی کوردی لـە ناوچەی بادینانـدا ، گۆڤاری « هەتـاو » ، ژ ١٠٢ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ ـ ٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا گلەیی لەوە دەکا ، کە لە ناوچەی بادیناندا بایەخ بە زمانی کوردی نادرێ •

باوکی میدیا :

**٩٨ ـ زمانی کوردی زمانێـکی زینـدووە ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٤ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١١٠ ـ ١١١ •**

نووسەر لەم وتارەدا دژی ئەو پڕوپاگندەیە وەســـتاوە ، کە دەڵێ زمانی کوردی زمانێکی زیندوو نی‌یە ••• ســـەبارەت بە دەولەمەندیو

خۆشیی زمانی کوردی هەندێ دواوەو وتەی چەند زاناییەکیشی کـردووە بـە بەڵـگە •

**٩٩ – شـــێوەکانی زمـــانی کوردی پەلاناگرێ بێ ئەوەی کۆزمانێـــکی کوردی پێکنەهێنرێ ، گۆڤـاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٢ ، ســـالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٧٥ – ٧٦ •**

ئەم کورتە وتارە هاندانی نووسەرانە بۆ دەســـت بـە ســـازکردنی زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی •

## بلـــە :

**١٠٠ – وتەی پێشکەش‌کردن ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سالی ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٣٩ ، ل ١ – ٢ •**

ئەم وتارە هەلی بۆ لێدوانو دەربڕینی بیروباوەڕ ســـــەبارەت بـە ڕێنووسیی کوردی هەڵخستووەو بەوبۆنەیەوە وتوویە : « یەکێـك لـەو قۆرتە گەورانەی دێتە ڕێی نووسیاری کوردی چەشنی نووسین ( املا )یەو ئەمە بەڕاستی شایانی سەرشۆڕیو تەریق‌بوونەوەیە کە هێشتا چەشـــنێك نووسینی تایبەتی نی‌یە کە زمانی کوردی پێ بنووســـرێ ••• یەکێ لـە نیازەکانی گەلاوێژ ئەوەیە کە ماوەی تێ‌گەیشتوانو پێگەیشتووە زاناکانی کورد بدات لەم بابەتەوە بیری خۆیان بنووسن ، بەشکوو لەم پاشاگەردانی نووسینە ڕزگارمان بێ » •

**١٠١ – خۆپاراستن لە لایەنگیریی ناڕاستی ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ٥ – ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٦ – ١١ •**

مامۆستا بلە لەم وتارەدا بەوردیو ڕاستی باسی مێژووی پەیدابوونی هەندێ پیتو نیشانەی کردووەو بێ‌لایەنانە هەقی بەوانە داوە ، کـە لـەو مەیدانەدا کاریان کردووە •

**هەروەها ژ : ٩٢ ، ٩٣ •**

د. بەدرخان سندی :

**١٠٢ - ( ئەز ) ئو ( من ) د ئەزمانێ کوردیدا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، بەرگی دەیەم ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ١٣٣-١٥٣ .**

د . بەدرخان لەم وتارەدا دوو دەســـــتە جێناوی کەسیی جودای دەســـــتنیشـــــان کردووە ( ١ - « ئەز »و ئاوەڵەکانی ؛ ٢ - « من »و ئاوەڵەکانی )و دەستووری هەر کۆمەڵێکیانی باس کردووە .

**هەروەها ژ : ٦٩٤ .**

م. بەرزنجی :

**١٠٣ - فێربوونا زمانێ کوردی بێ مامۆستە ، بەیرووت ، ١٩٧٩ .**

« کۆمەلا زانستی جڤاکی کوردی - الجمعیــة الثقافیــه الاجتماعیه الکردیه » لە بەیرووت ئەم کتێبەی م . بەرزنجی بڵاوکردووەتەوە . ئــەم کارە کە بۆ فێربوونی زمانی کوردییە ، بەمجۆریە : لەسەرەتادا پیتەکانی کوردی نیشاندراوەو هەندێ زانیاری لەبارەیانەوە وتراوە . لــە لاپــەڕە ( ١٠ )دا باسی جیاوازیی نێرو مێ کراوەو لە لاپەڕە ( ١٠ - ١٨ )دا زانیاری سەبارەت بە جێناوەکانو جۆریانو دەوریان دراوە . نموونە بــۆ هەندێ بەشە ئاخاوتنیتر هێنراوەتەوە ... ئەو وشـــانەی ســـەر بە خواردنو چێشتخانەو ئاوو هەواو شارو ماڵو هاتوچۆ ... ن نووسراون . شێوەی ئەم کتێبە وەك فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردییە . هەرچی بەشـــــــــە کوردییەکەشێتی بەشێوەی کرمانجیی ژووروەو دوو ڕیزە : ڕیزی یەکەم بــە ئەلفوبێی عەرەبییــەو ڕیزی دووەم بـــە ئەلفوبێی لاتینییە . تێکڕای کتێبەکە ( ١٠٨ ) لاپەڕەیە .

بەکر دلێر :

**١٠٤ ـ ناوناني المجمع العلمي الكردي ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان »، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٠ ـ ٦١ .**

لە ناوی « کۆڕی زانیاری کورد » دەدوێ‌و وا بەڕاســـت دەزانێ ، ناوبنرێ « کۆڕی زانستی کوردی » .

بەهجەت محەمەد هەروری :

**١٠٥ ـ ئـەو پەیڤێن ژ دوو ڕامانـاو پتر هەیـن د زمانێ کوردیدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٧ ، هەولێر ، شوباتی ١٩٨٤ ، ل ٣٢ ـ ٣٥ .**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی ئەو وشانە دەکات کە دوو مانا یان زیاتر دەبەخشن‌و کۆمەڵێ نموونەی هێناوەتـەوەو شەرحی‌کردوون .

س . م . بەهرامی :

**١٠٦ ـ بەرەو یەکێتی زمـانی کوردی ، گۆڤاری « هەتـاو » ، ژ ٣٠ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١٨ .**

ئەم نووســـینە بریتی‌یە لـە هەندێ وشـــەی کرمانجیی ژووروو و خواروو ، کە بەرانبەر یەك نووسراوون .

**١٠٧ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٤٤ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٤ .**

مامۆستا بەهرامی بۆ خزمەتی یەکێتی زمان چەند وشەیەکی هەردوو شـــێوەی کوردی ـ کرمانجیی ژووروو و خواروو ـ ی بە تەرجومەی عەرەبی‌یەوە بلاوکردووەتەوە .

**١٠٨ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ٣٣ ، ساڵی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٨ .**

لەم وتارەدا هەندێ وشەی کرمانجیی ژووروو و خواروو بەرانبەر یەك نووسراون .

## بەهزاد :

**١٠٩ ـ چاوگی گوێربووەوە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٢٤ ـ ٢٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی هەندێ لەو چاوگانە دەکات ، کە لە بنچینەدا بەسادەیی‌و بێ‌یارمەتی هیچ وشەیەکی‌تر مانای تەواوی سەربەخۆیان هەبووەو لەڕستەدا بۆ ڕۆنانی دەمە جیاجیاکانی کردار بەکارهێنراون بەڵام لە ئاخاوتن‌و نووسینی ئێستادا گۆڕاون‌و بە شێوەی بنچینەیی جارانی خۆیان نەماون .

## بەهمەن فارڤار سۆران :

**١١٠ ـ ڕێزمان ( دەستووری زەبانی کوردی ) ، تاران ، ١٩٨٢ .**

ئەم کتێبە ( ٨٧ ) لاپەڕەیەو باسی ڕێزمانی کوردی دیالێکتی کرمانجیی خوارووەو لە دوو بەش پێکهاتووە : ١ ـ فۆنەتیك ، ٢ ـ مۆرفۆلۆژی .

## بەیاد عەبدولقادر :

**١١١ ـ پێداچوونەوەیێکی خێرا بە چەند لایەنێکی دەنگسازیی زمانی کوردیدا ، گۆڤاری (( کاروان )) ، بەشی یەکەم ، ژ ٣٩ ، هەولێر ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٥ ، ل ٢٥ ـ ٣١ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی کێشەکانی دەنگسازیی زمانی کوردیو پێشکەوتنی دەنگەکانی زمانی کوردیو کاری زمانی بێگانەو ڕەنگدانەوەی بۆ سەر زمانی کوردیو دەنگەکانی ( ح ، ع ، غ ، ق ، س ، ص ، نگ ... )ی کردووە .

« بەیان » :

**١١٢ – ئەرکی بەیانو ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢٧ ، ١٩٧٥ ، ل ١ – ٣ و ٢٦ .**

ئەم وتارە دەربارەی هەوڵی چاککردنی ڕێنووسی کوردییەو ڕێنووسی کۆڕی زانیاری کوردی پەسەند کردووەو کورتەیەکی بڵاوکردووەتەوە .

ئاکیزە ڕەفیق حیلمی :

**١١٣ – بووژاندنەوەی زمان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٤٣ – ١٩٧ .**

ئەم وتارە هەندێ ڕووی زانستی زمانی باس‌دەکاو وا دادەنێ کە زمانەوانانی کورد دەبێ بەپێی ئەو ڕێبازانە خەریکی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بن ... ئنجا لە دەنگەکانی زمانی کوردیو باری ڕێزمانیی وشەو ڕستەی کوردی دواوە .

**١١٤ – بەزمی ڕێزمانو زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦١ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥ – ٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا هێرشی بردووەتە سەر تێکڕای ئەوانەی دەربارەی زمانی کوردی نووسیویانەو هەموو لایەکی بە ناشیو نەزان لەقەڵەمداوە .

**١١٥ ـ دیسانەوە لەگەڵ کاک طاهیر صـــادق ، گۆڤاری (( هیوا )) ، ژ ٣٢ ، ساڵی ٥ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٣٠ ـ ٣٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی مامۆســتا طاهیر صــادق دەداتەوە ســـەبارەت بە نووســینی هەندێ وشەی لێکدراوو ڕای لەگەڵ بۆچوونەکانیدا ناگونجێ . ( بڕوانە : باسی ژ ٣٢٥ ) .

**١١٦ - ڕێزمانو مێژووی زمانی کوردی ، (( دەفتەری کوردەواری )) ، ب ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٣٣ ـ ٤٠ .**

د . پاکیزە لـەم وتارەدا باســی ئەو بەرهەمانـەی کردووە ، کــە ڕۆژئاواییەکان لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسیویانە .

**١١٧ ـ زمانی پەسەندکراو ، گۆڤاری (( زانیاری )) ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٤٨ ـ ٥٤ .**

نووســەر لـە سەرەتادا ڕوونی کردۆوەتەوە ، کە زمــانی ئەدەبیی یەکگرتوو چییەو ئنجا باسی ئەو ڕێگایانەی کردووە ، کــە دەبنــە هۆی پەیدابوونی ... لە کۆتاییشدا لە زمانی ئەدەبیی کوردیو گیروگرفتەکانی دواوە .

**١١٨ ـ زمانی کوردی ، (( دەفتەری کوردەواری )) ، ب ٣ ، بەغــدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٠٤ ـ ١١٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی خێزانی زمانە هیندو ئەوروپاییەکانو ئەو دەورانەی زمانە ئێرانییەکانی پێدا تێپەڕیون کردووەو شوێنی زمانی کوردی لەم خێزانەدا دەستنیشان کردووە .

**١١٩ ـ لەکوێوە دەستبکەین بە دەستوورسازیی ڕێزمــانی کوردی ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد )) ، بەشی یەکەم ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغــدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٨٠ ـ ٢١١ ؛ بەشی دووەم ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغــدا ، ١٩٧٤ ، ل ٣٢٤ ـ ٣٦٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەو ڕایەدایە ، کە دەبێ بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لـە ئاوێــستاوە دەســـتپێبکرێ . بەوبۆنەیەوە بـە ناوی

« وردبوونەوە لە زمانی ئاقستا »وە هەندێ لە مێژووی لێکۆڵینەوەو پیتی نووسینی ئاوێستا دواوە • لە بەشی دووەمدا لە تێکڕای دەنگە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانو نیمچە بزوێنەکانو بزوێنە دوولانەکـانی زمانی ئاوێســــتا دواوەو لە کۆتاییشدا باسی خێزانی گەورەی زمانە هیندو ئەوروپاییەکانی کردووەو شوێنی زمانی کوردی لەناو ئەو خێــزانــە گەورەیەدا دیاری کردووە •

۱۲۰ – وەلامێکی زمانەوانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۳۲ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ۱۹٦۱ ، ل ۲۸ – ۳۲ •

لەم وتارەدا ئەگەرچی کەمێ رەخنە لە مامۆستا طاهیر صادق گیراوە ، بەلام بەگشتی لایەنی پێشنیارەکەی گیراوە ، کە بۆ ئەو ( ك )و ( گ )انەی لەپێش ( ی ، ێ ، وێ ، وی )یەوە دینو شـێوەی دەربڕینیان دەگۆڕێ ، پیتی تایبەتی دابڕێژرێ : ( بڕوانە : باسی ژ ۳۲٤ ) •

« پۆستەی خوێندەوارە بەرزەکان » :

۱۲۱ – گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٥ ، سالی ۱ ، بەغــدا ، ۱۹٥۸ ، ل ۱۲ – ۱٤ •

لێرەدا کۆمەلێ وشەی کوردی بلاوکراونەتەوە ، کە مامۆســــــتا عەبدولخالق حسەین جەباری ناردوونی • گۆڤاری « پێشکەوتن »یش لـە هەندێکیان دواوە •

« پۆستەی خوێنەران » :

۱۲۲ – گـۆڤـاری « پەیــام » ، ژ ۹٦ ، ب ۲ ، بەغـــدا ، ۱۹٥۱ ، ل ۱٦ – ۱۷ •

لە ( پۆستەی خوێنەران )ی ئەم ژمارەیەدا وەڵامی پرسیاری مستەفا محەمەد لەبارەی چۆنیەتی هەندێ وشـەی عەرەبی بە ڕێنووسی کوردیو لێکدانەوەی مانای چەند وشەیەکی کوردی‌یەوە بەرچاو دەکەوێ •

**١٢٣ – گۆڤـاری « پەیـام » ، ژ ١٢١ ، ب ٤ ، بەغـــدا ، ١٩٥٢ ، ل ١٧ – ١٨ •**

ع • شێخ صالح ویـستوویەتی بزانێ شـێوەکانی زمـانی کوردی کامەن • لە وەڵامدا بە دوورو درێژی باسی شـێوەکانی زمـانی کوردی کراوە •

**١٢٤ – گۆڤـاری « پەیـام » ، ژ ١٩٥ ، ب ٤ ، بەغـــدا ، ١٩٥٣ ، ل ١٧ – ١٨ •**

لێرەدا باسی ئەوە کراوە ، کە بۆ ئەوەی نووسـینی کوردی بـە بێ تەگەرەو بە ڕاستو ڕەوانی بێت ، چەند پیتێکی نوێیان بۆ چاپی کوردی هێناوە • لە کۆتاییشدا باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو پیتانە کراوە •

**١٢٥ – گۆڤـاری « پەیـام » ، ژ ١٩٧ ، ب ٤ ، بەغـــدا ، ١٩٥٣ ، ل ١٣ – ١٤ •**

محەمەد طاهیر ڕەضـــا داوای لە گۆڤاری « پەیام » کردووە ، پتر شەرحی ئەو پیتو نیشانە نوێیانە بکرێ ، کـە گۆڤاری « پەیـام » لـە ژمارە ( ١٩٥ )دا لێیان دوابوو • گۆڤاری « پـەیـام »یش لـە وەڵامـدا لێیان‌دواوە •

**١٢٦ – گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٢٠١ ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٥٣ ، ل ٥ •**

لێرەدا « پەیام » لەبارەی چۆنیەتی نووسـینی دیفتۆنگی ( وێ )و ( ڕ )ی قەڵەوو ( ی )ی ئیزافەی بەدوا بزوێندا هاتووەوە بۆ صـەلاحەدین عومەر دەدوێ •

**١٢٧ - گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٢١٧ ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٥٣ ، ل ٤ .**

ئەمە بریتیە لە لێکدانەوەی هەندێ وشەی کوردیو فارسی لەسەر داوای غەمگین ناوێك .

**١٢٨ - گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٢٥٤ ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٤ ، ل ٦ - ٧ .**

لە لاپەڕە ( ٦ )دا وەلاّمی پرسیارەکانی حەمە سەعید عەودالاّنی داوەتەوە ، کە دەربارەی ڕێنووسی گۆڤاری « پەیام »و مانای چەند وشەیەکەوە کردبوونی . لە لاپەڕە ( ٧ )یشدا مانای هەندێ وشەی بۆ محەمەد فەوزی لێکداوەتەوە .

## « پەروەردەو زانست » :

**١٢٩ - هەندێ تێبینی لەسەر ئیملای کوردی ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٧٦ - ٧٨ .**

ئەم وتارە کە باسی چۆنیەتی نووسینی « وشەی عەرەبی »و « بڕگەی ( دوو ) ، ( یی ) »و نیشانەی « دە / ئە »و « پرپۆزیشنی ( دا ) »و « نیشانەی ( تر ) ، ( ترین ) »و « وشەی لێکدراو »و « واوی پێوەندی »و ... هتد دەکات ، ڕێنمایی یە بۆ ئەو لیژنانەی کە کتێبی قوتابخانەکان دەگۆڕنە سەر زمانی کوردی .

## « پەیام » :

**١٣٠ - ( پەیام ) لە بنچێکی ( ئاوێستا )ییەوە هاتووە ، گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٢٧٣ ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٤ ، ل ٧ .**

ئەم نووسینە دەربارەی ئەسلی وشەی ( پەیام ) دەدوێو بە وشەیێکی کوردی ڕەسەنی دادەنێ .

پیرۆت :

**١٣١ - کوردی‌و فارسی ، گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٢٧٧ ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٥٥ ، ل ١٤ ٠**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ ، کە وێکچوونی هەندێ وشـــەی کوردی‌و فارسی، ئەوە ناگەیەنێ کـــە یەك زمـــانن ، بـــەڵـــکو هەریەکـــە زمانێـــکی سەربەخۆیە ٠

**١٣٢ - لە نووسینی کوردیدا لەمیرتان نەچێ ، گۆڤـــاری « پەیـــام » ، ژ ٣٠٢ ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٥٥ ، ل ١١ ٠**

ئەمە نیشـــانداێکی کورتی چۆنیەتیی نووســـــینی هەندێ دەنگی کوردی‌یە ٠

**١٣٣ - کوردی بە چی حەرفێ بنووســــــــــرێ ، گۆڤاری « دیاریی کوردســـــــــتان » ، ژ ١١ - ١٢ ، بەغدا ، ٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ - ١١ ٠**

خاوەنی وتـــار لـــە سەرەتادا کۆمەڵێ کۆسپ‌و گیروگرفتی ئەلفوێی عەرەبی خستووەتە پێش‌چاوو ئنجا لە ئەنجامدا بۆ نووســــــینی کوردی بەکارهێنانی ئەلفوێی لاتینی پەسەندکردووە ٠

پیرەمێرد :

**١٣٤ - زمانی کوردی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سالی ١ ، ژ ٣ ، بەغدا ، ١٩٤١ ، ل ٤٩ - ٥١ ٠**

پیرەمێرد لەم وتارە کورتەدا کەمێ باسی ئاوێستاو دەوڵەمەندیی زمانی کوردی‌و پێویستیی نووسینی کوردیی پەتی کردووە ٠

« پێشـــەکی » :

**١٣٥ - گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٤ ، سالی ٢ ، بەغـــدا ، ١٩٧٤ ، ل ٣ - ٥ ٠**

بەشی زۆری ئەم ( پێشەکی )یە باسی ئەو هەوڵانەیە کە لە مەیدانی داتانو دارشتنی زاراوەی کوردیدا دراون •

## تۆفیق وەهبی :

**١٣٦ – ئەسلی پیتە قالبی ( ئە )ی شێوەی سلێمانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٩ – ٣٨ •**

ئەم وتارە بریتییە لەم باسانە : پێشەکی – « چاوخشاندنێکی مێژوویی بەشێوەی سلێمانیدا » ( ل ٩ – ١٦ ) ؛ « چی یان وتووە لەبارەی ئەسلی ( دە )و ( ئە )ی پیتە قالبییەوە ؟ » ( ل ١٦ – ٢٠ ) ؛ « ( ئە )ی پیتە قالبی دیارە کە لە ( دە )وە گۆڕاوە » ( ل ٢١ – ٢٣ ) ؛ « باوەڕی خۆم لەبارەی پیتە قالبی ( دە )و ( ئە )وە » ( ل ٢٣ – ٢٩ ) ؛ « زمانە ئەدەبیەکەمان چۆن تواناو ئاساتر بکەین » ( ل ٢٩ – ٣١ ) ؛ « سێ پێشنیارە پێشەکیەکە » ( ل ٣١ – ٣٤ ) ؛ « کورتەی وتار بە عەرەبی » ( ل ٣٥ – ٣٨ ) •

**١٣٧ – باکوور – شیمال ؛ نیوەڕۆ – جنوب ، گۆڤاری « دەنگی گێتی ی تازە » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ ، ل ٤٤ – ٥٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە ، کە ڕەخنەیان لە بەکارهێنانی دوو زاراوەی ( باکوور )و ( نیوەڕۆ ) لە بەرانبەر ( شمال )و ( جنوب ) گرتبوو • مامۆستا وەهبی بۆ ئەم مەبەستە گەشتێکی بە هەندێ زمانی ئەوروپاییو ئێرانیدا کردوومو لەئەنجامدا ئەو دوو زاراوەی بە دوو زاراوەی لەبار داناوە •

**١٣٨ – بنچو بناوانی زمانی کوردی لە تویکلە گوتێکدا ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٢ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٣٩ – ٤٤ ؛**

**بەشی دووەم ، ژ ٤ ، ســـالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٢ ، ل ٣٥ – ٣٨ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٥ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٣٥ – ٤٠ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٧ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٤٣ – ٤٦ .**

مەبەستی مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم زنجیرە وتارەدا نیشـــاندانی ئەسلی زمانی کوردی‌یەو بە بەڵگەی زانـــستی‌یەوە دژی ئەو بیروڕایانــە وەستاوە ، کە زمانی کوردی دەبەنەوە سەر فارسیی کۆن یان پەهلەوی یان فارسیی نوێ .

نووسەر بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەی لە بەشی یەکەمی وتارەکەیدا لەبارەی «نەتەوەکانی هینـــدو ئەوروپایی » و « هینـــدو ئێرانی » و « بـەرەی زمانەکانی بانی ئێران »ەوە دواوە ... بەشی دووەم لەبـارەی « زمـانی فارسیی کۆن » و « فارسیی ناوەڕاست – پەهلەوی »یەوەیە ... لە بەشی سێیەمدا باسی تیرەی زمانی « پەهلەوی » و « فارسیی نوێ » کراوە ... باسی « زمانی ئاویستایی »و بەراوردکردنی لەگەڵ سانسکریتی‌و فارسیی کۆندا کەوتوونەتە بەشی چوارەمەوە ... ئەم وتارە تەواونەکراوەو لـــە کۆتایی بەشی چوارەمدا نووسراوە « ماوێتی » .

**١٣٩ – بۆ جەنابی مامۆستا ســـەعید صـــدقی‌ی بەڕێز ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٨ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ – ٦ .**

نووســـەر لێرەدا کەمێك باسی ســـەرچاوەی پەیدابوونی هەندێ نیشانەی سەر پیتەکانی کوردی کردووە .

**١٤٠ – بەختیوکردنی زمانەکەمان بـە وشـــەی ویـژە ، گۆڤـاری « پێشکەوتن » ، ژ ٤ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١ – ٣ .**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی نیشانداوە ، کە بەکارهێنانی وشـــەی « وێژە » بە مانای « ئەدەب » ڕاست نی‌یە ( لـە بارەیەوە بڕوانـە : باسی ژ ٩٩٦ ) .

**١٤١ ــ بەرامبەر بە ( غارە )ی عەرەبی لە کوردیا چی وشــــەیەك بەکاربهێنین ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٣ ، ســـالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٤٥ ــ ٤٨ •**

مامۆستا وەهبی لەم وتارەدا وەلامی ئەوە دەداتەوە ، کــە یەکێ لــە نووسەکانی ڕەخنەی لێ گرتووە ، کە وتوویەتی وشەی « ڕەوکردو » لــە کوردیدا بە واتای « غارە » نییە ، بەلکو مانای « لەترســـا ڕاکردن ، گێچکردن »ە ••• نووسەر بۆ وەلام گەشـــتێکی بە زمانی پەهلەوی‌و ئەویستایی‌و فارسیی نوێ ••• دا کردووەو بۆ پێســـەلماندنی ڕاســـتیی بەکارهێنانی ئەو وشەیە هەندێ نموونەو بەلگەی هێناوەتەوە •

**١٤٢ ــ پسپۆڕ ( ئازا ــ زات ) ، شـــارەزا ، گۆڤاری « دەنگی گێتی‌ی تــازە » ، ب ١ ، ژ ٣ ، بەغدا ، کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ ، ل ٣٧ ــ ٣٩ •**

نووسەر لێرەدا بە بەلگەی مێژوویی لە پەیدابوون‌و گەشـــەکردنی وشەی ( پسپۆڕ )و ( ئازا ــ زات )و ( شـــــارەزا ) لــە فارسـیی کۆن‌و ناوەڕاست‌و نوێ‌و لە زمانی کوردیدای کۆلیوەتەوە •

**١٤٣ ــ پیرەمەگروون ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٨ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١ ــ ٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەولی‌داوە ئەسلی وشــەی « پیرەمەگروون » ساغ بکاتەوە •

**١٤٤ ــ خوێندەواری باو ، بەغدا ، ١٩٣٣ •**

ئەم نامیلکەیە ( ٤٤ ) لاپەڕەیەو باسی چەشن‌و کاری پیتەکان دەکا بە لاتینی‌و لەڕێی هەندێ مەشق‌و دەرزەوە لە ڕێنووس دەدوێ •

**١٤٥ ــ دەستوور ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ ــ ٧ •**

نووســــەر لەم وتارەدا لــە چۆنیەتی نووسینی هەندێ ئــامــرازو وشــە دواوە •

**١٤٦ ــ دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ ٠**

ئەم کتێبە ( ١١٤ ) لاپەڕەیە ٠ لە سەرەتادا باسی ئەلفوبێی کوردیو دەنگەکانی کوردی کردووە ( ل ١ ــ ١٠ ) ؛ ڕستەو گرێو بەشـــەکانی ئاخاوتن ( ل ١١ ــ ٣٠ ) ؛ ناو ( ل ٣١ ــ ٦٠ ) ؛ ئاوەڵناو ( ل ٦١ ــ ٨٢ ) ؛ جێناو ( ل ٨٢ ــ ١١٤ )[٣] ٠

**١٤٧ ــ دەستووری زمانی کوردی ، گۆڤاری (( دەنگی گیتی‌ی تازە )) ، بەشی یەکەم ، ب ١ ، ژ ٢ ، بەغدا ، تشرینی دووەمی ١٩٤٣ ، ل ٣٩ ــ ٤٢ ؛ بەشی دووەم ، ب ١ ، ژ ٣ ، بەغدا ، کانوونی یەکەمی ١٩٤٣ ، ل ٤١ ــ ٤٤ ؛ بەشی سێیەم ، ب ١ ، ژ ٤ ، بەغدا ، کانوونی دووەمی ١٩٤٤ ، ل ٤٢ ــ ٤٤ ؛ بەشی چوارەم ، ب ١ ، ژ ٥ ، بەغدا ، شـــوباتی ١٩٤٤ ، ل ٤٢ ــ ٤٤ ؛ بەشی پێنجەم ، ب ١ ، ژ ٦ ، بەغدا ، مارتی ١٩٤٤ ، ل ٤٣ ــ٤٥ ؛ بەشـــی شەشەم ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، نیســـــانی ١٩٤٤ ، ل ٨٤ ــ ٩٢ ؛ بەشی حەوتەم ، ب ٢ ، ژ ٢ ، بەغدا ، مایسی ١٩٤٤ ، ل ١٨١ ــ ١٨٦ ٠**

نووسەر لە سەرەتای بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا کەمێ لە ( زمـان )و ( ئاخاوتن )و ( نووسین )و ( وشە )و ( کـەرت )و ( پیت ) دواوەو دوایی بە دوورودرێژی باسی تێکڕای پیتە بزوێنەکانی زمانی کوردی کردووە ٠٠٠ سەرپاکی بەشی دووەم دەربارەی ڕســـتەی هەمەجۆری کوردی‌یە ٠٠٠ لە بەشی سێیەمدا بەکورتی لە هەموو بەشەکانی ئاخاوتن دواوە ٠٠٠ بەشی چوارەم بە ناوی (( تەواوکردن ))ەوەیەو لەم مەسەلانە دواوە : (( تەواوکردنی ناوو بۆنـاو ؛ تەواوکـردنی فیعل ؛ تـەواوکردنی تەواوکەر ؛ تەواوکردنی دوولایی )) ٠٠٠ بەشی پێنجەم بریتی‌یە لەم باسانە : (( وشەی سادە ؛ وشەی لێکدراو ؛ گرێ ؛ چەشنەکانی گرێ ؛ هاوتا ؛ ڕستەی ســـادە ؛ ڕســتەی

---

(٣) لە ژمارە ( ١٩٧ )ی سالی ( ٤ )ی ڕێکەوتی ( ١٢ )ی ئەیلوولی ســـالی ( ١٩٢٩ )ی ڕۆژنامەی (( ژیـان ))دا هەواڵی دەرچوونی ئـەو کتێبەی مامۆستا تۆفیق وەهبی بڵاوکراوەتەوە ( ل ١ ــ ٢ ) ٠

تێکدراو » ... لە بەشی شەشەمدا کەمێ باسی ڕستەی تێکەڵاوی کردووەو نوێیی بە دووورودرێژی لە گشـــت نیشـــانەکانی خاڵبەندی دواوە ... سەرجەمی بەشی حەوتەم لەبارەی بەشە ئاخاوتنی ناوەوەیەو لەم باســـانە نوێوە تێدا : « پێناسەی ناو ؛ چەشنەکانی ناو ؛ جنســـــەکانی ناو ؛ نیشانەکانی ناسیاوی‌و نەناسیاوی ...

**١٤٨ – زانیاری گشتیی پیشەگی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ١٠ – ١٨ .**

ئەم وتارە لە سێ بەش پێکهاتووە : لە بەشی یەکەمدا پێناســـەی ( زمان )و ( دەنگ )و ( فۆنێم )و ( پیت )و ( وشە )و ( دەســـتووری زمـان ) ... کراوە . بەشـــی دووەم لەبارەی ئەلفوبێی کوردی‌یەوەیەو باسی پیتە بزوێنەکان‌و نەبزوێنەکانی تێدا کراوە . بەشی سێیەم سەبارەت بە بەکارهێنان‌و تێداچوونی هەمزەیە .

**١٤٩ – زمانی کوردی ، گۆڤاری « پەیام » ، ژ ٣٠٥ ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٥٥ ، ل ٨ – ٩ .**

ئەم بەرهەمە نەخشـــەیێکی دیالێکت‌و بەشە دیالێکتەکانی زمـانی کوردییە .

**١٥٠ – زنجیرەیە وتار لـەبـابـەت بنچ‌و بناوانی زمانی کوردی‌یەوە ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سەرەتا ، ژ ١ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٣٩ ، ل ٩ – ١١ ؛ وتاری یەکەم ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١٣ – ١٩ ؛ وتاری دووەم ، ژ ٣ ، سالی ١ ، بەغـدا ، ١٩٤٠ ، ل ٣٨ – ٤٨ ؛ وتـاری سێیەم ، ژ ٤ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١١ – ١٩ ؛ وتاری چوارەم ، ژ ٥ – ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ٢٧ – ٤٠ / ٨٠ – ٨٦ ؛ وتـاری پێنجەم ، ژ ٧ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ٢٦ – ٤٤ ؛ وتاری شەشەم ، ژ ٨ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ٣٣ – ٣٩ ؛ وتاری حەوتەم ، ژ ٩ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ٥ – ١٦ / ٣٢ ؛ وتاری هەشـــتەم ، ژ ١١ – ١٢ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ٤٩ – ٧٠ ؛ وتاری نۆیەم ، ژ ١ – ٢ ، ســـــالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٤١ ، ل ٧١ – ٨٦ ؛ وتاری دەیەم ، ژ ٢ – ٤ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٤١ ، ل ٣٨ – ٥٧ .**

ئەم زنجیرە وتارەی مامۆستا وەهبی لە سەرەتاو دە بەش پێکهاتووە :
لە سەرەتادا ( ١ - مانای ئاری‌و ئێران ؛ ٢ - بانی ئێرانی )ی باس‌کردووەو
لێکداوەتەوە ... باســـەکـانی وتاری یـەکـەم ئەمانەن : ١ - کۆچی
ئاری‌یەکان ؛ ٢ - کۆچکەرەکانی بەرەو ئاسیا ؛ ٣ - چیرۆکی ئێرانی‌یەکان
لەبابەت وڵاتی ئەسلی ئاری‌یانەوە ؛ ٣ - هندو ئێرانی ) ... وتاری دووەم
بە ناوی « کورد عەشیرەتێکی ماد بووە »وەیەو ئەم باسانەی تێدا کراوە :
( ١ - حوکمێکی مەتتیق ؛ ٢ - ئەسلی کورد ؛ ٣ - حکومەتێکی کۆن لە
شـــاخەکانی زاگرۆسدا - کاردوخی‌و کورتی عەینی نەتەوەن ؛ ٤ - ناوی
کورد چۆن بڕرا بەسەر هۆزەکان‌و دێکانی ماددا ) ... وتاری ســـێیەم
لەبارەی ون‌بوونی ناوی مادو پەیدابوونی ناوی کرمانجەوە دەدوێ‌و لـەم
بەشانە پێکهاتووە : ( ١ - ناوی ماد چۆن گوم بووە ؛ ٢ - کرمانج بە کێ
ئەڵێن‌و ئەم ناوە لەکەیەوە هـەیـە ) ... وتـاری چوارەم ســـەرناوی
« ( کرمانج ) لـە ( کوردمانج )ەوە نەهاتووە »ی دراوەتێ‌و بریتی‌یە لـەم
باســانە : ( ١ - دابەش‌کردنی شێوەکانی زمـانی کوردی ؛ ٢ - گوایـا
« کورمانج » لە « کوردمانج »ەوە ســـــووك‌کراوە کە مانای « مرۆڤی
کورد »ە ؛ ٣ - لە شوێن گەڕانی پێکهاتنی وشەی « کوردمانج » ) ...
وتاری پێنجەم لێکۆڵینەوەیە لە پێکهاتن‌و مانای وشـەی « کرمانج » ...
وتاری شەشەم باسی لەناوچوونی مادەکان دەکات‌و بـە کردەوەیەکی دینی
دادەنێ ... وتاری حەوتەم چیرۆکی شـەڕی ئەردەشێری بابەکان‌و قـڕم
دەگێڕێتەوە ... ناونیشانی وتاری هەشتەم « دینی جارانی کورد »ەو لەم
باسانە پێکهاتووە : ( ١ - دینی هیندو ئەوروپایەکان ؛ ٢ - دینی کـۆنی
هیندو ئێرانی ؛ ٣ - دینی کۆنی ئێران ؛ ٤ - دیاوس ؛ ٥ - مەنشـــەئی
« ئەهورەمەزدە ؛ ٦ - دینی کوردی پێش ئیســـلام ... وتاری نۆیـەم
لێدوان‌و ڕەت‌کردنەوەی ئـەو بیروڕایـانـەیە ، کـە یەزیدی‌یەکان بـە

شەیتانپەرســـت دادەنێن • ئەم بەشــــە بریتی‌یە لــە : « پێشـــــەکی ێ
١ ـ شـــــەیتانپەرستیی یەزیدی‌یەکان وەرگیراوێکی زەردەشــتی نی‌یە ێ
٢ ـ لەکوێ لە شوێن مەنشەئی ئەسلی شـــــەیتانپەرستیی یەزیدی‌یەکـانە
بگەڕێین » ••• سەرناوی وتاری دەیەم « شەیتانپەرستیی یەزیدی‌یەکانی
ئەمڕۆ تەطەورێکی ئەخیری طەبیعەتپەرستیی هندو ئەوروپایی‌یە »یـە •
تێیەدا لــە دوو مەســـــەلەی گرنگ‌کۆڵراوەتەوە ، کـە بەم ناوانەوەن :
« شەیتانپەرستیی یەزیدی‌یەکان دەوامێکی عەقیدەی شـــــەیتانپەرستیی
پێش ئیسلامە ؛ ٢ ـ ( مەلەك طاوس )ی یەزیدی‌یەکان لە ئەسڵدا ( دیاوس
پیتەر )ی خوای ئاســـــمانی هنـدو ئێرانی‌یەکان بوو کـە لەگەڵ ( زەوس
پاتیر )ی یۆنانیەکانو (ژوپیتەر)ی ڕۆماییەکان عەینی شەخسیەت بوون » •

**١٥١ ـ سوپاس ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٥ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٢ ـ ٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو نووسینە دەداتەوە ، کـــە بەناوی
« فرمانی ئێستەمان »ەوە لە ژمارە ( ٩ )ی سالّی ( ١ ) گۆڤاری « هیوا »دا
بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٩٣ ) • هەروەها باســـی ئــەو هــەوڵو
تەقەلایەی خۆی کردووە ، کە بۆ دانانی پیتو نیشانە داویەتی •

**١٥٢ ـ ســەلام سەردەفی شکاند ، گۆڤاری « دەنگی گیتی‌ی تازە » ، ب ١ ، ژ ٦ ، بەغدا ، مارت ١٩٤٤ ، ل ٢١ ـ ٢٤ •**

نووسەر وەڵامی وتارەکەی سەلام دەداتەوەو هەوڵی‌داوە بە بەڵگەی
مێژوویی ماناو مەبەستی ئەو وشانە ساغ‌بکاتەوە ، کـە ســـــەلام داوای
ساغ‌کردنەوەیانی کردبوو •

**١٥٣ ـ فۆتۆگراف ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ ـ ٩ •**

نووسەر لێرەدا وێنەی ئەو پیتو نیشانانەی خستۆتە پێش چاو ، کە لەزووەوە دایناونو وا ڕادەگەیەنێ کە ئەوە لاپەڕەیەکە لەو دەستنووسەی مامۆستا ئەنوەر سائیب ساڵی ١٩٢٥ بۆی پاکنووس کردووە •

**١٥٤ - کوردییەکەمان بە چۆن حرووفێکو چۆن بنووسین ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ - ٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ - ٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەلفوێی عەرەبی بۆ نووسینی کوردی پەسەند دەکاو نیشانی دەدا ، چۆن فارسەکانو تورکەکان لە ڕێگەی هەندێ دەستکاریکردنی ئەو ئەلفوبێیەوە گیروگرفتی نووسینی خۆیان ڕەواندۆتەوە ، هەروەها کوردیش بە هەمان شێواز دەتوانێ کەموکورتیی ئەو ئەلفوبێیە پڕبکاتەوە •

**١٥٥ - کۆلینەوە لە مانای ( پەروەردەو زانست ) ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٥ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣ - ٧ •**

مامۆستا وەهبی لەم وتارەدا لەوە دواوە ، کە بەکارهێنانی « پەروەردەو زانست » بۆ « التربية والمعرفة » ڕاست نیيەو بەڵکو ڕاستیيەکەی « پەروەرشتو شناسایی »یە •

**١٥٦ - لێبوونەوەی ناوی کەرکووك ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ٣ ، ساڵی ١ ، کەرکووك ، ١٩٥٨ ، ل ٤ - ٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی ئەسڵو ڕۆنانی وشەی « کەرکووك »ەوە دواوە •

**١٥٧ - وشەواتی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٧ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٢ - ٤ •**

مامۆستا وەهبی لەم وتارەدا لە وشەکانی « وشە ، واچە ، ئاخاوتن ، وتن ، واتەی »ی کۆلیوەتەوە •

**هەروەها ژ : ١٧٧ ، ٥١٣ ، ٥١٤ ، ٦٩٥ ، ٦٩٦ ، ٦٩٧ ، ٦٩٨ ، ١٠٠١ ، ١١٠٦ •**

ج. :

**١٥٨. – نووسینی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ٢٩ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١٤ – ١٨ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٣٠ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ – ٥ و ١٧ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٣١ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٣ – ٨ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٣٢ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١١ – ١٣ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٣٣ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١٢ – ١٦ .**

لەم زنجیرە وتارەدا بە دوورودرێژی باسی دەوری ئەو زانایانە کراوە ، کە خزمەتی زمانی کوردیان کردووە ... هۆی پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانی کوردی دیاریکراوە ... رێگەی یەکگرتن و سازبوونی زمانی ئەدەبی نیشاندراوە ... هەندێ کێشەی زمانی کوردی باسکراوە ... لە ئەلفوبێی کوردی کۆلراوەتەوە .. بیروڕای هەلە رەتکراوەتەوەو وەلام دراوەتەوە ...

ج. م. :

**١٥٩ – وردە سەرنجێك ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ – ٤٠ .**

ئەم وتارە رەخنە لەو نووسەرانە دەگرێ ، کە لە نووسینیاندا وشەی عەرەبی زۆر بەکاردێنن و داوایان لێدەکا ئاوڕ لە زمانی کوردی بدەنەوەو بەتایبەتی لە شێوەی کرمانجیی ژووروو .

حکر خوین :

**١٦٠ – آواو دەستورا زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ .**

ئەم کتێبە ( ٢٠٦ ) لاپەڕەیە . بەشێکی کەمی سەبارەت ڕستەسازییەو زۆربەی دەربارەی مۆرفۆلۆژییە . واتە بەکورتی لە ڕستەی کوردی

دواوەو بە دوورودرێژی لە تێکڕای بەشەکانی ئاخاوتن‌و پێشگرو پاشگرو نیشانە لە زمانی کوردیدا کۆڵیوەتەوە .

**هەروەها ژ : ۱۰۰۳ .**

## جەلادەت عالی بەدرخان :

**۱۶۱ ـ ئەلفابێیا کوردی ، گۆڤاری « هاوار » ، بەشی یەکەم ، ژ ۱ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ۳ ـ ٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ۲ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٥ ـ ٦ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ۳ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ۳ ـ ٥ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٤ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٤ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٥ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ۷ ؛ بەشی شەشەم ، ژ ٦ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٦ ؛ بەشی حەوتەم ، ژ ۷ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٦ ؛ بەشی هەشتەم ، ژ ۸ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ۷ ؛ بەشی نۆیەم ، ژ ۹ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ۷ ؛ بەشی دەیەم ، ژ ۱۰ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٤ ؛ بەشی یازدەهەم ، ژ ۱۱ ، شام ، ۱۹۳۲ ، ل ٥ ...(٤)**

ئەم زنجیرە وتارەی جەلادەت عالی بەدرخان لە بەشە لاتینی‌یەکەی گۆڤاری « هاوار »دایەو بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو . نووسەر لەم وتارانەدا بە دوورودرێژی لە ئەلفوبێی کوردی کۆڵیوەتەوەو یەك بەیەکی پیتەکانی بە نموونەوە نیشانداوەو چۆنیەتیی دەربڕین‌و نووسینیانی باس‌کردووە ...

**۱٦۲ ـ بنگەهێن گرامێرا کورمانجی ، گۆڤاری « هاوار » ، بەشی یەکەم ، ژ ۲۷ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱۱ ـ ۱۲ ؛ بەشی دووەم ، ژ ۲۸ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۹ ـ ۱۱ ؛ ژ ۲۹ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱۳ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ۳۰ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱٦ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ۳۱ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱٤ ـ ۱٦ ؛ بەشی شەشەم ، ژ ۳۲ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۹ ـ ۱۱ ؛ بەشی حەوتەم ، ژ ۳۳ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱٥ ـ ۱٦ ؛ بەشی هەشتەم ، ژ ۳٤ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱٥ ـ ۱٦ ؛ بەشی نۆیەم ، ژ ۳٥ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۱٤ ؛ بەشی دەیەم ، ژ ۳۷ ، شام ، ۱۹٤۱ ، ل ۷ ـ ۹ ؛ بەشی یازدەیەم ، ژ ٤۰ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ٦۳۰ ـ ٦۳۱ ؛ بەشی دوازدەیەم ، ژ ٤۲ ، شام ،**

---

(٤) ڕەنگە ئەم وتارە بەشی تری هەبێ ، بەلام لەبەر نەبوونی هەندێ ژمارەی ، ئەومان بە ئالۆزی لا مایەوە .

**۱۹٤۲ ، ل ٦٥۳ ؛ بەشی سیازدەیەم ، ژ ٤۳ ، شـــام ، ۱۹٤۲ ، ل ٦٦۸ ؛ بەشی چواردەیەم ، ژ ٤٤ ، شـــام ، ۱۹٤۲ ، ل ٦۸۰ ؛ بەشی پازدەیەم ، ژ ٤٥ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ٦۹٥ – ٦۹٦ ؛ بەشی شازدەیەم ، ژ ٤٦ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷۰۳ – ۷۰٤ ؛ بەشی حەفدەیەم ، ژ ٤۷ ، شـــــام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷۱۱ – ۷۱۲ ؛ بەشی هەژدەیەم ، ژ ٤۸ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷۱۹ – ۷۲۰ ؛ بەشی نۆزدەیەم ، ژ ٥۰ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷۳٤ ؛ بەشی بیستەم ، ژ ٥۱ ، شام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷٤۹ – ۷٥۰ ؛ بەشی بیستو یەکەم ، ژ ٥۳ ، شـــام ، ۱۹٤۲ ، ل ۷۷۰ – ۷۷۱ ؛ بەشی بیستو دووەم ، ژ ٥٤ ، شـام ، ۱۹٤۳ ، ل ۷۸۰ – ۷۸۱ ٠**

نووســــەر لەم زنجیرە وتارەدا بـە دوورودرێژی دەربارەی دەنگە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانو ڕێنووسو خاڵبەندیو ناوو جنسەکانی ناو و تاکو کۆو جێناوو ژمارە ٠٠٠ دواوە ٠

**۱٦۳ – ڕووپەلنەن ئەلفابێ ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، ۱۹۳۲ ٠**

نووسەر ئەم نامیلکەیەی بۆ فێربوونی زمانو نووســـینی کوردی داناوەو بریتییە لە ( ۲۸ ) لاپەڕە ٠

**۱٦٤ – زاری دوملیو مەولوودا عوسمان ئەفەندی، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۲ ، پاریس ، مایسی ۱۹۸٤ ، ل ۷۷ – ۸٥ ٠**

ئەم وتارە کە باسی شێوەی دوملیو هــەنـدێ تایبەتیتی دەنگەکانیو ڕێزمانیو بەراوردی لەگەڵ دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەکات ، لـــە ژمارە ( ۲۳ )ی گۆڤاری « هاوار » ( ۱۹۳۳ )ەوە وەرگیراوەو لە ئەلفوبێی عەرەبییەوە کراوە بە ئەلفوبێی لاتینی ٠

**هەروەها ژ : ۸۹۲ ، ۸۹۳ ، ۸۹٤ ، ۸۹٥ ، ۸۹٦ ، ۱۰۹۳ ، ۱۰۹٤ ، ۱۰۹٥ ٠**

جویس بلۆ :

**۱٦٥ – بیرانینا تەوفیق وەهبی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۲ ، پاریس ، مایسی ۱۹۸٤ ، ل ۱۳ – ۱٦ ٠**

له چەند شوێنێکی ئەم وتارەدا باسی کارە زمانەوانییەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی بەرچاودەکەوێ .

**١٦٦ - پرتووکێن نوو ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٥٩ - ٦٢ ؛ ژ ٢ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٦٧ - ٧٤ ؛ ژ ٣ ، پاریس ، شوباتی ١٩٨٥ ، ل ٨٧ - ٩٢ ؛ ژ ٤ ، پاریس ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ٦٢ - ٦٨ .**

نووسەر لەو بیبلیۆگرافیایەدا کە باسی ئەو کتێبانە دەکات پێوەندییان بە کوردناسییەوە هەیەو لەم ساڵانەی دواییدا بڵاوکراونەتەوە ، لەو کتێبانەش دواوە کە دەربارەی زمانی کوردین .

**هەروەها ژ : ٩٢٤ ، ٩٢٥ ، ١١٠٠ .**

جەلال دەباغ :

**١٦٧ - وشەیەك دەربارەی پاككردنەوەی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٣٠ - ٣١ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەو جۆرە وشە لێکدراوانە دواوە ، کە بەیاریدەی هەندێ وشەی بێگانە سازبوون .

جەلال مەحموود عەلی :

**١٦٨ - ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٢ .**

ئەم کتێبە ( ٥٠٤ ) لاپەڕەیە . نووسەر لە سەرەتادا باسی ئیدیۆمی کردووەو ئەو کارانەی هەڵسەنگاندووە کە لەبارەی ئیدیۆمی کوردییەوە نووسراون . لە لاپەڕە ( ٣١ تا ٤١٩ ) بەپێی زنجیرەی ئەلفوبێی کوردی

تێکڕای ئـەو ئیدیۆمانـەی کۆی کردوونەتەوە ، تۆمارکردوونو مانایانی لێکداوەتەوە •

**١٦٩ – جووتە وشە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٣ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٧٨ – ٨١ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەو جۆرە وشـــە لێکدراوانە دواوە ، کــە بەیارمەتی ( و )ی پێوەندی پێکەوە دەبەسترێن •

**١٧٠ – چەند سەرنجێك دەربارەی هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردیی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٥ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤٨ – ٥٤ •**

نووســـەر لە ســـەرەتای ئەم وتارەدا هەندێ تێبینی دەربارەی ئەو وتـارەی د • نەسرین فەخـری نیشـــانداوە ، کـە لـە ژمـارە ( ١٩ )ی « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ( ١٩٧٦ )دا بە ناوی « هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردی »یەوە بلاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٤٩ )و لە کۆتـایـیـدا ( ١٠٧) ئیدیۆمی‌تری خســـتۆتە پێش‌چاوو مـانـاکـانـیـانی لێکداوەتەوە •

**١٧١ – ڕێزەوێکی تایبەتی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٧٥ – ٧٦ •**

نووســـەر لەم وتارەدا بەکورتی لەو جوانکاری‌یەی زمانی کوردی دواوە ، کـە لـە ڕواڵەتی هەندێ کرداردا دەنگێــکی تایبەتی پەیدادەبێو وشــەی ئەو دەنگە وەردەگرێ دەکەوێتە سەرەتای ڕســـتەوە ، وەك : ( چز دەستی سووتا ؛ خرم دایکردە لێزمە ؛ گف کەوتە خولانەوە ••• ) •

## جەمال بابان :

**١٧٢ – بنچینەی هەندێك وشـــەو لەیەکچوونی هەندێکی‌تر لـــە کوردی‌دا ، گۆڤاری « پەروەردەو زانســـت » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٠ – ٢٠ •**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە کۆمەڵێ وشەو نووسەرەکەی هەوڵی‌داوە ئەسڵ‌و ڕەگ‌و ڕیشـــەیان ساغ‌بکاتەوەو نیشانی‌بدا لـە چی‌یەوە هاتوونو لـــە چ زمانێکی‌ترەوە خۆیان گەیاندۆتە فەرهەنگی زمانی کوردییەوە یاخـــود بەپێچەوانەوە ••• ئەم کارە لە دوو بەش پێکهاتووە : بەشـی یـەکـەم - نووسەر لەملاو ئەولا وەری‌گرتووە ؛ بەشی دووەم - زادەی لێکدانەوەی خۆیەتی •

**١٧٣ - هەندێك لـەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن ، گۆڤـاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٦٩ - ٦٢٢ ؛ ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٥٨ - ٢٨٨ •**

ئەم وتارە لە وشەی هاوبێژ ( المشترك اللفظی - Homonym )ی کوردی دواوەو ڕێگای پەیدابوونیانی دیاری‌کردووە •

**هەروەها ژ : ٧٠٢ •**

## جەمال جەلال :

**١٧٤ - دوو پیتی بەوێنە ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣٢ ، ســـــالی ٥ ، ١٩٦١ ، ل ٣٩ - ٤٠ •**

مامۆستا جەمال جەلال لەم وتارەدا ڕەخنە لە طاهیر صـادق‌و پاکیزە ڕەفیق حیلمی دەگرێ ، کە بەلایانەوە وایە دەبێ بۆ ئەو ( ك )و ( گ )انەی لەپێش ( ی ، ێ ، وێ ، وی )یەوە دێن پیتی تایبـەتی دابنرێ ( بڕوانـە : باسی ژ ٣٢٤ و ١٢٠ ) ••• هەروەها لایـەنی مەعرووف خەزنەدار دەگرێ کە ئەو ڕایانەی ڕەت‌کردۆتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٠٩ )و لەکۆتاییدا هەندێ بەڵگەی زمانەوانی بۆ ئەو مەبەستە دێنێتەوە •

**١٧٥ - زمانەکەمان ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٢٤ ، ســالی ٥ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٢٣ - ٢٧ •**

ئەم وتارە لە سێ باس پێکهاتووە : « ۱ - پیت یا تیپ » ؛ « ۲ - پیتی بێدەنگ‌و دەنگدار » ؛ « ۳ - باسی هەندێ وشەی تێکدراو » •

**۱۷٦ - مەبەست چی‌یە لەم هەموو وشە تازانە ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۳٦ ، بەغدا ، ۱۹٦۲ ، ل ۱۷ - ۲۰ •**

نووسەر لەم وتارەدا ڕەخنە لە کۆمەڵێ وشەی نوێباو دەگرێ‌و بەکارهێنانیان بە شتێکی نادروست دادەنێ‌و داوا لە نووسەران دەکا وشەی نالەبار نەهێننە زمانی کوردی‌یەوە •

## جەمال خەزنەدار :

**۱۷۷ - مامۆستای زانا تۆفیق وەهبی‌و ( شەفەق ) ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ۲ ، سالی ۱ ، کەرکووك ، ۱۹۵۸ ، ل ۱۲ •**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ جەمال خەزنەداردا ماناو واتاو ئەسڵی وشەی « شەفەق »ی لێك‌داوەتەوە •

## د• جەمال ڕەشید :

**۱۷۸ - ئێسکبەندیی مرۆڤ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٤ ، بەغدا ، ۱۹۷٦ ، ل ۸۳ - ۹٦ •**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە ژمارەیێك وشەو زاراوەی زانستی لە پزیشکی‌دا ، بەتایبەتی لە زانستی توێکاری ( علم التشریح )دا بەکاردەهێنرێن‌و پێکهاتووە لە ناوی ئێسکەکانی ئێسکبەندیی مرۆڤ لە کەلەسەرەوە تا کەلەنگوستی پێ ، یەکە یەکە لەگەڵ بەرانبەرەکانیان بە زمانی عەرەبی‌و ئینگلیزی‌و هەندێکیش بە لاتینی •

د. جەمال ڕەشید ئەحمەد :

**١٧٩ - پێوەندی کورد بە کاردۆخییانەوە ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ٨٧ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٨ - ٣١ .**

نووسەر لە هەندێ شوێنی ئەم وتارەدا دەربارەی ئەســـڵو وتای وشەی « کورد »و « کاردۆخ » دواوە .

**١٨٠ - چەمکی کوردو کرمانج لە مێژوودا ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ٨٣ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٩ - ٢٥ و ٣٧ .**

نووسەر لەم وتارەدا ڕای خۆیو زانایانی سەبارەت بـە پەیدابوونو واتای وشەی « کورد »و « کرمانج » خستووەتە پێش چاو .

**١٨١ - دەوری کەرتیان لە مێژووی کورددا ، گۆڤاری « ڕۆشـنبیری نوێ » ، ژ ٩٨ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ١٩ - ٣١ .**

د . جەمال لەم وتارە مێژووییەدا لە واتای وشەی ( کارتیان )و نزیکی لەگەڵ وشەی ( کورد )و ( کاردوخ )یش دواوە .

**١٨٢ - ناوی کەسیو توپۆنۆمیکی چەرخی هیللینی لـە زمانی کوردیی کۆنـدا ، گۆڤـاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغـــدا ، ١٩٨٥ ، ل ٧٢ - ٨٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵی ساغکردنەوەی ئەو ناوانەی داوە کــە لەنێو تێکستی ئەو دۆکومێنتانەدا هاتوون کـە لـە ناوچەی هـەورامـان دۆزراونەتەوە .

**١٨٣ - هێندێـک بیروڕا دەربارەی بناخەی مێژووی زمانی کوردیو پەیوەندی بە زمانە کۆنەکانی جیهانەوە ، گۆڤـاری « ڕۆشـــنبیری نـوێ » ، ژ ١٠٥ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٠١ - ١٢٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵیداوە ئەسڵی زمانی کوردی ساغبکاتەوەو سەرهەڵدانو گەشەکردنی دیاریبکاو پێوەندیی کۆنو نوێی بـە زمانانی جیاوازەوە نیشانبدا .

**هەروەها ژ : ٧٠٠ .**

جەمال شاڵی :

**١٨٤ - نووسینی کوردیو پێشخستنی ، گۆڤاری « سلێمانی » ، ژ ٨ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٩ ، ل ١٤ - ٢٠ .**

نووسەر لە سەرەتادا باسی ڕەوانیو خۆشیو دەوڵەمەندیی زمانی کوردی دەکاتو چەند کتێبێکی کوردی دەکاتە نموونە ... بۆ پەرەپێدانی زمانو نووسینی کوردی هەندێ تێبینی خستووەتە پێشچاو ... دەربارەی دانانی زاراوەو دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار دواوە .

د. جەمال نەبەز :

**١٨٥ - خوێندەواری بە زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٧ .**

ئەم نامیلکەیە لەو کۆسپو گیروگرفتانە دەدوێ کە لەسەر ڕێی بڵاوبوونەوەو پێشکەوتنی زمانی کوردیدان . ئەوەی لەم کارەدا پتر جێیەخو سەرنجڕاکێش بێ ، ئەو دوو بەشەیە ، کە بە ناوی « فەرهەنگ » ( ل ٥٨ - ٦٧ )و « دەستووری زمانی کوردی » ( ل ٦٧ - ٦٩ )یەوەن . مامۆستا نەبەز لە بەشی « فەرهەنگ »دا باسی کاری فەرهەنگنووسیی کردووەو بیروڕای لەبارو زانستییانەی بۆ دانانی فەرهەنگی کوردی دەربڕیوە . لە بەشی « دەستووری زمانی کوردی »یشدا هەندێ پێشنیارو زانیاریی باشی خستووەتە پێش چاو .

**١٨٦ - ڕەخنەی زمانەوانیو لیسی کوێرانە ، گۆڤاری « ناسۆی زانکۆیی » ، ژ ٩ ، ساڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ٨٦ - ٩٢ .**

د . نەبەز لەم وتارەدا لەبارەی سەرنجی زمانەوانییەوە ئەو ڕەخنانەی دەکاتەوە ، کە لە وتاری « چەند سەرنجێك دەربارەی زمانی بۆشایی » ( ژمارەی ڕۆژی ١٧/٤/١٩٧٨ی ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا ) لە نووسینێکی د . کوردستان موکریانی گیرابوو .

**١٨٧ ـ زاراوەی لیژنەی ( ریاضیات ) لەژێر وردەبینی لێکۆڵینەوەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٠٢ ـ ١٠٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٧ ، ســـاڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١٢ ـ ١٢١ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٨ ، ســـاڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٨٥ ـ ٩١ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ١١ ، ســـاڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١٠٦ ـ ١١١ ...**

ئەم زنجیرە وتارە لەبارەی ناتەواوی‌و کەم‌و کورتیی وەرگێڕان‌و دارشتن‌و داتاشینی ئەو زاراوانەوە دەدوێ کە لیژنەی « زاراوەی بیرکار » دایان‌ناوە‌و لە ژمارە ( ٥ )و ( ٦ )ی ســـاڵی ( ١ )ی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا بڵاویان‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٧١ ) .

**١٨٨ ـ زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .**

ئەم کتێبە ( ١٢٧ ) لاپەڕەیە . لە زوربەی زۆری ئەو کێشانە دەدوێ کە پێوەندییان بە سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردییەوە هەیە .

**١٨٩ ـ ســەرنجێك لــە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و « کۆڕی زانیاری کورد » ، گۆڤاری « کۆلێجی ئەدەبیات » ، ژ ٢٢ ، بەغــدا ، ١٩٧٨ ، ل ٧٩ ـ ١١٥ .**

نووسەر لە هەندێ شـــوێنی ئەم وتارەدا بیروڕای خۆی دەربارەی بەشێك لەو کتێب‌و وتارە زمانەوانی‌یانەی لەلایەن کۆڕەوە بڵاوکراونەتەوە ، نیشان‌داوە . لە لاپەڕە ( ٩٢ ـ ٩٤ )دا هەندێ تێبینی لەبارەی « ڕێنووسی کۆڕ »ەوە خستۆتە پێش چاو . بە دووروودرێژی لە لاپەڕە ( ٩٥ ـ ١٠٧ )دا ڕەخنەی لە « زاراوەکانی کۆڕ » گرتووە ( دەربارەی ئەم وتارە ، بڕوانە : باسی ژ ٣٨ ، ٣٥٣ ) .

**١٩٠ ـ کورتــە مێژوویەکی کوردناسی لــە ئەڵەمانیادا ، « گۆڤــاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤١٣ ـ ٤٨٩ .**

ئەم وتارەدا لەگەڵ باسی ئەو کارانەدا کە بە زمانی ئەڵمانی لەبارەی مێژوو و ئەدەب و فۆلکلۆرو ئەتنۆگرافیا ...ی کوردەوە نووســـراون ، باسی ئەو بەرهەمانەش کراوە ، کە دەربارەی زمانی کوردین •

**١٩١ - نووسینی کوردی بە لاتینی ، بەغدا ، ١٩٥٧ •**

ئەم نامیلکەیە ( ٣٥ ) لاپەڕەیەو بۆ مەبەستی فێرکردنی نووســـینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی دانراوە •

**هەروەها ژ : ٩٢٣ ، ١٠٠٤ ، ١٠٠٥ •**

## جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی :

**١٩٢ - ئـەی چـۆن بخوێنینـەوە ، وە چـۆن تێبگەیـن ، گۆڤـاری « گەلاوێژ » ، ژ ٦ ، ساڵی ٨ ، بەغدا ، ١٩٤٧ ، ل ٥٥ - ٦٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو بیروڕایانەی مامۆستا محەمەد ئەمین زەکی بەگی داوەتەوە ، کـە لـە ژمارە ( ٤ )ی ســـاڵی ( ٨ )ی گۆڤاری « گەلاوێژ »دا سەبارەت بە وشەی عەرەبی لە زمانی کوردیدا خستویەتی یە پێش چاو • مامۆســـــتا ڕۆژبـەیـانی ڕای مـامۆســـــــــتا محەمەد ئەمین زەکی پەسەند ناکا • بەشێوەیەکی زانستی ئەوەی ئیسپات کردووە ، کە وشەی عەرەبی دەبێ بە ڕێنووسی کوردی بنووســـرێ و هەروەها وشەی ڕەسەنی کوردی لەجێی ئەو وشە عەرەبی یانە دابنرێن ، کە هەندێ کەس بە بێ پێویست بەکاری دێنن •

**١٩٣ - چۆن زمانەکەمان بنووســـین ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١٠ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ - ١١ و ٨٩ - ٩٤ •**

مامۆستا ڕۆژبەیانی لێرەدا موناقەشەی ڕای نووســـین بە ئەلفوبێی عەرەبی و لاتینی دەکاو لەو دەنگانە دەدوێ ، کە نیگاریان دەوێ •

**١٩٤ ـ ڕاستکردنەوە ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٥٩ ـ ٦٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا بیروڕای خۆی بەرانبەر هەندێ نووسینی بەتایبەتی وتاری مامۆستا خەزنەدار . کە لە ژمارە ( ٦ ، ٨ ، ١١ )ی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا بڵاوکردۆتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٠٩ ) ، دەربڕیوە .

**١٩٥ ـ زمانو نووسینی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ژ ٤٣ ، ساڵی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ ـ ٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٤٤ ، ساڵی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ ـ ٥ .**

ئەم وتارە وەڵامی وتاری « زمانو نووسینی کوردی »ی ت . ب . مەریوانییە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٨٨ ) . مامۆستا ڕۆژبەیانی ، وێڕای خستنە پێشچاوی هەندێ لەو گیروگرفتانەی لەڕێی پێشکەوتنو لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدان ، لە سێ باسی گرنگیش دواوە : ١ ـ ئەلفوبێی کوردیو ڕێنووسی کوردی ؛ ٢ ـ چۆنیەتی نووسینی وشەی بێگانە لە کوردیدا ؛ ٣ ـ دەستووری زمانی کوردیو فەرهەنگی کوردی .

**١٩٦ ـ وێژ ، گۆڤاری « بڵێسە » ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٤٢ ـ ٤٣ .**

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە لە وشەی « وێژ »و عەروەها وەڵامێکە بۆ وتاری « بەخێوکردنی زمانەکەمان بە وشەی ( وێژە ) »ی مامۆستا تۆفیق وەهبی . کە لە ژمارە ( ٤ )ی ساڵی ( ١ )ی گۆڤاری « پێشکەوتن »دا بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٤٠ ) .

**١٩٧ ـ ــــــ ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٣ ، ساڵی ٨ ، بەغدا ، ١٩٤٧ ، ل ٦٣ ـ ٦٤ .**

ئەم وتارە لە بەشی « گەلاوێژو خوێندەوارانی »دا بڵاوکراوەتەوە . نووسەر لێرەدا وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە ، کە مامۆستا توفیق

ـەمبی بە ناوی « ( ر )ی قەڵەو چۆن بنووسیـــــن »ەوە کردبووی مـ
ـەموستا ڕۆژبەیانی وێڕای دەربڕینی ڕای سەبارەت بە چۆنیەتی نووسینی
( ر )ی قەڵەو ، هەروەها لەبارەی هەندێ پیتی تریشەوە چەند پێشنیارێکی
کردووە •

هەروەها ژ : ٥٠١ ، ٥٠٢ •

## جەوهەر غەمگین :

**١٩٨ ـ زمانی کوردی لە هەولێر ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٧ ـ ١٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی گرنگیی زمانی زگماك دەکاتو خەڵـکی هەولێر بۆ فێربوونو نووسیـــــنی کوردی هاندەداو ڕێو شـــوێنیان ـــەدا •

## جیگەرنی :

**١٩٩ ـ زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١ ـ ٤ •.**

ئەم وتارە کورتە بەراوردێکە لەنێوان دیالێکتی ژووروو و خوارووی ـنی کوردیدا ، بەتایبەتی لە ڕووی بەکارهێنانی جێناوەکانو تێداچوونی ـ )ی هەندێ وشـە لـە کرمانجیی ژووروودا بوونی ( و ) بە ( ڤ )و ـەکارهێنانی ( ێك ) وەك نیشـانەی نەناسیاوی لـە کرمانجیی خوارووداو ـوونی بـە ( ەك ) لـە کرمانجیی ژووروودا • ( لـەبارەیەوە بڕوانە باسی ـ ٣٠٤ ) •

**٢٠٠ ـ فراوانیی زمـانی کوردی ، گۆڤـاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٧ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٩٧ •**

أ • جێژنی بۆ نیشاندانی دەوڵەمەندیی زمانی کوردی کۆمەڵێ وشەی هاوواتای بڵاوکردووەتەوە •

## جیهان عومەر صدیق :

**٢٠١ ـ وشەی ( تمثیل ) ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ٧ ، ســـالی ١ ، کەرکووك ، ١٩٥٨ ، ل ٧ ـ ٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا وشەکانی « لاســـایی »و « نواندن » ، کـــە هەندێکەس لەجێی « تمثیل » بەکاری‌دێنن ڕەت‌دەکاتەوەو بـــە زمـــانی کوردیدا گەشتێك دەکا بۆ دۆزینەوەی وشەیەکی لەبار بۆ ئەو مانایە •

## حاجی جندی :

**٢٠٢ ـ ئەلفبا ، یەریڤان ، ١٩٥١ •**

ئەم ئەلفوبێیە بۆ گەورە دانراوەو بە پیتی سلاڤی‌یە •

**هەروەها ژ : ٢٠٣ •**

## حاجی جندیو ن• جەواری :

**٢٠٣ ـ ئەلفبا ، یەریڤان ، ١٩٥٧ •**

ئەلفوبێیەکی وێنەدارە بۆ منداڵانە • بە پیتی سلاڤی‌یە •

## حاجی عەبدولڕەحیم وەفی :

**٢٠٤ ـ چۆن فێری زمانی کوردی ئەبێت بە بێ‌مامۆســـــتا ، چاپی دووەم(٥) ، سلێمانی ، ١٩٧٠ •**

ئەم کتێبە ( ١٨٦ ) لاپەڕەیەو لەم بەشانە پێکهاتووە : ئەلفبای کوردی بە پیتی عەرەبی ( ل ٢٣ ـ ٢٦ ) ؛ وشـــەی کوردی ( ل ٢٩ ـ ١٠٢ ) ؛

---

(٥) تەنیا چاپی دووەمی ئەم کتێبەم بینیوە ، بەڵام وەك نووســـەرەکەی لـــە پێشەکیدا ( ل ١١ ، ١٤ ) پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، چاپی یەکەمی سالی ١٩٥٩ بڵاوکردووەتەوە •

ـسەی بچکۆلانەی زۆر بەکارهێنراو ( ل ١٠٥ – ١٣٤ ) ؛ نووسینی نامە
ا ـ ١٣٧ – ١٥١ ) ؛ هەندێ چەپکەی ئەدەبی ( ل ١٥٥ – ١٦٣ ) •••

حەمید فەرەج :

**٢٠٥ – ئەلفوبێی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣٦ •**

ئەم کارە ( ٦٦ ) لاپەڕەیەو ئەلفوبێیەکە بۆ فێرکردنی نووسـین و
خوێندنەوەی کوردی •

**٢٠٦ – ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ •**

ئەمە نامیلکەیەکی ( ٤٢ ) لاپەڕەییە • بریتییە لە پێشـاندانێکی
ێجگار کورتی کەمێـك لـەو نووسراوانەی پێوەنـدییـان بـە ڕێنووسی
کوردییەوە هەیە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٢ ل ٦٦ ؛ ژ ٥٦١ ) •

حجي جعفر :

**٢٠٧ – خالبەنـدی د گۆڤـارا ڕۆژی کوردا ، گۆڤـاری « کاروان » ،
ژ ٢٠ ، هەولێر ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٣١ – ٣٣ •**

ئەم وتارە بەشێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسـی ئـەو
یـەنەی خاڵبەندی دەکات ، کە گۆڤاری « ڕۆژی کـورد » ( ١٩١٣ )
بەکاری‌هێناون •

**٢٠٨ – زمانێ کوردی د گۆڤـارا ( ڕۆژی کورد )دا ١٩١٣ ، گۆڤـاری
« ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٥ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٢٥ – ١٤١ •**

نووسەر لەم وتارەدا لـە سەرهەڵدانی هەنـدێ دیاردەی گرنگ لـە
گۆڤاری « ڕۆژی کورد »دا دواوە ، بـەتـایبـەتی وەك : بەکـارهێنـانی
ڕێزلوەی کوردیی لەبارو پەیدابوونی نیگار بۆ هەندێ دەنگی کوردی •••

حەسەن شێخ حەمە مارف :

**٢٠٩ ـ دەربارەی وشـــەی ( زانیاری )و ( زانســـتی ) ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٤١ ــ ٤٢ .**

ئەنجامی ئەم وتارە ئەوەیە ، کە نووسەرەکەی ئەو ڕایەدایە وشـــەی « زانیاری » مانای ( مەعلوومات )ەو وشەی « زانستی » واتای ( عیلمی ) دەگەیەنێ .

**٢١٠ ـ زانیاری یان زانستی ، پیت یان تیپ ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٧ ، هەولێر ، شوباتی ١٩٨٤ ، ل ٣٠ ـ ٣١ .**

ئەم وتارە لە پێکهاتن‌و واتای وشەکانی « زانیاری »و « زانستی »و « پیت »و « تیپ » دەدوێ‌و لەئەنجامدا « زانســــــت » بۆ ( علمی )و « تیپ » بۆ ( حرف ) پەسەند دەکات .

**هەروەها ژ : ٢٨٥ ، ٢٨٦ ، ٢٨٧ ، ٢٨٨ ، ٢٨٩ ، ٢٩٠ ، ٢٩١ .**

حەسەن قزلجی :

**٢١١ ـ دەربارەی وەرگێڕانی ( گێلەپیاو )ەوە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٢ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٣٢ ـ ٣٨ .**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ تێبینی‌و سەرنجی زمانەوانی بەرانبەر بەکارهێنانی هەندێ وشەو دارشتنی هەندێ ڕستە لە دەقی کوردی ڕۆمانی « گێلەپیاو »ی عەزیز نەسیندا خســـتووەتە پێش چاو ، کە مامۆســـتا عەبدوڵلا حەسەن زادە لە فارسی‌یەوە کردوویەتی‌یە کوردی .

**٢١٢ ـ گۆڕانی پیتەکان بە یەکتر ، جێگۆڕکێی پیتەکان‌و ســــــوان‌و تێکشــــــکانی وشەکانی بەهۆی ئەو ئالوگۆڕانەی بەسەر پیتەکاندا دێ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١١٨ ـ ١٨٤ .**

ئەم وتارە برتی‌یە لەم باسانە : « ١ ـ گۆڕانی پیتەکان بـە یەکتر » ( ل ١٢١ ـ ١٧٦ ) ؛ « ٢ ـ گۆڕانی جێگای پیتەکان ( قلب ) ( ل ١٧٦ ـ

١٧٣ ) ؛ « ٣ ـ سواندن یا ( تصـــحیف ) ، کە بە گۆڕین و جێگۆڕکێی پیتەکان فڕێدانی هێندێ پیت پێتەدێ » ( ل ١٧٩ ـ ١٨٤ ) •

**٢١٣ ـ لەبارەی هێندێ لە نهێنییەکانی ڕێزمانی کوردی ، « گۆڤـاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١١٣ ـ ١٣٤ •**

مامۆستا قزلجی لەم وتارەدا لەم باســـــانە دواوە : « ١ ـ ناوگر ؛ ٢ ـ ( ت ) لـە کۆتایی هەندێ فیعلدا ؛ ٣ ـ پاشگری ( رە ) ، ( وە ) ، ( نێ ) ؛ ٤ ـ پاشگری ( ك ، ا ) ؛ ٥ ـ هاتنی ( ڕاناوی لکاو ) لەپێش فیعلەوە لە کرمانجیی سەروودا » •

## حەسەن کوردستانی :

**٢١٤ ـ لە حەق نووســـین تازە ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١١ی مایسی ١٩٢٦ ، ل ٨ ـ ١٠ •**

نووســــەر لەم وتارەدا لایەنی بیروڕای مامۆستا شاوەیس و پیرۆت ڕەتدەکاتەوە : باسی ژ ١٣٣ ، ٢١٥ ) دەگرێ و دواتر خۆشی هەندێ پێشنیار بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ئەلفوبێی عەرەبیی دەســـتکاریکراو دەخاتە پێش چاو •

## حەقی شاوەیس :

**٢١٥ ـ ئیمـلای کوردی ـ حروفـاتی عەرەبی ، گۆڤـاری « دیـاریی کوردســـتان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٨ ، بەغـــدا ، ١٤ی تەمووزی ١٩٢٥ ، ل ٧ ـ ٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ ـ ١٢ •**

مامۆســـــتا شاوەیس لێرەدا بە دوورودرێژی باسی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بـە ئەلفوبێی عەرەبی دەکاو لەو ڕایەدایە ، کـە ئـــەو ئەلفوبێیە بۆ نووسینی کوردی دەستنادات •

**٢١٦ – لاپەڕەی نووسینی تازەو کوردیی پەتی : لە نووسینو شـێوەدا سەربەخۆ ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٣ – ١٤ ، بەغدا ، ٥ی مارتی ١٩٢٦ ، ل ١٨ – ٢٠ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٥ ، بەغـدا ، ١٨ی مارتی ١٩٢٦ ، ل ١١ – ١٢ .**

نووسـەر لەم وتارەدا داوا دەکات بەرگی عەرەبی نەکرێتە بەر نووسینی کوردیو باش پەیڕەویی فۆنەتیکو دەستووری زمانی کوردی بکرێت .

**٢١٧ – نووسینی کوردی چۆن بێ ؟ ، گۆڤاری « دیاریی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٨ – ٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٧ – ٨ .**

ئەم وتارە بە نموونەو بەڵگەی زۆرەوە وا دادەنێ کە : ١ – وشـــە چۆن لە دەم دەربچێ بەوجۆرە بنووسرێ ؛ ٢ – وشەی بێگانـە بخرێتـە سـەر ئاهەنگی کوردی ؛ ٣ – دەبێ ( ە ، ی ، و ) لەبریتی سـەرو ژێرو بۆر بەکاربهێنرێ ؛ ٤ – دەبێ ئامرازی پێوەندیو پریپۆزیشـــنو ... بەجیا بنووسرێن ...

حەمە جەزا :

**٢١٨ – وەڵامی ڕەخنەکـەی فەرهـەنگی خاڵ ، گۆڤـاری « هیـوا » ، ژ ٣٠ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل ٤٠ – ٤٢ .**

نووسەری ئەم وتارە لایەنی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ دەگرێ لە تۆمارکردنو لێکدانەوەی وشەداو ڕەخنەکانی مامۆستا طاهیر صـــادق ڕەتدەکاتەوە . ( بڕوانە : باسی ژ ٣٢٩ ) .

حەمە کەریم ڕەمەزان هەورامی :

**٢١٩ – بەرگی یەکەم « سایکۆلۆجیەتی خوێندنەوە » ، سـلێمانی ، ١٩٦٨ ؛ بەرگی دووەم « بنچینەی وتنەوەی زمـانی کوردی » ، هەولێر ، ١٩٧٠ .**

مامۆستا حەمە کەریم ڕەمەزان هەورامی لەم کتێبە دوو بەرگی‌یەدا بەڕەی چۆنیەتی وتنەوەی زمانی کوردییەوە دواوەو هەوڵی‌داوە بەپێی پێویست لە زمانی کوردی بکۆڵێتەوە ... بەداخەوە لەم کارەدا زانیاری نەڕاست‌و کەم‌وکورتیی زۆر بەرچاو دەکەوێ .

هەروەها ژ : ٤٠٩ .

## حەننا ئەنتوان :

**٢٢٠ ـ چەند سەرنجێکی سەرپێ‌یی دەربارەی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٨ ، مایسی ١٩٨٣ ، ل ٦٥ ـ ٦٧ .**

نووسەر لە سەرەتادا بەرگی نۆیەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، کە سەرلەبەری لەبارەی ڕێنووسی کوردی‌یەوەیە هەڵدەسەنگێنێ‌و ئنجا باسی چەند گیروگرفتێکی نووسینی کوردی‌و شێوەی چارەسەرکردنیان دەکات .

## د. حوسێن ڕەهبەر :

**٢٢١ ـ جەلادەت بەدرخان وەك هیمداری ئەلفابێیا لاتینی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٥ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٩٦ ـ ١٠٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی دەوری جەلادەت بەدرخانی کردووە لە سازکردنی ئەلفوبێی لاتینی‌دا بۆ زمانی کوردی .

## خالید جوتیار :

**٢٢٢ ـ کوردی‌یەکەی ( قەڵای دمدم )و سەرەتایێکی‌تریش ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٣٥ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥٨ ـ ٦٨ .**

ئەم وتارە هەندێ سەرنجو تێبینی زمانەوانی‌یە دەربارەی شێوەی نووسینی داستانی ( قەلآی دمدم ) ، کە مامۆستا شوکور لە دیالێکتی ژووروووەوە هێناویەتی‌یە سەر دیالێکتی کرمانجیی خواروو .

ج . خەسرەو :

**٢٢٣ - ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی لیستەی سێیەمو چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ، گۆفاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٠ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٩ - ٢١ .**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە خستنە پێش چاوی هەندێ سەرنجو تێبینی لەبارەی دوو لیستەی ناوبراوی زاراوەی کۆڕی زانیاری کوردەوە .

**٢٢٤ - یەکێتی زمانی کوردی گۆڕانێك بەسەر شێوەکەماندا ، گۆفاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ژ ٩٨ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ - ٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٩٩ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ - ٥ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ١٠٠ ، سالی ٤ ، هەولێر ١٩٥٧ ، ل ١ - ٥ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ١٠١ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ - ٣ .**

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا باسی پێویستیی بوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردی دەکاو لە جیاوازیی نێوان دیالێکتەکان دەدوێو ئنجا بە وردیو دوورودرێژی باسی ئەو گۆڕانانە دەکا ، کە لە زمانی ئاخاوتنی سلێمانیدا پەیدابووە ، وەك : ١ - گۆڕانەکانی دەنگی (د) ؛ ٢ - ونبوونی دەنگی ( ت ) ؛ ٣ - فڕێدانی ( ك )و ( گ ) .

دلێنس د . جەباری :

**٢٢٥ - پاراستنی زمانی کوردی ، گۆفاری « هەتاو » ، ژ ١٢٣ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ١ - ٢ .**

نووسەر لەم کورتە وتارەدا ئامۆژگاریی میللەتەکەی دەکا بۆ پاراستنو گەشەپێدانی زمانەکەی .

**٢٢٦ – یەکێتی زمانی کوردی – ئەگەر لەکین گشـــت چوونیەکین ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١١٨ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ – ٢ •**

نوسەر لەم وتارەدا لە ڕێگای ئەو پەندە کوردییەوە ویستوویەتی نیشـــانیبدا ، کە جیاوازی لە مەیدانی لەك و لوڕو کەلهوڕو گۆرانو بۆرانو کرمانج ••• دا نییەو هەموو خاوەنی یەك زمانن •

دلشاد مەریوانی :

**٢٢٧ – تیپەگۆڕکێی وشـــە لــە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ١٣ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٢ – ٥٣ •**

ئەم وتارە باسی ئەو وشـــە کوردییانە دەکات ، کە بــە دوو جۆر دەوترێن • جۆری وتنەکەش ئەوەیە ، ئەو وشەیە پاشو پێشو جێگۆڕکێ دەکا ، وەك : بەفر / بەرف ؛ تەرزە / تەزرە ؛ دەروێش / دەورێش •••

« دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق » :

**٢٢٨ – بانگەوازێك لە دەســـتەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراقەوە ، کۆڕێك بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشـنبیری نوێ » ، ژ ٧٩ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٨١ •**

دەســـتەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق لەم بانگەوازەدا ، وێڕای ئەوەی هەندێ کێشەی نووسینی کوردی خستۆتە پێش چاو ، هەروەهـا داوا لە زانایانو نووسەرانی کورد دەکا بە وتار بەشـــداریی ئەو کۆڕە بکەن ، کە بڕیاریداوە بۆ لێکۆڵینەوەی گیروگرفتی ڕێنووســی کوردی ببەستێ •

**٢٢٩ – بانگەوازێك لــە دەســـتەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراقەوە ، کۆڕێك بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٩٦ – ٢٩٨ •**

ئەمە هەر وتاری ژ ( ٢٢٨ )ەو سەرلەنوێ بڵاوکراوەتەوە •

**هەروەها ژ : ٤٦٢ ، ٤٦٤ ، ٤٦٥ ، ٥٠١ ، ٥٠٢ ، ٧٢٣ •**

دەنگی مامۆستا :

**٢٣٠ – پرسیارێك دەربارەی نووسراوی کۆڕی زانیاری کورد ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٨ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ل ٤٥ – ٤٦ •**

ئەم نووسینە وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە دەنگی مامۆستا لە ( کۆڕی زانیاری کورد )ی کردبوو سەبارەت بە دۆزینەوەی وشەی کوردی بۆ ( نقابة )و ( نقابة الزراعيين الفنيين ) • هەروەها ڕای د • کەمال فوئاد لەبارەی پێشنیارەکەی کۆڕەوە خراوەتە پێش چاو •

ڕ • ن • :

**٢٣١ – نووسینی بێقوورت ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٤ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ – ٥ •**

نووسەر باسی پێشخستنی زمانی کوردی دەکاتو لایەنی بیروڕاو پێشنیاری مامۆستایان : تۆفیق وەهبیو ئەمین زەکیو ع • دەگرێ •

« ڕۆناهی » :

**٢٣٢ – نڤیسینا کوردی بتیپێت لاتینی ، گۆڤاری « ڕوناهی » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل ٦ – ٩ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لەسەر بناغەی ئەلفوبێ ( ٣٣ ) پیتیەکەی جەلادەت بەدرخان چۆنیەتی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی شەرحدەکاو نموونە بۆ هەر یەکێك لە پیتەکانی ئەو ئەلفوبێیە دێنێتەوە •

## ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی :

**٢٣٣ ــ ئاوڕدانەوەیەك ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٧١ ، ل ١٦ ــ ١٧ •**

لەم وتارەدا نووسەر باسی هەوڵو پێشــــــکەوتنی زمانی کوردی کردووەو ڕەخنەی لە هەندێ دەزگای کوردی گرتووە لــە بەجێهێنانی ئەرکیاندا •

**٢٣٤ ــ ئــەم کتێبــەم خوێنــدەوە : ڕێــزمــانی کوردی ، گۆڤــاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٢ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٠ ــ ١٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا کتێبی « ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا ئەحمەد حەسەن ئەحمەدی هەڵسەنگاندووە ، کــە ســــاڵی ١٩٧٦ بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٤ ) •

**٢٣٥ ــ ئەم کتێبەم خوێندەوە ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٧ ، ساڵی ٢ ، ئاباری ١٩٧٨ ، ل ٩٠ ــ ٩٣ •**

ئەم وتارە بریتییە لە هەندێ ســــــەرنجو تێبینی دەربارەی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »ی ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، کــە ســــاڵی ١٩٧٦ بڵاویکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٤ ) •

**٢٣٦ ــ بەسەرداچوونەوەی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٣ ، ساڵی دووەم ، هەولێر ، ئابی ١٩٨٤ ، ل ٢٣ ــ ٢٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا کتێبی « ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکـــەمی بەشی کوردیی زانکۆی سەلاحەددین »ی هەڵسەنگاندووە ، کە د• نەسرین فەخریو د • کوردستان موکریانی دایانناوە •

**٢٣٧ ــ تایبەتکردن لــە زمــانــە ئەدەبیەکەماندا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٤٢ ــ ٥٠ •**

ئەم وتارە باسی زمانی ئەدەبییەو وەلآمی ئەم پرســیارانە : « چۆن چۆنی ، زمانی ستاندارد دروستبکەین ؟ ، لەکوێوە دەستپێبکەین ؟ ، ئەو شێوەیە سەرپشکە ، کە زۆرینەی کورد پێی دەئاخێوێ ؟ ، شـێوەی سلێمانی تایبەتە ڕەســـەنەکانی زمانی ئەدەبی تێدایـە یـان نـا ؟ ••• » دەداتـەوە •

**٢٣٨ – تۆمـارکردنی بـاوکو کـوڕ ، گۆڤـاری « برایەتی » ، ژ ٩ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٣٨ – ٤٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی ڕوونکردووەتەوە ، کـە ناوی ( باوکو کوڕ ) – ( مضافو مضاف الیه )نو لەبەر ئەوە لەسەر دەستووری بـاوی کوردی دەبێ لە نووسیندا ( ی ) بخرێتە سەر ناوی کوڕ •

**٢٣٩ – دیاردەیەکی زمانەوانی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٨ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٦ – ٤١ •**

ئەم وتارە دەربارەی مۆرفیمی ( تر )و ( دی ) دەدوێ •

**٢٤٠ – زانیار ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٢ ، ســــالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٢ ، ل ٢٥ – ٢٨ •**

بەبۆنەی ناونانی « کۆڕی زانیاری کورد »ەوە هەندێ لە زانـایـان ڕای خۆیان لەبارەی ئەو ناوەوە دەربڕیبوو ••• مامۆســتا ئالانیش لـەم وتارەدا بەتایبەتی سەبارەت بە وشەی « زانیار » کۆڵیوەتەوەو بیـروڕای خۆی نیشانداوە •

**٢٤١ – فێرســتە کتێبێك ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٣ ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٨٢ ، ل ٢٤ – ٢٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی هەنـدێ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردیو شێوەی چارەسەرکردنیانی کردووە •

**٢٤٢ – کاری هەبوون ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٩ ، شوباتی ١٩٨٥ ، ل ١٥ – ٢١ •**

نووســـــەر لەم وتارەدا بە دوورودرێژی لە کرداری « هەبوون » دواوەو بۆ سۆراخی ڕەگی « هـ » نموونەی لە ئاوێســـــتاو هیندیو فارسی ... یەوە هێناوەتەوە .

**٢٤٣ ـ کێشەی نووسینی ڕاناوی لکاو ، گۆفاری « ڕۆژی کوردستان » ژ ٦٤ ، بغداد ، ١٩٨١ ، ل ٧٢ ـ ٧٣ .**

مامۆستا ئالانی لەم وتارەدا لە ڕوانگەی ئەو پرسیارانەوە : ( ئـایـا جێناوی لکاو یەکسەرە ... یان دووسەرە ؟ ... دەنووسێن بـە وشـەوە یان نـا ؟ ... ) لـەبـارەی چۆنیـەتی نووســـینی جێـناوی لـکاوەوە کۆڵیوەتەوە .

**٢٤٤ ـ کێشەیەك لە زمانی کوردیدا ، بغداد ، ١٩٨١ .**

ئەم بەرهەمە ( ٢٤٤ ) لاپەڕەیە . لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژو تێرو تەســـەلە لەبارەی مۆرفێمی ( ەوە / وە )وەو لەم بەشـــانە پێکهاتووە : پێشەکی ( ل ٣ ـ ٧ ) ؛ نمایشێك ( ل ٧ ـ ١١ ) ؛ هەڵســـــەنگاندنو بەراورد لەنێوان چەندان نووسیندا دەربارەی فۆرمو هەڵکەوتی مۆرفێمی دووبارەو بەردەوامی ( ل ١٢ ـ ٥٦ ) ؛ هەڵسەنگاندنی چەنـد نووسینێك لەبارەی نیشانەی کاری ڕابوردووی نزیکەوە ( ل ٥٧ ـ ٧٤ ) ؛ هەڵکەوتی مۆرفێمەکان لە دەســـتە شێوەی شـــارباژێڕ ( بابان )دا ( ل ٧٥ ـ ١٣٢ ) ؛ لە دەستەی شێوەی موکریو سۆرانیدا ( ل ١٣٣ ـ ١٥٠ ) ؛ لە دەستەی شــــێوەی ئەردەلانیدا ( ل ١٥١ ـ ١٦٠ ) ؛ لە مەڵبەندی گۆرانو لقی جافیـدا ( ل ١٦١ ـ ١٦٦ ) ؛ لە مەڵبـەنـدی گۆرانو لقی هەورامیـــدا ( ل ١٦٧ ـ ١٧٥ ) ؛ لە لوڕیو فارسیدا ( ل ١٧٧ ـ ١٩٠ ) ؛ لە کرمانجیی سەروودا ( ل ١٩١ ـ ٢٠٢ ) ؛ پاشگرو نیشانەی ( ەوە / وە ) لە ڕووی ئەرکەوە ( ل ٢٠٣ ـ ٢٣٧ ) . ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٥٨ ) .

**٢٤٥ ــ گەردانی ( بوون ) ، گۆڤاری « ڕۆشـــــنبیری نوێ » ، ژ ٨٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٢ ــ ١٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا ئەو هەوڵانەی خـــــستووەتە پێش چـاو ، کە هەندێ لە نووسەران لە گەردانکردنی ( بوون )دا بەسەریاندا تێدەپەڕێو هەوڵیداوە شێوە ڕاستەکانی گەردانی ئەو وشەیە دەستنیشان بکا .

**٢٤٦ ــ گەشـــتێکی زمانەوانی بە چەند شیعرێکی خانای قوبادیدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٥٦ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٦٨ ــ ٧١ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە چەند شیعرێکی خانای قوبادییەوە چەپکێك زاراوەو دەقەزمانی ڕەسەنی گوڵبژێر کردووەو لەڕووی زانستی زمانـەوە شیکردوونەتەوە .

**٢٤٧ ــ گیروگرفتەکانی نووســـــــینی وشەی لێکدراو ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨١ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٤ ــ ٨ .**

مامۆستا ئالانی لەم وتارەدا باسی ئەو ئاڵۆزیو کۆسپانەی کردووە ، کە لە نووســـینی وشەی لێکدراوی هەمەچەشنەدا دێتە ڕێو هەوڵیداوە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە .

**٢٤٨ ــ لە دادگای زمانەوانیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٩ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٣٤ ــ ٣٧ .**

ئەم وتارە دەربڕینی هەندێ سەرنجو تێبینییە دەربارەی ئەو وتارەی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی ، کـە لـە ژمـارە ( ٦٧ )ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا بەناوی « کورد واتەنی »یەوەیە ( بڕوانە : وتاری ژ ٥٣٩ )و تێیدا ڕەخنەی لە کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩٤ )ی مامۆستا مەسعوود محەمەد گرتووە .

**٢٤٩ ــ لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە ( تحیة عطرة ) بە کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢٠ .**

نووسەر ئەوەی پێکداوەتەوە کە ( سلاوی بۆندار ) بەرانبەر ( تحیة عطرة )ی عەرەبی ستێکی نابەجێیەو وا ڕادەگەیەنێ کە سلاوی جوان بۆ ئەو مەبەستە لەبارترە •

**٢٥٠ – لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە ( تێدا ) ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٥ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٢٢ – ٢٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەو گۆڕانو سوانە دواوە ، کە بەسەر پرپێۆزیشنی ( تێدا )دا هاتووە •

**٢٥١ – لێکۆلینەوە دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٢٤ – ٢٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ سەرنجو تێبینی لەبارەی کەموکورتیو ناتەواویی کتێبی ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە خستووەتە پێش چاو •

**٢٥٢ – نرخاندنی ئەم کتێبە ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣٤ – ٣٨ •**

مامۆستا ئالانی لەم وتارەدا کتێبی « زمانی کوردی بۆ دەستپێکەران »ی د • کامیل بەسیر هەلدەسەنگێنێ ، کە سالی ١٩٧٦ بلاوی کردووەتەوە •

**٢٥٣ – نرخاندنێك دەربارەی ( زاراوە زانستیەکان ) ، گۆڤاری « کاروان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١ ، هەولێر ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٢ ، ل ٦٩ – ٧٢ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢ ، هەولێر ، تشرینی دووەمی ١٩٨٢ ، ل ٤٤ – ٤٨ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٣ ، هەولێر ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٢ ، ل ٤٦ – ٥١ •**

مامۆستا ئالانی لەم زنجیرە وتارەدا بە دوورودرێژی ئەو نامیلکەیەی هەلسەنگاندووە ، کە کۆڕی زانیاری کورد سالی ١٩٧٦ بەناوی

« زاراوه زانســـتییه‌كان »ه‌وه بلاوی كردووه‌تـه‌وه ( بـڕوانـه : باسـی ژ ۱۰۷۳ ، ۵۹۵ ) ٠

**۲٥٤ ـ وه‌لامـه ڕه‌خنه‌یه‌ك ، گۆڤـاری « ڕۆشـنبیری نوێ » ، به‌شی یه‌كه‌م ، ژ ۹۷ ، به‌غدا ، ۱۹۸۳ ، ل ۳۸ ـ ٤۱ ؛ به‌شـــی دووه‌م ، ژ ۹۸ ، به‌غدا ، ۱۹۸۳ ، ل ٤۱ ـ ٤۹ ٠**

ئه‌م وتاره وه‌لامی ئه‌و ڕه‌خنه‌یه‌یه ، كه ماموستا عه‌بدولستار كازم له ژمـاره ( ۹۳ و ۹٤ )ی گۆڤاری « ڕۆژی كوردســـــتان »دا لـه كتێبی « كێشـــه‌یـه‌ك لــه ڕێزمـانی كوردیدا »ی مامۆســـتا ئالانی گرتبوو ( بڕوانه : باسی ژ ۳٥۸ ) ٠

**هه‌روه‌ها ژ : ٤۹٦ ٠**

## ڕه‌ئووف پشده‌ری :

**۲٥٥ ـ تیپ گۆڕكێی وشــــه لـه زمانی كوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی كوردستان » ، ژ ۳۷ ـ ۳۸ ، به‌غدا ، ۱۹۷۸ ، ل ٥۸ ـ ٥۹ ٠**

ئه‌م وتاره باسی ئه‌و وشانه ده‌كات ، كه جێ گۆڕكێ له ده‌نگه‌كانیاندا ده‌كرێ ، وه‌ك : فڕین / ڕفین ؛ بنواڕه / بڕوانه ٠٠٠

## ڕه‌ئووف عوسمان :

**۲٥٦ ـ بڕوانه : باسی ژ ٤۲۹ ٠**

**۲٥۷ ـ پیاچوونه‌وه‌یه‌ك بــه په‌راوێزی زاراوه‌كـانی كۆڕدا ، گۆڤـاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٥٠ ، به‌غدا ، ۱۹۷٦ ، ل ۳٦ ـ ٤۲ ٠**

ئه‌م وتاره هه‌ندێ تێبینیو سه‌رنجه ده‌رباره‌ی ئه‌و زاراوانه‌ی كۆڕی زانیـــاری كورد بلاوی كردوونه‌ته‌وه ( بڕوانه : باسی ژ ۱۰٥٤ ، ۱۰٥٥ ، ۱۰٥٦ ، ۱۰٥۷ ، ۱۰٥۸ ، ۱۰٥۹ ، ۱۰٦٠ ، ۱۰٦۱ ) ٠

## ڕەشید سمۆ :

**٢٥٨ ـ چەند گلیو گازند ژ بۆنا زمانێ کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٢٢ ـ ٢٣ .**

ئەم وتارە وەڵامی مامۆستا ڕەشید سمۆیە سەبارەت بە پرسیاری : بە کام ئەلفوبێ بنووسین ؟ ، کـە لە لاپەڕە ( ٩ )ی هەمان گۆڤاردا کراوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٨٢ ) .

## ڕەشید کورد :

**٢٥٩ ـ ڕێزمانا زمانێ کورمانجی ، شام ، ١٩٥٦ .**

ئەم کتێبە ( ١١٤ ) لاپەڕەیەو بە ئەلفوبێی لاتینییەو نووســـەر لــە چەند لاپەڕەیێکی ئەم کتێبەدا لە دەنگەکانی زمانی کوردی دواوەو لــە چەند شوێنێکی کەمدا باسی ڕستەی کوردی کردووە . بەشی هەرە زۆری ئەم بەرهەمە دەربارەی مۆرفۆلۆژییەو گەلێك کێشەی گرنگ‌و پێویستی تێدا باس‌کراوە .

## ڕەشید نەجیب :

**٢٦٠ ـ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١٢ ، ســالی ٨ ، بغداد ، ١٩٤٧ ، ل ١٤ ـ ١٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی گەشەکردنی زمانی کوردی لە ساڵانی بیستدا دواوەو وای نیشانداوە ، کە مێجەر ســۆن لەم کارەدا دەورێکی گەورەی بینیوە .

## ڕەشید یاسمی :

**٢٦١ ـ مێژووی نەژادو پەیوەستەگی کورد ( بەرچڤەی بە دەستکارییەوە : قانعی هونەرو کەریم زەند ) ، سلێمانی ، ١٩٦٩ .**

لەم کتێبەدا ناوەناوە بە چەند وشەیێك باسی زمانی کوردی کراوە •
( بڕوانە : باسی ٧٣٩ ) •

## أ • ڕەواندزی :

**٢٦٢ – زمانی ئالەم ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٤ ، ساڵی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ١ – ٤ •**

ئەگەرچی ئەم وتارە بە شێوەیێکی سەرەکی لەبارەی دابەش‌کردنی زمانانی جیهانەوە دەدوێ ، بەڵام بەشێکی زۆری دەربارەی ئەسڵ‌و دەوڵەمەندی‌و دواکەوتوویی زمانی کوردی‌یە •

## د • زاری یووسف :

**٢٦٣ – گرووپەکانی کردار لە دیالێکتی سلێمانیدا ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٣ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٧٧ ، ل ٨٦ – ٨٩ •**

ئەم وتارە د • کوردستان موکریانی لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە کوردی‌و نووسەرەکەی پێنج دەستە کرداری تێدا دەست‌نیشان کردووە : « ١ – گرووپی کرداری کۆتایی هاتوو بە ( ان ) » ؛ « ٢ – گرووپی کرداری کۆتایی هاتوو بە ( ین ) » ؛ « ٣ – گرووپی کرداری کۆتایی هاتوو بە ( وون ) » ؛ « ٤ – گرووپی کرداری کۆتایی هاتوو بە ( تن ) » ؛ « ٥ – گرووپی کرداری کۆتایی هاتوو بە ( دن ) » ( بڕوانە : باسی ٨١٥ ) •

**٢٦٤ – واتای ئامرازی پێوەندی ( لە ) لە زمانی کوردیدا ( سۆرانی ) ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ژ ١٠٣ – ١٠٤ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٤٥ – ٥٠ •**

د • کوردستان موکریانی ئەم وتارەی لە ڕووسی‌یەوە کردووە بە کوردی • ئەم وتارە باسی دەورو ئەرك‌و واتاو چۆنیەتی بەکارهێنانی پریپۆزیشنی ( لە ) دەکات لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا •

هـەروەها ژ : ۸۰٦ ، ۸۰۷ ، ۸۰۸ ، ۸۰۹ ، ۸۱۰ ، ۸۱۱ ، ۸۱۲ ، ۸۱۳ ، ۸۱٤ ، ۸۱٥ ، ۸۱٦ ، ۸۱۷ ، ۱۰٥۲ •

« زانیاری » :

**۲٦٥(أ) ـ پرسیار لـە خوێنەوارانە لەبارەی گیروگرفتی نووسینی کوردی‌یەوە ، گۆڤاری « زانیاری » ، ژ ۱ ، ساڵی ۱ ، بەغدا ، ۱۹۷۰ ، ل ۱۳۱ • •**

لێرەدا دەستەی نووسەرانی گۆڤاری « زانیاری » داوایان لـە خوێنەران کردووە ، کە ڕای خۆیان دەربارەی چۆنیەتی نووسینی وشەی بێگانە دەربڕن •

زوبێر بیلال ئیسماعیل :

**۲٦٥(ب) ـ مێژووی زمانی کوردی ، بەغدا ، ۱۹۸٤ •**

ئەمە کتێبی « تأريخ اللغة الكردية »یە ، کە مامۆستا زوبێر ساڵی ۱۹۷۷ بە زمانی عەرەبی بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ۷۰٦ )و مامۆستا یووسف ڕەئووف عەلی کردوویە بە کوردی •

« ژ نشریات هیوی جوانا طلبه کوردان » :

**۲٦٦ ـ هینکر زمان کوردی ، چاپخانەی نجم استقبال ـ باب عالی ـ ابو السعود ، ۱۹۲۱ •**

ئەمە ڕابەرێکە بۆ فێربوونی زمانی کوردی لەلایەن قوتابیانی کۆمەڵەی هیواوە دانراوە • برتی‌یە لە کۆمەڵێك وشەو ڕستەو گفتوگۆ • لـە سەرەتادا بەتورکی ، دوایی بەرانبەری بـە کرمانجیی ژوورو ؛ لـە ڕیزی سێیەمیشدا بە کرمانجیی خوارو • ئەم بەرهەمە ( ٦٤ ) لاپەڕەیە •

س • :

**٢٦٧ ــ گیرەشێوێنی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٦ ، سـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٠ •**

مامۆستا س • ئەم وتارەدا بە چەند وشەیەك باسی دەوری مامۆسـتا تۆفیق وەهبی دەکات لە دانانی نیشانەی سەر پیتەکاندا •

س • س • :

**٢٦٨ ــ یەکگردنا زمانێ کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٠ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١ ــ ٢ •**

نووسەری ئەم وتارە ، ئەو هەنگاوەی لە ژمارە ( ١٩ )ی گۆڤـاری « هەتاو »دا بۆ یەکگرتنی زمانی کوردی نراوە ، پەسـەند دەکاو ئنجا هەندێ کەمو کورتیی ئەو ئەلفوبێ لاتینییە دەخاتە پێش چاو کـە تێیدا بلاوکراوەتەوە •

س • ش • :

**٢٦٩ ــ یەکێتی زمان ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١١ ، سـالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٦ •**

ئەم وتـارە بەکورتی لـە دەنگە بزوێنەکـانو نەبزوێنـەکانی زمـانی کوردی دەدوێ •

ساجید ئاوارە :

**٢٧٠ ــ دەربارەی زمانو ئەدەبی کوردی ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا »، بەشی یەکەم ، ژ ٣ ، سالی ١ ، سـلێمانی ، ١٩٧١ ، ل ٢٨ ــ ٣٠ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٤ ، سالی ١ ، سلێمانی ١٩٧١ ، ل ٣١ ــ ٣٣ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٥ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٢ ، ل ٣١ ــ ٣٤ •**

نووسەر لە بەشی یەکەمدا باسی ئەسڵی زمانی کوردیو شوێنی لەنێو خێزانی گەورەی زمانە ئێرانیەکاندا دەکاو لە دەوڵەمەندیو فراوانیی زمانی کوردی دەدوێ ... لە بەشی دووەمدا دەربارەی دیالێکتە سەرەکییەکانی زمانی کوردی دەکۆڵێتەوە ... بەشی سێیەم بە ناوی « کام دیالێکتی سەرەکیی کوردی ببێ بە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردی » یەوەیە .

سالار ـ مستەفا قەرەداغی :

**٢٧١ ـ زبان چۆن پەیدابووە ؟ ، سلێمانی ، ١٩٥٨ .**

مامۆستا مستەفا قەرەداغی لەم نامیلکە ( ٣٨ ) لاپەڕەیی‌یەدا بە گشتی ئەو تیۆری‌یانەی خستووەتە پێش چاو کە باسی پەیدابوونو گەشەکردنی زمان دەکەن ، بەڵام لەکۆتاییدا لەبارەی میللەتانی زووی کوردستانو باری ئەمڕۆی زمانی کوردیشەوە دواوە .

سەروەت محەمەد ئەمین :

**٢٧٢ ـ ئەستێرەگەشەو سەرنجێك ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢٦ ـ ٣٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا ئەو فەرهەنگە کوردی ـ عەرەبی‌یەی هەڵسەنگاندووە ، کە مامۆستا فازیل نیزامەدین ساڵی ١٩٧٧ بەناوی « ئەستێرەگەشە »ەوە بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٤٥ ) .

سەعید صدقی :

**٢٧٣ ـ مختصر صرفو نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .**

ئەم کتێبە ( ٧٦ ) لاپەڕەیە . نووسەر لە پێشەکیدا ( ل ٣ ـ ٦ ) دەربارەی ئەلفوبێی کوردی هەندێ زانیاری تۆمارکردووە . دوایی لەسەر

ڕێبازی ڕێزمانی عەرەبی وشەی بەســەر ( ناو )و ( کردار )و ( پیت )دا دابەش‌کردوومو لێیانی کۆلیوەتەوە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٤٨ )•

سەلام :

**٢٧٤ – لێکۆلینەوە ، گۆڤاری « دەنگی گیتیی تازە » ، ب ١ ، ژ ٦ ، بەغدا ، مارتی ١٩٤٤ ، ل ٢٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی دەوری بەرزی مامۆســتا تۆفیق وەهبی دەکا لە مەسەلەی پێشخستنی زمانی کوردیداو لەدوایــدا ڕەخنــە لــە بەکارهێنانی چەند وشەیەك دەگرێو داوای لێدەکا بۆیان ساغ‌بکاتەوە •

ش • م • :

**٢٧٥ – تیپی لاتینی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٦٦ ، سالی ٦ ، هەولێر ، ١٩٥٩ ، ل ٥ – ٧ •**

خاوەنی ئەم وتارە بە هەندێ بەلگەوە ئەلفوبێی لاتینی بۆ نووسینی کوردی پەسەند دەکات •

د • شاکیر خەسباك :

**٢٧٦ – کوردو مەسەلەی کورد ، سلێمانی ، ١٩٦١ •**

ئەمە کتێبی « الکرد والمسألة الکردیة »ی د • شاکیر خەسباکە ، کە سالی ١٩٥٩ لە بەغدا بلاوی‌کردۆتەوەو مامۆستا ئەمین مۆتابچی کردوویە بە کوردی • لە ( ل ٩ – ٢٠ )دا لە باسی « ڕیشــەی نەژادی کورد »دا دەربارەی ئەسلی وشەی ( کورد )و ( زمانی کوردی ) گەلێ زانیاری بەرچاو دەکەوێ • ( بڕوانە : باسی ژ ٧٠٩ ) •

شاكير فەتتاح ئەحمەد :

**٢٧٧ – گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردیو شێوەی چارکردنیان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١١٢ – ١٣٤ .**

باسەکانی ئەم وتارە ئەمانەن : « سەرەتا » ( ل ١١٢ – ١١٥ ) ؛ « گیروگرفتی نووسینی دەنگەکان » ( ل ١١٥ – ١٢٢ ) ؛ « گیروگرفتی وشەی سادەو داڕێژراو » ( ل ١٢٢ – ١٢٤ ) ؛ « وشەی ناسادە » ( ل ١٢٤ – ١٢٦ ) ؛ « گیروگرفتی نووسینی کردار لەگەڵ ڕاناو لەڕووی پێکەوەنووسانو پێکەوە نەنووسانەوە » ( ل ١٢٦ – ١٢٧ ) ؛ « گیروگرفتی ئامرازە لێکدەرەکان » ( ل ١٢٨ ) ؛ « گیروگرفتی چۆنێتی نووسینی وشە لێکدراوەکان لەبارەی پێکەوە نووساندنو نەنووساندنەوە» ( ل ١٢٨ – ١٢٩ ) ؛ « گیروگرفتی دانانی نیشانەکان » ( ل ١٢٩–١٣٣ ) ؛ « چەند سەرنجێکیتر » ( ل ١٣٣ – ١٣٤ ) .

شوان :

**٢٧٨ – زمانو شێوە ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٨٢ ، سالی ٧ ، هەولێر ، ١٩٦٠ ، ل ٦ – ٨ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی نەژادو ئەسڵی زمانی کوردییەوە دواوەو باسی دەولەمەندیی زمانی کوردی کردووە .

شوکرییە ڕەسووڵ :

**٢٧٩ – دیسانەوە ( تیپ )و ( پیت ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٢١ – ٢٢ .**

نووسەر لەم کورتە وتارەدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ( پیت ) بۆ ( حرف ) لەبارترە ، وەك ( تیپ ) .

شوكور مستەفا :

**٢٨٠ – بەكارهێنانی ئەوزاری ( یش ) بەپێی دەستووری زمانی کوردی ، گۆڤاری (( بەیان )) ، بەشی یەکەم ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٤ – ١٥ و ٢٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ و ٥٣ .**

مامۆستا شـــوکور مستەفا لەم وتارەدا دەربارەی ئامرازی ( یش ) ، وەلاَمی ئەم پرسیارانە : (( ( یش )ە یان ( ش )یە ؟ )) ؛ (( بۆچی مەبەستێ بەکاردێ ؟ )) ؛ (( ئەلکێ بە کوێی وشەوە ؟ ))ی داوەتەوە .

**٢٨١ – ئاسکوێژی ، (( گۆڤـــاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەســـتەی کورد )) ، ب ١٣ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٢١٤ – ٢٢٩ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا لە ماناو ئەرکی ئاســـــــکوێژی کۆلیوەتەوەو ئنجا لەوە دواوە ، کە ئاسکوێژییەکانی زمـانی کوردی بۆ چ مەبەستێ ، بە چ هۆیەکەوە بەکاردەهێندرێن . لەکۆتاییشدا دە چەشن ئاسکوێژی لە زمانی کوردیدا دەستنیشان کردووە .

**هەروەها ژ : ٣١ ، ١٠٧٣ ، ١٠٧٤ .**

ع . ع . شەونم :

**٢٨٢ – چۆنیەتی وشەسازی لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ١٩ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥ – ٧ .**

ئەم وتارە بریتییە لە هەندێ ســــــەرنجو تێبینیو ئامۆژگاری بۆ دارشتنو دانانی هەندێ وشەو زاراوە .

**٢٨٣ – دەستووری نووسینی کوردی ، گۆڤاری (( برایەتی )) ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٢٢ – ٢٦ .**

نووســـــەر لەم وتارەدا باسی وێنـــەی دەنگەکانی زمانی کوردیو چۆنیەتی نووسینیانی کردووە .

**٢٨٤ – زمانی کوردی ویژەی فۆلکلۆرە ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٠ و ٢٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا بە هەندێ نموونەوە لەوە دواوە کە چۆن ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی کاری کردووەتە سەر زمانو بووە بە هۆی دەوڵەمەندیو فراوانکردنی •

شێخ حەسەن :

**٢٨٥ – بەشێك لە قەواعیدەکەی پایە بڵند تۆفیق وەهبی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٤ – ١٦ ؛ ژ ٥ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٧ – ٨ •**

ئەم دوو وتارە بەشێکی کەمی سەرەتای کتێبی « قواعد اللغة الکردیة »ی مامۆستا تۆفیق وەهبییە و مامۆستا شێخ حەسەن کردوویە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ٦٩٧ ) •

**٢٨٦ – ڕەخنەیێکی زانستی لە مامۆستای بەڕێز جەمیل ڕۆژبەیانی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٤ – ٨ •**

نووسەر ڕەخنەی لەو وتارەی مامۆستا ڕۆژبەیانی گرتووە ، کە لە ژمارە ( ١٠ )ی سالی ( ١ )ی گۆڤاری « هیوا »دا بڵاویکردووەتەوە • بەشی زۆری ئەم وتارە باسی پێویستی دانانی چوکلە بۆ ( ڕ )ی سەرەتای وشەو ڕەتکردنەوەی نووسینی ( ر ) بۆ ( ڕ )ی قەڵەوە •

**٢٨٧ – زمانەکەمان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٣ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٩١ – ٩٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە دوو وشەی « زبان »و « زانیاری »ی کۆڵیوەتەوە •

**٢٨٨ – زمانەکەمان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٥ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٣١ – ٣٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا جارێکی‌تریش دەربارەی وشەی « زانیاری » دواوەو بە هەندێ بەڵگەی نوێ واتای لێکداوەتەوەو وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە ، کە بەهەڵە بەکاری‌دێنن •

**٢٨٩ ـ زمانەکەمان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١٥ ـ ١٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ( ی )ی ئیزافەو واوی عەتف دەکاتو بە بەڵگەو نموونەوە وای‌دەسەلمێنێ ، کە پێویستە :

١ ـ ( ی )ی ئیزافەی بەدوا ( ی )دا هاتوو بنووسرێ •

٢ ـ واوی عەتف بەجیا بنووسرێو بە وشەی پێش خۆیەوە نەنووسێنرێ•

**٢٩٠ ـ زمانەکەمان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٧ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٨٩ ـ ٩١ •**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی وشەی « ئاشتی »و « خوێندکار »و « گیونامە » کۆڵیوەتەوە •

**٢٩١ ـ وشەی بەڕێوەبەرایەتی‌و زانیاری ، گۆڤاری « نەورۆز » ، ژ ٣ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٣٧ ـ ٤٢ •**

مامۆستا شێخ حەسەن لەم وتارەدا لەوە کۆڵیوەتەوە ئایا ئەوە ڕاستە کە هەندێ کەس وشەی « بەڕێوەبەرایەتی »و « زانیاری » لەباتی دوو وشەی عەرەبی « مدیریة »و « معارف » بەکاردێنن یان نا •

**هەروەها ژ : ٢٠٩ ، ٢١٠ •**

## شێخ محەمەدی خاڵ :

**٢٩٢ ـ ئاگاداریی زمان ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٨ ، سالی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ٢٧ ـ ٣٠ •**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە ئامۆژگاری کردنی کوردان ، بە زمانی زگماکیان بنووسن‌و قسەبکەن‌و ئەمەی بە ڕێگەی سەرەکیی پاراستنی زمان داناوە •

**٢٩٣ ـ پێشگرو پاشـگر ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٥٦ ـ ٢٧٩ ٠**

ئەمە ڕەخنەیە لەو وتارەی دە نەسرین فەخری ، کە لە بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بەناوی « پێشـگرو پاشگری ( ڤە ) یان ( وە ) لە زمانی کوردیدا »وە بـلاوی کـردووەتـەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٣٦ ) ٠

**هەروەها ژ : ١٠٢٣ ٠**

## شێخ مووسا بەهرامی :

**٢٩٤ ـ چەند وشەیەکی باکوورو سـوران ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٧ ٠**

بریتی‌یە لە ( ٣٠ ) وشە بە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی ـ کرمـانجیی ژووروو و خواروو ـ کوردی ٠

## ص ٠ :

**٢٩٥ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٥ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ٢ ٠**

نووسـەری ئـەم وتارە بەکورتی لەبارەی نیشـانەی ( ان )ی کۆوە دواوە ٠

## ص ٠ ش ٠ :

**٢٩٦ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٢٢ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١٧ ـ ١٨ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا لە سەرەتادا لایەنی ئەو بیروڕایانەی گرتووە ، کە ع • قڕگەیی لە ژمارە ( ١٧ – ١٨ )ی گۆڤاری « هەتاو »دا لەبارەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی کوردییەوە خستبوونی‌یە پێش چاو ( بڕوانە : باسی ژ ٤١٥ ) • دواتریش کەمێ لە شێوەکانی کوردیو ڕێزمانی کوردی دواوە •

ص • ط • :

**٢٩٧ – یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ١٤ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ٣ – ٤ •**

ئەم نووسینە بە شێوەی کرمانجیی ژووروەو بەکورتی باسی شێوەکانی کوردی دەکاتو لە پێویستی لەیەکترگەیشتن دەدوێ •

صابر گرد عازەبانی :

**٢٩٨ – چۆن فێری زمانی عەرەبی دەبیت ، چاپی چوارەم ، سلێمانی ، ١٩٧٨ •**

ئەم کتێبە ( ١٤٠ ) لاپەڕەیە • فەسلی یەکەم ( ل ٥ – ١١ )ی دەربارەی پیتەکانی کوردی‌یە ؛ لە فەسلی دووەم ( ل ١٢ – ٢٢ )دا کەمێ باسی ڕێزمانی کوردی کراوە • فەسلی سێیەم تا هەشتەم لە شێوەی فەرهەنگێکی عەرەبی – کوردی‌دایە ، کە وشەو دەستەواژەو ڕستەو وتووێژی بەپێی بابەت تێدا جێ‌کراوەتەوە •

**هەروەها ژ : ١٠٢٥ ، ١٠٢٦ •**

صادق بەهائەدین ئامێدی :

**٢٩٩ – ئیدیەمێت کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٢ •**

ئەم کتێبە ( ١٦٢ ) لاپەڕەی گەورەو ( ٢٥٠٠ ) ئیدیۆمێکی دیالێکتی ژووروی کوردی‌یە • ئیدیۆمەکان بە کوردی شەرح کراونو بە عەرەبی مانایاندراوە •

**٣٠٠ – تیپ یا پیت ، گۆڤاری « ڕوناهی » ، ژ ٢ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٦٢ ، ل ٨ – ٩ •**

نووسەر لەم وتارەدا ، کە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسیوێتی ، لەوە دەدوێ کە بۆ « حرف »ی عەرەبی لە دوو وشەی « پیت » یان « تیپ » کامیان ڕاستترە بەکاربهێنرێ •

**٣٠١ – جەلادەت بەدرخان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٥٥ – ٢٨٦ •**

لە چەند شوێنێکی ئەم وتارەدا باسی هەندێ لە کارە زمانەوانی‌یەکانی جەلادەت بەدرخان کراوە •

**٣٠٢ – ڕێزمانا کرمانجی ، بەغدا ، ١٩٧٦ •**

ئەم کتێبە ( ١٤٦ ) لاپەڕەیەو بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە • باسەکانی لەبارەی فۆنەتیکو مۆرفۆلۆژی دیالێکتی ژووروی زمانی کوردی‌یەوەن •

**٣٠٣ – ڕێنڤیسینا کوردی ب تیپێت عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد »، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٣٥ – ١٤٨ •**

ئەم وتارە بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی ئەوە دەکات ، کە فۆنەتیکو ڕێزمان دەبێ ئاوێنەی ڕێنووس بنو ئنجا لە نەبوونیی هەندێ وێنەی دەنگە بزوێنەکان دەدوێو هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدات •

**٣٠٤ ـ زاريێت زمانێ كوردی ئو زمانێ ئەدەبی ئو نڤیسینێ ، گۆڤاری « ڕۆژی كوردستان » ، بەشی یەكەم ، ژ ٤ ، سالی ٢ ، بەغـــدا ، ١٩٧٣ ، ل ٥٦ ـ ٥٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ٦ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٥٧ ـ ٥٩ ؛ بەشی ســـێیەم ، ژ ١٦ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٨ ـ ٦٢ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ١٩ ـ ٢٠ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥١ ـ ٥٥ .**

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا ئەو نووسینانەی د . کـەمـال فوئـاد هەڵدەسەنگێنێ‌و موناقەشە دەكات ، کـــە لەبارەی دیالێکتەکانی زمـانی کوردییەوە بڵاوی‌كردوونەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٨٠ ) .

**٣٠٥ ـ زمانەكەمان ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، بەشی یەكـەم ، ژ ١ ، ســـالی ٢ ، ســـلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٧٧ ـ ٨١ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١٤ ـ ١٨ .**

مامۆستا صادق بەهائەدین ئەم وتارەی بەشێوەی كرمانجیی خواروو نووسیوەو هەوڵی‌داوە هەڵەكانی ئەو وتارەی أ. جێژنی ڕاستبكاتەوە ، کـــە لـە ژمارە ( ١١ )ی ســـــالی ( ١ )ی گۆڤاری « ڕۆژی نوێ »دا بڵاوی‌كردبووەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٩٩ ) ... لێرەدا نووســـەر لەبارەی بەكارهێنانی جێناوەكانو تێداچوونی ( د )ی هەندێ وشـە لـە كرمانجیی ژووروو‌داو بوونی ( و ) بە ( ڤ )و بەكارهێنانی ( ێك ) وەك نیشـــانەی نەناســیاوی لـە كرمانجیی خواروو‌داو بوونی بـە ( ەك ) لە کـرمـانجیی ژوورووەدا ... دواوە .

**٣٠٦ ـ زمانێ كوردی ، گۆڤاری « ڕوناهی » ، ژ ٧ ـ ٨ ، بەغـــدا ، ١٩٦١ ، ل ٢٢ ـ ٣٩ .**

ئەم وتارە بە شێوەی كرمانجیی ژووروو نووسراوەو دەربارەی تاڵكو كۆیە لە زمانی كوردیدا .

**٣٠٧ ـ زمانێ كوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی كوردســــــــتان » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ ـ ٤١ .**

ئەم وتارە بەشێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی جێناوە کەسی‌یەکانی دیالێکتی ژوورووی کوردی دەکات •

**٣٠٨ ـ زمانێ کوردی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٣ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٥٧ ـ ٥٩ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لە هەندێ جیاوازی نێوان دیالێکتی ژووروو و خواروو دواوەو باسی پێویستی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی کردووە •

**٣٠٩ ـ زمانێ کوردی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣١ ـ ٣٢ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژوورووەو لە وشەی ( پیت )و ( تیپ )ی کۆلیوەتەوە •

**٣١٠ ـ زمانێ کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥ ـ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٤٩ ـ ٥١ •**

ئەم وتارە کە بە شێوەی کرمانجیی ژوورووە بەکورتی باسی کردارو کاتەکانی کردار دەکات •

**٣١١ ـ ژ ئاستەنگێت درێکا ئێکانی‌یا زمانێ کوردی‌دا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢١ ـ ٢٢ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٣٧ ـ ٤٦ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لە هەندێ وشە دەدوێ ، کە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك یەك دەوترێن ، بەڵام لە ماناو بەکارهێنانیاندا جیاوازن •

**٣١٢ ـ کورتکرنو پێتگۆرکێ‌یا دەنگان د زمانێ کوردی‌دا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢٧ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٠ ـ ٥٦ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لە دوو کێشەی گەورە دواوە : ١ ـ کورتکردنەوەو تێداچوونی هەندێ دەنگ لە کاتی لێکداندا ؛ ٢ ـ دەنگەگۆڕکێ ، واتە گۆڕینی دەنگێك بە دەنگێکی‌تر •

**٢١٣ - گراماتیکا زمانێ کوردی ، گۆڤـاری « ڕۆنـاهی » ، ژ ١ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٢٤ - ٢٨ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لـە بەشــــە ئاخاوتنی « جێناو » دەدوێ •

**٢١٤ - نێرینەو مێینی ( نێرینەو مێینە ) لـــە زمـانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٥٧ - ٥٩ •**

ئـەم وتارە بـە شــــێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو لەبارەی جینسەکانی ناوەوە لە شێوەی ژووروودا دواوە •

**٢١٥ - یـەکینی ئوپرینی د زمـانێ کـوردیـدا ، گـۆڤـاری « ڕۆژی کوردستان « ، بەشی یەکەم ، ژ ٢٨ - ٢٩ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٦ - ٦٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٣٠ - ٣١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١ - ٤٥ •**

ئەم وتارە بە کرمانجیی ژووروو نووسراوەو دەربارەی تاك‌و کۆ لـە زمانی کوردیدا دەدوێ •

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ٥٠١ ، ٩٨٦ •**

## صالح حسین حەسەن پشدەری :

**٢١٦ - کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ •**

ئەم کتێبە ( ٩٠ ) لاپەڕەیەو برتییە لە شـەش بەش : « ١ - یێژەی پیتی » ( ل ٧ ) ؛ « ٢ - وشەی ناوی » ( ل ٧ - ٤٠ ) ؛ « ٣ - وشـەی فرمانی » ( ل ٤٠ - ٥٦ ) ؛ « ٤ - وشـەی ڕاناوی » ( ل ٥٧ - ٦٠ ) ؛ « ٥ - وشــــەی ئامرازی » ( ل ٦٠ - ٦٦ ) ؛ « ٦ - ڕســـــتە » ( ل ٦٦ - ٨٩ ) •

## صەباح غالب :

**٣١٧ ـ باوەشی تیشکی زمان ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٤٧ ـ ٤٨ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٦١ ـ ٦٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٤٩ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٦٤ ـ ٩٦ ٠**

ئەم وتارە ڕەخنەیە لە کتێبی « زمانی کوردی لەبەر ڕۆشـــــنایی فۆنەتیکدا »ی د٠ ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کە سالی ١٩٧٦ لـەلایـەن کۆڕی زانیاری کوردەوە بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٦ ) ٠

**٣١٨ ـ کورتە هەلسـەنگاندنێکی کتێبی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤـاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨١ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٥ ـ ٣٥ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ ڕەخنەو سەرنجو تێبینی سـەبارەت بـە کتێبی « ڕێـزمـانی کوردی » ( بـەرگی یـەکـەم ـ مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم ـ نـاو )ی د ٠ ئەوڕەحمانی حاجی مارف خســـتووەتە پێش چاو ( بڕوانە : باسی ژ ٥٣ ، ٧١ ) ٠

## صەلاح شوان :

**٣١٩ ـ زمانو ئەدەب ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧ ـ ١١ ٠**

ئەم وتارە لە هەندێ شـــوێندا لەڕووی ڕەوانبێژی‌یەوە باســـی بەکارهێنانی وشەی جوانو ناسك دەکات لەلایەن شاعیرەوە ٠

**٣٢٠ ـ لەگەل نووســـینەکانی ئەکادیمیەکاندا ـ دەربارەی ئەدەبو زمان ـ ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ٥١ ، بەغــدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٩ ـ ٧٤ ٠**

ئەم وتارە ئەگەرچی بەگشتی ڕەخنەیە لە دوو وتاری « شــیعری بەرزی هەنـدێ لـە شـــاعیرە کـەم ناسراوەکانی کورد »ی د ٠ مـارف

خەزنەدارو « دەربارەی قەســـــیدەیێکی تازە دۆزراوەی حاجی قادری کۆیی »ی د • ئیحسان فوئاد ، کە لە ژمارە ( ١٩ )ی « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات »دا بڵاوکراونەتەوە ، هەروەها هەندێ سەرنجی زمانەوانی لە لێکدانەوەی ژمارەیەك وشەدا تێدا خراوەتە پێش چاو •

طاهیر صادق :

**٣٢١ ــ ئاوڕێك لە نووســــینی کۆنو نوێمان ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ٢٣ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٩ و ١٥ •**

نووســەر لـەم وتارەدا باسی پەیدابوونی هـەنـدێ پیتی کوردی کردووەو باری نووســـینی ئەمڕۆی تاڕادەیەك بە باش داناوەو داوای چارەسەرکردنی ئەو کەمو کورتیانەی کردووە کە ماون •

**٣٢٢ ــ پیتە ناسازەکان ، گۆڤاری (( هیوا )) ، ژ ٣٣ ، ســـالی ٥ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٣٣ ــ ٣٥ •**

ئـەم وتـارە بەکورتی باسی دەنگە بزوێنەکـانی زمـانی کوردییەو ژمارەیانی بە حەوت دەنگ داناوە •

**٣٢٣ ــ جارێکیتریش پیتەکانی کوردی ، گۆڤاری (( نووسەری کورد )) ژ ٣ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٢٦ ــ ٢٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە چەند ڕوویەکەوە لە پیتەکانی نووســـینی کوردی دواوەو لە کۆتاییدا وا ڕادەگەیەنێ کـە ژمارەی پیتەکانی کوردی ئـەگـەر پیتی ( خ ، غ )یان لـەگــەڵ دانێ ( ٣٤ ) پیتن • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٤٦ ) •

**٣٢٤ ــ دوو پیتی بێوێنە ، گۆڤاری (( هیوا )) ، سالی ٤ ، بەغــدا ، ١٩٦١ ، ل ٥٢ ــ ٥٣ •**

مامۆستا طاهیر صادق وا پێشنیار دەکا بۆ ئەو ( ك )و ( گ )انەی لەپێش ( ی ، ێ ، وێ ، وی )یەوە دێنو شێوەی تەلەفوزیان دەگۆڕێ ، پیتی تایبەتی دابڕێژرێ ( لەبارەیەوە بڕوانە : ژ ۱۲۰ ، ٦۰۸ ) •

**۳۲۵ – ڕۆژژمێر یان ڕۆژمێر ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ۳۲ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ۱۹٦۱ ، ل ۵۰ – ۵۱ •**

مامۆستا طاهیر صادق لەم وتارەدا وا پێشنیار دەکا بنووسرێ « ڕۆژمێر » • بۆ بەڵگەش هەندێ وشەی لێکدراوی وەك : « قژن = قژ + ژن » ؛ « ئاوێنە = ئاو + وێنە » ••• ێ هێناوەتەوە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ۱۱۵ ) •

**۳۲٦ – ڕێنووس – چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکووك ، ۱۹٦۹ •**

ئەم کتێبە ( ۱٤٤ ) لاپەڕەیە • نووسەر لەم بەرهەمەدا بە دوورو درێژی لە گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیو چارەسەرکردنیان دواوە •

**۳۲۷ – ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ۹ ، بەغدا ، ۱۹۸۲ ، ل ۱٤۹ – ۱۷۳ •**

باسەکانی ئەم وتارە : « دەنگو پیتەکانی کوردی » ( ل ۱٤۹ – ۱۵۰ ) ؛ ( نووسینی ژمارەکان لە ۱۱ تا ۱۹ » ( ل ۱۵۱ – ۱۵۲ ) ؛ « ناوەکانی لێکدراو » ( ل ۱۵۲ – ۱۵۳ ) ؛ « لە کوردیدا نیسبەت » ( ل ۱۵۳ – ۱۵۵ ) ؛ « ئاوەڵناوی باڵا » ( ل ۱۵۵ – ۱۵۷ ) ؛ « پیتەکانی پێوەندی » ( ۱۵۷ – ۱٦۰ ) ؛ « نووسینی وشەکانی واودار » ( ل ۱٦۰ – ۱٦٤ ) ؛ « چۆنیەتی نووسینی پێشگرەکان » ( ل ۱٦٤ – ۱۷۳ ) •

**۳۲۸ – زمانەوانی – لەگەڵ دوکتۆر عەبدولڕەحمان مارفدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ۱۷ ، بەغدا ، ۱۹۷٤ ، ل ۱۷ •**

ئەمە ڕەخنەیە لەو بەندەی د • ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کە لە ژمارە ( ۱٤ )ی گۆڤاری « بەیان »دا لە باسی فۆنەتیکی کوردیدا وتوویە :

« ئەگەر دوو دەنگی وێکچوو ، یاخود لێك نزیك بکەونە پاڵ یەك لـە دەربڕینـدا یەکێکیـان ونده‌بێ ، وەك ( کورتر = کورت + تر ) ••• » ( بڕوانە : باسی ژ ٦٥ ) •

**٣٢٩ – فەرهەنگی خاڵ ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٥ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل ٦٨ – ٦٩ •**

ئەم وتارە بریتییە لە کورتە نرخاندنێك و چەند ڕەخنەیەك لـە بەرگی یەکەمی « فەرهەنگی خاڵ » ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٢٣ ، ٢١٨ ) •

**٣٣٠ – ناو بچووككردنەوە ، گۆڤاری « دەنگی مامۆسـتا » ، ژ ٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٧١ ، ل ٤٢ – ٤٣ •**

نووسـەر لەم وتارەدا ( ٢٦ ) پاشگری بۆ بچووككردنەوەی ناو خستۆتە پێش چاو •

**٣٣١ – نووسینی سـەرەتای کتێب ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١٠ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٢٢ •**

نووسـەر لەم وتارەدا لە وشەی ( سەرەتا )ی کۆڵیوەتەوەو وای بەلاوە باشترە ، کە ئەم وشـەیە بەرانبەر ( مقدمة ) بەکاربهێنرێ ، نەك وشەی « پێشەکی » •

**٣٣٢ – هەڵەی نووسین ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٣ ، سـاڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٦٥ – ٦٧ •**

مامۆستا طاهیر صادق لەم نووسینەدا ڕای خۆی سـەبارەت بـە نووسینی وشەی داڕێژراوو لێکدراوو وشەی کۆتایی هاتوو بە ( ی ) لـە دۆخی ئیزافەداو واوی پێوەندی ••• نیشانداوە •

ع • :

**٣٣٣ – ئیملای کوردی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٥ – ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ – ٦ •**

مامۆستا ع . لەم وتارەدا داوا لە زانایانی کورد دەکا هەوڵبدەن بۆ دانانی دەستوورێکی ڕێکوپێکو ئەلفوبێیەکی وا کە کوردی بەئاسانی پێ بنووسرێتو بە ڕەوانی پێی بخوێنرێتەوە .

٣٢٤ – نووسینێکی ڕەوانو بێقۆرتم لێی نەوێت ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٣ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ – ٨ .

نووسەری ئەم وتارە تێکڕای نووسینەکانی « گەلاوێژ » لە ڕووی زمانەوە هەڵدەسەنگێنێو هەندێ هەڵەیان دەخاتە پێش چاوو لە کۆتاییشدا بۆ پێشخستنی نووسینو زمانی کوردی چەند پێشنیارێکی کردووە .

## عادیل عیرفان :

٣٢٥ – هەلمەقۆکردن بە نووسینی کوردیو وشەی عەرەبی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٨ – ٢٠ .

مامۆستا عادیل لەم وتارەدا باسی پاشاگەردانیی نووسینی وشەی عەرەبی کردووە .

## عوبەیدیللا ئەیوبیان :

٣٢٦ – بەرڕەسی وە تەحقیقی زەبان وە ئەدەبیاتی کوردی ، تەورێز ، ١٩٥٦ .

## عوسمان خەزنەیی :

٣٢٧ – کاتەکانی فرمانی ڕابوردوو لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « بەرەو ڕووناکی » ، ژ ٢ ، هەولێر ، ١٩٧٣ ، ل ٣٠ – ٣١ .

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی لە چۆنیەتی سازبوونی کرداری ڕابوردووی ڕەبەقو بەردەوامو نزیکو دوور ... دواوە .

## عوسمان صەبری :

**٣٣٨ ـ ئەلفبێیا کوردی ، شام ، چاپخانەی کەرەم ، ١٩٥٥ .**

ئەمە نامیلکەیەکی ( ٥٦ ) لاپەڕەیی‌یەو بریتی‌یە لە ژمارەیـەك دەرسی ڕێکوپێك لە فێربوونی زمانی کوردیدا . لە کۆتاییشدا هەندێ چیرۆك‌و شیعری کوردی تێدا تۆمارکراوە .

**٣٣٩ ـ ئەلفابێیا کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ١٩ ـ ٢٠ .**

ئەم وتارە وەڵامی مامۆستا عوسمان صەبری‌یە دەربارەی پرسیاری بە کام ئەلفوبێ بنووسین ، کە لە لاپەڕە ( ٩ )ی هەمان گۆڤاردا کراوە . ( بڕوانە : باسی ژ ٦٨٢ ) .

**٣٤٠ ـ پرسیارا گەلاوێژی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١ ، سالی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ٥٨ ـ ٦٠ .**

مامۆستا عوسمان صەبری بۆ وەڵامی پرسیاری گۆڤاری « گەلاوێژ » ( بڕوانە : باسی ژ ٤٨٤ ) سەرەڕای پەسـەندکردنی ئەلفوبێی لاتینی ، هەندێ بەڵگەشی بۆ ئیسپاتکردنی بیروڕاکەی هێناوەتەوە .

## عوسمان عارف :

**٣٤١ ـ چۆن فێری زمانی کوردی ئەبیت ، کەرکووك ، ١٩٧١ .**

## عومەر دزەیی :

**٣٤٢ ـ بەراوردکردنێکی ( ڕابـوردووی تـەواو )ی کوردی لـەگـەڵ ( Perfect )ی زمـانـە ئەوروپاییـەکـان ، گۆڤـاری « کاروان » ، ژ ٢٤ ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل ٥ ـ ٨ .**

نووسەر لەم وتارەدا بەراوردی کرداری « هەبوون »و « بوون »ی کوردی ( لەگەڵ ) زمانی ئینگلیزیو فەرەنسەییو ئەڵەمانیو ئیسپانیو ئیتالیانی کردووە .

۳٤۳ - لاتینی چییە ؟ ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ۹۸ ، بەغدا ، ئەیلوولی ۱۹۸٤ ، ل ٥۸ - ٦۱ .

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ وشەی لێك نزیکی کوردیو لاتینی خستووەتە پێش چاو .

## عومەر شەمەیی :

۳٤٤ - نووسینی کوردی ( ٤۸ ) ساڵ لەمەوبەر ، گۆڤاری « بەرەو ڕووناکی » ، ژ ۳ ، هەولێر ، ۱۹۷۳ ، ل ۱۲ - ۲۳ .

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ بەندی چەند نووسینێك لە گۆڤاری « دیاریی کوردستان »ەوە دەخاتە پێش چاوو لەگەڵ هی نوێدا بەراوردی دەکا بەنیازی نیشاندانی ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی نووسینی کوردی .

## عومەر عەبدولڕەحیم :

۳٤٥ - ڕابەری مامۆستا ، سلێمانی ، ۱۹٦۱ .

ئەگەرچی ئەم نامیلکە ( ٥۰ ) لاپەڕەییە بەگشتی ئامۆژگارییە بۆ مامۆستایانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە وتنەوەی ئەلفوبێی کوردیدا ، بەڵام لە هەندێ شوێندا چەند کێشەیێکی زمانی کوردی باس کردووە ، وەك : جیاکردنەوەی پیتە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانو لێدوان لێیان ؛ جیاوازی نێوان ( و ، وو ، ۆ ) ؛ جیاوازی نێوان ( ی ، یی ، ێ ) ، جیاوازی نێوان ( ر ، ڕ ) ...

۳٤٦ - ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ۹ ، بەغدا ، ۱۹۸۲ ، ل ۱۷٤ - ۱۸٥ .

ئەم وتارە لە پێشدا باسی مەرجەکانی باشترین ڕێنووس دەکاو دوایی لە پیتە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانی زمانی کوردی دەدوێو ئنجا گیروگرفتی وێنەی هەندێ دەنگو وشەی دەستنیشان کردووە .

هەروەها ژ : ٣٤٧ ، ١٠٤٠ ، ١٠٤١ ، ١٠٤٢ .

## عومەر عەبدولڕەحیمو عەبدوڵڵا ڕەضا :

**٣٤٧ ـ چۆنیێتی وتنەوەی ئەلفوبێ لـە قوتـابخانەکـانـدا ، گۆڤـاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ١٠ ، سالی ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥١ ـ ٦٤ .**

بەشێکی زۆری ئەم بەرهەمە دەربارەی ئەلفوبێی کوردییەو جگە لە جیاکردنەوەی بزوێنو نەبزوێنو لێدوانیان ، ئەم باســانەشی تیا کراوە : « جیاوازیی نێوان ( و ، وو ، ۆ ) » ( ل ٥٣ ) ؛ « جیاوازیی ( ر ، ڕ ) » ( ل ٥٣ ـ ٥٤ ) ؛ « جیاوازیی نێوان ( ی ، ێ ، یی ) » ( ل ٥٤ ـ ٥٥ ) ؛ « جیاوازیی نێوان ( ل ، ڵ ) » ( ل ٥٥ ) ...

## عومەر مارف بەرزنجی :

**٣٤٨ ـ سەعید کابانو یەکەم چووزەرەی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤٩ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٩ ـ ١١ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە کتێبی « مختصر صرفو نحوی کوردی »ی مامۆستا سەعید صدقی کابان دواوەو ئەوەی ئیسپات کردووە ، کە یەکەم کتێبـە بـە زمـانی کوردی لـەبـارەی ڕێزمـانی کوردییەوە نووسراێ .

( بڕوانە : باسی ژ ٢٧٣ ) .

## عەبدلمەجید سەعید :

**٣٤٩ ـ سەرنجێك دەربارەی گۆڕینی کتێبەکانی قۆناغەکانی ناوەندیو ئامادەیی بۆ سەر زمانی کوردی ، گۆڤاری « کاژاو » ، ژ ١ ، ســلێمانی ، ١٩٨٤ ، ل ١٤ ـ ١٦ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە هەندێ نموونەو بەڵگەوە رەخنە لەوە دەگرێ ، لەو کتێبانەدا کە بۆ قوتابخانەکان کراونەتە کوردی یەکێتی لە زاراوەکاندا نییە ، بەتایبەتی لە دانانی وشەیەکی کوردی بەرانبەر دوو وشەی عەرەبیی زۆر جیاواز یاخود بەپێچەوانەوە دانانی دوو وشەی کوردیی تەواو جیاواز بەرانبەر وشەیەکی عەرەبی •

## عەبدولخالق ئەحمەد عەزیز :

**٣٥٠ ــ پیت یا دەنگ ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٦٦ ، هەولێر ، کانوونی دووەمی ١٩٨٤ ، ل ٤٢ ــ ٤٤ •**

ئەم وتارە باسی جیاوازیی دەنگو پیت دەکاتو لەو نیگارانە دەدوێ کە بۆ دەنگەکانی کوردی دانراونو لە هەندێ گیروگرفتیان دەکۆڵێتەوە •

**٣٥١ ــ فۆنێم ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٨ ، هەولێر ، کانوونی دووەمی ١٩٨٥ ، ل ٣٨ ــ ٤٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە فۆنێم چییەو لەو ڕێگەیەوە هەوڵیداوە فۆنێمەکانی زمانی کوردی دەستنیشان بکاو بایەخی بە باسی ( ئـ )و ( ص ) ••• داوە •

## عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی :

**٣٥٢ ــ خوێندنگا یا قوتابخانە ، گۆڤاری « ڕەهێلە » ، ژ ١ ، ساڵی ٦ ، هەولێر ، ١٩٧١ •**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ کە گوایا لەو دوو زاراوە ــ « خوێندنگا »و « قوتابخانە » ــ کامیان لەبارترە • بەدوا ئەمەدا هەندێ زاراوەی کوردیی هێنراوەتەوەو بەرانبەرەکەشیان بە عەرەبی نووسراوە •

## عەبدولڕەحمان زەبیحی :

**٣٥٣ ـ ڕەخنەی زانستییانە یاخود شـــــلم کوێرم هیچ نابوێرم ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧١ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٧ ـ ٢٧ .**

ئەم وتارە وەلأمی ئەو ڕەخنەیەیە کە دە جەمال نەبەز لە ژمارە (٢٢)ی « گۆڤاری کۆلێجی ئـەدەبیـات » ( ١٩٧٨ )دا لـە « قامووسـی زمـانی کوردی »ی مامۆســتا عەبدولڕەحمان زەبیحی گرتووە ( بڕوانـە : باسی ژ ١٨٩ ) .

**هەروەها ژ : ١٠٣٣ .**

## عەبدولڕەزاق بیمار :

**٣٥٤ ـ ( بروانە : باسی ژ ٣٥٨ ) .**

## عەبدولستار کازم :

**٣٥٥ ـ ئاژاوەی زاراوەکان ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣٤ ، بـەغـــدا ، ١٩٦١ ، ل ٢٣ ـ ٢٧ .**

نووسەر لەم کورتە وتارەدا هەنـدێ زانیاریی باشی لەبارەی ڕێگەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی‌یەوە خستووەتە پێش چاو .

**٣٥٦ ـ ( زاراوەی زمانی کوردی لـە ترازووی بەراورددا )و چـەنـد ڕەخنەیەك ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٥٢ ـ ٢٠٣ .**

ئەم وتارە سەرنجو تێبینیو ڕەخنەیە دەربارەی کتێبی « زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا )ی مامۆســتا محەمەد ئەمین هەورامانی ، کە سالی ١٩٨١ بلاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٣٤ ) .

**٣٥٧ ـ کتێبی ( هەندێ ئامرازی سینتاکسی )و چـەنـد تێبینیەك ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٣ ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ١١ ـ ٢٠ .**

ئەم وتارە بریتییە لە ڕەخنەو لێدوان لەو کتێبەی د • ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم سالی ١٩٨٠ بە ناوی « هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا »وە بلاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٨٧ ) •

**٣٥٨ – هەلسەنگاندنو ڕەخنە لە کتێبی کیشەیەك لە ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٢ ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٨٢ ، ل ١٦ – ٢٣ •**

مامۆستا عەبدولستار کازم ئەم وتارەی بە عەرەبی نووسیوەو مامۆستا عەبدولڕەزاق بیمار کردوویە بە کوردی • ئەم نووسینە هەندێ تێبینیو سەرنجو ڕەخنەیە دەربارەی کتێبی « کیشەیەك لە ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا ڕەئووف ئالانی ( بڕوانە : باسی ژ ٢٤٤ ) •

**هەروەها ژ : ٧١٤ ، ٧١٥ •**

## عەبدولعەزیز خانەقا :

**٣٥٩ – جوابی پرسیاری گەلاوێژ ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١١ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٦ •**

مامۆستا عەبدولعەزیز خانەقا لەم نامەیەدا کە بۆ گۆڤاری « گەلاوێژ »ی ناردووە ، وا بە باش دەزانێ ئەو گۆڤارە هەر بە ئەلفوبێی عەرەبی بلاوبکرێتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٣٨٤ ) •

## عەبدولقادر قرگەیی :

**٣٦٠ – نووسینی وشە وەك بێژانی ناوخۆیی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢٣ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠ •**

ئەم وتارە ڕەخنەیە لەو نووسەرانە ، کە هەندێ وشەی کوردی بەپێی بێژانی ناوچەکەی خۆیان دەنووسنو داوا دەکا پەیڕەوی زمانی ئەدەبی بکەن •

## عەبدولقادر قەزاز :

**٣٦١ – زمانی کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ١٥ – ١٨ •**

نووسەری ئەم وتارە ئامۆژگاریی کوردان دەکا بە زمانی کوردی بدوێن و بایەخ بە زمانەکەیان بدەن و نرخی بزانن •

**٣٦٢ – سەرنجێك لە زمانی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ١١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٨ – ١٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا بەراوردێکی لەنێوان ڕێزمانی کوردی و زمانانی تر ( بەتایبەتی فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسی )دا کردووە و لە کۆتاییدا چەند پێشنیارێکی خستووەتە پێش چاو •

## عەبدولقادر محەمەد ئەمین :

**٣٦٣ – لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ( کە ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥١ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٥٦ – ٥٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو حاڵەتانەی کردووە کە ( کە )یان وەك نیشانەی ناسیاوی و پاشگرو ئامراز ••• تێدا دەبێنرێ • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ١٥ ، ٥١٥ ) •

## عەبدولکەریم حەمید :

**٣٦٤ – دەروازەیەك بۆ وێژەی فۆلکلۆری منالان لە ناوچەی گەرمیاندا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٤ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٤٢ – ٥١ •**

نووسەر لە کۆتایی ئەم وتارەدا ژمارەیەك وشەی تۆمارکردووە ، کە لەو تێکست و نموونە فۆلکلۆرییانەدا بەکارهاتوون کە خستوونی یە

بەرچاو • هاوواتای ئەو وشـــــانەش لــە کرمانجیی خوارووودا چۆیە نووسیوێتی •

## عەبدولکەریم شێخانی :

**٣٦٥ – جووتەناو یان وشەی لێکدراو ، گۆڤاری « بەیـان » ، ژ ٤٧ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٤٣ – ٤٥ •**

نووســـەر لەم وتارەدا بەتایبەتی لەو وشە لێکدراوانە دواوە ، کـە بەیارمەتی ( و )ی پێوەندی بەیەکەوە بەستراونو بەســـەر دوازدە جۆردا دابەشی کردوون •

**٣٦٦ – فەرهەنگی زانیاریو چەند تێبینییەك ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٣٤ ، تەمووزی ١٩٨٥ ، ل ٢٦ – ٣٥ •**

ئـەم وتـارە هەنـدێ تێبینیو ســـەرنجە دەربـارەی « فەرهەنگی زانیاری »ی مامۆستا کەمال جەلال غەریب ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٦٢ ) •

## عەبدولکەریم فندی :

**٣٦٧ – گۆڤارا ( ژین )ێو چەند ڕاستییەك ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ١٠٨ ، هەولێر ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٥ ، ل ٢٩٤ – ٣٠٧ •**

نووســـەر لـەم وتارەدا کـە لە گەلێ ڕووی گۆڤاری « ژین »ی ئەستەموول دواوە ، بە ناوی « خەباتا ل سەر زمانی »ەوە ( ل ٣٠٢–٣٠٤ ) باسی دەوری ئەو ڕۆژنامەیەی لە مەیدانی گەشەپێدانی زمـانی کوردیـدا کردووە •

## عەبدوڵلا ڕەضا :

**٣٦٨ – ( بڕوانە : باسی ژ ٣٤٧ ) •**

## عەبدوڵڵا سەڕاج :

**٣٦٩ ـ سەرنجێك دەربارەی وشە لە کوردیدا ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٥ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٢ ـ ١٧ •**

ئەم وتارە بریتییە لە ژمارەیەك وشەی کوردیو مانایان هەر بە کوردی لێكدراوەتەوە • وشەکانیش دوو بەشن : بەشی یەکەم ـ ئەو وشانەی پێوەندیان بە خاكو شاخو بارانو بەفرو ڕواڵەتی سروشتەوە هەیە ؛ بەشی دووەم ـ ئەو وشانەی پێوەندیان بە گیاندارو ئاژەڵو مەڕو ماڵاتەوە هەیە •

## عەبدوڵڵا شاڵی :

**٣٧٠ ـ ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگو بۆ فرمان ، بەغدا ، ١٩٧٦ •**

ئەم بەرهەمە ( ٧٢ ) لاپەڕەیە • زوربەی زۆری چاوگەکانی زمانی کوردی بەپێی بە دوایەکدا هاتنی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی تێدا تۆمارکراوەو بەرانبەر هەر چاوگێك ڕێژەی ڕابوردوو و داخوازی نووسراوە •

**٣٧١ ـ ( سەر )و ( چاو )و ( دڵ )و ( دەست ) لە وشەسازیی زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ١٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣ ـ ١٣ •**

ئەم وتارە لەو وشە داڕێژراوو لێکدراوانە دەدوێ کە وشەکانی ( سەر )و ( چاو )و ( دڵ )و ( دەست ) دەوری سەرەکی لە ڕۆنانیاندا دەبینن •

**٣٧٢ ـ ناوی بکەر ( الفاعل ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٥ ـ ٧ •**

نووسەر لە سەرەتادا لەڕێی زمانی ئینگلیزییەوە ڕوونی کردووەتەوە ( بکەر ) چییەو ئنجا ئەو ڕێگایانەی دیاری کردووە ، کە لە زمانی کوردیدا ( بکەر )یان لێوە سازدەبێ •

**٣٧٣ ـ ( هـ )ی سواو ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٢ ، سـالی ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣ ـ ٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٣ ، سالی ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤ ـ ١٩ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەو ڕایەدایە کە لە زمانی کوردیدا ڕستەی بێکردار نابێت • بۆ پێسەلماندنی ئەمە ، لەوە دواوە کە ( هـ )ی سواو لەگەڵ کرداری ( بوو )دا مانای وجود دەبەخشێتو لەگەڵ جێناوی لکاوی کاتی ئێستادا جێی کردارێکی بێهێزی سواو دەگرێ •

عەبدوڵلا نەقشبەندی :

**٣٧٤ ـ پاشکۆی ( درا ) ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٦ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ ـ ١٣٧ •**

**ئەم وتارە برێتییە لەم بەشـانە : « پێشەک » ( ل ١١٥ ـ ١١٧ ) ، « کردەوەی ( بەهێز )و ( بێهێز ) » ( ل ١١٧ ـ ١١٩ ) ؛ « کـردەوەی یەککارو دووکار » ( ل ١١٩ ـ ١٢١ ) ؛ « بناغەی دووکار » ( ل ١٢١ ـ ١٢٢ ) ؛ « کەلکی بناغەی دووکار » ( ل ١٢٢ ـ ١٢٥ ) ؛ « دەستەی زمان » ( ل ١٢٦ ـ ١٢٧ ) ؛ « کورتەی وتار بە عەرەبی » ( ١٢٨ ـ ١٣١ ) • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥١٦ ) •**

عەبدولحسێن بنیوەیس :

**٣٧٥ ـ بەراوردکردنێکی نێوان زاری خواروو و زاری گەرمەسێر ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٨ ، بەغدا ، کانوونی یەکەمی ١٩٨٥ ، ل ٨٨ ـ ٩٢ •**

ئەم نووسینە بریتییە لە بەراوردی هەندێ دەنگ‌و وشـــە لەنێوان زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی‌و شێوەی خانەقی‌و مەندەلیدا •

**٣٧٦ ـ بەراوردکردنێکی سەرپێیی نێوان زاری کرمـانجیی خواروو و زاری خانەقی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٥ ، بەغـدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٤٢ ـ ١٤٤ •**

نووسەر لە بەراوردەکەیدا ئەو لایەنانەی خوارەوەی لـە بـەرچـاو گرتووە : ١ ـ گۆڕینی دەنگێك بە دەنگێکیتر ؛ ٢ ـ ئیزافە ؛ ٣ ـ کۆ ؛ ٤ ـ پاشگری ( ەوە )و ( ە ) ؛ ٥ ـ پاشـــــــگری کاتی ڕابوردوو ؛ ٦ ـ جێناوی لکاو ؛ ٧ ـ جێناوی کەسیی جودا •

## عەبدولمەجید مجدی سەقزی ئەردەلان موهاجیر :

**٣٧٧ ـ کوردو مدیك ـ مدیـاو مدی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٠٩ ، سالی٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ ـ ٢ •**

ئەگەرچی ئەم وتارە سەرناوو سەرەتای باسی ئەسلی کوردە ، بەلام بـە زۆری لەو ئەلفوبێ کوردییە دواوە ، کـە ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری وەحشی نەبەطی لە کتێبی « شوق المستهام »دا باسی کردووە •

## عەزیز ڕەشید ئاکرەیی :

**٣٧٨ ـ ڕێزمانێ ئاخافتنا کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣٦ ـ ٥٩ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمـــانجیی ژووروو نووسراوەو بریتییە لـە کۆمەلێ خشـــتە کـــە بۆ ڕێژەی جۆربەجۆری کرداری تێپەڕو تێنەپەڕو یاریدەدەر دانراوە •

**٣٧٩ - كارليكرنا زمانيت بيانيا ل زمانێ كوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١١١ - ١١٧ .**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی کارتێکردنی سەلبیو ئیجابی زمانی بێگانە لە زمانی کوردی دەکاتو لە کۆتاییدا کۆمەڵێ وشەی کوردیو عەرەبی لە یەکتر تێزیك ڕیزکراون .

**هەروەها ژ : ١٠٣٧ .**

## عەزیزی مەلا ڕەش :

**٣٨٠ - جووتو جووتیاری لە دەشتی هەولێردا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣٦٦ - ٣٧٥ .**

ئەم وتارە گەلێ وشەو زاراوەی کوردی وای تێدا تۆمار کراوە ، کە لە جووتو جووتیاریی دەشتی هەولێردا بەکاردەهێنرێن .

## عەلائەدین سەجادی :

**٣٨١ - دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١١ - ١٨ .**

مامۆستا سەجادی لەم وتارەدا باسی پەیدابوونی پیتەکانی ( ۆ ، ێ ، ڵ ، ڕ ) دەکات لە جیهانی چاپداو بە کارو کردەوەی خۆی دادەنێ .

**٣٨٢ - دەنگی کوردیو نیشانەی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٩٧ - ١٥٢ .**

ئەم وتارە دەستوورێکە بۆ ئەو دەنگانە کە لە کوردیدا هەنو بۆ ئەو نیگارانە کە دەنگەکە نیشاندەدەن . مێژووی ئەو پیتانە کە ئێستە دەنگی کوردییان پێ دەنووسرێ ، ئەو ئاوازانە کە لە دەنگی کوردیدا پەیدا دەبن . بیروڕای زانایانی کورد لە نووسینی کوردیدا .

**٣٨٣ ـ زانینی کرۆکی زمان ، « گۆڤـاری کۆڕی زانیـاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٦ ـ ٦٢ ٠**

ئەم وتارە بە گشـــتی باسی زانســـتی زمانەو لـە داهاتنی زمانو گەشەکردنیو پەیدابوونی دیـالێکتو گۆڕانی ڕواڵەتی وشـــە دەدوێ ٠ لە کۆتاییدا لـە بنچو بناوانی وشەی کوردی ، هـەر لە ڕەگیەوە تـا ئـەو وشەیە کە ئێستە بەسەر زارەوەیە دەکۆڵێتەوە ٠

**٣٨٤ ـ کورتە باسێك لەبارەی ئەم نووســــینەی ئێمەوە ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢٣ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥ ـ ٧ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا باسی مێژووی پەیدابوونی هەندێ پیتو چوکلە دەکات لە نووسینی کوردیدا ٠

**٣٨٥ ـ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سالی ٦ ، بەغدا ، ١٩٤٥ ، ل ٤٣ ـ ٥١ ٠**

مامۆستا سەجادی لەم وتارەدا بۆ باسی چۆنیەتی نووسینی کوردی لە سەرەتادا گەشتێکی بە نووسینی عەرەبیو فارسیدا کردووەو ئنجا هەندێ خاسیەتی زمانی کوردی خستووەتە پێش چاوو چەند بیروڕایەکی لەبارەی نووسینەوە دەربڕیوە ٠

**٣٨٦ ـ وتنو نووسین ، « گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات » ، ژ ١٨ ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ٦١ ـ ٧١ ٠**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ ، کـە وشـــە ئەســـلەکەی چۆنە بەو جۆرە بنووسرێ یان چۆن لە زار دێتە دەرەوە وا بنووسرێ ٠

**٣٨٧ ـ وشەی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیـاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٤٨ ـ ١٧٨ ٠**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ ، کە وشـــەی وێکچوو لە زمانی کوردیو فارسیدا یان کوردیو عەرەبیدا هەیەو ئەمە دیاردەیەکی سروشتی هەموو

زمانێکە • هەر زمانێکیش لەمانە کە وشەی زمانێکیتر وەردەگرێ ،
بێگومان بەرگی زمانی خۆی بەبەردا دەکات •
هەروەها ژ : ٧١٨ ، ١٠٣٨ •

## د • عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ :

**٣٨٨ ـ ئیملای کوردیی تازەو دیمەنێکی ( مەمو زین )ی خانی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ١١ ـ ١٦ •**

د • عیزەدین لە سەرەتای ئەم وتارەدا باس لە چۆنیەتی نووسینی وشەی بێگانە دەکاتو وا پەسەند دەکا ، کە وشەی بێگانە بە هەر جۆرێك بەکارهاتبێ ، دەبێ سەر بۆ ئیملای ئەو زمانە شۆڕ بکا ••• بۆ ئەمەش هەندێ بەڵگەی لە ( خانی )یەوە هێناوەتەوە ، کە چۆن پەیڕەوی ئەمەی کردووەو ( س )و ( ص )ی کردووە بە هاوقافیە •••

**٣٨٩ ـ دیالێکتەکانی زمانی کوردیو گیروگرفتو چارەسەرکردنیان ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، ساڵی ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٨٥ ـ ١٠٢ •**

نووسەر باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردی کردووەو ئەو پردانەی دەستنیشان کردووە ، کە بە یەکیان دەگەیەنێو ڕێگەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی دیاری کردووە •

**٣٩٠ ـ زمانەوانی ، گۆڤاری « بەیان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٦٩ ، ل ٢ ـ ٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٠ ـ ١١ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٩ ـ ١٠ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٢ و ٢٨ ـ ٢٩ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ١٤ ـ ١٥ •**

بەشی یەکەمی ئەم وتارە بەناوی « بەسەرپێوە ـ بۆ گۆڤارو ڕۆژنامە »وەیەو نووسەر لە بەندی دووەمیدا کە سەرناوی « بڵێو مەڵێ »ی

داوەتێ ، ئامۆژگاریی نووسەرانی کورد دەکـا ، ئاگاداری بەکـارهێنانی وشەی تازە داتاشراو بن‌و لە داڕشتنی ڕستەدا لە یاسای ڕستەسازیی کوردی نەپچڕێن‌و بەڵێن دەدا لە ژمارەی داهاتوودا لەو بارەیەوە نموونە پیشـان بدا ... لە بەشی دووەمدا لە نادروسـتی بەکارهێنانی « باوکی فلان »و « زانای ئاینی »ی دوواوە ... لە بەشی سێیەمدا باسی ڕاسـتکردنەوەی « پێی هەستا »و « ئاهەنگ »ی کردووە ... لـە بەشـی چوارەمدا لـە « فرمانی یاریدەدەر »و « دانیشتن »و « کۆبوونەوە »و « ئاراستەکردن » کۆڵیوەتەوە . لە بەشی پێنجەمدا سێ سەرباسی « بۆ کێ دەنووسین ؟ » ؛ « لە هەڵەی باو ( کورد یا کوردی ) ؟ » ؛ « فرمانی کوردی » بـەرچـاو دەکەوێ .

**٣٩١ ـ سەرنجێ لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧١.**

ئەم کتێبە ( ٧٠ ) لاپەڕەیە . نووسەر بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە لـە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لە سەرەتادا ڕوونی‌کردۆتەوە ، کـە زمانی ئەدەبی چییەو لای گەلانی‌تر چۆن سەری‌هەڵداوەو گەشـــەی کردووە . بەدوا ئەمەدا لە مێژووی زمانی ئەدەبیی کوردی دواوەو ئنجـا هاتۆتە سەر زمانی نووسینی ئەمڕۆمان‌و ، بۆ چەسپاندن‌و گەشـەکردنی ، هەندێ بیروڕای لەبارو زانستی خستۆتە پێش چاو .

**٣٩٢ ـ شێوەو زمانی یەکگرتوو و زمانی ئەدەبی ، گۆڤاری «برایەتی» ، ژ ٧ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ؛ ژ ٨ ، ســـالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٢ ـ ١٥ .**

د . عیزەدینی لەم دوو وتارەدا لە باسی شـێوەکانی زمانی کوردی‌و دەوریان لـە مێژووی ئەدەبداو یـەکبوونی زمان‌و مانای زمـانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دواوە .

**٣٩٣ ـ مامۆستاو زانای کورد دوکتۆر بەکاییف ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣١ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٥٤ ـ ٥٦ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی کارە زمانەوانی‌یەکانی مامۆستا چەرکەزی بەکۆی کردووە ، بەتایبەتی « فەرهەنگی کوردی – ڕووسی »و « زمانی کوردەکانی تورکمەنستان »و « زمانی کوردەکانی ئازربایجان » ... هتد .

**٣٩٤ – وەلامێك بۆ لێکۆلینەوەی سەربری ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٧ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٤٩ – ٥٢ .**

ئەمە وەلامێکە بۆ ئەو ڕەخنەیەی د . محەمەد نووری عارف لە کتێبی زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی گرتبوو ( بڕوانە : باسی ژ ٥٦٨ ) . لێرەدا د . عیزەدین بە بەلگەوە سەرتجە زمانەوانی‌یەکانی ڕەخنەگری ڕەتکردووەتەوە .

**هەروەها ژ : ١٠٤٣ .**

عیصمەت شەریف وانلی :

**٣٩٥ – مەسەلەی یەکخستنی زبانی نووسینی کوردی : کرمانجی یا سۆرانی ؟ ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣٠ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، ل ١٩ – ٣٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا دوای هێنانەوەی هەندێ نموونەو بەلگە وا بە ڕاست دەزانێ ، کە لە باری ئەمڕۆی کورددا بە هەردوو شێوەی کوردیی خواروو و ژووروو بنووسرێو کاتێ بارو دۆخێکی لەبار دێتە پێشەوە لەبەر ڕووناکیی بەرنامەی زمانناسانماندا دەست بە یەکخستن بکرێ .

**هەروەها ژ : ٧١٧ ، ٨٩٧ ، ٩٨٠ .**

غازی فاتیح وەیس :

**٣٩٦ – پێوەندی نێوان سینتاکس و سیمانتیکس ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٣١ ، ١٩٨٢ ، ل ٨٨ – ٩١ .**

نووسەر لە ڕێگای هێنانەوەو شیکردنەوەی چەند ڕستەیەکی کوردییەوە ، ئەوەی نیشانداوە ، کە سینتاکس ڕواڵەتی ڕستە وەیا قسە دەگرێتەوەو چۆنیەتی کارکردنی کەرەستەکانو گۆڕانی ئەو کەرەستانە لە ڕستەداو ڕادەی کارکردنیان لە هەر حاڵێکدا بەسەر سیمانتیکدا .

**٣٩٧ – جیاوازیی نێوان فۆنێمو مۆرفێم ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ژ ١٠٧ ، بەغدا ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ١٩٠ – ١٩٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە کەرەستەی زمانی کوردی جیاوازیی نێوان فۆنێمو مۆرفێمی نیشانداوە .

**٣٩٨ – جیاوازیی نێوان مۆرفێمو وشە ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٣٨ ، هەولێر ، تشرینی دووەمی ١٩٨٥ ، ل ٩ – ١٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە کەرەستەی زمانی کوردی جیاوازیی نێوان مۆرفێمو وشەی نیشانداوە .

**٣٩٩ – دەنگەکانی ( ڵ ) ، ( ل ) وە ( ڕ ) ، ( ر ) لەژێر تیشکی فۆنەتیکو مۆرفۆلۆژیدا ، گۆڤاری « زانکۆ » ، ب ٨ ، ژ ٢ ، هەولێر ، ١٩٨٢ ، ل ٩٣ – ١١٩ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا لەبارەی جیاوازیی نێوان زمانی ئاخاوتنو زمانی نووسینەوە ؛ فۆنەتیکو مۆرفۆلۆژییەوە دواوەو لەپاشاندا لە دەنگەکانی ( ڵ ) ، ( ل ) ؛ ( ڕ ) ، ( ر )ی کۆڵیوەتەوەو بە بەڵگەوە نیشانیداوە کە چوار فۆنێمی سەربەخۆن .

**٤٠٠ – سیمای جیاکەرەوەو لایەنێك لە فۆنۆلۆژیی زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٦٠ – ٧١ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە شێوەی جیاکردنەوەی دەنگە بزوێنەکانو نەبزوێنەکانی زمانی کوردی دواوەو باری تایبەتیی فیزیکیو شوێنی

درکاندنیانی نیشانداوه •

**٤٠١ ــ فۆرمو ناوەرۆکی ئیدیۆم ، گۆڤـاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ٤ ، سالی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٥٩ ــ ٦٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی ئیدیۆمی کردووەو ئنجا کۆمەلێ ئیدیۆمی کوردی هێناوەتەوەو لێیاندواوە •

**٤٠٢ ــ فۆنەتیك ، بەغدا ، ١٩٨٤ •**

ئەم کتێبە ( ١٢٨ ) لاپەڕەیەو لە پێشەکیو شەش بەش پێکهاتووە : بەشی یەکەم ــ « سیستەمی ئاخاوتنو جێگای فۆنەتیك لەناو زانستی زماندا » ( ل ٩ ــ ١٩ ) ؛ بەشی دووەم ــ « لقەکانی فۆنەتیك » ( ل ٢١ ــ ٣٥ ) ؛ بەشی سێیەم ــ « کەرەستەکانی سیستەمی ئاخاوتن لە سنووری فۆنۆلۆژیو فۆنەتیکدا » ( ل ٣٧ ــ ٤٧ ) ؛ بەشی چوارەم ــ دابەشکرنی دەنگەکانی زمانی کوردی » ( ل ٤٩ ــ ٧٩ ) ؛ بەشی پێنجەم ــ « بڕگەو هێزو ئاواز » ( ل ٨١ ــ ٩٥ ) ؛ بەشی شەشەم ــ « تەوژمی هەوا » ( ل ٩٧ ــ ١١٨ ) •••

**٤٠٣ ــ کتێبی زاراوەی کوردیو چەند تێبینییەك ، گۆڤاری «کاروان» ، ژ ٢٤ ، هەولێر ، ئەیلوولی ١٩٨٤ ، ل ٩ ــ ١٤ •**

ئەم وتارە هەندێ سەرنجو تێبینییە لەبارەی کتێبی « زاراوەی کوردی »ی د • کامیل بەسیرەوە ، کە بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی کۆلێجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین دایناوە • ( بڕوانە : باسی ژ ٤٤٣ ) •

**٤٠٤ ــ لەگەل ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیداو سینتاکس ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩١ ، بەغدا ، ئازارو نیسانی ١٩٨٢ ، ل ٢٠ ــ ٢٣ •**

ئەم وتارە هەندێ سەرنجو تێبینییە دەربارەی کتێبی « ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەل ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری

لـه دیالێکته ناوەندی‌یەکانی زمانی کوردی‌دا »ی د • ئیبراهیم عـەزیـز ئیبراهیمه ( بڕوانه : باسی ژ ٨١ ) •
**هەروەها ژ : ٢٢ •**

## غەفوور ڕەشید :

**٤٠٥ ـ سەرنجێك لە پەراوی زاراوەی زانستی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢٧ ـ ٣٠ •**

ئەمـه لێدوانێـکه لـه کەم‌و کورتی‌و ناتەواویی زاراوەکـانی بەشی جوغرافیای ئەو کتێبەی نەقابەی مامۆسـتایان بە ناوی « زاراوەی زانستی »یەوە بڵاوی‌کردۆتەوە ( بڕوانه : باسی ژ ١٠٨٨ ) •

## غەفووری میرزا کەریم :

**٤٠٦ ـ بڕوانه : باسی ژ ٣٥ •**

## فاررووق عومەر صدیق :

**٤٠٧ ـ وشـەسازی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١٧ ـ ٥٢٥ •**

ئەم وتاره لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی‌یه له دوو پاشـگری ( ی )ی ناوی مەعناو ( ی )ی سیفەتی نیسبی • له سەرەتادا له ڕێی زمانی ئاوێستاو فارسیی کۆن‌و ناوەڕاستەوە ئەسلی ئەو دوو پاشگره سـاغ‌کراوەتەوەو دوایی دەورو واتایان له زمانی کوردیدا ڕوون‌کراوەتەوە •
**هەروەها ژ : ٨٣١ •**

## فاضـل :

**٤٠٨ ـ زمانی کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ١٥ ـ ١٧ •**

نووســـــەر لەم وتارەدا لایەنی وتەکانی مامۆستا عەبدولقادر قەزاز دەگرێ ( بڕوانە : باسی ژ ٣٦١ )و ئەمیش ئامۆژگاریی کوردان دەکا بە زمانی کوردی بدوێن و هەندێ قسەی زانایان لەبارەی بایەخدان بە زمانی زگماکەوە دێنێتەوە •

## فوئاد حەمە خورشید :

**٤٠٩ ـ زمـانی کوردی ـ دابـەشبوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی ، بەغدا ، ١٩٨٥ •**

ئـەمە کتێبی « اللغـة الكرديـة ـ التوزيـع الجغرافي للهجاتها »یـە ( بڕوانە : باسی ژ ٧٢٢ ) و مامۆستا حەمە کەریمی هەورامی کردوویـە بە کوردی •

**٤١٠ ـ گۆران کێن ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٣٤ ، بەغـدا ، ١٩٧٦ ، ل ٥ ـ ٧ •**

نووســـــەر لەم وتارەدا بەکورتی لـە تێکڕای دیالێکتە کوردییەکان دواوەو بە دوورودرێژی باسی دیالێکتی ( گۆران )ی کردووە •

**هەروەها ژ : ٧٠٣ ، ٧٢١ ، ٧٢٢ •**

## فوئاد زەکی هەناری :

**٤١١ ـ نووسینی تیپی ( دال ) بە شـــێوەی ســـــلێمانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٧ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٩ ـ ٢١ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو ( د )ە دەکا کە لە ناوچەی ســـلێمانی کلۆر دەکرێ و نیشانی دەدا کە ئەمە نابێ لە زمانی ئەدەبیدا ڕەنگ بداتەوە •

فەتحوڵڵا کەریم :

**٤١٢ - دەوری پیتی بزوێنی ( ە ) لـە ڕێزمـانی کوردیـدا ، گۆڤـاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٣ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٧٥ - ٧٧ .**

ئەم وتارە لەو حاڵەتە جۆربەجۆرانە دەدوێ ، کە بزوێنی ( ە )ی تێدا دەبینرێ .

فەرهاد شاکەلی :

**٤١٣ - چەند ئالیێن ڕەوشا زمانی کوردی ، گۆڤاری « هیوا »، ژ ٢ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٢٩ - ٣٤ .**

ئەم وتارە بریتییە لە هەندێ بیروڕاو سـەرنج دەربارەی زمانی کوردیو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و ...

فەیسەڵ مستەفا حاجی :

**٤١٤ - لە ڕێگای یەکگرتنی شـێوەکانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٥٢ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٦٠ - ٦٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥٣ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٢ - ١٤ ؛ بەشی سـێیەم ، ژ ٥٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٤٠ - ٤٢ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٥٥ - ٥٦ ، بەغدا ، ل ٤٠ - ٤٣ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٥٧ ، بەغـدا ، ١٩٧٧ ، ل ٦١ - ٦٣ ؛ بەشی شەشەم ، ژ ٥٨ - ٥٩ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٤٢ - ٤٣ ؛ بەشـی حەوتەم ، ژ ٦٠ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٤ - ٣٦ ؛ بەشی هەشتەم ، ژ ٦١ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ١٩ .**

نووسەر لە بەشی یەکەمدا لە دەنگی ( وو ) لە کرمانجیی خوارووداو ( وی ) لە کرمانجیی ژووروودا دواوەو بـۆ بەرانبـەر یـەك ڕاگرتنیـان کۆمەڵێك وشـەی هێناوەتـەوە ... لـە بەشی دووەمدا باسـی بەرانبـەر یەك وەستانی ( و )و ( ڤ )ی کردووە ... لـە بەشی سێیەمو چوارەمدا

دەربارەی ( جێناوی کەسیی جودا ) لە هەردوو دیالێکتە سەرەکییەکەی کوردیدا کۆلیوەتەوە ... بەشی پێنجەم سەبارەت ( جێناوی کەسیی لکاو )ە ... بەشی شەشەم باسی ( نێرو مێ )یە ... بەشی حەوتەم بە ناوی ( فرمان بەگوێرەی کات )ەوەیە ...

## ع · قرگەیی :

**٤١٥ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ٩٧ ـ ١٨ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ٢ ـ ٤ .**

نووسەری ئەم وتارە باسی ڕێگەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەکاو هەندێ بیروڕای باش و زانستییانەی لەو بارەیەوە دەربڕیوە ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٢٩٦ ) .

**٤١٦ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ٢٥ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٢ ـ ٤ و ١٨ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردی کردووەو یەکگرتنیانی بە ڕێگەی نەهێشتنی گیروگرفت داناوە .

## قەدری جان :

**٤١٧ ـ وەرام ، گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ، ژ ١١ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٤ ـ ٥٥ .**

مامۆستا قەدری جان لەم وەڵامەیدا نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی پەسەند کردووە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٨٤ ) .

## د · قەناتی کوردۆ :

**٤١٨ ـ ئاوەڵکار لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروودا ، گۆڤاری (( ئاسۆی زانکۆیی )) ، ژ ٤ ، سالی ٤ ، سلێمانی ، ١٩٨٠ ، ل ٨١ ـ ٨٩ .**

ئەم باسەی ئاوەڵکردار د • کوردستان موکریانی لە لاپەڕە ( ٢٣٧ - ٢٤٦ )ی کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو )ی د • قەناتی کوردۆوە کردووە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ٨٤٢ ، ٤٢٥ ) •

**٤١٩ - ئاوەڵنێو لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووداً « گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٩ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٦ - ١١ •**

ئەم نووسینە بەشێکە لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو )ی د • قەناتی کوردۆ ، کە ساڵی ( ١٩٧٨ ) لە مۆسکۆ بڵاوی کردووەتەوەو د • کوردستان موکریانی کردوویە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ٨٤٢ ، ٤٢٥ ) •

**٤٢٠ - ئی • ئا • ئۆربیلیو کوردناسی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١١٣ - ١٤٢ •**

ئەم وتارە بە گشتی باسی دەوری گەورەی ئەکادیمی یووسف ئابگارۆڤیچ ئۆربیلی دەکات لە مەیدانی کوردناسیداو لە ( ل ١١٧-١٢٨ )دا لە کارە زمانەوانییەکانی داواوە • ئەم نووسینەی مامۆستا کوردۆ د • ئەورەحمانی حاجی مارف کردوویە بە کوردی •

**٤٢١ - تاریخا نفیساندنو چاپکرنا فەرهەنگێت کوردی ، گۆڤاری « ڕۆناهی » ، ژ ٧ - ٨ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٤ - ١١[٦] •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی مێژووی نووسینو چاپکردنی فەرهەنگە کوردییەکان دەکات •

**٤٢٢ - جێناوی نیشانە ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٣٢ ، ١٩٨٢ ، ل ٩٠ - ٩١ •**

ئەم باسەی ( جێناوی نیشانە ) د • کوردستان موکریانی لە لاپەڕە ( ١١١ - ١١٣ )ی کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ( بە کەرەستەی

---

(٦) وا پێدەچێ ئەو وتارە بەشێکی تری هەبێ ، بەڵام لەبەر دەستنەکەوتنی هەندێ ژمارەی گۆڤاری « ڕوناهی » ئەوەمان بەناڵۆزی لامایەوە •

دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو )ی د • قەناتی کوردۆوە کردووە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ٨٤٢ ، ٤٢٥ ) •

**٤٢٣ ـ حاڵەتەکانی جینسو بینای بەرکار لە زازادا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٣٧ ـ ٢٦٣ •**

ئەم وتارە ، کە مامۆستا کوردۆ ساڵی ١٩٧٦ بە زمانی ڕووسی لە گۆڤاری « فیلۆلۆژیی ئێرانی »دا بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٨٣٩ ) د • ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم کردوویە بە کوردی •

**٤٢٤ ـ حاڵەتەکانی جینسو بینای بەرکار لە زازادا ، گۆڤاری «هیوا» ، ب ٣ ، پاریس ، شوباتی ١٩٨٥ ، ل ١١٨ ـ ١٣١ •**

مامۆستا قەناتی کوردۆ ئەم وتارەی بە زمانی ڕووسی لە گۆڤاری « فیلۆلۆژیی ئێرانی » ( مۆسکۆ ، ١٩٧٦ ، ل ١٠٤ ـ ١٠٩ )دا بڵاوکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٨٣٩ ) • د • ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم کردوویە بە کوردیو لە بەرگی پێنجەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ( ١٩٧٦ )دا چاپی کردووە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٢٣ ) • گۆڤاری « هیوا »ش تەرجومە کوردییەکەی د • ئیبراهیمی لە ئەلفوبێی عەرەبییەوە هێناوەتە سەر ئەلفوبێی لاتینی •

**٤٢٥ ـ ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیو سۆرانی ، بەغدا ، ١٩٨٤ •**

ئەم کتێبە د • کوردستان موکریانی لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردی • ( ٣٨٢ ) لاپەڕەیە • ( بڕوانە : باسی ژ ٨٤٢ ) •

**٤٢٦ ـ زمانی کوردی ، یەریڤان ، چاپی یەکەم ، ١٩٤٩ ؛ چاپی دووەم ، ١٩٥٦ ؛ چاپی سێیەم ، ١٩٦٠ ؛ چاپی چوارەم ، ١٩٧٠ •**

ئەو چوار چاپەی کتێبی « زمانی کوردی » ، کە بە ئەلفوبێی سلاڤی چاپکراونو بۆ قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەت دانراون ، جیاوازی زۆر کەم لە ناوەڕۆکیاندا هەیە • چاپی چوارەم ، کە ساڵی ١٩٧٠

بڵاوکراوەتەوە ( ١٦٦ ) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لـــە باســــــی : فۆنـەتیـك ( ل ٨ - ١٩ ) ؛ مۆرفۆلۆژی ( ل ١٩ - ١٢٥ ) ؛ ڕاســــتنقیـــــاندن ( ل ١٢٦ - ١٣٨ ) ؛ سینتاکس ( ١٣٨ - ١٥٨ ) ... ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٤٢٧ ، ٤٣٠ ) .

**٤٢٧ - زمانێ کوردی ( ڕێزمان ) ، وەشـــانێن کۆمکار ، فرانکفۆرت ، ١٩٨١ .**

ئـەم کتێبــە ( ١٩٤ ) لاپەڕەیـەو بـە ئەلفوبێی لاتینی‌یەو ناوەرۆکی هەروەك ناوەرۆکی کتێبی « زمانێ کوردی »یە ، کە لە یەریڤان چاپکراوە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٢٦ ) .

**٤٢٨ - ژمارە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خوارووودا ، گۆڤـاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ١ - ٢ ، ساڵی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٢ ، ل ١٠٨ - ١١٥ .**

ئەمە باسێکە لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی » ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو )ی د . قەناتی کوردۆ ( بڕوانە : باسی ژ ٨٤٢ ، ٤٢٥ )و د . کوردستان موکریانی کردوویە بە کوردی .

**٤٢٩ - کوردناسی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٧ ، بەغـدا ، ١٩٨١ ، ل ٦٦ - ٧٩ .**

ئەم وتارە مامۆســــتا ڕەئووف حەســـەن لە کتێبی « مێژووی ڕۆژهەڵاتناسیی عەرەبناسی‌و کوردناسی لە مۆزەخانەی ئاسیایی‌و ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی لینینگراد »داوە کردوویە بە کوردی ، کـــە د . مـارف خەزنەدار لە زمانی ڕووسی‌یەوە وەریگێڕاوەتە ســــــەر زمانی عەرەبی ( بڕوانە : ژ ٧٢٤ ) ... مامۆستا کوردۆ لەم وتارەدا باسی زۆربەی ئـەو کارانەی کردووە کە لە ڕووسیاو یەکێتی سۆڤێت دەربارەی زمان‌و ئەدەب‌و مێژوو ... ی کورد نووسراون . باسی ئەو کارانەی پێوەندیان بە زمانی کوردییەوە هەیەو ئەو زانایانەی لەو مەیدانەدا کاریـــان کردووە بەرچـاو دەکەوێ .

**٤٣٠ ـ گراماتیکا زمـانێ کوردی ، گۆڤاری « ڕوناهی » ، ژ ٧ ـ ٨ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ١٠٧ ـ ١١٠ .**

گۆڤاری « ڕوناهی » وای بە پێویست زانیوە ئەو کتێبی ڕێزمانەی مامۆستا کوردۆ بۆ قوتابخانە کوردیەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیەتی نووسیوە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٢٦ ) ، بـە چەنـد ئەڵقەیـەك بڵاوبکرێتەوە . لێـرەدا پێشەکی ئەو کتێبە بڵاوکراوەتەوە .

**٤٣١ ـ ل بابەت نقیسکارە زمانو ئەلفابێ پەرتووکێت دینێ ئێزیدیان ، « گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری کـورد »، ب ١ ، ژ ١ ، بەغـدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٣٢ ـ ١٧٩ .**

ئەگەرچی نووسەر لەم وتارەدا کەمێك باسی ئایینو تایبەتێتیو ژیانی کوردە یەزیدیەکانی کردووە ، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لـە زمانیـان دواوەو لەبـارەی ئـەو ئەلفوبێیەوە کۆڵیوەتەوە ، کـە دوو کتێبی دینی « جلوە »و « مەصحەفا ڕەش »ی پێ نووسراوە .

**٤٣٢ ـ ناما پرۆفیسـۆر ڤ . کوردۆ ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ١٥ ـ ٢٠ .**

مامۆستا کوردۆ لەم نامەیەدا کە بـە شـێوەی کرمانجیی ژووروو نووسیوێتیو باسی بەشـی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی لێنینگراد دەکات لەو کارانە دواوە ، کە لەبارەی زمانی کوردیەوە نووسـیویانەو بڵاویان کردۆتەوە .

**٤٣٣ ـ نووسـراوەکانی لێرخ لەبارەی کوردەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٦٢٤ ـ ٦٦٣ .**

هەرچەندە ئەم وتارە بەگشتی باسی کاری کوردناسیی پیۆتەر لێرخە ، بەڵام لە لاپەڕە ( ٦٣٠ ـ ٦٣٧ )دا ، ئەوەی پ . لێرخ لـە بەرگی یەکـەمی کتێبی « لێکۆڵینەوە لەبارەی کوردەکانی ئێرانو خالدیکانی سـەرووی

باوباپیرانیانەوە »دا دەربارەی زمانی کوردی وتوویەتی بـە لێـدوانـەوە خراوەتە پێش چاو ( بڕوانە : باسی ژ ٨٦١ ) ٠

**٤٣٤ ـ هەندێـك بیروڕای هەڵـە لەبارەی زمـانو مێژووی کوردەوە ( وەرگێڕانو پێشـــــەکی : د ٠ ئەوڕەحمانی حاجی مارف ) ، بەغـــدا ، ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ٠**

لە لاپەڕە ( ١٥ ـ ١٧ )دا نووسەری پێشەکی باسی کارە زمانەوانییەکانی کوردۆ دەکات ٠٠٠ ق ٠ کوردۆ لە ( ل ٤٤ ـ ٤٥ )دا باسی ئەسـڵی زمـانی کوردی ڕووندەکاتەوەو لە ( ل ٥٢ ـ ٥٦ )دا بەرپەرچی ڕەشید یاسـەمی دەداتەوە ، کە زمانی کوردی بـە بەشـێك لـە زمانی فارسـی دادەنێ ٠ لە ( ل ٦٩ ـ ١٠٥ )دا ڕەخنە لە بیروڕای هەڵەی ن ٠ یا ٠ مارر دەگرێ کە زمانی کوردی بە زمانێکی یافیتی لەقەڵەمدەدا ٠ لـە چەند شـــــوێنێکی ( ل ١٠٨ ـ ١١٠ )دا ڕەخنە لە ڕای ڤیلچێڤسکیو میلێر سەبارەت بە کورد ، دەگرێو لە ( ل ١١٥ ـ ١٢٠ )یشـــدا مـانـای وشـــەی « کاردوخ » لێكدەداتەوە ٠ لە ( ل ١٢٥ ـ ١٢٧ )دا دەربارەی ڕای ڤیلچێڤـسکی بەرانبەر دەورەکانی زمانی کوردی ، دواوە ٠ لە ( ل ١٤٩ ـ ١٥٢ )دا ڕای ئاکۆپۆڤـە سەبارەت بە زمانی کوردی ، ڕەتدەکاتەوە ٠

**هەروەها ژ : ٨٢٨ ، ٨٢٩ ، ٨٣٠ ، ٨٣٧ ، ٨٣٨ ، ٨٣٩ ، ٨٤٠ ، ٨٤١ ، ٨٤٢ ، ٨٤٣ ، ٨٤٤ ، ٨٤٥ ، ٨٤٦ ، ٨٤٧ ، ٨٤٨ ، ٨٤٩ ، ٨٥٠ ، ٨٥١ ، ٨٥٢ ، ٨٥٣ ، ٨٥٤ ، ٨٥٥ ، ٨٥٦ ، ١٠٥١ ، ١٠٥٢ ٠**

## کامەران عالی بەدرخان :

**٤٣٥ ـ ئەلفابێیا کوردی ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، ١٩٢٨ ٠**

ئـەم نامیلکەیـە ( ٤٨ ) لاپەڕەیەو بۆ فێربوونی زمـانی کوردییە ٠ لە کۆتاییەکەیدا هەندێك چیرۆكو مەتەڵی کوردی تۆمارکراوە ٠

**٤٣٦ ـ ئەلفابێ‌یا من ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، ١٩٣٨ .**

ئەم نامیلکەیە نزیکەی ( ٣٠ ) لاپەڕە دەبێت . نووسەر لە سەرەتادا لە چۆنیەتی دەربڕینی دەنگەکانی زمانی کوردی دواوەو بۆ ئەم مەبەستە گەلێ نموونەی جوانو لەباری هێناوەتەوە . لە پاشـــکۆشیدا کۆمەلێ چیرۆکو تێکستی کوردی تۆمارکردووە .

**٤٣٧ ـ ئەلفەبەیا کوردی ، بۆن ، ١٩٨١ .**

ئەم کتێبی ئەلفوبێ‌یەی د . کامەران بەدرخان کە بە ئەلفوبێی لاتینی‌یەو ( ٢٨ ) لاپەڕەیە ، یەکەم جار ســالی ١٩٣٨ لە بەیرووت چاپکراوە[٧] . ســالی ١٩٨١ بۆ یادی تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر کۆچی دواییدا ، ێ . ئالتونچ لە ئەلەمانیای ڕۆژئاوا چاپی کردووەتەوە .

**٤٣٨ ـ زمانێ مادەر ، پاریس ، ١٩٦٥ .**

ئەم نامیلکەیە بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوەو نزیکەی ( ٤٠ ) لاپەڕە دەبێتو بۆ فێربوونی زمانی کوردی دانراوەو بە ئەلفوبێی لاتینی نووســراوەو لـە ڕێگای ڕستەوە خەلك فێری دەنگەکانی کوردی دەکات . لە کۆتاییشــدا هەندێ چیرۆکو شیعری کوردی تێدا تۆمارکراوە .

**٤٣٩ ـ فێربوونا خوەندنا کوردی ، پاریس ، ١٩٦٨ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٦٠ ) لاپەڕەیە . بە شێوەیەکی گشتی فـراوانکردنی نامیلکەکەی سالی ١٩٦٥ یتی ـ واتە نامیلکەی « زمانێ مادەر » ( بڕوانە : باسی ژ ٤٣٨ ) . لەم بەرهەمەدا جگە لە هێنانەوەی شیعرو بانی هەندێ لە شاعیرانی کورد ، هەندێ تێکستی فۆلکلۆری کوردییش تۆمارکراوە .

**هەروەها ژ : ٨٨٤ ، ٨٨٥ .**

---

(٧) بەداخەوە ، چاپی بەیرووتی ئەو کتێبەم نەبینیوە .

د . کامیل حەسەن بەصیر :

**٤٤٠ ـ بەراوردکارییەك لەنێوان زمانی کوردیو زمانی عەرەبیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٣ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣ ـ ٦٦ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە چەند ڕوویەکەوە بەراوردی لەنێوان زمانی کوردیو عەرەبیدا کردووە ، وەك : دەنگەکانو چۆنیەتی نووسینەوەیان ؛ وشە وەرگرتن ؛ دارشتنو زرەڕێژ ؛ داتاشینو لێکدان ؛ نێرو مێ ؛ دارشتنی ڕستە ...

**٤٤١ ـ خالبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥ ـ ١٠ .**

ئەم وتارە باسی نیشانەکانی خاڵ ( . )و کۆما ( ، )و پرسیار ( ؟ ) ... ەد ، کە لە کاتی نووسیندا دادەنرێن . ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٨ ) .

**٤٤٢ ـ دوارۆژی زمانەکەمانو چۆنیەتی لێکۆلینەوەی ، گۆڤاری « بلێسە » ، ژ ٩ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٢ ـ ١٧ .**

نووسەر لەم وتارەدا دژی ئەو بیروڕا هەلەیە وەستاوە ، کە وا دادەنێ ، گوایا کورد زمانێکی تایبەتی یەکگرتووی سەربەخۆی نییە ... باسی بەشەکانی زانستی زمانی کردووەو لەبارەیانەوە ئاوڕی لە زمانی کوردی داوەتەوە ... سەبارەت ڕێگەی لێکۆلینەوە لە زمانی کوردی دواوە .

**٤٤٣ ـ زاراوەی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٧٩ .**

ئەم کتێبە ( ١٧٦ ) لاپەڕەیەو ئەم باسانەی تێدا کراوە : « زاراوە سازی ؛ دیاری کردنو پێناسەی زاراوە ؛ زاراوە لە زانستە مرۆڤایەتییەکاندا ؛ زاراوەی زانستی ؛ ڕێبازەکانی لەدایكبوونو دانانی زاراوە لە زمانی کوردیدا ؛ ڕێبازی وەرگرتن ؛ ڕێبازی ئاوەلواتا ؛ ڕێبازی

لێکدان ؛ ڕێبازی داتاشین ؛ ڕێبازی داڕشـــتن ؛ ڕێبـازی وەرگێڕان ؛ ڕێبازی زرەڕێژ ؛ باری زاراوەی کوردی ؛ ســــەرچاوەکانی زاراوەی کوردی ؛ هەلبژاردنی زاراوەی جیهـــانی ؛ زاراوەی عەرەبی ؛ ڕێبـــازی داڕشتن‌و لێکۆلینەوەی زاراوە ••• » ( لەبارەیەوە بڕوانە : باســـی ژ ۴۰۳ ) •

**٤٤٤ – زمـانی عەرەبی‌و کێشەی زاراوەی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ۲ ، ژ ۱ ، بەغدا ، ۱۹۷٤ ، ل ۷٥۱ – ۷٦۸ •**

ئەم وتارە برتی‌یە لەم باسانە : « وشە لە زماندا » ؛ « ڕێبازی زمانی عەرەبی لە داهێنانی وشەی نوێدا » ، « مەجازو وشـــــەی عەرەبی » ، سی کردنەوەی چەند زاراوەیەکی عەرەبی » ؛ « ڕێــــی زۆر کردنی زاراوەی عەرەبی : ۱ – وەرگرتنی عەرەبی بە بێ دەستکاری ؛ ۲ – کردن بە کوردی یەکێك یان پتر لە دەنگەکانی زاراوە عەرەبییەکە ؛ ۳ – کردن بە کوردی دەنگی زاراوەی عەرەبی‌و پەرەپێدانی واتاکەی ؛ ٤ – وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبی ؛ ٥ – داتاشینی زاراوەی کوردی بە ڕابەریی زاراوەی عەرەبی » •

**٤٤٥ – زمانی نەتەوایەتیی کوردی ، بەغدا ، ۱۹۸٤ •**

ئەم کتێبە ( ۹۰ ) لاپەڕەیەو برتی‌یە لە پێشەکی ( ل ۳ – ۹ )و چەند باسێك : « زاراوە زمانی‌یەکان » ( ل ۱۰ – ۱۱ ) ؛ « دیاردەی ئاخاوتن لە زمانەکەماندا » ( ل ۱۱ – ۱٥ ) ؛ « دیاردەی زار لە زمانی کوردیدا » ( ل ۱٥ – ۲۱ ) ؛ « دیاردەی زمان‌و نەتەوە » ( ل ۲۱ – ۲۳ ) ؛ « زمانی نەتەوایەتی کوردی » ( ل ۲۳ – ۳۲ ) ؛ « ڕێبازەکانی وەدەســـتهێنانی زمانی نەتەوایەتیی کوردی » ( ل ۳۲ – ٤۰ ) ؛ « ڕێبازە سەرەکی‌یەکانی ڕێبازی پەسەندکراو » ( ل ٤۰ – ٤٦ ) ؛ « زمانی نەتەوایەتیمان لە کۆڕی دەنگسازیدا » ( ل ٤٦ – ٤۷ ) ؛ « دەنگە کپەکان » ( ل ٤۷ – ٦۷ ) ؛ « دەنگە بزوێنەکان » ( ل ٦۷ – ۸۱ ) •••

**٤٤٦ - زانستی ئاوەڵواتا ، بەغدا ، ١٩٨١ .**

ئەم کتێبە ( ١٢٤ ) لاپەڕەیەو برتییە لە : پێشەکی ( ل ٣ - ٦ ) ؛ بەشی یەکەم - مێتەفۆر لە ڕەخنەسازیی یۆنانی‌و ڕۆمانیدا ( ل ٧ - ٣٩ ) ؛ بەشی دووەم - مەجاز لە ڕەخنەسازیی عەرەبیدا ( ل ٤٠ - ٦١ ) ؛ بەشی سێیەم - مێتەفۆر لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا ( ل ٦٢ - ٧١ ) ؛ بەشی چوارەم - خوازە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا ( ل ٧٢ - ١١٠ ) .

**٤٤٧ - کێشەکانی زمانو وێژەی کوردی لە بەردەستی کۆڕی زانیاریدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٨ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٣٢ - ٣٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا ، کە باسی تێکڕای ئەرکەکانی کۆڕی زانیاری‌و دەزگا ڕۆشنبیرییە کوردییەکانی تێدا کردووە ، لەو کارە زمانەوانییانەش دواوە ، کە لیژنەی زمانی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق خەریکیتی .

**٤٤٨ - هۆنراوەی کوردی‌و زاراوەی کلاسیزم لە ڕەخنەسازیی ئەورووپیدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٧٥ ، بەغدا ، کانوونی یەکەمی ١٩٨١ ، ل ١٣ - ١٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا ، کە لە گەڵێ ڕووی کلاسیزم دواوە ، لەژێر سەرناوی « زاراوەی کلاسیکی لە زمانی کوردیدا »داوەشدا ( ل ١٤ - ١٥ ) هەندێ زانیاریی زمانەوانیی خستووەتە پێش چاو .

**هەروەها ژ : ٥٠١ ، ٥٠٢ .**

ق . کۆچەر :

**٤٤٩ - هەندێ تێبینی لەسەر نووسراوەکانی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٢ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٤ - ١٠ .**

نووســـــــەر لەم وتارەدا باسی پاشاگەردانیی ڕێنووسی کوردیو گیروگرفتی شێوازی جۆربەجۆری نووسینو گیروگرفتی نەبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی کردووە •

## د • کوردستان موکریانی :

**٤٥٠ – ئامرازەکانی خستنەســـەر لـە زمـانی کوردیدا ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ب ٤ ، ژ ١ ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ١٤٥ – ١٧٥ •**

ئەم وتارە برێتییە لە دوو بەش : « ١ – هەڵسەنگاندنی زوربەی ئەو کارانەی لەســەر ئەم بابەتە نووســـــــراون » ( ل ١٤٥ – ١٥٤ ) ؛ « ٢ – ئامرازەکانی خستنەسەر لە زمانی کوردیدا » ( ل ١٥٤ – ١٧٥ ) •
لە بەشی دووەمدا ئەم باسانە دەبینرێ : « شوێنی ئامرازی خستنەسەر » ؛ « ئامرازەکانی خســـتنەســـەر لـــە شێوەی کرمانجیی خواروودا » ؛ « ئامرازەکانی خستنەسەر لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا » •••

**٤٥١ – ئامرازی ( ە ) خســـتنەســـەرو چەنـد ڕوونکردنەوەیەکی زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ٨١ ، بەغــدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٨ – ٢٤ •**

ئەم نووســـــینە بەشێکە لەو وتارەی لەژێر ناوی « ئامرازەکانی خستنەســـەر لە زمانی کوردیدا »دایەو لە ژمارە ( ١ )ی بەرگی ( ٤ )ی گۆڤاری « زانکۆ »دا « بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باســی ژ ٤٥٠ )و وەك خۆی دەڵێ لەبەر گرنگیو کـەم بـاسکردنی ئـامرازی ( ە )و بـۆ وەڵامدانەوەی د • ئەوڕەحمانی حاجی مارف بـە هەندێ پەراوێزی نوێوە سەرلەنوێ بڵاوی دەکاتەوە •

**٤٥٢ – ئاوەڵناو لە ڕستەی کوردیدا ( بـە کەرەســـتەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمـانجیی ژووروو ) ، گۆڤـاری « کاروان » ، ژ ٥ ، هەولێر ، شوباتی ١٩٨٣ ، ل ٣٩ – ٤٤ •**

نووسەر دوای کورتە گەشتێك بەو کارانەدا کە لەبارەی ( ئاوەڵناو لە ڕستەی کوردی‌دا )وە نووسراون ، لەو دەورانە دواوە کە ئاوەڵناو لە ڕستەدا دەبینێ ، بەتایبەتی وەك : « ئاوەڵناو لە ڕۆڵی نیهاددا » ؛ « ئاوەڵناو لە ڕۆڵی گوزارەدا » ؛ « ئاوەڵناو لە ڕۆڵی بەرکاردا » ؛ « ئاوەڵناو لە ڕۆڵی دیارخەردا » ؛ « ئاوەڵناو لە ڕۆڵی ئادڤێربڵ‌دا » .

**٤٥٣ - برێتی بەشێکی ڕستەیە ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٧ ، ساڵی ٢ ، سلێمانی ، ئایاری ١٩٧٨ ، ل ٨٠ - ٨٣ .**

د . کوردستان لەم وتارەدا کە لە ( بەدەل ) دەدوێ لە سەرەتادا کورتە گەشتێکی بەو کارانەدا کردووە ، کە لەو بارەیەوە نووسراون‌و دوایی بە نموونەو بەڵگەوە لێکۆڵینەوەی خۆی پێشکەش کردووە .

**٤٥٤ - تیشکێك لەسەر گۆڤاری ( ڕووناکی ) ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٧ ، بەغدا ، ئەیلوولی ١٩٨٠ ، ل ٢٦٤ - ٢٧٧ .**

لە لاپەڕە ( ٢٧٠ )ی ئەم وتارەدا کەمێ باسی ڕێنووسی گۆڤاری « ڕووناکی »و بەکارهێنانی وشەی کوردی تێدا کراوە .

**٤٥٥ - جۆرەکانی جێناوو دەورییان لە ڕستەی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٢٩ - ٢٥٤ .**

باسەکانی ئەم وتارە ئەمانەن : « چی لەسەر جێناو نووسراوە » ( ل ٢٢٩ - ٢٣٣ ) ؛ « سەرەتا » ( ل ٢٣٣ - ٢٣٤ ) ؛ « جێناوی کەسی » ( ل ٢٣٤ - ٢٣٩ ) ؛ « جێناوی لکاو » ( ل ٢٤٠ - ٢٤٢ ) ؛ « جێناوی نیشانە » ( ل ٢٤٢ - ٢٤٤ ) ؛ « جێناوی پرسیاری » ( ل ٢٤٤ - ٢٤٧ ) ؛ « جێناوی چەندی ( چەندێتی ) » ( ل ٢٤٧ - ٢٤٨ ) ؛ « جێناوی هەیی » ( ل ٢٤٨ - ٢٤٩ ) ؛ « جێناوی خۆیی » ( ل ٢٤٩ - ٢٥٠ ) ؛ « جێناوی نادیار » ( ل ٢٥٠ - ٢٥١ ) ؛ « جێناوی دیار » ( ل ٢٥١ - ٢٥٢ ) ؛ « جێناوی نەفی » ( ل ٢٥٢ - ٢٥٣ ) ؛ « ئەنجام » ( ل ٢٥٣ - ٢٥٤ ) ..

له باسی هەموو جێناوەکاندا فۆرمی هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردی ـ کرمانجیی خواروو و ژووروو ـ هێنراوەتەوەو دەورو ئەرکو شوێنیان لە ڕستەدا دیاری کراوە • •

**٤٥٦ ـ جۆرەکانی ڕستە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « زانکۆ » ، ب ٦ ، ژ ١ ، سلێمانی ، ١٩٨٠ ، ل ١١١ ـ ١٤٠ •**

باسەکانی ئەم وتارە ئەمانەن : « سەرەتا » ( ل ١١٢ ـ ١١٣ ) ؛ «جۆرەکانی ڕستە لە زمانی کوردیدا : ١ ـ ڕستە بەپێی پێوەندی واتاوە ( أ ـ ڕستەی ئەرێ ؛ ب ـ ڕستەی نەرێ ) ؛ ٢ ـ ڕستە لەڕووی نێوەڕۆکەوە ( أ ـ ڕستەی خەبەردان ؛ ب ـ ڕستەی پرس کردن ؛ جـ ـ ڕستەی فەرمانو داخوازی کردن ؛ د ـ ڕستەی سەرسوڕمان ) ؛ ٣ ـ ڕستە بەپێی پێکهاتن ( أ ـ ڕستەی سادەی نەفرە ؛ ب ـ ڕستەی سادەی فرە ) ؛ ٤ ـ ڕستە لەڕووی فۆرمی ناسادەیەوە ( أ ـ ڕستەی تەواو ؛ ب ـ ڕستەی ناتەواو ) » ( ل ١١٣ ـ ١٣٦ ) ؛ « ئەنجام » ( ل ١٣٧ ـ ١٣٨ ) ؛ « کورتە » ( ل ١٣٩ ـ ١٤٠ ) •

**٤٥٧ ـ جیاوازی نێوان ناوەڵناوو دیارخەر ، گۆڤاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ٣ ، ساڵی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٧١ ـ ٧٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵی داوە ئیسپاتی بکا ، کاتێ ناوەڵناو لە ڕستەدا بەکارهات ، ئەوسا دەبێ لەڕووی ئەو دەورانەوە شی بکرێتەوە ، کە لە ڕستەدا دەیان گێڕێت •

**٤٥٨ ـ چۆنیەتی پەرەسەندنی ئۆرتۆگرافی لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٢ ، بەغدا ، تەمووزی ١٩٨٤ ، ل ٣٨ ـ ٤٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەڕێی گەڕان بە ڕۆژنامە کوردییەکانی کۆنو نوێدا هەوڵی داوە دەمی پەیدابوونو گەشەکردنی وێنەی دەنگە کوردییەکانی ئەلفوبێی عەرەبیی دەستکاری کراو دەستنیشان بکا •

**٤٥٩ - چۆنیەتی نووســـــینی چاوگەی نەسادە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٨٦ - ٢١١ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی چۆنیەتی نووســـینی هەموو چاوگێکی داڕێژراوو لێکدراوی کردووە .

**٤٦٠ - چەند سەرنجێکی سینتاکسی دەربارەی بەشی ڕێزمـانی کتێبی خوێندنی زمانی ... قوتابخانەکان ، گۆڤاری « ئۆتۆنۆمی » ، بەشی یەکەم ، ژ ٤ ، ســـالی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٥٦ - ٥٨ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥ ، سالی ٧ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٦٧ - ٧٤ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ١ ، سالی ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ٦٥ - ٧٠ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٢ ، ســـــالی ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ٩٠ - ٩٣ .**

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا سەبارەت بەو کتێبانەی بۆ خوێنـــدنی زمانی کوردی دانراون هەندێ سەرنج و تێبینی لەبارەی ئەو باسـانەیانەوە خستووەتە پێش‌چاو کە پێوەندییان بە ڕستەسازییەوە هەیە .

**٤٦١ - ناو لە ڕستەی کوردیدا ( لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لــە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ) ، گۆڤـاری « زانکۆ » ، ب ٧ ، ژ ١ ، هەولێر ، ١٩٨١ ، ل ٦٧ - ٩٤ .**

باسەکانی ئەم وتارە : « سەرەتا » ( ل ٦٧ - ٦٩ ) ؛ « ناو نە ڕۆلی نیهاددا » ( ل ٦٩ - ٧١ ) ؛ « دۆخی نیهاد لە ڕستەدا » ( ل ٧١ - ٧٢ ) ؛ « شوێنی نیهاد لە ڕســـتەدا » ( ل ٧٢ ) ؛ « ناو لـە ڕۆلی گوزارەدا » ( ل ٧٢ - ٧٦ ) ؛ « ناو لە ڕۆلی بەرکاردا » ( ل ٧٦ - ٧٩ ) ؛ « ناو لـە ڕۆلی دیـارخـەردا » ( ل ٨٠ - ٨٣ ) ؛ « ناو لـە ڕۆلی ئـاوەڵکاری ئـادڤێربلـدا » ( ل ٨٣ - ٩٠ ) ؛ « ئەنجام و سەرچاوەو کورتە ... » ( ل ٩١ - ٩٤ ) .

**٤٦٢ - لـەگـەڵ نۆیـەرەی ڕۆژنـامەگـەریی کوردیدا ، گـۆڤـاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣٢٢ - ٣٣٢ .**

ئەم وتارە کە گەلێ لایەنی ڕۆژنامەی « کوردستان »ی گرتۆتەخۆ ، لە لاپەڕە (٣٣٠)دا بە ناوی « زمانی کوردی لە ڕۆژنامەی کوردستاندا »وە

باسی شێوەی زمانی نووسینی ڕۆژنامەکەو بەکارهێنانی وشـــەی عەرەبیو ڕەنگدانەوەی ڕێنووس‌و وێنەی دەنگەکانی تێدا کراوە •

**هەروەها ژ : ٢٦٣ ، ٢٦٤ ، ٤١٨ ، ٤١٩ ، ٤٢٢ ، ٤٢٥ ، ٤٢٨ ، ٨٥٧ ، ١٠٦٧ا •**

## « کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » :

**٤٦٣ ــ ڕاســـــپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ •**

ئەم نامیلکەیە ( ١٤ ) لاپەڕەیەو بە کوردی‌و عەرەبییە • بریتییە لــە ڕاسپێرییەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی کە کۆڕی زانیاری عێراق « دەستەی کورد » لـە بەغـدا لە ١٨ ـ ١٩/١٢/١٩٨٥دا گێڕاویە ( بڕوانە : باسی ژ ٧٢٣ ) •

**٤٦٤ ــ کارنامەی کۆبوونەوەی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی بە پیتی عەرەبی ، بەغدا ، ١٨ ــ ١٩ کانوونی یەکەمی ١٩٨٥ •**

ئەم نامیلکەیە کە لەلایەن لیژنەیەکەوە ( د • کامیل بەصیر ، شوکور مستەفا ، نووری عەلی ئەمین ، عەبدولڵەتیف گلی ، د • ئەوڕەحمانی حاجی مارف ) ئامادەکراوە ، بریتییە لە خشتنە پێش‌چاوی ئەو گیروگرفتانەی لە نووسینی کوردیدا هەن • ( ١٨ ) لاپەڕەی گەورەیەو دەســــــتخەتەو فۆتۆکراوە •

**٤٦٥ ــ کۆڕێــک بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٣٩ ــ ٤٠ •**

ئەم بانگەوازە لەبارەی ئەو بڕیارەوەیە ، کە دەستەی کوردی کۆڕی زانیــاری عێراق داویتی بۆ بەستنی کۆڕی لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی ••• لەم بانگەوازەدا باسی هەندێ بابـەتی گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی کراوە •

**هەروەها ژ : ٢٢٨ ، ٢٢٩ ، ٥٠١ ، ٥٠٢ ، ٧٢٣ •**

## « کۆڕی زانیاری کورد » :

**٤٦٦ – ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٦٤ – ٣٧٩ .**

ئەم بەرهەمە بریتییە لە بیروڕای ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد سەبارەت بە ڕێنووسی کوردی . ئەم بڕیارو پێشنیارانەی کۆڕ کراوەتە نامیلکەیەکیش‌و سالی ١٩٧٦ بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٦٧ ) .

**٤٦٧ – ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .**

ئەم نامیلکەیە ( ١٨ ) لاپەڕەیەو بریتییە لە بیروڕای ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد سەبارەت بە ڕێنووسی کوردی . ئەم پێشنیارو بڕیارانەی ئەنجومەنی کۆڕ لە بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »یشدا بلاوکراوەتەوە . ( بڕوانە : باسی ژ ٤٦٦ ) .

**٤٦٨ – لەبارەی لیستەی یەکەمی ( زاراوەی کارگێڕی )یەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٨٨٠ – ٨٩٣ .**

ئەمە وەلامی ئەو نامەو وتارانەیە کە لەبارەی لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕەوە بۆ کۆڕ نێردراون یان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە .

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ١٠٥٤ ، ١٠٥٥ ، ١٠٥٦ ، ١٠٥٧ ، ١٠٥٨ ، ١٠٥٩ ، ١٠٦٠ ، ١٠٦١ ، ١٠٧٣ ، ١٠٧٤ .**

## د . کەریم ئەیووبی :

**٤٦٩ – نامەیەک لە لێنینگرادەوە ، گۆڤاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٦٧ ، سالی ٦ ، هەولێر ، ١٩٥٩ ، ل ٧ – ٨ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٦٩ ، سالی ٦ ، هەولێر ، ١٩٦٠ ، ل ١٥ – ١٧ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ١٧٢ ، سالی ٦ ، هەولێر ، ١٩٦٠ ، ل ٤ – ٦ .**

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا لە خاسیەتی زمانی کوردی دواوەو لـە ڕووی بەکارهێنانی وشەو داڕشتنی ڕستەوە هەندێ هەڵەی نووســـەرانی گۆڤاری « هەتاو »ی خستووەتە پێش چاوو ڕاستکردووەتەوە •
**هەروەها ژ : ٨٢٣ ، ٨٥٨ •**

## کەریم زەند :

**٤٧٠ ــ زمانی کوردیو هونەری وەرگێران ، سلێمانی ، ١٩٧٧ •**
ئەم کتێبە ( ٧٨ ) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە باسی هەمەچەشـــنەو تێکەڵو پێکەڵی زمانەوانی •

**٤٧١ ــ نـەژادی میللەتی کـورد وە بنچینـەی زبـانی ، گۆڤـاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٥ ــ ٢٢ •**
لە سەرەتای ئەم وتارەدا بەکورتی باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردی کراوەو دوایی بەدرێژی لە بەشە دیالێکتەکانی لوڕی کۆڵراوەتەوەو بەراورد لەنێوانیاندا کراوە ••• ڕای هەندێ لە زانایان سەبارەت بە ئەسڵی زمانی کوردی خراوەتە پێش چاوو ئەو ڕایە ڕەتکراوەتەوە کە زمانی کوردی بە دیالێکتێکی فارسی لەقەڵەمداوە •
**هەروەها ژ : ٢٦١ •**

## کەریم شارەزا :

**٤٧٢ ــ زمانو زمانی کوردیو خاســـیەتەکانی ، گۆڤاری « کاژاو » ، ژ ١ ، سلێمانی ، ١٩٨٤ ، ل ٣ ــ ٩ •**
نووســـەر لەم وتارەدا هەندێ خاســـیەتی زمانی کوردی لەڕووی داڕشتنو گەردانکردنو دەربڕینی دەنگەوە خستووەتە پێش چاو •

**٤٧٣ ــ ناڵیو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، بەغدا ، ئەیلوولی ، ١٩٨٣ ، ل ٢١ ــ ٢٨ •**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا دەربارەی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دواوەو ئنجا بە نموونەوە ئەوەی نیشانداوە ، چۆن نالیو شاعیرە هاوچەرخەکانی لەپاڵ شێوە تایبەتییەکەی بابان ( سلێمانی ) وشەو فۆرمی دیکەیان لە بەشە دیالێکتەکانی تری کوردی وەرگرتووەو لەناو شیعرەکانیانا بەکاریانهێناوە •

## کەمال ڕەئووف محەمەد :

**٤٧٤ - تۆفیق وەهبی کوڕی پیرەمەگروون ، گۆڤاری (( کاروان )) ، ژ ١٨ ، هەولێر ، ئازاری ١٩٨٤ ، ل ٢ - ١٦ •**

لە هەندێ شوێنی ئەم وتارەدا باسی کارە زمانەوانییەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبیو هەندێ لە زمانەوانانیتری کورد کراوە •

## د • کەمال فوئاد :

**٤٧٥ - بەبۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا تۆفیق وەهبییەوە ، ( ١٨٩١ - ١٩٨٤ ) ، گۆڤاری (( هیوا )) ، ژ ٢ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ١٧ - ٢٤ •**

نووسەر لە کۆتایی ئەم وتارەدا باسی هەندێ لە کارە زمانەوانییەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی کردووە •

**٤٧٦ - بەراوردێك لەنێوان زمانی نووسینی کوردیی ڕۆژئاوایی ( جزیری )و زمانی نووسینی کوردیی ڕۆژهەڵاتی ( سلێمانی )دا ، گۆڤاری (( زانیاری )) ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ١٧ - ٢٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە ڕووی ( جیاوازیی دەنگەکان )و ( جیاوازیی مۆرفۆلۆژی )یەوە بەراوردی زمانی نووسینی ئەو دوو دیالێکتە سەرەکییەی زمانی کوردی کردووە •

**٤٧٧ - چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٣٦ - ٤٠ •**

نووسەر لە کۆتایی ئەم وتارەدا لە بنچو بناوانی وشەکانی « کفری »و « چوارتا »و « شارەبان »و « فەلەستین »و « کەنج »و « دیجلە »و « دانیشگا - زانستگا »ی کۆلیوەتەوە •

**٤٧٨ - چەند سەرنجێکی زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٥٨ - ٥٩ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە دوو باس دواوە : ١ - شێوەی دەربڕین‌و نووسینی دیفتۆنگی ( وێ ) ؛ ٢ - ڕەخنە لە ناوی « کۆڕی زانیاری کورد »و وای پێ ڕاستە بووترێ « ئەکادێمیی زانستیی کوردی » •

**٤٧٩ - چەند سەرەتایەکی زمانەوانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ١٩ - ٢٦ •**

د • کەمال لە سەرەتای ئەم وتارەدا باسی جیاوازیی زمانی گفتوگۆو زمانی ئەدەبی کردووەو دوایی لە دیالێکتەکانی کوردی‌و زمانی ئەدەبیی کوردی‌و دانانی ڕێزمان ••• دواوە •

**٤٨٠ - زاراوەکانی زمانی کوردی‌و زمانی ئەدەبی‌و نووسینیان ، گۆڤاری « زانیاری » ، ژ ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ١٦ - ٢٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی تێکڕای دیالێکتەکانی زمانی کوردی کردووەو بەسەر چوار بەشدا دابەشی کردوون : « ١ - کوردیی ڕۆژئاوایی یا ( کرمانجیی سەروو ) ؛ ٢ - کوردیی ڕۆژهەڵاتی یا ( کرمانجیی خواروو ) ؛ ٣ - کوردیی باشووری ؛ ٤ - گۆرانی‌و زازایی » •
( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٠٤ ) •

## د • کەمال مەزهەر :

**٤٨١ - « تێگەیشتنی ڕاستی »و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ •**

نووسەر لە بەندی یەکەمی بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا ، کە بە ناوی « ( تێگەیشتنی ڕاستی )و زمانی کوردی »یەوەیە ( ل ١٤٨ - ١٥٤ ) ، سەبارەت بە ڕەوانی زمانو داڕشتنی وشەی کوردیی نوێو دەستکاری کردنی ئەلفوبێی عەرەبیو بەکارهێنانی شێوەی ( دە )و ... لەلایەن نووسەرانی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی »یەوە دواوە .

**٤٨٢ - سەرنجێکی مێژوویی لە زمانەکەمان ، گۆڤاری « بلێسە » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٣٥ - ٤٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو بیروڕایانە دەداتەوە ، کە زمانی کوردی بە بەشە دیالێکتی فارسی دادەنێن .

ع . گۆڤان :

**٤٨٣ - نووسینی کوردی بە تیپی لاتینی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سالی ٥ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ١ - ٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە نموونەو بەڵگەوە وا نیشاندەدا ، کە زمانی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی بنووسرێ چاکترە .

« گەلاوێژ » :

**٤٨٤ - پرسیاری گەلاوێژ ( زمانی کوردیو چۆنیەتیی نووسینی ) ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، سالی ٤ ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥١ .**

لێرەدا دەربارەی زمانی کوردیو چۆنیەتیی نووسینی پرسیار لە خوێنەرانی کورد کراوە ، کە بە شێوەیێکی ڕاستو زانستی ڕای خۆیان سەبارەت بە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی یان لاتینی دەربڕن .

( بڕوانە : باسی ژ ٣٤٠ ، ٣٥٩ ، ٤١٧ ، ٤٨٤ ) .

گیو موکریانی :

**٤٨٥ ـ ئەلفوبێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، ١٩٦٠ ٠**

ئەم نامیلکەیە ( ٤٣ ) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە چەند دەرسێك بۆ فێرکردنی لاتینی ٠ لە کۆتاییشدا کەمێك باسی ڕێزمانی کوردی تێدایە ٠

**٤٨٦ ـ ئەلفوبێی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، ١٩٧٢ ٠**

ئەم کتێبە ( ١٦٠ ) لاپەڕەیە ٠ بە زاراوەکانی ( سۆرانی )و ( بادینی )و ( فەیلی )و ( هەورامی )یە ٠ ئەگەرچی مەبەستی ئەم کارە بە زۆری فێرکردنی زمانی کوردییە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیێکی فراوان باسی ئەلفوبێو ڕێزمانی کوردی گرتۆتەخۆ ٠

**٤٨٧ ـ پاشاگەردانی زمانو نووسین ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ١٧١ ، ساڵی ٦ ، هەولێر ، ١٩٦٠ ، ل ٢٣ ـ ٢٤ ٠**

نووسەر لەم وتارە کورتەدا وەڵامی کاکە شوان دەداتەوە ، سەبارەت بەو چەند وشەیەی لە ژمارە ( ٦٨ )ی ڕۆژنامەی (( ئازادی ))دا پێشنیاری کردبوو ٠

**٤٨٨ ـ فەرهەنگی کوردستان ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ١٢١ ، ساڵی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ١ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی ناوەرۆکی (( فەرهەنگی کوردستان ))ی کردووە ، کە بۆ چاپ ئامادەی کردووە ٠

**٤٨٩ ـ فێربوونی زمانی کوردی بە بێ مامۆستا لە سێ مانگدا ، چاپی دووەمین ، هەولێر ، ١٩٦٩ ٠**

ئەم نووسراوە ( ١٣٦ ) لاپەڕەیەو لە شێوەی فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبیدایە ، کە بەپێی بابەت وشەکانی جیاکراوەتەوەو لە هەندێ شوێندا وتووێژیش بۆ وشەکان سازکراوە ٠ وێڕای ئەوە ، لە سەرەتاو کۆتایی ئەم کتێبەدا باسی پیتەکانی کوردیو هەندێ مەسەلەی ڕێزمانی کوردی کراوە ٠

**٤٩٠ - فێربوونی زمانی کوردی لە سێ مانگدا بە بێ مامۆستا ، چاپی سێیەمین ، هەولێر ، ١٩٧٤ ٠**

ئەم کتێبە ( ١٤٠ ) لاپەڕەیە ٠ وێڕای ئەو هەموو وشەو دەستەواژەو ڕستانەی بە کوردی هێنراوەنەتەوەو بەرانبەرەکانیان بە عەرەبی نووسراون ، هەروەها لە سەرەتادا هەندێ کێشەی ڕێزمانی کوردیش باس کراوە ٠

**٤٩١ - نموونەی خەتو ئەلفوبێی کوردی پێش ئیســـــلام ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٧٦ ، سالی ٦ ، هەولێر ، ١٩٦٠ ، ل ١٨ - ١٩ ٠**

وێنەو باسی ئەو ئەلفوبێ کوردی‌یەیە ، کە لەپێش زاینەوە هەبووەو کە ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری وەحشییەی نەبەطی لە کتێبی « شـــوق المستهام فی معرفة رموز الاقلام »دا لێی دواوە ( بڕوانە : وتاری ژ ٤٩٣ ) ٠

**٤٩٢ - وەلام بۆ زانای گەورەو گرانو هونەرمەند مامۆستا تۆفیق بەگی خۆشەویست ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٢٨ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ٤ - ٥ و ١٦ - ١٨ و ٢١ - ٢٣ ؛ ژ ١٢٩ ، سالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٨ ، ل ٤ - ٥ و ١٦ - ١٩ ٠**

ئەم وتارە وەلامی ئەو ڕەخنەیەیە ، کە مامۆســـتا تۆفیق وەهبی لـە ژمارە ( ٤ )و ( ٥ )ی گۆڤاری « پێشـکەوتن »دا سەبارەت بە بنچو بناوانی وشەی « وێژە ، بوێژ ، گۆڤار ٠٠٠ » گرتوویەتی ٠ مامۆستا گ٠ە موکریانی لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەیدا بە دوورو درێژی باسی ئاوێستای کردووە ٠٠ لە بەشی دووەمدا لەبابەت وشـــــەکانی « وێژە ، بوێژ ، گۆڤار ٠٠٠ »و نیشانەی هەندێ پیتی کوردییەوە دواوە ٠

**٤٩٣ - وێنەی ئەلفبای کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٨ - ١٩ ٠**

ئەم وتارە باسی ئەلفوبێیەکی کۆنی کوردی دەکا ، کە لەپێش زاینەوە هەبووەو گەلێ کتێبی پێ نووســـــراوەو ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکری وەحشییەی نەبەطی لە کتێبی « شـــوق المستهام فی معرفة رموز الاقلام » ( ٢٤١ ك )دا لێی‌دواوە ( بڕوانە : وتاری ژ ٤٩١ ) ٠

**٤٩٤ – یەکێتی زمان فەرمانێکە لەسەر شانو ملی هەموو لایەکمانە ، گۆڤاری « هەتاو » ، بەشی یەکەم ، ژ ١ ، ســـــالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢ ، ســـــالی ١ ، ١٩٥٤ ، ل ١٥ – ١٦ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٣ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٨ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٤ ، سالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ٨ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٥ ، ســـــالی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ٩ – ١٠ .**

نووســـەر لەم زنجیرە وتارەدا باسی پێویســـتیی پاراستنی زمانی کوردیو هـەوڵی پێشخستنیو پێکەوەنانی زمـانی ئەدەبیی یەکگرتووی کردووە .

**٤٩٥ – یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٧٥ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ، ل ١ – ٢ ؛ ژ ٧٧ ، ســـــالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ، ل ١ – ٤ .**

مامۆســـتا گیوی موکریانی لـە ســەرەتای ئەم نووسینەیدا ، زنجیرە وتـارەکـەی مامۆســــتا محـەمـەد میهری ( بڕوانـە : وتـاری ژ ٥٠٣ ) هەڵدەسەنگێنێو دوایی باسی پێویستیو ڕێگەو ڕێبازی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەکات .

**هەروەها ژ : ١٠٦٨ ، ١٠٦٩ ، ١٠٧٠ .**

ل . هـ . :

**٤٩٦ – چاوپێکەوتنێکو گفتوگۆیەك لەگەڵ مامۆســــتا – ڕەئووف ئالانی – دا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٨٣ ، تشرینی ١ – ٢ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٧٩ – ٨٤ .**

مامۆســـتا ئالانی لەم چاوپێکەوتنە ( گفتوگۆیە )دا بیروڕای خۆی دەربارەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیو ســەبارەت ئەو کتێبانەی لەســــەر زمانی کوردی نووســــراونو لەبـابـەت وتەی هەندێ لـە کوردناسانەوە ... خستووەتە پێش چاو .

« لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد » :

**٤٩٧ – ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ٠**

ئەمە بەرهەمی لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردە ، کە لە چەند ژمارەیێکی گۆڤاری کۆڕدا ( بڕوانە : باسی ژ ٤٩٨ )و سالی ١٩٧٦ بە کۆکراوەیی لە کتێبێکی گەورەی ( ٤٧٨ ) لاپەڕەییدا بەناوی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی »یەوە بلاوی کردووەتەوە ٠

ئەم نووسراوە بە شێوەیێکی سەرەکی دەربارەی بەشەکانی ئاخاوتنەو بریتییە لە باسی : ناو ( ل ١٠ – ٢٦ ) ؛ جێناو ( ل ٢٧ – ٧٤ ) ؛ ئاوەڵناو ( ل ٧٥ – ٩١ ) ؛ کردار ( ل ٩٢ – ٢٦٧ ) ؛ چاوگ ( ل ٢٦٨ – ٢٨٣ ) ؛ ئاوەڵکردار ( ل ٢٨٤ – ٣٠٣ ) ؛ پریپۆزیشن ( ل ٣٠٤ – ٣٢٥ ) ؛ ئامرازی پێوەندی ( ل ٣٢٦ – ٤١٦ ) ؛ ئامرازی سەرسوڕمان ( ل ٤١٨ – ٤٤٧ ) ؛ ئامرازو گیرەکو نیشانە ( ل ٤٤٧ – ٤٧٧ ) ٠

**٤٩٨ – ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٨٩ – ٤٩٦ ؛ ب ٣ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٤١ – ٣٥٨ ؛ ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل ٢٨٩ – ٤٠٠ ٠**

ئەمە بەرهەمی لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردەو بە شێوەیێکی سەرەکی دەربارەی بەشەکانی ئاخاوتنە ٠ ئەم بەرهەمە سالی ١٩٧٦ بە کۆکراوەیی لە کتێبێکی گەورەی ( ٤٧٨ ) لاپەڕەییدا بە ناوی « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی »یەوە بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٩٧ ) ٠

**٤٩٩ – ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٤٣ – ٤٢١ ٠**

تێکڕای ئەم باسە باسی ئەو پێشگرانەیە کە کرداری داڕێژراو ڕۆدەنێن •

**٥٠٠ – ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆلینەوەی لیژنەی زمانو زانستەکانی ، « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٣٤٤ – ٤٨٥ •**

ئەم بەشەی کاری لیژنەی زمانو زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد بەرهەمی کۆبوونەوەکانی سالی ( ١٩٧٨ )ەو باسی پێشگرە •

## « لیژنەی زمانی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » :

**٥٠١ – بەراوردکاری لەنێوان زارە کوردییەکانـدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٧٧ – ٣٤٠ •**

ئەمە بەرهەمی لیژنەی زمانی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کوردە ، کە لە ماوەی دوو سێ سالدا هێنراوەتە بەرهەم • ناوەرۆکی ئەم باسە بەمچەشنەیە : کورتە باسێکی فۆنەتیك ( ل ٢٧٧ – ٢٨٠ ) ؛ هێندێ زاراوەی فۆنەتیکی زمانی کوردی ( ل ٢٨٠ – ٢٩٣ ) ؛ دەنگ گۆڕکێ لە زمانی کوردیدا ( ل ٢٩٤ – ٣١١ ) ؛ بەراوردکاریی ڕێزمانیی زارە کوردییەکان ( ل ٣١١ – ٣٣٧ ) • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٠٢ ) •

**٥٠٢ – هەندێ لە بابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٨٥ •**

ئەم کتێبە ( ٧٦ ) لاپەڕەیە ، بەرهەمی کۆبوونەوەکانی خولی کۆڕی سالی ١٩٨٣ – ١٩٨٤ی لیژنەی زمانی کوردییە ، کە ئەندامەکانی ( ١ – د • کامیل حەسەن بەسیر ؛ ٢ – مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی ؛

٣ ـ د ٠ وریا عومەر ئەمین ؛ ٤ ـ نووری عەلی ئەمین ؛ ٥ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی ؛ ٦ ـ ئەبوزەید سندی )ن ٠ باسەکانی ئەم کارە بریتی‌یە لە : « لێکۆلینەوەی چەند دەنگێکی زمانی کوردی » ( ل ٩ ـ ١٨ ) ؛ « وشە » ( ل ١٩ ـ ٣٧ ) ؛ « فرێز » ( ل ٣٨ ـ ٤٥ ) ؛ « رستە » ( ل ٤٥ ـ ٦٥ ) ؛ « ئامرازی گونجاندن » ( ل ٦٥ ـ ٧٦ ) ٠

م ٠ م ٠ :

٥٠٣ ـ زمانی کوردی یەك جۆرە شێوەکانی زۆرە ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٤٧ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٤٨ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٥٤ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٥٥ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٢ ؛ ژ ٥٦ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ و ١٤ ؛ ژ ٥٧ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٥٨ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٥٩ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٦٠ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦١ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٦٢ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٣ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٤ ؛ ژ ٦٤ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٥ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٦ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٧ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٨ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ ـ ٣ ؛ ژ ٦٩ ، سالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٦ ،

ل ١ – ٣ ؛ ژ ٧٠ ، ســـــالی ٣ ، هەولێــر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ – ٣ ؛ ژ ٧١ ، ســـــالی ٣ ، هەولێــر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ – ٣ ؛ ژ ٧٢ ، ســـــالی ٣ ، هەولێــر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ – ٣ ؛ ژ ٧٣ ، ســـــالی ٣ ، هەولێــر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ – ٣ ؛ ژ ٧٤ ، ســـــالی ٣ ، هەولێــر ، ١٩٥٦ ،
ل ١ – ٣ ٠

له ژماره ( ٥٤ )ەوه تا ژماره ( ٧٠ ) ناوی وتار بووه به « زمانی ئێمه یەك جۆره شێوەكانی زۆره » ٠ له ژماره ( ٦٠ )ەوه تا ژماره ( ٦٨ ) لـه سەروو ناونیشانی وتارەكەوه ( یەكێتی زمانی كوردی )یشی نووسـراوه ٠ له ژماره ( ٧١ )ەوه تا ژماره ( ٧٤ ) ، تەنیا ســـــەرناوی ( یەكێتی زمانی كوردی ) ماوه ٠٠٠ ئەم زنجیره وتاره ( ٢٣ ) بەشـەو له ژماره ( ٤٧ ) تـا ( ٧٤ )ی گۆڤاری « هەتاو » ( جگه له ژماره ٤٩ تا ٥٣ )دا بڵاوكراوەتەوه ٠ مامۆستا محەمەد میهری له ئەستەموولەوه ناردویەتی ٠٠٠ نووســـەر لەم زنجیره وتارەدا به شێوەیەكی دوورو درێژ لەبارەی دیالێكتەكانو بەشـه دیالێكتەكانی كوردی‌یەوه دواوەو شێوەی ئاخاوتنیانی دیاری كردووه ٠٠٠ سەبارەت به ڕێزمانی كوردی‌و وێكچوونو جیاوازیی نێوان دیالێكتەكانی كـوردی كۆلیوەتـەوه ٠٠٠ وەڵامی بیروڕای ناڕاســـــــتو هەڵەی ڕۆژهەڵاتناسانی داوەتەوه ٠٠٠ باسی نەژادو ئەســـلی كوردی كردووه ٠
( لەبارەیەوه بڕوانه : باسی ژ ٤٩٥ ) ٠
هەروەها ژ : ٧٣٦ ، ٧٣٧ ٠

م ٠ م ٠ :

٥٠٤ – نووسینی زمانی كوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٨ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٩ – ١٤ ٠

ماموستا محەمەدی مەلا کەریم لەم وتارەدا دەربارەی وێنەی هەندێ دەنگ‌و نووسینی هەندێ وشە چەند پێشنیارێکی کردووە •

**هەروەها ژ : ٥٥٧ ، ٥٥٨ ، ٥٥٩ ،- ٥٦٠ ، ٥٦١ ، ٥٦٢ ، ٥٦٣ •**

م • و • :

**٥٠٥ ـ کورتە باســــــێك دەربارەی فۆنەتیکی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٥٨ ـ ٥٩ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٧ •**

ئەم کورتە وتارە بەکورتی باسی ئەو ( ك )و ( گ )انە دەکات ، کــە لەپێش ( ی ، ێ ، وی ، وێ )ەوە دێن •

د • مارف خەزنەدار :

**٥٠٦ ـ بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناس خۆدزکۆ ـ لێکۆڵینەوەیێکی زمانەوانی لەبابەت زمانی کوردی‌یەوەیە ( شــێوەی ســــلێمانی ) ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٢ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٣٤ ـ ٣٩ •**

لێرەدا د • خەزنەدار پێشەکی ئەو وتارەی خۆدزکۆ لەبارەی زمــانی کوردییەوە لە گۆڤاری « ئاسیا » ( ١٨٥٣ )دا نووســــیوێتی ، بەکوردی بڵاوکردووەتەوەو هەندێ پەراوێزی بــۆ کــردووە • ( بڕوانــە : باســـی ژ ٨٩٩ ) •

**٥٠٧ ـ تیپ‌و پیت ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٧ ـ ٣٨ •**

نووســــەر لەم وتارەدا ماناکانی دوو وشــــەی ( تیپ )و ( پیت ) لێك‌دەداتەوەو هەوڵ‌دەدا ئیسپاتی بکا ، کە ( تیپ ) بەراتبەر بە ( حرف )ی عەرەبی ڕاستترە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٢٠ ) •

**٥٠٨ ـ دەستنووسی ژمارە ( D 448 )ی نامەخانەی ئامۆژگاری ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیێت ـ لینینگراد ، « گۆڤاری کۆلێجی ئاداب » ، ژ ١٧ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١٠ ـ ٣٦ .**

ئەم دەستنووسە کە د . مارف خەزنەدار باسیدەکا ، یەکێکە لە دەستنووسەکانی ئەلێکساندر ژاباو بریتییە لە دوو بەش : بەشی یەکەم ـ باسی هەندێ جیاوازی نێوان شێوەکانی کوردیو چەند دەستوورێکی گشتیی زمانی کوردی دەکات . بەشی دووەم ـ فەرهەنگۆکێکی بەراوردکردنە لەنێوان دوو شێوەی زمانی کوردی ، شێوەی ( هەکاری )و ( ڕەوەندی ) ، بەپێی پیتی هیجا ڕێکخراوەو نزیکەی ( ٨٠٠ ) وشەیێك دەبێت .

**٥٠٩ ـ زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢٣ ـ ٢٦ ؛ ژ ٨ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٣ ـ ١٨ ؛ ژ ١١ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٣٨ ـ ٤٥ .**

مامۆستا خەزنەدار لەم زنجیرە وتارەدا سەبارەت بە نووسینی هەندێ پیتو وشەو ئامراز دواوە :

بەشی یەکەم بریتییە لەم باسانە : « ١ ـ ( کوردستان ) یا ( کوردوستان ) ؛ ٢ ـ واوی عەتف ؛ ٣ ـ ( ر ) یا ( رر ) ؛ ٤ ـ ( زمان ) یا ( زبان ) » .

لە بەشی دووەمدا لەبارەی « ١ ـ ( دووەم ) یا ( دوهەم ) ؛ ٢ ـ ئاوی عەلەم ؛ ٣ ـ ( سلێمانی ) یا ( سولەیمانی ) یا ( سلەیمانی ) ؛ ٤ ـ ( یەکیتی سۆڤیەت ) یا ( یەکیتی شووروەوی ) ؛ ٥ ـ ( ناومرۆك ) یا ( ناواخن )ەوە دواوە .

بەشی سێیەم دەربارەی « ١ - ( کابرایی - کابرایێك ) یا ( کابرایە - کابرایەك ) ؛ ٢ - ( لە دایكبوون ) یا ( زایین ) ؛ ٣ - ( تیپ ) یا ( پیت ) دواوە • ( لەبارێەوە بڕوانە : باسی ژ ١٧٤ ، ١٩٤ ) •

**٥١٠ - وشەی نالی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٣ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٢٦ - ٢٧ •**

ئـەم وتـارە باســی ئەو مانایانـە دەکات ، کـە وشـــەی ( نالی ) دەیانگەیەنێ •

**هەروەها ژ : ٦٠٨ ، ٦٠٩ ، ٧٢٤ ، ٧٢٩ •**

مالمیسانژ :

**٥١١ - دملکی دە لیکەرێ هەفدودانی ، گۆڤاری « هیوا » ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٦٧ - ٨٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا بە دوورودرێژی لە جۆرەکانی کرداری ناسادەو چۆنیەتیی ڕۆنانیان لە شێوەی دملکیدا دواومو لەگەڵ کرمانجیی ژووروو و هەورامانیدا بەراوردی کردوون •

**٥١٢ - دملکی میان د جیاییا ڤاتشـــان ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٢ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٨٣ - ١٠٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی شێوەکانی دملکی کردووەو جیـاوازیـان لە ڕووی دەنگ ( بزوێنو نەبزوێن )و مانا ••• وە نیشانداوەو لـەگـەڵ کرمانجیی ژوورووداا بەراوردی کردوون •

ماموّســتا :

**٥١٣ - بێژانەوەی وشە ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٥ ، سالی ١ ، بەغدا ، ل ١ - ٢ •**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم وتارەدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە وشەی « ئاهەنگ » بە مانای « حفلة » هەڵەیە .

٥١٤ ــ وشەوانی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١ ــ ٤ .

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم وتارەدا مانای وشەی « بەزم »و « گۆبەند »ی لێکداوەتەوە .

هەروەها ژ : ١٣٦ ، ١٣٧ ، ١٣٨ ، ١٣٩ ، ١٤٠ ، ١٤١ ، ١٤٢ ، ١٤٣ ، ١٤٤ ، ١٤٥ ، ١٤٦ ، ١٤٧ ، ١٤٨ ، ١٤٩ ، ١٥٠ ، ١٥١ ، ١٥٢ ، ١٥٣ ، ١٥٤ ، ١٥٥ ، ١٥٦ ، ١٥٧ ، ١٧٧ ، ٦٩٥ ، ٦٩٦ ، ٦٩٧ ، ٦٩٨ ، ١٠٠١ ، ١١٠٦ .

محەمەد ئەحمەد ئەمین :

٥١٥ ــ چەند سەرنجێکی ڕێزمانی دەربارەی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر پاشگری ( کە ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٩ ــ ١١ .

ئەم نووسینە دەربڕینی هەندێ سەرنج و تێبینییە دەربارەی وتاری « لێکۆڵینەوەیەك لەسەر پاشگری ( کە ) لە زمانی کوردیدا »ی مامۆستا عەبدولقادر ئەمین ، کە لە ژمارە ( ٥١ )ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان »دا بڵاوی کردووەتەوە . ( بڕوانە : باسی ژ ٣٦٣ ) .

محەمەد ئەحمەد سەعید :

٥١٦ ــ پاشکۆی ( دا ) یان پاشگری ( دا ) ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤٥ ، ١٩٧٧ ، ل ٢٠ ــ ٢٢ .

ئەمە هەندێ سەرنج و تێبینییە دەربارەی وتاری « پاشکۆی درا »ی د . عەبدوللا نەقشبەندی ، کە لە ژمارە ( ١ )ی بەرگی ( ١ )ی گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد »دا بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٣٧٤ ) .

**٥١٧ ـ چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٥ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٢ ـ ١٧ .**

نووسەر لەم وتارەدا کتێبی « ڕێزمانی کوردی » ( بەرگی یەکەم ـ مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم ـ ناو )ی د . ئەوڕەحمانی حاجی مارفی هەلسەنگاندووە ، کە سالی ١٩٧٩ بلاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٣ ) .

**٥١٨ ـ چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٣ ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٨٢ ، ل ٤٠ ـ ٤٤ .**

ئەمە هەر وتاری ژ ( ٥١٧ )ەیەو سەرلەنوێ بلاوکراوەتەوە .

**٥١٩ ـ کورتە هەلسەنگاندنێکی پرۆگرامی خوێندنی ڕێزمانی کوردی لە قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەییدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٩ ، ١٩٨٣ ، ل ٧٥ ـ ٩٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ تێبینی و سەرنجی لەبارەی بەشی ڕێزمانی تێکرای ئەو شەش کتێبی « زمانی و ئەدەبی کوردی »یەوە خستووەتە پێش چاو ، کە بۆ هەر لە پۆلی یەکەمی ناوەندییەوە تا پۆلی شەشەمی ئامادەیی دانراون .

**٥٢٠ ـ ( کە ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٨٢ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٦ ـ ٩ .**

ئەم وتارە هەر ئەو وتارەیە ، کە لە ( ل ٩ ـ ١١ )ی ژمارە ( ٨٠ )ی سالی ١٩٨٠ی هەمان گۆڤاردا بلاوکراوەتەوەو کەمێ جیاوازی هەیە ( بڕوانە : باسی ژ ٥١٥ ) .

محەمەد ئەمین زەکی :

**٥٢١ - خولاصەیەکی تەئریخی کوردو کوردستان ، جلدی ئەوەڵ ، جزئی دووەم ، بەغدا ، ١٩٣١ .**

بەشی سێیەمی ئەم کتێبە ( ل ٢٨٦ - ٣١٤ ) سەرلەبەری باسی زمانی کوردیە . لە سەرەتادا دەربارەی ئەسڵی زمانی کوردیو شوێنی لەنێو خێزانی زمانە ئێرانییەکانداو بەراوردکردنی لەگەڵ پەهلەویو فارسیدا دواوە . دوایش بە دووروودرێژیو نموونەوە لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی کۆلیوەتەوە .

**٥٢٢ - زمانی کوردی ، گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ، سالی ١ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ - ٢ .**

گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ئەوەی بەزمو ڕووی زانایانو ڕووناکبیرانی کورد کردبووەوە ، کە (( یەکێ لەو قۆرتە گەورانەی دێتە ڕێی نووسینی کوردیو بڵاوبوونەوەی خوێندەواری لەناو کورددا ، بە گران لە نووسینو قسەی یەکتری گەیشتنمانە )) . مامۆستا محەمەد ئەمین زەکیش لەم وتارەدا ڕێو شوێنی لابردنی ئەو گیروگرفتە گەورەیە پیشاندەدا .

**٥٢٣ - زمانی کوردی ، گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ، سالی ٤ ، ژ ٣ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ١ - ٩ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا باسی میللەتانی زووی کوردستان دەکاتو ئنجا دێتە سەر مادەکانو زمانی کوردی دەگەڕێنێتەوە سەر زمانی میدی . دواتر کەمێ بەراوردی زمانی کوردیو فارسیو ئینگلیزی دەکاو ئەوجا هۆی پەیدابوونی وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا نیشاندەدا . لە کۆتاییشدا لە دەوڵەمەندیو ڕەوانیی زمانی کوردی دواوە .

**٥٢٤ - زمانی کوردیو ئەدەبی ، گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ، سالی ١ ، ژ ١ بەغدا ، ١٩٣٩ ، ل ٣ - ٨ .**

نووســـــەر لەم وتارەدا دژی ئەو بیروڕایانە وەستاوە کــە زمانی کوردی‌یان بە شێوەیێکی فارسی لەقەڵەمداوەو بۆ پێ‌سەلماندنی ئەوەی کە زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆو دەولەمەندە باسی شــــاعیرانی کۆنی کوردی کردووە •

**٥٢٥ ــ قســەو زمانی کوردی ، گۆفاری « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم ، سالی ٧ ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٤٦ ، ل ١ ــ ١٠ ؛ بەشی دووەم ، ســالی ٧ ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٩٤٦ ، ل ١ ــ ١١ ؛ بەشی سێیەم ، سالی ٧ ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٤٦ ، ل ١ ــ ١٢ ؛ بەشی چوارەم ، سالی ٧ ، ژ ٩ ، بەغـدا ، ١٩٤٦ ، ل ١ ــ ١٢ ؛ بەشی پێنجەم ، سالی ٧ ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٤٦ ، ل ١ ــ ٩ •**

ئەمە ئەو باسەی زمانی کوردی‌یە کە لە کتێبی « خلاصة تأريخ الكرد وكردستان »ی مامۆستا ئەمین زەکی بەگدا نووسراوە • بۆئەوەی زێـدە زانیاری‌یەکی تێدابێ ، گۆڤاری « گــەلاوێژ » وای بــە بــاش زانیوە لــە نوسخە عەرەبی‌یەکەی مامۆستا محەمەد عەلی عەونی‌یەوە بیکاتە کوردی ، چونکە مامۆســــتای ناوبراو هەندێ لێدوانو زانیاریی خۆی لەگەڵـدا چاپکردووە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٢١ ) •

**هەروەها ژ : ٢٧ •**

محەمەد ئەمین محەمەد :

**٥٢٦ ــ زمان لە شیعری هێمندا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٥٩ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ١٠ ــ ١٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا نیشانی‌داوە مامۆســــــتا هێمن چۆن لەڕووی ڕەوانبێژی‌یەوە مامەلە لەگەڵ وشەی کوردی ڕەسەنو وشـــــەی بێگانە دەکاتو لەکوێ دایاندەنێو لە ڕێگایانەوە ڕستەکان بــە چی ســــۆزێك دەهۆنێتەوە •

محەمەد ئەمین هەورامانی :

**٥٢٧ ـ ئامرازی ( لە ) لە تەرازووی بەراورددا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٣٨ ، تشرینی دووەمی ١٩٨٥ ، ل ٢٠ ـ ٣٧ .**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی ئەرك و دەوری ئامرازی ( لە ) دواوەو لەو لایەنەوە بەراوردی لەنێوان دیالێکتی کرمانجیی خواروو و دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و بەشە دیالێکتی هەورامانیدا کردووە .

**٥٢٨ ـ پرپۆزیشنی ( بە ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠١ ، بەغدا ، ئاداری ١٩٨٤ ، ل ٦٤ ـ ٧٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەڕووی ئەرکی سینتاکسیو واتای سیمانتیکی ... یەوە لە پێشبەندی ( بە ) دواوە .

**٥٢٩ ـ تەماشاکردنێکی سەرپێیی زاری سۆرانیو زاری هەورامی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١١٧ ـ ١٦٥ .**

ئەم وتارە وەڵامی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەداتەوە ، کە وایان داوەتە قەڵەم گوایا شێوەی هەورامیو کوردی یەك زمان نین . بۆ پتر پێسەلماندنی ئەمە لەڕووی فۆنەتیکەوە بەراوردی دوورودرێژی لەنێوان هەردوو بەشە دیالێکتی هەورامیو سۆرانیدا کردووە .

**٥٣٠ ـ ( دا ) لە زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردیدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٠ ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٣٨ ـ ٤٧ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا گەشتێکی بەو نووسراوانەدا کردووە ، کە باسی ( دا )یان کردووەو ئەوجا لێکۆلینەوەی خۆی بەمجۆرە دامەزراندووە : « ١ ـ ڕواڵەتی ( دا )ی فۆلکلۆرو کوردواتەنی ؛ ٢ ـ واتای ( دا ) لە وێنەی فۆلکلۆریو کوردواتەنیدا ؛ ٣ ـ ئەرکی ( دا ) لەم وێنانەدا ؛ ٤ ـ ڕواڵەتی مۆرفۆلۆژی ( دا ) ؛ ٥ ـ ( دا ) لەنێو شیعری شاعیرانی پێش چەرخی بیستەمدا ... » .

**٥٣١ ــ دەربــارەی کتێبی ( کوردیش دایلێکت ) ، گۆڤـاری « ڕۆژی کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٧ ــ ١٨ ، ســـــالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٨ ــ ٦٠ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٩ ــ ٢٠ ، ســالی ٣ ، بەغـدا ، ١٩٧٤ ، ل ٤١ ــ ٤٦ .**

نووسەر لەم وتارەدا بە دوورودرێژی لەو کتێبە دواوە ، کە د . ن . مەکەنزی سالی ١٩٦١ لە لەندەن لەبارەی زمانی کوردییەوە بلاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٩٣٧ ) .

**٥٣٢ ــ ڕێنووس پەیڕەوی زمانناسی بکا باشە ، گۆڤاری « ئاســــۆی زانکۆیی » ، ژ ١٠ ، سالی ٢ ، ئابی ١٩٧٨ ، ل ٨٨ ــ ٩١ .**

نووســـــەر لەم وتارەدا وادادەنێ ، ئەوەی زۆر پێویست بێ لــە ڕازاندنەوەی ڕێنووسی زمانی کوردیدا دوو دیوە : « دیوی یەکەمیــان ئەوەیە کە ڕێنووسی سەرکەوتوو توانای هەیە بەتەواوی وەك ئاخاوتنەکەی لەکاتی خوێندنەوەیدا دەنگ بداتەوە بە بێ جیاوازیو بـە بێ کەموکوڕی ئاوازو بە بێ ئەوەی بیری خوێنەر بچێ بەرەو گێژاوێك گوایا ئەمە چیڕیە ڕێنووس ... » ... « دیوەکەی تریان بەلای زمانناسیدا ڕادەکێشێ .. » . مامۆســتا هەورامانی بەتایبەتی لــە دیوی دووەم دواوەو بەلگەو نموونەی هێناوەتەوە .

**٥٣٣ ــ زاراوەی ناتەواو ، گۆڤاری « ئاســـــۆی زانکۆیی » ، ژ ٣ ، سالی ٣ ، سلێمانی ، ١٩٧٩ ، ل ٧٨ ــ ٨١ .**

مامۆســتا هەورامانی لەم وتارەدا هەندێ هەلەی بـاوی نێو زمـانی کوردی دەستنیشان دەکاو زاراوەی تازەداهاتوو هەلدەسەنگێنێ .

**٥٣٤ ــ زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا ، بەغدا ، ١٩٨١ .**

ئەم کتێبە ( ٣٢٦ ) لاپەڕەیەو بریتییە لە : پێشەکی ( ل ٥ ــ ٥٠ ) ؛ بەشــــی یــەکــەم ــ کورتــە مێژوویەکی لێکۆلینەوەی زمانی کوردی ( ل ٥١ ــ ٧٠ ) ؛ بەشی دووەم ــ بەراوردکردنی دیالێــکتی هەورامــانیو

سۆرانی لە ڕووی دەنگ‌و دەنگسازی‌یەوە ، واتە لەڕووی فۆنۆلۆژی‌یەوە ( ل ٧١ - ١٦٢ ) ؛ بەشی سێیەم - بەراوردکردن لە ڕووی وشەسازی‌یەوە ، واتـە لـە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یەوە ( ل ١٦٣ - ٢٩٩ ) ؛ بەشـی چوارەم - سینتاکس ، یاخود ڕستەسازی ( ل ٣٠١ - ٣١٥ ) • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٣٥٦ )•

**٥٣٥ ـ زمانەکەمان لەکوێوە هاتووە ، گۆڤاری (( بەیان )) ، بەشـــی یەکەم ، ژ ١٠ ، بەغـدا ، ١٩٧٢ ، ل ٢١ و ٢٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٥ - ١٦ و ٢٢ ؛ بەشی سـێیەم ، ژ ١٣ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١١ - ١٣ ؛ بەشـــی چوارەم ، ژ ١٧ ، بەغـــدا ، ١٩٧٤ ، ل ٨ - ٩ و ٢٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە ڕەگ‌و ڕیشەی زمانی کوردی دواوەو باسی پێوەندیی کوردی لەگەڵ ئاوێستا کردووەو لەڕووی فۆنەتیک‌و موفرەداتی زمانەوە کۆلیوەتەوە •

**٥٣٦ ـ سەرەتایێک لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٣ •**

ئەم بەرهەمە ( ١٨٢ ) لاپەڕەیەو بەشێوەیێکی گشتی لـە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە :

بەشی یەکەم - بریتی‌یە لە :

أ ـ کورتە مێژووی زانستی زمان •

ب - زانستی زمان‌و ناوونیشانی •

جـ - لقە گرنگەکانی زانستی زمان •

بەشی دووەم - بریتی‌یە لە :

أ ـ ڕەسەنیی زمانی کوردی •

ب - زمانی کوردی لەڕووی زانستی زمانەوە ـ واتە لەڕووی ( فۆنۆلۆژی‌و مۆرفۆلۆژی‌و سینتاکس )ەوە •

**٥٣٧ – فۆنەتیکی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ ؁**

ئەم کتێبە ( ٧٢ ) لاپەڕەیەو بریتییە لەو باسانە : پێشەکی ( ل ٥ – ١٦ ) ؛ فۆنۆلۆژی ( ل ١٧ – ٢١ ) ؛ فۆنیم ( ل ٢٢ – ٢٤ ) ؛ جیاوازیی نێوان پیت‌و دەنگ ( ل ٢٥ – ٢٧ ) ؛ دەنگەکانی زمانی کوردی ( ل ٢٧ – ٢٨ ) ؛ کلیلی دەنگەکان ( ل ٢٩ – ٣٥ ) ؛ کۆنسۆنانتەکان ( ل ٣٦ – ٣٨ ) ، بزوێنەکان ( ل ٣٨ – ٣٩ ) ؛ دەنگە بزوێنە تێهەڵکێشراوەکان ( ل ٤٠ – ٤١ ) ؛ ئەو شتانەی کە زمانی کوردییان دیاری کردووە ( ل ٤١ – ٤٢ ) ؛ بزوێنی لۆدار ( ل ٤٣ – ٤٦ ) ؛ هێز ( ل ٤٧ – ٤٩ ) ؛ ئەندامەکانی ئاخاوتن ( ل ٥٠ – ٥٤ ) ؛ دەست‌نیشان کردنی دەنگە کۆنسۆنانتەکان ( ل ٥٤ – ٥٧ ) ؛ شێوەی دەرچوونی دەنگەکان ( ل ٥٧ – ٥٨ ) ؛ ناوونیشان هەڵدانی دەنگە کۆنسۆنانتەکان ( ل ٥٩ – ٦٣ ) ؛ چۆنیەتی بەکارهێنانی نووسینی دەنگی ( ل ٦٤ – ٦٩ ) ؛ کورتەی باس ( ل ٦٩ – ٧٠ ) ؁ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٨٩ ) ؁

**٥٣٨ – فۆنیم لەبەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەی بەراوردیدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٦ – ٩ ؁**

نووسەر لەم وتارەدا بەگشتی لەم باسانە دواوە : ( لێکۆڵینەوەی بەراوردی ؛ جیاوازیی نێوان پیت‌و دەنگ ؛ فۆنیم ... )و لە زمانی کوردییەوە نموونەی هێناوەتەوە ؁

**٥٣٩ – کوردواتەنی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەشی یەکەم ، ژ ٦٤ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٨ – ٢١ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦٧ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٥٥ – ٦٠ ؁**

ئەم وتارە دەربڕینی هەندێ سەرنج‌و تێبینی ڕێزمانییە سەبارەت بە ڕستەسازی‌و وشەسازی‌و دەنگسازی کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا مەسعوود محەمەد ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩٤ ) ؁

**٥٤٠ ـ ( کـه ) لـه زمـانی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردیدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ١٢ ، ئەیلولی ١٩٨٣ ، ل ١٩ ـ ٢٨ •**

ئەم وتارە دەربارەی ( کە ) وەك جێناو لەلایەکەوەو وەك ئامراز لـــە لایەکی دیکەوە دەدوێ •

**٥٤١ ـ لەگـەڵ وتـاری بەیانو ڕێنووســـی کوردیی بەیان ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٣٠ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤ ـ ٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا ڕەخنە لەوە دەگرێ کـە یەکێتی لـە ڕێنووسی گۆڤاری « بـەیـان »دا نییەو گەلێ نموونە بۆ ئـەو ڕەخنەیەی دێنێتەوەو لەکۆتاییشدا چەند پێشنیارێکی بۆ کردووە •

**٥٤٢ ـ وشەی ( هەورامان ) لە چیەوە هاتووە ، گۆڤـاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢٥ ـ ٢٦ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٦ ـ ٣٩ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە بنەڕەتی وشەی ( هەورامان ) وردبووەتەوە ، بۆئەوەی نیشانبدا چیەو لەچیەوە هاتووە • بۆ ئەمەش چەند ڕایـەکی خستۆتە پێش چاو ، کە هەندێکیان هی گەڕۆکەکانو ڕۆژهەڵاتناسەکانە •
( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٥٦ ) •

**هەروەها ژ : ٥٠١ ، ٥٠٢ ، ٧١١ •**

محەمەد ڕەشید نادر :

**٥٤٣ ـ لەبارەی ناوی ( تەوێڵە )وە ، گۆڤاری « برایـەتی » ، ژ ١٠ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٥ •**

ئەمە چەند دێڕێکە باسی پەیدابوونی ســـەرچاوەی ناوی ( تەوێڵە ) دەکـات •

## محەمەد زەکی ئەفەندیو میرزا محەمەد باشقە :

**٥٤٤ ــ قرائەتی کوردی ، نووسراوە بــە واســــطەی محەممەد زەکی ئەفەندیو میرزا محەممەد باشقە موعەلیمانی مەکتەبی حکومەتی ســلێمانی • تەرتیب کراوە بە واسطەی مێجەر ی. ب. سۆنو و. ج. فاریلل • نەشرکراوەتەوە بە واسطەی دایرەی مەعاریفی بەغدا ، ١٩٢٠ •**

واتە سالی ١٩٢٠ محەمەد زەکی ئەفەندیو میرزا محەمەد باشـــقە ، کە مامۆستایانی قوتابخانەی حکومەتی بوون لە ســلێمانی بە هاریکاری ی • ب • سۆنو و • ج • فاریلل بە ناوی « قرائەتی کوردی »یەوە ئــەم نامیلکەیەیان بلاوکردووەتەوە • ئەم بەرهەمە ( ٣٤ ) لاپەڕەیەو نووسەرانی باسی ئەلفوبێی کوردییان کردووەو لەبارەی نووسینی کوردی بــە پیتی لاتینی دواون •

## محەمەد صالح سەعید :

**٥٤٥ ــ پیتی ( ە ) لە کوردیدا ، گۆڤاری « گزنگ » ، ژ ١ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٧ ، ل ٥ ــ ٨ •**

نووسەر لــەم وتارەدا لــەو ئەرکە جۆربەجۆرانە دواوە ، کە دەنگی بزوێنی ( ە ) لە زمانی کوردیدا دەیبینێو شازدە ئەرکی بۆ دەستنیشـان کردووە •

**٥٤٦ ــ جارێکیتریش پیتەکانی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ژ ٤ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٤ ــ ٧٠ •**

ئەم وتارە هەندێ تێبینیو سەرنجو ڕوونکردنەوەیە دەربارەی ئــەو نووسینەی مامۆستا طاهیر صادق لە ژمارە ( ٣ )ی گۆڤاری « نووســەری کورد »دا بەناوی « جارێکیتریش پیتەکانی کوردی » ( ل ٣٦ ــ ٣٨ )ەوە بلاویکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٣٢٣ ) •

**٥٤٧ ـ چەند لایەنێك لە زمانی كوردیدا ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ژ ١٠ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٣ ، ل ٥٨ ـ ٦١ .**

ئەم وتارە لە سێ بەش پێکهاتووە : « ١ ـ تێبینیی گشتی لەسەر بزوێن » ؛ ٢ ـ ( دەنگ ) یان ( بزوێن ) ـ ( و ) وە ( ی ) » ؛ « ٣ ـ چۆنیەتی ڕاست نووسینی هەندێ وشە » .

**٥٤٨ ـ زمانی كوردیو پیتی ( و ) لەگەڵ ( ی )دا ، گۆڤاری « چیا » ، ژ ٢ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٨ ، ل ٢٣ ـ ٣٣ .**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا لە جۆرەكانی دەنگی ( و )و ( ی ) دواوەو لە دوایشدا ئەركەكانی بە دووروودرێژی باس كردووە .

**٥٤٩ ـ زمانی كوردیو نیشانەكردنی گیروگرفتەكانی ، گۆڤاری « برایەتی » ، بەشی یەكەم ، ژ ٥ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٧ ـ ١٨ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٢٣ ـ ٢٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی دیالێكتەكانی زمانی كوردییەوە دواوەو هەروەها ئەو هۆیانەی دەستنیشانكردووە ، كە بوونەتە هۆی پەیدابوونی دیالێكتو بەشە دیالێكتی جیاوازو ئنجا هەندێ ڕێگەی بۆ سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەكگرتووی كوردی داناوە .

**٥٥٠ ـ فڕێدانو هەڵبواردن لە بەكارهێنانو نووسینی كوردیدا ، « گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی كورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢١٢ ـ ٢٢٨ .**

ئەم وتارە باسی فڕێدانو هەڵبواردنی ئەم پیتانەی كردووە : « ١ ـ فڕێدانی ( ب )» ؛ « ٢ ـ فڕێدانی ( د ) » ؛ « ٣ ـ پیتە گیراوەكانی ( دوانی ) » ؛ « ٤ ـ فڕێدانی (ت) كە ڕاناوە » ؛ « ٥ ـ فڕێدانی ( ك ) » ؛ « ٦ ـ فڕێدانی ( ی ) » ؛ « ٧ ـ ( وێ ) لە زمانی كوردیدا » .

**٥٥١ ـ ( گەشەی ڕێنووسو زاراوە ) هەڵدانەوەی چەكێكی ڕەوی كاروان ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ١٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٣ ـ ٢٣ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو کتێبو نامیلکانە دەکات ، کە هەر لە زووەوە تا ئەم سالانەی دوایی لەبارەی زمانی کوردیو ئەلفوبێی کوردیو ڕێنووسی کوردیو زاراوەی کوردییەوە نووسراون • باسی دەستپێکردنو گەشەکردنیانی کردووە ••• دواتریش لە کارەکانی بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی کوردی دواومو هەندێ پێشنیاری زمانەوانی خستۆتە بەرچاو •

**٥٥٢ – وتەی ئەم جارە ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٦ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٢ ، ل ٣١ – ٣٣ •**

نووسەر لێرەدا لەم کێشانە دواوە : « بەرنامەی کوردیی قوتابخانەکان » ؛ « ٢ – بەکارهێنانی جیا » ؛ « ٣ – دەنگی هەندێ گیاندار » ؛ « ٤ – ( بزوێن ) یا ( دەنگ ) » •

**٥٥٣ – وتەی ئەم جارە ، گۆڤاری « دەنگی مامۆستا » ، ژ ٢ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٢ ، ل ٢٠ – ٢٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە سێ باس دواوە : « ١ – بەکارهێنانی ( دا ) ؛ ٢ – بەکارهێنانی جیا ؛ ٣ – هەندێك دەنگیتر » • •

**هەروەها ژ : ٧٣١ •**

## محەمەد عەلی قەرەداغی :

**٥٥٤ – چەند پەراوێزێکی ( فەرهەنگی لەکو لوڕ ) ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٩ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٤٦ – ٥٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ تێبینیو سەرنجی زمانەوانی ، بەتایبەتی لە هێنانی وشەی هاوواتاو لێکدانەوەی مانای وشەدا سەبارەت بەو کارەی مامۆستا مەحموود زامدار خستۆتە پێش چاو ، کە لە « فەرهەنگی لەکو لوڕ »ی مامۆستا حەمید ئێزەد پەناهدا تۆماری کردووە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٠٩ ) •

**٥٥٥ – کتێبی ( وشەی زمانی کوردی )و چەند سەرنجێك ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٣٤ ، بەغدا ، ١٩٧٥ – ١٩٧٦ ، ل ٣٥ – ٤٠ •**

ئەم وتارە ڕەخنەیە دەربارەی کەمو کورتی کتێبی « وشـەی زمـانی کوردی »ی ، کە د • ئەوڕەحمانی حاجی مارف سـاڵی ١٩٧٥ بڵاوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٧٠ ) •

محەمەد مستەفا :

**٥٥٦ – وشـەی هەورامان لە چیەوە هاتووە ؟ گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٣٠ – ٣١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٨ – ٤٠ •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەو لێکۆڵینەوەیەی مامۆسـتا محەمەد ئەمین هەورامانی پەسەند دەکات ، کە لە ژمارە ( ٢٥ – ٢٦ )ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردسـتان »دا لەبارەی وشەی ( هەورامان )ەوە بڵاوی کردووەتەوەو هەروەها هەندێ زانیاریتری خستووەتە سەر • ( بڕوانە : باسی ژ ٥٤٢ ) •

محەمەدی مەلا کەریم :

**٥٥٧ – بە کام شێوەی زمانەکەمان بنووسین ؟ ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٥ ، ساڵی ٢ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٢٣ – ٢٧ و ٧٢ – ٧٥ •**

نووسـەر لەم وتارەدا دەربارەی زمانی ئەدەبیی کوردی دەدوێو شێوەی سلێمانی بە بناغەی زمانی ئەدەبی دادەنێو واش بە باش دەزانێ بە شێوەکانیتر دەولەمەند بکرێ •

**٥٥٨ – پاشـاگەردانی لـە نووسینی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ١ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٤٤ – ٤٧ •**

نووسەر لە سەرەتای ئـەم وتارەدا لـە مێژووی نووسـینی کوردی دواوەو ئنجا باسی ئەو پاشاگەردانییانە دەکات کە لەم ساڵانەی دواییدا پەیدا بووە •

**٥٥٩ ـ پێداچوونەوەی هەندێ بیروڕا لە دەوروبەری ڕێنووسی کوردیو یەکخستنیدا ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٢ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٦٧ ـ ٧٣ .**

ئەم وتارە هەندێ پێشنیارە بۆ یەکخستنی ڕێنووسی کوردیو هەروەها وەڵامە بۆ ئەو وتارەی مامۆستا جەلال دەباغ ، کە لە ژمارە ( ٩٣ )ی ڕۆژی ٢٧/٥/١٩٧٨ی ڕۆژنامەی « بیری نوێ »دا بلاوی کردووەتەوە .

**٥٦٠ ـ چەند سەرنجێکی زمانەوانییانە بەدوا گفتوگۆکەی مامۆستا نەریماندا لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٧٣ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٦٠ ـ ٦٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا هەندێ سەرنجو تێبینی لەبارەی ئەو زاراوانەوە خستۆتە پێش چاو ، کە مامۆستا تۆفیق وەهبی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مامۆستا نەریماندا لێیاندواوەو مامۆستا نەریمانیش ئەو ڕایانەی لە ژمارە ( ١٢ )ی گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی »دا بە وتارێك بلاوکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٧٤ ) .

**٥٦١ ـ ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا » لەبەر ڕووناکیی ڕەخنەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٣ ـ ٤٤ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٣ ـ ٥٦ .**

نووسەر لەم وتارەدا کەموکورتیو ناتەواویی ئەو نامیلکەیەی خستۆتە پێش چاو ، کە مامۆستا حامید فەرەج سالّی ١٩٧٦ بەناوی « ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا »وە بلاویکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٢٠٦ ) .

**٥٦٢ ـ هەنگاوێکی‌تر بە ڕێگای دانانی دەستوورێکدا بۆ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧ ـ ١٣ .**

ئەم وتارە باسی دەوری مەلا ڕەشید بەگی بابان دەکات لە مەسەلەی نووسینو ڕێنووسی کوردیدا . ( بڕوانە : باسی ژ ٦١٣ ) .

**هەروەها ژ : ٥٠٤ ، ٥٦٣ .**

محەمەدی مەلا کەریمو کەمال جەلال غەریب :

**٥٦٣ – هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٩ – ٥٥ .**

ئەم وتارە باسی ئەو ڕێگەو ڕێبازانە دەکات ، کە بۆ دانانو هەڵبژاردنو داڕشتنو وەرگێڕانی زاراوە لە زماندا دەبێت بەکاربهێنرێ .

محەمەد مەعرووف فەتتاح :

**٥٦٤ – خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨ ، ل ١٦٢ – ١٩٥ .**

ئەم وتارە لەم بەشانە پێکهاتووە : « ١ – سەرەتا » ( ل ١٦٢ – ١٦٣ ) ؛ « ٢ – چاوخشاندنێك بەو کارانەدا کە لە دیاردەی ( خۆیەتی ) دواون » ( ل ١٦٣ – ١٦٨ ) ؛ « ٣ – شێوەی جیاوازی دەربڕینی خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا » ( ل ١٦٨ – ١٧٠ ) ؛ « ٤ – جیاوازیی نێوان جۆرەکانی دەربڕینی خۆیەتی » ( ل ١٧١ – ١٧٣ ) ؛ « ٥ – جۆرەکانی پێشگرو پاشگری خۆیەتی » ( ل ١٧٤ – ١٧٦ ) ؛ « ٦ – دابەش کردنی زمانەکانی جیهان بەپێی ڕەوشتی مۆرفیمو شوێنی زمانی کوردی » ( ل ١٧٦ – ١٧٩ ) ؛ « ٧ – ڕیزبوونی پاشگرەکانو شوێنی پاشگری خۆیەتی لە ڕستەی کورتکراوەدا » ( ل ١٨٠ – ١٨٢ ) ؛ « ٨ – ناوو ڕێکەوتنی لەگەڵ پاشگری خۆیەتیدا » ( ل ١٨٣ – ١٩٠ ) ؛ « ٩ – شوێنی پاشگری خۆیەتی لە فرێزو ڕستەدا » ( ل ١٩٠ – ١٩٤ ) ؛ « ١٠ – کاکڵی باسەکە » ( ل ١٩٤ – ١٩٥ ) .

**٥٦٥ – ڕێنووسی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٢٩ – ٢٦٧ .**

باسەکانی ئەم وتارە « ١ - سەرەتا » ( ل ٢٢٩ - ٢٣٠ ) ؛ « ٢ - باسای دەنگی کوردی » ( ل ٢٣٠ - ٢٣٩ ) ؛ « ٣ - باسای نووسین » ( ل ٢٣٩ - ٢٤٥ ) ؛ « ٤ - رادەی ڕێکەوتنی دەنگ و وێنەکانی لە ڕێنووسی کوردیدا » ( ل ٢٤٦ - ٢٤٩ ) ؛ « ٥ - بنەما نافۆنیمەکانی ڕێنووسی کوردی ( گیروگرفتەکانی ڕێنووسەکەمان ) » ( ل ٢٤٩ - ٢٦٠ ) ، « ٦ - گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی و چەند پێشنیارێك » ( ل ٢٦٠ - ٢٦٦ ) ؛ « ٧ - کورتەی لێکۆڵینەوە » ( ل ٢٦٦ ) •

**٥٦٦ - شێوازی ئاخاوتن لەناو ئافرەتی سلێمانیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٧ ، بەغدا ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ٢٢٣ - ٢٣٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا ئەو وشانەی خستۆتە پێش چاو ، کە ئافرەتی سلێمانی لە وتووێژیاندا بەکاری دێنن و لەکۆتاییشدا لەوە دواوە کە هەندێ دەنگ چۆن دەردەبڕن •

**هەروەها ژ : ٩٤٩ •**

## محەمەد نووری عارف :

**٥٦٧ - تەئسیری زمانو ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی ، « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ، ژ ١٨ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٧٢ - ٩٤ •**

نووسەر لە لاپەڕە ( ٨٢ - ٨٣ )دا کەمێ باسی ڕێنووسی کوردی کردووەو لە ( ل ٨٣ - ٨٥ )دا دەربارەی ئەو وشانەی ئەمڕۆ لە فارسیدا بەکارناهێنرێن و لە کوردیدا باون دواوە •

**٥٦٨ - لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێیی لە : زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٣ - ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٤٢ - ٤٥ و ٥٣ •**

ئەم وتارە ڕەخنەیە لەو کتێبە ، کە مامۆستایان : د • عیزەدین مستەفا ڕەسووڵو د • ئیحسان فوئادو صادق بەهائەدین ئامێدی بۆ خوێندنی زمانو ئەدەبی کوردی پۆلی یەکەمی ناوەندی دایاننەوە ••• بەشێکی زۆری ئەم وتارە سەرنجو تێبینیو ڕەخنەی زمانەوانییە لە کتێبی ناوبراو ( بڕوانە : باسی ژ ٣٩٤ ) •

مستەفا شەوقی :

**٥٦٩ – نووسینمان ، گۆڤاری « پەیژە » ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٢٧ ، ل ٤٢ – ٤٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی پێویستی لێکۆڵینەوە لە ڕێزمانی کوردیو دانانی فەرهەنگی کوردیو سازبوونی زمانی ئەدەبی ••• کردووە •

**٥٧٠ – نووسینمان ، لە کتێبی « مستەفا شەوقیو پەیژە »دا ، ساغکردنەوەو لێکۆڵینەوەی مومتاز حەیدەری ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٣٨ – ١٤٠ •**

ئەمە هەمان وتاری باسی ( ژ ٥٦٩ )ەو مامۆستا مومتاز حەیدەری لە کتێبی ناوبراودا بڵاوی کردووەتەوە •

مستەفا شێخ نیعمەتوڵلا :

**٥٧١ – لاپەڕەی قەواعیدی کوردی ( ئیعراب کردن ) ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، بەشی یەکەم ، ساڵی ٩ ، ژ ٣ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٤٥ – ٤٨ ؛ بەشی دووەم ، ساڵی ٩ ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٥٢ – ٥٥ ؛ بەشی سێیەم[٨] ، ساڵی ٩ ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٤٩ – ٥٢ •**

نووسەر لە بەشی یەکەمو دووەمی ئەم وتارەدا هەندێ ڕستەی کوردی هێناوەتەوەو ئیعرابی کردوون • لە بەشی سێیەمیشدا لە ڕێی هەندێ

---

**(٨) سەرناوی ئەم وتارە لە بەشی سێیەمدا بووە بە « لاپەڕەی بناوانی زمانی کوردی » .**

ڕســـــــــەوە بەراوردی لەنێوان ئیعرابی کوردیو عەرەبیو ئینگلیزیدا کردووە •

## مستەفا نەریمان :

**٥٧٢ ـ بیلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ •**

نووسەر لەم بیبلیۆگرافیایەدا کە باسی ئەو کتێبانە دەکات پێوەندییان بەکوردناسییەوە هەیەو لە نێوان سالآنی (١٧٨٧ـ١٩٧٥)دا بلآوکراونەتەوە ، لەو کتێبانەش دواوە ، کە لەبارەی زمانی کوردییەوەن •

**٥٧٣ ـ نووسینی کوردی لە ڕەگو ڕیشەوە ، بەغدا ، ١٩٨١ •**

ئەم کارە ( ٦٨ ) لاپەڕەیەو باسی ئەو هەوڵو تەقەلایانە دەکات ، کـە لە مەیدانی نووسینی کوردیدا دراون ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٥ ) •

**٥٧٤ ـ فریای ئەم گەنجینەیە بکەون ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ١٢ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ٧٩ ـ ٨١ •**

نووسەر لەم وتارەدا کە باسی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ مامۆســـــــتا تۆفیق وەهبیدا کردووە ، دەربارەی هەندێ کاری زمانەوانی چاپکراوو چاپنەکراوی دواوەو بیروڕای لـەبـارەی چەند زاراوەو وشـــــەیەکەوە خستۆتە پێش چاو ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٦٠ ) •

**٥٧٥ ـ فەرهـەنگا کوردی ـ تورکی بـەرهـەمێکی تاقانـەو هێژایە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٢ ـ ١٥ •**

ئەم وتارە خستنە پێش چاوی هەندێ زانیـــارییە دەربارەی ئـەو فەرهەنگە کوردی ـ تورکییەی مامۆستا مووسا عەنتەر سالی ١٩٦٧ لـە ئەستەموول بلآوی کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٨٣ ) •

**٥٧٦ ـ فەرهەنگی کشتوکال ، گۆڤاری « پاشکۆی شۆڕشی کشتوکال » ژ ٢ ، بەغدا ، تەمووزی ١٩٧٨ ، ل ٥٠ ـ ٥٣ •**

نووسەر لە سەرەتای ئەم وتارەدا ناوەرۆکی « فەرهەنگی کشتوکاڵ »ی خستۆتە پێش چاوو دوایی هەندێ سەرنجو تێبینی لەبارەیەوە نیشانداوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٨٥ ) •

**هەروەها ژ : ٥٧٦ •**

## موحسین عوسمان عەبدوڵلا :

**٥٧٧ ــ دوو پەیڤــو ئێك ڕامان ، گۆڤاری « کاروان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٦ ، کانوونی دووەم ، هەولێر ، ١٩٨٤ ، ل ٤٠ ــ ٤١ ؛ بەشــی دووەم ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢١ ، حوزەیرانی ١٩٨٤ ، ل ٣١ ــ ٣٤ •**

ئەم وتارە بە شێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی ئەو جووتە وشانە دەکات ، کــە یەك مــانــا دەگەیەنن ، وەك : « فەرقو جودایی » ؛ « حەپسو زیندان » ؛ « ساخو سەلامەت » ••• هتد • نووسەر لە بەشی دووەمدا کۆمەڵێ جووتــە وشــەی وەك « دەخیلو ئامان » ؛ « ئێشو ئەلەم » ؛ « فەقیرو ژار » ؛ « خێرو خۆشی » ؛ « خاڵو نیشان » •••ی هێناوەتەوەو واتایانی لێكداوەتەوە •

## موکەڕەم تاڵەبانی :

**٥٧٨ ــ بــەرەو زمــانێــکی یــەکگرتووی کوردی ، گۆڤــاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٣٠ ــ ٣١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٣ ــ ٣٥ •**

ئەمە وتاری « نحو لغة کردیة موحدة »یەو کراوە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ٧٢٧ ) •

**٥٧٩ ــ لەبارەی بنجو بنەوانی وشەی مسکێنەوە لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧١ ــ ٨٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵی ساغکردنەوەی ئەسڵی وشەی ( مسکێن )ی داوەو بۆ ئەمە گەشتێکی بە زمانی کوردیو عەرەبیدا کردووە •

هەروەها ژ : ٧٢٧ •

## موکەڕەم ڕەشید :

**٥٨٠ – دەربارەی جووتە ناو لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ٤٠ – ٤١ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٣٢ – ٣٣ •**

ئەم وتارە لەو ناوە لێکدراوانە دەدوێ کە لە ئەنجامی دووپاتبوونەوەدا سازدەبن • نووسەر دە جۆر جووتە ناوی دەستنیشان کردووە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ١٦ ) •

**٥٨١ – لیستەیەك جووتەناو ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ ٤٢ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٢ – ٢٣ •**

ئەم لیستەیە ( ٢٦٠ ) جووتە ناونو بەگوێرەی پیتی هیجا ڕیزکراون •

## مومتاز حەیدەری :

**٥٨٢ – بڕوانە : باسی ژ ٥٧٠ •**

## مەحموود حەسەن :

**٥٨٣ – وەڵامی پرسیاری گەلاوێژ ، گۆڤاری (( گەلاوێژ )) ، ساڵی ٤ ، ژ ١١ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٧ •**

نووسەری ئەم وەڵامە وا ڕادەگەنێ کە هەندێ کەرەستەی گۆڤاری (( گەلاوێژ )) بخرێتە سەر ئەلفوبێی لاتینێ • ( بڕوانە : باسی ژ ٤٨٤ ) •

مەحموود زامدار :

**٥٨٤ ـ دەنگ یا تیپ ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٧ ، بەغـدا ، ١٩٧٢ ، ل ٤٠ ـ ٤٤ ٠**

ئەم وتارە بە شێوەیێکی زانستی لە گەڵێ چەمکی دەنگ دواوەو لە کۆتاییدا لەگەڵ تیپدا بەراوردی کردووە ٠ ئەمە بەئەسڵ نووسـینێکی مامۆستا ئەدوەرد حەنتایەو بە دەستکاری‌یەکی زۆرەوە کراوەتە کوردی‌و بەتایبەتی نموونەی کوردی باشی خراوەتەسەر ٠

**٥٨٥ ـ کوردی لە عەرەبیدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥ ، سالی ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٤٧ ـ ٥٢ ٠**

ئەم وتارە باسی تەئسیری زمانی کوردی لەسـەر زمانی عەرەبی دەکات‌و کۆمەڵێ وشـەی کوردی دێنێتەوە ، کە عەرەب لە کوردی وەرگرتوون ٠

**٥٨٦ ـ ناوو نازناوو ناوو ناتۆرەو سـووککردنی ناو لەناو زمانی ئێمەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردسـتان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٣٢ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٤١ ـ ٤٨ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٣٣ ، بەغـدا ، ١٩٧٥ ، ل ٦٥ ـ ٧٢ ٠**

نوسەر لەم وتارەدا بە دوورودرێژی لە ناوو نازناوو ناوو ناتۆرەو سوککردنی ناو لە زمانی کوردیدا دواوەو چ لە شارو چ لە دێی کورد ، لای موسلمان‌و گاورو جووی کوردستان ٠

**٥٨٧ ـ نـاوو نـازناوو نـاوو ناتۆرەو ناودەرکردن‌و سـاناکردنی ناو لەناو زمان‌و لەلای گەلی ئێمە ، گۆڤـاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٩ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٤٢ ـ ٥٤ ٠**

نوێشـکی ئەم باسـە لە ژمارە ( ٣٢ ـ ٣٣ )ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ( ١٩٧٥ )دا بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٨٦ ) ٠

**هەروەها ژ : ١٠٨٤ ٠**

ت ٠ ب ٠ مەریوانی :

**٥٨٨ ـ زمانو نووســـینی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٤٠ ، ساڵی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ ـ ٤ و ١٣ ٠**

ئەم وتارە باسی هەڵەو ناشارەزایی هەندێ لە زمانەوانانی کورد دەکاو بۆ نیشاندانی ڕێگەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی زمانی ئەڵەمانی کردووە بە نموونەو کەمێ لە مێژووی گەشەکردنی نووســـینی دواوە ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ١٩٥ ، ٦٠٩ ) ٠

مەسعوود محەمەد :

**٥٨٩ ـ بەرەو ڕاستە شەقامی ئاخاوتنی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٨ ٠**

ئەم نامیلکەیە ( ٦٣ ) لاپەڕەیەو وەڵامی ئەو وتارەی مامۆســـــتا محەمەد ئەمین هەورامانی‌یە ، کە لە ژمارە ( ٦٤ )ی تشرینی دووەمو کانوونی یەکەمی ساڵی ( ١٩٧٧ )ی گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ »دا ، بـەنـاوی « کوردواتەنی »یـەوە بڵاوی کردووەتەوەو کۆمـەڵێك ڕەخنەی لـە دوو نووسینی مامۆستا مەســـعوود محەمەد : « فۆنەتیك چیمان بۆ بکـا ؟ » ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩٩ )و « چەنـد حەشـــارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩٤ ) گرتبوو ٠

**٥٩٠ ـ بەسەرداچوونەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٢٥ ـ ١٧٦ ٠**

ئەمـە نرخاندنو هەڵسەنگاندنی وتاری « لـەبـارەی هێنـــدێ لـە نهێنییەکانی ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا حەسەنی قزلجی‌یە ، کـــە لـــە ( ل ١١٣ ـ ١٣٤ )ی بەرگی پێنجەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بڵاوی‌کردووەتەوە ٠

**٥٩١ ـ بەکارهێنانی ( ی ) لـە ڕێزمانی کوردیدا ، « گۆڤـاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ ـ ١١٤ ٠**

ئەم وتارە تەرخانکراوە بۆ باسی ڕۆڵی ( ی ) لە ڕێزمانی کوردیدا چ بە تەنیا چ لەگەڵ دەنگی دیکەدا یێتە ناو وشەوەو بەشداریێ لە دەربڕینی واتا یا لە داهێنانی واتای تازەدا • ئەم باسە لەگەڵ وتاری « سووڕێکی خامە بە دەوری ڕاناودا »دا کە لە ژمارە ( ١ )ی بەرگی ( ٢ )ی هەمان گۆڤاردا بڵاوکراوەتەوە ، کراونەتە کتێبێكو ساڵی ١٩٧٤ بە ناوی « وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی »یەوە چاپکراوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٠٥ ) •

**٥٩٢ – تیرو پشکێ لە دەنگسازی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠١ ، بەغدا ، ئاداری ١٩٨٤ ، ل ٢٨ – ٥٢ •**

ئەمە وەڵامە بۆ وتاری « چەند وشەیەك دەربارەی وتاری ( لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا »ی د • ئەورەحمانی حاجی مارف ، کە لە لاپەڕە ( ٦٢ – ٦٩ )ی ژمارە ( ٩٠ )ی گۆڤاری « بەیان »دا بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٠ ) •

**٥٩٣ – چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس‌و ئەلفوبێی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٦٨ – ٣٥٩ •**

ئەم وتارە لە دەوری ئەم باسانە دەسووڕێتەوە : « ١ – گیروگرفتی نووسینی دەنگەکان : أ – ئەوانەی نیشانەدارن ( بزوێن‌و نەبزوێن ) ؛ ب – ئەوانەی پیتیان بۆ دانەندراوە ؛ ج – پلەی دەنگە بزوێنەکان ؛ د – دیفتۆنگەکان ( وێ ، نگ ) » ؛ « ٢ – گیروگرفتی وشەی سادەو دارێژراو : أ – ناوی عەرەبی ؛ ب – پێشگر – پاشگری ( پێناسین‌و کۆ ) » ؛ « ٣ – وشەی ناسادە : أ – دیاردەی داتاشین‌و قووتدانی هەندێ دەنگ ؛ ب – گیروگرفتی نووسینی ژمارەکان لە ( ١١ )ەوە تا ( ١٩ ) » ؛ « ٤ گیروگرفتی نووسینی کردار لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسان‌و پێکەوە نەنووسانەوە » ؛ « ٥ – گیروگرفتی نووسینی

ئامرازە لێکدەرەکان ( حروف العطف ) » ؛ « ٦ - گیروگرفتی چۆنیەتی نووسینی وشـــە لێکدراوەکان لەبارەی پێکەوە نووســـاندنەوە » ؛ « ٧ - گیروگرفتی دانانی نیشانەکان » ٠

**٥٩٤ - چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ٠**

نووسەر لەم کتێبە ( ٩٧ ) لاپەڕەیەدا لە چوار کێشەی باس نەکراوی زمانی کوردی دواوە : « ١ - حەشـــــارگەی ڕاناو » ( ل ٩ - ١٧ ) ؛ « ٢ - حەشارگەی پاشگرەکانی کار » ( ل ١٧ - ٥١ ) ؛ « ٣ - حەشارگەی ( فعلی انتقال )و ( انتقالی پێچەوانە ) » ( ل ٥١ - ٧٧ ) ؛ « ٤ - حەشارگەی ناوگر » ( ل ٧٧ - ٩١ ) ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٣٩ ) ٠

**٥٩٥ - خۆدیتنەوە لە دوو ڕەخنەی دۆستانەدا ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٧ ، نیسانی ١٩٨٣ ، ل ٤١ - ٥٠ ٠**

ئەم وتارە لە دوو بەش پێکهاتووەو تەنیا بەشی یەکەمیان پێوەندی بە زمانەوە هەیە ٠ بەشی یەکەم ( ل ٤١ - ٤٣ ) وەڵامو لێدوانو ڕوونکردنەوەیە لەبارەی ئەو دوو بەشی وتارەی مامۆستا ڕەئووف ئالانی ، کە لـە ژمـارە ( ١ )و ( ٢ )ی گۆڤاری « کاروان »دا بەنـاوی « نرخانـدنێـك دەربارەی زاراوە زانستییەکان »ەوە بڵاوی کردبووەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٢٥٣ ) ٠

**٥٩٦ - ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ » ، ژ ٨٠ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢ - ٨ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی دوو خاڵ ( ١ - زاراوەی « نەمان » بەرانبەر « انعدام » ؛ ٢ - کورتە بزوێنی « i » )ی کۆڵیوەتەوە ، کـە لـە ژمـارە ( ٧٦ )ی گۆڤـاری « ڕۆشـــــنبیری نوێ » ( ١٩٧٩ )دا د ٠ ئەوڕەحمانی حاجی مارف لە وتاری « با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین »دا باسیانی کردووە ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٤٤ ) ٠

**٥٩٧ - ڕێنووسی کورد ، « گۆڤاری کـۆڕی زانیاری کـورد » ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٣٢ - ٢٨٨ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا بەگشتی باسی ئەلفوبێی عەرەبیو ئەلفوبێی کۆڕی بەتایبەتی دەکات • ئەو تێبینیو بیروڕایانەشی لە دوو سەرەوە دەربڕیوە : ١ ـ لکی ئەلفوبێ ؛ ٢ ـ لکی تێکخستنی پیتەکانی ئەلفوبێ بۆ نووسینی ئاخاوتن •

**٥٩٨ ـ سووڕێکی خامە بەدەوری ( ڕاناو )دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٩ ـ ١٤٧ •**

سەرەتای ئەم باسە ڕەخنەو ڕاستکردنەوەو پێڕازینەبوونی ئەو کارانەیە لەبارەی جێناوەوە نووسراون • بەدوا ئەمەدا بە دواکەوتنی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەیە : « لە کوردیدا ( ڕاناو ) چیە ؟ » ؛ « ڕاناو چەندن ؟ » ؛ « ڕاناو چ کارێك دەکەن ؟ » • ئەم باسە لەگەڵ وتاری « بەکارهێنانی ( ی ) لە ڕێزمانی کوردیدا »دا کە لە ژمارە ( ١ )ی بەرگی ( ١ )ی هەمان گۆڤاردا بلاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٩١ ) ، کراوەتە کتێبێكو ساڵی ١٩٧٤ بە ناوی « وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی »یەوە چاپکراوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٠٥ ) •

**٥٩٩ ـ فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٦٨ ـ ٦٢٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا بە زۆری هەوڵی نیشاندانی خزمایەتیو دژایەتی ناوخۆیی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردی دواوەو لە ئەنجامدا چوار پلەی دیاریکردووە : « ١ ـ گونجانی تەواو » ؛ « ٢ ـ گونجان » ؛ « ٣ ـ نەگونجان » ؛ « ٤ ـ دژایەتی » •

**٦٠٠ ـ ( کۆڕی زانیاری کورد ) چۆن ئەم ناوەی وەرگرت ، گۆڤاری « زانیاری » ، ژ ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٥٧ ـ ٧١ •**

مامۆستا مەسعوود لەم وتارەدا وەڵامی ئەو نووسەرانەی داوەتەوە ، کە ڕەخنەیان لە ناوی ( کۆڕی زانیاری کورد ) گرتووەو هەروەها بە

دوورودرێژیو بە نموونەو بەڵگەی زمانەوانییەوە ساغیکردووەتەوە ، کە بۆچی ئەو ناوە پەسەندکراوە •

**٦٠١ – گیروگرفتی ڕێنووســــی کــوردی ، گۆڤــاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧ – ٢٨ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو کۆسپو گیروگرفتانەی کردووە ، کە لە ( وێنەی دەنگەکان )و ( نووسینی وشەکان )دا هەنو هەوڵیداوە بەپێی بۆچوونی خۆی چاریان بۆ بدۆزێتەوە •

**٦٠٢ – لە ئاوێنەی ئەم گوتارەدا تیشـــــکی چەند چرایەك ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٠ ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ١٧ – ٢٥ •**

ئەم وتارە هەندێ تێبینیو سەرنجە لەسەر چەنـد وتارێك ، کـە لـە ژمارە ( ١٠ )ی « گۆڤاری کۆڕی زانیـاری عێراق – دەستەی کورد »دا بڵاوکراونەتەوە ••• ئەوەی پێوەندی بە مەسەلەی زمانی کوردییەوە هەیە ئەو تێبینیو سەرنجانەن کـە لـە لاپەڕە ( ٢٣ – ٢٥ )دا لـەبـارەی وتاری « لایەنێکی جیاوازی »ی د • وریا عومەر ئەمین ( بڕوانە : باسی ژ ٦٦٦ )و وتاری « بەراوردکاری لە نێوان زارە کوردییەکاندا »ی لیژنەی زمانەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٥٠١ ) خراوەتە پێش چاو •

**٦٠٣ – لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ئابو ئەیلوولی ١٩٨٢ ، ل ١٧ – ٣٢ •**

ئەم نووسینە وەڵامی ئەو وتارەی د • ئەوڕەحمانی حاجی مارفە ، کە لە ژمارە (٩١)ی سالی ١٩٨٢ی هەمان گۆڤاردا بەناوی « پێداچوونەوەیێکی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەســـعوود محەمەد »ەوە چـەنـــد ڕەخنەیەکی لە هەندێ بیروڕای مامۆستا مەسعوود محەمەد ، کە سـەر بـە فۆنەتیك و ڕێنووسن گرتبوو ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٥٠ ) •

**٦٠٤ – نامەیەك لەلایەن مەسعوود محەمەدەوە ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ١٨ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٣ – ٧ •**

ئەمە هەندێ تێبینیو سەرنجیی زمانەوانی‌یە لەبارەی چەند وشـــەو تەعبیری ناو وتاری « ڕەدووکەوتن وەك من چووبمە بنجو بنـــاوانی »ی مامۆستا تەها بابانەوە ، کـە لـە ژمارە ( ١٦ )ی گۆڤاری « بـەیـان »دا بڵاوی کردۆتەوە •

**٦٠٥ - وردبوونەوە لە چەند باســـێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغـدا ، ١٩٧٤ •**

ئەم کتێبەی مامۆستا مەسعوود محەمەد کە ( ٢١٢ ) لاپەڕەیە ، لـــە پێشەکی‌یەکو دوو وتار پێکهاتووە : پێشــــەکی ( ل أ - ت ) ؛ وتـاری یەکەم « بەکارهێنانی ( ی ) لە ڕێزمانی کوردی‌دا » ( ل ١ - ٦٠ ) ؛ وتاری دووەم « ســــــوورێکی خامە بەدەوری ( ڕاناو )دا » ( ل ٦١ - ١٨٠ ) • وتاری یەکەمی ئەم کتێبە لە ژمارە یەکو وتاری دووەمی لـە ژمارە دووی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بڵاوکراوەتەوە ( بڕوانە : باســـی ژ ٥٩١ و ٦٠٥ ) •

**٦٠٦ - هەڵدانەوەی چـەنـد ڕووبەڕەیێکی ... ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٥ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٦٤ - ٣١١ •**

ئەم وتارە بریتی‌یە لـە سێ بەش : « ١ - دیاردەیێکی فۆنەتیکی » ؛ « ٢ - ئـاخـاوتنی عادەتی‌و شـــێوازی ئەدەبی » ؛ « ٣ - دەنگەکـــانی ئاخاوتن » •

بەشی یەکـەم باسی ئـەو ( ك )و ( گ )انە دەکـات ، کە ( ی ، ێ ، وی ، وێ ) بەدوایاندا دێت ••• بەشی دووەم - لەو حاڵەتانە دەدوێ ، کە لە زمانی ئاخاوتنی هەندێ ناوچەدا سواونو نەماونو وادادەنێ کـــە لـە زمانی ئەدەبیدا بوونیان پێویستە ••• بەشی ســـێیەم لەبارەی جیاوازیی دەنگو پیتەوەو کاری دەنگەکان لەسەر یەکترەوە کۆلیوەتەوە •

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ١٠٧٣ ، ١٠٧٤ •**

مەعرووف جیاوك :

٦٠٧ – بەرگی ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٠ ٠

نووسەر لەم کارەیدا دەربارەی جۆری دەنگەکانو شوێنی دەربڕینیان دواوە ٠ سەبارەت بە ڕێنووسی کوردیو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی هیچ شتێکی ئەوتۆی نەوتووەو شتێکی نوێی وای پێشنیار نەکردووە ، شایانی باس بێت ٠

مەعرووف خەزنەدار :

٦٠٨ – دوو تیپی بەوێنە ، نەك بێوێنە ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٣٢ ، سالی ٤ ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٤٢ – ٤٣ ٠

مامۆستا خەزنەدار لەم وتارەدا ئەو پێشنیارەی مامۆستا طاهیر صادق ڕەتدەکاتەوە ، کە بۆ ( ك )و ( گ )ی پێش ( ی ، ێ ، وی ، وێ ) پیتی سەربەخۆ دابنرێ ( بڕوانە : باسی ژ ٣٢٤ ) ٠

٦٠٩ – لیسی کوێری ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٤٢ ، سالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ١ – ٣ ٠

ڕەخنەیێکی توندو تیژە لە وتاری « زمانو نووسینی کوردی »ی ت ٠ ب ٠ مەریوانی ( بڕوانە : باسی ژ ٥٨٨ ) ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی : ژ ٦٦٩ ) ٠

هەروەها ژ : ٥٠٦ ، ٥٠٧ ، ٥٠٨ ، ٥٠٩ ، ٥١٠ ، ٧٢٤ ، ٧٢٩ ٠

د ٠ مەکەنزی :

٦١٠ – پێکهاتنی وشە لە شێوەی سلێمانیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠١ ، بەغدا ، ئاداری ١٩٨٤ ، ل ١٥٣ – ١٦١ ٠

ئەم باسە کە دەربارەی ڕۆنانی وشەی ناسادەی کوردیە لە شێوەی سلێمانیدا ، مامۆستا غازی فاتیح وەیس لە کتێبی

( Kurdish Dialects Studies )ی د • مەکەنزی‌یەوە وەری گرتووەو کردوویە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ۹۳۷ ) •

**٦١١ – شێوە زاری هەولێری ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ۷۰ ، بەغدا ، ۱۹۸۰ ، ل ۲۲ •**

ئەم نووسینە ، کە باسی هەندێ تایبەتیی فۆنەتیکی ناوچەی سۆران دەکات ، مامۆستا هیمدادی حوسێن لە لاپەڕە ( ۲۷ – ۲۹ )ی کتێبی ( Kurdish Dialects Studies )ی د • مەکەنزی‌یەوە وەری گرتووەو کردوویە بە کوردی ( بڕوانە : باسی ژ ۹۳۷ ) •

**٦١٢ – نووسینێکی تازە بۆ زمانی کوردی ، ۱۹۵۸ •**

ئەمە نامیلکەیەکی ( ١٦ ) لاپەڕەیی‌یە • ( ٨ ) لاپەڕەی بە ئەلفوبێی عەرەبی‌یەو ( ٨ )یشی بە ئەلفوبێی لاتینی • باسی ئەلفوبێی کوردی بە لاتینی دەکاتو لەسەر شێوەیێکی زانستی ئەلفوبێ‌یەکی ڕێکوپێکو ئاسانی لاتینی بۆ نووسینی کوردی داناوە •

**هەروەها ژ : ۸۷۰ ، ۹۳۵ ، ۹۳٦ ، ۹۳۷ ، ۹۳۸ ، ۹۳۹ •**

## مەلا ڕەشید بەگی بابان :

**٦١٣ – اقتران النيرين في مجمع البحرين ( ئامادەکردنو پێشکەش‌کردنو لەسەر نووسینی : محەمەد عەلی قەرەداغی ) ، بەغدا ، ۱۹۷۳ •**

مەلا ڕەشید بەگی بابان ساڵی ۱۹٤۲ لە ئەستەموول لە نووسینی « اقتران النيرين في مجمع البحرين » بووەتەوەو سەرەتایێکی لەبارەی نووسینی کوردی‌یەوە بۆ ئەو کتێبەی نووسیوەو بە بیری خۆی هەندێ چارەی بۆ دەربڕینی دەنگە کوردییەکان دۆزیوەتەوە • ئەو نیگارە نوێیانەی

لەم ڕێنووسەدا دەبینرێن ، ئەمانەن : ١ - وێنە بۆ دەنگی ( د )ی کلۆر کە بریتی‌یە لە دانانی خاڵێك لەژێر پیتی ( د )دا ؛ ٢ - بۆ دەنگی ( ر )ی لاواز خاڵێکی لەژێر ( ر )دا داناوە ؛ ٣ - بۆ ( ل )ی قەڵەو خاڵێکی لەسەر ( ل ) داناوە ؛ ٤ - بۆ ( ی )ی درێژ کەشیدەیەکی لەژێر ( ی )دا دانـاوە ••• ( بڕوانە : باسی ژ ٥٦٢ ؛ لاپەڕە ٨٥ - ٨٧ی باسی ژ ٦٢ ) •

مەولوود بێ‌ ـی :

**٦١٤ - هەڵویستێکی کورت لە ژیانی کۆنی جوتیارانی ناوچەی کوردستان بەتایبەتی لە ناوچەی هەولێر ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢١ ، ساڵی دووەم ، حوزەیرانی ١٩٨٤ ، ل ٨٤ - ٨٩ •**

لەم وتارەدا ئەو زاراوانەی پێوەندییان بە جووتەوە هەیە ، خراونەتە بەر چاوو مانایان لێدراوەتەوە •

ڤ • ف • مینۆرسکی :

**٦١٥ - کورد • تێبینی‌و وردبوونەوە ، ( حەمە سەعید حەمە کەریم لە عەرەبی‌یەوە کردوویە بە کوردی ) ، هەولێر ، ١٩٨٤ •**

باسی زمانی کوردی کەوتۆتە ( ل ٨٣ - ٨٧ )ەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٧٢٩ و ٨٨٠ ) •

**هەروەها : ژ ٧٢٩ ، ٨٨٠ ، ٩٤٦ ، ٩٤٧ ، ٩٤٨ •**

ن • :

**٦١٦ - دیسـانەوە ( ئەلفوبێی نوێ دانەری ئیبراهیم باڵدار )و بەراوردی ڕەخنە زانستییەکەی مامۆستا مستەفا صالح کەریم‌و وەڵامەکەی مامۆستا ئیبراهیم ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٤ - ٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە « ئەلفوبێی نوێ »ی مامۆســـــتا ئیبراهیم باڵداری کۆلیوەتەوەو هەندێ ڕەخنەی زمانەوانی لێ گرتووەو پەنجەی بۆ پێویستیی جیاکردنەوەی ( ر )ی لاوازو ( ڕ )ی قەڵەو ڕاکێشـــــاوە •
( بڕوانە : باسی ژ ٧٤ ) •

نارۆ :

**٦١٧ ــ زمانێ کورمانجی ، یەریڤان ، ١٩٤٨ •**

ئەمە زماننامەو ڕاســـــت نووســـینی زمانی کوردییە بە ئەلفوبێی ســـلاڤی• •

ناصر ئازا :

**٦١٨ ــ پاراستنی نووسین لە هەڵە ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ساڵی ٦ ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٥ ، ل ٣٠ ــ ٣٢ •**

مامۆستا ناصر ئازا لەم وتارەدا هەندێ هەڵەی نووسینی خســـتۆتە پێش چاو ، بەتایبەتی بەکوردی بیرنەکردنەوەو بەکارهێنانی وشـــــەی ناقۆڵای بێگانە ، لەجێی وشەی جوانی ڕەسەنی کوردی •

ناکـــام :

**٦١٩ ــ ئەوانــەی حەز لــە واو نووســـین دەکەن ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٥ ــ ٣٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا دانانی دوو واو بۆ نووسینی واوی درێـژ بــە کارێکی نالەبار دادەنێو وا پەسەند دەکا کە ئەو وشانەی بزوێنی ( وو )ی درێژیان تێدایە هەر بە یەك واو بنووسرێن •

**٦٢٠ ـ شی‌كردنه‌وه‌ی وتـاره‌كـه‌ی دوكتۆر خه‌زنه‌دار ـ تیپ‌و پیت ، گۆڤاری « ڕۆژی كوردستان » ، ژ ٣ ـ ٤ ، ســـــالی ١ ، به‌غدا ، ١٩٧١ ، ل ٣٩ ـ ٤٠ .**

نووسه‌ر ڕه‌خنه له د . مارف خه‌زنه‌دار ده‌گرێ ، كه له ژماره ( ١ )ی ئه‌م گۆڤاره‌دا ، وشه‌ی ( تیپ ) بۆ ( حرف )ی عه‌ره‌بی به ڕاســـت ده‌زانێ ( بڕوانه : باسی ژ ٥٠٧ ) ... ناكام هه‌ندێ به‌ڵگه بـۆ ئیســـــپاتی ئـه‌وه دێنێته‌وه ، كه ( پیت ) ڕاستره .

## « نـــزار » :

**٦٢١ ـ نزارو ڕه‌خنه‌گر ، گۆڤاری « نزار » ، سالی ١ ، ژ ٥ ، به‌غدا ، ١٩٤٨ .**

ئه‌م وتاره وه‌ڵامی ئه‌و قســـانه‌یه كـه له‌باره‌ی وشـــه‌ی « نزار »ه‌وه كراون‌و ئنجا به وردی مانای وشه‌ی « نزاری »ی تێدا لێك‌دراوه‌ته‌وه‌و له كۆتاییشدا چۆنیه‌تی نووسینی باس‌كراوه .

## نزار محمد سعید :

**٦٢٢ ـ قه‌فته‌ك ژ مه‌به‌ستێت د زمانێ كوردی‌دا ، گۆڤاری « كاروان » ، ژ ٢٧ ، كانوونی یه‌كه‌می ١٩٨٥ ، ل ٢٦ ـ ٣١ .**

نووسه‌ر له‌م وتاره‌دا بۆ نموونه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ندیی زمانی كوردی هه‌ندێ ئیدیۆم‌و په‌ندی پێشینانی كوردی هێناوه‌ته‌وه‌و مانایانی لێك‌داوه‌ته‌وه .

## نووره‌دین زازا :

**٦٢٣ ـ چه‌ند گۆتن ل سه‌ر زمانێ كوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١ ، پاریس ، تشرینی یه‌كه‌می ١٩٨٣ ، ل ٢١ .**

ئەم وتارە وەلامی د • نوورەدین زازایە دەربارەی پرسیاری بە کام ئەلفوبێ نووسین ، کە لە لاپەڕە ( ٩ )ی هەمان گۆڤاردا کراوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٨٢ ) •

## نووری عەلی ئەمین :

**٦٢٤ – ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ •**

ئەم کتێبە ( ١٠٤ ) لاپەڕەیەو برتییە لە دە بەش : « ١ – دەنگەکانی زمانی کوردی » ( ل ٥ – ٢٩ ) ؛ « ٢ – وشەی عەرەبی لە کوردیدا چۆن بنووسرێ ؟ ••• » ( ل ٣٠ – ٤٤ ) ؛ « ٣ – گیروگرفتی وشـــەی لێـکدراو » ( ل ٤٥ – ٥٩ ) ؛ « ٤ – گیروگرفتی فرمـــانی لێـکدراو » ( ل ٦٠ – ٦٢) ؛ « ٥ – گیروگرفتی ڕانـاوی لـکاو » ( ل ٦٣ – ٦٩ ) ؛ « ٦ – گیروگرفتی پێشـــبەند » ( ل ٧٠ – ٧١ ) ؛ « ٧ – گیروگرفتی ئامرازی ( ی ) پەیوەندی » ( ل ٧٢ – ٧٤ ) ؛ « ٨ – گیروگرفتی پێتـە ناوبەندی ( و ) » ( ل ٧٥ – ٧٨ ) ؛ « ٩ – گیروگرفتی پاشـــبەند » ( ل ٧٩ – ٩٠ ) ؛ « خالبەندی » ( ل ٩١ – ٩٩ )[٩] •

**٦٢٥ – ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ •**

ئەم کتێبە (٢١٨) لاپەڕەیەو نووسەر تێیدا بە دووروودرێژی لە ڕووی فۆنەتیکو وشەڕۆنانو مۆرفۆلۆژیو سینتاکســـەوە لـــە زمانی کوردی کۆلیوەتەوە •

**٦٢٦ – زاراوەی زانستی ، گۆڤاری « بلێسە » ، ژ ٦ ، ســـالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢٨ – ٣١ •**

---

(٩) لەبارەی ئەو کتێبەی مامۆســـتا نووری عەلی ئەمینەوە ، بڕوانە : محەمەدی مەلا کەریم ، لەگەڵ ڕابەرەکەی کـاك نووری عەلی ئەمیندا ، ڕۆژنامەی « برایی » ، ژ ٧ ، بەغـــدا ، ١٩٦٧ ، ل ٤ – ٥ ؛ ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ٢ ؛ ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل ٢ ؛ ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل ٢ ، ٧ •

نووسەر لەم وتارەدا لەبارەی چۆنیەتی دارشتن‌و دانانی زاراوەی زانستی‌یەوە دواوەو هەندێ دەستووری بۆ ئەو کارە خستۆتە پێش چاو •

**٦٢٧ - زاراوەی زانیاری لە زمانی کوردی‌دا ، گۆڤاری « نەورۆز » ، ژ ٣ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٦٠ - ٦٣ •**

ئەم وتارە باسی گیروگرفتی نەبوونی زاراوەی زانستی دەکات لە زمانی کوردیداو لە کۆتاییدا بۆ دارشتنی زاراوە دوو رێگە دەست‌نیشان دەکات : ( ١ - هەڵبژاردن ؛ ٢ - داتاشین )و لێیان دەدوێ •

**٦٢٨ - قەواعیدی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٥٦ ؛ بەرگی دووەم ، بەغدا ، ١٩٥٨ •**

بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ( ١١٢ ) لاپەرەیەو لەسەر « صرف‌و نەحو » - « مۆرفۆلۆژی‌و سینتاکس »ەو لە بەشەکانی ئاخاوتن دواوەو لەسەر شێوازی عەرەبی بەشەکانی ئاخاوتنی بەسەر : ناو ، فرمان ، پیت‌دا دابەش کردووە ••• باسی رستەو جۆرەکانی رستە : رستەی سەربەخۆ ( جملة مستقلة ) ، رستەی لێکدراو ( جملة مركبة ) ، رستەی تێک‌ئاڵاو ( جملة معقدة ) •••ی کردووە •

بەرگی دووەم ( ١٥٨ ) لاپەرەیە • هەرچەندە نووسەر لەسەر بەرگی کتێبەکە وای‌داناوە کە باسەکەی لە ( صرف‌و نەحو )دایە ، بەڵام هەندێ لە دەنگەکان‌و وشەش دواوە • ئەم بەرگە بە گشتی باسی : دەنگە بزوێنەکان‌و کۆنسۆنانتەکان ؛ وشەو جۆرەکانی ، دەستەواژەو چەشنەکانی ، رستەو پارچەکانی رستەو جۆرەکانی رستە ؛ بەشەکانی ئاخاوتن ••• دەکات •

**٦٢٩ - گرتنی کەلێنێکی‌تر لە رێزمانی کوردی ( پێشگر - پاشگر ) ، بەغدا ، ١٩٥٨ •**

ئەم نامیلکەیە ( ٥٩ ) لاپەرەیەو نووسەر باسی زوربەی زۆری ئەو پێشگرو پاشگرانەی کردووە تێیدا ، کە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا بەکاردێن •

**٦٣٠ ــ گیروگرفتی نووسینی کوردی لە تای ترازووی پیتە بزوێنو نەبزوێندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٦٠ ــ ٤١٩ ٠**

ناوەرۆکی ئەم وتارە بەمچەشـــــــنەیە : « گیروگرفتی پیتەکان » ( ل ٣٦٠ ــ ٣٨٢ ) ؛ « گیروگرفتی نووسینی وشە » ( ل ٣٨٢ ــ ٣٩٩ ) ؛ « گیـروگــرفتی ئـامـرازی ( ی ) پێـوەنـدی » ( ل ٣٩٩ ــ ٤٠٠ ) ؛ « گیروگرفتی فرمانی ( ە ) لە صـــیغەی حاڵدا » ( ل ٤٠٠ ــ ٤٠١ ) ؛ « گیـروگـرفتی ئـامـرازی لێـکدرەر ( عطف ) » ( ل ٤٠١ ــ ٤٠٧ ) ؛ « گیروگرفتی چاوگو فرمان » ( ل ٤٠٧ ــ ٤٠٩ ) ؛ « گیروگرفتی ڕاناو لەگەڵ فرماندا » ( ل ٤٠٩ ــ ٤١٢ ) ؛ « گیروگرفتی زیادی‌یەکان لەگـەڵ وشەدا : ئامرازی کۆ ؛ ئامرازی پێناسین ٠٠٠ » ( ل ٤١٢ ــ ٤١٩ ) ٠

**٦٣١ ــ نیشانەکانی ڕێژەی فرمان ، گۆڤاری « ڕۆشـــنبیری نوێ ، بەشی یەکـەم ، ژ ١٠٦ ، بەغـــدا ، ١٩٨٥ ، ل ٥٠ ــ ٥٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠٧ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٢٠١ ــ ٢١٥ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا بە دووروودرێژی لە بەکارهێنانی نیشـــانەکانی ( دە )و ( ب )ی ڕێژەی کردار دواوەو بە بەڵگەی زۆر چۆنیەتی لکانیـانی بە وشەی سادەو ناسادەوە نیشانداوە ٠

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ٥٠١ ، ٥٠٢ ٠**

نەجمەدین عونی :

**٦٣٢ ــ زمانی کوردی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٦٠ ــ ٦١ ٠**

ئـەم وتـارە بـە شـــێوەی کرمانجیی ژووروو نووسراوەو باسی دیالێکتەکانی کوردی‌و ســـازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەکـات ٠

نەجمەدین مەلا :

**٦٣٣ – گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری کوردان ( الهدیة الحمیدیة فی اللغة الکردیة ) ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٢١ – ٢٥ •**

ئەم وتارە لەبارەی فەرهەنگی « الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة »وەی یووسف ضیا پاشای خالدی‌یەوە دەدوێ کە سالی ١٣١٠ك لە ئەستەموڵ بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٣٠ ) •

نەوزاد ئەحمەد مەحموود :

**٦٣٤ – من بەخت ناگرم ••• بەڵام ، لێم زیز مەبە ، ئەگەر چەند ڕەخنەیەکت ئاراستە بکەم ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ١٢ ، خولی دووەم ، ئابی ١٩٨٣ ، ل ٩١ – ٩٧ •**

ئەم وتارە هەندێ سەرنج‌و تێبینی‌یە دەربارەی هەڵەی ڕێزمانی‌و ڕێنووسی ئەو وتارەی د • ئیحسان فوئاد لە ژمارە ( ١١ )ی هەمان گۆڤاردا بە ناوی « لێم زیز مەبن ئەگەر بەختان بگرم »ەوە بڵاوی کردووەتەوە •

د • نەسرین فەخری :

**٦٣٥ – بنەماکانی دانانی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، سالی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٤ – ١٢٠ •**

ئەم وتارە هەندێ ڕاوێژو ئامۆژگاری‌یە بۆ نووسینی کتێبی ڕێزمانی کوردی •

**٦٣٦ – پاشگرو پێشگری ( ڤە ) یان ( و ) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٢٣٤ – ٢٧٣ •**

ئەم وتارە پێکهاتووە لەم باسانە : « ١ – پێشگرو پاشگر چین ؟ » ؛ « ٢ – ئایا ئەم پێشگرو پاشگرە ( وە ) یان ( ەوە )یە ؟ » ؛ « ٣ – واتاکانی

چی‌یەو چەندە لەگەڵ فرمانـدا ؟ » ؛ « ٤ ـ نموونە بۆ خۆی‌و تایبەتی‌یەکانی‌تری لەم زمانەدا ؟ » ؛ « ٥ ـ ئەنجامی باس » • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ١٣ ، ٢٩٢ ) •

**٦٣٧ ـ پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١٩٨ ـ ٢٤٣ •**

لەم وتارەدا ئەم باسانە بەرچاو دەکەون : « ئایا ( اندن ) پاشگرە یان ئامرازە ؟ » ؛ « ئایا ئەم پاشگرە ( اندن )ە یا ( اند ، انن ، دن )ە ؟ » ؛ « دەوری پاشگری ( اندن ) لەگەڵ تایبەتیەکانی لە زمانی کوردیدا » ؛ « ئەنجام » •••

**٦٣٨ ـ بەرەسەندنی واتای وشەو دەوری لە دەوڵەمەندکردنی زماندا ، گۆڤاری « الاستاذ » ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٦٤٢ ـ ٦٧١ •**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ چۆن وشە پەیدادەبێ‌و دوایی مانای فراوان دەبێتەوەو پەلدەهاوێت • بۆ نموونەی ئەو قسانەش وشەی « سەر » کراوەتە بەڵگەو لە هەموو ڕوالەتو ناوەرۆکیدا چی کۆکردۆتەوەو چەند وردە واتاو مەبەست دەگەیەنێ باس‌کراوە •

**٦٣٩ ـ پێشەکی چۆن بنووسین ؟ لە دەنگەوە بۆ وشە ، تا ڕستە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٢٠ ـ ٤٣٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی لەم باسانە دواوە : « نووسینی ئەو دەنگانەی بە جۆرێك زیاتر دەنووسرێن » ( ل ٤٢٢ ـ ٤٢٧ ) ؛ « نووسینی وشە » ( ل ٤٢٧ ـ ٤٣١ ) ؛ « هەندێك تێبینی » ( ل ٤٣١ ـ ٤٣٣ ) •

**٦٤٠ ـ ( تیپ ) و ( پیت ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٦ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٢٢ ـ ٢٥ •**

نووسەر لەم وتارەدا مانای ( تیپ )و ( پیت )ی لێکداوەتەوەو لە کۆتاییدا وای پەسەند کردووە ، کە ( پیت ) بۆ ( حرف ) بەکاربهێنرێ •

**٦٤١ ـ چاوخشانديك بهو كتيبانهدا كه لهسهر زمانو ڕێزمانی كوردی نووســــــراون ، « دەفتەری كوردەواری » ، ب ۱ ، بهغــدا ، ۱۹۷۰ ، ل ٥٦ ـ ٥٩ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا واڕادەگەیەنێ کـه ئەو کتێبانەی باسی زمـانو ڕێزمانی کوردی دەکەن دوورن لە لێکۆڵینەوەی زانستیەوەو تەنـانـەت زیانیش دەگەیەنن ٠

**٦٤٢ ـ چاوگی بێواتا له زمانی كوردیدا ، نهجهف ، ۱۹۷۳ ٠**

ئەم کتێبە ( ۱۰٤ ) لاپەڕەیەو لەو چاوگانە دەدوێ ، کە بە ســـادەیی بەکارنایەنو واتاو مەبەستی تەواو نادەن ٠

**٦٤٣ ـ زمانی كوردی ، گۆڤاری « برایهتی » ، ژ ۱ ، ساڵی ۱ ، بهغدا ، ۱۹۷۰ ، ل ٢٤ ٠**

نووسەر لەم کورتە وتارەدا باسی کۆنیو دەوڵەمەندیی زمانی کوردی کردووە ٠

**٦٤٤ ـ سهرەتای بڵاوبوونهوەی نووسینی كوردیو دانانی كتێب بـۆ ڕێزمانی كوردی ، گۆڤاری « برایهتی » ، ژ ٤ ، ساڵی ۱ ، بهغدا ، ۱۹۷۰ ، ل ٤٦ ٠**

لەم وتارەدا بەکورتی باسی چەند کتێبێك کراوە ، کە لەبارەی زمـانی کوردییەوە نووسراون ٠

**٦٤٥ ـ فهرههنگی ناوی دەنگ له زمانی كوردیدا ، « گۆڤاری كۆلێجی ئهدهبیات » ، ژ ۱۸ ، بهغدا ، ۱۹۷٤ ، ل ۹٥ ـ ۱۲۲ ٠**

ئەم وتارە باسی « ناوی دەنگی سروشـــــــت » دەکاتو لەبابەت خاسیەتو دروســــــتبوونیان لەڕووی زمانەوەو بنکەی گۆڕینیان بـۆ چاوگو کردار دەدوێ ٠

**٦٤٦ ـ لێكسیكۆلۆگیا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بهشی یهكهم ، ژ ۱۰۱ ، بهغــدا ، ئاداری ۱۹۸٤ ، ل ٥٣ ـ ٦٣ ؛ بهشی دووهم ، ژ ۱۰۲ ، تهمووزی ۱۹۸٤ ، ل ۲۸ ـ ۲۹ ؛ بهشی سێیهم ، ژ ۱۰۳ ـ ۱۰٤ ، بهغدا ، ۱۹۸٤ ، ل ٥٨ ـ ٦٦ ؛ بهشــی چوارەم ، ژ ۱۰٥ ، بـهغــدا ، ۱۹۸٥ ،**

**ل ٨٢ – ٩٥ ؛ بەشـــی پێنجـــەم ، ژ ١٠٧ ، بەغـــدا ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ١٨٠ – ١٨٩ •**

نووسەر لەم زنجیرە وتارەدا باسی پەرەسەندنی وشـــەو دەوری لـە دەوڵەمەندکردنی زماندای کردووە • لە بەشی یەکەمدا وشەی « دەست »و لە بەشی دووەمدا وشەی « چاو »و لە بەشی سێیەم‌و چوارەمدا وشـــەی « دەم »و لە بەشی پێنجەمدا وشەی « دڵ »و « زمان »ی کردووە بە نموونەو ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا چەنـد بەکـاردێن‌و چی دەگەیەنن‌و چی‌یان لێ دروستکراوەو چ ئاڵوگۆڕێك بەســەر ڕواڵەت‌و ناوەرۆکیاندا هاتووە •

**٦٤٧ – لێکۆڵینەوەیێك دەربـارەی جێگۆڕکێ‌و هەڵـگێرانەوەو گۆڕینی شوێنی دەنگ لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤـاری کۆڕی زانیـاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ١٣ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٢٦١ – ٢٩٣ •**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە باسی جێگۆڕکێی دەنگ ؛ گۆڕینی دەنگێـك بـە دەنگێکی‌تر ؛ زیادکردن‌و لێـکدان‌و فڕێـدانی دەنگ ؛ ئـاڵـوگۆڕو دەستکاری‌کردنی دەنگی وشە •••

**٦٤٨ – ناوو پێشگرو پاشگر لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٥ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ١٥ – ١٦ •**

ئەم وتارە باسی نیشانەی نەناسیاوی ( ێك ) دەکات‌و بە پاشـــگری دادەنێ •

**٦٤٩ – هەندێ زاراوەو ئیدیۆمەی کوردی – لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیان لە ڕووی زمانەوە ، « گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات » ، ژ ١٩ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٧١ – ١١٥ •**

نووســـەر لەم وتارەدا ( ٨٧ ) ئیدیۆمی کوردی هێناوەتەوەو مانای لێکداونەتەوەو لە پەیدابوون‌و پێکهاتنیان دواوە ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ١٠ ، ١٧٠ ) •

**٦٥٠ ــ یـاری لـە کوردەواریداو پێکهاتنی لەڕووی زمانەوەو ئـاری بۆسەر کۆمەڵ ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ۱ ، سالی ۱ ، سلێمانی ، ۱۹۷۷ ، ل ٥١ ــ ٦٠ ٠**

د ٠ نەســــرین لـەم وتـارەدا نـاوی ( ۳٥۸ ) یـاریی کوردەواری تۆمارکردووەو دوایی لە پێکهاتنی ئەم یاریانە ئەڕووی زمانـەوە ــ واتـە چۆنیەتی دروستبوونی ئەو ناوانە ــ دواوەو لە ئەنجامدا بەسەر سـیازدە دەستەدا دابەشی کردوون ٠

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ۷۳۰ ، ۸۸۱ ٠**

وردی :

**٦٥١ ــ دەســـتووری زمـانی کوردی ، گۆڤاری « گرۆگالی منداڵانی کورد » ، ژ ۳ ، ١٩٤٦ ، ل ۳ ٠**

ئەم وتارە کە دەربارەی چۆنیەتیی نووسینی کوردی‌یە ، باســـی ( واوی کورت )و ( واوی درێژ )و ( واوی کراوە )و ( گیرە ــ شــدة )و ( لامی قەڵەوو لاواز )و ( یای بێ‌هێزو بەهێز )ی تێدا کراوە ٠

د ٠ وریا عومەر ئەمین :

**٦٥٢ ــ ئامرازەکانی بەستن ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٧ ، بەغدا ، حوزەیران ، ١٩٨٤ ، ل ٢٨ ــ ٣١ ٠**

نووســــەر لـەم وتارەدا لـە ( و ، ی ، ە ) دواوەو وەك ئامرازی پەیوەندیی نێوان بەشەکانی ڕستە لێیانی کۆڵیوەتەوەو نیشـــــانی‌داوە ( ناوو ناو )و ( ناوو ئاوەڵناو ) لە چوارچێوەی ڕستەدا لەیەك‌دەدەن ٠

**٦٥٣ ــ ئیملای کوردی‌و چەند تێبینی‌یەك ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ــ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٣٤ ــ ٤٤٩ ٠**

ئـەم وتـارە لـە ڕێی تیۆریی فۆنێـم‌و جیـاکـردنـەوەی فۆنەتیك‌و

مۆنۆلۆجی‌یەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەوەی داوە ئایا پێویستە پیتی ( ص )و ( ط ) بخرێتە ناو ئەلفوبێی کوردی‌یەوە ؟ یان ( ق )و ( ع )و ( ح ) لە ئەلفوبێی کوردیدا لابرێن ؟ یان پێویســـت دەکا چوکلە لەژێر ( ر )ی سەرەتای وشەدا دابنرێ ؟ ...

**٦٥٤ – پەیوەندیی ڕاناوو فرمان لـە کرمانجیی ژووروودا ، گۆڤـاری « کاروان » ، ژ ٢ ، هەولێر ، تشرینی دووەمی ١٩٨٢ ، ل ٤١ – ٤٣ .**

د . وریا لەم وتارەدا باسی ئەوەی کردووە ، کە لە دیالێکتی ژووروویی کوردیدا دوو جۆر جێناوی جودا هەیەو وا ڕادەگەیەنێ کـە دەوریان لـە ڕستەدا بەستراوە بە کات ( ڕابوردوو یا داهاتوو )و جۆری کردار ( تێپەڕ یا تێنەپەڕ )ەوە .

**٦٥٥ – تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٧ ، ئەیلوولی ١٩٨٥ ، ل ١٩٦ – ٢٠٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە کرداری تێنەپەڕ لـە ڕووی پێوەندیی سیمانتیکی‌یەوە بە کارا ڕێزمانی‌یەکەیەوە کردارێکی کارا بزرە .

**٦٥٦ – خزمایەتی لە زمانا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٤ ، تەمووزی ١٩٨٢ ، ل ٢٦ – ٣١ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی خزمایەتی‌و پێوەندیی زمانەکانی جیهانی کردووەو شوێنی زمانی کوردی لەنێوانیاندا دیاری کردووە .

**٦٥٧ – ڕستەی بکەر نادیار ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ئابو ئەیلوولی ١٩٨٢ ، ل ٣٤ – ٣٥ .**

نووسـەر لـەم وتارەدا لەبارەی ڕستەی کـارا بزری کوردی‌یەوە دواوە .

**٦٥٨ – ڕوونکردنەوەیەك ، گۆڤاری « نووســـەری کورد » ، ژ ٢ ، خولی سێیەم ، ئابی ١٩٨٥ ، ل ٨٢ – ٨٨ .**

ئەم نووسینە وەڵامە بۆ ئەو ڕەخنەیەی د ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، کە لە وتاری « جێناوی کەسیی جودا لە زمانی کوردیدا » ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد ، ب ١٢ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٥٤ ـ ٩٥ )دا لە وتاری « لایەنێکی جیاوازی » ( گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٥٤ ـ ٢٧٦ )ی د ٠ وریا عومەر ئەمینی گرتووە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٥ ) ٠

**٦٥٩ ـ ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٨ ، مایسی ١٩٨٣ ، ل ٦٨ ـ ٧٤ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا لەسەر بناغەی دوو ڕستەی : « ١ ـ ئێمە ئێوە ئەنێرین »و « ٢ ـ ئێوە ئێمەتان نارد » لە جێناوی لکاوی کۆڵیوەتەوەو دەورو ئەرکو واتای لە ڕستەدا دەستنیشان کردووە ٠

**٦٦٠ ـ ڕێکەوتن لە زماندا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩١ ، ئازارو نیسانی ١٩٨٢ ، ل ١٦ ـ ١٩ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا لەوە دواوە ، کە لەگەڵ زماندا هەندێ لە بەشەکانی ڕستە لەگەڵ یەك ڕێكدەکەون لەڕووی یەك یا زیاتر لە چەمکی گرامەری وەك کەسو ژمارەو جنسو دۆخ ٠ هەروەها شوێنی زمانی کوردی لەناو سیستەمی ئەو ڕێکەوتنەدا نیشانداوە ٠

**٦٦١ ـ زمانو ماتماتیك ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٧ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٣٤ ـ ٣٧ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا شێوەی بەدوا یەکدا هاتنی سێ بەشە بنچیەکەی ڕستە : ( کارا )و ( بەرکار )و ( کردار )ی لە زمانی کوردیدا ساغکردووەتەوە ٠

**٦٦٢ ـ فۆنۆلۆجی ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٢٠ ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٣٤ ـ ٣٧ ٠**

ئەم وتارە هەوڵدانێکە بۆ پێناسینی فۆنەتیکو دەرختنی پێوەندیی نێوان فۆنەتیکو فۆنۆلۆجی • ئەم کارەش لەســـەر بناغـەی بەراوردی دەنگەکانی زمانی کوردیو عەرەبی سازکراوە •

**٦٦٣ ـ فۆنێمەکانی زمانی کوردی ، گۆڤاری (( نووسەری کـورد )) ، ژ ٨ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٩ ـ ٣٥ •**

د • وریا لەم وتارەدا تێکڕای فۆنێمەکانی زمانی کوردی دەستنیشان کردووەو نموونەی بۆ هەموویان هێناوەتەوە •

**٦٦٤ ـ کاتو ڕەگی فرمان ، گۆڤاری (( ڕۆژی کوردستان )) ، ژ ٦٥ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٧٨ ـ ٨٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا هەوڵیداوە پێوەندیی مۆرفۆلۆژیی نێوان ڕەگی کاتی رابو، دە[illegible] ی داهاتەوە، کرداری کوردی بخاتە ڕوو ـ واتە [illegible]و یاسایانەی دەشێ بە هۆیانەوە ڕەگی [illegible] وەربگیرێ •

**٦٦٥ ـ کەی (( ات ))و . . . کەی (( ێت )) ، گۆڤاری ((ڕۆژی کوردستان)) ، ژ ٧٠ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠ ـ ٢١ •**

نووسەر لـەم وتارەدا ئـەوەی ڕوونکردۆتەوە ، کە جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك کەی ( ات )و کەی ( ێت ) وەردەگرێ •

**٦٦٦ ـ لایەنێکی جیاوازی ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد )) ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٥٤ ـ ٢٧٤ •**

نووسەر لە سەرەتادا هەندێ لە زانستی زمانو لقەکانی زانستی زمانی دواوەو ئنجا هاتۆتە سەر باسی جێناوی کەسیی جوداو لکاو لە کرمانجیی خواروو و ژووروودا و لە ڕووی ســینتاکســەوە لێیانی کۆڵیوەتەوە •
( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٠٢ ) •

**٦٦٧ ـ وشـــــە ، گۆڤاری (( نووسەر کورد )) ، ژ ٩ ، خولی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٨٣ ـ ٨٩ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ( وشـــــە )و ( مۆرفێم )ی ( ناوگر )ی ( پێشگرو پاشگر ) ••• دەکاتو لە زمانی کوردییەوە نموونەو بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە •

**٦٦٨ ـ یاســــاییێکی فۆنۆلۆجی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٥١ ـ ٥٢ •**

ئەم وتارە لەو پرپۆزیشنانە دەدوێ کە لەگەڵ ئەو جۆرە کردارانـە دەردەکەون کـە چەمکی گوێزانەوە دەگەیەنن ، وەك : ( چوون بۆ ، دان بـە ••• هتد ) • دەشێ پرپۆزیشنەکە بە پاشگری کرداری ( ە ) جێگیر بکرێت •

**هەروەها ژ : ٥٠١ ، ٥٠٢ ، ٩٨١ •**

« هەتاو » :

**٦٦٩ ـ ؟ ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ٤٢ ، ســـالی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٤ ـ ٥ •**

ئـەم وتـارە بێ ســـەرناوە ، کە بە ناوی گۆڤاری « هەتـاو »ەوە نووسراوە ، نووسینی مامۆســـتا گیوی موکریانیەو وەڵامە بۆ وتـاری « لیسی کوێری »ی مەعرووف خەزنەدار ( بڕوانە : باسی ژ ٦٠٩ ) •

**٦٧٠ ـ ئەلفوبێی کـوردی بـە تیپی لاتینی ، گۆڤـاری « هەتـاو » ؛
وانەی یەکـەم ، ژ ٩٠ ، ســـــالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٦ ؛
وانەی دووەم ، ژ ٩١ ، ســـــالی ٣ ، هەولێـر ، ١٩٥٧ ، ل ٦ ؛
وانەی سێیەم ، ژ ٩٢ ، ســـــالی ٣ ، هەولێـر ، ١٩٥٧ ، ل ١٥ ؛
وانەی چوارەم ، ژ ٩٣ ، ســـــالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١٧ ؛
وانەی پێنجەم ، ژ ٩٤ ، ســـــالی ٣ ، هەولێـر ، ١٩٥٧ ، ل ٣ ؛
وانەی شەشەم ، ژ ٩٥ ، ســـــالی ٣ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ٢٧ ؛
وانەی حەوتەم ، ژ ٩٦ ، ســـــالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ٢٤ ؛
وانەی هەشتەم ، ژ ٩٧ ، ســـــالی ٤ ، هەولێـر ، ١٩٥٧ ، ل ٢ ؛
وانەی نۆیـەم ، ژ ٩٨ ، ســـــالی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ٥ •**

ئەمە کۆمەڵێ دەرسە دەربارەی فێربوونی نووســـــینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینی •

**٦٧١ ــ لەبــابــەت یەکێتی زمــانی کوردی‌یەوە ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ٣٥ ، ساڵی ٢ ، هەولێر ، ١٩٥٥ ، ل ٣ •**

ئەم نووسینە ئامۆژگاری‌یە بۆ خوێندن بە زمانی کوردی‌و هەوڵدانە بۆ یەکگرتنی زمانی کوردی •

**٦٧٢ ــ یەکگردنی زمانی کوردی‌و ئەلفبای کوردی عێراق‌و ســووریا ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١ ــ ٢ •**

ئــەم وتارە باسی پێویستیی لەیەکترگەیشتنی کوردان دەکــاتو بــۆ سەرەتای ئەم کارە ئەلفوبێی کوردی بە لاتینی‌و عەرەبی خســـتۆتە پێش چــاو •

**٦٧٣ ــ یەکێتی زمان ، گۆڤاری (( هەتاو )) ، بەشی یــەکــەم ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ل ٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٣ ، ســـــــاڵی ١ ، هەولێر ، ١٩٥٤ ، ل ١٢ •**

لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا باس لەوەیە ، کە ئەو ئەلفوبێ لاتینی‌یەی کوردەکانی سووریا بەکاری‌دێنن ، پێویستی بە زیادکردنی چەند پیتێکی نوێ‌یە • بەشی دووەمی وتــار لــەبــارەی نیشــــــانەی کــۆی زمــــانی کوردی‌یەوەیە •

هەژار :

**٦٧٤ ــ کتێبمان چۆن چاك دەبێ ، گۆڤاری (( پەروەردەو زانســـت )) ، ژ ٦ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١٠٣ ــ ١١٣ •**

لەم وتارەدا هەندێ ئامۆژگاری بۆ چاككردنی کوردی‌یەکەی کتێبی قوتابخانەکان خراوەتە پێش چاو •

**٦٧٥ ـ کوردو سەربەخۆیی زمان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٢٨٠ ـ ٣٢٣ .**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ ، کە بوونی وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا هیچ دیاردەیـەکی خـراپ نیەو دەڵێ زمانێکی دەوڵەمەندی وەك عەرەبی سەدان وشەی بێگانەی تێدایەو بۆ پێسەلماندنی ئەمە لیستەیەکی دوورودرێژ ( کە نزیکەی ٦٠٠ وشەیەك دەبێ )ی هێناوەتەوە .

**٦٧٦ ـ نە وا سوێر ، نە وا بێخوێ ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٥١ ـ ٥٦ .**

نووســەر لـەم وتارەدا لـەوە دەدوێ ، کە هەندێ لـە نووســەران بێبیرکردنەوە وشەی بێگانەی چەسپاو لـە زمانی کوردی دەردەهـاوێژن و لە جێیان وشەی داتاشراوی بێمانای نالەبار دادەنێن .

ص . هەژار :

**٦٧٧ ـ سۆرانی یا کرمانجی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .**

ئەم نامیلکە ( ٣٩ ) لاپەڕەیە ، کە وەرامی کتێبی « مسـألة توحیـد اللغة الکردیة »ی عیسمەت شەریف وانلی یە ( بڕوانە : باسی ژ ٧١٧ ) ، لە دوو بەش پێکهاتووە : یەك ـ پێشـــەکی ( ل ٥ ـ ٢٠ ) ؛ دوو ـ وەرامی نووسینەکەی کاك عیسمەت شەریف ( ل ٢١ ـ ٣٩ ) . ( بڕوانە : باســی ژ ٧١٧ ) .

أ . ب . هەوری :

**٦٧٨ ـ دەستووری نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبی ، ســـلێمانی ، ١٩٦٨ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٤١ ) لاپەڕەیەو بریتی یە لەو باسانە : « ســـەرەتا » ( ل ٣ ـ ٦ ) ؛ « شێوەی گشتیی نووسینی کوردی یان شێوەی ناوچەیی »

( ل ٧ – ١٠ ) ؛ « وشـــەی بێگانە » ( ل ١١ – ١٤ ) ؛ « وشـــە دروستکردن » ( ل ١٤ – ١٧ ) ؛ « نووسیارو نووســینی کوردی » ( ل ١٨ – ٢١ ) ؛ « نووسینی پیتی ( ر ) » ( ل ٢٢ – ٢٤ ) ؛ « نووسینی پیتی ( واو ) » ( ل ٢٥ – ٢٧ ) ؛ « نووسینی پیتی ( ی ) » ( ل ٢٨ – ٣٠ ) ؛ « نووســــینی پیتی لام » ( ل ٣٠ – ٣٢ ) ؛ « نووســـــینی هەمزە » ( ل ٣٢ – ٣٣ ) ؛ هەندێ شـــیعرو وشـەی کۆتـایی و ... ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٧٧ ) .

**٦٧٩ – وشەی کۆنو نوێ ، گۆڤاری « بەیـان » ، ژ ٤٧ ، بـەغـدا ، ١٩٧٨ ، ل ٧٢ – ٧٤ .**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی ئەو وشانەی زمان جێدێڵنو ئەوانەی تازە ڕەگ دادەکوتن دواوە .

هیمدادی حوسێن :

**٦٨٠ – فەرهەنگ نووســینی کوردی لـە ١٩٧٠ – ١٩٨٤ ، گۆڤـاری « ئۆتۆنۆمی » ، ژ ٤ ، ساڵی ١٠ ، هەولێر ، ١٩٨٥ ، ل ٧٦ – ٨٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە سەرپاکی ئەو فەرهەنگە کوردییانە دواوە کە لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠ – ١٩٨٤دا بڵاوکراونەتەوە .

**٦٨١ – نیشـــانەکانی کۆ لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٠٦ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ١٠٩ – ١١٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو نیشانانەی کردووە ، کە لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی دیدا کۆ سازدەکەن .

« هیوا » :

**٦٨٢ – پرسێن ئەلفابەیا کوردی ، گۆڤاری « هیوا » ، پاریس ، تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ ، ل ٩ .**

ئەم كورتە وتارە باسی ئەوە دەكا كە لە ٢٣ تـا ٢٨ی مانگی گولانی ١٩٨٣دا سیازدە نووسەرو زمانەوانی كوردی عێراق‌و ئێران‌و توركیـا لـە پاریس كۆبوونەوەو لە كێشەی نووسینی كوردی‌و زاراوە كۆلیونەتەوەو پرسیاری بە كام ئەلوبێ نووسینیان خستۆتە پێش چاو • ( بڕوانە : باسی ژ ٢٥٨ ، ٣٣٩ ، ٦٢٣ ) •

**٦٨٣ ـ زاری دوملی‌و مەولوودا عوسمان ئەفەندی ، گۆڤاری (( هیوا )) ، ژ ٢ ، پاریس ، مایسی ١٩٨٤ ، ل ٧٧ ـ ٨٥ •**

ئەم وتارە كە باسی شـێوەی دوملی‌و هەندێ تایبەتێتی دەنگەكانی‌و ڕێزمانی‌و بـەراوردی لـەگـەڵ دیالێكتی كرمانجیی ژووروودا دەكـات ، نووسینێكی جەلادەت بەدرخانە لە ژمارە ( ٢٣ )ی گۆڤـاری « هـاوار » ( ١٩٣٣ )ەوە وەرگیراوەو لـە ئەلفوبێی عەرەبی‌یەوە كراوە بـە ئەلفوبێی لاتینی •

**٦٨٤ ـ زمان ، گۆڤاری (( هیوا )) ، پاریس ، تشرینی یەكەمی ١٩٨٣ ، ل ١٠ ـ ١٨ •**

گۆڤاری « هیوا » لەبەر ئەوەی بڕیاری‌داوە لە بەشە كرمانجی‌یەكەیدا پەیـڕەوی ئـەو ئەلفوبێ لاتینی‌یە بكا كـــە گـۆڤـاری « هـاوار »ی پێ بلاوكراوەتەوە ، بۆیـە لـەم وتارەدا باسی كەم‌وكورتی‌یەكانی ئەلفوبێ‌كە و چۆنیەتیی چارەسەركردنیان كراوە •

ی • ل • :

**٦٨٥ ـ ئیملای كوردی ، گۆڤاری (( بلێسە )) ، بەشی یەكـەم ، ژ ١ ، سـالی ١ ، سـلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٧٣ ـ ٧٤ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢ ، سـالی ١ ، سـلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٦٦ ـ ٦٧ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٣ ، سالی ١ ، سلێمانی ، ١٩٥٩ ، ل ٧٤ ـ ٧٥ •**

نووسەر لەم سێ ئەڵقەیەدا باسی چونیەتیی نووسینی پیتی هەمزەو لامی قەڵەوو ڕێی قەڵەوو واوی کورتو درێژو کۆنسۆنانتو یێی کورتو درێژو کۆنسۆنانتو واوی پێوەندیو وشەی لێکدراو ...ی کردووە .

## یووسف ڕەئووف عەلی :

**٦٨٦ ـ دەربارەی لیستەی زاراوەکانی کۆڕ ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ١٠ ، ساڵی ٢ ، ئابی ١٩٧٨ ، ل ٩٢ ـ ٩٤ .**

ئەم وتارە هەندێ تێبینیو سەرنجە لەبارەی لیستەی یەکەمو دووەمو سێیەمی ئەو زاراوانەوە ، کە کۆڕی زانیاری کورد بڵاوی کردوونەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٥٤ ، ١٠٥٥ ، ١٠٥٦ ) .

**٦٨٧ ـ لامی سووکو لامی قورس لە وشەدا ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، ژ ٤ ، ساڵی ٣ ، سلێمانی ، ١٩٧٩ ، ل ٨٢ ـ ٨٣ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە دەنگی ( ل )ی لاوازو ( ڵ )ی قەڵەو لە ڕووی زاراوەو جیاوازیو دەورەوە دواوە .

**هەروەها ژ : ٢٦٥ب .**

## یووسف ڕەهێڵ :

**٦٨٨ ـ یەکێتی زمانی کوردی ، گۆڤاری « هەتاو » ، ژ ١٠٤ ، ساڵی ٤ ، هەولێر ، ١٩٥٧ ، ل ١ ـ ٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی هۆی دواکەوتوویی زمانی کوردی کردووە .

## بـه زمـانی عەرەبی

### أبو زيد مصطفى السندي :

**٦٨٩ ـ الكلمات العربية المستعملة في اللغة الكردية ، « گۆڤاری کۆڕی زانیـاری عێـراق ـ دەسـتەی کـورد » ، ب ٩ ، بەغـدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٨٩ ـ ٥١٠ ٠**

ئەم وتارە باسی چۆنیەتیی نووسینی ئەو وشە عەرەبی‌یانە دەکات ، کە لە زمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێن ٠ نووسەر بۆ ئەم مەبەستە لە سەرەتادا کەمێك لە مێژووی نووسـینی کوردی بـە ئەلفوبێی عەرەبی‌و ڕێنووسی عەرەبی‌و ڕێبازەکانی نووسینی زمانی فارسی دواوەو دەربارەی کارکردن لە زمانی کوردی کۆلیوەتەوەو ئنجا باسی چۆنیەتیی نووسینی وشەی عەرەبی بە کوردی کردووە ٠

**هەروەها ژ : ٥٠١ ، ٥٠٢ ٠**

### أحمد شبيب :

**٦٩٠ ـ حـوار من ( خـارج ) اللغـة الكرديـة ، گـۆڤـاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٧ ، بەغدا ، حوزەیرانی ١٩٨٤ ، ل ٦ ـ ٧ ٠**

ئەم وتارە بریتی‌یە لە دەربڕینی هەندێ ڕاو سـەرنج دەربارەی ئـەو وتارەی د ٠ بەدرخان سندی ـ « القاموس الكردي الموحـد حاجة قوميـه كبرى » ، کـە لـە ژمارە ( ٦٥ )ی هـەمـان گۆڤـاردا بڵاوی‌کردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٦٩٤ ) ٠

## د • أحمد عثمان أبو بكر :

**٦٩١ – ذكر الاكراد واصولهم في كتابات المسلمين الاوائل ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد » ، ب ١٣ ، بەغدا ، ١٩٨٥ ، ل ٣٦١ – ٣٨٣ •**

لە هەندێ شوێنی ئەم وتارەدا لێکدانەوەی مانای وشەی « کورد » بەرچاو دەکەوێ •

**٦٩٢ – كتاب ( الشعب الكردي وتطوره الاجتماعي ) ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، بەشی دووەم ، ژ ٥٤ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٤ – ١٨ •**

د • ئەحمەد عوسمان بە زنجیرە وتارێك لە ناوەرۆکی کتێبی « گەلی کوردو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی »ی کردووە ، کە د • مەسعوود فانی والی تورکی ساڵی ١٩٣٣ بە زمانی فەرەنسی لە پاریس بڵاوی‌کردووەتەوە • لە بەشی دووەمی ئەم وتارەدا ( ل ١٦ ) ، کەمێ زانیاری کتێبەکەی د • مەسعوود فانی لەبارەی ئەسڵی زمانی کوردیو تایبەتێتی‌یەوە خراوەتە پێش چاو •

## أدور يوحنا :

**٦٩٣ – ملاحظات حول اصوات اللغة الكردية ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان ، ژ ٥ و ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٣١ – ٣٢ •**

نووسەری ئەم وتارە لە سەرەتادا باسی دەنگو ئەو وێنانە دەکا کە لە ئەلفوبێدا بۆیان دادەنرێ ••• دوایی دێتە سەر ڕەخنە لە نیگاری هەندێ لەو دەنگانەی مامۆستا تۆفیق وەهبیو ئەدمۆنس لە فەرهەنگی کوردی – ئینگلیزیدا دایان‌ناوە •

## د • بدرخان سندي :

**٦٩٤ – القاموس الكردي الموحد حاجة قومية كبرى ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان ، ژ ٦٥ ، بەغدا ، ١٩٨١، ل ٦ – ١٣ •**

ئەم وتارە لە پێویستیی‌و چۆنیەتیی ڕێکخستنی فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی دەدوێ • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٩٠ ) •

**هەروەها ژ : ١٠٢ •**

## توفیق وهبی :

**٦٩٥ ـ اصـــل الاكراد ولغتهم ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١ ـ ٤٤ •**

لە هەندێ شوێنی ئەم وتارەدا باسی ئەسـ‍ـــــــڵی زمانی کوردی‌و بەراوردکردنی کوردی لەگەڵ فارسی‌و دیالێکتەکانی کوردی کراوە •

**٦٩٦ ـ حول مقال مســـــــؤولية الاديب الكردي الكبرى ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٥ ، ساڵی ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٨١ ـ ٩١ •**

مامۆستا تۆفیق وەهبی لەم وتارەدا باسی سازبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی‌و پێشکەوتنی کردووەو لە دەوری خۆی‌و بەرهەمەکانی دواوە •

**٦٩٧ ـ قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، بغـداد ، ١٩٥٦ ؛ الجزء الثاني ، ١٩٥٦ •**

بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە ( ٥٦ ) لاپەڕەیە • لە سەرەتادا پێناسـەی ( زمان ، ئاخاوتن ، وشە ، نووسین ، پیت ، دەنگ ، بڕگە ، هێز ••• )ی کردووەو لـە ( دەنگەکانی زمانی کوردی‌و چۆنیەتیی دەربڕینیان ) دواوە • بزوێن‌و نەبزوێنەکانی جیاکردۆتەوەو بەتایبەتی لە دوو دەنگی ( و )و (ی)ی نیمچە بزوێن دواوە ••• لە کۆتاییدا چیرۆکی ( بەختیـــارو بەدبەخت )ی تۆمارکردووەو کردووشیە بە عەرەبی ••• بەرگی دووەم لە لاپەڕە (٥٦)ەوە دەست‌پێ‌دەکات تا ( ١١٢ ) • لە ( ل ٥٧ ـ ٦٤ )دا دەربارەی ڕســـــتەو جۆرەکانی دواوە • لە ( ل ٦٥ ـ ٨٠ )دا باسی بەشەکانی ئاخاوتنی کردووە • لە ( ل ٨١ ـ ٨٩ )دا لـــە دەســـــتەواژەو جۆرەکانی کۆڵیوەتەوە • لـە

( ل ٩٠ – ٩٧ )دا لـه خالّبەنـدی دواوە • لە ( ل ٩٨ – ١١٢ )دا چیرۆکی «بووکە سووری »ی تۆمارکردووە و لـە تـەك تـەرجومـەی عەرەبیـدا بلاوی کردۆتەوە • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٢٨٥ ) •

**٦٩٨ – قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ( ألف بـاء ) ، مجموعة من المحاضرات التي ألقيت في نادي الارتقاء الكردي ببغداد في سـنة ١٩٥٥ – ١٩٥٦ ، بغداد ، ١٩٥٦ •**

ئەم نووسراوە بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە • نوسخەیەکی کە من دیومە لـە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری عێراق پارێزراوە • تێکڕای ئەم نووسـراوە لەگەڵ دەستکاری‌یەکی زۆر کەمدا بووە بە کەرەستەی کتێبی « قواعـد اللغة الكردية » ، الجزء الاول ، بغداد ١٩٥٦[١٠] • دەتوانرێ بوترێ ئـەم کتێبەو ئەو نوسخەی ڕۆنیۆیە یەك شتن ، چونکە لە چەند شوێنێکی کەمدا نەبێ جیاوازیان نییە • تەنانەت پێشەکی‌یەکانیشیان تەواو وێك‌دەچن •

**هەروەها ژ : ١٣٦ ، ١٣٧ ، ١٣٨ ، ١٣٩ ، ١٤٠ ، ١٤١ ، ١٤٢ ، ١٤٣ ، ١٤٤ ، ١٤٥ ، ١٤٦ ، ١٤٧ ، ١٤٨ ، ١٤٩ ، ١٥٠ ، ١٥١ ، ١٥٢ ، ١٥٣ ، ١٥٤ ، ١٥٥ ، ١٥٦ ، ١٥٧ ، ١٧٧ ، ٥١٣ ، ٥١٤ ، ١٠٠١ ، ١١٠٦ •**

## تۆما بوا :

**٦٩٩ – مع الاكراد ( ترجمة : آواز زەنگنە ) ، بغداد ، ١٩٧٥ •**

ئەم کتێبە بە عەرەبی ( ١٦٧ ) لاپەڕە دەرچووە • بەشـێکی کەمی فەسلی دەیەمی ئەم بەرهەمە ( ل ١٣١ – ١٣٤ ) باسی زمانی کوردی دەکات• نووسەر لە سەرەتادا ناوی هەندێ لەو کتێبانەی بردووە ، کـە لەبـارەی زمانی کوردییەوە نووسراونو ئنجا باسی ئەسـلی زمـانی کوردی‌و

---

(١٠) لەسەر لاپەڕە یەکی ئەم کتێبە نووسراوە : بغداد ، ١٩٥٦ . کەچی لـە دوا لاپەڕەیدا نووسراوە : مطبعة البيان ، بيروت ، ١٩٥٦ .

دیالێکتەکانیو بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبیو لاتینی بۆ نووسینی کوردی کردووە •

## د • جمال رشيد أحمد :

**٧٠٠ ـ علاقة الكرد بالكاردوخيين ، گۆڤاری « زانکۆ » ، ب ٧ ، ژ ١ ، هەولێر ، ١٩٨١ ، ل ٤٣ ـ ٦٥ •**

لە هەندێ شوێنی ئەم وتارەدا مەسەلەی زمانەوانی بەرچاو دەکەوێ ، بەتایبەتی لە مەسەلەی لێکدانەوەی مانای وشەی « کورد » و « کاردوخ »داو هەروەها لە باسی تێزیکایەتی دەنگی وشەی « کورد » بە وشەی « کاردوخ »ەوە •

**هەروەها ژ : ١٧٩ ، ١٨٠ ، ١٨١ ، ١٨٢ ، ١٨٣ •**

## حسين أحمد الجاف :

**٧٠١ ـ جولة في كتاب ادگار بالانس عن الاكراد ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥٤ ، بغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٢٣ ـ ٢٤ •**

نووسەر لەم وتارەدا کە باسی ئەو کتێبە ( ١٩٦ ) لاپەڕەیی‌یەی میستەر ئەدگار بالانس دەکات ، کە سالی ١٩٧٣ لەبارەی کوردەوە بڵاوی کردۆتەوە ، ئەو شوێنانەی خستۆتە پێش چاو کە پێوەندی بە زمانی کوردییەوە هەیە •

## جمال بابان :

**٧٠٢ ـ اصول اسماء المدن والمواقع العراقية ، الجزء الاول ، بغداد ، ١٩٧٦ •**

ئەم کتێبە ( ٤١٠ ) لاپەڕەیەو باسی هەندێ لە شارو گوندەکانی عێراق دەکات • لە زۆر شوێندا باسی ئەسڵی ناوی شار و گوندە کوردی‌یەکان بەرچاو دەکەوێ •
**هەروەها ژ : ١٧٢ ، ١٧٣ •**

جی • ار • درایفر :

**٧٠٣ ـ الاسم ( کورد ) وارتباطاته الفیلوجیة ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٢ ، بغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٦ ـ ٢٠ •**

ئەم وتارە کە ج • ر • درایفەر ساڵی ١٩٢٣ بڵاوی‌کردۆتەوەو باسی پەیدابوونو واتای وشەی کوردو پێوەندیی فیلۆلۆژی دەکات ، مامۆستا فوئاد حەمە خورشید کردوویە بە عەرەبی •

رفیق حیلمي :

**٧٠٤ ـ الاکراد منذ فجر التاریخ الی سنة ١٩٢٠ ، الموصل ، ١٩٣٤ •**

ئەم بەرهەمە ، کە بە زۆری باسی نەژادی کوردو جوگرافیای کوردستانو ئەدەبی کوردی‌یە ، هەروەها باسی زمانی کوردیش دەکات •

ریبر :

**٧٠٥ ـ الاکراد ، دمشق ، ١٩٦٩ •**

ئەم کتێبە ( ٨٢ ) لاپەڕەیەو لەگەڵ باسی نەژادو ژمارەو دابو نەریتو بزووتنەوەکانی کورددا ، لە زمانی کوردیش دواوە •

زبیر بلال اسماعیل :

**٧٠٦ ـ تاریخ اللغة الکردیة ، بغداد ، ١٩٧٧ •**

ئەم کتێبە ( ٧٢ ) لاپەڕەیەو ناوەرۆکی بەمچەشنەیە : پێشەکی

( ل ٣ – ٥ ) ؛ خێزانی زمانەکان (ل٦ – ٩) ؛ زمانی کوردی (ل٩ – ١٠) ؛ پێوەندیی کورد بە میدێکانو زمانەکەیانەوە ( ل ١٤ – ١٧ ) ؛ بیروڕای دی سەبارەت پێوەندیی نێوان زمانی کوردیو میدی ( ل ١٧ – ١٨ ) ؛ زەردەشتو ئاوێستا ( ل ١٨ – ٢٧ ) زمانی زەردەشت ( ل ٢٨ – ٣٢ ) ؛ دەورەکانی مێژووی پێشکەوتنی زمانە ئێرانییەکان ( ل ٣٣ – ٥١ ) ؛ زمانە ئێرانییەکانی سەرووی ڕۆژئاوا ( ل ٥٢ – ٥٤ ) ؛ سەربەخۆیی زمانی کوردی ( ٥٤ – ٥٩ ) ؛ زمانی کوردیی ئەمڕۆ ( ل ٦٠ – ٦١ ) ؛ دیالێکتەکانی کوردی ( ل ٦٠ – ٦٥ ) ؛ لەبارەی لوڕستانو لوڕو شێوەیانەوە ( ل ٦٥ – ٦٧ ) ؛ ڕای تر لەبارەی دیالێکتەکانی کوردییەوە ( ل ٦٧ – ٧١ ) ؛ وشەی کۆتایی ( ل ٧١ ) ٠ ( بڕوانە : باسی ژ ٢٦٥ ب ) ٠

أي ٠ بي ٠ سون :

**٧٠٧ – اللغة الكردية ، نقلها الى العربية : الاستاذ ابن خلكان ، گۆڤاری « نزار » ، سالی ١ ، ژ ٦ ، بغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٣ – ٤ ؛ سالی ١ ، ژ ٧ ، بغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٩ – ١٠ ؛ ژ ٨ ، بغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٦ – ٧ ؛ سالی ١ ، ژ ٩ ، بغدا ، ١٩٤٨ ؛ ل ٥ ٠**

ئەم زنجیرە وتارە تەرجومەی پێشەکی ئەو کتێبەیە ، کە مێجەر سۆن سالی ١٩١٣ لەبارەی زمانی کوردییەوە بلاّوی کردۆتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٩٣٧ ) ٠

**هەروەها ژ : ٩٧١ ، ٩٧٢ ، ٩٧٣ ، ٩٧٤ ، ٩٧٥ ، ٩٧٦ ٠**

## صلاح سعدالله :

**٧٠٨ ـ حول اللغة الكردية ، بغداد ، ١٩٨٥ ٠**

ئەم نامیلکەیە ( ٦٢ ) لاپەڕەیەو باسی زمـــانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیو گیروگرفتەکانی دەکات ٠

## د ٠ شاکر خصباك :

**٧٠٩ ـ الکرد والمسالة الکردیة ، بغداد ، ١٩٥٩ ٠**

( بڕوانە باسی ژ ٢٧٦ ) ٠

**٧١٠ ـ آثار المستشرق درایفر في أصل تســـمیة الاکراد ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ١ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٩ ـ ١٢ ٠**

ئەم وتارە دەربارەی ئەسلی وشەی « کورد » دەدوێو بەتایبـــەتی باسەکەی ( درایفەر )ی ڕۆژهەلاتناس لەوبارەیەوە لێکدەداتەوە ٠

## د ٠ عبدالرحمن معروف :

**٧١١ ـ ما کتب عن اللغـة الکردیـــة ( ترجمـة : محمـد امین غفور الهورامانی ) ، بغداد ، ١٩٧٨ ٠**

ئەم کارە ( ٦٢ ) لاپەڕەیەو کتێبی « چی لەبارەی زمانی کوردیـەوە نووسراوە »یە کراوەتە عەرەبی ( بڕوانە : باسی ژ ٥٢ ) ٠

**٧١٢ ـ موجز تاریخ وضع القوامیس الکردیـة ، « گۆڤـاری کـۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٧٠٥ ـ ٧٢٨ ٠**

ئـەم وتـارە ـ « کورتە مێژوویەکی فەرهەنگنووسیی کوردی » ـ باسی تێکڕای ئەو فەرهەنگو فەرهەنگۆکە کوردیانە دەکات کە هەر لـە زووەوە تـا ئەم سالانەی دوایی چ لەلایەن کوردەوەو چ لەلایەن بێگانەوە دانراون ٠

**هەروەها ژ : ٣٨ ، ٣٩ ، ٤٠ ، ٤١ ، ٤٢ ، ٤٣ ، ٤٤ ، ٤٥ ، ٤٦ ، ٤٧ ، ٤٨ ، ٤٩ ، ٥٠ ، ٥١ ، ٥٢ ، ٥٣ ، ٥٤ ، ٥٥ ، ٥٦ ، ٥٧ ، ٥٨ ، ٥٩ ، ٦٠ ، ٦١ ، ٦٢ ، ٦٣ ، ٦٤ ، ٦٥ ، ٦٦ ، ٦٧ ، ٦٨ ، ٦٩ ، ٧٠ ، ٧١ ، ٧٢ ، ٧٣ ، ٤٢٠ ، ٤٣٤ ، ٤٩٩ ، ٥٠٠ ، ٧٦٢ ، ٧٦٣ •**

## عبدالستار طاهر شريف :

**٧١٣ – حول القاموس الكردي الوحـــد حاجة قومية كبرى ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٨ ، بغدا ، ١٩٨٤ ، ل ١٠ – ١٣ •**

نووســـەر لـەم وتـارەدا باسی بایەخو گرنگیو پێویستیی دانانی فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی کردووە •

**هەروەها ژ : ١٠٣٤ •**

## عبدالستار كاظم :

**٧١٤ – ملاحظات حول كتـاب اللغـة الكرديـة في ضـوء الفونتيك ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٣ ، بغدا ، ١٩٨١ ، ل ١٥ – ١٧ •**

ئەم وتارە هەڵسەنگاندنو نرخاندنی کتێبی « زمانی کوردی لـەبـەر ڕۆشـــنایی فۆنەتیکدا »ی د • ئەوڕەحمانی حاجی مـارفـە ( بڕوانـە : باسی ژ ٥٦ ) •

**٧١٥ – ملاحظات حول ( نوبهار ) ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردســتان » ، ژ ٥٦ ، بغدا ، ١٩٧٩ ، ل ٢٢ – ٢٦ •**

نووسەری وتار ئەو هەڵە زمانەوانییانەی خستۆتە پێش چـاو ، کـە مامۆستا صـــادق بەهائەدین لـە چاپی « نەوبەهار »ی ئەحمەدی خانیدا کردوویەتی ( بڕوانە : باسی ژ ٩٨٦ ) •

**هەروەها ژ : ٣٥٥ ، ٣٥٦ ، ٣٥٧ ، ٣٥٨ •**

عبدالمجيد لطفي :

**٧١٦ ـ اللغة الادبية للامة الكردية ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٧ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ١٠ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا باسی پێویستیی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەکات ٠

عصمت شريف وانلي :

**٧١٧ ـ مسألة توحيد اللغة الكردية ، بغداد ، ١٩٦٠ ، ( ترجمة الدكتور صديق الاتروشي ) ٠**

ئەم نامیلکەیە کە ( عصمت شریف وانلی ) لە سویسرە بڵاوی‌کردبووەوە ، دوکتۆر صدیق ئەترووشی بە ناوی « مسألة توحيد اللغة الكرديه » وە وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و سالی ١٩٦٠ ( حافظ مصطفى قاضی ) لە بەغدا لەچاپی‌داوە ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٦٧٧ ) ٠

**هەروەها ژ : ٣٩٥ ، ٩٨٠ ، ٩٨٧ ٠**

علاء الدين سجادي :

**٧١٨ ـ كيفية تعلم اللغة الكردية ، گۆڤاری « نزار » ، سالی ١ ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٣ ـ ١٤ ؛ سالی ١ ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٦ ؛ سالی ١ ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٤ ؛ سالی ١ ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٥ ؛ سالی ١ ، ژ ١١ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ل ١٤ ؛ سالی ١ ، ژ ١٢ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٢ ؛ سالی ١ ، ژ ١٤ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٤ ـ ١٥ ؛ سالی ١ ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١١ ـ ١٢ ؛ سالی ١ ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٤ ؛ سالی ١ ، ژ ١٧ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ١٢ ـ ١٣ ؛ سالی ١ ، ژ ١٨ ، بەغدا ، ١٩٤٨ ، ل ٤ ؛**

**سالی ۱ ، ژ ۱۹ ، بەغدا ، ۱۹٤۸ ، ل ۱۲ ؛ سالی ۱ ، ژ ۲۰ ، بەغـدا ، ۱۹٤۸ ، ل ۱٦ ؛ سالی ۱ ، ژ ۲۱ ، بەغدا ، ۱۹٤۸ ، ل ۱٦ .**

ئەم زنجیرە وتارەی مامۆستا سەجادی ، کەرەســـتەو کاکلی کتێبی « دەستوورو فەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی »یە ، کە سالی ۱۹٦۲ بلاّوی‌کردۆتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ۱۰۳۸ ) .

## علي سيدو الگوراني :

**۷۱۹ ـ اللر و لرستان ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کـورد » ، ب ۲ ، ژ ۲ ، بەغدا ، ۱۹۷٤ ، ل ۱۰۸ ـ ۱۸۱ .**

لە لاپەڕە ( ۱۱۱ تا ۱۱۳ )ی ئەم وتارەدا بەناوی « اللغة في لرستان »ەوە باسی شێوەی لوڕی کراوەو بیروڕای زانـایـان لەبارەیەوە خراوەتە پێش چـاو .

## عمر حسن دولة :

**۷۲۰ ـ اللغـة الكرديـة ولهجاتها ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٤ ، سالی ۱ ، بەغدا ، ۱۹٥۸ ، ل ۳ ـ ٤ .**

ئەم وتارە بە کورتی باسی دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکات .

## فؤاد حمه خورشيد :

**۷۲۱ ـ التوزيع الجغرافي للهجات الكردية ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ۳ ، ژ ۲ ، بەغدا ، ۱۹۷٥ ، ل ٦۱۲ ـ ٦۳٥ .**

ئـەم وتـارە باسی دابەش‌بوونی جوگرافیایی دیالێکتەکانی زمـــانی کوردی دەکات .

**۷۲۲ ـ اللغة الكردية ـ التوزيع الجغرافي للهجاتها ، بغداد ، ۱۹۸۳ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٥٢ ) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە : پێشەکی ( ل ٧ – ٨ ) ؛ بەشی یەکەم – زمانی کوردی ( ل ٩ – ١٨ ) ؛ بەشی دووەم – دیالێکتەکانی زمانی کوردی ( ل ١٩ – ٢٩ ) ؛ بەشی سێیەم – نەخشەی دیالێکتەکانی کوردی ( ل ٣٠ – ٤٥ ) ؛ بەشی چوارەم – ئەنجام ( ل ٤٦ – ٤٧ ) ؛ سەرچاوە ( ل ٤٨ – ٥٢ ) • ( بڕوانە : باسی ژ ٤٠٩ ، ٧٢٥ ) •
**هەروەها ژ : ٤٠٩ ، ٤١٠ ، ٧٠٣ •**

## « المجمع العلمي العراقي – هيئة اللغة الكردية » :

**٧٢٣ – توصيات ندوة الاملاء الكردي الموحد ، بغداد ، ١٩٨٥ •**

ئەم نامیلکە ( ١٤ ) لاپەڕەیەو بە کوردی‌و عەرەبی‌یە • بریتی‌یە لە ڕاسپێری‌یەکانی لێدوانی ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی کە کۆڕی زانیاری عێراق « دەستەی کورد » لە بەغدا لە ١٨ – ١٩/١٢/١٩٨٥دا گێڕاویە ( بڕوانە : باسی ژ ٤٦٣ ) •

## « مجموعة من المستشرقين السوفيات » :

**٧٢٤ – تاريخ الاستشراق والدراسات العربية والكردية في المتحف الاسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينينغراد ١٨١٨ – ١٩٦٨ • ترجم وعلق عليه وقدم له د. معروف خزنەدار ، بغداد ، ١٩٨٠ •**

ئەم کتێبە چەند باسێکە ، کە د • مارف خەزنەدار لە کتێبی « مۆزەخانەی ئاسیایی‌و ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگراد » ( مۆسکۆ ، ١٩٧٢ )وە لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە عەرەبی • ئەوەی لێرەدا پێوەندی بە زمانی کوردی‌یەوە هەیە ، باسەکەی ق • کوردۆیێڤە ، کە بە ناوی « الدراسات الكردية » ( ل ٢٣٧ – ٢٦٥ )ەوەیە ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٧٢٤ ، ٨٥٠ ) •

مدحي المندلاوي :

**٧٢٥ ـ اللغـة الكرديـة ـ التوزيع الجغـرافي للهجاتهـا ، گۆڤـاری « کاروان » ، ژ ١١ ، ئابی ١٩٨٣ ، ل ١٤٥ ـ ١٤٧ ٠**

ئەم وتارە نیشاندانێکی ئەو نامیلکەیەیە کە مامۆســـتا فوئاد حەمە خورشـــید ســـالی ١٩٨٣ بە ناوی « اللغة الكردية ـ التوزيع الجغرافي للهجاتها »وە بلاّویکردووەتەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٧٢٢ ) ٠

مصطفى نريمان :

**٧٢٦ ـ اسـماء الطيور في اللهجـات الكرديـة ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٩ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ٢١ ـ ٢٣ ٠**

ئەم وتارە برتییە لە خـــستنە پێش چاوو نیشاندانی فەرهەنگی « نامهـای پرندگان در لـهجەهـای کـردی »ی دکتۆر محەمەد کەیوان ٠ ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٨٠ ) ٠

**هەروەها ژ : ٥٧٢ ، ٥٧٣ ، ٥٧٤ ، ٥٧٥ ، ٥٧٦ ٠**

د ٠ مكرم الطالباني :

**٧٢٧ ـ نحـو لغـة كردية موحدة ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردســتان » ، ژ ٣٠ و ٣١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ١ ـ ٢ ٠**

ئەم وتارە لە کێشەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەدوێ ٠ ( بڕوانە : باسی ژ ٥٧٨ ) ٠

**هەروەها ژ : ٥٧٨ ، ٥٧٩ ٠**

ميريللا غاليتي :

**٧٢٨ ـ التراث الكردي في مؤلفـات الايطاليين ، « گۆڤـاری کـۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٢٢٥ـ٣٠٠ ٠**

ئەم بەرهەمە د • یووسف حبی کردوویە بە کوردی • لە هەندێ شوێنی ئەم کارەدا باسی زمانی کوردی کراوە بەتایبەتی لە ( ل ٢٧٤ ـ ٢٧٨ )دا ، کە لە کتێبی « ڕێزمانی کوردی )ی ماوریزۆ گارزۆنی دواوە •

ف • ف • مینورسکی :

**٧٢٩ ـ الاكراد • ملاحظات وانطباعات ( ترجمه وعلق عليه وقدم له د • معروف خزندار ) ، بغداد ، ١٩٦٨ •**

لەم تەرجومە عەرەبی‌یەدا باسی زمانی کوردی کەوتۆتە لاپەڕە ( ٣٧ ـ ٣٩ )ەوە ( بڕوانە : باسی ژ ٨٨٠ ) •

**هەروەها ژ : ٦١٥ ، ٨٨٠ ، ٩٤٦ ، ٩٤٧ ، ٩٤٨ •**

د • نسرين فخري :

**٧٣٠ ـ الالعاب الشعبية في المجتمع الكردي تكوينها اللغوي ودورها في المجتمع ، گۆڤاری « كاروان » ، ژ ١٨ ، ئازاری ١٩٨٤ ، ل ٩٤ ـ ١٠٢ •**

ئەم وتارە باسی یاریی فۆلکلۆری کوردی دەکاو ناوی یاری‌یەکانی لە ڕووی زمانەوانی‌یەوە لێکداوەتەوە •

**هەروەها ژ : ٤٩٧ ، ٤٩٨ ، ٦٣٥ ، ٦٣٦ ، ٦٣٧ ، ٦٣٨ ، ٦٣٩ ، ٦٤٠ ، ٦٤١ ، ٦٤٢ ، ٦٤٣ ، ٦٤٤ ، ٦٤٥ ، ٦٤٦ ، ٦٤٧ ، ٦٤٨ ، ٦٤٩ ، ٦٥٠ ، ٨٦١ •**

؟ :

**٧٣١ ـ اللغة الكردية ، گۆڤاری « چيا » ، ژ ٢ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦٨ ، ل ٥ ـ ٨ •**

ئەم وتارە دەربارەی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی دەدوێ • لەوە دەچێ هی مامۆستا محەمەد صالح سەعید بێ •

# بـه زمـانی تورکی

م ٠ ص ٠ آزیزی :

**٧٣٢ ـ حروفمز و تســـــهیل قرائت ، گۆڤاری « ڕۆژی کورد » ، ژ ٢ ، ئەستەموول ، ٦ی تەمووزی ١٣٢٩ك / ١٩١٣ز ، ل ٢ ـ ٣ ٠**

( کۆمەڵەی گشـــتیکردنی خوێندەواریو چاککردنی ڕێنووس )و ( کۆمەڵەی هیڤی ) بایەخێکی تایبەتییان بە چارەسەرکردنی کێشـــەکانی ڕێنووسی کوردی دابوو ، ئەو بەرهەمەی لەم بارەیەوە هێنابوویانە ئەنجام ، ئەلفوبێیەك بوو لەسەر بناغەی پیتەکانی عەرەبیو هەشت پیتی نوییان بۆ زیاد کردبوو ٠ پیتەکانی ئەم ڕێنووســـە بەیەکەوە نەدەلکان ٠ پیتە نوێ پێشنیارکراوەکانیش سەرو بۆرو ژێرو ئەلفو واوی کراوەو واوی درێژو یێی لارو دیفتۆنگی ( وێ ) بوون ، کە نیگارەکانیان شێوەیەکی تایبەتییان هەبوو و وەك ئەوانە بوون ، کە لە نووسینی ئەمڕۆی کوردیدا هەن ٠٠٠ دەربارەی کێشەی نووسینی کوردیو ڕێگەی چارەسەرکردنیو پێویستیی گرنگی پێدانیو خستنە پێش چاوی ئەو ئەلفوبێ نوێیە لە ژمارە ( ٣ )ی گۆڤاری « ڕۆژی کورد »دا بـە زمـانی تورکی ئـەو وتـارە بـە نـاوی « پیتەکانمانو ئاسانکردنی خوێندنەوە »ەوە بڵاوکراوەتەوە ٠

« تعمیم معارف و اصلاح حروف » :

**٧٣٣ ـ جمعیت محترمەسی طرفنـدن وارد اولمشـــــدر : روژ کرد مجموعەسی مدیریت علیه سنه ، گۆڤاری « ڕۆژی کورد » ، ئەستـــەموول ، ٦ی تەمووزی ١٩٢٩ك / ١٩١٣ز ، ل ١٣ ـ ١٦ ٠**

ئـەمە نامەیەکە ، کۆمەڵەی گشتیکردنی خوێنـدەواریو ڕێنووس سەبارەت بە کێشەی نووسینی کوردیو ڕێگەی چارەسەرکردنیو پەسەندکردنی ئەو ئەلفوبێ نوێیە بۆ گۆڤاری « ڕۆژی کورد »یان کردووە ( بڕوانە : باسی ژ ۷۳۲ ) •

**« ژین » :**

**۷۲٤ ــ کوردجە حرفلری ، گۆڤاری « ژین » ، ئەستەموول ، ژ ۱۸ ، ۸ی مایسی ۱۳۳۵ك •**

گۆڤاری « ژین »ی ئەستەموول لە ژمارە ( ۱۸ )یدا ، کە ڕێکەوتی ۸ی مایسی ۱۹۱۹ دەکات لیستەی ئەلفوبێیەکی کوردی بلاوکردەوە[۱۱] • لەو ئەلفوبێیەدا پیتە بزوێنەکانو پیتـە نەبزوێنەکان جیاکراونەتەوەو بـۆ یەکەمیان ( ۸ ) پیتو بۆ دووەمیان ( ۳٤ ) پیت دیاریکراوە • لە نێو پیتـە بزوێنەکاندا نیگاری ( ە ، ی ، و ) هەیە •

## کەمال بادیللی :

**۷۲٥ ــ کورتچە گرامەری ، ئەنقەرە ، ۱۹٦٥ •**

ساڵی ۱۹٦٥ لە ئەنقەرە کەمال بادیللی بەناوی « کورتچە گرامەری » ـ واتـە ( ڕێزمـانی کوردی )یەوە کتێبێکی گەورەی بلاوکردەوە • ئـەم لێکۆڵینەوەیە ( ۱٦۰ ) لاپەڕەیەو بریتییە لە : پێشەکی ( ل ۳ ـ ۷ ) ، کـە بەگشتی لە زمانی کوردیو دیالێکتەکانی دواوە تێیـدا • دیالێکتـەکـانی زمانی کوردی بەسـەر ( لوڕی ، گۆرانی ، کـەلـهوڕی ، کرمـانجی )دا

---

(۱۱) ئەو ئەلفوبێیە لە ژمارەکانی تریشدا بلاوکراوەتەوە . بـە دوا ژمـارە ( ۱۸ )دا ، من تەنیا ژمارە ( ۱۹ )و ( ۲۱ )م بینیوەو لـە هەردووکیاندا هـەیـە •

دابەش کردووە • لە لاپەڕە (٨ ـ ١٤)دا هەندێ زانیاری لەبارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە خستۆتە پێش چاوو لە دەنگەکانی کۆڵیوەتەوە • بەشێکی فراوانی (ل ١٥ ـ ١٥٠) لەبارەی مۆرفۆلۆژییەوەیە • دوا بەشی ئەم کتێبە (ل ١٥١ ـ ١٦٠) سەبارەت بە سینتاکسە •

م • م • :

**٧٣٦ ـ اساس ، گۆڤاری « کوردستان » ، ئەستەموول ، ژ ٢ ، ٩ی شوباتی ١٣٣٥ﻫ ، ل ٢١ ـ ٢٢ ؛ ژ ٤ ، ١٥ی مارتی ١٣٣٥ﻫ ، ل ٤٢ ـ ٤٣ ؛ ژ ١٠ ، ٣٠ی حوزەیرانی ١٣٣٥ﻫ ، ل ١٢٦ ـ ١٢٧ ؛ ژ ١٥ ، ٩ی تشرینی یەکەمی ١٣٣٥ﻫ ، ل ١٩٣ ؛ ژ ١٦ ، ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٣٣٥ﻫ ل ٢٠١ ـ ٢٠٣ ؛ ژ ١٨ ، ؟ ، ل ٢٢٩ ؛ ژ ١٩ ، ٢٩ مارتی ١٣٣٦ﻫ ، ل ٢٤٥ ـ ٢٤٦ •**

ئەمە زنجیرە وتارێکی محەمەد میهرییە بەناو « أساس »ەوە لە ژمارە (٢ ، ٤ ، ١٠ ، ١٥ ، ١٦ ، ١٨ ، ١٩)ی گۆڤاری « کوردستان »ی ئەستەمووڵدا ، سالی ١٩١٩ ـ ١٩٢٠ بلاوی‌کردۆتەوەو باسی ڕێزمانی کوردی‌یە •

لە ژمارە (٢)دا هەندێ ڕای گشتی لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە خستۆتە پێش چاوو ئنجا دەڵێ : هەوڵی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردی دەکرێ بە دوو بەشەوە ـ ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاوایی ••• ڕۆژئاوایی زووتر دەستی پێ‌کراوە •

لە ژمارە (٤)دا وا ڕادەگەیەنێ ، کە ئەوەی دەربارەی ڕێزمانی کوردی لە ڕۆژهەڵات نووسراوە زوربەی چاپ‌نەکراوە • ئەوەی لە لایەن (حاجی فخر المالیکی ئەردەڵانی ناضری مالیەی ئێران)ەوە نووسراوە ، چاپ‌کراوە • ئەم کتێبە کە (٣٠) سالێك لەمەوبەر چاپ‌کراوە من تا ئێستا نەمبینیوە ••• (بڕوانە : باسی ژ ٩٨٥) • لە کۆتایی ئەم بەشەدا دێتە سەر

باسی کتیبەکەی خۆی‌و دەڵێ : من کە باسی شـێوەکانی کوردی دەکەم‌و نموونەیان لێ دەهێنمەوە مەبەستم یەکخستنیانە ٠

لە ژمارە ( ١٠ )دا بـاسـی چۆنیەتی دانانی کتیبەکەی دەکاو دەڵێ : هەرچەندە پێویـست بوو کارێکی‌وا لەلایەن لیژنەیەکەوە بکرێ ، ئەگەرچی ئەمە بۆ کورد هەڵنەکەوتووە ، بەڵام منیش درێغیم نەکردووە ٠٠٠ پاشـان باسی گیروگرفتی نووسینی کتیبەکەی دەکاو بەتایبەتی ئەوەی کە نەیزانیوە کام شێوە بکا بە بناغە ٠

لە ژمارە ( ١٥ )و ( ١٦ )دا باسی چاوگی کوردی کردووەو بەسـەر چەند جۆرێکدا دابەشی کردوون ٠

ئەوەی لە ژمارە ( ١٨ )دایە دەربارەی کرداری کاتی ئێستاو کرداری فەرمانەوەیە ٠

**٧٣٧ – عرفان ، گۆڤاری (( کوردستان )) ، ئەستەموول ، ژ ١ ، ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٣٣٥ك ، ل ١٢ ؛ ژ ٢ ، ٩ی شـــوباتی ١٣٣٥ك ، ل ٢٢ – ٢٤ ؛ ژ ٤ ، ١٥ی مارتی ١٣٣٥ك ، ل ٤٣ – ٤٤ ؛ ژ ١٠ ، ٣٠ی حوزەیرانی ١٣٣٥ك ، ل ١٢٥ – ١٢٦ ؛ ژ ١٥ ، ٢٩ی تشـــرینی یەکەمی ١٣٣٥ك ، ل ١٨٩ – ١٩٠ ؛ ژ ١٦ ، ٢٧ی تشـــرینی دووەمی ١٣٣٥ك ، ل ٢٠٤ – ٢٠٥ ؛ ژ ١٨ ، ؟ ، ل ٢٢٧ – ٢٢٨ ؛ ژ ١٩ ، ٢٩ی مـــارتی ١٣٣٦ك ، ل ٢٤٤ – ٢٤٥[١٢] ٠**

ئەمەش دیســـــان زنجیرە وتـارێـکی محەمەد میهری‌یە بەناوی « عیرفان »ەوە لە ژمارە ( ١ ، ٢ ، ٤ ، ١٠ ، ١٥ ، ١٦ ، ١٨ ، ١٩ )ی گۆڤاری « کوردستان »ی ئەستەموولدا ، کە ڕێکەوتی ساڵانی ١٩١٩ – ١٩٢٠ دەکات بڵاوی کردۆتەوە ٠

---

(١٢) ڕەنگە چ ئەم وتارەو چ وتاری « اســـاس » بەشی‌تریان هەبێ ٠٠٠ جا ئێمە لەبەرئەوەی چەند ژمارەیێکی گۆڤاری « کوردســـتان »مان دەستنەکەوت ، نەمانتوانی بگەینە ئەنجام ٠

له بەشی ژمارە ( ١ )دا لەوە دواوە ، کە ئەوەی لەلایەن زانایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە بۆ مەبەستی سیاسی بووە • لەنێو ئەو کارانەی ڕۆژهەڵاتدا باسی بەرهەمەکەی یووسف ضیا پاشای خالدی ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٣٠ ) کردووەو لەگەڵ ئەوەی بە کارێکی باشی داناوە ، ڕەخنەی توندو تیژیشی لێ گرتووە •

له بەشی ژمارە ( ٢ )دا ڕەخنە لە یووسف ضیا پاشا دەگرێ و دەڵێ ئەو عەرەبەو ویستوویەتی کورد بکا بە عەرەب ••• ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٣٠ ) • نووسەر لێرەدا چەند نموونەو بەڵگەیەکی مێژوویی دێنێتەوە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کورد میللەتێکی ڕەسەنەو نە عەرەبەو نە فارسە •

له ژمارە ( ٤ )دا وا ڕادەگەیەنێ کە یووسف ضیائەددین هەموو شێوەکانی کوردی نەزانیوەو بۆیە نەیتوانیوە بچێتە نێو زمانی کوردییەوە• لەبەرئەوەی خۆی عەرەبەو کورد نییە توانای ئەوەی نەبووە قووڵ بێتەوە • هەروەها دەڵێ : ئەگەر لە زمانی کوردیدا وشەی تورکی و عەرەبی ••• هەبێ واناگەیەنێ کە ئەم زمانە ڕەسەن نییە ، چونکە هەموو زمانێکی سەر ئەم زەمینە هەر بەوچەشنەیە •

له ژمارە ( ١٠ )دا باسی کتێبێکی چاپکراوی ( خەلیل خەیالی ) دەکات و دەڵێ ، ئەمیش هەڵەی ئەوەیە کە هەر دەربارەی شێوەی ژووروودە و وێڕای ئەوەش کتێبەکەی یووسف ضیائەددینی کردووە بە سەرچاوەی سەرەکیی خۆی ••• نووسەر پاشان دێتە سەر کتێبەکەی خۆی و دەڵێ : هەرچەندە بەشێکی زۆریم لەوەی ( خەلیل خەیالی )یەوە وەرگرتووە ، بەڵام زادەی

بیری خۆمم بەکارهێناوەو بە زمانی کوردیدا گەڕاوم • ئەگەرچی لە شێوەی جیاجیاوە وشەم کۆکردۆتەوە ، بەڵام ئەوەی منیش هێشتا لە ســەدا دەی زمانی کوردی نییە •

لە ژمارە ( ١٥ )شدا باسی هەندێ کێشەی ڕێنووسی کوردی کراوە •

لە ژمارە ( ١٦ )و ( ١٨ )و ( ١٩ )یشدا کۆمەڵێ وشــەی کوردیو عەرەبی هێنراوەتەوەو لەگەڵ یەکتر بەراوردکراون •

هەروەها ژ : ٥٠٣ •

## بـه زمـانی فارسی

احسان نوری :

**٧٣٨ ـ تاریخ ریشهٔ نژادی کرد ، چاپخانه سپهر ، ١٩٥٥ .**

ئەم کتێبە ( ١٤٥ ) لاپەڕەیە . لە لاپەڕەکانی ( ٨٢ ـ ٩٢ )دا لە ئەسڵی وشەی کوردو زمانی کوردیو شێوەکانی کوردی دواوە .

رشید یاسمی :

**٧٣٩ ـ کرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او ، تهران ، ؟ .**

نووسەر لە ( ل ٨٩ ـ ٩٩ )دا لەژێر سەرناوی « تحقیقات علماء در خصوص لفظ کرد »دا لە ئەسڵی وشەی ( کورد ) دواوە . لە ( ل ١٣٣ ـ ١٣٨ )یشدا بە ناوی « زبان »ەوە باسی زمانی کوردی کردووە . ( بڕوانە : باسی ژ ٢٦١ ) .

دکتر محمد تقی ابراهیم پور :

**٧٤٠ ـ دستور زبـان کردی ( اورامی ، سنندجی ، کرمانشاهی ، مهابادی ) ، طهران ، ؟ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٥١ ) لاپەڕەیە . سەرەتا ( ل ١ ـ ٣ ) باسی ئەلفوبێی کوردیە . لـە لاپـەڕە ( ٤ )یشـــەوە تـا کۆتایی دەربارەی بەشـەکانی ئاخاوتنە .

محمد صديق مفتی زاده :

**٧٤١ – درس زبان کردی ، جزوه ١ – ٢ ، تهران ، ٢٥٣٦ •**

ئەم بەرهەمە بەدەست نووسراوەو ئۆفسێت کراوەو ( ٦٠ ) لاپەڕەیەو بە ناوی « کۆمەڵەی فێرکردنی گشتیو زمانە کۆنەکان لە کۆلێژی ئەدەبو زانستە ئینسانییەکانی زانکۆی تاران »ەوەیە • بریتییە لە پێشەکییەکی کورت بە ناوی « مێژوویەکی کورتی زمانی کوردی »یەوەو باسی فۆنەتیکو سینتاکسو مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردی •

مصطفی خرم دل :

**٧٤٢ – صرف دستور زبان کردی سورانی ، تبریز ، ١٣٤٧ ك / ١٩٦٨ ز •**

**هەروەها ژ : ١٠٨٢ •**

## بـه زمـانی ڕووسی

ڤ · ئی · ئابابیێڤ :

**٧٤٣ ـ دیسان دەربارەی دۆزینەوەیەکی درەنگ ، « کێشـــــــەی زمانەوانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٥ ، ژ ٥ ، ل ١٦٨ - ١٦٩ ·**

ئەم نووسینە باسی وتاری ( D. N. Mackenzie, Gender in Kurdis, BSOS, 1954, Vol. 16, pt. 3, pp. 528-541) دەکات ·

یو · یو · ئاڤالیانی :

**٧٤٤ ـ جۆرەکـانی واتـای کرداری ڕابوردووی نزیـك لـــه زمـانە ئێرانییەکانـدا ( بـــه کەرەســـــتەی زمـــانی کوردی ) ، « کارەکانی زانکۆی ئوزبەکستان » ، ١٩٥٦ ، ب ٦٢ ، ل ١٤١ - ٢٣٣ ·**

نووسەر لەم وتارەدا بە کەرەستەی زمانی کوردی لە جۆرەکانی واتای دەمی ڕابوردووی نزیك لە زمانە ئێرانییەکاندا کۆڵیوەتەوە ·

**٧٤٦ ـ دابەش‌کردنی کرداری نـاســــــــــادەو کێشەی تێپەڕاندنو تێنەپەڕاندن لـــه کرمانجیدا ، کتێبی « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانســــــی فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، لینینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٣ - ٥ ·**

ئاڤالیانی لـەم کورتـە وتارەدا لـە شێوازی دابـەش‌کردنی کرداری ناسادەو هەندێ کێشەی کرداری تێپەڕو تێنەپەڕ لـە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا دواوە ·

**٧٤٧ ـ دەســـتووری ڕێژەی کردار لـە زمـانی کوردیدا ( دیالێکتی کرمانجیی خواروو ) ، (( کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی ڕۆژهەڵاتناسان )) ، باکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ٦ ـ ٧ •**

ئەم وتارە کورتەی ئەو باســـــەی ئاڤالیانی‌یە ، کـە لـە کۆنفرانسی ڕۆژهەڵاتناساندا ، کە لە ( ١١ تا ١٦ )ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لە باکۆ بەسترا ، خوێندوویەتی‌یەوە • کورتەی ئەم باسانە لەلایەن زانکۆی ئازربایجانـەوە چاپکراوە •

**٧٤٨ ـ کرداری ناســـــادە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری (( کارەکانی زانکۆی ئوزبێکستان )) ، ب ٩٥ ، ١٩٥٩ ، ل ١٣٧ ـ ١٥٠ •**

نووســەر لەم وتارەدا باسی ئەو کردارە نادادانە دەکات ، کـــە بـە یاریدەی ناو ڕۆنراون •

**٧٤٩ ـ کرداری نادادەو کێشەی کرداری تێپەڕ و تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا ، (( کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی )) ، لێنینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٣ ـ ٥ •**

ئەم نووســـینە کورتەی ئەو وتارەیە ، کە یو • یو • ئاڤالیانی لـەو کۆنفرانسە زانستی‌یەدا خوێندوویەتی‌یەوە کە شارەزایانی زمانە ئێرانی‌یەکان سالی ١٩٦٢ لە زانکۆی لێنینگراد گرتیان •

**٧٥٠ ـ کرداری ناســـادەی لـە ناوو کرداری یاریدەدەری ( کردن ) سازبوو لە زمانی کوردیدا ، (( کارەکانی زانکۆی ئوزبەکستان )) ، ١٩٥٩ ، ب ٩٥ ، ل ١٦٩ ـ ١٧٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو جۆرە کردارە نادادانەی زمانی کوردی کردووە کە لە ناوێکو کرداری ( کردن ) پێکهاتوون •

**٧٥١ ـ کەرەســـتە لەبارەی کرداری ناســـادەی زمانی کوردی‌یەوە ، سەمەرقەند ، ١٩٦٢ •**

ئەم کتێبە ( ١٠٠ ) لاپەڕەیەو دەربارەی ڕۆنانو جۆرو واتای کرداری نادادە لە زمانی کوردیدا دەدوێ •

**٧٥٢ ـ كێشـــەی جیاكردنەوەی كرداری لێكدراو و ئیدیۆمی كرداری ( بە كەرەستەی زمانی كوردی ) ، گۆڤاری (( كورتەی دەنگوباســـی زانكۆی سەمەرقەند )) ، سەمەرقەند ، ١٩٥٨ ، ل ٤٠ – ٤٢ •**

ئەم وتارە كـە لەبارەی جیاكردنەوەی كرداری لێكدراوو ئیـدیۆمی كرداری‌یەوە دەدوێ ، كورتەی ئەو باسەیە كە یو • یو • ئاڤالیـانی لـە كۆنفرانسی چوارەمی زمانناسی لە سەمەرقەند خوێندوویەتی‌یەوە •

**٧٥٣ ـ لەبارەی جۆرەكانی واتای كرداری ڕابوردووی بـەردەوامـەوە لە زمانە ئێرانی‌یەكاندا ( بە كەرەستەی زمانی كوردی ) ، (( كارەكانی زانكۆی ئوزبەكستان )) ، ١٩٥٩ ، ب ٦٠ ، ل ٧٩ – ٩٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا بە كەرەستەی زمانی كوردی باسی جۆرەكـانی واتـای كرداری دەمی ڕابوردووی بەردەوامی لـە زمانە ئێرانی‌یەكـانـدا كردووە •

**٧٥٤ ـ لـەبـارەی هەندێ ڕێگەی گەشەكردنی ڕۆنانی كردارەوە لـە دیالێـكتی ژووروو‌ی زمـانی كوردیـدا ، (( ئیدیۆمو شـــێوازو پێكهاتنی ڕێزمانیی زمانە ڕۆژهەلاتی‌یەكان )) ، سەمەرقەند ، ١٩٧٢ ، ل ٢٨ – ٤٠ •**

ئاڤالیانی لەم وتارەدا باسی ئـەو ڕێگایانەی كـردووە كـــە كرداری داڕێژراوو لێكدراویان پێ سازدەكرێ‌و بەمە جۆری گەشەكردنی كرداری دەست‌نیشان كردووە •

**٧٥٥ ـ واتـای كرداری ڕابوردووی نزیك لـە زمـانـە ئێرانی‌یەكاندا ( بە كەرەستەی زمانی كوردی ) ، لـە كتێبی (( كۆبوونـەوەی زانســـتی پرۆفیسۆرانو مامۆستایانی زانكۆی ئوزبەكستان لە نیســـانی ١٩٥٦دا – كورتەی باسەكان )) ، سەمەرقەند ، ١٩٥٦ ، ل ٩٥ – ٩٦ •**

نووسەر لەم كورتەیەدا بە كەرەستەی زمانی كوردی باســـی واتای كرداری دەمی ڕابوردووی نزیكی كردووە لە زمانە ئێرانی‌یەكاندا •

**٧٥٦ ـ هەندێ حالەتی ئیدیۆمی كرداری لە زمانی كوردیدا ، گۆڤاری (( كارەكانی زانكۆی ئوزبەكستان )) ، ژ ١١٢ ، ١٩٦١ ، ل ٨٥ – ٩٩ •**

ئەم وتارە لەو ئیدیۆمانە دەدوێ ، کە کردار دەوری سەرەکی دەبینێ لە ڕۆنانیاندا .

**٧٥٧ – هەندێ کێشەی بیناى وشەی ڕووسیو جیهانی لـە زمـانی تاجیکیدا ، « کورتەی هەواڵەکانی زانکۆی ئوزبەگستـــــان » ، ١٩٥٩ ، ل ٧٢ – ٧٧ .**

لە لاپەڕە ( ٧٦ )ی ئەم وتارەدا باسی ئەو وشە کوردییانە کراوە کە چوونەتە زمانی تاجیکییەوە .

## ئێ . م . ئۆرانسکی :

**٧٥٨ – زمانە ئێرانییەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .**

ئەم کتێبە ( ٢٠٣ ) لاپەڕەیە . نووسەرەکەی لەژێر سـەرناوی « زمانی کوردی » ( ل ١٣٥ – ١٣٩ )دا دەربارەی ناوچەکانی کوردنشینو دەورەکانی زمانی کوردیو لێکۆڵینەوەی کوردناسانو ڕێزمـانی کوردی کۆڵیوەتەوە . لە باسی « زمانە ئێرانییەکانی سەرووی ڕۆژئاوا » ( ل ١٧٣ – ١٧٤ )یشدا کەمێ لە زمانی کوردی دواوە .

## ئەنسیکلۆپیدیا :

**٧٥٩ – ئەنسیکلۆپیدیای بچووکی سـۆڤێتی ، چاپی سێیەم ، ب ٥ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .**

لە لاپەڕە ( ٢٦٧ )دا باسی زمانی کوردی کراوە .

**٧٦٠ – ئەنسیکلۆپیدیای سۆڤێتی ، ب ٢٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٥١ .**

**« زمانی کوردی »** ( ل ٩١ ) .

**٧٦١ – ئەنسیکلۆپیدیای گەورەی سۆڤێتی ، چاپی سێیەم ، ب ١٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ .**

لە لاپەڕە ( ٧١ )دا باسی زمانی کوردی کراوە .

ئەورەحمانی حاجی مارف :

**٧٦٢ - لەبارەی فەرهەنگەکانی مامۆستا گیوی موکریانییەوە ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست » ، لێنینگراد ، ١٩٧٢ ، ل ١٧١ - ١٧٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی فەرهەنگی « ڕابەر »و « کۆلکەزێڕینە »و « مەهاباد »... ی کردووەو لەدەوری مامۆستا گیوی موکریانی لە مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا دواوە .

**٧٦٣ - مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی‌و شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی - کوردی ، ١٩٧٢ .**

ئەم نامیلکەیە کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەیەتی‌و ( ٢١ ) لاپەڕەیە . لە پێشەکی‌و دوو بەش‌و سێ فەسڵ‌و ئەنجام‌و پاشبەند پێکهاتووە .

ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم :

**٧٦٤ - ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٥ .**

ئەمە کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەیەتی‌و ( ٢٣ ) لاپەڕەیەو بریتییە لە پێشەکی‌و سێ بەش‌و ئەنجام . سێ بەشەکەش ئەمانەن : ١ - ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بە ئامراز لە ناو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوودا ؛ ٢ - ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بێ‌ئامراز لەنێو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوودا ؛ ٣ - دەوری وشەی تەناسوبی لەنێو ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتوو و ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەریدا .

ل . ئا . پیرێیکۆ :

**٧٦٥ – بەراوردکردنی تایبەتیتی کرداری ڕابوردووی تێپەڕ لە زمانی کوردیو تالیشی‌دا ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ .**

ئەمە کورتەی نامەی دوکتۆری‌یەو ( ١٦ ) لاپەڕەیە .

ڕ . ن . تسابۆلۆڤ :

**٧٦٦ – لەبارەی مێژووی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٦ .**

ئەم کتێبە ( ١٠٤ ) لاپەڕەیە . دەربارەی پەیدابوونو گۆڕانو گەشەکردنی دەنگە بزوێنەکانو کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردی‌یە .

**٧٦٧ – لەبارەی مێژووی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .**

ئەم کتێبە ( ٩٢ ) لاپەڕەیە . دەربارەی پەیدابوونو گۆڕانو گەشەکردنی بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی کوردی‌یە .

ئی . ئی . تسوکەرمان :

**٧٦٨ – ئەندامی نادیاری کۆ لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « زمانناسیی سۆڤیەتی » ، لینینگراد ، ١٩٣٧ ، ب ٤ ، ل ١٠١ – ١٠٣ .**

ئەم وتارە لەو حاڵەتانە دەدوێ ، کە چۆن ناو بێ‌ئەوەی نیشانەی کۆی پێوەبێ مانای کۆ دەگەیەنێ .

**٧٦٩ – خاسیەتی ڕستەی نیهاد ڕستەیی لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری فەلەستین » ، ب ١٢ ، ژ ٧٦ ، مۆسکۆ – لینینگراد ، ١٩٦٥ ، ل ١٦٠ – ١٦٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا لەسەر بناغەی هەندێ تێکستی فۆلکلۆر لەو جۆرە نیهادانە دواوە ، کە نە بە وشەیەك یان بە دەستەواژەیەك هاتوون ، بەڵکو بە ڕستەیەکی سەرلەبەر دەربڕراون .

**٧٧٠ ــ دۆخەکانی ناو لـە بەشــە دیالێکتی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیێتدا ، لینینگراد ، ١٩٣٩ ، ل ٤ ٠**

ئەمە کورتەی نامەی دوکتۆری یەکەیەتی ٠

**٧٧١ ــ دۆخەکانی ناو لـە شێوەی کوردیی خۆراساندا ، « نووسراوە دێرینەکانو مەســـــلـەی مێژووی کولتووری گـەلانی ڕۆژهـەلات » ، لینینگراد ، ١٩٧٣ ، ل ١٤٢ ــ ١٤٤ ٠**

نووسەر لێرەدا لە دۆخی ڕاستەوخۆ و دۆخی تیانی ناو بە بێ نیشانەو لەگەڵ نیشانەی کۆو نەناسیاوی دواوە ٠

**٧٧٢ ــ دوو کتێبی ڕێزمانی پرۆفیســــــۆر خاچاتۆریان ، گۆڤاری « زمانناسیی سۆڤیەتی » ، لینینگراد ، ١٩٧٧ ، ب ٤ ، ل ١٥٣ ــ ١٧٢ ٠**

ئـەم وتـارە ڕەخنـەیـە لـە : ١ ــ کتێبی « زماننامە کورمانجی »ی پرۆفیسۆر خاچاتۆریان ، کـە ساڵی ١٩٣٢ لە یەریڤان بڵاویکردۆتـەوە ؛ ٢ ــ « زماننامە ژە کورمانجی » کە پرۆفیسۆر خاچاتۆریانو حاجی جندی ساڵی ١٩٣٥ لە یەریڤان چاپیانکردووە ٠

**٧٧٣ ــ دەربارەی هەندێ تایبەتێتی دووەم پاشکۆ لە زمانی کوردیدا ، « بیرو زمان » ، مۆسکۆ ، ١٩٤٨ ، ب ١٠ ، ل ٣٦٤ ــ ٣٧٥ ٠**

**٧٧٤ ــ دیـارکردنی واتـای کرداری تێپـەڕ لـە زمـانی کوردیدا ، « گۆڤاری فەلەســتین » ، ب ١١ ، ژ ٧٤ ، مۆسکۆ ــ لینینگراد ، ١٩٦٤ ، ل ٣٩ ــ ٤٤ ٠**

نووســـەر لـەم وتـارەدا لە ڕێگەی هێنانەوەی چەند نموونەیەکی کرداری تێپـەڕو تێنـەپـەڕەوە لــە هـەنـدێ فـەرهــەنگی کوردیو بەراوردکردنیانو نیشاندانی دەوریانەوە هەوڵیداوە ماناو واتای کرداری تێپەڕ دەستنیشان بکات ٠

**٧٧٥ ــ ڕســـتەی خاوەنێتی لـە بەشـــە دیالێکتی خۆراساندا ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات » مۆسکۆ ، ١٩٧٠ ، ل ١٦٩ ــ ١٧١ ٠**

نووســـەر لـەم وتارەدا لـە ڕێی کرداری « بوون »ەوە خـاوەێتی باس کردووەو لە دۆخی ئیزافە دواوە •

**٧٧٦ – ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ •**

ئەم کتێبە ( ٢٤٠ ) لاپەڕەیەو دەربارەی کردارە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا •

**٧٧٧ – سەرنج لەبارەی فۆنەتیکی زمـانی کوردییەوە ، « کۆکـراوەی ئێرانناسان » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ١٥٩ – ١٦٥ •**

نووســـەر لـەم وتـارەدا لـەبـارەی دیـاردەی بوونی ( i ) بـە ( ی – y )یەوە دواوە •

**٧٧٨ – شـــوێنی وشـــەی ســـەرەکی لە دەستەواژەی دژواتادا ، « گۆڤاری فەلەستین » ، مۆســـکۆ – لێنینگراد ، ١٩٦٢ ، ب ٧ ، ژ ٧٠ ، ١٩٥٩ – ١٩٦١ •**

ئەم کورتە وتارە لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی دەستەواژەی وەك : « دایكو باوك » ؛ « شـــەوو ڕۆژ » ؛ « ژنو پیـاو » ؛ « ئـەرزو ئاسمان » ••• دامەزراوە •

**٧٧٩ – شێوەی کوردیی خۆراسانیو لێکۆڵینەوە لە تێکســـتەکانی ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ ، ل ١٦٠ – ١٦٦ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو کەرەستەی فۆلکلۆرە دەکات ، کە بە شێوەی کوردیی خۆراسـانـەو کۆیکردۆتەوەو لەگـەڵ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیدا بۆ چاپ ئامادەی کردووە •

**٧٨٠ – کۆی ناو لە بەشە دیالێکتی خۆراســـــانـدا ، « زمانناسیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٨١ ، ل ٢٣٢ – ٢٣٧ •**

نووسەر لەم وتارەدا باسی ئەو نیشانانەو ئەو حاڵەتانەی کردووە ، کە لە بەشە دیالێکتی کوردیی خۆراساندا کۆ سازدەکەن •

**٧٨١ ـ لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە ، گۆڤاری « کارەکانی ئامۆژگـــای زمانناسی » ، ١٩٥٦ ، ب ٤ ، ل ٥ – ٥٨ .**

ئەم وتارە لەبارەی جنسەکانی ناوەوەیە لە زمانی کوردیدا .

**٧٨٢ ـ لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە ، لە کتێبی « زمانە ئێرانییەکان » ، ب ٢ ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٥٠ ، ل ٧٨ – ١٤٤ .**

ئەم نووسینە بریتییە لە دوو باسی گەورەو بایەخدار : ١ ـ گەردانی کرداری تێپەڕ ؛ ٢ ـ حالەتەکانی ناو .

**٧٨٣ ـ لەبارەی یەکێتی ڕەگەزی نیشانەی کرداری کاتی ئێســـــتاو حالەتی حازرەوە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروی زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کێشەی ڕۆژهەلاتناسی » ، ١٩٥٩ ، ب ٢ ، ل ١٤٨ – ١٥٥ .**

ئـەم وتارە لەسەر لێکدانەوەی ڕێژەی : ١ ـ ئـەز بکەڤم ، ئـەزێ بکەڤم ؛ ٢ ـ ئەز بکەتاما ، ئەزێ بکەتاما ... سازکراوە .

**٧٨٤ ـ مـانـای فۆرمی لێکدراو ( بـە کەرەستەی زمانی کوردی ) ، « گۆڤاری ئەنجومەنی زانستی ئامۆژگای زمانناسی » ، لێنینگراد ، ١٩٦٣ ، ل ١٤ – ١٥ .**

ئەم نووسینە کورتەی ئەو وتارەیە کە تـــــــوکەرمان لە کۆڕێکی فراوانی ئەنجومەنی زانـــــــــتی ئامۆژگـای زمـانـنـاسی لـە لێنینگراد خوێندوویەتییەوەو بـە کەرەستەی زمانی کوردی واتـاو مانای وشـــەی لێکدراوی لێکدراوەتەوە .

**٧٨٥ ـ نیشانەی نەناسیاویی کۆ لە بەشە دیالێکتی خۆراســــاندا ، گۆڤاری « فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ١٠٧ – ١١٠ .**

نووســـەر لەم وتارەدا دەربارەی نیشـــانەی ( ینی / نی )ی کۆی لەناسیاوی دواوە .

**٧٨٦ ـ هاوڕەگەزایەتیی نیشانەی کاتی ئایندەو نیشـــانەی حالەتی غائیب لە زمانی کوردی ( کرمانجی )دا ، « کێشەی ڕۆژهەلاتناسی » ، ١٩٥٩ ، ژ ٢ ، ل ١٤٨ – ١٥٥ .**

نووسەر لەم وتارەدا ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە لە زمانی کوردی
( دیالێکتی ژووروو )دا نیشانەی کاتی ئایندەو نیشانەی دۆخی غائیب لـە
یەك سەرچاوەوە هاتوون •

**هەروەها ژ : ٧٨٧ ، ٨٢٨ ، ٨٢٩ ، ٨٣٠ •**

ئی • ئی • تسوکەرمانو ژ • س. موسیلیان :

**٧٨٧ ـ فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ئەکادیمی ئی • ئـا • ئۆربیلی ، « کورتەی وتارەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی لینینگراد » ، مارت ١٩٦٦ ، ل ٦٩ ـ ٧٠ •**

نووسەران لەم وتارەدا دەربارەی ناوەرۆكو بابەخی دەستنووسی ئەو
فەرهەنگە کوردی ـ ڕووسی‌یەی ئەکادیمی ئی • ئا • ئۆربیلی دواون ، کە
لە ساڵانی بیستدا نووسیویتیو ئێستـــا لەلایەن کارگێڕانی بەشی کوردی
لینینگرادەوە بۆ چاپ ئامادەکراوە •

چەرکەزی بەکۆ ( چ • خ • باکاییێف ) :

**٧٨٨ ـ بنچینەی ڕێنووسی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٢ •**

ئەم کتێبە ( ٢٧٢ ) لاپەڕەیەو باسی چۆنیەتی نووســینی کوردی بـە
ئەلفوبێی ســــــلاڤی دەکاتو بریتی‌یە لـە : پێشـــــەکی ( ل ٣ ـ ٨ ) ؛
١ ـ ئەلفوبێو ڕێنووس ( ل ٩ ـ ٦٠ ) ؛ ٢ ـ خالبەندی ( ل ٦٠ ـ ٧٠ ) ؛
٣ ـ فەرهەنگی ڕاستنووسینی وشـە ( ل ٧١ ـ ٢٠١ ) ؛ ٤ ـ هـەنـدێ
تێکستی کوردی ( ل ٢٠٢ ـ ٢٦٩ ) •

**٧٨٩ ـ بەشـــــە دیالێکتی کوردەکانی تورکمەنســـــتان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢[١٣] •**

---

(١٣) بۆ وەرگرتنی زانیاری پتر دەربـارەی ئـەو بـەرهـەمـە ، بڕوانە :
د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چەرکەزی بەکۆ ( باکاییێف ) لە مەیدانی
کوردناسیدا ، « پاشکۆی عێراق » ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٢ ،

ئەم کتێبە ( ٢٧٠ ) لاپەڕەیەو برتی‌یە لە : پێشەکی ( ل ٣ - ٧ ) ؛ فۆنەتیك ( ل ٨ - ٢٧ ) ؛ مۆرفۆلۆژی ( ل ٢٨ - ١١١ ) ؛ وشەڕۆنان ( ل ١١٢ - ١١٩ ) ؛ سینتاکس ( ل ١٢٠ - ١٣٠ ) ؛ جیاوازیی شێوەی کوردەکانی تورکمەنستان لە زمانی ئەدەبیی کوردی ( ل ١٣١ - ١٣٥ ) ؛ پاشکۆ - تێکستو فەرهەنگۆك ( ل ١٣٦ - ٢٦٨ ) •

**٧٩٠ - پۆستپۆزشن وەك کەرەستەی دەربڕینی پێوەندیی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا ، لینینگراد ، ١٩٥٠ •**

ئەمە کورتەی نامەی دوکتۆری‌یەکەیەتی •

**٧٩١ - پۆستپۆزشی ( ڕا ) وەك کەرەستەی دەربڕینی ڕێزمانی لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کۆنگرەی زانایانی لاو » ، مۆسکۆ - لینینگراد ، ١٩٤٩ ، ل ٤١ - ٤٢ •**

ئەم نووسینە ، کورتەی ئەو وتارەیە ، کە مامۆستا چەرکەزی بەکۆ لە کۆڕی بیرەوەری ئەکادیمی ن • یا • ماردا خوێندوویەتی‌یەوە •

**٧٩٢ - دەوری پێوەندیی زمان لە پێشکەوتنی زمانی کوردەکانی سۆڤیەتدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ •**

ئەم کتێبە ( ٢٨٨ ) لاپەڕەیە • لە پێشەکی‌و چوار فەسڵ‌و هەندێ تێکستی فۆلکلۆرو فەرهەنگێکی وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا پێکهاتووە ••• لە پێشەکی‌دا ( ١ - ڕوونکردنەوەی پێوەندیی زمانان‌و ٢ - باسی کوردەکانی سۆڤێت )ی کردۆتە مەبەست ( ل ٧ - ٢١ ) • فەسڵی یەکەم بە ناوی « دەوری زمانی عەرەبی لە پێشخستنی زمانی کوردی‌دا »وەیە ( ل ٢٢ - ٤٨ ) • فەسڵی دووەم سەرناوی « دەوری زمانی تورکی لە پێشخستنی زمانی کوردی‌دا »ی وەرگرتووە ( ل ٤٩ - ٦٨ ) ؛ فەسڵی سێیەم « دەوری زمانی ئەرمەنی لە پێشخستنی زمانی کوردیدا » ( ل ٦٩ - ١٢٨ )و فەسڵی چوارەم « دەوری زمانی ڕووسی لە پێشخستنی زمانی کوردی‌دا » ( ل ١٢٩ - ١٤٦ ) •

**٧٩٣ – زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥[١٤] .**

ئەم کتێبە ( ٢٨٤ ) لاپەڕەیەو نووسەر بە شێوازێکی فراوان لە فۆنەتیك ( ل ١١ – ٢٧ )و مۆرفۆلۆژی ( ل ٢٧ – ٩٠ )و وشەڕۆنان ( ل ٩٠ – ٩٧ )و سینتاکس ( ل ٩٧ – ١٠٥ )ی شێوەی کوردەکانی ئازربایجان دواوەو ئنجا جیاوازیی بنچینەیی ئەو بەشە دیالێکتەی لەگەڵ زمانی ئەدەبیدا ( ل ١٠٥ – ١١٥ ) باس کردووەو لە کۆتاییشدا هەندێ تێکست ( ل ١١٦ – ١٨٩ )ی تۆمارکردووەو فەرهەنگێکی کوردی ( بەشە دیالێکتی کوردی ئازربایجان ) – ڕووسی داوە ( ل ١٩٠ – ٢٨١ ) ...

**٧٩٤ – کوردەکانی سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣[١٥] .**

ئەم کتێبە ( ٣٥٢ ) لاپەڕەیەو نووسەر تێیدا بەراوردی لەنێوان بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤیەتدا کردووە . لە پێشەکیدا ( ل ٥ – ٢٣ ) دەربارەی کوردەکانی سۆڤیێت و مێژووی لێکۆڵینەوە لە زمانیان دواوە . لە چوار فەسڵی گەورەدا لە : فۆنەتیك ( ل ٢٥ – ٥٦ ) ؛ مۆرفۆلۆژی ( ٥٧ – ٢٣٨ ) ؛ وشەڕۆنان ( ل ٢٣٩ – ٢٧٢ ) ؛ سینتاکس ( ل ٢٧٣ – ٣٠٧ )ی کۆڵیوەتەوە . لە کۆتاییشدا هەندێ تێکستی بڵاوکردووەتەوە .

**٧٩٥ – زمانی کوردی ، گۆڤاری « زمانە خاوەن نووسینە تازەکانی میللەتانی سۆڤیەت » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ ، ل ٤٦٨ – ٤٧٤ .**

ئەم وتارە لەبارەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە دەدوێ لە یەکێتی سۆڤیێت .

**٧٩٦ – لەبارەی کێشەی گەردانی سوبیەکتو ئۆبیەکتی کرداری تێپەڕەوە لە زمانی کوردیدا ، « کێشەی زمانەوانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٠ ، ژ ٤ ، ل ١٠٣ – ١٠٦ .**

---

(١٤) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢ .

(١٥) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢ .

**٧٩٧ - مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە ڕووسیاو یەکێتی سۆڤێت ، « لەبارەی مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانی‌یەکانەوە » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ١٠٠ – ١١٧ .**

مامۆستا بەکۆ لەم وتارەدا باسی زوربەی ئەو کارە زمانەوانی‌یانەی کردووە کە بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ڕووسیای قەیسەری‌و دوای شۆڕش لە یەکێتی سۆڤێت لەبارەی زمانی کوردیەوە نووسراون .

**٧٩٨ - هەندێ کێشەی سازبوونی زمانی ئەدەبیی کوردی یەکێتی سۆڤێت ، « کێشەی ئیدیۆم‌و شێوازو پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانە ڕۆژهەڵاتی‌یەکان » ، سەمەرقەند ، ١٩٧٢ ، ل ٥٣ – ٦٢ .**

نووسەر لەم وتارەدا باسی مێژووی ئەو ئەلفوبێ‌یانە دەکات ، کە کوردەکانی سۆڤێت بەکاریان‌هێناوەو لە پێشکەوتن‌و گەشەکردنی نووسین‌و سازبوونی زمانی ئەدەبیی ئەو کوردانە دواوە .

**٧٩٩ - هێز لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستاندا ، « کۆکراوەی ئێرانناسی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ل ١٦٦ – ١٧٢ .**

ئەم وتارە لەوە دەدوێ کە هێز ( النبرة Stress ) لە بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستاندا لە چ شوێنێکی وشەدا دادەنرێ‌و دەوری چی‌یە .

**هەروەها ژ : ١٠٧ .**

## ئا . س . چیکۆباڤا :

**٨٠٠ - سەرەتایێکی زمانناسی ، ب ١ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ .**

لە لاپەڕە ( ٢٠٢ )و ( ٢٠٤ )ی ئەم کتێبە ڕووسی‌یەدا باسی زمانی کوردی کراوە .

ل • ئا • خێتاگورۆڤ :

**٨٠١ ـ حاڵەتەکانی جنس لە زمانە ئێرانییەکاندا ، « نامەی زانایانی زانکۆی مۆسکۆ » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٩ ، ب ١ ، ژ ٢٠ ، ل ٥٠ ـ ٩٧ •**

لە لاپەڕە ( ٥١ ـ ٦٦ ، ٧٩ ـ ٩٧ )دا باسی حاڵەتەکانی جنس لە زمانی کوردیدا کراوە •

ف • دیتێل :

**٨٠٢ ـ سێ ساڵ گەڕان بە کوردستاندا ، گۆڤاری « وەزارەتی ڕۆشنبیریی میللی » ، ب ٤ ، پیترسبورگ ، ١٨٤٧ •**

ف • دیتێل سێ ساڵێك بە کوردستاندا گەڕاوەو کەرەستەیەکی زۆری فۆلکلۆرو ئەتنۆگرافیای خڕکردوەتەوە • لەم وتارەدا دەربارەی ئەو کەرەستانە دواوەو سەبارەت بە کوردستانو زمانی کوردیو دیالێکتەکانی نووسیویتی : « لە گەڕانەکەمدا ـ واتە لە دیاربەکرەوە تا سنووری سووریا ـ گەلێ مەسەلەی جوگرافیو ئەتنۆگرافی سەرنجیان ڕاکێشام • ڕێگاکەم بە ماردینو دیاربەکرو نەسیبەینو ئورفەدا تێدەپەڕی • ئەو ناوچانەی کە من پیایاندا دەگەڕام بەشێکی کوردستان بوون ، کە زۆر کەم ناسراون • لەبەرئەوەی تاکو ئێستا هیچ کەرەستەیەکی ئەتنۆگرافی وەهامان نییە دەربارەی خێڵەکانی ئەم هەرێمەی ئاسیا ، بۆیە لە لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکانیدا ، بەتایبەتی گرنگی بە باری جوگرافی ناوچەکە دەدەم • لە کۆکردنەوەی ئەو کەرەستانەدا زۆر زەحمەتم کێشاوە • بەگوێرەی ئەو کەرەستەیەی لامە ، نزیکەی ( ٣٠٠ ) خێڵی کورد هەیەو لەو باوەڕەدام کە لێکۆڵینەوەی تەواو لە کوردستانی ئەمڕۆ یارمەتیی ئەوەمان دەدا باشتر لە باری زووی ناوچەکە بگەین کە ئێستا بەشێکە لە تورکیا ( مەبەستی دەوڵەتی عوسمانییە ـ ئەوڕەحمان ) •••

ف • دیتێل کە دێتە سەر باسی زمانی کوردی دەڵێ : من بۆم دەرکەوت کە زمانی کوردی بەسەر زۆر دیالێکتدا دابەش دەبێتو لەم ڕووەوە هێشتا کەس هیچی نەنووسیوە • بەشێکی کوردستان لەژێر حوکمی تورکیادایە ، لەبەرئەوە ئاشکرایە ، کە زمانی تورکی کاری کردۆتە سەر زمانی کوردی ، هەروەك چۆن لە بەشەکەی ئێرانیشدا تەئسیری زمانی فارسی هەیە •

م • ب • ڕودێنکۆ :

**٨٠٣ – ئەرکی کرداری ( گریان ) لە تێکستی ئەدەبی کوردی سەدەکانی ناوەڕاستدا ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ) ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی کولتووری گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست » ، لینینگراد ، ١٩٧٢ ، ل ٢٠٠ – ٢٠٣ •**

نووسەر لەم وتارەدا لەبەر ڕووناکی داستانی « یوسف و زلێخا »ی سەلیم سلێمانو « مەمو زین »ی ئەحمەدی خانیو « لەیلو مەجنوون »ی حارسی بتلیسیدا لە ڕێژەی جۆربەجۆری کرداری « گریان » کۆڵیوەتەوە •

**٨٠٤ – دەربارەی هەندێ تایبەتێتی ڕێنووسی دەستنووسە کوردییەکان ، « زمانناسیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٨١ ، ل ١٩٨ – ١٩٩ •**

ئەم وتارە دەربارەی بەکارهێنانی هەندێ پیتی جیاوازە لە دوو دەستنووسی « یوسفو زلێخا »دا •

**٨٠٥ – هەندێ تایبەتێتی زمانی ئەدەبیی کوردی سەدەکانی ناوەڕاست ، گۆڤاری « فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ١٠٤ – ١٠٧ •**

نووسەر لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە داستانی « یوسف و زلێخا »ی سەلیمی سلێمانەوە هەندێ تایبەتێتی زمانی کوردیی ئەو سەردەمەی لە بەکارهێنانی وشەو ڕێژەدا دیاری کردووە •

زاریٚ یوسف ( ز • ئا • یوسوپۆڤا ) •

**٨٠٦ - ئەرکی پارتیکلی ( ئەوا )و ( وا ) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا ، (( نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی کولتووری گەلانی ڕۆژھەلاتی ناوەڕاست )) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ ، ل ١٦٦ - ١٦٨ •**

ئەم وتارە باسی ئەو ئەرکانە دەکات کە وشـــەی ( ئەوا )و ( وا ) بەجێیدێنن •

**٨٠٧ - ئەرکی جێناوی لکاوی ( یٚ ) لە زمانی کوردیدا ، (( کورتـەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی )) ، دووشەمبە ، ل ٣٢٥ - ٣٢٧ •**

ئەم وتارە بە نموونەوە لـەوە دەدویٚ کـاتیٚ جێناوی لـکاوی ( یٚ ) دەچێتە سەر پریپۆزیشنی : ( لە ، بە ، دە ) دەیانکاتە ( لیٚ ، بیٚ ، دیٚ ) •••

**٨٠٨ - بینای ئیزافە لە شێوەی سلێمانیدا ، (( زمانناسیی ئێرانی )) ، مۆسکۆ ، ١٩٨١ ، ل ٢٣٨ - ٢٤٢ •**

ئەم وتارە باسی ئەو نیشانانە دەکات ، کە لە شێوەی ســـــلێمانیدا ئیزافە سازدەکەن •

**٨٠٩ - پریپۆزیشنو پۆستپۆزیشن لە دیالێکتی خوارووی کوردیـدا ، لینینگراد ، ١٩٦٥ •**

ئەم کارە کورتەی نامەی دوکتۆری زاریٚ یوسفەو ( ١٩ ) لاپەڕەیەو لە سیٚ بەش پێکهاتووە : ١ - پێشەکی ؛ ٢ - خاســـیەتی ناو لـە ڕووی مۆرفۆلۆژیەوە ؛ ٣ - پریپۆزیشنو پۆستپۆزیشن •

**٨١٠ - پریپۆزیشنو پۆستپۆزیشن لە سۆرانیدا ، (( نووســـــراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژھەلات )) ، لینینگراد ، ١٩٦٥ ، ل ٥٤ - ٥٦ •**

ئەم وتارە بەکورتی باسی ئەرکو دەوری پریپۆزیشـنو پۆستپۆزیشن دەکات لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا •

**٨١١ ـ پۆستپۆزیشنی ( ەوە ) لە زمانی کوردیدا ( دیالێکتی سۆرانی ) ، « کورتەی هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاســـــیا » ، ژ ٦٨ ، ١٩٦٤ ، ل ٤٠ ـ ٤٧ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە شێوەو دەورو ئەرکی پۆستپۆزیشنی ( ەوە ) لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا دواوە .

**٨١٢ ـ دیالێکتی سابێمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٨٥ .**

ئەم کتێبە ( ١٤٤ ) لاپەڕەیەو بریتی یە لە : پێشەکی ( ل ٩ ـ ٢٠ ) ؛ ئەلفوبێو ڕێنووس ( ل ٢١ ـ ٢٤ ) ؛ فۆنەتیك ( ل ٢٥ ـ ٣٠ ) ؛ وشەناسی ( ل ٣١ ـ ٣٣ ) ؛ مۆرفۆلۆژی ( ل ٣٤ ـ ١٠٨ ) ؛ سینتاکس ( ل ١٠٩ ـ ١٣٠ ) ؛ پاشکۆ ( ل ١٣١ ـ ١٣٧ )(١٦) ...

**٨١٣ ـ فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی ، « نووســـــراوە دێرینەکانو مەســـەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەڵات » ، لێنینگراد ، ١٩٦٩ ، ل ١٦٧ ـ ١٦٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا کەمێ دەربارەی شێوەی کارکردنو شێوازی دانانی ئەو فەرهەنگە کوردی ( کرمانجیی خواروو ) ـ ڕووسی یە دواوە ، کە لەگەڵ قەناتی کوردۆدا خەریکی دانانی بوون ( بڕوانە : باسی ژ ١٠٥٢ ) .

**٨١٤ ـ کرداری کارا بزر لە زمانی کوردیدا ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی خواروو ) ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەڵات » ، لێنینگراد ، ١٩٧٣ ، ل ١٤٧ ـ ١٥٠ .**

ئەم وتارە باسی چۆنیەتی پێکهاتنی ڕێژەی کرداری کارا بزر لە کاتی ڕابوردوو و ڕانەبوردوودا دەکاتو تایبەتی نیشاندەدا .

---

(١٦) بۆ زانیاری پتر لەبارەی ئەو کتێبەوە ، بڕوانە : د . کوردســــتان موکریانی ، بەرهەمێکی نوێی زمانەوانی زەرێ یوســوپۆڤا ، ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ ٨٣٧ ، بەغدا ، ٢٤/٤/١٩٨٦ ، ل ٦ .

**٨١٥ – گرووپەکانی کردار لە بەشە دیالێکتی کوردیی سـلێمانیدا ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ل ٢٧٥ – ٢٧٩ .**

نووسەر لەم وتارەدا شەش گرووپ کرداری دیاریکردووەو نموونەی بۆ هەریەکێکیان هێناوەتەوەو لە کۆتاییشدا خشتەیەکی بۆ ڕێکخستوون . ( بڕوانە : باسی ژ ٢٦٣ ) .

**٨١٦ – لەبارەی تایبەتێتی بەکارهێنانی پرێپۆزیشنی ( بۆ )وە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا ، گۆڤاری « فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ١١١ – ١١٣ .**

ئەم وتارە بەکورتی باسی زوربەی ئەو تایبەتیانەی تێدا کراوە کە لە بەکارهێنانو دەورو گەیاندنی واتای پرێپۆزیشنی ( بۆ )دا هەیە .

**٨١٧ – لەبارەی هەندێ تایبەتێتی بەکارهێنانی پرێپۆزیشنەوە لە زمانی کوردیدا ، « نووسراوە دێرینەکانو مەسەلەی مێژووی کولتووری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٠ ، ل ١٧١ – ١٧٣ .**

نووسەر لەم وتارەدا لە چەند تایبەتێتییەکی پرێپۆزیشنی ( بۆ ، لە ، لێ ، پێ ، تێ )ی کۆلیوەتەوە .

**هەروەها ژ : ٢٦٣ ، ٢٦٤ ، ١٠٥٢ .**

## ل . زاگورسکی :

**٨١٨ – ئەلفوبێیەکانی قەفقاس ، « هەوالەکانی لقی قەفقاسیای کۆمەلی جوگرافی ڕووسی ئیمپراتۆری » تغلیس ، ١٨٨٧ ، ب ٩ ، ژ ٢ ، ل ١ – ٣٢ .**

لە لاپەڕە ( ٣ )ی ئەم وتارەدا باسی هەولی سەرنەکەوتووی سازاندنی ئەلفوبێی ئەرمەنی بۆ زمانی کوردی کراوە . لە لاپەڕە ( ١٥ )شدا باسی هەولی پ . لێرخ لە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینیدا بۆ زمانی کوردی بەرچاو دەکەوێ .

## زمانەکانی ئاسیاو ئەفەریقا :

**٨١٩ ـ زمانەکانی ئاسیاو ئەفەریقا ، ب ٢ ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .**

ئەم کتێبە کۆمەڵێك زانا نووسیویانە . بەرگی دووەم ( ٤٤٠ ) لاپەڕەیەو سەرپاکی باسی زمانە ئێرانییەکانە . لە لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانییە نوێکاندا کاتێ باسی لقی سەرووی ڕۆژئاوا کراوە ( ل ١١٠ ـ ١٥٦ ) دەربارەی فۆنەتیك‌و مۆرفۆلۆژی‌و سینتاکس‌و لێکسیك ...ی زمانی کوردی گەلێ زانیاری خراوەتە پێش چاو . ئەم بەشە ( ل . ئا . پیرێیکە ، د . ئی . ئێدێلمان ) نووسیویانە .

## ئی . ئا . سمیرنۆڤا :

**٨٢٠ ـ پێوەندیی ڕەگەکانی کردار لە زمانی کوردیدا ( دیالێکتی سۆرانی ) ، « کورتەی هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاسیا » ژ ٦٧ ، ١٩٦٣ ، ل ٣٨ ـ ٤٠ .**

نووسەر لەم وتارەدا دەربارەی پێوەندیی نێوان ڕەگی کردارو بناغەی کردار لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووەدا دواوە .

**٨٢١ ـ شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانییەکاندا ، لێنینگراد ، ١٩٧٤ .**

ئەم کتێبە ( ٢٢٤ ) لاپەڕەییە ، کە باسی شێوەی ژمارەی ناو لە تێکڕای زمانە ئێرانییەکاندا دەکات ، لە ( ل ١٥٨ ـ ١٩٠ )دا دەربارەی ژمارەی ناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا دواوە . ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٨٤٣ ) .

**٨٢٢ ـ گەردانی کرداری تێپەڕ لە دیالێکتی خوارووی کوردی ( سۆرانی )دا ، کتێبی « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، لێنینگراد ، ١٩٦٢ ، ل ٢٣ ـ ٢٤ .**

ئەم نووسینە کورتەی ئەو وتارەیە ، کە ئی • ئا • سمیرنۆڤا لەو کۆنفرانسە زانستی‌یەدا خوێندوویەتی‌یەوە ، کە شارەزایانی زمانە ئێرانی‌یەکان سالّی ١٩٦٢ لە زانکۆی لێنینگراد گرتیان • نووسەر لێرەدا بە چەند خالّێك شێوەی چۆنیەتی گەردانی کرداری تێپەڕی لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا باس‌کردووە •

**هەروەها ژ : ٨٢٣ ، ٨٥٨ •**

## ئی • ئا • سمیرنۆڤا ، ك • ڕ • ئەیووبی :

**٨٢٣ – فۆنەتیکی زمانی کوردی ( دیالێکتی موکری ) ، لێنینگراد ، ١٩٨٥ •**

ئەم کتێبە ( ٣٤٠ ) لاپەڕەیەو بەدوورو درێژی باسی گشت ڕوویەکی تێکڕای دەنگەکانی بەشە دیالێکتی کوردی موکری دەکات •

## س • ن • سۆکۆلۆف :

**٨٢٤ – زمانی ئاوێستا ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ •**

ئەم کتێبە ( ١٢٣ ) لاپەڕەیە • لە هەندێ شوێندا بەراوردکاری لەگەلّ زمانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ • ( بڕوانە : باسی ژ ٩٧٨ ) •

**هەروەها ژ : ٩٧٨ •**

## ف • س • سۆکۆلۆڤا :

**٨٢٥ – بەلّگەی نوێ دەربارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانی‌یەکان ، لە کتێبی « زمانە ئێرانی‌یەکان » ، مۆسکۆ – لێنینگراد ، ١٩٥٠ ، ل ٥ – ٢٨ •**

لە لاپەڕە ( ١٠ – ١٤ )دا نووسەر هەندێ بەلّگەی لەبارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە هێناوەتەوە •

**٨٢٦ ـ لەبارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکانەوە ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٥٣ .**

ئەم کتێبە ( ١٥٠ ) لاپەڕەیە . لە لاپەڕە ( ٧٨ ـ ١٠٣ )دا دەربارەی زمانی کوردەکانی تورکمەنستان کۆڵراوەتەوەو باسی بزوێنەکانو کۆنسۆناتنەکانی ئەو بەشە دیالێکتە کراوە . ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٨٥٩ ) .

**١٢٧ ـ لێکۆڵینەوە لەبارەی فۆنەتیکی زمانە ئێرانییەکانەوە ، لینینگراد ، ١٩٥٤ .**

ئەم نامیلکەیە ( ٣٦ ) لاپەڕەیەو کورتەی نامەی دوکتۆریی ناوکە . لە لاپەڕە ( ١٥ ـ ٢٠ ، ٣٢ ، ٣٥ )دا باسی فۆنەتیکی زمانی کوردی کراوە .

## ع . شەمۆ ، ئی . تسوکەرمان :

**٨٢٨ ـ لەبارەی کێشەی بزوێنی ( i )ی کوردییەوە ، گۆڤاری « نووسینو شۆڕش » ، ژ ١ ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٣٣ ، ل ١٧٩ ـ ١٨٠ .**

ئەم وتارە لەبارەی بوونو دەوری بزرۆکە ( کسرة مختلسە )ی ( i )ەوە دەدوێ .

## ع . شەمۆ ، ئی . تسوکەرمان ، ق . کوردۆ :

**٨٢٩ ـ دەربارەی کێشەی جنس لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « نووسینو شۆڕش » ، ژ ١ ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٣٣ ، ل ١٦٠ ـ ١٧٨ .**

بەر لە بڵاوبوونەی ئەم وتارە مەسەلەی جیاکردنەوەی نێرو مێ لــە زمـانی کوردیدا باس نەکرابوو . لــەم وتـارەدا سێ جنسی نێـرو مێو بێلایەن دیاری کراوە .

## ع . شەمۆ ، ق . کوردۆ ، ئی . تسوکەرمان :

**٨٣٠ ــ دەربارەی ئیزافە لــە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « شــۆڕشو نووسین » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٣ ، ژ ١ ، ل ٥١ ــ ٥٦ .**

بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردناسیدا لەم وتارەدا نیشـــــانەکانی ئیزافە دیاری کراوە .

## فاررووق عومەر صدیق :

**٨٣١ ــ ڕۆنانی ناو[١٧] لە زمانی ئەدەبیی کوردی عێراقدا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ .**

ئەم نامیلکەیە کە کورتەی نامەی دوکتۆری‌یە ، نووســــەر تێیدا دەربارەی ئەو پێشگرو پاشگرانەی ناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکرداری داڕێژراوو ئـەو حاڵەتانەی نـاوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکرداری لێکدراویان لێ پەیدا دەبێ دواوە . ئەم بەرهەمە ( ٢٤ ) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لـە پێشــــەکی‌و چوار فەســـڵ .

**هەروەها ژ : ٤٠٧ .**

## ئۆ . ل . ڤیلچێڤسکی :

**٨٣٢ ــ ئەنجامی پشکنینی ئاسەواری زمانە ئێرانی‌یە زیندووەکان ، لە کتێبی « ئەکادیمیای زانســـتی سۆڤێت بۆ ئەکادیمیک ن . یا . مارر » ، مۆسکۆ ــ لینینگراد ، ١٩٣٥ ، ل ١٩١ ــ ١٩٨ .**

---

(١٧) مەبەستی ( باب الاسماء )ە .

نووسەر لێرەدا کە لە ڕێگای هەندێ ئاسەواری کۆنەوە باسی ئەسڵی زمانە ئێرانی‌یەکانی کردووە ، لە زمانی کوردیش دواوە •

**٨٣٣ – کورد – سەرەتایێك لە مێژووی ئەتنۆگرافی گەلی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ •**

ئەم کتێبە ( ١٦٢ ) لاپەڕەیەو پێکهاتووە لە : پێشەکی ( ل ٣ – ٤ )و هەشت فەسڵ ( ل ٥ – ١١٦ )و هەندێك سەرنج ( ل ١١٧ – ١٦٢ ) • نووسەر لە فەسڵی پێنجەمدا ( ل ٦٧ – ٧٨ ) ڕای د • م • میخایلیس‌و أ • ل • شیلتیسرو چەند زانایەکی‌تری ئەوروپایی‌و ڕای هەندێك زانای ڕووس : کۆنیك‌و لێرخی نیشان‌داوە ، کە دەڵێن کورد بە ڕەگەز خالدی‌یەو بە زمان ئێرانی‌یە • لەپاشا نووسەر تیۆری ن • یا • مارڕو ڤ • ف • مینۆرسکی دەهێنێتەوە سەبارەت نەژادو زمانی کوردی • لە لێکۆڵینەوەکەیدا ئەو تیۆری‌یەی پەسەند کردووە ، کە زمانی کوردی بە یافیتی دادەنێ • ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٤٣٤ ) •

**٨٣٤ – کەرەستەی زمانەوانی دەربارەی مێژووی شێوەی کۆمەلایەتی لە کوردستان » ، گۆڤاری « زمانە ئێرانی‌یەکان » ، ب ١ ، مۆسکۆ – لینینگراد ، ١٩٤٥ ، ل ١٣ – ٣٠ •**

ڤیلچێڤسکی لەم وتارەدا وا نیشان‌دەدا کە کورد میللەتێکی ڕەسەن نی‌یەو خاوەنی یەك زمان نی‌یە ، بەڵکو لەجیاتی یەك زمان کە هەموو کۆمەڵی کورد تێی‌بگەن ، خاوەنی سێ چوار زمانن‌و چ لە چۆنیەتی دروست‌بوونداو چ لە چۆنیەتی پێشکەوتندا زۆر لە یەکتر جیاوازن •

**٨٣٥ – لەبارەی زاراوەی « پالە »ی کوردییەوە ، گۆڤاری « زمانو بیر » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٥ ، ب ٥ ، ل ٩٧ – ١٠٢ •**

نووسەر لەم وتارەدا لە چۆنیەتی پەیدابوونو گەشەکردنی وشەی « پالە »ی کوردی دواوە •

**٨٣٦ ـ یەکەم کۆنفرانسی گشتیی کوردناسیو کێشەی زمانی ئەدەبیی کوردی سۆڤێت ، گۆڤاری « زمانو بیر » ، ژ ٦ ـ ٧ ، مۆسکۆ ، ١٩٣٦ ، ل ٢٢٣ ـ ٢٢٧ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا بەکورتی باسی ئەو کۆنفرانسەی کردووەو لە ئەنجامو بڕیارەکانی سەبارەت بە زمانی ئەدەبیی کوردی دواوە ٠

## قەناتی کوردۆ ( ك ٠ ك ٠ کوردۆییڤ ) :

**٨٣٧ ـ پاشگر لە زمانی کوردیدا ، « کورتەی هەواڵەکانی ئامۆژگای میللەتانی ئاسیا » ، ژ ٦٧ ، ١٩٦٣ ، ل ٣٢ ـ ٣٧ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا لە زوربەی ئەو پاشگرانە دواوە ، کە ناوو ئاوەڵناوو ئاوەڵکردار سازدەکەنو بەسەر چەند گرووپێکدا دابەشی کردوون ٠

**٨٣٨ ـ پێشگر وەك کەرەستەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، « کێشەی ئیدیۆمو شێوازو پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان » ، سەمەرقەند ، ١٩٧٢ ، ل ٤٠ ـ ٥٣ ٠**

مامۆستا کوردۆ لەم وتارەدا لەو پێشگرانە دواوە ، کە دەچنە سەر ناوو ئاوەڵناوی سادەو دەیانکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو ٠

**٨٣٩ ـ حاڵەتەکانی جنسو بینای بەرکار لە زازادا ، « فیلۆلۆژیی ئێرانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٦ ، ل ١٠٤ ـ ١١٨ ٠**

نووسەر لەم وتارەدا وەڵامی ئەو بیروڕا هەڵەیەی داوەتەوە ، کە زازا بە بەشە دیالێکتی زمانی کوردی دانانیو دوایی لەڕێی هەندێ بەراوردەوە بەتایبەتی لە مەسەلەی وێکچوونی جنسەکانی ناوو بینای بەرکارەوە بیروڕای خۆی چەسپاندووە ٠ ( لەبارەیەوە بڕوانە : باسی ژ ٤٢٣ ، ٤٢٤ )٠

**٨٤٠ ـ دەربارەی دوو بنچینەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٩ ، ب ٢٩ ، ل ٦٥ ـ ٧٤ ٠**

ئەم وتارە لە مەسەلەی دارشتن و لێکدان دەدوێ لە ڕۆنانی وشەی ناسادەی کوردیدا •

**٨٤١ ـ دەربارەی کێشەی ڕۆنانی وشە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کێشەی ڕێزمان و مێژووی زمانە ڕۆژهەلاتی‌یەکان » ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ ـ ١٤٢ •**

ئەم وتارە بە شێوەیەکی گشتی لە دوو کێشە دەدوێ : ١ ـ جووتە وشە لەڕووی واتاو ڕێزمانەوە ؛ ٢ ـ ڕۆنانی ناوی واتا لە زمانی کوردیدا •

**٨٤٢ ـ دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ •**

ئەم کتێبە کە ( ٢٩٢ ) لاپەڕەیە کاری هەرە گەورەو دیارو زانستی‌یانەی مامۆستا کوردۆیەو بریتی‌یە لە : پێشەکی ( ل ٣ ـ ٢٣ ) ؛ فۆنەتیك ( ل ٢٤ ـ ٤٢ ) ؛ مۆرفۆلۆژی ( ل ٤٣ ـ ٢٨٠ ) ؛ ئەنجام ( ل ٢٨١ ـ ٢٨٤ ) ؛ سەرچاوە ( ل ٢٨٥ ـ ٢٨٨ ) • ( بڕوانە : باسی ژ ٤٢٥ ) •

**٨٤٣ ـ دیسان لەبارەی فۆرمی کۆی ناوەوە لە زمانی کوردیدا ، « نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست » ، مۆسکۆ ، ١٩٧٧ ، ل ٢٥٦ ـ ٢٥٩ •**

ئی • ئا • سمیرنۆڤا لە لاپەڕە ( ١٥٨ )ی کتێبی « شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانی‌یەکاندا » ( لینینگراد ، ١٩٧٤ ) وای داناوە کە لە بەشە دیالێکتی کوردی موکریدا نیشانەی ( ان )ی کۆ تەنیا لە دۆخی تیاندا بەرچاو دەکەوێ ( بڕوانە : باسی ژ ٨٢١ ) • مامۆستا کوردۆش لەم وتارەدا بە بەلگەی تەواوەوە نیشانی‌داوە کە نیشانەی ( ان )ی کۆ لە بەشە دیالێکتی موکریدا بە ڕەوانی لە دۆخی ڕاستەوخۆشدا دێت •

**٨٤٤ ـ ڕۆنانی کرداری نسادە لە زمانی کوردیدا ، لینینگراد ، ١٩٤٠ •**

# ڕەخنەی نارەختە[1]

لەتەک ئەو ڕەخنانەی لە وتاری « کاربەولێن کردن بەپێی ڕۆناڵ »ی مامۆستا محەمەد مەعرووف فەتتاحم گرتبوو[2]، گازندەی ئەوەشم لێی کردبووە، کە لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، ناوی بەشێکی زۆری ئەو سەرچاوانەی نەبردووە، کە پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە لێکۆڵینەوەکەی ئەوەوە هەیە و کەڵکی زۆری لێوەرگرتوون ..[3] هەر بەو بۆنە و سۆنگەیەوە، وام بە باش و دروست زانی، ئەو گلەیی‌یە ڕەوایەی چەند جار بەرەو ڕوو دەربارەی وەرگرتن و ناونەبردن، لە د. وریای برامم کردبوو و ئەویش خۆی نەدەکردە خاوەنی، بهێنمەوە بیری و داکۆکیی و بەرگری‌یش لە هێزەو بەرنامەو ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی بکەم .. جا لەو ڕووەوە لە پەراوێزی ژمارە ( ٤ ) دا ئەوەم کردووەتە نموونە، کە کاکە وریا بە هەندێ کەرەستەی لاپەڕە ( ٥٦ ـ ٥٧ )ی کتێبی « چەند خەسڵەتێکی ڕێزمانی کوردی » ( ١٩٧٦ )ی مامۆستا مەسعوود محەمەد، کورتە وتارێکی پێکەوە ناوە و بە ناوی « باسێکی فۆنۆلۆجی »یەوە بڵاوی کردووەتەوە.[4]

د. وریا بۆ شاردنەوەی ئەو ڕاستی‌یە و خەفەکردنی ئەو

---

١ـ ڕەختە = توند و تۆکمە و ساغ، خۆگرتە و قایم، بێ‌خەوش ..

٢ـ د. عەبدولڕەحمانی حاجی مارف، وتاری کاربەولێن کردن بەپێی ڕۆناڵ و چەند سەرنجێک، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »، ژ ١٣٩، بەغدا، ١٩٩٧، ل ٨ـ١٦

٣ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٢ـ١٣

٤ـ هەمان سەرچاوە، ل ١٥ـ١٦

بانگی حەقە ، هەوڵی داوە بە هەندێ وشەی قەبە بەری ڕۆژ بە بێژنگ بگرێ .. گوایا ئەم بەهێی پەیڕەوە تازەکانی زمانەوانی کاردەکاو ئەوڕەحمانیش ڕێبازی سلکاری تەقلیدی گرتووە و لە لێکۆڵینەوەکەی ئەو نەکەیشتووە .. ئەمە و چەند شتێکی دی سەیر و سەمەرەی کردووەتە وتارێک ـ « ڕەخنەی ناڕەخنە » و لە ژمارە ( ١٤٠ )ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا بڵاوی کردووەتەوە[٥] .

بەر لەوەی وەڵامی ئەو وتارەی بدەمەوە ، کورتە گەشتێک بە چەند وتارێکیدا دەکەم ، تا پەردە لەسەر ڕاستی هەڵدەمەوەو تەموومژی چەند ساڵە بڕەوێنمەوە و نیشانی خوێنەری کوردی هێژای بدەم ، کە کارو کردەوە ، هەڵسوکەوت .. ی زاناو زانستپەروەر بەو جۆرەی د . وریا ڕاست و پەسەند و ڕەوا نییە .. لە کۆتاییشدا دەگەینە ئەنجامێک ، ئەوەی دەربارەی وتاری « ڕەخنەی ناڕەخنە » دەیڵێم ، بە سانایی و ئاسانی لێیەوەربگیرێ .

• • •

لە وتاری « پاساییکی فۆنۆلۆجی »ی د . وریادا[٦] ، تەنانەت بەشێک لە نموونەکانی مامۆستا مەسعوود بە کەمێ دەستکاری‌یەوە دەبینرێن . بەوێنە : « بووم بە ئەندازیار ـ بوومە ئەندازیار » ( ل ٥٤ )ی مامۆستا مەسعوود ، لای د . وریا تەنیا وشەی ( ئەندازیار )ی کراوە بە ( مامۆستا ) : « بووم بە مامۆستا ـ بوومە مامۆستا » ( ل ٥١ ، س ٣ ) . یاخود نموونەی « تۆم کرد بە وێنەگر ـ تۆم کردە وێنەگر »ی کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی » ، لە وتاری « پاساییکی

---

(٥) د . وریا عومەر ئەمین ، ڕەخنەی ناڕەخنە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٤ ، بەغدا ، ١٩٩٧ ، ل ٢٢ـ٢٤ .

(٦) د . وریا عومەر ئەمین ، پاساییکی فۆنۆلۆجی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٥١ـ٥٢ .

فۆنۆلۆجی ‌دا کراوە بە : ‌ کردم بە پیلو ـ کردمە پیلو ( ل ٥١ ، س٣ ) .

مامۆستا مەسعوود لە کۆتایی لاپەڕە (٥٤)دا ئەوەی یادداشت کردووە ، کە بەشێك لە کردارەکان هەڵناگرن (٥) کەیان بکۆڕێ بە پێشبەند . هەرچی د . وریاشە لە کۆتایی لاپەڕە (٥١)دا ئەو دەربڕینەی پاش و پێش خستووە و وتوویە : بەشێك لە کردارەکان هەڵناگرن پێشبەندیان لەگەڵدا بێت و بە هۆی (٥)وە دەردەبڕرێن . وبرای ئەوە ، ئەو سێ نموونەیەی ە . وریا هێناونییەوە ، دوانیان زۆر لەوانی مامۆستا مەسعوودەوە نێزیکن :

| د . وریـــــا | مامۆستا مەسعوود |
| --- | --- |
| خستمە ناو دۆڵابەکەوە | خستمە خوارەوە |
| ڕشتمە سەر ئەرز | کەوتە سەر زەوی |
| ... هتد | |

جێگەی ڕەخنە و گلەیی‌یە ، کە د . وریا بێ قووڵبوونەوە و گەڕان و سۆراغ ، زۆر جار زانیارییکی ناتەواو دەکاتە یاسایەکی سەرلەبەری زمانی کوردی .ئەوەتە لەم وتارەیەدا وتوویە : ئەگەر ڕەگی کردار بە کۆنسۆنانت کۆتایی هاتبێ .. (وو) دەبێ بە (ۆ) .. ناردوومانە ـ ناردۆتە ، ڕۆیشتووە ـ ڕۆیشتۆتە ، بووە ـ بۆتە .. ( ل ٥١ ـ س٢ ) .

ئەگەر د . وریا بیوتایە ، تەنیا لە سلێمانی و چەند ناوچەیێکی کەمی دی ، ئەم دیاردەیە دەبینرێ ، ئەوە ڕەخنەی نەدەهاتە سەر . جا کە زوربەی زۆری کورد هەر (وو) بڵێن و زووش ناوچەی سلێمانی نەیکردبێتە (ۆ)و تەنانەت ئەمڕۆش کەسانێکی زۆریان ئەو گۆڕانەی بەسەردا نەهێنن ، ئیتر د . وریا چۆن ئاکامی ئەو بێ‌ناکایەی خۆی دەکاتە ئەو یاسا گشتییە .. بۆ

ئەوەی ئەو وتانەی منیش هەر قسەی ڕووت نەبن ، وا چەند بەڵگەیێك دێنمەوە :

پەیدابوونی ئەو (ۆ)یە شتێکی نوێیە .. ئەوەتە نالی (بۆتە) نالی و دەلی ( بووەتە ) :

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە ، یا ئەخۆ
هەر غاری یارە ، یا بووەتە غاری مار و موور[7]

بۆ مەشقی عیشقی زوڵفی نیگار و نیگارشی
( نالی ) لە خامەدا بووەتە شاهی طوڕڕەنووس[8]

د . جەمال نەبەز ، کە خەڵکی شاری سلێمانییە ، لە کتێبی « زمانی یەکگرتووی کوردی » ( بامبێرگ ، ١٩٧٦ )دا تێکڕا شێوەی ( وو )ی بەکارهێنانەوە . بۆ نموونە لە ( پێشەکی )دا ، نووسیویە : « هاتووەتەوە » ( ل ٥ د ٤ ) : « کەوتووەتە » ، ل ٥ ، د٤ ) : « کردووەتە » ( ل ٦ ، د ٢ ) .. و نەینووسیوە : ( هاتۆتەوە ) : ( کەوتۆتەوە ) : ( کردۆتەوە ) ..

قووڵنەبوونەوە ، بەردەوام د . وریا بەرەو هەڵە دەبات . ئەوەتە وێرای ناڕاستیی باسی کێشەی (وو)و (ۆ) ، لە زۆربەی کێشەکانی دی ئەم وتارە یەك پەرەیی‌یەدا ، ڕوون و ئاشکرا نادروستی دەبینرێ . بەوێنە :

١ـ نووسیویە : « .. ئەوانەی کە پریپۆزیشنەکەیان (بە)یەو ناوەکەی دوای چەمکی (کەسی) پێوەبێ » (ل ٥١) .. لێرەدا ژمارە (٣)ی لەسەر ( کەسی ) داناوە و لە پەراوێزدا وتوویە : « ناو چەمکی کەسی تیا بێ وەك کەرەسەیێکی سیمانتیکی .. ئەو

---

(٧) دیوانی نالی ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٩٥ .

(٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٤٠ .

ئاوانە ئەگرێتەوە کەسێ بنوێنێ .. وەک ( ئازاد ـ برا ـ ئەوە .. هتد ) ( ل ٥٢ ) .

لە نموونەی سێیەمدا : « کردم بە پیاو ـ کردمە پیاو » . ڕاستە وشەی ( پیاو ) مەفهوومی کەسیی تێدایە ، بەڵام بە ئاسانی دەتوانین دەیان وشە بخەینە جێگەی ( پیاو ) ، کە مەفهوومی کەسیی تێدا نەبێ وەک :

| | |
|---|---|
| کردم بە خۆڵ | کردمە خۆڵ |
| کردم بە پڵاو | کردمە پڵاو |
| کردم بە شلە | کردمە شلە |
| کردم بە خانوو | کردمە خانوو |
| کردم بە بازاڕ | کردمە بازاڕ |
| کردم بە باخ | کردمە باخ |
| کردم بە کراس | کردمە کراس |
| کردم بە وتار | کردمە وتار |
| کردم بە کتێب | کردمە کتێب |
| کردم بە سەرین | کردمە سەرین |
| کردم بە ماست | کردمە ماست |
| کردم بە پەنیر | کردمە پەنیر |
| کردم بە علامەت | کردمە علامەت |
| کردم بە دەرگا | کردمە دەرگا |
| کردم بە پەنجەرە | کردمە پەنجەرە |
| .. هتد | |

ئەوانەت بۆ نموونەی دووەم : ( بووم بە مامۆستا ـ بوومە مامۆستا )و یەکەم : ( بەخشیم بە ئەو ـ بەخشیمە ئەو )یش ، لەبریتی ( مامۆستا )و ( ئەو ) دەشێ چەندین وشەی ئەوتۆ دابنرێن ، کە مەفهوومی کەسییان تێدا نەبێ . وەک :

| | |
|---|---|
| بووم بە عیبرەت | بوومە عیبرەت |
| بووم بە پەند | بوومە پەند |
| بووم بە نموونە | بوومە نموونە |
| بووم بە خۆڵ | بوومە خۆڵ |
| بووم بە کەلاک | بوومە کەلاک |
| بووم بە سینەما | بوومە سینەما |
| .. هتد . | |
| بەخشیم بە وڵات | بەخشیمە وڵات |
| بەخشیم بە کوردستان | بەخشیمە کوردستان |
| بەخشیم بە نیشتمان | بەخشیمە نیشتمان |
| بەخشیم بە سروشت | بەخشیمە سروشت |
| بەخشیم بە گەردوون | بەخشیمە گەردوون |
| .. هتد . | |

وتاری ناوبراو بە هەموو ئەو وەرگرتن و خەوش و ناتەواوییەوە . پاش دوو ساڵێک چەند دێڕێکی بۆ کراوەتە پێشەکی و . وتاری « یاسای دەرکەوتنی (ر) ش»[9] بە پاشکۆ . کە ئەمیش هەندێ بیروڕای دی یە لە کتێبەکەی مامۆستا مەسعوودەوە ( بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکرێ ) وەرگیراوە و بە ناوی « پاشبەندەکان »وە لە بەرگی پازدەهەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد »دا بڵاوکراوەتەوە[10] .

بەداخەوە . ئەو چەند دێڕەی لە سەرەتاوە زیادی کردووە . نەک هەر زۆری قسەی ڕووتە . بەڵکو ڕاستیش نییە . بەوێنە . کە

(9) د . وریا عومەر ئەمین . یاسای دەرکەوتنی « ر » . گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » . ژ ٧٢ . بەغدا . ١٩٨٦ . ل ١٩ـ٢٠ .

(10) د . وریا عومەر ئەمین . پاشبەندەکان . « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » . بە ١٥ . بەغدا . ١٩٨٦ . ل ١٨٢ـ١٩٤ .

دەڵێ : « بە شێوەیێکی گشتی هەموو ئەوانەی باسی پێشبەندیان کردووە لەسەر ئەم شەشە پێکهاتوون ( بۆ ـ بە ـ لە ـ تا ـ وەك ـ بێ ) ( ل ١٨٢ ، د ٥ـ٦ ) . سەیریش ئەوەیە لە کۆتایی ئەم وتارەیدا « ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی » ( ١٩٧٦ ) ی کۆڕی زانیاری کوردی وەك سەرچاوە داناوە ، کەچی لە لاپەڕە ( ٣٠٥ـ٣١١ ) ی ئەو بەرهەمەدا بە دوور و درێژی باسی جیاوازیی دیاریکردنی ژمارەی پێشبەند لای نووسەرانی ڕێزمانی کوردی کراوە . بەوێنە ، ئەوە وتراوە ، کە مامۆستا سەعید صدقی کابان ( بۆ ، تا ، لە ، بە ) ـ واتە ( چوار پێشبەند ) ی یادداشت کردووە (ل ٣٠٥و ٣١٠) ، مامۆستا توفیق وەهبی لە کتێبی ( دەستووری زمانی کوردی )دا سێ پێشبەندی ( لە ، ی ، ی )و حەوت ( بە ، بێ ، پێ ، تا ، تێ ، بۆ ، وەك )یش لە فەرهەنگەکەیدا ( ل ٣١٠) . مامۆستا نووری عەلی ئەمین « بۆ ، بە ، لە ، تا ، هەتا ، هەتاوەکو ، هەتاکو ، تاکو ، ی وەصفی و ئیزافە ، بزوێنی (ە) دوای کاری وەك چووە بازاڕ ـ هەروەها ئامرازی (وە) بە واتای (بە) ، وەك ، وەکو ، هەروەکو ، پێ ، لێ ، تێ ، لەسەر ، بەبێ ، لەبەر .. هی تریش لەم شێوەیە » (ل ٣١١) .. هتد .

لە نمایشی کارەکانی ئەو سێ زانایە و ئەوانی دیدا جیاوازییەکی گەورە لە دیاریکردنی پێشبەندەکاندا بەدی دەکرێ ، کەچی د . وریا دەڵێ : « هەموو .. لەسەر ئەم شەشە پێکهاتوون » .. بەڵێ د . وریا نەك هەر خۆی ماندوو نەکردووە چاوێك بە کاری نووسەرانی ڕێزمانی کوردیدا بگێڕێ ، بەڵکو پچێکیشی کاتی نەداوە بە خوێندنەوەی ئەو چەند لاپەڕەیەی بەرهەمی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ ، تا بزانێ چەند جیاوازییەکی زۆر لەو کێشەیەدا هەیە .. ئەم تەنیا تەماشای ئەو لاپەڕەیەی کردووە ، کە لیژنەی ناوبراو شەش پێشبەندی پەسەندکردووە و ئەمەی لێبووە بە هەموو نووسەران ..

ئەوەی پتریش سەرنج ڕابکێشێ ، ئـەوەیە کـە ئەو لە دێـڕی (١ـ٢)دا وتبێتی : « لە ڕێزمانی کوردی‌یا کێشەیێکی زۆر لەسەر دەست نیشـان کردنی پێشبـەندەکـان Preposition و ژمارە و ئەرکیان هەیە » ل ١٨٢ ) . ئیتر چۆن پاش سێ دێرێک شتێکی دی بۆ بەو وتانەی خۆی دەڵێ و دەنووسێ : « هەموو لەسەر ئـەم شەشە پێک‌هاتوون » ( ل ١٨٢ ، د ٥ـ٦) ، ئەدی جیاوازیی زەقی ئەو دوو گوتەیەی ، کە نێوانیـان سێ دێرێکـە ، دەبێ لە ڕووی تێ‌ڕوانینی زانستی‌یەوە چۆن هەڵسەنگێنرێ ؟ ..

ئەو بیروڕا نوێیانـەش ، کە لە کتێبی نـاوبراوی مـامۆستـا مەسعوود محەممەدەوە بۆ ئەم وتارە وەرگیراون ، بـەتایبـەتی بـەیدابـوونی ئەو ( ێ )یـەیە لە کـردارەکـانی وەک ( دامێنێ ، ئـەدەمێ ، دانێ .. )دا دەبـینـرێ ( بـڕوانـە : ل ٥٥ـ٥٧ )ی کتێبـەکەی مـامۆستـا مـەسعـوود محـەمـەد و ل ١٨٥ـ١٨٩ی وتارەکەی د . وریا ) .

ئەو وتاری « یاسایێکی فـۆنۆلۆجی یـەی پاش دوو سـاڵێک چـەند دیـرێکی بۆ کـرایە پێشـەکی و هەنـدێ بیروڕای دی لە کتێبەکەی مامۆستا مەسعوود محەممەدەوە ( بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکرێ ) وەرگیرا و بە ناوی « پاشبەندەکان »ەوە بڵاوکرایەوە و لە سـەرەوە کەمێـک لێ‌دواین . ساڵی ( ١٩٩٦ )یش بـەشێکی خرایە نێو وتاری « لە یاسا دەنگی‌یەکانی زمـانی کوردی »و لە ژمارە ( ١٣٨ )ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا سێ‌بارە چاوی بە دنیا هەڵهێنایەوە .. ( بڕوانە : ل ١٩ـ٢٠) .

ئەم وتارەی « لە یاسا دەنگی‌یەکانی زمانی کوردی »[11] بریتییە لە باسی سێ یاسای فۆنۆلۆجیی زمانی کوردی :

١ـ« یاسای دەرکەوتنی ( ر ) » ، کە دە ساڵ پێشتر ـ واتە ساڵی

(١١) د . وریا عومەر ئەمین ، لە یاسا دەنگی‌یەکانی زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٣٨ ، بەغدا ، ١٩٩٦ ، ل ١٨ـ٢١ .

١٩٨٦ - دوو جار لە : ١ - ژمارە (٧٢)ی گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان»[12] و ب - بەرگی پازدەهەمی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد»دا[13] بڵاوی کردووەتەوە[14].
٢ - «پاسای دەرکەوتنی (ت)»، کە ساڵی ١٩٨٤ لە ژمارە (٦٦)ی گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان»[15] و ساڵی ١٩٨٦یش لە «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد»دا[16] ڕۆشنایی بینیوە.
ئەم دوو پاسە زووتر بڵاوکراونەتەوە و ئێمەش پێشتر لێیان دواین. دەمێنێتەوە باسەتی سێیەمی وتارەکە، کە «پاسای دەرکەوتنی (ی)»یە.
بەتایبەت بۆ ئەم دوا بەشە، بەدڵ کلەیی لە د. وریای برام دەکەم، چونکە، کارێکی کردووە، دوور لە کلت داب و نەریتێکی زانستانە.. باسی ئەوەی کاتێ دوو بزوێن دەکەونە پاڵ یەک، یان (ی) لە نێوانیاندا دەردەکەوێ، یان یەکێک لە بزوێنەکان دەتوێتەوە، دەیان ساڵە لە لایەن زمانەوانانی کوردەوە لێی کۆڵراوەتەوە، کەچی تازە د. وریا باسی دەکا و پەنجە بۆ کاری هیچ کەسیش ڕاناکێشێ.
جا وتارێک، کە بریتی بێ لە پاسێک، دەیان ساڵ بەر لە ئێستا لە

(١٢) بڕوانە : پەراوێزی ژ ٩
(١٣) بڕوانە : پەراوێزی ژ ١٠
(١٤) چەند جارێک، کە لە دەزگا کوردییەکانەوە وتاری د. وریایان بۆ دەناردم تا هەڵیسەنگێنم، دەمبینی تەنیا لاپەڕەی یەکەمی (ئەویش کە چەند دێڕێکی درشت بوو) بە خەتی خۆی بوو و ئەوی دی خەتی ئوتابی یەکی بەشەکە (بەتایبەتی تازە ..) نەبینی وەکەیتی ئەمەش، ئەوەیە، وتارێکی بڵاوکراوەی دەدایە ئوتابی یەک بۆی بنووسێتەوە و خۆیشی بۆ ئەناسینەوە و چاوپێستکردن، سەرەتایێکی چەند دێڕی بۆ دەنووسی.
(١٥) بڕوانە : پەراوێزی ژ ٦.
(١٦) بڕوانە : پەراوێزی ژ ١٠

لایەن چەندین زمانەوانەوە لێی کۆڵرابێتەوە ، ج خزمەتێکی زمانی کوردی دەکا و کەڵک و بایەخی چییە و بەتایبەتیش گەر پەردەی ڕەشی لابێ بەسەر کاری ئەو زانایانەی لە ڕێگای ساخکردنەوەی کێشە جۆربەجۆرەکانی زمانی کوردیدا شەونخونی‌یان کێشابێ .

زۆر دوور ناڕۆم ، تەنیا دەگەڕێمەوە بۆ بیست ساڵ بەر لەو وتارەی د . وریا ، کە لە دووەم خاڵ باسی ( چەند خاسیەتێکی زمانی کوردی )ی کتێبی « زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا »[١٧] ، کە وتراوە :

« لە زمانی کوردیدا دوو پاشخود پتر دەنگی بزوێن لەپاڵ یەکدا ناتوانن بێن .

لەبەر ئەوە زۆر جار لە نێوان دوو دەنگی بزوێندا نیمچەبزوێنێک (ی-Y ) ، ( و-W ) پەیدا دەبێ ، پاشخود بزوێنێکیان تێ‌دەچێ . وەک :

١-پەیدابوونی نیمچەبزوێن :

بەوێنە کاتێ ئامرازی کۆ ( ان ) دەخرێتە سەر وشەیەک کە کۆتایی بە بزوێنی(ا، ۆ ، ێ ، ی ) هاتبێ ، ئەو دەمە نیمچەبزوێنی ( ی-Y ) پەیدا دەبێ .. وەک :

برا + ی + ان = برایان

چەقۆ + ی + ان = چەقۆیان

دێ + ی + ان = دێیان

ڕێوی +ی +ی = ڕێوییان

. . . . .

---

(١٧) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، ل ١٩٧٦ .

ب) تێچوونی بزوێن :
بەتایبەتی ( ە ) کە بزوێنێکی دیکەی دێتە پاڵ تێدەچێ

لە حاڵەتی کۆدا ـ واتە لە ( ان ) خستنەسەر وشەدا ، وەک :
بەران = بەرە + ان
کاتێ ئامرازی ( ەکە )ی ناسانن دەخرێتە سەر وشەیەک ، وەک :

بەردەکە = پەردە + ەکە

پارەکە = پارە + ەکە

... » ( ل ٥٤ـ٥٦ ) .[18]

دواتریش ، ساڵی ١٩٧٩ لە چەندین لاپەرەی بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا[19] کە باسی پێوەلکانی نیشانەکانی کۆ و ناسیاوی و نەناسیاوی .. بە ناوەوە کراوە ، کێشەی پەیدابوونی ( ی ـ Y ) ، یان تێداچوونی بزوێن

---

(١٨) دەربارەی ئەو باسە فۆنۆلۆجی یە ، بەتایبەتی لەو سەرچاوانەی خوارەوە و هەندێکی دیدا زانیاری بەرچاو دەکەوێ .

ا ـ ق . کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و خواروو ) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٧٣ ..

ب ـ ع . بەکۆ ، بەشە دیالێکتی کوردی تورکمەنستان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٢٤ .

ج ـ ک . ئەیووبی و ئی . سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل ١٩ .

د ـ د . نەسرین فەخری و د . کوردستانی موکریانی ، ڕێزمانی کوردی ( بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین ) ، ١٩٨٢ ، ل ٤٩ـ٥٠ ، ٥٦ ... و هەندێکی دی .

(١٩) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ( مۆرفۆلۆژی ) ، بەشی یەکەم ( ناو ) ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

لێکدراوەتەوە . بەوێنە ، بڕوانە لاپەڕە (١٤٨-١٤٩ ، ١٨٩-١٩٤ ، ٢٠٠-٢١٠ ) ..

د . وریاش وتوویە : « .. ئەگەر دوو بزوێن کەوتنە پاڵ یەک ، بە شێوەیێکی گشتی ( ی ) لە نێوانیان دەردەکەوێ

مامۆستا + ان ــــ مامۆستایان

چەقۆ + ەکە ــــ چەقۆیەکە

ڕێ + ەکە ــــ ڕێیەکە

...

لە هەندێ حاڵەتدا یەکێ لە بزوێنەکان دەتوێتەوە و پێویست بە ( ی ) ناکات .

... » ( ل ٢٠-٢١) .

ئەوەتە ئەوەی د . وریا وتوویە ، هەر ئەوەیە کە پێشتر لە کتێبی « زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا » باسکراوە . تەنانەت نموونەکانیشی بڕێکیان هەمان نموونەی ئەو سەرچاوەیەن و بڕەکەی دیش لە بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی کتێبی « ڕێزمانی کوردی »دا[٢٠] هەن . لێرەدا ئەوەش دووپات دەکەمەوە ، کە لە چەندین لاپەڕەی ئەم کتێبەشدا ، کاتێ باسی پێوەلکانی نیشانەکانی کۆ و ناسیاوی و نەناسیاوی .. بە ناوەوە کراوە ، کێشەی پەیدابوونی ( ی ) یان تێداچوونی بزوێن لێکدراوەتەوە .

د . وریا لە لیستەی سەرچاوەکانیدا نە ناوی ئەو کتێبەی ئەوڕەحمانی حاجی مارفی بردووە و نە بەرهەمی دی یادداشت کردووە .. کەچی تەنیا و تەنیا سێ کورتە وتاری خۆی بە سەرچاوە داناوە .. هەرچی لە کۆتایی وتاری « یاسای دەرکەوتنی

---

(٢٠) هەمان سەرچاوە .

( ر ) ، شدایه[31] . سەرنجی خوێنەر تەنیا بۆ بەرهەمێکی خۆی ڕادەکێشێ و دەڵێ ( بۆ دەوری بەرکاری ڕاناوە لکاوەکان سەیری ئەم وتارەم بکەن : ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ـ گۆڤاری کاروان ، ژ ٨ ( ١٩٨٣ ) . ل ٦٨ـ٧٤ . وەك بڵێی لەو بارەیەوە هیچی دی نەنووسرابێ .

• • •

ئەگەر د . وریا ئاگا و خەبەری لەو بەرهەمە ، بیار و بەرچاوە زانستییەی مامۆستا مەسعوود محەمەد نەبووبێ ، ئەوە بلیەخ نەدانە بە بەری ڕەنجی ئەوا و هاوکاری . خو بێتو بە لێکۆڵینەوەیێکی بێبەهای لە قەڵەم دابێ ، ئەوە گلەیی و گازندەی پتر دێتە سەر .. بەداخەوە ، هۆو سۆنگە ؛ نیاز و مەبەست ؛ دۆز و مەرام هەرچییەك بێ ، ئەو دیاردە دزێوە نابەجێ و نادروستە ، دیار و ئاشکرا لە زۆرانی و زوربەی نووسینەکانی د . وریادا ڕەنگی داوەتەوە . بەوێنە لە وتارێکی دوورودرێژ لەمەوبەریدا ، کە بە ناوی « لێڵ لە زمانی کوردیدا »[32] بڵاوی کردووەتەوە ، هەزار جار گەردنی ئازادبێ ، ناوی ئەوەی نەبردووە ، بەندە بیست و دوو ساڵێك لەمەوبەر لە لاپەڕە (١٤ـ١٩)ی کتێبی ( وشەی زمانی کوردی )دا[33] ، بە ناوی « وشەی هاوبێژ »ەوە لە هەمان کێشەی زمانی کوردی دواوە .. بەڵام حەیف و مەخابن ، بە چ ڕەوا و هەقێك ، بە کام ئینساف و ویژدانێك ، ئامە ماجستێرە ئیروتەسەلە زانستییەکەی مامۆستا

---

(٣١) سەرچاوەی ناوبراو ، یاسای دەرکەوتنی ( ر ) .. ل ٢٠

(٣٢) د . وریا عومەر ئەمین ، لێڵ لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری ( ڕۆشنبیری نوێ ) ، ژ ١٣٦ ، بەغدا ، ١٩٩٥ ، ل ٦٦ـ٦٩ .

(٣٣) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

فەتتاحی مامە عەلی[24] ، کە د . وریا خۆی یەکێک بووە لە ئەنداماتی وتوویژ و هەڵسەنگاندنی و وا بە سووک و ئاسانی پەردەپۆشی کردووە و لێی شاردووینەتەوە .
جا بیسەلمێنم مەبەست و نیازی د . وریا ، یان شێوە و شێوازی ، ڕێگە و ڕێبازی نووسینەکانی ، هەرچییەک بێ ، من سەری خۆم و خوێنەری پێوە نایەشێنم و تەنیا بە کوردی و بە کورتی ، بێ سێودوو ، بانگی هەق دەدەم و دەڵێم : زۆربەی کەرەستەی وتاری ( لێڵی لە زمانی کوردیدا )ی د . وریا لە نامەکەی مامۆستا فەتتاح مامەوە وەرگیراوە .
کەواتە ، فەرموون با کورتە گەشتێک بە هەردوو بەرهەمەکەدا بکەین :
مامۆستا فەتتاح یەکەم نووسەری کوردە ، وشەی ( لێڵی ، هاودەنگ .. )ی کردبێتە زاراوەی زمان . ئەوەتە لەسەر بەرگی نامەکەی و گەلێک لاپەرەیدا زاراوەی ( هاودەنگ ) دەبینین .. لە سەرناوی ( ل ٥٦ )و چەند شوێنێکی دیدا زاراوەی ( لێڵی )مان بەرچاودەکەوێ .. هتد .. بەڵێ ، وتارەکەی د . وریاش بە ناوی ( لێڵی .. )یەوەیە ، واتە زاراوە پەسەندکراوەکەی مامۆستا فەتتاحی وەرگرتووە و لە سەرجەمی وتارەکەیدا دەیڵێت و دەیڵێتەوە و خۆیشی لێ بێدەنگ کردووە . لە ناوەڕاستی ستوونی ( ل٦٧ )یشدا زاراوەی ( هاودەنگ )ی بەکارهێناوە ، کەواتە پەیڕەویی مامۆستا فەتتاحی کردووە ، بێ ئەوەی نە بە چاک و نە بە خراپ ناوی بێنێ .
بەشی سێیەمی نامەکەی مامۆستا فەتتاح بە ناوی « هاودەنگ لە ئاستی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسدا »وەیە : « ١- هاودەنگ لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا » ( ل ٦٣ .. ) ، « ٢- هاودەنگ لە ئاستی

(٢٤) فتاح مامە علی ، هاودەنگ لە زمانی کوردیدا ، نامەی ماجستێر ، زانکۆی سەلاحەددین ، ١٩٨٩ .

سینتاکسدا » ( ل ٨٠ ... ) . د . وریاش لە دێڕی دووەمی وتارەکەیدا وتوویە : « دوو جۆری لێ دەست نیشان کراوە » و « ١ـ لێڵی مۆرفۆلۆجی » ( د ٣ ) و « ٢ـ لێڵی سینتاکسی » ( د ـ ٤ ) .

لێرەدا تەنیا زاراوەی ( لێڵ ) لە جێی ( هاودەنگ ) دانراوە و کەسێکی لە من کوتوکوێرتریش هەست بەو وەرگرتنە دەکات .

لە خەرمانی بە بەرەکەتی ئەو وشە و ڕستانەی مامۆستا فەتتاح کردوونیە بەڵگەی لێکدانەوەکەی ، لە هەر لایەکەوە لوێچێنە و مشتێکی لێ هەڵگیراوە و لە وتاری ( لێڵ لە زمانی کوردیدا ) چێنراوە . ئەوەی مامۆستا فەتتاح لە ( ل ٥٩ ) دا نووسیویە : « . . ئەم ڕستەیە . پێی دەخورێت .. دوو واتای هەیە : ١ـ « قاچی دەخورێت ، ٢ـ دەتوانێ خواردنەکە بخوات .. » . د . وریاش لە ستوونی دووەمی ( ل ٦٨ ) دا دەڵێ :

« ڕستەی ( پێی دەخورێ ) ئەم سێ واتایەی هەیە :

١ـ قاچی ( وەک خواردن ) دەخورێ ، ٢ـ قاچی ( وەک هەست و ئازار ) دەخورێ ، ٣ـ دەتوانێ بیخوا » . لێرەدا شوکرانە بژێری دەوێ ، کە مانایێکی لێ زیادکردووە .

تەنانەت هەندێک لێکۆڵینەوەی مامۆستا فەتتاح ، کە بەلای منەوە هەڵەن و پەسەند نین ، د . وریا بێ بیرکردنەوە وەری گرتوون . ئەوەتە لاپەڕە ( ٥٦ ) ی نامەکە ، کە بە سەربابی « هاودەنگ و لێڵ واتایی » دەست پێ دەکات ، لە یەکەم دێڕیدا نووسراوە : « کەلێ وشە و فرێز لە زماندا واتایێک زیاتر دەبەخشن .. » . د . وریا لە یەکەم دێڕی وتارەکەیدا دەڵێ : « لێڵی لە زماندا ئەوەیە دەربڕینێک زیاتر لە مانایێک ببەخشێ . » .

بێ گومان ، د . وریا نەک هەر نەدەبوو ئەو دەربڕینەی مامۆستا فەتتاح بەو ناتەواوییەوە وەربگرێ و ناویشی نەبا ، بەڵکو وەک مامۆستایێک پێویست بوو لە سەرەتادا ستایشی بکردایە و پاشانیش دەستی بگرتایە و ڕێگای ڕاستی نیشان بدایە .

ئەكەرد . وريا كەمێك خۆی ماندوو بكردايە ، هەڵبەت ئەدەكەوتە ئەو هەڵەيەوە و لە كێشەی لێڵيی زماندا ( هاودەنگ ـ Homonym ) و ( فرەواتا ـ Polysemantic ) ی لەيەك جيادەكردەوە .

ئاچار وا بەندە بە كورتی ئەو تەم و مژە دەرەوێنینەوە :

( وشەیێك ) ، يان ( دەربڕينێك ) ، كە لە ماناكانيان زياتر بەخشی ، لە زانستی زماندا ( هاودەنگ ـ Homonym ) نين ، بەڵكو ( فرەواتا ـ polysemantic )ن .

هەرچی ( هاودەنگ )ە ، بەو وشانە دەوترێ ، كە لە وتن و نووسيندا وەك يەكن ، بەڵام واتايان جيايە . بۆ وێنە ، ئێمە كە دەڵێين : (بير ـ هزر ، فكر ، بيروهۆش ) ، يان ( بير ـ چاڵاو ، بئر ـ عەرەبی ) ئەمە وا ناگەيەنێ ، كە ( بير ) دوو مانای هەبێ ـ واتە ( فرەواتا ) بێ ، بەڵكو دوو وشەن ، كە تەنها لە وتن و نووسيندا وەك يەكن ، ئەگينا لە واتا و پەيدابووندا جياوازن . بۆ نموونە وشەی ( ئازار ـ ژان ، ئێش ، ئێشی ئەندام ) ، كە وشەيێكی كوردييە ، زۆر دوورە لە ( ئازار ـ مانگی مارت ) ، كە وشەيێكی كوردی نييە و لە پەيدابوون و دروستبووندا سەرچاوەيێكی دی هەيە .

بۆ زانياريی زياتر و پتر وردبوونەوە ، با بڕوانينە ( ئازا )- كورد پێنج وشەی هاوبێژی ( ئازا ) بەكاردێنێ :

١ـ ( ئازا ) : لە ئاوێستادا (ئەزامی )يە .

ا ) بوێر ، بەجەرگ ، چاونەترس ، جوامێر ، جەسوور ، دلاوەر ، دلێر ، كەڕناس : نەترس ، لەگيت ، ميرخاس ، ڕەشيد ، مەرد . مرۆی مەرد و بوێر لە ژيان و كاری ڕۆژانە و جەنگو شەڕدا بۆ نموونە گيانداری چاونەترس و نەبەز :

« نییە دەخڵم لە شانامە و مەصاڵی ، غەیری ئەم نوکتە
کە کوشتەی بەندی تۆیە هەر کەسێ ئازاد و ئازا بێ »

(نالی ، ل ٥٩٨)

« لە پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ و شێری ئازا بوو
ئەمێستا مار و مێروو ، گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران »

(حاجی قادری کۆیی ، ل ٩١)

« ماڵندووی سەرخەرێک بشکێنە لە لام
تێشکت ئەگرم ، مەترسە ئازام »

(پیرەمێرد ، ل ٤٢١)

« کەلیکی و ئازا و سەربەست
بە بلوێری ئازادی مەست »

(گۆران ، ل ٢٢٨)

« بەختیاری بۆ کەسێکە خۆی لەبیرچێ بۆ گەلی
دانەنیشێ ، تێبکۆشێ ، مەرد و ئازا هەڵکەوێ »

(ئیحسان فوئاد ، ل ٢٠)

« ئەو پەرچەمە پەرێشانەی
بە وێنەی دوو هەڵۆی ئازا
کە دەپوانێ
ڕاست لانەی دڵی پێ دەزانێ »

(بێخود ، ل ١٩)

ئیدیۆم :

ئالزا کۆ و ئالزا مەیدان = واتا هەی لە گوندا ئالزا ، ئەوە مەیدان .. بۆ هەلدانی یەکێك دەوترێت ، کە بە قسە تەواو بێت و لە کرداردا سست بێت .

ب ـ بە مەجاز : چابووك ، چالاك ، چوست ، بەتاو ، بەگوڕ ، خۆشڕەو ، خێرا ، گورجوتوند ، بەتەو ، بەپێت .. لە ( ئاوێستادا : ئازوو ، ئاسوو ) .. مرۆ یان گیانداری بەکار و لەشسووك لە بەجێهێنانی کاردا .. بەوێنە دەوترێ :

شیروان ئالزا کەوتە ڕێ و دەمە و ئێوارە گەیشتەوە گوندەکەی خۆیان

۲ـ ( ئالزا ) :

کورتکراوەی ( ئازاد )ە لە کرمانجیی ژووروودا زۆر بەکاردێنرێ .

« تو دەوونی عەمرێ ڕەنگین
ب دلی شا ، فکرێ ئالزا »

( فکری حەسەن ، ل ۱۹ )

« ئول ورا ما ئالزا و هێسا
وی وەختەکێ نەدی زۆر زختیا ئاغا »

( عەمەری جەلال ، ل ۳٦ )

۳ـ ( ئالزا ) :

ا ـ بەکاکڵ ، ساخ ، ساغ ، سلخلەم ، بێخەوش ، بێعەیب ..

دژواتای : ( پووت ، پووچ ، پووچەڵ .. )ە

گوێزی ئالزا = گوێزی ئالزا ئەوەیە بەکاکڵ بێ و کاکڵەکەی بە دەزبێت و توێکڵ تەنك بێ .

ئیدیۆم :

وەك گوێزی ئلزابە = واتە ساغ و بی‌خەوشە
ب ـ ساخ ، ساغ ، نەشکاو ، باش ، چاك ..
دژواتای : ( نەخۆش ، شکاو ، عەیبدار .. )ە

٤ـ ( ئلزا ) :

لە لوڕیدا واتای ( بەهێز .. بەتوانا .. ) دەگەیەنێ
لە ( ئلز = هێز ) و پاشگری ( ـا ) پێکهاتووە

٥ـ ( ئلزا ) :

لە ( اعضاء )ی عەرەبییەوە واتە : ئەندام ، ئەعزا .. ئـەندامی لەش . کورد ، ئەم وشەیەی لە قاڵبی کۆوە وەرگرتووە ، کەچی بۆ تاك بەکاری دێنێ . کاتێك کۆی دەکاتەوە ، وشەی وەك ( هەموو ، گشت .. )ی دەخاتە پێش : ( هەموو ئلزام ، گشت ئلزای ) .

« دەستێکی خستبووە سەر مشتوی خەنجەرەکەی ، هەموو لەشی ئەجووڵایەوە ، هەروەها خوێن لە هەموو ئلزای ئەباری »

( لە خەوما ، ل ٤٨ )

« هەر ئلزام پەی وێش شین و زایشەن
لاڵە و ناڵەی سەخت زام کاریشەن »

( مەولەوی ، ل ٣٣٧ )

« جـروسکەییکی ئـلزاری تر لە بـڵێوە بـەرەو هەمـوو ئلزای ئەندامی کەوتە گەشت »

( پەشێو حەسەن ، سەبەینێ .. ل ٤١ )

« کەشت ئالزای بەدەنیی
لەتلەت و کون بووە »
( تریادی جەل زادە ، ل ١٠٥)

« گرتیان و بە بێلەقە ئالزای ئەندامیان شکاند » ( هەمان ، ل ٢٨)
هتد ..

کەواتە دەبێ بزانین ، کە ( ئالزا ) یەك وشە نییە و پێنج مانای هەبێ ، بەڵکو پێنج وشەن و هەریەکەیان سەربەخۆیە و خاوەنی بن و بنەچە و تایبەتێتی خۆیەتی . شایانی باسە ، کە لەرهەنگنووسانی وڵاتە پێشکەوتووەکان و هەندێك لە زانا کوردەکان ( توفیق وەهبی و ئەمانی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ و زەبیحی و تا رادەیێك گیوی موکریانی ) لە بەرهەمەکانیاندا ئەو جۆرە وشانەیان بە یەك وشە دانەناوە و تێکەڵیان نەکردوون و لە یەك جیایان کردوونەتەوە و سەرلەنوێ وەك وشەی سەربەخۆ بە خەتی رەش نووسیویانتەوە و ژمارەیان بۆ داناون ، وەك لەو شێوەیەی سەرەوەدا لە وشەکانی ( ئالزا )دا نیشانماندا .
ئەوجا با بزانین ( فرەواتا ـ Polysemantic ) بە چی دەڵێن :
مەبەست لە زاراوەی فرەواتا ، ئەوەیە وشەیێك خاوەنی چەند مانایێك بێو ئەو مانایانەش لە یەك نێزیك بن . بەوێنە :

ئالان
١ ـ زستانەوار ، گەرمەسێر ، قشلاخ ، جێ ژیانی کۆچەر لە زستاندا ، بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران . ٢ـ لەوەرگا ، لەوەرگە ، بژوێن ، زەمەند ، چیمەن ، مێرگ ، گیلجار ، پاوان .. زەویی پڕ گیا و لەوەڕ ٣ـ دەشت ، تەختان ، تەختانی ، تەختایی .. زەویی بێگرد و تەپۆلکە ٤ـ گۆشتەزەوی ، نەرمان .. زەویی بێ بەرد و نەرمەنیشە و سلز و لەبار ، کە بۆ

کشتوکاڵ دەستبدات م ـ چۆڵ ، بیـابان ، دەشت‌ودەر ، سارا ، هەردە .

لە فەرهەنگدا ئەو واتایانە بە دوا یەکدا ڕیزدەکرێن و بە ژمارە جیادەکرێنەوە . بەمەش سنوور لە نێوان مانکانی یەک وشەدا دادەنرێ و بەکارهێنانی فەرهەنگ ئاسان‌دەکرێ .

زۆر جار ئەوەش بەدی دەکرێ ، کە وشە فرمواتاکە ، وێڕای مانای ڕاستەوخۆ ، مـانای نـاڕاستەوخـۆ ( تیان ـ مجـاز ) یشی هەبێ . وەک

ئاراویز :

١ـ ئەو شوێنەی بەرداش ئاردی لێوە دەخاتە قولکەئاشەوە ..

٢ـ ئەو شوێنـەی ئاردی لە لێـواری بەرداشـەوە تێ‌دەڕژێ ٣ـ مـەجاز : ا / دەمـوکات ، دەمودوو ، دەمـوپل ، دەمـوکاوێـژ .. بریتی‌یە لە دەواری ( بواری ) دەمی قسەکـەر ـ واتە شێـوە و تەرزی قسەکردن و ئاخـاوتنی ب ) قسەی پڕوپووچ ، وتـەی بێ‌سەروبەر .

ئـەو چـەنـد نیـرەی لەبـارەی وشـەی ( هـاودەنـگ ) و ( فـرمولتا )وە تـۆمارمکـرد ، بێ‌گـومـان ئـاستی ( واتـانـاسی )و ( مـورفۆلۆجی ) دەگـرێتەوە . هـەرچی ئـاستی ( سینتاکس ) ی ئەو بابەتەیە درێـژەپێدانی دەوێ ، بـۆیە بـۆ دەرفەتێکی دی هەڵدەگرم .

لێرەدا بە پێـویستی دەزانم ، ئەو ڕاستییـەش بخەمـە پێش چاو ، کە ئەو جۆرە خـەوشە تـەنیا لە چـەند شـوێنێکی کەمی کارەکەی مامۆستا فەتتاحی مامەدا دەبینرێ ، بەڵام زێدە ڕۆیی نییە ، ئەگەر بڵێم لای د . وریا تەواو کاریگەرە ، بەتایبەت لەو شوێنانەدا زەق و زۆپ بەدەردەکەون ، کە بۆ کوێرکردنـەوەی سەرچاوەکە نموونەیێک دەگۆڕێ بە نموونەیێکی دی ـ واتە لە جێی نموونەیێکی لەبارو ڕەوانی مامۆستا فەتتاح ، نموونەیێکی

نالەبار و نارموان دادەنێ .

بەوینە ، مامۆستا فەتتاح شەش هاودەنگی ( دا )ی ریزکردووە و ماناى هەر یەکێکیانی راست لێکداوەتەوە ( ل ٧٣-٧٤ ) . بە بانی سێ وشەی ( بەلەک )ی هاودەنگی کردووەتە نموونە ( ل ٧٤) . پێنج وشەی ( ها )ی لێکداوەتەوە و نیشانی داون ، کە هاودەنگن .. و گەلێکی دی .. هەرچی ئەو چەند نموونە کەمەی د . وریایە بەشێکیان ( فرەواتا )ن ، نەک ( هاودەنگ )و سەربارى ئەوەش ماناکیان باش لێکنەدراوەتەوە :

نموونەی یەکەمی - ( ڕواندن ) لە هێلکاری یەکەمیدا دوو واتای بۆ دیاری کردووە ( ١-چاندن ؛ ٢-رەوانەکردن )و لە ژێر خودی ( ڕواندن )یشدا ( هێنانەدی ، جێبەجێ کردن )ی نووسیوە (ل ٦٦) . ڕاست وایە بڵێین دوو وشەی ( ڕواندن ) هەیە . یەکەمیان فرەواتایە و بەم مانایانە دێت . ( ١-چەقاندنی ریشە و شەتڵ ، جێبەجێ کردنی کار ) . هەرچی دووەمەکەیانە ، یەک واتای هەیە : ( وەدەرنان ) .

بۆ نموونەی دووەمی - (بار ) ، دوو واتای لێکداوەتەوە : ( ١- بارەداریک ، ٢- بارێکی نالەبار ) . ئەگەرچی ئەو مانایانە راستن ، بەڵام ، لە زمانی کوردیدا چەند وشەیێکی هاودەنگی ( بار ) هەن و هەر یەکەشیان چەند واتایەکیان هەیە .. هەرچەندە مامۆستا هەژاری موکریانی لە فەرهەنگی ، هەنبانە بۆرینە ،دا وەک وشەی هاودەنگی جیانەکردوونەتەوە ، بەڵام ئەوەتە ، ئەو هەموو واتایەی بۆ ( بار ) یادداشت کردووە :

دبار :

١- ئەوەی لەسەر پشتی بارەبەری دادەنێ ، ٢- رەمخی ئاش ( زرێبار ) ، ٢-پڕ و زۆر : ( پڕوبار ) ، ٤) داب و ئاسایی : ( دنیاکە لە باری خۆی نەماوە ) ، ٥- تاوان و قەرەبو : ( من باری جگی

خۆم لە تۆ دەوێ ) ، ٦) ڕاستی و دروستی : ( پیاوێکی بێبارە ) ، ٧) کار و کردە ( تاوانبار ، گوناهبار ) ، ٨) قرتماغەی سەر لێو : حەددی چی‌یە نالی کە بێ ملچە کەفارەت ( نالی ) ، ٩) ئەرك و ڕەنج : ( ئەمان چەند بارت گرانە ) ، ١٠) شوغڵ ( خەریکی کاروباری خۆمم ) ، ١١) بۆخ و سپیلی سەر زمان : ( زمانم باری گرتووە ) ، ١٢) نەخۆشی : ( بیمار و لەش بە بارم ) ؛ ١٣) تۆڵ ، بیزە ، بز ، بێچووی ناو زگ : ( بووره حەبێ باری هەیە ) ، ١٤) بەخت و هات ( بابلیەکی بار کەوتووم بۆم نایە ؛ ١٥) ساز و تەیاری ؛ ١٦) وێنە » ( ل ٣٩ ) .

جا ئەگەر د . وریا چاوێکی بە فەرهەنگە کوردییەکاندا بگێڕایە ، یان هیچ نەبێ پرسی لە کوردیزانێك بکردایە ، ئەوە وا ( بار )ی ( لەبار ) نەدەبرد .

سێیەم نموونەی کە وشەی ( لادان )ە و دوو مانای « ١- تێنەپەڕ ( ئازاد لایدا )و ٢- تێپەڕ ( ئازاد شتێکی لادا ) » ( ل٦٦) هیچ دوو وشە نین و لە بنەڕەتدا هەر یەك وشەیە و بەڵام دوو واتا دەگەیەنێ .. کەواتە دوو وشەی هاودەنگ نین و یەك وشەی فرەواتایە .

... هتد

مامۆستا فەتتاح لە چەند شوێنێکی نامەکەیدا ئەوەی یادداشت کردووە ، کە هەندێ لێڵ لە نووسیندا دەرناکەوێ و لە وتندا دەردەکەوێتەوە ( بڕوانە : ل ٥ ، ١٠-١١ ، ٧٠ .. ) و چەندین نموونەی بۆ کردووەتە بەڵگە .. د . وریاش دەڵێ : « هێز لە نووسیندا دەرناکەوێ[٢٥] بۆیە ئەگەر بەتەنیا بەرچاو کەوت بە لێڵ لە قەڵەم دەدرێ .. لە وتندا لێڵییەکەی نامێنێ . نموونەی تری ئەم جۆرە ( برایەتی ، وردە .. هتد ) » ( ل ٦٧ ، س ١ ) . وێڕای ناونەبردنی سەرچاوە ، خۆزیا بۆ لێکدانەوەی نموونەی

---

[٢٥] لە زمانی کوردیدا دەردەکەوێت .

دووەم – ( وردە ) . کەلکی لە فەرهەنگە کوردییەکان وەردەگرت ،
تا وا بە ساکاری ( وردە )ی نەدەخستە پێش چاو .

بێ لایەنانە نەدان بەوەدا دەنێم ، کە کارەکەی مامۆستا فەتتاحی مامە کوردییەکەی لەوی د . وریا ڕەوانتر و پاراوترە ، پێناسە و لێدوانەکانی ڕوونتر و تەواوتر و زانستیانەترن ، نموونە و بەڵگەکانی جوانتر و دروستتر و تێروتەسەلترن .. لە ڕووی چەندێتیشەوە دە ئەوەندەی ئەوی د . وریا دەبێ .. ئێدی گەر بەندە ئەو هەموو بەراوردەش بە درۆ هۆنیبێتەوە ، خۆ ئەوە هەر دەمێنێتەوە ، کە نووسەری وتاری « لێل لە زمانی کوردیدا » ، دەبوو وەک سەرچاوەیێک ناوی نامەکەی مامۆستا فەتتاحی مامە بەرێ ! .

د . وریا لەم وتارەیدا دزێنی نەکردووە و لە چەند شوێنێکی دیشەوە کەرەستەی ئامادەی وەرگرتووە و بە هیچ چەشنێک ئاماژەی بۆ ئەوانیش نەکردووە . بەوێنە لە ستوونی دووەمی لاپەڕە ( ٦٧)دا ، دەڵێ : « .. ( سەوزە ) لە وتندا ئەگەر هێز Stress خرایە سەر بڕگەی یەکەم دەبێتە سیفەتێک دەخرێتە پاڵ شتێک . وەک ( گیا سەوزە ) . ئەگەر هێز خرایە سەر بڕگەی دووەم واتای ( خواردەمەنیی سەوزە ) دەگەیەنێ » . بەندەش لە ( ل ٧٠ )ی کتێبی « زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا » نووسیونی : « وشەی ( سەوزە ) ئەگەر هێز لەسەر دوا دەنگی دابنرێ ، ئەوە مانای ( هەموو جۆرە شینایییەک دەگرێتەوە کە ڕوابێ ) . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بە مانای ( ڕەنگی سەوز ) دێت . وەک بوترێ ( ئەو مەرەکەبە سەوزە ) . .. »(٣٦) .

لە درێژەی ئەم لێدوانەدا د . وریا نووسیویە : « .. لە زمانی کوردیدا هێز لەسەر دوا بڕگەی وشە سەرهەڵدەدا » .. مامۆستا

---

(٣٦) بڕوانە : پەراوێزی ژ ١٧ .

قەناتی کوردۆ چل ساڵێك لەمەوبەر پەنجەی بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشاوە[27] . مامۆستا چەرکەزی بەکۆ سی و دوو ساڵ پێش ئێستا ئەوەی باس کردووە[28] . کەریمی ئەیووبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا بیست و نۆ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ئەوەیان یادداشت کردووە[29] . بەندەش ساڵی ۱۹۷٦ وتوویە : « زۆربەی کوردناسانی سۆڤێت لەو ڕایەدان ، کە هێز لە زمانی کوردیدا ، بە زۆری دەکەوێتە سەر دوا برگەی وشە »[30] .

سەرسوڕهێن ئەوەیە ، کە د . وریا کەرەستەیێکی زۆری لە نامەکەی فەتتاحی ماهەوە وەرگرتووە و بڕێکیش لە نووسینەکانی بەندە و کەسانی دیبەوە ، کەچی لە کۆتاییدا ئاماژەی تەنیا بۆ دوو سەرچاوەی کوردی کردووە ، کە ئەویش بەرهەمی خۆێن .. !

● ● ●

د . وریا لە زۆربەی نووسینەکانیدا وێڕای پەلەکردن ، دوو ڕێگای نازانستیانە دەگرێتە بەر :

۱ـ لەملاو ئەولا زانیاری وەردەگرێ و دەیکاتە موڵکی خۆی و ماڵ خاوەنەکەی زەوت دەکا ( وەك لە سەرەوە نیشانمان دا )[31] .

---

(۲۷) قەناتی کوردۆ ( کوردۆییف ) ، ڕێزمانی کوردی ، مۆسکو ، ۱۹٥۷ ، ل ۲۲ .

(۲۸) چەرکەزی بەکۆ ( باکایێف ) ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ، ۱۹٦٥ ، ل ۲٥ .

(۲۹) کەریمی ئەیووبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۱۷

(۳۰) بڕوانە : پەراوێزی ژ ۱۷ .

(۳۱) وەنەبێ د . وریا هەر لە بواری زمانەوانیدا دەستی بەسەر ماڵ و موڵکی خەڵکیدا گرتبێ ، بەڵکو لە مەیدانی زانستەکانی دیشدا ، هەمان ڕەوتی چەوت و چەوێڵ ئاسۆی لەلە مێتی .. ئەو وتارە زانستیانەی بە ناوی خۆیەوە لە بارەی لەلەك و زیندەوەران .. هەوە بڵاوی کردوونەتەوە ، لای هەموان ڕوون و ئاشکرایە ، کە لە ئینگلیزییەوە یان عەرەبییەوە کردوونیەتە کوردی .

## ٢ـ ئاو لە سەرچاوە ناداتەوە .. ئەمەش دەبێتە هۆی

ب ـ وێنە هەنووکە وتارێکم لەبەر دەستدایە ، کە بە ناوی « کارەساتی کۆچەرەکان » ( رۆژنامەی عیراق ، ژ ٣١٦٥ ، ١٨/٦/١٩٨٦ ) هەمیە ، کە ئەنجام و ئاکام : تەجروبە و تاقیکردنەوە : لێکۆڵینەوە و توێژینەوە : گەڕان و پشکنین : بەدووکەوتن و چاودێری پێنج و بەڵاوانی دەیان ساڵ ، دەیان پسپۆڕانی ماسییە ، کە بۆ ئاشکراکردنەوەی ئەو نهێنیانە سەدان شەویان لەناو دەریا و ئۆقیانووسەکاندا بەڕێکردووەتەوە و چەندینیان تووشی کارەساتی ناخۆش بوون .

خوێنەرانی ئازیز ! لەبەرچوون ، وا لە خوارەوە چەند دێڕێکی کەمی ئەو وتارەتان دەخەمە پێش چاو و خۆتان بینە حەکەم ، بزانن ئێمەیە کە خاوەنی چەند کتێباوێکین و د . وریاش ئەو لە بواری ماسی ناسیدا پسپۆڕ نییە ، چونکە ماسیگریش نەبێ ، ئیتر چۆن ئەو قسانە بە ناوی خۆیەوە دەکات و دەڵێ :

« .. ماسی ی سەلەمۆنی دەریا و کەندارەکانی ئەورووپا کە دەبنە چوار ساڵان ، هەموو لە هەمان کاتا مل ڕێ دەگرن و دەست بە کۆبوونەوە دەکەن .. هەموو سەلەمۆنەکانی دەریا و کەندارەکان لە شوێنێکا کۆ دەبنەوە و ژمارەیان دەگاتە سەدان هەزار ملیۆن ڕووبەرێکی سەدان کیلۆمەتر دووجایی داگیر دەکەن .. چوار پێنج هەزار کیلۆمەتر دەبڕن تا دەگەنە ناوەڕاستی زەریا ( محیط )ی ئەتلەسی ، لەگەڵ ئەو ماسی یانەی لە دەریا و کەندارەکانی ڕۆژهەڵاتی کەنەدا و ئەمەریکاوە هاتوون دەگەنە یەک و پۆلێکی هەرە گەورەتر پێک دێنن .. ئنجا هەموو پێکەوە بەرەو باکوور هەزاران کیلۆمەتری تر دەبڕن تا دەگەنە .. هەر کۆمەڵەی ڕوو لەو زێیە دەکات کە تیایا لە دایک بووە .. لەوێ گەراکانی خۆی دادەنێ .. زۆری پێناچێ سەر دەنێتەوە . گەراکان هەڵدێن .. ئەوەی تازە نزیکەی دوو ساڵ لەم شوێنەدا دەمێننەوە تا هەراش دەبن . ئنجا هەموو پێکەوە لە هەمان کاتدا مل ڕێ دەگرن و بەرەو دەریاکان ئاوێر دەبنەوە . هەر بەو ڕێگەیەی باوانیان پێیەوە هاتن .. بەرەو باشوور مل ڕێ دەگرن تا دەگەنە ناوەڕاستی زەریای ئەتلەسی .. ماسییەکانی ناو سەرچاوە و کانی و ڕووبار و زێکانی ئەورووپا و ئەمەریکای باکوور و ئیسلەندە .. دوای چواردە ساڵ .. گەشتی چوون بۆ مەڵبەندی باوان سێ ساڵ دەخایەنێ .. » .

ئەگەر د . وریا پەنجەی بۆ سەرچاوەی ئەو وتارە ڕابکێشایە و بینووسیایە کە لە کوێوە وەریگرتووە و لە چ زمانێکەوە کردوویەتیە کوردی ، ئەوە دەستپاکی و زانایی خۆی ئیسپات دەکرد و ئێمەش گومانمان لەو زانیارییانە نەدەبوو . هەڵەکە بریا

سالکاریی نووسینەکانی و کەوتنە هەڵەی گەورەوە .. ئەوەتە لە وتاری « ئیملای کوردی و چەند تێبینی‌یەک »دا[٣٢] ، نووسیویە : « دەبێ ئەوەشیان لەبیر نەچێ کە هەموو لامێکیش دوای ئەلف بێ لە زمانی کوردیدا قەڵەوە وەک لە ( ماڵ ، هەڤاڵ ، ساماڵ ، تاڵ .. هتد » ( ٤٤٢ ) .. بۆ ئەوەی زانیاریی ڕاست و دروست بگەیەنرێتە خوێنەر و خوێندکاری کوردی ئێستا ، دەبێ توێژەر زێدە خۆی ماندوو بکا .. پێویستە ببێتە مۆرانە و بچێتە نێو بەرگەکانی ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و فەرهەنگ و دەستنووسە کوردییەکانەوە .. ئاخر ، کە لەو بەرهەمە کوردییانەدا دەیان وشە هەبن ( ل )ی دوای ( ا )یان لاواز بێ ، وەک : ( ئالان ، ئالودە ، ئالیک ، ئالیکار ، ئالبسۆر ، ئالە ، ئالنگ ، بالۆرە ، بالووکە ، چالاک ، چوالە ، زالە ، سالار ، قالۆنچە ، کالیار ، لالۆ ، لالەبالس ، لالەزار ، لالووت ، لالفاو ، مالوان .. )[٣٣] . ئیتر چ ڕەوایە ئاوڕیان لێ نەدرێتەوە و بە چوار وشەی ( ماڵ ، هەڤاڵ ،

---

نەکەین ، کە زمانەوانێک ، نەک سروشتناسێک : لاڕێکی وڵاتێکی شاخاوی ، نەک بە سالاچوویێکی ملبەندی کەنار دەریا و ئۆقیانووس .. لە بواری زیانی ماسیدا هێندە پسپۆڕ و شارەزا و بە ئەزموون بێ .

بەپێچەوانەی ئەم ڕەفتارەی د . وریاوە ، دەبینین دەیان هەواڵ و باسی زانستی لە زمانانی جیاوازەوە دەکرێنە کوردی و لە چاپەمەنییە کوردییەکاندا بڵاودەکرێنەوە . هیچ زێدە ڕۆیی نییە ، گەر ئەڵێم زۆربەیان و ، بڵێم سەرجەمیان پەنجەیان بۆ سەرچاوەکانیان ڕاکێشاوە .. جا گەر ئەو شێوازەی د . وریا پەیڕەو نەکرێتەوە ، ئەوە دەبێ دەیان کەلە ڕووناکبیری کورد هەڵە بن و د . وریا ڕاست بێ .

لێرەدا پەنجە بۆ ئەوەش ڕادەکێشم ، کە چەندین وتاری لەو چەشنەی د . وریام خوێندووەتەوە و بە بیرمدا نایەت ، لەسەر تاکە یەکێکیان نووسیبێتی وەریگێڕاوە .

( ٣٢ ) د . وریا عومەر ئەمین ، ئیملای کوردی و چەند تێبینی‌یەک ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٢٤ - ٤٤٩ .

( ٣٣ ) ئەوانەمان کورد کاتێ ناوە عەرەبی‌یەکان کورت دەکاتەوە و شێوەی کوردییان پێدەدا ، ئەوانەیان ، کە ( ال )یان تێدایە ، سەرەتاکیان ( ل )ەکەیان لاوازە : ( مالە ، سالە ، ئالە ، ... )

سەمەڵ ، تاڵ ) یەسلینکی نابەجێ بۆ زمانی دەوڵەمەندی کوردی ڕۆیەتی .. بۆ زمانی شیرینی کوردی کەم زوڵم و زۆری لێکراوە ، تا ئێمەش بەرانبەری وا بێخەم و بێباک بین و بە هانایەوە نەیەین ..

هەندێ خەوشی زمانی دی ئەو دوو دێڕە و چەند دێڕێکی سەرووتری ئەم نووسینەی د . وریا ، ناچارم دەکەن بۆ تاویک باسە بنەڕەتییەکە جێبێڵم و بێمە سەر نیشاندانی بڕێکیان :

١ـ نووسەر لەو دوو دێڕەدا ، کە دەربارەی دوو فۆنیمی ( ل )ی لاواز و (ڵ) دەدوێ ، لە ڕووی فۆنۆلۆجییەوە تێیان دەڕوانێ ، کەچی نووسیویە : « .. هەموو لامێکیش دوای ئەلف بێ .. » . بێگومان ، د . وریا چاک دەزانێ ، کە ( لام )و ( ئەلف ) ناوی پیتن ، نەک ناوی فۆنیم .. وا بێدەچی ، ئەمە هۆی پەلەکردن بێ .. !

٢ـ کەمێ لە سەروو ئەو دوو دێڕەشەوە وتوویە : « .. ڕایەکی پووچە و بە تیشکی نەزمری‌یەی فۆنیم لش دەبیتەوە » . هیوادارم گلەییم لێنەکرێ ، گەر بڵێم ، ئەو شێوازە نزمە ، زمانی کووچە و کۆڵانانە . پێویستە د . وریا ئەوە بزانێ ، کە زمانی نووسین ، شێوازی بەرزی گەرەکە . هیچ نەبوایە با بە زمانێکی سادە بیوتایە ( .. ڕایەکی نادروستە و تیشکی نەزمرییەی فۆنیم هەڵیدەوەشێنێتەوە ) ..

... و هەندێکی دی .

ئاوڕ لە سەرچاوە نەدانەوە و خۆ ماندوو نەکردن ، بە بەشێکی نووسینەکانی د . وریاوە دیارە . ئەوەتە هەر لەم وتارەدا ، لە چەندین شوێنی دیدا ، ئەو جۆرە ناتەواوییانە بەدی دەکرێن .

بەوێنە :

نووسیویە : « لە ئەنجامی گەڕان بە شوێن هەموو ئەو وشانەی - بابڵێین - لەگەڵ ( پیر )و ( بیر )دا جووتۆکەن لە زمانی کوردیدا ،

ئەم حەوت وشانەی خوارەوە دەستدەکەون ( بەپێی کۆششی خۆم ).

بێڕ - پێڕ - تێڕ - شێڕ - سێڕ - زێڕ - مێڕ « ( ل ٤٣٦-٤٣٧ ) .

ئەگەر د . وریا باش کۆششی بکردایە ، هەڵبەت وشەکانی

( گێڕ ، لێڕ ، قێڕ ، نێڕ ، هێڕ ، دێڕ ، زێڕ .. )و هەندێکی دیش دەکەوتنە ڕیزی ئەو حەوت وشەیەوە ، کە کردوونیەتە نموونە .

بە دوا ئەو کۆمەڵە ناتەواوەدا ، کۆمەڵی دووەمی ڕیزکردووە ، کە ئەمانەن : « کەر - کەڕ - کەو - کەم - کەس - کەی - گەل - کەلە» ( ل ٤٣٧ ) . لێرەدا بە ڕاشکاوی دەڵێم ، بە کەمێ خۆ ماندووکردن و بیرکردنەوە ، دەتوانرا وشەکانی ( کەز ، کەش ، کەپ ، کەت ، کەچ ، کەڤ ، کەد ، کەژ ، کەڵ .. ) یشیان بخرێتە سەر .

واش دەردەکەوێ ، کە د . وریا زۆر سەروسەودای لەگەڵ ئەو کارانەدا نەبێ ، کە لەمەڕ زمانی کوردییەوە نووسراون . گەرنا لە باسی نەبوونی نیگار بۆ فۆنیمی (أ)دا ، وا بێباکانە نەیدەوت :

« ئەوە چەند ساڵە زمانی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی دەنووسرێ ، کەچی هیچ خوێندەوارێک هەستی بە گیروگرفتی وا نەکردووە باس بکرێ » ( ل ٤٤٧ ) .

شایانی باسە ، مامۆستا توفیق وەهبی لە سەرەتای ژیانی زانستییەوە هەستی بە بوونی ئەو کورتە بزوێنە کردووە و ساڵی ١٩٢٩ لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی »دا پیتی ( ی )ی بۆ کردبووە نیگار[٣٤] .. بەڵام وێکچوونی شێوەی ئەم پیتە لەگەڵ پیتی ( ی - ی ) بووە هۆی چارەسەرنەکردنی ئەو گیروگرفتە .

د . جەمال نەبەز کاتێ لە کتێبی « زمانی یەکگرتووی

---

(٣٤) تەوفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ١٩٢٩ ، ل

کوردی ـدا[٣٥] باسی گیروگرفتەکانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی دەکات ، زۆر ڕاست بۆ ئەوە چووە ، کە ئەو ئەلفوبێیە « هەرچی چۆن دەستکاری بکرێ ، هێشتا گەلێک ناتەواوی تێدا دەمێنێت» ( ل ٨٣)و یەکێکیش لە ناتەواوییەکانی ، کە پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، ئەوەیە کە دەڵێ : « تیپی دەنگداری وونبوو ( واتا زێری کورت ) یا بزرۆکە ـ تۆفیق وەهبی وتەنی ـ بەم ئەلفوبێیە نانووسرێ » ( هەمان سەرچاوە ، ل ٨٤ ) .

مامۆستا مەسعوود محەمەد لە چەند نووسینێکیدا دەربارەی (أ) دواوە[٣٦] . ئەوەی جێی مونافەشە بێ ، ئەوەیە نووسەر ئەو کورتە بزوێنەی بە هێز ( کە ئەو « فورس‌کردن »ی پێوتووە ) داناوە .. دواتریش لە نێوان مامۆستا مەسعوود محەمەد و نووسەری ئەم ڕەخنەیەدا ، دەربارەی ئەو کێشەیە بە چەند وتارێک بیروڕا ئاڵوگۆڕ کراوە[٣٧] .

ئەگەرچی وێڕای ئەو زانانە ، هەندێ زمانەوانی دیش لە بارەی فۆنیمی ( أ )و گیروگرفتی نەبوونی وێنە بۆی لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیدا کۆڵیونەتەوە ، بەڵام کارەکانی ئەو

---

(٣٥) د . جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .

(٣٦) بۆ نموونە :

أ ـ مەسعوود محەمەد ، «ڕێنووسی کۆن» ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٤ ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ٢٥٢ ـ ٢٥٤ .

ب ـ مەسعوود محەمەد ، «ئەوەتێک چیمان بۆ بکا ؟» « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ٥٩١ .

(٣٧) بڕوانە :

أ ـ مەسعوود محەمەد ، لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧ـ٣٢

ب ـ د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، چەند ڕشەیەک دەربارەی وتاری ( لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا » ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٩٠ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٦٢ـ٦٩ .

چەند نووسەرەی ناومان بردن ، سەر و زیادە بۆ ڕەتکردنەوەی وشەکانی د . وریا ، کە دەڵێ : « هیچ خوێندەوارێک هەستی بە گیروگرفتی وا نەکردووە .. » .

بەداخەوە ، د . وریا زۆر جار شتی ئەوتۆ دەنووسێ ، کە هەر قسەی ڕووت بێ و نرخی زانستی نەبێ . ئەوەتە لە نزیک کۆتایی ئەم وتارەیدا وتوویە : « گەر ئەو ئیملایەی ئێستە هەمانە بەراوردبکەین لەگەڵ ئیملای میللەتانی تری وەک ئینگلیزی‌و چینی و فەرەنسی ئەوسا هەست بەوە دەکەین ئێمە لەچاو ئەو میللەتە پێشکەوتووانە گیروگرفتی ئیملاییمان چەند کەمە » ( ل ٤٤٩) .

بەڵێ د . وریا ئینگلیزییەکی باش دەزانێ و بۆی هەیە بەراورد لە نێوان کێشەکانی ڕێنووسی کوردی و ئینگلیزیدا بکات . بەڵام بۆچوون و بیروڕاکانی کاتێ قاڵبی زانستی وەردەگرن ، کە بەڵگەو نموونەی ڕاست و واقیعی‌یان بۆ کرابێتە پاڵپشت . ئەم نەک لەو بارەیەوە هیچی نەکردووە و هەر قسەی ڕووتی کردووە ، بەڵکو دوو زمانی ( چینی )و ( فەرەنسی )یشی تێهەڵکێشاوە . جا کەسێک زمانی چینی و فەرەنسی‌یش بزانێ ( کە ئەو نایزانێ ) ، گەر شارەزایی‌یەکی باشی لە نووسینیاندا نەبێ ، ڕێ بە خۆی نادا قسەی وا بکا .. جا نێوان واقیع و ئەو جۆرە خەمڵاندنە ئاسمان‌و ڕێسمانە .

یاخود کە لە دووەم لاپەڕەدا نووسیویە : « ئەلفوبێی هەر زمانێ لەسەر بیناغەی فۆنێمەکانی دادەمەزرێت . ژمارەی ئەلفوبێی هەر زمانێکیش ژمارەی فۆنێمەکانی‌یەتی .. » ( ل ٤٣٥) ، ئەمە هەر قسەی ڕووتی کردووە ، بەداخەوە کەوتووەتە هەڵەی گەورەشەوە :

١- ئەوەتە نیمچە خوێندەواریش هەست بەوە دەکات ، کە نووسینی چینی بەپەیڕەوی چ ڕێبازێکی کردووە .

٢- لە ڕێنووسی زمانی ڕووسیدا ڕێبازی فۆنەتیکی و

مۆرفۆلۆجی کاریگەرن ..[39] لەم زمانەدا لەگەڵ بەکارهێنانی پیت وەک نیشانەی فۆنیم ، هەروەها بەکارهێنانی پیت وەک نیشانەی برگەش لە ئاوانداية ، کەواتە چۆن « ژمارەی ئەلفوبێی هەر زمانێکیش ژمارەی فۆنیمەکانی‌یەتی .. ؟» ..

٣- ڕێنووسی ئینگلیزی و فەرەنسی پەیڕەوی ڕێبازی چاولێکەری دەکەن ، کە هۆی نووسینی گەلێک وشە بەو شێوەیەی ئێستا وا ڕوون‌دەکەنەوە ، گوایا باووباپیرانیان بەو جۆرە نووسیویانە[39] ، ئەویش چونکە نووسینی ئەو زمانانە بە دەورێکی مێژوویی درێژدا تێپەڕیوە و گەلێک پاشماوەی کۆنی تێدا ماوە .

٤- د. وریا دەبوو مەفهوومی ( ئەلفوبێ )و ( پیت ) لێک جیابکاتەوە و لەو دەربڕینەدا : « ژمارەی ئەلفوبێی هەر زمانێکیش ژمارەی فۆنیمەکانی‌یە » ، ( پیتەکانی ) لە جێی ( ئەلفوبێی ) دابنایە ، چونکە سەرجەمی ( پیت )ەکانی زمانێک ، دەبنە ( ئەلفوبێ )ی ئەو زمانە .

سەلیقەی زمان و وردیی پاش هەڵبژاردنی وشە و ڕستە بە پێی مەبەست وتار دەرازێننەوە و ناتەواوی وەلاوە دەنێ و بیروڕا بە خێری و پڕی دەخاتە سەر ئەو نیازەی نووسەر هەیەتی .. بە نموونە ، پێمانایە د. وریا لە بەندی یەکەمی وتارەکەیدا بیوتایە ( لە هەموو نووسینێکدا ڕیشەی نیشانەی دەنگ ) هەیە ، ئەو دەمە ڕەخنەی لێنەدەگیرا ، چونکە تەنانەت لە نووسینی هیرۆگلیفیشدا ، ئەو دیاردەیە ڕەنگی داوەتەوە .

ڕاست وابوو ، لە بەندی دووەمیشدا بڵێ : ( باشترین ئەلفوبێ ، کە لەسەر بناخەی فۆنۆلۆجی دانرابێ ، ئەوەیە

---

( ٣٨) ف . ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ، چاپی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٣٦٢ .

(٣٩) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٦٧ .

ژمارەی پیتەکانی هێندەی ژمارەی فۆنیمەکانی ئەو زمانە بێ )
چونکە ئەگەر ئەلفوبێ لەسەر بناخەی یەکسانی لە نێوان ژمارەی
پیت و ژمارەی فۆنیمدا دابمەزرێ ، بەشێکی زۆری کێشەی
ڕێنووس نامێنێ .. بەڵام ئەلفوبێی کامڵ نییە ، چونکە تێپەڕینی
بە دەوری مێژوویی درێژدا گیروگرفتی بۆ سازکردووە .

سەیر لەوەشە ، د. وریا هەر خۆی دواتر نووسیویە :
« دەربارەی ( ڵ ) ، بەلای منەوە سروشتی نووسینی کوردی بە
ئەلفوبێی عەرەبی ئەم ( ڵ )یەی بەسەر زمانی کوردیدا
سەپاندووە » ( ل ٤٤٧ ) جا کە فۆنیمی ( ڵ ) لە کوردیدا نەبێ و
پیتیشی بۆ دانرابێ ، ئەوە ژمارەی پیتەکانی پترن لە فۆنیمەکان ..
کەوابە چۆن دەشێ بوترێ ، « ژمارەی ئەلفوبێی هەر زمانێکیش
ژمارەی فۆنیمەکانی یەتی » .

لە هەمان لاپەڕەشدا کە دەڵێ : « سەر و بۆر و ژێر ( الفتحة
والضمة والكسرة ) سێ فۆنیمن لە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی
عەرەبی ، کەچی زۆربەی زۆری چاپکراوەکانی هیچ سیمایەکیان
لە نووسینا بۆ نییە » ، دیارە هیچ بیری لەوە نەکردووەتەوە ،
کە سێ فۆنیمی ئەو زمانە لە نووسیندا وێنەیان نەبێ ، ئەوە
ژمارەی پیتەکانی ئەو زمانە لە فۆنیمەکانی کەمترن .

ئەم وتارەی د. وریا یەکجار پڕ ناتەواوی و کەم و کورتییە و
لێدوان لە گشت ڕوویێکی ئەو زۆر دەکێشێ ، بۆیە لە کۆتاییدا
تەنیا پەنجە بۆ سێ خاڵیان ڕادەکێشم :

١- ئەم وتارە ، کە بەناوی ( ئیملای کوردی و چەند
تێبینییەک )ەوەیە ، دەبوو دەیان وتاری زانایانی کورد
سەرچاوەی بن ، بەتایبەت چونکە لەو بارەیەوە بە زمانی کوردی
کاری زانستی زۆرە بەداخەوە یەک لێکۆڵینەوە چییە ،
نەکراوەتە سەرچاوە و تەنیا پەنجە بۆ سێ کتێبی ئینگلیزی
ڕاکێشراوە . ئەمەش هەر شوکرانە بژێریی دەوێ ، چونکە چوار
مانگێک پێشتر بەشێکی هەمان وتاری ، لە گۆڤارێکی دیدا

بڵاوکردووەتەوە[40] و لەویدا ناوی ئەو سەرچاوە ئینگلیزیانەشی نەبردووە .

٢ـ د . وریا زۆر دەکەوێتە ئەوەی لە بەرهەمەکانیدا ڕێدەکەوێ ، بڵێ فلانە نووسەر وای وتووە ، کەچی لێرەدا ناچار بووە ، چەند جارێک بنووسێ : « هەندێکیش لەسەر ئەو رایەن .. » ( ل ٤٣٤ ) .. هی واش هەیە لەسەر ئەم رایەیە .. » ( ٤٣٤ ) .. « هەندێ زمانەوان هەن .. » ( ل ٤٤٤ ) .. هتد . بەداخەوە ، ئەم وتنە و ئەوتنەکانی دی شتێکی ئەوتۆیان جیا نییە ، چونکە نە ناوی ئەو ( کەس )و ( زمانەوانانە )ی نووسیوە و نە ئاماژەی بۆ بەرهەمەکانیان کردووە .

٣ـ لەنگی و خواروخێچی ی گەلێ ڕستەی ئەم وتارەی و شێوازی لاواز و ناڕەوانیی کوردی نووسینەکەشی بابەتی وتارێکی سەرلەبەرە .

• • •

لە خوێندنەوەی گەلێک نووسینی دا ، خوێنەر دێتە سەر ئەو ڕایەی ، کە د . وریا :

١ـ ئاگاداری ئەو لێکۆڵینەوانە نەبێ ، کە دەربارەی زمانی کوردی نووسراون ؛

٢ـ زمانی کوردی باش نەزانێ .

---

(٤٠) لە ژمارە (٨)ی خولی دووەمی گۆڤاری « نووسەری کورد » ( حوزەیرانی ١٩٨٢ )دا بە ناوی « ئەنێیەکانی زمانی کوردی » ( ل ٢٩ـ٣٥ )یەوە ، وتارێکی بڵاوکردووەتەوە ، ئەم حەوت لاپەڕەیە بێ ئەوەی هیچ دەستکارییەکی بکرێ ، لاپەڕە و نیو ێکی لە سەرەتاوە خراوەتە سەر و چەند لاپەڕەیەکیش لە کۆتاییەوە و بە ناوی « ئیملای کوردی و چەند تێبینییەک »ەوە لە بەرگی نوێی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » ( تشرینی یەکەمی ١٩٨٢ )دا چاپکراوە .

**# نموونە بۆ ڕای یەکەم :**

بەوێنە لە وتاری « ڕێکەوتن لە زماندا »[41] نووسیویە : « سێ جۆرجنس لە زماندا دەستنیشان کراوە : ا : نێرینە ، ب - مێیینە ، جـ - بێلایەن » (ل ١٦) . بەڵام ئەوەتە ( لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد ) چوار جنسی دیاری کردووە :

« ناو لە ڕووی زایەندەوە ( جنسەوە ) . ئەمیش دەکرێت بە چوار بەشەوە : ا - ناوی نێرینە .. ب - ناوی مێیینە .. جـ - ناوی دوولایەن . د - ناوی بێلایەن »[42] .. د . ئەورەحمانی حاجی مارفیش بەهەمان چەشن چوار جنسی یاداشت کردووە : « ١- ناوی نێر .. ٢- ناوی مێ .. ٣- ناوی دوولایەن .. ٤- ناوی بێلایەن »[43] .. هتد .

**# نموونە بۆ ڕای دووەم :**

لە هەمان وتاردا وتوویە : « لە کوردیی خوارووشدا لە نێدادا نەبێ جنس جیاناکرێتەوە . ( کوڕە ، ماسە بەرامبەر کچێ ، پووری ) » (ل١٦) .. وێڕای ئەو جیاوازییەی لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا لە دۆخی بانگهێشتندا لە نێوان نێر و مێدا دەکرێ ، هەروەها لە زوربەی ناوچەکانی هەمان دیالێکتدا لە دۆخی نیان ( Oblique Case )یشدا نێر و مێ لەیەک جیادەکرێنەوە . لەم دۆخەدا ناو ئەگەر نێر بێ نیشانەی ( ی )ی

---

(٤١) د . وریا عومەر ئەمین ، ڕێکەوتن لە زماندا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩١ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٦-١٩ .

(٤٢) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ، ل ١٩-٢٠ .

(٤٣) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم - ( مۆرفۆلۆژی ) ، بەشی یەکەم ( ناو ) ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ل ١٦٨-١٧٨ .

پێوە دەلکێ ، بەڵام کە مێ بێ نیشانەی (ێ) ی دەچێتەسەر . ئەم دیاردەیەش بەتایبەت لە ناوچەی سۆران ( واتە ـ مەڵبەندی د . وریا )دا یەکجار ڕوون و ئاشکرایە ، بۆ بەڵگە لە کتێبی « فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری »یەوە[44] چەند نموونەیێک دێنینەوە :

ا ـ بۆ جنسی نێر :

مەیلێکم هەیە مەیلانێ
لەناو بۆخچەی سوڵتانێ

( ل ۱۲)

بووکی ماڕێ مێرێ
بردیان لۆ یەخسیرێ

( ل ۲۰۲)

.. هتد

لەو نموونانەی سەرەوەدا ، وشەکانی ( سوڵتان ، مێر .. ) لەبەر ئەوەی جنسی نێرن و لە دۆخی تیاندان ، نیشانەی ( ی )یان پێوە لکاوە .

ب ـ بۆ جنسی مێ :

بای شەمار بە هاوینێ
. . . . . .
خەو خۆشە لەگەڕ تامینێ

( ل ۲۹)

(٤٤) فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردەواری ، کۆکردنەوەی محەمەد کەریم شەریف ، کەرکووک ، ۱۹۷٤ .

سەنگ ماڵووری خۆراسان

هێنام لە لای <u>لاجانێ</u>

(ل ٣٢)

... هتد

دەبینین وشەکانی ( ئاسین ، لاجان ) .. نیشانەی (ێ) یان وەرگرتووە ، چونکە لە جنسی مێن و لە دۆخی تیاندان[45]

جا د . وریا بەر لەوەی بڕیار بدا جنس لە کوردیی خوارووادا : « .. لە ئێستادا نەبێ جیاناکرێتەوە » ، دەبوو هیچ نەبێ کەمێک لە شێوە زاری خۆی وربینێتەوە ، یان هەندێ بەرهەمی چاپکراو بخوێنێتەوە ، یان پرسیارێک بکا ...

ئەوێک بەرانبەر مەڵبەندی سۆرانی ئازیزی خۆی بەو چەشنە بێ ، ئیتر چۆن داوای لێبکرێت ، کە ئاوڕ لە ناوچەی موکریان و زووی سلێمانی بداتەوە ، کە لەو دەڤەرانەشدا بەئاشکرا لە دۆخی تیاندا جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێ[46].

یاخود د . وریا کە سەبارەت زمانی زگماکی خۆی وا ئاشارەزا و کەمتەرخەم بێ ، ئێدی دەمێک باسی زمانێکی بێگانە دەکات ، چۆن خوێنەر بڕوا بە نووسینەکانی بکات و بێگومان بێ لێیان . بەداخەوە ، من بەش بە حاڵی خۆم بەرانبەر زۆربەی وتەکانی واقم وڕدەمێنێ .. د . وریا با هەندێ زمانی ڕووسیش بزانێ ، بەڵام لەم وتارەیدا بۆ ئەوەی نەکەوتایەتە هەڵەی وا گەورەوە ، دەبوو تەماشای فەرهەنگێکی ڕووسی بکردایە ، تا وا بە ساویلکەیی وشەی ( دەفتەر ـ Titrad ) ، کە مێیە ، بە نێر دانەنێ ( ل ١٦ـ ، س ٢ ) .

---

(٤٥) بۆ پتر زانیاری لەو بارەیەوە ، بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی .. ل ١٧٦ـ١٧٧

(٤٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ل ١٧٢ـ١٧٦ .

د . وریا کە کەمێک ڕووسی بزانێ و هەڵەی وا گەورە بکا ، وشەیێکی باو و زۆر بەکارهێنراو و ئاشکرای جنسی مێ بە نێر دابنێ ، ئیدی دەبێ سەنگی ئەو قسانەی چەند بێ ، کە دەربارەی ئەو زمانانە دەیکا ، کە تاکە وشەیەکیان لێ نازانێ .. ئەوەتە دەڵێ :

« لە هەندێ زماندا کۆ لە ( سێ ) وە دەست پێدەکات وەک لە .. سانسکریتی و چەند زمانێکی سلۆڤانیکی .. » (ل ١٦ . س ١) .

« زمانی واش هەیە کۆی لە چوارەوە دەس پێدەکات .. وەک لە زمانی فیجیینی و تیکری » (ل ١٦ ، س ٢) .

« زمانی فنلەندی (١٥) حاڵەتی هەیە .. » (ل ١٧ ، س ١) .

« زمان هەیە ( یەکەر ) و ( پەرکار ) تێیدا ڕێکدەکەون .. وەک زمانی سنهالی » (ل ١٨ ، س ١) .

لەبەر ئەوەی د . وریا هیچ یەکێک لەو زمانانە نازانێ ، نەدەبوو بە ناوی خۆیەوە ئەو قسانە بکات .. ئەگەر ئەو ئەیویستایە خۆی دەربخا .. یا مەرجی لێکۆڵینەوەی زانستی بزانایە ؛ یان ڕێزی لە بەرنامەی زانستی بگرتایە ، هەڵبەت ناوی ئەو سەرچاوەیەی دەبرد ، کە ئەو زانیارییانەی لێوەرگرتووە ..

جا ئەگەر ڕێباز و شێوازی تازەگەریی د . وریا ئەمە بێ ، ئەوە بە هەموو سەنگ و پێوانەیێک لە هیچ بوارێکی زانستیدا جێگای نابێتەوە و نابێتەوە و پەسەند نییە .

• • •

ئەگەرچی لە چەند لێکۆڵینەوەیێکی کەمی زمانەوانیی لای خۆماندا ، چاوگ بۆ وەدەست هێنانی ڕەگی کردار ، کراوەتە سەرچاوە ، بەڵام دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین ، کە بەشێکی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لە ڕوانگەی قەدی کردارەوە شوێن دۆزینەوەی ڕەگی کردار کەوتوون . بەوێنە ، بڕوانە : ( د . قەناتی کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ١٥٨-١٦٤ ؛ ئی . ئی . تسوکێرمان ، لەبارەی ڕێزمانی

کوردی‌یەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٧٦ـ٩٥ : ك . ر . ئەیووبی و
ئی . ئا . سمیر نۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لینینگراد ،
١٩٦٨ ، ل ٦٩ـ٧٦ : ع . خ . بەکەیێف ، زمانی کوردەکانی
سۆڤیێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، ل ١٦٦ـ١٧٠ : D . N.Mackenzi ,
Kurdish Dialecte Studies , London , 1961 , pp .
. 85-87 , 177 -180
... هتد

بەڵام سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، د . وریا لە وتاری « کات و ڕەگی فرمان »دا[47] دەڵێ : « ڕێزمانی تەقلیدی چاوگی کردووە بە سەرچاوە و لێیەوە ڕەگی ڕابوردوو وەرئەگرێ بە لابردنی ( ن )ی چاوگ .. بەڵام پەیوەندیی مۆرفۆلۆجیی نێوان ڕەگی ڕابوردوو و داهاتووی دەستنیشان نەکردووە . واتا ئەو یاسایانەی نەخستووەتە ڕوو بە هۆیانەوە ڕەگی داهاتووی فرمان لە ڕابوردووی وەربگرێ »(ل ٢٨ .. ) .

بەر لە هەر شت ئەو ڕاستی دەخەمە پێش چاو ، کە وێکچوونێکی زۆر لە نێوان کەرەستە و بۆچوونەکانی ئەم وتارەی د . وریا و لاپەڕە ( ٨٥ـ٨٧ : ١٧٧ـ١٨٠ )ی کتێبی ناوبراوی د . مەکەنزیدا هەیە .

وێڕای ئەوەی زۆربەی زۆری نووسەرانی ڕێزمانی کوردی بە دەیان ساڵ بەر لە د . وریا ئەو یاسایانەیان خستووەتە ڕوو ، کە بە هۆیانەوە ڕەگیان لە قەد پێوەردەگیرێ ، ئەوەش ڕوون و ئاشکرا دەبینرێ ، کە لێکۆڵینەوەکانیان لەوەی ئەو قووڵتر و وردتروتێرو تەسەلترە و هەڵەشیان یەکجار کەمترە .

بەداخەوە ، ئاوڕنەدانەوە لەو خەرمانە بە بەرەکەتەی پێشڕەوان و پەلەکردن بوونەتە هۆی هەڵەی گەورە و ناتەواویی

---

(٤٧) د . وریا عومەر ئەمین ، کات و ڕەگی فرمان ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٦٥ ، بەغدا ١٩٨٤ ، ل ٧٨ـ٨٠ .

زۆری وتاری ناوبراوی د . وریا .

نووسەر لە سەرەتادا نووسیویتی : « لەم وتارەدا هەوڵ ئەدەین پەیوەندی مۆرفۆلۆجی‌ی نێوان ڕەگی کاتی ڕابوردوو و ڕەگی کاتی داهاتووی فرمانی کوردی بخەینە ڕوو . واتا ئەو یاسایانەی ئەشێ بە هۆیانەوە ڕەگی داهاتوو لە هی ڕابوردوو وەربگیرێ » ( ل ۷۸ ) .

بێگومان پێوەندیی مۆرفۆلۆژیی نێوان قەدی کردار و ڕەگی کردار ـ واتە ئەو یاسایانەی دەشێ بە هۆیانەوە ڕەگی لە قەدەوە بێ وەربگیرێ ، ڕێگەیێکی دروست و زانستانەیە .

ئەوەتە د . وریا مەبەستی بووە لە ڕێگەی نیشاندانی پێوەندیی مۆرفۆلۆژیی نێوان قەدی کردار و ڕەگی کردارەوە زانیاریی نوێ بخاتە ڕوو و لەسەر ئەو ڕێگەیە نەڕوات ، کە چاوگی تێدا کراوەتە سەرچاوە ، کەچی لە سەرەتای هەر یاسەیەکیدا لەبریتی ئەوەی لە ڕوانگەی قەدەوە بۆ ڕەگ بگەڕێ ، پەنجەی بۆ چاوگ درێژ کردووە ـ واتە بۆ ئەو شێوازەی خۆی بە « ڕێزمانی تەقلیدی » ناوی دەبا . چەند نموونەیێک :

• لە دەست پێکردنی یەکەم یاسای دۆزینەوەی ڕەگدا وتوویە : « گەر هات و چاوگەکە ( یائی ) بوو واتا ( ی ) تیا پێش ( ن ) دەرکەوت ڕەگی داهاتووی بە لابردنی ( ی )یەکە دەس ئەکەوێ » ( ل ۷۹ ) .

• « گەر چاوگەکە ئەلفی بوو » ( یاسای دووەم ، ل ۷۹ )
• « گەر چاوگەکە واوی بوو » ( یاسای سێیەم ، ل ۷۹ )
• « گەر فرمانەکە دالی بوو » ( یاسای چوارەم ، ل ۸۰ )
... و هەندێکی دی .

ناتەواویی دیاری وتاری « کات و ڕەگی فرمان » ، ئەوەیە هەندێ یاسا باس نەکراوە و گەلێ قەد و ڕەگ ناونەبراوە . بۆ نموونە ، ڕەگی چاوگی ( زاین )و ( خوێندن ، ژەندن )و ( ئەنگاوتن ، ئاخاوتن )و ( داشتن )و ( ویستن )و ( کەیشتن ،

ڕۆیشتن )و چەندینی دی ، کە هەندێکیان بەر یاسای تایبەتی دەکەون و بەشێکیان بێزۆکن ، یادداشت نەکراون .

بەشێک لەو یاسایانەش ، کە باس کراون ، پڕ ناتەواوین . بەوێنە لە بەشی ( ب )ی یاسای دووەمدا وتراوە :

« ب ـ گەر فرمانەکە تێنەپەڕ بوو ڕەگی داهاتووی بە گۆڕینی (ا) بە ( ێ ) دەست دەکەوێ :

| ڕەگی داهاتوو | ڕەگی ڕابوردوو | چاوگ |
|---|---|---|
| سووتێ | سووتا | سووتان |
| گرێ | گریا | گریان |
| ترسێ » ( ل ٧٩ ) | ترسا | ترسان |

بەڵێ ئەوە دەستوورێکی بنەڕەتی‌یە ، ئەگەر قەدی کرداری تێنەپەڕ کۆتایی بە دەنگی ( ا ) بێت ، بۆ وەرگرتنی ڕەگ لێیەوە (ا) دەکرێ بە ( ێ ) . وەک :

| ڕەگ | قەد | چاوگ |
|---|---|---|
| گەڕێ : دەگەڕێم | گەڕا : گەڕام | گەڕان |
| خنکێ : دەخنکێم | خنکا : خنکام | خنکان |
| پسێ : دەپسێم | پسا : پسام | پسان |

. . . و گەلێکی دی .

لەم دەستوورەدا سێ کرداری بێزۆکن : ( وەستان ، گریان ، ترسان ) . واتە (ا) ) کەیان ناکرێ بە ( ێ ) ، بەڵکو لادەبرێ : ( وەستا ـ وەست : دەوەستم ؛ گریا ـ گری : دەگریم ؛ ترسا ـ ترس : دەترسم ) .

د . وریا بۆ نموونەی ئەو دەستوورە ڕێکوپێکە ، لە نێو ئەو چەند نموونە ڕاست و ڕەوانەدا ، سێ بەڵگەی هێناوەتەوە ، کە دوانیان ( گریا ـ گری ؛ ترسا ـ ترس ) بێزۆکن و بەر دەستوور

نلکەون و نلکە یەکێکیان ( سووتا ـ سووتێ ) بەپێی پاسلکە دەڕوات .
... و هەندێکی دی .

• • •

ئەو خوێندکارانەی تازە بڕوانامەی ماجستێر و دوکتۆرایان وەرگرتووە ، لەبەر هەر هۆیێک بێ ، وەڵامی ئەو کارە نارەوایە نادەنەوە ، کە د . وریا دەرهەقیان دەیکا .. جا ئەویش ئەمەی بە زەمینە و هەل و دەرفەتێکی باش زانیوە و بە ڕۆژی ڕووناک زانیاری لە نامەکانیان وەردەگرێ و بەناوی خۆیەوە بلاویان دەکاتەوە .. لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا هەندێ لەو نارەواییەی دوام ، کە لەگەڵ مامۆستا فەتتاحی مامەدا کردوویەتی و ئێستاش وا بە چەند وشەیێک جاری ئەو ڕاستییە دەدەم ، کە چی لە نامەی دوکتۆریی مامۆستا عەبدوڵلا حوسێن ڕەسووڵ[48] وەرگرتووە :
● لە بڕگەی چوارەمی ، ستوونی دووەمی ، لاپەڕە ( ٦٨ )ی ژمارە (١٣٦)ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »دا ، دوو نموونەی ( پێمدەشکێ ، پێیی دەخورێ )ی وتارەکەی د . وریا ، لە لاپەڕە (٣٩ ، ٥٧ ، ١٦٢ـ١٦٥)ی نامەکەی مامۆستا عەبدوڵلادا باس کراوە و ئەو بابەتە بەتەواوی ڕوونکراوەتەوە .
د . وریا لە ستوونی یەکەمی لاپەڕە (٦٧ )ی هەمان وتاریدا ، کە باسی هێز و وانلکۆڕی دەکا ، مامۆستا عەبدوڵلاش لە لاپەڕە (٩٠ـ٩٤)دا لەو بابەتەی کۆڵیوەتەوە و تەنانەت ( برایەتی ) ، کە نموونەیێکی باسەکەیەتی لە وتارەکەی د . وریاشدا وتراوەتەوە .

(٤٨) عەبدوڵلا حوسێن ڕەسووڵ ، مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار ، نامەی دوکتۆری ، بەغدا ، ١٩٩٥ .

● ئەوەی د . وریا لە لاپەرە (٢٢)ی ژمارە (١٤٠)ی گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ »دا دەربارەی مۆرفیمی کاتی داهاتوو وتوویەتی ، هەر دەقاودەق لە نامەکەی مامۆستا عەبدوڵڵاوە وەریگرتووە و تەنانەت نموونەکانیشی هەمان نموونەن ( بروانە : ل ١١٢-١١٦ی نامەکە ) .

لە نامەی ناوبراودا جێناوی کەسی سێیەمی تاک لە دەستەی رێککەوتندا بە سفر ( ∅ ) دانراوە .. د . وریاش لە بڕی یەکەم و دووەمی ستوونی دووەمی لاپەڕە ( ٢٢)دا دەڵێ : ئەم راناوە هیچ سیمایێکی بەدەرناکەوێ .. کەچی لە وتارەکانی زوویدا ( ە ، ات ، یت )ی بە جێناوی لکاوی کەسی سێیەم داناوە .

هەر لە ستوونی دووەمدا باسی مۆرفیمی داهاتوو دەکا ، کە زووتر بە شتێکی راستی نەدەزانی ، بەڵام ئێستا بیروڕای مامۆستا عەبدوڵڵای بڵاوکردووەتەوە .

ئەمانە و چەندین زانیاریی دی لەو نامەیە وەرگرتووە و بە هیچ چەشنێکیش ئاماژەی بۆ نەکردووە .

● ● ●

لەبەر ئەوەی د . وریا وێڕای ئەوەی زمانەوانە ، شاعیریشە و چیرۆکنووسیشە ، دەبوایە نەک هەر ئاگادارییەکی باشی لە تایبەتێتی و بنەماکانی زمانی کوردیدا هەبێ ، بەڵکو پێویست بوو کوردییەکی رەوان و پاراویش بزانێ ، بەڵام بەداخەوە کوردییەکەی لە گێژاوی دەربڕینێکی سەرگەردانیدایە و لە بریتی ئەوەی خوار و خێچی راست بکاتەوە و بە دەربڕینی رەوان و بێگرێ بانگە بە گوێی ئەوەی نوێدا بدا ، راست و دروستەکەشی شێواندووە .

بۆ بەڵگەی ئەم وتانەم ئاوڕێکی خێرا لەو چیرۆکەی دەدەمێنەوە . کە چەند ساڵێک لەمەوبەر بە سەرناوی « بۆ

دارلاستیکەکەی شکاند » ( کۆڤاری ڕەنگین ، ژ ١٠٢ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٨ )دا بڵاوی کردووەتەوە .. ئەوەتا لە کۆتاییدا نووسیویە : « .. بەتەما بووم بەم دارلارستیکە کۆترەکان بگرم ..» .. کۆتر بە دارلاستیک (ناگیرێ)و (دەکوژرێ) . کورد هەڵەی و ناکاو ڕەنگە زیندە ڕۆیی نەبێ ، گەر بڵێم ، بێگانەیەکیش کەمێ کوردی بزانێ ، شتی وا سەیر و سەمەرە نالێ .. ئەمە لەوە دەچێ یەکێکی ناتەواو بڵێ : ( بە قاچ نان دەخۆم ) ؛ ( بە دەست شەقێکم لە تۆپەکە هەڵدا ) ؛ ( بە ئاگر جلەکانم تەڕکرد ) ؛ ( بە ئاو کراسەکەم وشک کردەوە ) .

کۆتایی چیرۆک بەم چەشنە بوو ، ئەوجا با بزانین لە دێڕی یەکەمدا چی دەڵێ : « لە ڕۆژێکی یەکجار سارد لە زستانا .. » .
ڕاست وابوو بنووسێ :

« لە ڕۆژێکی یەکجار ساردی زستاندا » ، چونکە :

١- لە یەک ڕستەی وا کورتدا دوو جار ئامرازی ( لە ) بەکارهێنان ، جوان نییە .

٢- ( لە )ی دووەم مانای ڕستەکە دەشێوێنێ .. وا دەگەیەنێ ، ( ڕۆژی یەکجار سارد ) لە وەرزەکانی دیشدا هەبێ .. لەبەر ئەوەی مەبەستی نووسەر ( زستانە ) ، بۆیە دەبێ ( سارد ) و( زستان ) بە ( ی ) پێوەندبکرێن و بەوە گومان نەهێڵرێ .

ئەمە خەوشی سەرەتا و کۆتایی ئەو چیرۆکەیە .. کورد واتەنی : « مشتێک نموونەی خەروارێکە » .. جا کە سەروبنی ئەو نووسینە بە هەڵەی وا زەق و زۆپ تەنرابێ .. ئیتر ئەوی دی دەبێ چۆن بێ ؟.. وەچی لەو زەلکاوانە چاوەڕوان بکرێ ، کە کوردییەکەی هێندە لاواز و سەرگەردان بێ .

• • •

لەبەر ئەو هۆیەی لە سەرەتادا پەنجەم بۆ ڕاکێشاوە ، بەداخەوە لەم نامیلکەیەدا مەودای ئەوە نییە سەرپاکی بەرهەمەکانی . د . وریا بخەمە سەر لەنگەری و بێژنگ و دانبژێر و بەردە شۆڕیان بکەم و زیوان و داپوجانیان لێ بگرم ..[49]

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ، ئەوانەی لە سەرەوە لێیان دواوم ، تا ڕادە و ئەندازەیێک پەردەیان لەسەر هەندێ کاری ناڕەوا و نادروست : لاواز و پڕ خەوشی د . وریا لاداوە .

* * *

ئێستاش لەبەر تیشک و ڕووناکیی ئەو ڕاستییانەی سەرەوەدا ، نادروستیی وتاری « ڕەخنەی نارەخنە »ی[50] دەخەمە پێش چاو .

د . وریا ئەم وتارەی ، کە بە داکۆکی و بەرگرییێک لە مامۆستا محەمەد ، مەعرووف دەستپێکردووە ، هەوڵی داوە وەک زۆربەی وتارەکانی پێشووی بە وتەی قەبە و زلی بێبەڵگە خوێنەر چەواشە بکات .. ئەوەتە دەڵێ : « بەپێی پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی و مەنتیقی پەیوەندیی نێوان کەرەسەکانی زمان ، کاری سادە نەک هەر لە کوردیدا ، بەڵکو لە هیچ زمانێکا نابێ هەبێ » (ل ٢٢ ، س١ ) .

لەسەر ڕووی ئەم زەمینە بە ژمارەیێکی تەقدیری پتر لە دوو هەزار و پێنج سەد زمان هەیە . زمانی ئەوتۆش هەیە چەندین دیالێکت و دەیان بەشە دیالێکتی هەیە .. ژمارەی زمان و دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی جیهان ، کە لە دەیان هەزار تێپەڕن ، کام زانا سەدیی پێنجی ئەو ژمارەیە دەزانێ ، تا ڕێ بە

---

(٤٩) هیوامە لە دەرفەتێکی دیدا ، بەهەموان شێوە نهێنی و خەوشی نووسینەکانی دیکی ئاشکرا بکەم .

(٥٠) بڕوانە : پەراوێزی ژ ٥ .

خۆی بدا قسەی وا زل بکا ؟ .. چ لە مەسەلەی زماندا و چ لە زۆر بابی دیدا وەنەبێ هەمیشە مەنتیق جێگیر بێ .. ئەوەتە لە پێش چاومانە ، کە چەندین کێشەی ئەو دنیایە دژ بە مەنتیق دەڕۆن و دەکرێن .

ئایا ئەو زمانەوانانەی ئەو جۆرە قسانە دەکەن ، ئاگایان لەوە نییە ، کە دیاردەی هەندێ زمان لە ئەفسانە و حیکایەت دەکات . بەوێنە :

لە زمانە کۆنتینتۆ ـ بوشمانی یەکاندا لە سەدا هەژدەوە تا سەدی سی ، ناو و ڕەگی کردار بە دەنگی چەقەنەیی[51] دەست پێ دەکەن .. ئی . ئا . گۆنچاروف دەربارەی دەنگی چەقەنەیی سەرنجی خۆی بەم چەشنە دەربڕیوە : « من لە زووەوە ئەمەم بیستبوو ، کە زمانی بوشمانی هەمووی لە دەنگی ئەوکی و چەقەنەیی پێکهاتووە و هەر لەبەر ئەوەشە ناتوانرێ بە نووسین دەربڕدرێ . ویستم ئەمە تاقی بکەمەوە و داوام لێکرد بە زمانی بوشمانی پێم بڵێ : ( بە زمانی ئێوە ، باوک ، چی پێ دەڵێن ؟ ) . کابرای بوشمان لەسەرخۆ دەمی کردەوە و بە زمان چەقەنەیێکی لێدا و دوو نۆتی دەربڕی . ئەمجا لێم پرسی : ( ئەی « دایک » ؟ ) . کابرای بوشمان دیسان بە زمان چەقەنەیێکی لێدا و دوو نۆتی پەخش کرد ، کە لەوانی دی جیاواز بوون . گەلێ پرسیاری دیم لێکرد .. وەڵامەکانی یان لە نۆتەدا ، یان لە چۆنێتی چەقەنە لێداندا دەگۆڕان »[52] .

---

(51) دەنگەکانی تێخلوتن وەک شتێکی ئاسایی لە هەناسەداندا دروست دەبن و بە زۆریش لە هەناسەدانەوەدا . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە زماناندا کۆنسۆنانت هەیە لە هەناسەداندا دروست نابێ ، بەڵکو لە بزووتنەوەی مژیندا دەبێ ـ واتە مژینی زمان بە ئاسمانەی دەم و لێو و ئەندامی دی . لە باری مژیندا زارەزار یان دەنگی وەک چەقەنە بەر گوێ دەکەوێ . ئەو جۆرە کۆنسۆنانتانەش زاراوەی کۆنسۆنانتی چەقەنەیی یان پەسەردا دابڕاوە .

(52) ئی . ئا . گۆنچاروف ، کارە کۆکراوەکانی ، ب ٢ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٢١٧ .

گەلێ هۆز هەن خاوەنی زمانی ئیشارەتن . هۆزی ئەرانـدای ئوسترالی نزیکەی ( ٤٥٠ ) ئیشارەتی جیاوازی هەیە ، کە نەک هەر شتی دیاری‌کراو نیشـان دەدەن ، بـەڵکـو بیـروڕای گشتیش دەردەبـڕن . زمانی ئیشـارەتی خێڵی ئـەرانـدا و خێڵەکـانی دی تەواوکەری زمانی دەنگی‌یە و لە حاڵاتی تایبەتی‌دا بەکاردێنرێ . بێوەژنی خێڵی وارموونگی ئوسترالی بۆ ماوەی ساڵێک قسەکردنی لێ قەدەغە دەکرێت . کۆڕی ژنان لە کووچە و کۆڵان بەبێ دەنگی دەبینرێ ، کەچی بـە پەنجـە و دەست و ئانیشـک لەگەڵ یـەک دەدوێن . هیندی‌یەکـانی ئەمـەریکا لە پێـوەندیی نێـوان خێڵی جیاوازدا زمانی ئیشارەت بەکاردێنن[٥٣] .

یەکگرتنی هەمیشەیی تاقمی دەنگ و واتا ( مەرجێکی گرنگی پەیدابوونی دێرینترین وشەن ) بووە هۆی جـووت‌بوونیـان و ئـەمەش دیـاردەی قەدەغـەکردن ئیسپـات دەکـا . لە کـۆنـدا قەدەغەکردن بە خەیاڵی ئەفسانەوە ؛ بە باوەڕی سیحری‌یەوە ؛ بە هێزی وشەوە بەند بووە : ئەگەر ناوێک بزانی ، ئەوە مرۆکەش دەناسی و هێزت بە سەریدا دەشکێ . لەبەر ئەوە لای گەلێ خێڵ و میللەت قـەدەغە بـوو نـاوی سـەرکردە و خـواوەند و فـریشتە بهێنرێ ؛ نەدەبوو کەس نـاوی خۆی بە بێگانە بڵێ : ژن نـاوی مێردەکەی بیا . ژن لای هەندێ خێڵ تا ئێستاش نەک هەر مـاڵی ئـەوەی نییە بـە ئاشکـرا نـاوی مێـردەکەی بـڵێ ، بەڵکـو نابێ سـەرپاکی ئـەو وشانـەش بڵێ ، کـە تاکـە بڕگـەییکی لە نـاوی مێردەکەی یان لە ناوی کەسوکاری مێردەکەیدا هەبێ[٥٤] .

ن . ن . میکلووخە ـ مەکەلای ، ساڵی ١٨٧١ کە لە باکـووری ڕۆژهەڵاتی غینیای نوێ بوو ، نووسیویە دەڵێ : « نزیکەی هەر

---

(٥٣) ف . پ . فیلین ، کێشەی باروبۆخی کۆمەڵایەتیی زمان ، گۆڤاری « کێشەی زمانناسی » ، مۆسکو ، ١٩٦٦ ، ژ ٤ ، ل ٣٩ .

(٥٤) ب . ف . گۆلۆڤین ، سەرەتاییکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، ل ٢١٢ .

دێیەکی ئەو ناوچەیە بەشە دیالێکتی خۆی هەیە . لەو گوندانەدا ، کە بە پێ چارەکە سەعاتێک لە یەکدی دوورن ، چەند وشەیەکی جیاواز بۆ ڕاگەیاندنی واتای تاکە وشەیەک دەبیسترێ . خۆ دانیشتوانی ئەو گوندانەی دووری یان لەیەکەوە بەپیادە سەعاتێک دەبێ ، هەندێ جار بە بەشە دیالێکتی هێندە لە یەک جیاواز دەئاخێون ، کە نزیکەی لە یەکدی تێنەگەن ».(٥٥) .(٥٦)

لەپاڵ ئەو زمانانەی زۆر بڵاوبوونەتەوە ، زمانی ئەوتۆش هەیە کەم پەلیان هاویشتووە . ئەم زمانانەش لە خزمەتی میللەتی خۆیاندان – زمانی خێڵێک یان میللەتێکی بچووکن . تەنانەت زمانی دوو یان یەک گوندیش هەیە . بەوێنە ، لە داغستان هی دوو گوندی وەک زمانی بۆتلیخی ( زمانی دانیشتوانی گوندی بۆتلیخ و میارسووە ) . هی یەک گوندی ، وەک زمانی گینوخی ( زمانی گوندی گیونوخی ناوچەی سیتینە ) . سەرپاکی گینوخەکان نزیکەی دووسەد کەسێک دەبن ..(٥٧) ، کەچی دیالێکتی ئەوتۆیش هەیە بە ملیۆنەها کەس پێی دەدوێن .

---

(٥٥) ( میکلوخە – مەکەلای ) زانا و گەڕیدەی ڕووس ، ساڵی ١٨٤٢ لە هەرێمی نۆڤگۆرۆد لە دایک بووە و ساڵی ١٨٦٣ لە زانستگەی پیتربورگ وەرگیراوە .
ساڵانی ١٨٦٦_١٨٦٧ گەشتێکی بە دوورگەی کەناری و مەغریبدا کرد . ساڵی ١٨٦٩یش دوای گەڕانەوەی لە پێنجی دەریای سوور ، یەکەم بەرهەمی زانستیی دەریارەی چەند جۆرە ماسییەکی دەریایی بڵاوکردەوە .
هەر لە سەرەتای کارکردنییەوە ، گرنگی بە کولتوور و داب و نەریتی میللەتانی ئەو وڵاتانە داوە ، کە بینیونی .. دواتر ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافی و لێکۆڵینەوەی دانیشتوانی ڕەسەنی باشووری پێنجەلاتی ئاسیا و ئوسترالیا .. سەرنجی ڕاکێشاوە . دوو ساڵ و نیو لە باکووری پێنجەلاتی کەناری غینیای نوێ ژیاوە .
(٥٦) ن . ن . میکلوخە – مەکەلای ، گەشت ، ب ١ ، مۆسکۆ – لێنینگراد ، ١٩٤٠ ، ل ٢٤٣ .
(٥٧) پ . ئا . بوداگۆف ، مرۆڤ و زمانی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٤ ، ل ٩٧ .

له زمانی ڕووسیدا لەرینەوەی دەنگەژێکان لەگەڵ هەموو توانستی وتنی دەمدا یەکدەگەوێ : زۆربی دەنگی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار ، بەڵام ئەم دیاردەیە لە زمانە ئینۆ ـ ئوگۆری‌یەکاندا بەپێچەوانەوەیە ـ واتە لەرینەوەی دەنگەژێکان بەدەگمەن لەگەڵ وتنی دەمدا یەکدەگەوێ و نەبوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەداریش لەو زمانانەدا بەڵگەی ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیەن[58] .

جا کە مەسەلە بەو چەشن و جۆرە بێ ، ئیدی زمانەوانانی ڕێبازی نوێ چۆن ڕێ بە خۆیان دەدەن ، قسەی وا نابەجێ بکەن .. یاخود بۆ د . وریا دەبێ وەك تووتی ئەوی ئەوان وتوویانە دووپات بکاتەوە .. مەنتیقی ئەو مەنتیقەی هەردوو لایان ناوی دەبەن ، کوا خۆی و کوا تۆوی ؟ ..

لە سەرێکی دی‌یەوە ، ئەوێك لە چەندین نووسینیدا باسی بوونی کرداری سادەی کردبێ ، ئینجا کە لە وتاری « ڕەخنەی ناڕەخنە »دا بەپێچەوانەوە پێ لەسەر نەبوونی ئەو جۆرە کردارانە دابگرێ ئەوە هیوادارم گلەییم لێنەکرێ ، گەر بڵێم ، د . وریا تەنانەت باش ئاشنا و بیداری نووسینەکانی خۆیشی نییە ، یان ڕارایە و هەردەم لەسەر هەوایەکە .

ئەوە چەند نموونەیێك لە وتاری :

١ـ « لایەنێکی جیاوازی »

« .. بەپێی قاڵبی فرمانەکە ( سادە یا لێکدراو ... )» ( ل٢٦٢ ، د ١٠) .

« گەر پریدیکەیت بریتی بوو لە فرمان ( چ سادە چ لێکدراو ) .. » ( ل٢٦٢ ، دوادێڕ ) .

٢ـ « لە پەیوەندی‌یەکانی بکەر نادیار » :

---

(٥٨) ف . م . بیریزین ، ب . ن . گۆلۆڤین ، زمانناسیی گشتی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٩ ، ل ١١٧ .

دیوی دەرەوەی زمان ئەبینێ و سەیری زمان ناکات وەك سیستەمێکی ئاڵۆزی فرەڕووی پەیوەندیدار ، بۆیە هەر لێکۆڵینەوەیەکی زمان بە پێی ئەم پێڕەوە سلکار دەردەچێ » ( ل ۲۲ ، س ۱ ) .

نووسەر لەوەدا هیچ ڕاست ناکا ، کە وتوویە : « پێڕەوی ( تقلیدی ) .. هەر دیوی دەرەوەی زمان ئەبینێ » .. لێرەدا درێژە بە ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو وتنانەی نادەم و تەنیا دەڵێم :

ئەخێر ڕێبازی چاولێکەری دەستووری ناوەکی و دەرەکیی زمان ڕەچاودەکات و نەك هەر کەلێ لێکۆڵینەوەی زمانانی بێگانە ئەوە ئیسپات دەکەن ، بەڵکو چەندین توێژینەوەی زمانی کوردییش بەڵگەی ئەو ڕاستییەن .

لە سەرێکی دییەوە بۆ دەبێ کەلێ کاری زانستیی لوتکە ، کە بەپێی ئەو ڕێبازە کەیەنرابنەتە ئەنجام سلکار بن ـ د . وریا وتەنی : « هەر لێکۆڵینەوەیەکی زمان بەپێی ئەم پێڕەوە سلکار دەرئەچێ »و کەچی چەند وتەیێکی کورت و گێڕی پڕ هەڵە و خەوشی د . وریا زانستی بن :

● ئەگەر د . وریا بە چوار وشەی ( ماڵ ، هەڤاڵ ، سامان ، تاڵ ) یاسایێکی نابەجێ بۆ زمانی دەوڵەمەندی کوردی ڕۆبنێ و بڵێ :
« .. هەموو لامێکیش دوای ئەلف بێ لە زمانی کوردیدا قەڵەوە » ، ئەوە بەپێی پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی ئەنتیقی کاردەکا و کارەکەی هەمە لایەنە .. بەڵام یەکێکی دی دەیان وشە بهێنێتەوە ، کە ( ل ) ی دوای ( ا ) یان لاوازبێ ، وەك : ( ئالان ، ئالودە ، ئالیك ، ئالیکار ، ئالیسوّر ، ئالك ، ئالنگ ، بالۆرە ، بالووکە ، چالاك ، چوالە ، زالە ، سالار ، قالۆنچە ، کالیار ، لالۆ ، لالەبلس ، لالەزار ، لالووت ، لالغاو ، مالوان ) .. ئەوە کاری ئەو کەسە هەر دیوی دەرەوەی زمان دەبینێ و سلکار دەردەچێ .. یاخود ئەوێکی ڕێبازی تازەکەری ، کە لەو چەند دێڕەدا جیاوازی

له نێوان مەفهوومی دەنگ و پیتدا نەکردبێ و ئێمە و ماناتێک ، کە هەرگیز هەڵەی وای لێ روونەدابێ ، ئەوە چ لایەکمان هەر دیوی مرموەی زمان دەبینێن ؟

* ئێمە بیست ساڵێک لەمەوبەر ئەوەمان یادداشت کردبێ ، کە لە بالێکتی کوردیی خوارووداوا ، لە دۆخی بانگهێشتن و دۆخی یاندا نێر و مێ جیادەکرێنەوە و لە دەفەری جیاوازەوە نموونەمان هێنابێتەوە .. کەچی دواتر و بە دوا ئەو دۆزینەوەیەدا د . وریا بێ ئاگایانە بڵێ : « لە کوردیی خوارووشدا لە نێوادا نەبێ جنس جیانەکرێتەوە » ، ئیتر بۆ دەبێ لێکۆڵینەوە دروست و راستەکە ساکار بێ و قسە بێ بەڵگە و هەڵەکەش زانستی بێ ؟

* یەکێک ئیدیعای پەیرەوی کردنی رێبازە تازەکانی زمانەوانی و مەنتیقی بکات و وشەی هاوبێژ ( Homonym )و وشەی فرەواتا ( Polysemantic ) تێکەڵ بە یەک بکات ، کەچی منێکی ساکاری رێبازی چاولێکەری پتر لە بیست ساڵ لەمەو پێش لێکم جیاکردبێنەوە ، ئەوە رێبازی کاممان باشترە ؟

* نووسەرێك دوور لە کشت داب و نەریتێکی زانستانە ، بە رۆژی رووناك کەرستە لە بەرهەمی رێزماننووسانی کورد و نامەی ماجستێر و دوکتۆریی خوێندکارانی کوردەوە وەربگرێ و بە هیچ جەشنێك ناویان نەبا و بیکا بە موڵکی خۆی و سەربارى ئەو کارە نارەوایە ـ بە سووك و ئاسانی پەردەپۆش کردنی ئەو راستی یە ـ بە هەق و بە رێبازی نوێکەری بزانێ .. کەچی خەڵکی دی ، کە ئەمانەت دەپارێزن و کەشە بە لێکۆڵینەوەی بلاو بلاوبیرانیان دەدەن ، بە ناشارەزا و لە دنیا نەگەیشتوو دابنێ .

* لە ئەنجامی کەم ئاگایی و قووڵ نەبوونەوە و ئاوڕ لە سەرچاوە نەدانەوە ، زانیاری یێکی ناتەواو دەربارەی تایبەتێتی یێکی شێوەیێکی کوردی وەربگرێ و بە پاساوێکی کشتیی بۆ سەرلەبەری زمانی کوردی ناوبەرێ و بە فرەوویی و مەنتقیی و

ئازمەگەریی دابنێ ، بەڵام زانیاریی تەواو و گشتیی زمانەکەمان لە قاڵبی زانستیدا جێگیر بکرێ ، بە لای ئەوەوە یاسای یەك لایەنە بێ ...

● زمانەوانێك بۆ وتنەوەی دەستوورێکی ڕێکوپێکی دەیان ساڵ لەمەوبەر باسکراو ، سێ وشە بهێنێتەوە ، کەدوانیان بێزۆك بن و بەر دەستوورەکە نەکەون و ئاکە یەکێکیان بەپێی یاساکە بڕوات .. ئەوە ناچارین هەزار شاڵاو و خۆزگە بۆ ( تەقلیدی ) یەکەی خۆمان بخوازین .

● پرۆفیسۆرێك ئاگای لەوە نەبێ ، کە لە چەندین لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا چوار جنس یادداشت کراوە و بڵێ : سێ جنس دەستنیشان کراوە .. یان وشەیێکی یەکجار باوی ڕووسیی جنسی مێ بە نێر دابنێ .. ئیتر بە کام لێکۆڵینەوەی نوێ هەردوو دیو دەخوێنێتەوە .

● توێژەرێك خۆی چەندین ساڵ باسی بوونی کرداری سادەی کردبێ ، کەچی ئێستا ئاگای لەو وتانەی خۆی نەمابێ و بەرانبەر ئەو بۆچوونە وەستابێ ، کە لەگەڵ ڕایەکەی خۆی دەگونجێ ، دەبێ نرخ و بەهاو سەنگی ئەو وتە ئازانستی‌یەی چەند بێ ؟ ..

● بێتو قوتابی‌یەکیش وشەکانی ( ئاژا )و ( پیاو ) بە ڕەگی کردار دابنێ ، بە هیچ جۆرێك لێی قبووڵ ناکرێ .. کەواتە د . وریا چۆن ڕێ بە خۆی دەدا باسی ساکاریی زانایانی کورد بکا ؟ .

● بە کوردی و بە کورتی ، وا پێدەچێ بە لای د . وریاوە ، قسەی ڕووتی بێ بەڵگە و بێ نموونە ؛ بێ ئاگایی و بێ خەبەری لە بەرهەمی دیار و بەرچاوی زانایانی کورد ؛ ئاونەهێنانی سەرچاوەو بە چاوی سووك تەماشاکردنی کاری زمانەوانان ؛ قسەی خراپ بە گەورە پیاوانی کورد [٥٩] ؛ لەملاو لەولا زانیاری وەرگرتن و کردنە موڵکی خۆ و ماڵ خاوەنەکەی زەوتکردن ؛

(٥٩) دواتر لەو بارەیەشەوە دەدوێین .

دیاردەی دزێو و نابەجێ و نادروست ؛ بێسەلیقەیی و سادکاریی
کەرەستە و زانیاری و هەڵەی گەورە ؛ وشەی دژ بە یەکی بێ
سەروبەر ؛ لەنگی و خواروخێچیی کوردی نووسین ؛ شێوازی
نزم و زمانی کووچە و کۆڵانان .. « پێرەوە تازەکانی زمانەوانی و
مەنتیقی » بنو هەرچی قسەی بە کەڵک بە بەڵگە ؛ ئاگاداری و
خەبەرداریی لە کاری زانایانی کورد ؛ ئاوهێنانی سەرچاوە و
بایەخدان بە بەری رەنجی زمانەوانان ؛ رێزگرتنی گەورە پیاوانی
کورد ؛ دەست نەگرتن بەسەر ملکی خەڵکی و زەوت نەکردنی ماڵ
خاوەنەکەی ؛ دیاردەی راست و بەجێ و دروست ؛ وردی و بە
سەلیقەیی و کەرەستە و زانیاریی باش ؛ وشە و بیری پتەو ؛
رەوانی و پاراویی کوردی نووسین ؛ شێوازی بەرز و زمانی
ئەدەبی .. یشە رێبازی سادەی چاولێکەری بێ .

گەر تازەگەریتی وا بێ ، بەڵێ بێ و شەرتە تا ماوم ، هەر
لەسەر دینە کۆنەکەی خۆم بم و با کاکە وریاشم هەر پێم بڵێ
( تەقلیدی سادکار .. ) .

بۆ ئەو شەش حەوت وشەیەی کردوومنەتە نموونەی حاڵەتی
هاودەنگی و یەکێتیی رەگ و قەد ، د . وریا دەڵێ : « شەش حەوت
کار ناکرێ بە قیاس بۆ زمان » .. خۆزگە هاوڕێی ئازیزم کەمێ
بیری دەکردەوە و ئەو راستییانەی خوارەوەی رەچاو دەکرد :

١ـ ئەو شەش حەوت وشەیە ، وەک نموونەی مشتێک لە
خەروارێک هێنراومەتەوە ، دەنا نموونەی دیش هەیە و بەتایبەتی
لە کرمانجیی ژووروودا .. ئەوەتە چاوگێکی یەکجار دیار و
بەرچاوی وەک ( مرن ) ، رەگیش و قەدیشی ( مر )ە ، کە
مۆرفیمێکی سادەیە .

٢ـ منیش ، لەگەڵ ئەوەشدا ، کە لە ئینگلیزیدا یەکجار
کۆڵەوارم ، هێندە دەزانم ، چەندین کرداری وەک
( can, do, go ... ) لە یەک مۆرفیم پێکهاتوون و سادەن .. جا
ئەویە بەو ئینگلیزی باش زانینەوەی ، پاساوی پاکانەی

ئەبینینی ئەو دیاردە ئاشکرایەی چییە ؟ ..

٣ـ خۆ بۆ پەسەندنەکردنی ڕای مامۆستا محەمەد مەعرووف ، کە وتوویە : « کاری سادە لە کوردیدانیە » ، هەر هاودەنگی و یەکێتیی هەندێ ڕەگ و قەدم نەکردووەتە نموونە ، بەڵکو بە بەڵگەی دی‌یش ڕەتم‌کردووەتەوە . ئەی د . وریا لەوانی دی بۆ نەدواوە ؟

٤ـ گەر ئەو نموونانەی من واش بن ، وەك ئەو لە لاپەڕە ( ٢٣ )شدا دەربارەیان دەڵێ : « ئەنانەت لە پێڕەوی ئەقلیدیشا ئەخرێنە خانەی ( ناوێزە ) کانەوە » (س ١) .. کەواتە بۆ ڕەخنەی لە مامۆستا محەمەد مەعرووف نەگرتووە ، کە لە وتارەکەیدا بە هیچ چەشنێك ئەوەی یادداشت نەکردووە . شەش حەوت وشەیەك هەبن بێزۆك بن و نەچنە جفزی دەستوورە گشتی‌یەکەوە

د . وریا لەنێو ئەوەی وتوومە ، ئەم مۆرفیمانە ، « کە لە یەك کاتدا ڕەگیش و قەدیش بن ، ئەوە بێ بیرکردنەوە دەزانین لە یەك مۆرفیم پێکهاتوون » ، دەستەواژەی ( بێ بیرکردنەوە ) ی بەلاوە یەکجار خرایە و دەربارەی نووسیویە : « دەربڕینی ( بێ‌بیرکردنەوە ) لە زانستدا نی‌یە و جێی نابێتەوە و نابێ خاوەنی ناسناوی ئەکادیمی ئەم جۆرە دەربڕینانە بەکاربێنێ و بێ‌بیرکردنەوە بڕیار بدات .. » ( ل ٢٢ ، س ١ ) :

١ـ ئەگەر لە هەر کەسێك بپرسیت یەك و یەك دەکاتە چەند ، بێ بیرکردنەوە پێت دەڵێت : دوو .. بەڵام گەر لە خوێندەوارێکی باشیش بپرسیت ٤٧٨×٢٧٣ دەکاتە چەند ، بێ‌گومان بیری لێدەکاتەوە و ئەوجا ئەنجامت پێدەڵێت .. جا ئەو نموونانەش ، کە ڕەگ و قەدیان وەك یەك بن ( نەك جیاواز بن ) ، بێ‌گومان بێ بیرکردنەوە دەزانین لە یەك مۆرفیم پێکهاتوون .

٢ـ بەڵێ هاوکاری هێژام دەڵێ : ئەو دەربڕینە « لە زانستا نی‌یەو جێی نابێتەوە و نابێ خاوەنی ناسناوی ئەکادیمی ئەم

جۆرە دەربڕینانە بەکاربێنێ » .. ئەمانە لە قسەی زانای لوتکە و فریشتەی ئاسمان دەچن .. یەکێك بەو چەشنە زانست پەروەر بێ و قسەی هێندە بەجێ بێ ، بە ڕۆژی ڕووناك کەرەستە لەملاو لەولا وەرناگرێ و بیکاتە موڵکی خۆی و شێوازی نووسینی زمانی لاکۆلان نابێ و نالێ : « .. رایەکی پووچە و بە تیشکی ئەزەری یەی فۆنێم فش دەبێتەوە »[٦٠] و توانج و تانە ناگرێتە کەلەمێرانی کوردو و کاری وا ناکا زانێکی وەك مامۆستا مەسعوود محەمەد بە ( .. درێژدادر ) ناو بەری[٦١] ..

جا گەلوا ! ئەو ( بێ بیرکردنەوە )یەی بەندە لە زانستدا جێی نابێتەوە ، یان ئەو ڕەفتار و تەرزمانی یەی د . وریا ؟

گەر مەرج وابێ ، خاوەن ناسناوی ئەکادیمی دەست بەسەر ماڵی خەڵکیدا بگرێ ، لە بێئاگایی پاسای سەیر و سەمەرە بێنێتە ناوان ؛ بە زمانی کووچە و کۆلانان بدوێ ؛ پلار و تەوس بگرێتە زانایان .. ئەوە یاران ببورن ، من ناسناوی ئەکادیمیم ناوی و هەر پیرۆز بەوانە بێ ، کە چێژ لەو شێواز و ڕێبازە وەردەگرن .

گریمان بۆچوون و نموونەکانی بەندە سەبارەت بە ڕاست نەزانینی ڕای مامۆستا محەمەد مەعرووف ، کە وتوویە : « کاری سادە لە زمانی کوردیدا نی یە » ، باش و تەواو نین ، بەلام خۆ ئەو هەموو ڕەخنە و تێبینی و سەرنجانەی دی ، کە لە بارەی وتاری « کارپۆلێن کردن بەپێی ڕۆنان »ی کاکە حەمەوە نیشانم داون ، تۆ بڵێی شتێکی چاك و دروست و بەکەڵکیان تێدا نەبێ ، کە شایانی باس بێ .. ؟ بەڵێ گەلێ کەموکورتیی ئەو وتارەم پڕکردووەتەوە و هەڵەی زۆریم ڕاست کردووەتەوە .. بەلام د . وریا نەیویستووە دان بەو ڕاستی یەدا بنێ و سەرەتای وتاریشی ، کە بەو

---

(٦٠) بڕوانە : سەرچاوەی ل ٣٢ .

(٦١) بڕوانە ، وتاری ( ڕەخنەی ناڕەخنە ) ، ل ٢٣ ، س ٢ . پاشان دێینەوە سەر ئەو باسە .

بەرگری یە لاوازە دەست پێکردووە ، هەر بۆ ئەوە بووە ، ڕێگە بۆ وەڵامی ئەو ڕەخنەیەم خۆشکا ، کە لە پەراوێزی ژمارە ( ٤ )دا لە خۆیم گرتووە .

ئـەوەتە دەست پێکـردنی داکـۆکی لە خـۆیشی بـە شێـوازە بەردەوامە وتە قەبە و قەڵەوەکـانی دەهۆنێتـەوە و لە ترۆپکی چەواشەکـارییەوە دەڵێ : « د . ئـەوڕەحمان لەم بـاسەیـدا زۆر تاکید[٦٢] لەسەر پێڕەوی زانستی ئەکات کەچی نەیتوانیوە تیایا خۆی بە ئاسانترین مەرجەکانی ببـەستێتەوە .. » ( ل ٢٣ ، س ١ ) . بـەڵێ من نەک هـەر لەم وتارەمـدا ، بـەڵکـو لە زۆربـەی نووسینەکانمدا جەخت لەسەر پێڕۆ و بەرنامەی زانستی دەکەم ، چونکە باس بەبێ ئەو ڕێباز و شێوازە ، نابێتە باسی زانستی .. ئەمە تاکە ڕاستی یەکە کـە د . وریا بدانی پێـدا نابێ و مـایەی خۆشی یە .. بەلام بەداخەوە ، ئەمەشی

هەر بۆ ئەوە درکاندووە ، بیخاتە مێشکی خوێنـەرەوە ، گوایـا ئەوڕەحمان لەگەڵ ئەوەشدا لەو باسەیەدا نەیتوانیوە خۆی بە ئاسانترین مەرجەکانی پێڕەوی زانستی یەوە ببەستێتەوە .. بۆ ئەوەی ئەو وتانە هەر قسەی ڕووت و ڕەجاڵ نەبن ، د . وریـا دەبوو :

١- کەمێ باسی پێڕەوی زانستیی بۆ بکردینایە ، تا فێری ئەو عیلمە بین ، کە ئەو دەیزانێ و ئێمە سەری لێ دەرناکەین .

٢- لە نێـو مەرجـەکـانی زانستیـدا ، ئـاسـانتـرینیـانی بـۆ دەست نیشان بکردینـایە ، بـۆ ئەوەی لەمـەولا زەحمەتتـرین و ئاسانترینیان جیابکەینەوە .

٣- بە بەڵگە و نموونەوە نیشانی بدایە ، کە ئەوڕەحمان لە کام بەند و خـاڵی ئەو وتـارەیدا ، ئـەوەی ئەو دەفـەرمووێ ، پێی نەکراوە .

---

[٦٢] زمانەوانێک لە وشەی ( تەئکید )دا ، هەڵەی وا بکا و بە ( تاکید ) بینووسێ ، هەڵبەت گلەیی دێتە سەر .

بەڵێ ئەو جۆرە قسانەی د . وریا بە هەموو کەسێک دەکرێ ، بەڵام زانست و زانیاری خۆ ماندووکردنی دەوێ .

د . وریا بەدوا ئەو قسانەدا ، وا ڕادەگەیەنێ ، کە ئەو ڕەخنەیەی بەندە لە پەراوێزێ ناوبراودا لە خۆیم گرتووە ، گوایا « بێ ئەوەی لە دوور یا نزیکەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ناوەرۆکی ڕەخنەکەیەوە هەبێ ناوی وتارێکیم ( باسێکی فۆنۆلۆجی ) ، کە سیازدە ساڵ لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە ئەخزێنێتە ناو باسەکەیەوە .. » ( ل ۲۳ ، س ۱ )

وا بێدەچێ نووسەری ئەو چەند دێڕە تەنانەت لەو وتارەشدا ، کە تێیدا ڕەخنە لە خۆیشی گیراوە ، هێندە خۆی ماندوو نەکردووە بە وردی بیخوێنێتەوە .. گەرنا ، ئەوە بە ڕوونی و ئاشکرایی و ئاسانی دەبینی پێوەندیی ئەو ڕەخنەیەی لەوم گرتووە ، چەند نزیکە و هاومەبەستی ئەو ڕەخنەیەیە ، کە لەو شوێن و لایەنەوە لە مامۆستا محەمەد مەعرووفم گرتووە ..

من ئەوەم زۆر بێ باش بووە ، کە مامۆستا محەمەد بەشی یەکەمی وتارەکەی تەرخانکردووە بۆ کورتە هەڵسەنگاندنێکی ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی دابەشکردنی کرداردا کراون .. بەڵام ڕەخنەم لەوە هەبووە ، سەرجەمی ئەو سەرچاوە کوردییانەی لێیان دواوە تەنیا نۆ کتێبووتارن و وێڕای ئەوەش پێوەندیی ڕاستەخۆیان بە ناوەرۆکی باسەکەیەوە نییە و ، ژمارەی ئەو بەرهەمانەش کە باسی نەکردوون ، لەوانەی باسی کردوون زیاترە و بەشێکیان لە باسەکەیەوە زیاتر نزیکن . بۆ بەڵگەی ئەو قسانەشم ناوی بیست بەرهەمم خستووەتە ڕوو .. پاشان هۆی ناونەبردنی ئەو بەرهەمانەم لێکداوەتەوە و خستوومەتە بەرچاو .. جا بەم بۆنەیەوە بەجێم زانیوە و بۆ پەند و ئامۆژگاری ، کلەیی لەو دۆستانەی دیشم بکەم ، کە لەو ڕووەوە کەمتەرخەمن و ڕێز لە کاری پێشڕەوان ناگرن ، بەتایبەتی د . وریا ، کە نە لەوە دەدوێ زووتر چی کراوە و نە

ناوی سەرچاوە دەبات و لەوەش خراپتر لەمەلاو لەولا زانیاری وەردەگرێ و ناوی خاوەنە ڕاستەقینەکەشی پەردەپۆش دەکات ، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین جار بەدەمی ئەم ڕاستییەم پێوتووە و خۆی لێ گێلکردووە .. جا ئەمەی من کاری دۆستانەیە یان نا ؟ ... بەرگرییە لە ڕابەران و زانست یان نا ؟ ..

هەرچی بۆ ئەو خاڵەشێتی ، کە وتوویە : « وتارێکم .. کە سیازدە ساڵ لەمەوبەر بڵاوکراوەتەوە » ، دەڵێم :

١ـ درەنگە و زوویی بۆ ئەو جۆرە کارانە نە مەرجە و نە دەوری هەیە .

٢ـ هەر کە ئەو وتارەی بڵاوبوومەوە ، پێموت : مامۆستا مەسعوود محەممەد لە کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی »دا باشتر و فراوانتر لەو کێشەیە دواوە ... لە وەڵامدا وتی : نەمخوێندووەتەوە .

ئەوجا منیش ئەو دوو ڕاستییەی خوارەوەم بە هاوڕێی خۆشەویستم ڕاگەیاند :

یەکەم ـ عوزر لە قەباعەت خراپتر ..

دووەم ـ ئاخر نەک هەر زۆری نموونەکانت ، بەڵکو هەندێ ڕستەشت هەر وەک ئەوانی مامۆستا مەسعوودن . ئەویک حەوت ساڵ بەر لەو وتارەی تۆ ئەو کتێبەی بڵاوکردبێتەوە ، خۆ ناکرێ بڵێین ، ئەو لە تۆی وەرگرتووە .

٣ـ وتاری « کاربۆلێنکردن بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێک » ، ئەمیش ساڵ لەمەوبەر نووسیومە .. ماوەی چەند ساڵێک هیچم بڵاونەدەکردەوە ، کاتێ کەوتمەوە بڵاوکردنەوە ، ئەمە بووە یەکەم وتارم

زێدە ڕۆیی نییە ، گەر بڵێم هەر بەندێکی ئەو وەڵامەی د . وریا جێی سەرسوڕمان و گومان و پرسیارە . ئاخر ، کە وتوویە : « وەک دەرئەکەوێ د . ئاورەحمان لە باسەکەی من نەگەیشتووە یان زۆر

به سەرپێیی سەیریکردووە » ( ل ۲۳ ، س ۱ ) ، گوایا ئەوە نازانێ :

۱ـ نە من هێندە نەخوێندەوارم لە باسەکەی ئەو نەگەیشتبم و نە باسەکەی ئەویش لە ئاستێکی وا بەرزی زانستیدایە ، تەنانەت زمانەوانیش تێی نەگا .

۲ـ یان کە بڵێ ئەورەحمان « زۆر بە سەرپێیی سەیری کردووەم ئەی چۆن مێ تێر پێکشتر ، دەنووسێ : « لەگەڵ باسێکی مامۆستا مسعود محمددا بەراووردی ئەکات » . لێکۆڵینەوە لە باسێک کەمەترابێتە ئەو ئاستەی لەگەڵ نووسینێکی دیدا بەراورد کرابێ و بانگی هەقی ناڕەوایی وەرگرتن و ناونەبردنی تێدا درابێ ، ئیتر چۆن بە سەرپێیی سەیری کراوە ؟

د . وریا لەبریتی ئەوەی پێ لە ڕاستی بنێ و بەڵێن و پەیمان بدا واز لە کاری ناڕەوای وەرگرتن و ناونەبردن بێنێ و ئیمان بە ڕێزگرتنی ڕابەران و پێشڕەوان بێنێ ، کەچی کەوتووەتە برو بیانووی بێ سەروبەرو دەربڕینی بازارییانە و تەنانەت وتنی وتەی ناشیرین بە مامۆستا مەسعوود محەمەد .

پاکانەی وەرنەگرتنی زانیاری لە مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەوەیە ، گوایا باسەکەی ئەم دەربارەی دەنگسازییە و ئەوی ئەویش شتێکی دییە .. خۆم و خوێنەر بەم بیانووە سەیر و سەمەرەیەوە خەریک ناکەم ، تەنیا دەپرسم :

۱ـ ئەی چۆن بەشێک لە نموونەکانی مامۆستا مەسعوود محەمەد و هەندێ شێوە دەربڕینی ئەو زاتە کەوتوونەتە وتاری « پاسایێکی فۆنۆلۆجی »یەوە .. ؟[٦٣]

۲ـ هەر لەبەر ئەوەی مامۆستا مەسعوود کتێبەکەی بە دەنگسازی ناونەنابێ ، ئیتر کە کەرەستەی بۆ وتارێکی ئەو بوارە لێوەربگیرێ ، ماڵ خاوەنەکەی پێوە نامێنێ ؟ ..

---

٦٣) لە سەرەتای بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا ، ئەو نموونە و دەربڕینانە باس کراون .

د . وریا کە پێدادەگرێ و دەڵێ : « دۆزینەوەی خۆمە و پێشتر باسنەکراوە » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) . وا دیارە دەیەوێ بڵێ ئەم پێشتر باسی کردووە و مامۆستا مەسعوود لەوی وەرگرتووە .. بەو پێیە یان دەبێ مامۆستا مەسعوود ساڵی ١٩٧٦ مێشکی ساڵی ١٩٨٤ ی د . وریای خوێندبێتەوە و ئەو نموونە و دەربڕینانەی لێوەرگرتبێ .. یان ساڵی ١٩٨٤ پێش ساڵی ١٩٧٦ بکەوێ .

هیچ یەکێک لەو لێکدانەوانەش پەسەندنین و ڕووی مەجلیسیان نییە .. حا لەبەر ئەوەش ، کە من شاهیدیی ناڕاستم بۆ نەداوە و ناڕاستیم بۆ نەگۆڕیوە بە ڕاستی و قەباڵەی بەتاڵم بۆ مۆرنەکردووە ، بۆیە بە ئەوسەوە پێیدەڵێ : « ئەبوو د . ئاورەحمان وەک خاوەن ئەستاوێکی ئەکادیمی واقیعی بوایە و ئەمەی دەربخستایە » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) .. بەداخەوە لە چەند شوێنێکی ئەو کورتە وتارەیدا ، ئەو دەربڕینەی وتوومەتەوە و ویستوویەتی بەو جۆرە پلار و توانجە کاربکاتە سەر خوێنەر و بەندە .

ئەوەی زۆریش جێی نیگەرانی و دڵتەنگی بێ ، ئەو وتە ناشیرینانەیە ، کە بە مەبەستی بەرگری لە خۆکردن بە مامۆستا مەسعوود محەمەدی دەڵێ . د . وریا وا نیشان دەدا ، کە ئەم باسەکەی زانستییانەیە و دوورە لە سەڵەفییەتی و درێژدادڕی بێسوود و ئەنجام » ( ل ٢٣ ، س ٢ )ی وەک مەسعوود محەمەد ..

کەمێک پەر لەوەی ئەو وتە جوان و قەشەنگانە بە کاک مەسعوود بڵێ ، ڕووی کردووەتە بەندە و بە زمانی بازاڕییانە و بە کورتییەکی خوارو خێچ وتوویە : « ئەو پرسیارە ئاراستەی د . ئاورەحمان ئەکرێ لێرە ئەوەیە .. کام پێڕەوی زانستی لە کام لوتووی هەتاری نەدات .. » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) .

هەرچی بۆ شەخسی خۆمە ، هیچ گلەیێک لەو برا ئازیزەم ناکەم ، بەڵام بۆ مامۆستا مەسعوود محەمەد ، نەک هەر گلەیی ،

بەڵکو لۆمە و سەرزەنشتیشی دەکەم .. کەلۆ ! ئێمەی کوردی کلۆڵ و چارەڕەش ، چەند زانا و دانا ؛ پلەبەرز و پلەدار ؛ گەورەو کەڵەمێر .. ی وەک مامۆستا مەسعوود محەممەدمان هەیە ، تا وا بە چاوی سووک تەماشای بکرێ . ئەگەر زمان بۆ ئەو جۆرە وشانە بجزوێ ، ئەی قەڵەم چۆن قایل دەبێ بیاننووسێ ؟ ..

د . وریا بۆ ناونەبردنی سەرچاوە و نکۆڵیکردن لە وەرگرتنی زانیاری لە کەسانی دییەوە ، دیسان دەڵێ : « .. لەم وتارە یەکجار کورتەمدا .. ئەنجامی شیکردنەوەی خۆم دەخەمە ڕوو . بەلێ شتێ ئەکەم پێشتر باس نەکراوە ، سوودم لە هیچ سەرچاوەیێک وەرنەگرتووە .. »و دەبوو « د . ئاورەحمان باژ لە کوێ پێشتر باسکراوە .. » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) ..

بالنە ، لەو تاکە پەراوێزەدا ، کە تێیدا لەو ڕووەوە ڕەخنەم لە د . وریا گرتبێ و وتبێتم : « وێرای ئەو چەند نێرەی مامۆستا تۆفیق وەهبی ، کە لە بەندی (٤٧)ی لاپەڕە ( ١٠)ی کتێبی ( دەستووری زمانی کوردی ـ ١٩٢٩ )دا پێوەندیی بەو باسەی د . وریاوە هەیە ، مامۆستا مەسعوود محەممەدیش لە چەند نووسینێکیدا لەو کێشەیە دواوە : یەکەم جار ساڵی ١٩٧٣ لە وتاری ( بەکارهێنانی ـی ـ لە ڕێزمانی کوردیدا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب ١ ، ژ ٢ ، ل ٨٩ ـ ١٠٠ )و ئەمجا لە کتێبی ( ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ ١٩٧٦ )دا لە دوو شوێندا ( ل ١٠٥ )و (ل ٢١٥-٢١٦) ودواتریش لە کتێبی (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ـ ل ٥٦-٥٧)دا لە هەمان باس دواوە »(٦٤) .. خۆ هێشتا چەند مانگێک بەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو وتارەمدا تێپەڕیوە و کەچی براکەی هێژام دەنووسێ : دەبوو « د. ئاورەحمان

(٦٤) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وتاری کاربواێنکردن بەپێی بۆنان و چەند سەرنجێک ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ١٣٩ ، بەغدا ، ١٩٩٧ ، ل ١٥-١٦ ، پەراوێزی ژ ٤ .

بڵێ «له کوێ پێشتر باس کراوه .. » .. ئەو دەیەوێ وا خەڵك چەواشە بکا ، کە هەر لەبەر ئەوەی وتارەکەی ئەو دەربارەی دەنگسازییە و ئەوانی کەسانی دی ، ئەو ناوە زلەیان نییە ، ئیتر ئەم نابێ ناویان بەرێ و ئەوان مافیان بەسەر ئەو باسەوە نییە .

لێرەدا دوو ڕاستی دەخەنە پێش چاو :

١- مەسەلە ئەوە نییە ، کە ناوی باسەکان جیاوازن ، بەڵکو هەڵسو و کەوتی د . وریا لە نووسیندا بەو شێوە ناڕاستەیە .. بێتو ئەمەشی لێ قبووڵ بکەین ، کە توێژەرانی دی مەبەستی سەرەکیی ئەو نووسینانەیان (دەنگسازی ) نەبێ ، ئەی چۆن بەوە قایلبین ، کە بۆ هەموو بوار و ئاستێ ، کەرەستەی زۆر و ئامادەی لە مامۆستایان : فەتتاحی مامە عەلی و ئەورەحمانی حاجی مارف و د . عەبدوڵلا حوسێن .. وەرگرتووە و بە هیچ چەشنێکیش ناویانی نەبردووە .

٢- بەپێی ئەو وتانەی د . وریا ، ئەگەر ئەو بەشی زمانی کوردییەی ، ئەو سەرۆکیتی و ئێمەش مامۆستا ، ڕۆژێك لە ڕۆژان ناوی بگۆڕرێ ، یان ببێتە کۆلێجیکی سەربەخۆ، ئەوە دەبێ ناو و دەوری ئەو و ئێمە لە مێژووی ئەو بەشەدا باس نەکرێت . بێگومان برای بەڕێزم ئەمەیانی قبووڵ نییە .. جا با لێم ببووری ، کە منیش بە خاڵی یەکەم قایل نیم ..

ئەوێکە ، کە بۆ وتاری « باسێکی فۆنۆلۆجی » بڵێ : « لەم وتارە یەکجار کورتەمدا .. ئەنجامی شیکردنەوەی خۆم دەخەمە ڕوو .. سوودم لە هیچ سەرچاوەیێك وەرنەگرتووە .. » .. ڕەنگە هەڵم بێ ، گەر لێی بپرسم : خۆ وتاری « ڕەخنەی ناڕەخنە »ش ئەنجامی شیکردنەوەی خۆتە ، ئەی بۆ لێرەدا سوودت لە سەرچاوە وەرگرتووە و ناویشت بردوون ؟ .

وەك من خستوومەتە ڕوو و ، وەك خۆیشی ددانی پێدا ناوە ، لە وتاری « باسێکی فۆنۆلۆجی »دا ناوی هیچ سەرچاوەیێکی

نەبردووە .. لە زۆربەی نووسینەکانی دیشیدا ناوی دووسێ
سەرچاوەییەک دەبا ، کەهەمیشە بەشی زۆریان بەرهەمی خۆین ..
ئەمانەت لە نامیلکەی « ڕێزمانی ڕاناوی لکاو »[65]دا ، کە
گەورەترین کاریەتی ، چوار پەراوێز و پێنج سەرچاوەی ڕیزکردووەو
سیانیان هی خۆین ( ل ٢٨ ) ، بەڵام ئەوەی تەواو
سەرنج ڕابکێشێ و مایەی خۆشی بێ ، ئەوەیە ژمارەی پەراوێز و
سەرچاوەکانی وەڵامەکەی -ڕەخنەی نارەخنە ، دوازدە دانەن ..
شاهیدیی هەق دەدەم ، ئەمە یەکەم جارە د . وریا لە نووسینیدا
بەو ئەندازەیە پەنجە بۆ سەرچاوە ڕابکێشێ و .. دیارە لە دڵدا
ئیمانی بە ڕەخنەکەی من هێناوە و لەمەو دوا ئەو شێواز و ڕێبازە
دەگرێتە بەر ، کە بەندە دەمێک ساڵە پێڕەوی دەکا .. ئەمە کارێکی
چاکە و بەدڵ پیرۆزبایی لێدەکەم .. بەڵام خۆزگە بوێرانە زاتی
دەکرد ، پێ لە هەڵەکانی زووی بنێ .

د . وریا لەبەر ئەوەی بە کوردی بیرناکاتەوە ، بەلایەوە
سەیرە ، کە من داوای ( لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل ) دەکەم و
بۆیە بەم بۆنەیەوە وتوویە : « .. د. ئەورەحمان لە زۆر شوێنا
دەربڕینی ( تێروتەسەل ) بەکاردەهێنێ » ( ل ٢٣ ، س٢ ) .. گەر
بە کوردی بیرم نەکردایەتەوە ، کە لە زمانێکی بێگانەوە ئەو
مەبەستەم وەربگێڕایە ، دەبوو بڵێم (دیوی ناوەوە و
دەرەوە ) .. من چ پێویستم بەو دەقاودەقە ناقۆڵایە هەیە ، کە
زمانەکەی خۆم دەربڕینی ( تێروتەسەل )ی هەبێ .. بێگومان
لێکۆڵینەوەی تێروتەسەلیش ئەوەیە ، هەموو ڕوو و دیوێکی
دیاردەیەک تاوتوێ بکا .. مامۆستا وریا ( تێروتەسەل ) بە
( دوورودرێژ ) تێگەیشتووە و ئەوەتە ئەنجامی ئەو
بێئاگایییەی لە ڕستەیێکی شێواوی بێ گوزارەدا دەردەخا و
دەڵێ : « تێروتەسەل لە زانستا مەوزوعیەت و ڕاستی دەرخستن

---

(٦٥) د . وریا عومەر ئەمین ، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

و گەیشتنە یاسا و ئەنجامی تازە بە کورتترین ڕێگا » .

بەندە هەمیشە گرنگی بە بەکارهێنانی ڕێژەی ڕاستی وشە :

شێوازی دروست دارشتنی ڕستە : پاراوی و ڕەوانی و بێگرێیی مەبەست دەربڕین : باش پەیڕەوی کردنی ڕێنووس : ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپ .. داوە و بۆیە بەرهەمەکانی تا ڕادەیەک بە پوختی دەکەونە بەر دیدەی خوێنەران .. بەڵام بە خەم و پەژارە و کەسەرێکی زۆرەوە دەڵێم ، نووسینەکانی د . وریا لە سەرپاکی ئەو بوارانەدا یەکجار پڕ خەوش و ناتەواوین .. ئەومتە تەنانەت لەم وەڵامەیدا ، کە لای خۆی تەواو بایەخی پێداوە ، دەیان هەڵەی زەق و چەندین کەموکورتیی ئەو بابەتانە ، ئاشکرا ، لە چاو دەچەقن .. لێدوان لە گشت ئەو لایەنانەی وتاری ناوبراو ئاو زۆر دەکێشێ و ناچار هەڵیدەگرم بۆ ئەڵقەیەکی دی .. جارێ تەنیا سەرنج بۆ دوو خاڵی سەر بە ڕێنووس ڕادەکێشم :

١ـ د . وریا یەکێکە لەوانەی بەتەواوی لایەنگیری دانانی چوکڵەیە لە ژێر ( ڕ )ی سەرەتای وشەدا و ئەمەی لە وتاری « ئیملای کوردی و چەند تێبینییەک »[٦٦] دەربڕیوە و نووسیویە : « ... ئەو ڕایەی کە دەڵێ لەبەر ئەوەی هەموو ( ڕ )یەک ، لە سەرەتای ووشەی کوردی دەرکەوێ قەڵەوە ، بۆیە لە نووسینا پێویست بەوە ناکات نیشانەی ( قەڵەوی )ی بۆ دابنرێت ڕایەکی پووچە و بە تیشکی ئەزمرییەی فۆنێم فش دەبێتەوە ... » ( ل ٤٤٢ ) ، کەچی لە وتاری « ڕەخنەی ناڕەخنە »دا لە نووسینی سەرجەمی ئەو جۆرە وشانەدا ( ٢ )ی نیشانەی قەڵەویی لەژێر ئەو پیتەدا دانەناوە ..[٦٧] ئەم

---

(٦٦) بڕوانە : پەراوێزی ( ٢٢ .

(٦٧) تەنانەت بۆ زووربەی زۆری ئەو ( ڕ )ە قەڵەوانەش ، کە لە ناوەڕاست یان کۆتایی وشەدا دێن ، چوکڵەی دانەناوە .

دیاردەیەش وەنەبێ هەر لەم وتارەیدا بێ ، بەڵکو لە زۆربەی نووسینەکانیدا بەهەمان چەشنە .. زێدە ڕۆیی نییە ، گەر بڵێم ، نامیلکەی ( ڕێـزمانی ڕانـاوی لکاو ) پتـر لە سەد وشـەی وای گرتووەتە خۆ و تاکە یەکێکیان چییە ، چونکە لەژێر ( ڕ )ەکەیدا نییـە . بۆ نموونە سـەرنـاوی ئـەو نـامیلکـەیـە لە سێ وشـە پێکهـاتـووە : ( ڕێـزمـانی ڕانـاوی لکـاو )و دوانیـان بـە ( ڕ ) دەست پێدەکەن و لەژێر ( ڕ )ی هیچ کامێکیاندا (٧) دانەنراوە ، واتە نووسراوە : ( ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ) ..

٢- ئیملای چەنـدین وشەی هـەڵەیە و بـەتایبـەتی ئەوەی لەبریتی ( تەئکید ) ، نووسیـویە ( تـاکید ) ( ل ٢٣ ، س ١ ، د ٢٥) ؛ لە جیاتی ( بەراورد ) ، ( بەراوورد ) ( ل ٢٣ ، س ١ ، د ٣٠ ؛ ل ٢٣ ، س ٢ ، د٥ ) .

جا ئەمانە کەمتەرخەمی بن ، یان نەزانین بۆ زمانەوان نەنگە .

بەداخەوە بەرهەمەکانی د . وریـا پڕی ئـەو جۆرە هـەڵە و خەوشانەن ..

بەوێنە لە کۆتایی وتاری ناوبراوی « لە یاسا دەنگییەکـانی زمانی کوردی »دا دوو وشەی ( ئاژا ) ـکە ئاوەڵناوە و ( پیاو ) ـ کە ناوە ، بە ڕەگی کردار داناوە .. ئەوەتە نووسیویە :

« ئـەگـەر ڕانـاوی لکـاو ( ین ـ یت ) لەگـەڵ ڕەگی فـرمـان دەرکەوتن ..

.... ....

ئێمە ئاژاین »

« ئەگەر ڕەگی فرمان بە کپ کۆتایی هاتبێ .. :

تۆ پیاویت » ( ل ٢١) .

مایەی خەم و پەژارەییەکی سەخت و گرانە ، زانست و زانیاریی زمانەوانیک لەو ئاست و ڕادەیەدا بێت .

بـاسی ڕەخنەی د . وریـا دەربارەی بـەکارهێنـانی دەربڕینی ( ئیروتەسەل ) لە لایەن بەندەوە ، دەمگەڕێنێتەوە بۆ ئیدیعای

بەردەوامی سەبارەت بە ( تازەگەرێتی ) و بەپەیڕەوی کردنی ( پەیڕەوە تازەکانی زمانەوانی )و (بێدەسەڵاتی پەیڕەوی چلولیکەری و هەر بینینی دیوی دەرەوەی زمان ) .. بۆ ئەم قسە زلە ڕوونە بێ بەڵگانەی دەڵێم :

ئەو دەڵێ لە دیوی ناوەوە و دەرەوەی شت دەکۆڵینەوە ، بەڵام ئەمەی هەر بە قسەیە ، نەك بە کردار . ئەوەتە لە زۆربەی نووسینەکانیدا تەنیا لە دیوی دەرەوەی دیاردەکان دەدوێ و ئەویش بە نیوەچڵی . بۆ وێنە :

١- ( مۆرفیمی وشەدارێژ - Derivational morphame )و ( مۆرفیمی وشەگۆڕ - Inflexional morpheme ) هەر لەبەر ئەوەی هەردووکیان مۆرفیمی بەندن و سەربەخۆ و بە تەنیا واتا نابەخشن ، بە یەك شتیان دادەنێ و جیاوازی لە نێوانیاندا ناکات و ئەمەش هۆی ئەوەیە ، کە تەنیا دیوی دەرەوەی ئەو مۆرفیمانەی بینیوە . ئەگەر دیوی ناوەوەی ببینیایە ، ئەوسا دەیزانی :

أ - مۆرفیمی وشەدارێژ دەتوانێ وشەیەك لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بکاتە بەشێکی دیکەی ئاخاوتن ، بەڵام مۆرفیمی وشەگۆڕ ناتوانێ ئەو ئەرکە ببینێ .

ب - لە وشەی ئاسادەی زمانی کوردیدا پاشگر ( کە مۆرفیمی وشەدارێژە ) ، هەمیشە لە دوای بنەمای وشەوە دێت و ئنجا بە دوای ئەودا نیشانە ( کە مۆرفیمی وشەگۆڕە ) - واتە هەمیشە پاشگر پێش نیشانە دەکەوێ .

جـ - مۆرفیمی وشەدارێژ مانای دارێژە ( المعنى الاشتقاقي - Dervational meaning ) دەدات ، هەرچی مۆرفیمی وشەگۆڕە بە مانای نیسبی ( المعنى النسبي - Relational meaning ) دەگەیەنێ .

.. هتد[69]

۲ـ بايەخ بە ئێتیمۆلۆجیی وشە نادات ، کە ئەمە لایەنێکی یەکجار گرنگی هەر زمانێك و کێشەیێکی گەورەی زمانەوانی یە .. بە نموونە لە زمانی ڕووسیدا وشە نییە ئەسڵ و ڕەگەزی ئاشکرا نەکرابێ ، بۆیە لێکۆڵینەوە لەو زمانە بەپێی پەیڕەوی کردنی پێڕەوە نوێکان کارێکی زیرانەیە ، بەڵام ، ئێمەیێکی کورد ، کە لەو مەیدانەدا هێشتا شتێکی ئەوتۆمان ساخ نەکردبێتەوە ، ئیتر چۆن بیانخەینە بەر تیشکی پێڕەوە نوێکانی زمانەوانی .

۳ـ زمانەوانێك واتا و ڕۆنانی سەدان وشەی زمانەکەی نەزانێ ، چەندین وشە بە هەڵە بەکاربێنێ و بنووسێ ؛ ڕستە بە خوارو خێچی دابڕێژێ .. نەك هیچ شێواز و ڕێبازێکی لێکۆڵینەوە دایی نادا ، بەڵکو کۆمپیوتەریش فریای ناکەوێ ..

زمانەوانێك لە باسی جێناوە کەسییە جوداکانی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ( هوون = ئێوە ) بە ( هون ) تۆمار بکا[69] ؛ لە لێدوانی جێناوە لکاوەکانی دیالێکتی خوارووی کوردیدا ، ڕستەی وەك : ( من بوم ناردنیت )و ( تو بوت ناردنین ) ..[70] نموونەی بن : لە چیرۆکیدا بە ( دارلاستیك ) گوتن ( بگرێ ) ، یان ڕستەی ناتەواوی وەك ( لە ڕۆژێکی یەکجار سارد لە زستانا ) دارێژێ .. ئەوە ئەو جۆرە دەربڕینانە ، کە کورد بەو چەشنەی د . وریا نەیانڵێ ، بێگومان کەرەستەی وا ویران ، مەنتیق دەشێوێنێ و بەرەو نشوستیی دەبا ، بۆیە هیچ ڕێباز و پێڕەوێك پێی ناکرێ ، هەروەو دیوی لێکبداتەوە ، بەڵکو تەنانەت دیوی ساکاری دەرەوەشی پێ ساخ ناکرێتەوە .. یلخود بۆ ئەم کەرەستە

---

(٦٨) بۆ پتر زانیاری ، بڕوانە : د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٢٢ـ٤٨ .

(٦٩) د . وریا عومەر ئەمین ، لایەنێکی جیاوازی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٢٥٤ ـ ٢٧٦ .

(٧٠) د . وریا عومەر ئەمین ، ڕێزمانی ڕانانوی لکاو ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل ٢٢ .

شەق و گێزە هەزار و یەك خەت و خشتە و نەخشە و بیرکاری بۆ بەکاربهێنرێ ، ئەنجامی هەر هەڵە دەردەچێ .

ڕاست وایە . ئێمە بەر لە هەر شت کەرەستەی پەرش و بڵاوی زمانەکەمان کۆ بکەینەوە ؛ دیالێکتەکانی کوردی بزانین : زمانێکی ڕەوان و بێ گەرد و بێ گرێ فێربین .. ئەوسا بڕیار بدەین بە ڕێبازی چاولێکەری ؛ یان بناخەگری ، یان .. لە زمانەکەمان بکۆڵینەوە . دیارە نەك هەر تەلاری بەرز و بڵند ، بەڵکو خانووچکەش دەبێ لە بناخەوە دەست پێبکرێ . ئەگەر یەکێك بە خەیاڵ یەکسەر نهۆمی سەرەوە بنیات بنێ ، ئەوە بەر لە هەر کەس بەسەر خۆیدا دەڕووخێ ..

بەڵێ کار و پرۆسەی کۆمپیوتەر شتێکی یەکجار پێشکەوتوو و بەکەڵکە . بەلام کە زانیاریی هەڵەی بخرێتە ناو هەڵبەت ئەویش ئەنجامی باش نادات .. بۆ زمانێکی وەك ڕووسی ، کە دەمەتەقێ لەسەر هیچ نەمابێ ، تەنانەت دوو ڕای جیاوز لەسەر شوێنی دانانی کۆمەڵێك نەبێ ، ئەوە کەرەستەی ساغ کراوەی ئامادەی بێ گەرد و ڕاست و ڕەوانی ئەو زمانە بخرێتە کۆمپیوتەرەوە ، بێگومان بە ڕێکەیێکی هەرە زانستی کەرەستەکانی شیدەکاتەوە .

د . وریا بەو هەموو خەوش و هەڵوخەشە و کردەوە نارەوا و نازانستییانەشییەوە ، سڵنەکاتەوە و چەند جار بە ئەوس و لووت بەرزییەوە ، ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە خاوەن ئاسناوێکی ئەکادیمی وەك ئاوڕەحمان نابێ هێندە سادە و نەزان و دواکەوتوو بێ و دەبێ وەك ئەو بەپێی پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی بکۆڵێتەوە .

گەلۆ ! لێم گەڕێن ، من هەر سادە و ڕاست و ڕەوان دەبم ؛ وشەیێك لە نەخوێندەوارێکیش وەربگرم ، بە ڕێزەوە ناوی دەبەم و با بەمە نەزان بم و با زانایانی ئاخرزەمان لەسەر ئەو کردەوە ڕاستەم هەر پلارم تێبگرن .. بەڵێ بێ ، هەر یەکێکیش

دەست بەسەر ماڵی خەڵکیدا بگرێ ، پڕ بە دەنگ جاڕی لێ بدەم ..
جا با کاکە وریاشم بە تواناجەوە پێم بڵێ : « ئەم جۆرە ڕەخنانە بلاویان نەماوە » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) . من لە پێناوی ڕاستیدا خزمەتی خۆم دەکەم .

ئەوەتە د . وریا بۆ داپۆشینی کاری نالەبارای یان بە قسەی بێبایەخ و بێهوودەی وەك : « ئەم جۆرە ڕەخنانە بلاویان نەماوە » ، یان بە وتەی قوت و زۆپی « ئیمڕۆ لە زمان کۆڵینەوە فەلسەفە و بیر و پێڕەو و زانست و هونەرە .. » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) .

گریمان ڕەخنەکانی بەندە بلاویان نەماوە ، بەلام دەبێ ئەو ( فەلسەفە و بیر و پێڕەو و زانست و هونەر .. )ە چی بێ ، کە د . وریا لە نووسینەکانیدا پێڕەوی کردووە .. ؟ کەسێکی بێئاگا گوێی لەم قسە قوت و زلانە بێ ، وا تێدەگا ، کە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی گەیاندبێتە دوند و لوتکە و ترۆپك .. ئەلحەق لە فەلسەفەی وەرگرتن و تالانەبردن ؛ کورتبینی و پەلەی بیر ؛ پێڕەوی قووڵنەبوونەوە ؛ زانستی نەشارەزایی .. دا ، دڵئاسوودە و خاترجەمە و هەر بۆیەش لە بەردەوامیدا وتوویە :
« هەر کارێکی زمانەوانیی بێ ئەسلی نەزمری دەنگی بێڕەنگە » ( ل ٢٣ ، س ٢ ) .. ئەم وتانەشی تەواو ڕاستن و ، ئەوەتە ئەسلی نەزمری و عەمەلی سەرپاکی نووسینەکانی کەرەستەی ئامادە و بیروبۆچوونی ئەم و ئەون و ، بۆیە دەنگی بە ڕەنگن و هەموومان بەئاسانی هەستی پێدەکەین .

# قەرەبووی خوێندکارێک
# بۆ مامۆستاکەی

لەو سات و کاتەوەی دەستنووسی وتاری « ڕەخنەی ناڕەخنە »ی بەندە کەوتووەتە دەست د . وریای بەرام ، چ لای خۆم و ، چ لای دۆست و ئازیزان ، بەتایبەت جەخت و تەئکید دەکەنە سەر ئەو خاڵە ، کە ئەو کەرەستە و زانیاریی لە نامەی ماجستێرەکەی مامۆستا فەتتاحی مامەوە وەرنەگرتووە ، بەڵکو کاکە فەتتاح لەوی خواستووە .

بەدوا هەموو ئەمەشدا ، بۆ بەرپەرچدانەوە و ڕێگەلێبڕینەوە و نەهێشتنی گومان و سۆ و دڕدۆنگی لە ئیدیعا ناڕاستە هەڵبەستراوە چاوبەستە خاپێنۆکە خەڵەتێنەکەی ، دوێنێ ( ٣٠/٧/١٩٩٨ ) نامەیەکی ئەو خوێندکارە لەخۆبوردووبەئەمەکەی دایە دەستم .. یەکەم شت ، کە لە خوێندنەوەی نامەکەدا زەق و زۆپ هاتە بەرچاوم ، ناڕەوانی و پڕگرێیی کوردییەکەی بوو . ئەوەی من بیزانم و ئاگاداری بم ، بەگشتی هەمە بڵاوکراوەکانی مامۆستا فەتتاح بە کوردییەکی پوخت و سفت نووسراون .. کەچی ئەم نامەیەی بە تەرز و شێوە شێوازە لەنگ و چەوت و چەوێڵە کوردی نووسینەکەی مامۆستاکەی داڕێژراوە .

بنەما و ناوەرۆکی نامەکە کتومت هەر ئەو قسە و وتە و پەیڤانەن ، کە د . وریا دەیکردن .. دەڵێی مامۆستا وتوونی و خوێندکار نووسیونی :

بۆ مامۆستای گەورەم بەڕێزم دکتۆر ناوەرەحمانی حاجی مارف

سڵاو و ڕێزی برایانەو زانستیانەتان لێ بێت

برایانی بەڕێز لەم دواییەدا وتارێکتان بە ناوی (ڕەخنە یا ناڕەخنە) وە بە دەستنووسی بڵاو کردۆتەوە کە تیایدا هێرشێکی زۆر دەکەنە سەر بەرهەمەکانی د. وریا عومەر ئەمین، بۆیە لەو بۆچوونەی کە بەبیرەوەری بەشەوە هەیە و بە پێویستم ئەزانم ئەم ڕوونکردنەوەیەتان بۆ ڕابگەیەنم :

لە وتارەکەتاندا واتان لێ ئەداوە کە د. وریا هەندێ زاراوە و شێوەنەی وەک (لێکەی و هاودەنگ و (ڕیتم دەخورێ) لە نامەکەیدا ماجستێرەکەی من وەرگرتووە کە بەناوی (هاودەنگی لە زمانی کوردی دا) یە و کردووەتی بە هی خۆی و ناوی وەک سەرچاوە ناهێنێ .

برای گەورەو بەڕێزم : ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کە د. وریا پێشتر لە وتارێکیدا کە بە ناوی (شیعری سپی یاسای گوێزانەوەیە) و لە ژمارە (١٢١) گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بڵاو کردۆتەوە، ئەم شێوەنە و زاراوانەی هێناوەتەوە و من لە نامەکەما وەک سەرچاوە سوودم لێ بینیوە و لە لاپەڕە (٤١) نامەکەم تۆمار کردووە و لە لیستی سەرچاوەکانیشدا دوو جار ناوی وتارەکەی ئەو برادەرەم هێناوە. جا لە پێناوی دەرخستنی ڕاستی و ڕێزگرتنی لە زانستدا ... ئەم ڕوونکردنەوەیەتانم بۆ دەنێرم و داوای لێبوردنیشم لێدەکەم بۆ ئاگاداری د. وریا .

لەگەڵ ... ڕێزم و هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو دڵسۆزێکی وشەی کوردی .

برای بچووکتان
نەجاح ...
١٩٩٨/٧/٢٢

مامۆستا فەتتاح بۆ لایەنگیری لێکردن و پاساودانی کاری نابەجێی مامۆستاکەی ، ڕاستی دەکاتە قوربان و بەلاگێری ناڕاستی و دەڵێ : من بۆ نامەی ماجستێری یەکەم زاراوەی « هاودەنگ »و « لێڵ » یم لە د . وریا وەرگرتووە و ئەو پێشتر لە وتاری « بنج و سیما و پاساکانی گوێزانەوە » ( ڕۆشنبیری نوێ ، ژ ۱۲۱ ) دا ناوی بردوون ..

۱ـ « هاودەنگ » : ج وەك زاراوە و ج وەك وشەی ئاسایی ، ئەگەر بە چرای ڕۆن گەرچەکیشەوە بۆی بگەڕێن لە یەکەم دێڕەوە تا دوا دێڕ لە وتاری ناوبراوی د . وریادا نایبینینەوە .. بەلام سەرناوی نامەی ماجستێری مامۆستا فەتتاح « هاودەنگ » لە زمانی کوردیدا » بە و لە دەیان شوێن و لاپەڕەشیدا وەك زاراوە وتراوەتەوە و بەکارهێنراوە .

۲ـ « لێڵ »یش نە وەك زاراوە و نە وەك وشەی ئاسایی لە وتارەکەی د . وریادا نییە .. ئەوەی هەبێ ، نەك زاراوە ، بەڵکو وشەی ( لێڵ )ە ، کە ئەویش تاکە جارێك لە ستوونی دووەمی لاپەڕە ( ۷۳ )دا نووسراوە .. بەڵێ ، دەبێ ئەوە بزانین :

أـ کورد لە دێر زەمانەوە وشەی ( لێڵ ) بەکاردێنێ .

ب ـ ( لێڵ ) ئاوەڵناوە و ( لێڵی ) ناوی واتایە ..

جـ ( لێڵ ) وشەیێکی ئاساییە و د . وریاش ئەو تاکە جارە هەر بەو شێوەیە ، وەك هەر وشەیێکی دی کوردی بەکاری هێناوە .. بەلام مامۆستا فەتتاح :

یەك ـ ( لێڵی ) وتووە ، نەك ( لێڵ ) .

دوو ـ ( لێڵی )ی لە وشەی ئاساییەوە کردووەتە زاراوە .

جا کە ڕاستیی و دروستیی مەسەلەکە ئەمە بێ ، ئیتر بۆ دەبێ مامۆستا فەتتاح لە پێناوی شاردنەوە و پەردەپۆشکردنی کاری ناڕەوای مامۆستاکەیدا ، نەك هەر بەرهەمی خۆی ببەخشێ و بەختبکا ، بەڵکو هەرچی ڕاستی و مەوزووعییەت و زانست و ڕێبازی زانستییشە ، بکاتە بالاگەردانی و لە دەوری بگێڕێ .

وێڕای بەخشینی دوو زاراوەی ( هاودەنگ )و ( لێڵی ) بە مامۆستا ، کاکی خوێندکار نموونەی ( پێمدەخورێ )یشی هەر

دەکاتە خەڵات .

مامۆستا فەتتاح لە پێناوی داکۆکی و بەرگری کردنی ناوەڕۆکی نامەکەیدا ، ناوی ئەوەی نەبردووە ، کە ڕستەی ( پێم دەخوری ) لە وتاری « بنج و سیما و باسکانی گوێزانەوە »دا ، چ لە ڕووی داڕشتنەوە و ، چ لە باری دەوری ڕێزمانی و مەبەستی لێکۆڵینەوەوە ، زۆر لە مەبەست و جۆری تۆژینەوەکەی نێو نامەی ماجستێرییەکەی ئەو جیاوازە . هەرچی لە وتاری « لێل لە زمانی کوردیدا »یە ، کە شەش ساڵێک دواتر بڵاوی کردووەتەوە ، لە هەموو ڕوخ و ڕوویەکەوە لەگەڵ باس و بابەتی مامۆستا فەتتاحدا یەکدەگرنەوە و بەندە لە وتاری « ڕەخنەی ناڕەختە »دا ئەو بابەتی هەڵەی داوە .

ئەوە وەک ڕۆژی ڕوون دەرکەوت ، کە دوو زاراوەی ( هاودەنگ )و ( لێل )و ڕستەی (پێم دەخوری ) بە هەوڵ و کۆششی مامۆستا فەتتاح لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا جێگیرکراون و د . وریا بەخشکەیی و بێ ناوبردن لێی وەرگرتوون .. جا لەبریتی ئەوەی کاکە وریا داوای عوزرخوایی و لێبوردن لە خوێندکارەکەی بکا ، هێناویەتی یە سەر ئەو باوەی دەستبەرداری ماڵ ڕەوای خۆی بێت . بە خنوخۆڕایی ، کوردواتەنی « قەزای دیزە کەوت لە کۆزە » .

کاکە فەتتاح لە نامەی داکۆکی لە مامۆستاکەیدا ، ئەوەی پێوەندی بە خودی خۆیەوە هەبێ ، تەنیا باسی دوو زاراوەی « هاودەنگ »و « لێل »و ڕستەی « پێم دەخوری »ی کردووە ـ واتە ئەوەی د . وریا لە هەموو شوێن باسی دەکا ـ و لە لایەنەکانی دی نووسینەکەم نەدواوە .. هیوادارم لێم زیز و زویر و دڵگیر نەبێ ، گەر هەندێ ڕووی دی ئەو باسە بخەمە بەر دیدە :

١ـ من لە لاپەرە ( ١٠ )ی دەستنووسەکەمدا پەنجەم بۆ ئەوە ڕاکێشاوە ، کە بەشی سێیەمی نامەی ماجستێرەکەی مامۆستا فەتتاح بە ناوی « هاودەنگ لە ئاستی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسدا »وەیە : « ١ـ هاودەنگ لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا » ( ل ٦٣ .. ) ، ٢ـ هاودەنگ لە ئاستی سینتاکسدا » ( ل ٨٠ ... ) د .

وریاش له دێڕی دووەمی وتارەکەیدا بەهەمان شێوە دواوە .. بێخود له بەندی دووەمی کارەکەی کاکە فەتتاحدا له یەکەم دێڕدا نووسراوە : « کە لێ وشە و فرێز لە واتایێك زیاتر دەبەخشن .. » .. له یەکەم دێڕی وتاری « لێل له زمانی کوردیدا »شدا ، ئەو دەربڕینە بە کەمێ دەستکارییەوە وتراوەتەوە .. هتد . ئایا مامۆستا فەتتاح ئەم ماف و هەڵەشی هەر لە دەوری مامۆستاکەی دەگێڕێ .. ؟ گوایا نازانێ ، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتەی مامۆستاکەی و خۆی چ لە زانست و چ لە هەر کارێکی ڕۆژانەی دیدا بێ ، بە چی ناودەبرێ ؟ ..

٢ـ خوانەکردە ، بێتو ئەو هەموو بەراوردەشم بوختان و تۆمەت بێ ، خۆ ئەوە هەر دەمێنێتەوە ، کە نووسەری وتاری « لێل لە زمانی کوردیدا » دەبوو وەك سەرچاوەییك ناوی نامەی ماجستێرەکەی مامۆستا فەتتاحی مامە بەرێ .. بەرهەمەکەی مامۆستا فەتتاح ، کە شەش ساڵێك بەر لە وتارەکەی د . وریا چاپکرابێ و لە ڕووی چۆنێتی و چەندێتیشەوە چەندین جار بەسەر وتاری « لێل لە زمانی کوردیدا »دا بشکێتەوە ، بێگومان مەبەستی ناونەهێنانی ڕوون و ئاشکرایە .. ئەدی کاکی مافخوراو بۆ وا زوو قسەکانی سێ مانگێك لەمەوبەری خۆی لەبیرچووەتەوە ، کە پێی وتم : « .. مەسەلەکان هەر چۆنێك بن ، ئەوە هەر دەمێنێ ، کە دوکتۆر وریا زۆری لە من وەرگرتووە و ناویشی نەبردووم .. » . ببوورن ! من نازانم بە کوردی بەمە چی دەوترێ ؟

لە نامەکەی کاکە فەتتاحدا دوو باسی دی جێی سەرنج و تێڕامانن . نووسیویە :

١ـ « هێرشێکی زۆر ئەکەنە سەر بەرهەمەکانی د . وریا

٢ـ « لە پێناوی دەرخستنی ڕاستی و ڕێزگرتن لە زانست و مەوزوعیەت ئەم ڕوونکردنەوەتان بۆ ئەنێرم .. » .

وا پێدەچێ مامۆستا فەتتاح جیاوازیی نێوان ( ڕەخنە )و ( هێرش ) نەزانێ و سەرەڕای ئەوەش لەو سەرەتایە بێئاگابێ ، کە هەر زانستێك لەسەر بناغەی زانینی مەردووم و بنچینەی

ڕەخنە و تێگەیشتنی هەموو ئەوەی لە زوودا کراون ، دابڕێژرێ پێشڕەوەکەی و گەشەدەکا .. ئەرێ کە بەندە شێوازی نەرم ؛ کەموکوڕتی و ناتەواوی ؛ هەڵە و خەوش : لەملاو ئەولا زانیاری وەرگرتن و کردنە موڵکی خۆ ؛ بە چاوی سووک ڕوانینە کاری پێشڕەوان .. وچەندین نیاردەی دی دزێوی نووسینەکانی ئەو برا خۆشەویستەی خۆی نیشاندابێ ، ئەوە ئەو ڕەخنە زانستییەیە ، کە مایەی پێشخستن و گەشەپێکردنی زمانەکەمانە و هەڵوێستی بوێرێکە ڕاستی و زانستی نەکردبێتە بالاکەڕدانی برادەرەکەی .

بەداخەوە ، ڕاستی و ڕێزگرتن لە زانست و مەوزوعیەت ، لە نامەکەی کاکە فەتتاحدا نە دەنگی هەیە و نە ڕەنگ .. ئەویک بۆ خاتری خاتران هەموو ڕاستییێکی ئاوەژوو وتەفروتوونا کردبێ ، دەبێ نرخ وبەهای ئەو قسانەی چی بێ ، هەرچی خەوش و غەلەوغەشی مامۆستاکەیەتی بە ڕاست دانابێ و سەرباری ئەوەش هیچ شتێکی باش و بەکەڵکی لە نووسینەکەی مندا بەدی نەکردبێ ، ئەوە دیارە نە کەموکەیێک ئینساف و نە پچێک ویژدان لەو نامەیەدا تۆویان نابێ .

لە کۆتاییدا هەر هێندە دەڵێم ، کێ بەوە ڕازی و قایل دەبێ ، کێ بە باش و ڕاستی دەزانێ ، مامۆستا فەتتاح ناوی وتارێکی ساڵیکەی د . وریا بێنێ ، کە لە هەمان ساڵی نووسینی نامەی ماجستێرییەکەیدا بڵاوکراوەتەوە ، کەچی د . وریا پاش شەش ساڵێک لە وتاری « ئاوێ لە زمانی کوردی »دا ناوی ئەو کارە زانستییە تێروتەسەلەی خوێندکارەکەی نەهێنێ .. شوکرانە بژێری دەوێ ، کە نووسەری ئەو نامە شیرینە ، لەمە ئەدواوە ، دەمنا لێرەشدا خۆی بە خەتابار دادەنا و د . وریاش بە ڕاست و زانستپەروەر .

گەلۆ ! تا کەی تەرازوو و کێشی خوار و لاسەنگ .

**ئەوڕەحمانی حاجی مارف**

**١٩٩٨/٧/٣١**

# ڕەخنەی ناپەختە

عەبدولڕەحمانی حاجی مارف

بەرگی دووەم

کەساس جەبیاری

بە چاپی گەیاندووە و بڵاوی کردووەتەوە

سلێمانی - ١٩٩٩

# ڕەخنەی ناڕەختە

ئەوڕەحمانی حاجی مارف

بەرگی دووەم

کەساس جەبباری

بە چاپی گەیاندووە و بڵاوی کردووەتەوە

سلێمانی - ١٩٩٩

# تروسکەی چرایێک

دەمێک بەرگی یەکەمی کتێبی «ڕەخنەی ناپەختە»ی دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارفی براگەورە و مامۆستام بە چاپ گەیاند، لە لایەن دەیان هاوڕێ و هاوکارەوە دەسخۆشی و ئافەرینی زۆر کرام ...ئەمڕۆش بە تاو و تینی تروسکەی چرای ئەو بوێر و جوامێرانە دڵ و دەروونی سەرپاکی خوێنەری کوردی تینووی ڕاستی ڕووزدەکەمەوە ... فەرموون ! ئەوەش بەرگی دووەمی ئەو کارە شاکارە .

کەساس جەبباری

# نوخشه

به هەوڵ و تەقەلای دۆست و ئازیزان ئەڵقەی (یەکەم و پێنجەم)ی زنجیرە وتاری «ڕەخنەی نارەختە» خرانە بەر دیدەی خوێنەران.... ئێستاش وەڵامی وتاری «پاشبەندی /ی/ لە رەخنەی نارەختەدا »و ئەڵقەی دووەمی بەرهەمی ناوبراوم، لە بەرگێکدا پێکەوە دەبەستم و، دەیانخەمە بەرپێسەمەی دەرگای کەوشکەنی پێشخانەی بارەگای دڵسۆزان و خەمخورانی زمانی کوردییەوە .

ئەورەحمان

کاتێ بەشی یەکەمی وتاری «ڕەخنەی نارەختە» گەیشتبووە ئەوەی بڵاوبێتەوە ، مامۆستا وریا ڕایگەیاند «منیش وەڵامم هەیە...»[1] . ئەگەرچی دڵخوازی ئەوە بووم ، ئەو بەرهەمەم زوو بکەوێتە بەر دیدەی خوێنەران، بەڵام ئارەزوو و پەرۆش

(١) ئەڵقەی یەکەمی ئەم بەرهەمەم لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»دا زۆربەی قۆناغەکانی بڕیبوو و تەنانەت خرابووە سەر لاپەڕە و کرابووە مەکێت . واتە هەر هێندەی مابوو چاپ بکرێ ... نازانم بەڕێوەبەری دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بۆ چ نیاز و بەپێی کام بەرنامە و یاسا، داهوویە مامۆستا وریا ... ئەویش دوور لە گشت داب و نەریتێک فۆتۆکۆپی کردبوو و بەپەلە وەڵامێکی نووسیبووەوە و داوای کردبوو لە هەمان ژمارەی ئەو گۆڤارەدا بۆی بڵاوبکەنەوە ... لـــە پاش ئەم کەینوبەین و بێ‌ئوسوولی‌یە، دوو ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤارەکەیان ، دژی وتارەکەم هاندا و لێم کەوتنە بەربیانوو .. بە کورتی ناچاریان‌کردم وەریبگرمەوە ، چونکە هەستم‌کرد گەڕی بارە ترێم پێ‌دەکەن ... ئەوجا هاتمە سەر ، ئەو ڕایەی دوو ئەلقەی (یەکەم و پێنجەم) پێکەوە ببەستم و بیکەمە نامیلکەیێک ... دەستنووسی ئەو نامیلکەیەم دایە سانسۆری چاپەمەنیی کوردی، کە هەر هەمان دەستە و دام و دەزگایە... ئەمجارەیان کۆسپ و تەگەرەی سەیر و سەمەرەتریان هێنایە ڕێی بڵاوکردنەوەی . بەڵێ ، ئەوەیش وا لەژێر بەرەدا بوو ، کەوتە سەر بەرە ... دوای ئەوەی مامۆستا وریا و هاودەنگانی هەرە نیزیکی ، گشت ڕێگەیەکیان لێ‌گرتم، هەر هێندەم لە دەستهات دەستنووسەکەم فۆتۆکۆپی بکەم و لەگەڵ نامەیەکدا بۆ هەندێ دۆستی نیزیکم و بۆ چەند دڵسۆزێکی زمانی کوردی بنێرم ...

بەڵێ دڵنەوایی کردن و پەرۆشی و دڵسۆزیی سەرپاکی دۆستانم هەموو خەم و پەژارەیەکیان ڕەواندەوە ... خۆ دوو برای یەکجار نیزیکم : دوکتۆر عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسووڵ و مامۆستا کەساس جەبباری بە وەفا و ئەمەکی مەردانەی کوردانەیان، بە چەشنێک قەرزداریان کردم، کە هەتا هەتایە شەرمەزاری قاپیی دڵسۆزییان بم و سەری ڕێز و نەوازشتیان بۆ دانەوێنم ...

لە شاری منارە و قەڵا د . عەبدوڵڵا ژمارەیێکی زۆری لە دەستنووسەکەی من فۆتۆکۆپی کردووە و بە بەرگێکی جوان و نامەیێکی ڕازاوەی تایبەتی‌یەوە بۆ کتێبخانەکانی هەرێم و هەندەرانی ناردووە.

لە شاری هەڵمەت و قوربانی‌یش، مامۆستا کەساس جەبباری بە چاپی‌گەیاندووە و بڵاوی‌کردووەتەوە و دیدەی سەرپاکی خوێنەرانی هێژای پێ ڕوونکردووەتەوە .

تینووێتی بڵاوبوونەوەی وەڵامەکەی ئەو دۆستەم فرە زیاتر بوو ...
بە هیوای ئەوە بووم، ئەو ڕەخنانەی من کاریکەنە سەر ئەو برایەم و
بینە هاندەری و بیبزوێنن - واتە ئەمجارە یەکجار خۆی ماندوو
بکا... هێز و وزەی ؛ توان و تاقەتی بخاتە گەڕ ، تا بە
زانیاریی زانستی ئاسوودە و شادمانمان بکا... بەڵکو ناتەواوی و
خەوشی نووسینەکەی منیش بخاتە ڕوو و بەو پێیە بە
هەردووکمان توانیبێتمان خزمەتێکی دڵسۆزانەی زمانە
شیرینەکەمان کردبێ ! .

نەک هەر حەیف و داخ ، کە ئاواتم نەهاتە دی ، بەڵکو هەزار
جار بریا و خۆزگە و کاشکی بە نووسینەکانی پێشووی و بە
هەڵس و کەوت و کار و کردەوەی جارانی ... من بە تەمای چی
بووم و خۆنمایی ئەو چۆن و بە چ چەشنێک دەرکەوت ... ئەوەتە
چێو لە تاریکی دەکوتێ و قسەی گوێ ئاگردانمان بۆ دەگێڕێتەوە.

بەڵێ بۆ مەبەستی وەڵام لە ژمارە (١٤٢)ی گۆڤاری
«ڕۆشنبیری نوێ»دا بە نێوی « پاشبەندی /ی/ لە ڕەخنەی
نارەخنەدا » (ل ١٥-٢٠) وتارێکی بڵاوکردووەتەوە، کە لە گشت
ئالی و لایەنێکەوە بە چەشن و ڕادە و ئەندازەییێک لەکەدار و پڕ
خەوشە ، خوێنەر وڕ و گێژ و ئەبڵەق دەکا .

ڕستەی لەنگ و خواروخێچی کوردی ؛ شێوازی نزمی کۆلکە
خوێندەواران ؛ بێسەلیقەیی و ساکاریی کەرەستە و زانیاری و
هەڵەی گەورە ؛ قسەی ڕووتی بێ بەڵگە ؛ وشەی دژیەیەکی
بێسەروبەر ؛ شێواندنی ڕاستی و بوختانی زۆر و زەبەندە ؛
هەڵەی بێشومار لە ڕێنووس و خاڵبەندی و وەرگرتنی دەقی

وەرگیراودا... بە تەواوی سەرودڵ دەگرن و ئەمەش نیشانەی چرای نابووتی هەڵکردنە .

ئەوەتە هەر لە سەرناوی وتارەکەیدا - «پاشبەندی /ی/ لە رەخنەی نارەخنەدا » چوار خەوشی زەق خوێنەر سەرسام دەکەن :

١- «رەخنەی نارەختە» نە دێوە و نە درنج ، بەڵکو بەرهەمێکی بەندەیە و لە سەرەتادا لە شێوەی وتاردا بووە و دوایی کرواەتە کتێب ... بۆیە دەبوو وشەی (وتار) یان (کتێب) لە پێشیەوە دابنرێ، تا خوێنەر تێبگا (رەخنەی نارەختە) چییە ... بۆ پتر روونکردنەوە، ئەوە دەکەمە نموونە، گەر یەکێک وتارێک دەربارەی چۆنێتیی باسکردنی گۆران لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی»دا بنووسێ و ناوی وتارەکەی بنێ ( گۆران لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا) ، ئایا ئەمە ئەو نیشانە دەپێکێ، کە نووسەر هەیەتی؟ یان خوێنەر لە سەرباسەکەدا لە مەبستی لێدوانەکە تێدەگا ؟ ... نەخێر .. کەواتە لەم باسەشدا راست وایە ، بنووسرێ : (گۆران) لە کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی»دا . راستە «پیاو بە گەورەیی فێری پڵاوخواردن بێ ، دەست بۆ لووتی دەبا» .

٢ - ئەو کتێبەی من ناوی «رەخنەی نارەختە»یە، نەک مامۆستا وریا وتەنی «رەخنەی نارەخنە». لە پەراوێزی لاپەرە (٥)یشدا روونمکردووەتەوە، کە (رەختە) واتای (توند و تۆکمە و ساغ . خۆگرتە و قایم . بێخەوش ..) دەگەیەنێ، کەچی وا دیارە ئەو برایە، نەک هەر هێندە کوردی نەزانە ، دوو وشەی (رەخنە)و (رەختە)ی لەیەک بۆ جیانەکرێتەوە ، بەڵکو لە مانای

نلێکدانەوەکەش تێ‌ئەگا ... وا دیارە ، تەقەی سەری دێ .. بێتو کاکە وریا ئەمە بە هەڵەی چاپ دابنێ ، خۆ دەبوو :

أ - لە چەند شوێنێکی دیدا بەهەمان شێوە دووپات نەبوایەتەوە ، بەتایبەت ئەوەتە لە دێڕی چوارەمی پەراوێزی ژمارە (١)دا هەر (رەخنەی نارەخنە) نووسراوە .

ب - بەتەنگ وتارەکەیەوە بهاتایە و خۆی سەرپەرشتیی چاپی بکردایە[٢] .

٣- دەبوو دەستەواژەی (رەخنەی نارەخنە) بخرێتە نێوان کەوانەی دووتاییەوە - واتە بنووسرایە : «ڕەخنەی نارەخنە» ، چونکە ئەوە سەرناوی بەرهەمەکەی منە[٣] .

---

(٢) وا پێدەچێ ماموستا وریا بەلایەوە گرنگ نەبێ نووسینەکانی لە هەڵەی چاپ بە دوور بن ؛ یان تا ئێستا فێری کاری هەڵەبژێری نەبووبێ .... گەرنا ، ئەوە بۆ لەو ڕووەوە سەرپاکی بڵاوکراوەکانی هێندە شێواو و سەرگەردانن ؟
بێ‌گومان ، دەبوو کاکە وریا کۆششی بکردایە ، کارەکانی لەو چەشنە خەوشە بپارێزێ ... دیارە منیش داوای شتێکی مەحاڵ و زیاد لە بارست و توانستی خۆی لێ‌دەکەم ، چونکە ئەونیک دەستنووسی بەرهەمەکانی پڕ لەو جۆرە هەڵانەبن ، ئیدی کاتێ لە چاپ دەدرێن ، چۆن چاک دەبن .. بەوێنە دە ساڵێک لەمەوبەر وتارێکی‌یان بۆ ناردبووم ، هەڵی‌سەنگێنم ، بەوە زۆر دڵگران بووم ، کە بینیم پیتی (ر)ی ناوی خۆی لەبیرکردووە و نووسیبویە : (ویا) . لە دێڕی یەکەمیشدا سێ خاڵی پیتی (ژ)ی وشەی (ژمارە)ی دانەناوە و بووەتە (رمارە) ... هتد . بە تووڕەیی‌یێکی برایانەوە گلەییم لێ کرد و ئەویش لە بریتی ئەوەی شەرم بیگرێ ، کەچی پێکەنی ... چەند ساڵ لەسەر ئامۆژگاریی خۆم هەر بەردەوام بووم و کۆڵنەدەدا ، بەڵام لەم دواییەدا بەتەواوی بۆم دەرکەوت ، بایە و بە لای گوێیدا دەڕوات و منیش ئاسنی سارد دەکوتم .

(٣) ئەمیش هەر داوایێکی مەحاڵە .. ئەونیک جیاوازیی دەقی وەرگیراو و گێڕانەوەی ئاسایی نەکا و تەنانەت ، کە دەقێکیش وەربگرێ ، نە بیخاتە نێو کەوانەی دووتایی‌یەوە و ، نە وەک خۆی بە ساخ و سەلیمی بیهێڵێتەوە ، ئیتر بە تەمای چی بین . کورد وتەنی : «ئاو بێنە و دەست بشۆ» .

٤- پێویستە لە ژێر (ڕ)ی هەردوو وشەی (ڕەخنە) و (نارەخنە)دا چوکلە دەبێ ، بەڵام لە ژێر هیچ کامێکیاندا دانەنراوە[٤].

وێڕای ئەو هەموو خەوشەی سەرناوی ئەو وتارەی سەرنجڕاکێش ئەوەشە ، وتارەکەی باسی پاشبەندی (ێ)یە ، نەك (ە) ... من لە کتێبی «ڕەخنەی نارەختەیدا گلەییم لە مامۆستا وریا کردووە، کە بە هەندێ کەرەستەی لاپەڕە (٥٦ - ٥٧)ی کتێبی «چەند جەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی» (١٩٧٦)ی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، کە دەربارەی پاشبەندی (ە)یە ، کورتە وتارێکی پێکەوەناوە و بە ناوی «یاسایێکی فۆنۆلۆجی»یەوە بڵاوی کردووەتەوە[٥] ... بۆ نەهێشتنی گومان لەو وتانەم نموومەکانی هەردووکیانم بەرانبەر یەک داناوە و تەنانەت هەندێ

---

(٤) وەنەبێ تەنیا هەر لەژێر (ڕ)ی ئەو دوو وشەیەدا چوکلەی دانەنابێ ، بە لکو ئەم دیاردەیە بە زووریەی ئەو وشانەی (ڕ)یان تێدایە ، بەهەمان چەشن مامەڵەی لەگەڵ کردوون .. ئەوەتە لە (٩٨) وشە ، کە بە (ڕ) دەست پێدەکەن ، تەنیا بۆ سیانیان چوکلەی داناوە و بۆ (٩٥)ەکەی دییان پشتگوێی خستووە . یاخود لەو (٣٣) وشەیەی (ڕ) لە ناوەڕاست یان کۆتاییاندا هەیە ، بۆ (٢٢)یانی دانەناوە و تەنیا (١١)یانی ڕاست نووسیوە .. جا ئەم پاشگەردانییە ، نەک تەنیا هەر لەم وتارەدا ، بەڵکو لە تێکڕای بەرهەمەکانی دی مامۆستا وریای بێناکدا ڕەوش و بنەشەی لە ڕێنووسی کوردی بڕیوە .

(٥) وریا عومەر ئەمین . یاسایێکی فۆنۆلۆجی ، گۆڤاری «ڕۆژی کوردستان» ، ژ ٦٦ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل ٥١ - ٥٢ .

شێوه دەربڕینی مامۆستا مسعوودم گێڕاوەتەوە ، کە کاکە وریا وتونی‌یەوە .. بە دوا ئەمانەشدا ، پەنجەم بۆ چەند هەڵەیێکی زەق ڕاکێشاوە و بە بەڵگە و نموونەی زۆر ڕاستم‌کردوونەتەوە .. (بڕوانە: ل ٥ - ١) .

من وا چاوەڕوان بووم دەربارەی ئەو هەموو لایەنەی پاشبەندی (٥) شتێک بفەرمووێ ، کەچی ئەو پەنای بۆ پاشبەندی (یێ) بردووە . ئەوەی بەندە لەبارەی ئەم پاشبەندەیانەوە وتبێتی، هەر هێندەیە، کە لە لاپەڕە (١٢)دا بە دوو دێڕێک نووسیویە : بۆ (ی)ش لە وتاری «پاشبەندەکان»دا ، کەڵکی لە هەمان کتێبی مامۆستا مسعوود وەرگرتووە .

مامۆستا وریا، کە لە یەکەم دێڕی ئەم وتارەیدا بڵێ : «د.ئاورەحمانی حاجی مارف لە باسێکیدا وای لە قەڵەم ئەدات» (ل١٥ ، س١)، چێتر وایە، سەرەتا لەو برایەم ، کە زۆر شانازی بە زانینی بابەتی جێناو و ڕستەسازییەوە دەکات ، بپرسم : ئەو (ی)یەی لە دوای وشەی (وا)وە نووسیویتی چییە و بۆ داینەوە؟ دانانی ڕاستە یان نا ؟ گەر ڕاستە بەڵگەی چییە؟ گەر هەڵەیە، چۆن ڕێ بە خۆی دەدات باسی ڕێزمـانی جێناوی لکـاو و ڕستەسازی بکا ؟...

کەسێک هەموو کار و ماندووبوونی ڕێزماننووسانی زمانی کوردی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی جێناوە لکاوەکاندا وەلاوە بنێ و چەندین ساڵ بە ئیدیعای ڕێبازی نوێوە لاف و گەزاف لێ‌یدا ، گوایا ئەم خۆی لێزانـــە و زانستیبانە «بەپێی پەیڕەوی گوێزانەوە Transformation Grammar»[٦] ئەو کێشەیەی ساخ‌کردووەتەوە،

(٦) وریا عمر امین، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، بەغدا، ١٩٨٦، ل٦.

کەچی لە هەر هەنگاوێکی بەکارهێنانی جێناوی لکاودا هەڵنووتێ و سەرەنگرێ ببێ ، ئیتر چۆن بڕوا بەو خۆهەڵکێشان و خۆپەسنیدانەی دەکرێ؟

دەمێ ساڵە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی دوو دەستە جێناوی لکاویان لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا دیاری کردووە :

- **دەستەی یەکەم**
  - تاک
    - کەسی یەکەم : م
    - کەسی دووەم : ت
    - کەسی سێیەم : ی
  - کۆ
    - کەسی یەکەم : مان
    - کەسی دووەم : تان
    - کەسی سێیەم : یان

- **دەستەی دووەم**
  - تاک
    - کەسی یەکەم : م
    - کەسی دووەم : ی (یت)
    - کەسی سێیەم : Ø، ا(ات)، ، ێ (ێت)
  - کۆ
    - کەسی یەکەم : ین
    - کەسی دووەم : ن
    - کەسی سێیەم : ن

هەروەها ئەوەیان یادداشتکردووە، کە دەستەی یەکەم لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕدا بەکاردێن و ، دەستەی دووەمیش دەچنە

سەر کرداری ڕابوردووی تێنەپەڕ و ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ[7] .. مامۆستا وریاش لەم ساڵانەی دواییدا یەکدوو خشتە و چەند خەتێکی خواروخێچی بۆ ئەو بیر و بۆچوونەی دەیان ساڵ بەر لە ئێستا کردووە و بەمە کردوویەتی‌یە ماڵ و موڵکی خۆی ... ئەمە لە لایەک ، لە لایێکی دی‌یەوە ، ئەو کە لە یەکەم دێڕی ئەم وتارەیدا بڵێ : « ... وای لە قەڵەم ئەدات»، وا پێدەچێ تەنانەت لەوەش باش تێ‌نەگەیشتبێ، کە لەم‌پۆلەو وەری‌گرتووە ....

لە دەربڕینی « ... وای لەقەڵەم ئەدات»ی مامۆستا وریادا ، ئەوە ڕاستە، کە کردارەکە - (ئەدات) ، جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی دەستەی دووەمی خراوەتە سەر، چونکە تێپەڕێکی ڕانەبوردووە ... بەڵام ئەو (ی)یەی لە دوای (وا)وە دانراوە، نەک هەر زیادە، بەڵکو هەڵەییکی گەورەشە ... ئێمە دەزانین (ی) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی یەکەمە و پێوەندی بە کرداری ڕابوردووی تێپەڕەوە هەیە ... جا لێرەدا چی ئەو جێناوەی هێنا ؟ ... بێ‌گومان کوردی نەزانین ...

گەر کرداری (ئەدات)ی ڕانەبوردوو بکەینە ڕابوردوو ، ئەو دەمە جێناوی (ات) لە کۆتایی کردارەکە هەڵدەگیرێ و جێناوی (ی) دەخرێتە دوای (وا)وە . وەک :

**ڕابوردووی نزیک : وای لەقەڵەم دا Ø**
**ڕابوردووی بەردەوام : وای لەقەڵەم ئەدا Ø**
**ڕابوردووی تەواو : وای لەقەڵەم داوە Ø**
**ڕابوردووی دوور : وای لەقەڵەم دابوو Ø .**

---

(7) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو دەربارەی کاری ئەو زانیانەی لە جێناوی لکاویان کۆڵیوەتەوە، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم - وشەڕۆنان . بەشی دووەم - جێناو . بەغدا . 1987 ، ل 19 - 71.

کەواتە کورد وەک مامۆستا وریا نالێ : «... وای لەقەڵەم ئەدات»، بەڵکو یەژێ : «... وا لەقەڵەم ئەدات »..

وێڕای ئەوە خراپ نییە ، مامۆستا وریا ئەوش بزانێ، گەر لە تاقی ڕانەبوردوودا (ی) لە دوای (وا)وە دابنرێ ، ئەوە (ئەوڕەحمان) دەبێتە بەرکار ، نەک کارا - واتە (یەکێک ئەوڕەحمان وا لەقەڵەم ئەدات) ، نەک (ئەوڕەحمان کەسێک وا لەقەڵەم ئەدات) ... ئەو برایە ، کە نووسیویە : ئەوڕەحمان «... وای لەقەڵەم ئەدات ، کە من ...»، بێگومان ویستوویەتی بڵێ : (ئەوڕەحمان ئەو بە شتێک تاوانبار ئەکات) - واتە (ئەوڕەحمان) ، کە دەبێ (کارا) بێ ، بووە بە (بەرکار) ..

بۆ زیندە ڕوونکردنەوە با بڕوانینە ئەو چەند نموونەیەی خوارەوە :




ئەو ئێمە وا لەقەڵەم ئەدات
کارا
بەرکار
کارا
Ø
مان
وا - مان لەقەڵەم ئەد - ات
بەرکار
کارا


ئەو ئێوە وا لەقەڵەم ئەدات
کارا
بەرکار
کارا
Ø
تان
وا - تان لەقەڵەم ئەد - ات
بەرکار
کارا


ئەو ئەوان وا لەقەڵەم ئەدات
کارا
بەرکار
کارا
Ø
یان
وا - یان لەقەڵەم ئەد - ات
بەرکار
کارا

بۆ درێژەپێنەدان ، ڕەخنەکانی دی سەر بە سێ دێڕی بەندی یەکەمی وتاری ناوبراو هەڵدەبوێرین و دێینە نێو باسی ئەوەی لە بەندی دووەمدا وتوویە : «وەک دەرئەکەوێ د.ئاورەحمان لەگەڵ ڕێزم بۆی لە سروشت و ئەنجامی باسەکانی مامۆستا مسعود محمد و هی من نەگەیشتووە» (ل١٥، س١) .

بەندە هێندە ئاگادار و بەئاگابێ لە یەکەم خوێندنەوەی وتاری «یاساینکی فۆنۆلۆجی»دا هەست و دەرکی بەوە کردبێ ، کە سەرچاوەی ئەو کورتە باسەی کاکە وریا ، کەرەستەی لاپەڕە (٥٦ - ٥٧)ی کتێبی «چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی»ی مامۆستا مەسعوود محەممەد بێ و پاشانیش بۆچوون و نموونەکانی هەردووکیانی بەرانبەر یەکدی ڕاگرتبێ و بەراوردی کردبن و سەرباری ئەوەش کاکی خاوەنی ئەو وتانە ، خۆی لە کۆتایی ئەم وتارەیدا بفەرمووێ : «ئەوەی مایەی دڵخۆشی‌یە ئەوەیە د.ئاورەحمان دوای ئەمە هەموو دان بەوەدا ئەنێ کە باسەکەی من و مامۆستا مسعود دوو بابەتی جیاوازن» (ل١٩ ، س٢) ، ئیتر خوێنەری وشیار و زرنگی کورد چۆن بەو قسە و قسەلۆکانەی مامۆستا وریا ناخەنن ؟

گەر ئەورەحمان لە سروشت و ئەنجامی باسەکەی ئەو و ئەوی مامۆستا مەسعوود نەگەیشتبێ ، کەواتە :

١ - ئەو بەرانبەر یەکدی ڕاگرتنەی کەرەستەی بەرهەمی هەردووکیان و بەراوردکردنیانی لەسەر چ بنەما و زەمینەیێک کردووە و چۆن ئەو بانگی هەقەی داوە ؟

٢ - قسە ناڕاستەکەی مامۆستا وریا ، کە گوایا ئەورەحمان دانی بەوەدا ناوە ، ئەو دوو باسە ، دوو بابەتی جیاوازن و ئەمە مایەی دڵخۆشی‌یە ، لە لایەکەوە دەبێتە پاڵپشتی ئەوەی بەندە لە سروشت و بابەتی ئەو دوو نووسینە گەیشتوود و ، لە لایێکی

دی‌یەوە وتەی دژبەیەک و بێسەروبەری مامۆستا وریا ڕەتدەکاتەوە.

هەزار پێچ و پەناکردن پاساوی ئەو وەرگرتن و ناونەبردنە نادەنەوە ... کاکە وریا «تیر دەخا و کەوان دەشارێتەوە» ..

لە بەندی سێیەمدا بە کوردییە سپەهی و خۆشیکەکەی قەول و بەڵێنمان دەداتێ و دەڵێ : «بە زنجیرەیێک وتار یەکە یەکە موناقەشەیەکی زانستی هەموو ئەو رەخنانەی د. ئاورەحمان ئەکەم بۆ دەرخستنی ڕاستی کە لای ئاگاداران ئاشکرایە» (ل ١٥ ، س ١) .

گەرچی بێگومانم ، کاکە وریا ئەو کەسە نییە بتوانێ و پێی‌بکرێ (زنجیرەیێک وتار) بنووسێ و ، یان لە هێز و وزەیدا بێ (موناقەشەیەکی زانستی) بکات ..ئەوەتە «دیزە وتی من بنم زێڕینە، ئەسکوێش وتی ئەی من لە کوێ بووم» .. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، هەشتەنۆ مانگێک ئەم وەڵامەم ڕادەگرم ، تا ڕاستیی ئەم وتانەم بەتەواوی دەرکەوێ .

بۆیە دەڵێم مامۆستا وریا پیاوی ئەو بارە گرانە نییە ، چونکە هەموو دەزانین ، ناوەرۆک و کرۆکی ئەوەی لە ماوەی بیست ساڵێکدا دەربارەی زمانی کوردی بڵاوی‌کردووەتەوە ، چەند بابەتێکی کەمی نێو بازنەییکی تەسکن ، کە ئەویش بە زۆری لەم و لەوی وەرگرتوون و ئەوجاش چەندین جار کاوێژیان دەکاتەوە و دەیانجوێتەوە .. باشترین بەڵگەش بۆ ئەم وتانەم ، کەرەستەی ئەم وەڵامەیەتی ، کە هەر بەندێکی چوار جار و ، پێنج جار بڵاوی کردووەتەوە - واتە «کۆنە دەرفرۆشێ بە نرخی تازە» .

فەرموون ! ئەوە فۆتۆکۆپیی هەندێ خشتە و نەخشە و هێڵکاریی ئەم وتارەی و نووسینەکانی دیی :

ئەوەی خوارەوە فۆتۆکۆپیی یەکەم خشتەی ئەم وتارەی - «پاشبەندی /ی/ لە رەخنەی نارەخنە»دایە ، کە جێناوە لکاوەکانی تێدا ڕوونکردووەتەوە :

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو ١ | لکاو ٢ |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | [illegible] |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

بەپێی ئەو چاپەمەنییانەی ئێستاکە لەبەر دەستمدان ، ئەو خشتەیە (٤) جاری دیش ، لەو نووسینانەی خوارەوەدا بڵاوکراوەتەوە :

١ - وتاری «راناو له کرمانجیی خواروودا»، ڕۆژنامەی «هاوکاری»، ژ ٦١٦ ، ل٦ ، بغدا ، ١٩٨١/١٢/١٧.

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | — | ێت/ات |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

٢ - وتاری «ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، گۆڤاری «کاروان» ، هەولێر ، ١٩٨٣، ل٦٨ .

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

٣ - نامیلکەی «رێزمانی راناوی لکاو» ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل٨

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | - | ات/ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

٤- وتاری «ڕێزمانی ڕاناو - هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی»، گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»، ژ ١١٥ ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ١٩٣.

| ژمارە | کەس | جودا | لکاو A | لکاو B |
|---|---|---|---|---|
| تاک | ١ | من | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ات / ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن |

.... هتد[٨].

بەڵێ «هەموو شتێک بە خوێ ، خوێنیش بە مەعنا».

(٨) دەربارەی چۆنێتی جیاوازیی دابەشکردنی جێناوە لکاوەکانی ئەو خشتانە و کەموکورتی و هەڵەی دیاریکردنی جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەم و یادداشت نەکردن و لەبیرکردنی هەندێ حاڵەتی ، بڕوانە لاپەڕە (٦٧-٧٢)ی ئەم کتێبە .

نووسەر بە دوا ئەو خشتەیەی بۆ ڕوونکردنەوەی جێناوە لکاوەکان خستوویەتە بەر چاو ، نەخشەیێکی دەرکەوتنی ئەو جێناوە لکاوانەی لە هەردوو دەوری کارایی و بەرکاریدا لە دوو کاتی دژبەیەکدا کێشاوە .. ئەو وێنەیەش بەهەمان چشن ، چەند جارێک بلاوی کردووەتەوە....

فەرموون ! ئەوە لە هەندیٚ نووسینیەوە بۆتان فۆتۆکۆپی دەکەم :

١ - لە وتاری «پاشبەندی / ی/ لە ڕەخنەی نارەخنەدا»وە[٩].




(ل١٥ ، س٢)

(٩) بڕوانە : گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ ١٤٢ ، بەغدا ، ١٩٩٨ .

## ٢ - لە نامیلکەی «ڕێزمانی ڕاناوی لکاو» ەوە[١٠]




(ل ١٥)

## ٣ - لە وتاری «ڕێزمانی ڕاناوی لکاو»ەوە[١١]




(ل.٧، س٢)

.... هتد .

---

(١٠) بڕوانە : پەراوێزی ژ ٦.

(١١) بڕوانە : گۆڤاری «کاروان» ، ژ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٣

گشت نەخشە و خشتە و وێنەکانی دیی وەڵامەکەی مامۆستا وریا بە هەمان چەشنی ئەو دووانەی سەرەوەن ، کە نیشانم دان . جا بە پێویستی نازانـــم چەندین لاپەڕەی دیکە بەو بە یەک‌گرتنە پڕبکەمەوە و کورد وتەنیش : «مشتێک نموونەی خەروارێکە».

شتێکی دی کە پێوەندی بە وێنەکانی وتاری «پاشبەندی /ی/ لە رەخنەی نارەخنەدا »وە هەبێ و خوێنەر یەکجارەکی لە عیلمەکەی کاکە وریا بڕەنجێنێ، ئەو چەند هێڵکارییەن ، کە لە گوێزانەوەیاندا لە نووسینەکانی پێشووتریەوە بۆ ئەم وتارەی ، هەڵەی گەورەی کردووە.

بۆ نموونە با سەرنج لەو هێڵکارییەی خوارەوە بدەین ، کە لە ستوونی دووەمی لاپەڕە (١٦)ی وەڵامەکەیدا کێشاویە :




لەو وێنەیەی سەرەوەدا ، رستەی «ئێمە ئەو بۆ تۆ ئەنێرین»، کە کاکە وریا بۆ گۆڕینی جێناوی جودای بەرکاری ناڕاستەوخۆ بە لکاو کێشاویە، دەبوو ببی بە (ئێمە بۆ - ت - ی ئەنێرین)، نەک ئەو

وتەنی : : «ئێمە بۆ ئەو-ت ئەنێرین». گەر ئەمەی ئەو بە جێناوی
جودا دەربڕین ، دەبێ بڵێین : (ئێمە تۆ بۆ ئەو ئەنێرین).

بەڵێ ئەوهاوڕێیەم تا ئەو ڕادەیەش سافیلکە نییە ، جیاوازیی
نێوان دوو ڕستەی (ئێمە ئەو بۆ تۆ ئەنێرین)و (ئێمە تۆ بۆ ئەو
ئەنێرین) ئەزانێ ، بەڵام لەز و پەلەی وەڵامدانەوە ئاوەز و سەلیقەی
وا لێبڕیوە ، تەنانەت نەخشەیێکی ڕاستی چەند ساڵ لەمەوبەری
خۆی بشێوێنێ ...

ئەوەتە ، هەمان ڕستە - واتە : (ئێمە ئەو بۆ تۆ ئەنێرین) ، لە
لاپەڕە (٢١)ی نامیلکەی «ڕێزمانی ڕاناوی لکاو»دا ڕاست گۆڕیوە
بە «ئێمە بۆ -ت-ی ئەنێرین».

ئەوەش وێنەی ئەو نەخشەیەی :




ئێمە بۆ ـ ت ـ ی ئەنێرین .

ئەو کەرەستانەش ، کە کەوتوونەتە جغزی هێلکاری‌یەکانی ئەم وتارەوە ، هێندە کز و ناتەواو و نەدارن ، لە زانین و زانیاریی زمانەوان و کوردزمان ناچن ...

بەوێنە لەم نەخشەیەی سێیەمدا :



نیشانی داوه :

١ - له هەردوو کاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردوودا جیناوه لکاوەکانی دەستەی یەکەم پێش ئەوانی دەستەی دووەم دەکەون .

٢ - له ڕانەبوردوودا ئەوانی پێشەوه دەبنه (بەرکار)و ئەوانی دواوه (کارا) . له ڕابوردوودا بەپێچەوانەوه ، جیناوه لکاوەکانی سەرەتا دەوری (کارا) دەبینن و ئەوانی کۆتایی دەبنه (بەرکار).

ئەوەی مامۆستا وریا بۆ هاتنی جیناوه لکاوەکان لەگەڵ کرداری ڕانەبوردوودا وتوویە، تەواوە. بەڵام دەمێ لەتەک کرداری ڕابوردوودا باسیان دەکا ، ساکاری و بێئاگایی دەبینرێ :

ئەوەته خۆنواندنی جیناوه لکاوەکانی تەنیا له ڕابوردووی بەردەوامدا باسکردووه . ئەمه وا دەگەیەنێ لەوە بێ خەبەر بێ ، که له زمانی کوردیدا (ڕابوردووی نزیک)و (ڕابوردووی تەواو)و (ڕابوردووی دوور)یش هەبن و نەزانێ جیناوه لکاوەکان به چەشنێکی دی لەگەڵیاندا دێن .

ئەگەرچی له ڕابوردووی بەردەوامدا جیناوه لکاوەکان تەنیا له یەک حاڵەتدا دەردەکەون ، که ئەویش بریتییه له هاتنی جیناوێکی دەستەی یەکەم له سەرەتاوه له دەوری کارادا و له کۆتاییەوە جیناوێکی دەستەی دووەم له ڕۆڵی بەرکاردا . بەڵام ئەم یاسایە بەتەواوی لەگەڵ جۆرەکانی ڕابوردووی نزیک و تەواو و دوور ناگونجێ.

هەرچی یاساکانی دەرکەوتن و دەوربینینی جیناوه لکاوەکانە لەگەڵ ئەو سێ چەشنه ڕابوردووەدا ، بەم جۆرەی خوارەوەیه :

١ - هاتنی دوو جیناوی دەستەی یەکەم بەسەریەکەوه . وەک:

* ڕابوردووی نزیک :

نارد - مان - یان = ئەوان ئێمەیان نارد .

* ڕابوردووی تەواو :

نارد - وو - مان - یان = ئەوان ئێمەیان ناردووە .

* ڕابوردووی دوور

نارد - بوو - مان - یان = ئەوان ئێمەیان ناردبوو

لەم حاڵەتەدا جێناوی یەکەم هەمیشە بەرکارە و جێناوی دووەمیش هەردەم کارایە .

٢ - هاتنی جێناوێکی دەستەی یەکەم لەگەڵ جیاوێکی دەستەی دووەم.

لەم حاڵەتەدا جێناوەکەی دەستەی یەکەم چ لە پێش ئەوەی دەستەی دووەمەوە بێت و ، چ لە پشتیەوە ، هەر وەک کارا خۆی دەنوێنێ . جێناوەکەی دەستەی دووەمیش چ لە پێش ئەوی دەستەی یەکەمەوە دەرکەوێ و ، چ لە پشتیەوە ، هەر وەک بەرکار دەور دەبینێ . بەغوونە :

أ - کاتێ جێناوی دەستەی یەکەم لە پێشەوە دێ و ئەوی دەستەی دووەم بە دوایدا :

* ڕابوردووی نزیک :

نارد - تان - ین = ئێوە ئێمەتان نارد .

نارد - مان - ن = ئێمە ئێوە (ئەوان)مان نارد .

* ڕابوردووی تەواو :

نارد - وو - تان - ین - ە = ئێوە ئێمەتان ناردووە .

نارد - وو - مان - ن - ە = ئێمە ئێوە (ئەوان)مان ناردووە.

* ڕابوردووی دوور :

نارد - بوو - تان - ین : ئێوە ئێمەتان ناردبوو .

نارد - بوو - مان - ن = ئێمە (ئەوان)مان ناردبوو .

ب - دەمیٚ جێناوی دەستەی دووەم لە پێشەوە دەردەکەویٚ و جێناوی دەستەی یەکەم بە دوایدا دیٚ :

* ڕابوردووی نزیک :

نارد - ین - یان = ئەوان ئێمەیان نارد .

نارد - ین - ت = تۆ ئێمەت نارد.

* ڕابوردووی تەواو :

نارد - وو - ین - یان - ە = ئەوان ئێمەیان ناردووە .

نارد - وو - ن - یان - ە = ئەوان ئێوەیان ناردووە .

* ڕابوردووی دوور :

نارد - بوو - ین - یان = ئەوان ئێمەیان ناردبوو .

نارد - بوو - ن - یان = ئەوان ئێوەیان ناردبوو

... هتد .

کاکە وریا دەبوو لە زمانی کوردییەوە ، ئەو جۆرە تایبەتێتی‌یانەی جێناوە لکاوەکان هەڵهێنجیٚ ، نەک ئەو چەند بارە ساکارە ناتەواوە و ئەویش هەر دەمە نادەمێک لە نزۆەنەوە ئەو قەوانە سواوە پەڕپووتەمان بۆ لیٚ‌بداتەوە .

وێڕای هەموو ئەوە،ئەم نەخشەیەی سێیەم باسێکی لاوەکیش دێنێتە گۆڕیٚ ،ئەویش هێنانە ئارای هەندیٚ زاراوەی ناتەواو و چەوت و چەوێڵن ، کە بەڕاستی ناشارەزایی و نابەڵەدیی باوکی ئیڤان نیشاندەدەن ...

بەوێنە ، هەر لە سەرەتای دابەشکردنی (کات)ەوە لەو نەخشەیەدا، زاراوەی (داهاتوو)ی بۆ (ڕانەبوردوو) داناوە . گەر لە هەڵەی بەکارهێنانی وشەی (داهاتوو) بەرانبەر (مستقبل)یش

بگەڕێین ، بەڵام چۆن دەشێ لەوە بێدەنگ بین ، بکرێتە زاراوە بۆ هەردوو کاتی ئێستا (مضارع)و ئایندە (مستقبل) ؟..

لە کۆتایی هەمان نەخشەدا ، کە نووسیویە «دەستەی (٢) هەمیشە بە ڕەگی کارەوە دەلکێ» (ل١٦ ، س١)، تۆ بڵێی لە گەردانکردنی نموونەکەی خۆیدا ، واتە - (ناردن)دا ، ئەوەی نەبینیبێ، (نێر) بنەمای کاتی ڕانەبوردووە و ، هی کاتی ڕابوردووش (نارد)ە... زمانەوانانی کورد ، کە زاراوەی (ڕەگ)یان بۆ کەرەستەی کاتی ڕانەبوردوو و (قەد)یش بۆ کەرەستەی کاتی ڕابوردوو پەسەندکردووە، هۆی جیاوازیی ئەو دوو بنەمایەیە. بێتو کاکە وریا دەرکی بەو جیاوازییە نەکردبێ ، یان بەو زاراوانە قایل نەبوویێ ، خۆ دەبوو پێمان بڵێ بە ڕەگی کامیانەوە دەلکێ - واتە بە هی ڕانەبوردووەوە ، یان ڕابوردووەوە...

لە سەرێکی دیەوە ساکارییەکەی هێندە زەقە ، ئەوە نەزانێ ، لە هەندێ حاڵەتدا جێناوە لکاوەکانی دەستەی دووەم بە «ڕەگی کارەوە» نالکێن . بۆ نموونە .

أ - نارد - تان - ین

نارد - - یان - یت

.......

ب - دە - نووس - ر - ێ - ین

دە - نووس - ر - ا - یت

.......

ئەوەتە جێناوەکانی (ین ، یت ...)ی دەستەی دووەم بە «ڕەگی

کارەوە» نەلکاون . نە خالی (أ)دا بە دوا (تان ، یان)ی دەستەی یەکەمدا هاتوون و نە خالی (ب)دا لە کۆتایی (ر-ی ، ر- ا)ی کارا بزری‌یەوە دەرکەوتوون .

بێ‌ئاگایی لەم دیاردە بەرچاوە جێی سەرسوڕمانە .

لە چەند بەندێکی دی وتاری ناوبراودا ، زاراوەی ئەوتۆ بەرچاو دەکەون ، کە یەکجارەکی ئاواز و ئاوەزی کوردایەتی دەشێوێنن .. بە نموونە، لە سەرەتای پەراوێزی ژمارە (١٠)دا بۆ -Pronominali zation - (بەجێناوکردن) ، زاراوەی (راناواندن)ی داڕشتووە[١٢]

... وێڕای ئەوەی، کە زمانەوانانی کورد (بەتایبەت د. نەسرین محەممەد فەخری و مامۆستا مستەفا زەنگەنە ..) گەلێ ڕووی پاشگری (-اندن)یان ساخکردووەتەوە ، ئەمڕۆ تەنانەت کۆلکەخوێندەواری کوردیش دەزانێ، وشەکانی وەک : (ژن، پیاو ، دەرگا، پەنجەرە ، ئاسمان ، شەقام ... ناو ، ڕاناو ... ) بە تۆبزیش ئەو پاشگرە وەرناگرن .. ئێدی کاکە وریا گاڵتە بە زمانی زگماکی دەکا ، یان کورد وتەنی : «لە بێ‌خەبەران کەشکەک سڵاوات»؟! ..

... و گەلێکی دی ..

* * *

بەندە ، کە لە پەراوێزی ژمارە (٤)ی بەرهەمی «وتاری کارپۆلێن‌کردن بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێک »دا نووسیویتی :

---

(١٢) زاراوەی (ڕاناو) خۆی بارە بەسەر زمانی کوردییەوە ، کەچی کاکە وریا پاشگری (-اندن)یشی خستووەتە سەر .. ئەمە ئەو پەندە دێنێتەوە یاد ، کە دەڵێ : «ڕێوی خۆی نەدەچوو بە کونەوە ، هەژگێکیشی بەستبوو بە کونەوە».

باسەکەی د. وریا پێوەندی بەوەی مامۆستا تۆفیق وەهبی‌یەوە هەیە ، کە لە بەندی (٤٧)ی لاپەڕە (١٠٠)ی کتێبی «دەستووری زمانی کوردی» (١٩٢٩)دا لێی‌دواوە و ئەوجا لە کتێبی «ڕەخنەی نارەختە»دا ئەوە نەبینری، کە بۆ خوێنی چێشتیش لە هیچ شوێنێکدا مامۆستا مسعوود محەممەدی بە یەکەم توێژەری پاشبەندی (یٚ) دانابێ ، ئیتر کاکە وریا چۆن وا زوو ئەو بوختانەی هۆنی‌یەوە و ڕێی بە خۆی دا لە بەندی چوارەمدا بڵێ : «بە لای د. ئاورەحمانەوە مامۆستا مسعود یەکەم کەسە باسی ئەم پاشبەندەی کردووە ..» (ل ٨٥، س١) .

یاخود ، کە مامۆستا وەهبیی خۆمان (٢٦) ساڵ بەر لە (ئەدمۆنس)و (٣٢) ساڵ پێش (مەکەنزی) لەو دیاردەیە دوابێ، ئیتر بە چ گەز و پێوانەیێک ؛ بە کام یاسا و ڕێبازێکی نوێ لە سەرەتای بەندی پێنجەمدا دەڵێ : «یەکەم کەس باسی ئەم پێشبەندەی کردبێ (ئەدمۆنس)ەو لە سالی ١٩٥٥دا .. دوای ئەم لە ساڵی ١٩٦١دا د. مەکەنزی باسی ئەم پێشبەندە ئەکات» (ل ١٦، س١) .. کورد ڕاستی وتووە : «کون بە سەهۆڵ بگیرێ هەر دەکرێتەوە»...

وێڕای شێواندی ئەو ڕاستی‌یە ، سەرنج بۆ دوو خەوشی ئەو بەندە کورتە ڕادکێشم :

١ - باس ، باسی پاشبەندی (یٚ)یە ، کەچی لێرەدا، بووە بە (پێشبەند)... ئەم جۆرە پاشاگەردانی و بەربادی‌یە بە زۆربەی بەرهەمەکانی‌یەوە دیارە .. ئەلحق «تەرەتۆنەکەی ناگاتێ»...

٢ - لاپەڕەکانی باسەکەی د . مەکەنزی یادداشت نەکردووە ، چونکە ئەو خۆی ماندوو ناکا و هەمیشە کاری هەر ڕەمڵ‌لێدانە ...

«نیرە بیدۆشە»کەیە ..

کاکە وریا دوای خستنە ڕووی ئەو کۆمەڵە خشتە و نەخشەیەی لە نووسینەکانی زوویەوە وەری‌گرتوون (کە بەشێکیانی بە هەڵە گوێزاوەتەوە و هەندێکیان پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بەم بابەتەی ئێستایەوە نییە و ...) هاتووەتە سەر ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکەی مامۆستا مەسعوود و بەراوردکردنی لەگەڵ کارەکەی خۆی و دەڵێ : ئەو بۆچوونەی مامۆستا مەسعوود «دوورە لە ڕاستی» (ل ١٧، س١) ، کە وا ڕادەگەیەنی (لە حاڵی بزربوونی (مفعول) بزوێنەکە دەبێتە (یٚ) »[١٣] (ل١٧ ، س٢) . ئەوجا بۆ پتەوکردنی ئەو وتەیەی دوو هۆی نابەجێیٚ یادداشت کردووە :

لە یەکەمیاندا بێ‌ئەوەی تاکە بەڵگەیێکی مێژوویی ، یان مەنتیقی هێنابێتەوە ، نووسیویە:«بزوێنەکە نی‌یە ئەبێتە (یٚ) بەڵکو پێشبەندە .. ئەبێتە (یٚ)» (ل١٧، س٢)، بەڵام مامۆستا مەسعوود ، کە بەپێچەوانەوە وای ڕاگەیاندووە (یٚ) دەبێتە پێشبەند ، لە نالی و حاجی قادری کۆیی و فۆلکلۆرەوە نموونەی هێناوەتەوە .. بێ‌گومان زۆر بەکارهێنانی ئەو (یٚ)یە لە ناوچە جیاجیاکانی ئەمڕۆی کوردستان و زووی سلێمانیدا ، پتر دەبێتە پاڵپشتی بۆچوونەکەی مامۆستا مەسعوود، نەک خەملێندانە بێ پشت و پەناکەی کاکە وریا .

---

(١٣) کاکە وریا لە تەواوی ئەم دەقەدا - «لەوەدا کەوا حاڵی بزربوونی (مفعول) بزوێنەکە دەبێتە (یٚ) »، کە لە مامۆستا مەسعوودی وەرگرتووە ، (کەوا)ی پەڕاندووە و کەوانەکانی (مفعول)یشی دانەناوە ، واتە نووسیویە : «لەوەدا لە حاڵی بزر بوونی مفعول بزوێنەکە دەبێتە (یٚ)».

له دووەم هۆشدا ، که دەڵێ : «بزربوونی مفعول نی‌یه ئەیکات به (یٚ) بەڵکو گۆڕینیەتی به لکاو» (ل ١٧، س٢)، ئەوەی شاردووەتەوە، که مامۆستا مەسعوود لەو بارەیەوە له دێڕی (٧)ی لاپەڕە (٥٦)ی کتێبی «چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی»دا نووسیویه : «ئەمەش یەکێکه له خاسیەتەکانی راناوی لکاو که له شتی تری جودا دەکەنەوە ..» .. کەواته هەردوو باس یەک بابەتن - واته هەوڵی مامۆستا مەسعوود بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنێتیی دەربڕینی (کارا)و (بەرکار) به جێناوی لکاو ،بووەته هەوێن و بیر و کەرەستەی لێدوانەکەی کاکه وریا . خۆزگه ئەم عەزیزەم لەو ڕێگه چەوته دوور دەکەوتەوە و دەهاته سەر ئەو ڕاسته شەقامەی برایانی دی پێیدا دەڕۆن .. ئەوەته مامۆستا مەسعوود بەو هەموو زانین و گەورەیی‌یەی خۆیەوە ، هەر لەبەر ئەوەی مامۆستا تۆفیق وەهبی کەمێک لەو کێشەیه دواوە ، بەوپەڕی لەخۆبوردوویی‌یەوە ، ئەوە ڕوون دەکاتەوە ، دەشێ مافی ئەوە به خۆی بدات ، وشەی «حەشارگه» بکاته سەرناوی ئەو باسەی یان نا؟ .. ئەوته دەڵێ : «بەپێی ئەوەی که جارێکیان خۆم لەبارەی ئەو فعلانه شتێکم نووسیبێت و مامۆستا تۆفیق وەهبیش بەر له من باسی کردبێتن هەر دەڵێی مافی ئەوەم نەمابێ ناوی (حەشارگه) بکەمه عنوانی ئەو جۆره فعلانه»(ل٥٣) ... بەڵێ مرۆی زانا و دانا ؛ دەسپاک و سەرڕاست بەو جۆره هەڵس‌وکەوت دەکات ..

سەرەرای یەکگرتنەوەی ئەو دوو لایەنەی باسەکانی هەردووکیان (که کاکه وریا به جیاوازی له قەڵەم داون) ، هەندێ بابەتی دی وێکچوون له نێوانیاندا دەبینرێ . بەوێنه :

١ - ئەو کردارانەی له هەردوو بەرهەمدا کراونەته نموونه وەک یەکن، که (دان ، گەیشتن، گرتن ...)ن.

٢ - هەندێ شێوە دەربڕینی زاری مامۆستا مسعوود لە وتارەکەی کاکە وریادا بەئاشکرا دبینرێ.

ئەوەیە ڕاستی و دروستیی مسئلەکە ، بەڵام نووسەری وتاری «پاشبەندی /ێ/ لە رەخنەی نارەخنەدا » وا دەزانێ بە بیانو و بەهانەی پڕوپووچ دەتوانێ خوێنەر بخەڵەتێنێ .. واش تێگەیشتووە ، گەر بە دوا ئەوەدا چەند قسەیێکی زل بکا، ئیتر بە تەواوی لەو تەنگژەیە ڕزگاری دەبێ، ئەوەتە بۆ ئەو مەبستە لە کۆتاییدا نووسیویە : «بەداخەوە ئەڵێم د. ئاورەحمان لەم بۆچوون و بڕیارەیدا نەختێ پەلەی کردووە و بۆچوونەکەی مامۆستا مسعود محمدی بە ڕاستییەکی مطلق لەقەڵەمداوە و بڕیاری ئەوەی داوە من لەوم وەرگرتووە .. ئەمە دژی هەموو جۆرە پێرەونکی زانستییە» (ل١٨-١٩).

ئەگەرچی وەڵامی ئەو وتانە ئاو زۆر دەکێشێ، بەڵام بە کورتی بە چەند خاڵێک لێیان دەدوێم :

١ - گەر ئەو قووڵبوونەوە و لێکدانەوە و بەدواکەوتن و پشوودرێژییەی بەندە پەلەکردن بێ و ساکاری و بێ‌ڕباکی و هەڵە و خەوشی زۆر و خۆڕانەگریی ئەویش هێمنی و هێوری بێ ، ئەوە ئاسمان ئەستوونی دەوێ.

٢ - کە وتوویە : «بۆچوونەکەی ماموستا مسعود محمدی بە ڕاستییەکی مطلق لەقەڵەمداوە»، پەنجەی بۆ هیچ لاپەڕەیێکی نووسینەکەی من ڕانەکێشاوە ، چونکە ڕاست ناکا و لە بەرهەمەکەی مندا شتی وا نەوتراوە.

٣- تاکە شتێک کە ڕاست بێ ، ئەم وتەیەتی : « بڕیاری ئەوەی داوە من لەوم وەرگرتووە » ... بەڵێ ئەم بڕیارەم لە خۆڕایی نەداوە ،

بەڵکو لەسەر بناخە و بنەمای پتەوی بەراورد و بەیەکگرتن دامەزراندووە .

٤- دیارە لای کاکە وریا کاری ناڕەوا ( هاودەنگی پێڕەوی زانستی )یە و ، هەرچی کاری ڕەواشە « دژی هەموو پێڕەوێکی زانستی‌یە » ...

☆ ☆ ☆

مامۆستا وریا وا ڕادەگەیەنێ ، لەبەر ئەوەی « دەست نیشان کردنی یاساکانی پاشیەندی (ی) لە زمانی کوردیدا بابەتێکی ئاڵۆزی سەر بە سینتاکسە » (ل١٩ ، س٢) ، نەدەبوو ئەوڕەحمان «خۆی لەم گێژاوە » بدا (ل١٩ ، س٢) ، چونکە « ئەوە چەن ساڵە ( وەک سەرۆکی بەشی کوردی » (ل١٩، س٢) داوای لێ « ئەکەم دەرسی سینتاکس بە قوتابیانی ماجستێر و دکتورا بڵێتەوە ... داوای لێبووردن ئەکات و ئەڵێ لێی نازانم و سەرم لێی دەرناچێ » (ل١٩ ، س٢) .

ئەوێک بە ڕۆژی ڕووناک کەرستە لە بەرهەمی زمانەوانانی کورد و نامەی ماجستێر و دوکتۆریی خوێندکارانی کوردەوە وەربگرێ و بیکا بە ماڵ و موڵکی خۆی و بە بیانو و بەهانەی هەرزان بەها هەوڵی شاردنەوەی بدا ... یاخود کە دەقی بڵاوکراوە وەردەگرێ ، بۆ وەدیهێنانی مەبەستی ناڕەوا و نابەجێی بیشێوێنێ و تێکوپێکی

بدا... ئیدی دەمێ وتووێژ و دەمەتەقێیەک بگێڕێتەوە ، دەبێ چی بەسەر بێنێ و بەرانبەرەکەشی تووشی چ دەردی سەری و گرفتارییەک بکا ، بەتایبەت چونکە خۆ ئەمیان ماست نییە بە لێوییەوە دیار بێ .

بەڵێ من بۆ نەوتنەوەی بابەتی ڕستەسازی داوای لێبووردنم کردووە و بە گاڵتەشەوە وتوومە «باشی لێ نازانم» ، کەچی بەداخەوە مامۆستا وریا ئەمەشی کردووە بە «لێی نازانم و سەرم لێی دەرناچێ».. جا نەک هەر خۆی بەڵکو گێل و گەمژەش تێ دەگەن ، ئەو وەڵامە گاڵتە و شۆخییەی بەندە تەنیا بۆ ئەوە بووە، پتر بابەت و دەرزی لەبەردڵانی خۆی بڵێتەوە .

گەر بەندە بابەتی ڕستەسازییش باش نەزانێ ، هیچ گلەییەکی نایەتە سەر ، چونکە ئەو دەرزەی نەوتووەتەوە ... بەڵام کاکە وریا ، کە لە هەر نووسینێکیدا چەندین ڕستەی گێڕ و خواروخێچی دوور بە ئاوەز و ئاهەنگی کوردی ، وەک چقڵ لە چاو دەچەقن ، چۆن ڕووی دێ توخن و نیزیکی ئەو کێشەیە بکەوێ ... ئەو برایەم وەنەبێ هەر لەم بوارەدا وا کوڵەوار و کز و سڤک بێ ، بەڵکو لە دەوار و دەرەتانی بابەتەکانی دیی زمانی کوردیشدا بەهەمان چەشنە و کەچی بە ڕاست و چەپدا پەلدەهاوێ. بەوێنە : دەربارەی دەنگسازی دەنووسێ و دەرز دەڵێتەوە ، کەچی تا ئێستا هەندێ دەنگی کوردی ڕاست بۆ ناوترێ ... خۆی دەخاتە گێژاوی واتارسازییەوە و مانای سەدان وشەی کوردی نازانێ و ئەوانەی دەشیانزانێ ، مانای بەشێکی

زۆریان بە هەڵە لێک دەداتەوە ... لە مەیدانی وشەسازیدا هێندە بێ ئاوەزە ، ناو و ئاوەڵناوی لێ بووە بە کردار ... هتد ، کەچی «دەڵێی نە بای دیوە و نە باران» .

مامۆستا وریا ئەوە باش دەزانێ ، بێتو من دەرزی ڕستەسازیم بوتایەتەوە ، هیچ نەبێ خوێندکارانم لەو مەینەتی و دەردی سەریە مەرەخەس دەکرد ، کە بۆ ڕاستکردنەوەی ڕستە ناکوردییەکانی ئەو دەیچێژن .

بە بڕوای من ، وا چاکە مامۆستا وریا لە نووکەوە تێ‌هەڵچێتەوە، واتە چەند ساڵێک خەریکی فێربوونی زمانی بابی ببێ ... بەدوا ئەمەشدا هەوڵی پەیداکردنی شارەزایی لە سەرجەمی قوتابخانە زمانەوانییەکان و بەتایبەت پێڕەوی چۆمسکی (کە ئەو خۆی بە شاگردی دەزانێ) بدا ... کورد وتوویە «تا بە شەو نەڕۆیت ، بە ڕۆژ ناگەیتە مەنزڵ» و دیارە چۆمسکی‌یش شاگردی کارتۆنی ڕاناگرێ .

بەندە دڵنیا و خاترجەمە ، کە ئەو هاوڕێیەی چەند کەم لە زمانی بابی بەڵەدە ، گەلێ کەمتریش لە پێڕەو و یاساکانی قوتابخانەی چۆمسکی ئاگادارە .. وەلێ ، ئەو تەنیا سەوداگەری و بازرگانی بە ناوی قوتابخانەی چۆمسکی‌یەوە دەکا ... گەر نا ، ئەوە چەندین ساڵە بۆ بەرهەمێکی ئەو زاتەی نەکردە کوردی؟ بەڵێ! کاتی ئەوە هاتووە ، ئەو قاچاخچییانە سنوورداش بکرێنەوە!...

کاکی ئازیز ماوەیەکە نازناوی (استاذ علم اللغة)ی لە خۆی ناوە . ئەمیش دوای ئەوەی بیست ساڵێک ئەو خەڵکەی بەوە خەڵەتاند ، گوایا بڕوانامەی دوکتۆرای هەیە[١٤]... دەبێ دوای پەردە هەڵماڵین لە ڕووی ئەم نازناوە زل و قەبە نوێیەی ئێستاشی سبەی خۆمان چۆن پێ بناسێنێ؟ ...نیازی لەم بەکارهێنانی کارتی درۆیە چی یە؟... گوایا نازانێ «تەعریفی خۆکردن ، پەموو جوونە»؟...

من جگە لە هەندێ بیروڕای زمانەوانیی خۆم و وەرگێڕانی چەند وتارێکی ئەو بوارە ، بەرگی یەکەمی کتێبی «سەرەتاییکی زمانناسی» ، کە (٣٣٩) لاپەڕەیە بڵاوکردووەتەوە و بەرگی دووەمیشیم بۆ چاپ ئامادەکردووە و ئەوجاش بەو نازناوانە ، خۆم، خۆم گەورە ناکەم...

سەرباری هەموو ئەمە ، ئەوەی بە گاڵتە بۆ خۆقوتارکردن لە

---

(١٤) ئەمە ڕووداوێکی کۆتایی ساڵانی چل و سەرەتای پەنجاکانم وەبیردێنێتەوە :

لەو سەردەمەدا کابرایێکی میسری بە پزیشکی بەڕێوەبەرێتیی مەعارفیی سلێمانی دامەزرابوو ... بۆ هەر قوتابخانەیێک بچوایە ، بەر لە هەر شت مقەستێکی لەگەڵ خۆی دەبرد . پۆل بە پۆل دەگەڕا و هەر قوتابییێک قژی درێژ بوایە ، یەکسەر دەردوو بۆی هەڵدەپاچی ... ئاخرێکەی پەردە لە ڕووی هەڵماڵرا و زانرا سەرتاشە و بە بڕوانامەی کەسێکی دی هاتووە... بەپەلە سنووڕداش کرا....

سەیر ئەوەیە ، لەم ساڵانەی دواییدا . کاکە وریای خۆمان ، خۆی لێ کردبوونە دوکتۆر و ، ئەوەتە :دەستەکەی ئەویش کەوتە ڕوو.... جا هەر لەبەر ئەم هۆیەیە ، لەم بەرگی دووەمەی کتێبی «ڕەخنەی ناڕەخنە» دا بە (دوکتۆر) ناوم نەبردووە .

(ئەو سەرتاشەی خۆی لێ کردبوونە پزیشک جارێکی دی دەگەڕێتەوە) دەشێ بکرێتە سەرناوی چیرۆکی ئەو جۆرە بەسەرهاتە .

وتنەوەی بابەتی ڕستەسازی وتوومە «باشی لێ نازانم» ڕاستیش بێ، دەبوو مامۆستا وریا هەر بە ڕەوای ببینیایە لە مەیدانی ڕستەسازیدا ڕەخنەبگرم و نەڵێ : «کەچی لێرە خۆی لەم کێژاوە داوە» (ل ١٩ ، س٢) ، چونکە مامۆستا وریا گەلێ جار لە دەریای قووڵی ئەوتۆدا مەلە دەکا ، کە مەلەوانی چاکیشی تێدا دەخنکێ.... ئەوەتە :

١- سەرپەرشتیی دوو نامەی دوکتۆری کردووە ، کە یەکێکیان دەربارەی زاری هەورامی‌یە و ئەوی دییان - زاری لوڕی ... ئاخر ئەوێک خۆی ددان بەوەدا بنێ و بڵێ ، من تا ئێستا شێوەزاری خۆمم بۆ دابین ناکرێ ، ئیدی چۆن سڵ ناکاتەوە، سەرکاریی ئەو کارانە بگرێتە ئەستۆ؟... «لە هەزار ئاش دەکا و ئاشێک ناماڵێتەوە»...

٢- ساڵانێک ، کە هێشتا کوردی لە ئێستاش خراپتر دەزانی، بووبوو بە سەرپەرشتی زمانەوانی (مشرف لغوي)ی ڕۆژنامەی «هاوکاری»و گۆڤاری «بەیان».. تەنانەت جارێکیان مامۆستا محەممەد ئەمین هەورامانی زۆر سەرزەنشتی کرد و بە گژیا چوو ، چونکە بە دەستکاریی ناشیانە ، هەندێ ڕستەی ڕاستی بۆ خواروخێچ کردبوو ... باشە ، کاکە وریا بەو هەموو کوردی نەزانینەوە ، چۆن ڕێی بە خۆی داوە و چۆن رووی هاتووە ، ئەو پۆستە وەربگرێ؟... جا ئەمە هەر بۆ پارە وەرگرتن بووە؟ یان هەموو شت بۆ خۆی بە ڕەوا دەبینێ؟

٣- ڕۆژێک لە پێش چاوی بەندە بە دوکتۆر (عادل الجادر)ی سەرۆکی بەشی عیبریی کۆلێجی زمانی وت ، کە عیبری باش

دەزانێ و گەر دەرزی بداتێ ، ئامادەیە بیلێتەوە ... دۆستی ئازیزم بۆ ئەمەیان چی دەفەرمووێ؟ گوایا نازانێ «گوڵ بە باوەشێن ناگەشێتەوە»...

٤- ئەو خوێندکارانەی خوێندنی باڵا ، کە دەیانەوێ کەڵک لە بەرهەمێکی چۆمسکی وەربگرن ، ئامۆژگارییان دەکا توخنی چۆمسکی نەکەون و پێیان دەڵێ ، زۆر زەحمەتە و تەنانەت من تا ئێستا هیچی لێ تێنەگەیشتووم .. گەر وایە خاوەنی ئەو قسانە بۆ دەڵێ : «من بە پێی پێڕەوی گوێزانەوەی چۆمسکی سەیری زمان نەکەم ...» .

وا پێدەچێ تەنیا لەمەدا ڕاست بکا ، کە هیچ لە چۆمسکی تێنەگەیشتووە .. ئەلحەق کزی و لاوازی و بەرەڵایی نووسینەکانیشی شاهیدی بۆ ئەو وتانەی دەدەن ... ماڵی ئاوابێ ، کە ئەمجارە ڕاستگۆ دەرچوو ... بەڵام بەداخەوە ، زۆر خـــۆی پێ نەگیراوە و خوو و ڕەوشتە خۆڕسکەکەی تەنگی پێ هەڵچنیـــوە و ئۆقرەی لێبڕیوە و زوو ئەو تاکە ڕاستبێژییەی سڕیوەتەوە . ئەوەتە لە نوژەنەوە کەوتووەتەوە دەهۆڵکوتان و دەڵێ : «من بە پێی پێڕەوی گوێزانەوەی چۆمسکی سەیری زمان ئەکەم» (ل١٩ ، س١) ... گەلۆ! «بەدەستی خۆی ناگری بەرداوەتە ماڵی خۆی» .

(استاذ علم اللغة) بەمەش دانەمرکاوەتەوە و تانە لە بەندە دەدا ، کە لە ڕێبازەکەی ئەو بەلەد نییە و بۆ ئەمە «تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێ»و دەفەرمووێ «ئەوەی لە قوتابخانەی چۆمسکی نەگات ناتوانێ ڕەخنە لە باسێ بگرێ بە پێی ئەم پێڕەوە نوسرابێ» (ل١٩ ، س١) .

گەرچی ڕۆژێک لە ڕۆژان نە باسی ئەم قوتابخانەیەم کردووە و ، خۆم بە کارامەیی ئەو مەیدانەوە هەڵکێشاوە ، بەڵام ئێستاکە ناچارم ئەو ڕاستییە بدرکێنم و بەوپەڕی ڕاشکاوی و دڵنیایی‌یەوە ، ئەوە ڕابگەیەنم ، لە کاکە وریا زۆر پتر ئاگاداریم و تێی گەیشتووم ...

ئەو برایەم لە ماوەیێکی درێژدا تەنیا هێندەی پی‌کراوە ، کەڵک لە چەند لێکدانەوەیێکی ئاسانی چۆمسکی وەربگرێ و ئەویش بەشێکیانی بە ناتەواوی و هەڵەوە کردووەتە قەفەزێکی تەنگ و بە زۆری زۆرملێ زمانی کوردی تێدا بەند کردووە ..

وێڕای خوێندنی ئەو بابەتە لە زانستگەی لینینگراد و خوێندنەوەی چەندین ڕەخنەی زانستی لەبارەیەوە ، بی‌گومان دەمێکە بیر و بۆچوونی خۆیشم لەمەڕ هەندێ لایەنی ئەو قوتابخانە بەرزە لە لا گەڵاڵە بووە و لە سەروو هەمووشیانەوە جارێ بە زوووی دەزانم لەم قۆناغە سەرەتاییەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا پێڕەوی ئەو ڕێبازە بکرێ . جا بە هیوام لە دەرفەتێکدا بە وتارێکی سەربەخۆ ئەو ڕاستییە ڕوون‌بکەمەوە ... لە لاییکی دی‌یشەوە بە هومێدی ئەوەشم :

١- بە شێک لەو ڕەخنانەی بەرەو ڕووی چۆمسکی بوونەتەوە، بکەمە کوردی ، تا خوێنەری کورد بە ناوی زل هەڵنەخەڵەتێ .

٢- نیشانی بدەم ، مامۆستا وریا چی و چەند لە چۆمسکی تی‌گەیشتووە . بۆ ئەوەش ، کە ڕووناکبیری کورد بە ئاسانی لەو باسەم بگات ، چەند نووسینێکی ئەو برایە لەگەڵ ناوەرۆکی بەرهەمی (Syntactic Structures)ی چۆمسکی ، کە (د. یۆیل یوسف

عزیز) کرویە بە عەرەبی[١٥] ، بەراورد بکەم .

☆ ☆ ☆

هەر دوو هەفتەیێک دەبوو ، وتاری « ڕەخنەی نارەخنە » بڵاوبوویەوە ، کە مامۆستا وریا لە ڕاڕەوی بەردەم ژوورکەی خۆیدا بە دەنگێکی پەڕیو و ڕەنگێکی هەڵبزڕکاوەوە ، پێی وتم : « مامۆستا! خۆ لە وەڵامەکەم دڵگیر نیت ؟». بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوە و وتم : « بە هیچ چەشنێک »و بۆ جەختکردن لە مەبەستی وتەیێکی ناشیرین و ڕەزاقورسی و ، هەروەها ڕێزپرینەوە لەوەی سبەی بە چەشنێکی دی پێمان نەفرۆشێتەوە ، بە دوا وەڵامی « بە هیچ چەشنێک »دا ، ( بەڵام!)یکم داکوتا ... ئەوجا وتم « هێندە هەیە، جوان نییە بە منت وتووە (درێژدادڕ) » ... تەواو ڕەنگی تێکچوو و یەکسەر بە سوێندە عادەتی‌یە لە ڕادەبەدەر تاڵ و تفتەکەیەوە ، فەرمووی : « هەردوو مناڵەکەم بمرن گەر مەبەستم تۆبێ ... زۆر چاک ئەزانی لەگەڵ کێمە و کەچی خۆتی لێ غەشیم ئەکەی » ...

ئەمە وا ، کەچی پاش ماوەیێکی کەم ، لە وتاری « پاشبەندی /ی/ لە ڕەخنەی نارەخنەدا »دا ، نەک هەر وا ڕادەگەیەنێ ، کە ئەو قسەی ناشیرینی بە مامۆستا مەسعوود محەمەد نەوتووە ، بەڵکو منیش دەکاتە درۆزنێکی گەورە و دەڵێ : « ئەو گۆڤارە ، کە ئەم وتارەی تیا بڵاوکراوەتەوە هێشتا مەرەکەبەکەی وشک نەبووەتەوە » (ل١٦ ، س٢) ... بە کورتی ، دەڵێ ئەمە هەڵبەستە و بوختانی ئەوڕەحمانە ... بە ڕاستی : « دە لێی بەرزەکی باتانە ».

ئەو وازوازی و بێباکی‌یەی ، چ بەندە و چ سەرجەمی دۆستان سەرسام ناکا ، چونکە ئەمە کار و پیشەی ڕۆژانەیەتی و دیارە خوویەکە گرتوویە بە شیری ... هەر ساتە و بە چەشنێک تەشخەڵە

---

(١٥) نوم جومسکی ، البنی النحوية (ترجمة : د. يؤيل يوسف عزيز) ، بغداد ، ١٩٨٧ .

بە یەکێک دەکا ... زیندە ڕۆیی نییە ، گەر بڵێم ، ڕاست لە مەزهەبیدا نییە و زۆر جار بە گەڕ و دەبە و فێڵ وگزی‌یەکانی پی‌دەکەنین و خوا هەڵناگری جارجارەش خێروبێریان داوەتەوە [١٦] ... خالق ! دەبێ چ هەوێن و ئامیانێ لە بەدەنی ئەو دۆستەماندا بێ ؟

مامۆستا یەکمان ماوەی دە ساڵێک دەیووت و دەیووتەوە ، گوایا دوکتۆر فڵانی ژیر و زیرەک چاک ئەو برادەرەمانی هەڵسەنگاندووە، کە بە ( درۆزنێکی ساویلکە )ی ناودەبا ... بەڵام ئەوە پێنج ساڵێکـە ، ئەو مامۆستایەمـان ، دوای بینینی درۆ و دەلەسە ؛ گزی و فزی ؛ فێڵ و تەڵەکبازی ؛ غەل و غەش ... ی زۆری ، دەڵێ : نەمدەزانی دوکتۆر فڵانیش وەک ئێمە ساکارە و چۆن ئەو (ڕێوی)یە ، کە (شای درۆزنان)ە ، بە (درۆزنی ساویلکە) تێ‌گەیشـــووە .... ئاخـر «ئاو دەزانێ پەنیری مەلا کێ خواردوویەتی ».

☆ ☆ ☆

دەمێ بەندە لەو گلەیی‌یە دەبێتەوە ، کە نووسەری وتـــــاری

---

(١٦) (غانم) قوتابی‌یێکی عەرەبی پۆلی سێیەمی بەشەکەمان بوو ... بە هۆی کێشەیەکەوە دە ڕۆژێک دیار نەبوو ... کاتێ دەردەکەوێتەوە ، مامۆستا وریا لە پۆل دەیکاتە دەرەوە و پێی دەڵێ ، تۆ فەسڵ کراویت ... من ئاگام لەم کەین‌وبەینە نەبوو هەر هێندەم دەزانی ، کە (غانم) دەوام ناکات ... پاش دوو ساڵ ، لەبەردەم ژووری کاکە وریادا بینیم ، (غانم) بە ڕوویێکی خۆش و پۆشاکێکی جوانەوە وەستاوە ... بەگەرمی دەستی یەکترمان گوشی ... لێم‌پرسی ، کە ئەم چەند ساڵە لەکوێ بووە .. بەپێکەنینەوە وتی : ( درۆی د . وریا بە خێر گەڕا و کردمی‌یە خاوەنی سێ دوکان و ماڵ و حاڵێکی چاک ... دوای ئەو لە پۆل دەرکردنەم و هەواڵی هەڵبەستراوی فەسڵکردنم ، ڕووم‌کردە بازاڕ و دەستم‌دایە کار و باش سەرکەوتم ... کەچی سەیر ئەوەیە ، ئەمڕۆ کە بۆ بەڵگەنامەیێک هاتووم ، تازە بە تازە بەناز‌ەوە پێم دەڵێت بۆ دەوام ناکەیت ... تۆیەک ، کە تا ئێستا ناوت لە لیستی پۆلی سێیەمدا بێ ، چۆن دەتوانم بەڵگەنامەی فەسڵت بدەمێ ... برۆ پۆل و دەوامی خۆت بکە ...» ئاخ « تەپڵی دڕاوە »...

« یاسایینکی فوتولۆجی » بۆ چوتێتی گۆڕانی پێشبەندی ( بە)و بوونی بە پاشبەندی (٥) ، بە نهێنی زانیاری و کەرەستەی ئامادەی لە لاپەڕە ( ٥٦ - ٥٧ )ی کتێبی « چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی»یەوە دەرهێناوە ، ئەوجا دێتە سەر باسێکی دی ، کە پێوەندیی بەو کارە نارەوایەوە نەبێت ... بە کوردی ئەمی دووەمیان ئامۆژگارییەکە بۆی ، کە لەز و پەلە ئەکات و بێ قوولبوونەوە و گەڕان و سۆراخ ، زانیارییێکی ناتەواو ، یاخود بەکارهێنانێکی ناوچەیی ئەکاتە یاسایێکی سەرلەبەری زمانی کوردی ... ئەو کە بڵێ : ئەگەر ڕەگی کردار بە کۆتسوتانت کۆتایی هاتبێ (وو) دەبێ بە (ۆ) ... و من دەربارەی باری سەرنجی خۆم خستبێتە پێش چاو ، ئیتر ئەو دەزووە قرچۆکەی مامۆستا وریا ، ئەو دوو باسە جیاوازەی بەیەکەوە پێ‌گرێداوە ، دەبێ چەند بەرگە بگرێ ... ئەونک لە وەڵامدا بنووسێ : « ... د. ئاورەحمان دوای ئەمە هەموو دان بەوەدا ئەنێ کە باسەکەی من و مامۆستا مسعود دوو بابەتی جیاوازن و ئەمجارە لەبارەیەوە ئەڵێ [ ئەگەر بیوتایە تەنیا لە سلێمانی و چەن ناوچەیەکی کەمی دی ئەم دیاردەیە دەبینرێ ئەوە ڕەخنەی نەدەهاتە سەر ] (ل٣) ئەی بۆ هاتە سەرم و لەسەرچی بوو هاتە سەرم و بوو بەچی » (ل ١٩)[١٧] ، ئەوە یان یەکجار ساکار و ساویلکەیە ، یان کار و کردەوەی هەر خەڵەتاندنی

(١٧) لەو چەند دێڕەی مامۆستا وریادا لە گەلێ لایەن و ڕووەوە خەوش و ناتەواوی دەبینرێ و بەشێکیان دەخەمە پێش چاو :

١- لە دێڕی یەکەمدا ڕاست وایە نەڵێ : « دوای ئەمە هەموو »و بڵێ ( دوای هەموو ئەمە ) .

٢- لە کۆتایی دێڕی یەکەم و سەرەتای دێڕی دووەمدا باش وا بوو بنووسێ ( ددان بەوەدا ئەنێ ) ، نەک « دان بەوەدا ئەنێ » .

←

خوێنەرە و «ئاو دەکاتە بێژنگ» ..

بۆ بەندی یەکەمیان بە ڕاشکاوی‌یەوە دەڵێم ، نەخێر من هەرگیزاوهەرگیز ددانم بەوەدا نەناوە ، کە باسەکەی مامۆستا وریا و مامۆستا مەسعوود «دوو بابەتی جیاوازن» ، بەڵکو وتوومە، گەر سەرناوی ئەو دوو نووسینە جیاوازیش بن ، هاودەنگی و یەکێتیی بابەت و ناوەڕۆک کۆیان دەکاتەوە و ئەو بانگی هەقەشم بە بەڵگە و نموونە و بەراورد ڕاگەیاندووە . ئیدی چ ڕەوایە ( سەرباس ) بکرێ بە ( بابەت) ... بەڵێ ! سادە و

---

←

٣- ئەو دەقەی لە بەندەی وەرگرتووە :

أ- دەبوو بخانە نێوان کەوانەی دووتایی‌یەوە - واتە «　　　　　　» ، نەک نیشانەی [　　　　　　] .

ب- من لە سەرەتای دێڕی یەکەمدا وتوومە : « ئەگەر د. وریا بیوتایە » ، کەچی ئەو کردوویە بە « ئەگەر بیوتایە » . لە کۆتایی هەمان دێڕیشدا نووسیومە : « چەند ناوچەییکی » و ئەو گۆڕیویە بە « چەن ناوچەیەکی » .

ج- لە سێ شوێندا کۆمام داناوە و لە کۆتاییشدا خاڵ ، بەڵام سەرجەمی ئەو نیشانانە نەکەوتوونەتە ، نێو نەقڵەکەوە .

د- لەسەر پیتی (ی)ی ناوەڕاستی وشەی (سلێمانی)و لە ژێر (ڕ)ی سەرەتای (ڕەخنە)چوکلەم داناوە ، کەچی کاکە وریا بۆی سڕیومەتەوە .

٤- ئەم بەندەی وەڵام ، کە چوار دێڕە و بریتییە لە چەندین ڕستە ، تەنیا لە کۆتاییدا خاڵێک دانراوە ، دەنا لە تاکە شوێنێکدا چییە نیشانەی دیی خاڵبەندی نییە .

٥- لە دوا دێڕدا ، کە نووسیویە : « ... بۆ هاتە سەرم و لە سەر چی بوو هاتە سەرم ... » بە شێوازی بەرز و نەدەبی باڵای نووسینی کوردی گەیاندووەتە لوتکە ... برا « فێری ڕۆین بە ، ئنجا دەست بکە بە ڕاکردن » .

جا ئەو ، کە زمانی زگماکی وا خراپ بزانێ و ، دەقی وەگێراو وا بشێوێنێ ... ئیتر چۆن لە زمانی کوردی دەکوڵێتەوە و بە کام ڕێبازی زانستی‌یەوە شانازی دەکا ، کە لە ئەلفوبێی بەرنامە و یاسا و پێڕەوەکانیدا هێندە بێخەبەر و دەستەپاچە بێ ؟

ساکاریی بەو ڕادەیە . یاخود غەلوغەشی وا گەورە ئابڕووی زانست دەبەن و ، ورشە و گەشەی ناهێڵن .

ئەمەیان دەربارەی پێشبەندی (بە)و پاشبەندی (٥) بوو ... هەرچی ئەوەی دییە ، کە وتوومە : « ئەگەر د. وریا بیوتایە تەنیا لە سلێمانی و چەند ناوچەیێکی کەمی دی ، ئەم دیاردەیە دەبینرێ ، ئەوە ڕەخنەی نە دەهاتە ســـەر » لەمەڕ باسی بوونی (وو)ە بە ( وٚ )و وەک لە سەرەوە ڕوونمکردووەتەوە ، ڕەخنەیە لە خاڵێکی دیی وتارەکەی .

☆ ☆ ☆

مامۆستا وریا کە زانیویتی لە پەلەقاژێ و لنگەفرتێی نێو ئەو زوٚنگ و زەلکاوەی تێیکەوتووە بە شێواندن و شاردنەوەی ڕاستی قوتاری نابێ ، بوٚیە لە تاو و عەزرەتدا شەلم کوێرم پەنا دەباتە بەر شێوازێکی یەکجار نزمتر و نارەواتر ، کە ئەویش قسەی هەڵبەستراو و شاخدارە ... شتی ئەوتوٚ بە ناوی منەوە دەڵێت و دەگێڕێتەوە ، کە نەک هەر لە ڕەوشت و ئاکار و خسڵەتی بەندەوە هەزار فرسەخ دوور بێ ، بەڵکو ڕوٚژێ لە ڕوٚژانیش بیر و خەیاڵی وا نابەجێ و ناپەسەندی نەکردبێتەوە . ئەو کە لە پەراوێزی ژمارە ( ١١ )دا نووسیویتی : « د. ئاورەحمان چەن جارێ لەبەردەم مامۆستا و قوتابییانی خوێندی باڵا ئەوەی دووبارە ئەکردەوە کە

نامەکانی ماجستێر و دکتوراه هەموو ( وریانەمە )ن چونکە زۆربەی زۆری سەرچاوەکانیان وتار و باس و لێکۆڵینەوەکانی منن» . لەبەر ئەوەی « ئەوی لە دیزەدا بێ ، بە ئەسکوێ دەردێ»، دەبوو دوو ڕاستی لەبیرنەکات :

١- مایەی خۆشی و بەختەوەری‌یە ، گشت مامۆستایانی بەشی کوردی و قوتابیانی خوێندنی باڵا لە ژیاندان . جا ئەگەر ئەو شەرم لە من نەکات ، ئەو تۆمەتە بخاتە ئەستۆم ، ئەدی لەمەودوا چۆن ڕووی دێ لە پێش ( ١٠ ) کەسێکدا سەرهەڵبڕێ .

٢- ئەوەتە دوو قوتـــابی ( لەیلا جەلیـــل عەبـــاس دەلۆ) و ( ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان ) ، کە لەم ڕۆژانەدا نامەکانیان چاپکردووە و من سەرپەرشتیان بووم ، ئامۆژگاریم کردوون ، کەڵک و سوود لە سەرجەمی ئەو کارانە وەربگرن ، کە لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراون . خاتوو لەیلا لە لیستی سەرچاوەکانیدا (٨) هەشت بەرهەمی کاکە وریا و (٥)ی بەندەی تۆمارکردووە . کاکە ئازادیش (٨) هەشتی ئەو و (٦)ی من . جا گەر بەندە خاوەنی ئەو وتە نابەجێ‌یە بوایە ، هەڵبەت ڕێی بە قوتابی‌یەکانی نەدەدا ، ناوی مامۆستا وریا ، لە مامۆستاکەیان پتر دەرخەن ، وا پێدەچێ ئەو برا هێژایە بیەوێ دەستە چەورەکەی بە من بسڕێ ! بەڵێ ئەو خورمایەی کاکە وریا خواردوویەتی ،

دەنکەکەی و ا لە گیرفانی مندا .

دوو ساڵێک لەمەوبەر لیستی سەرچاوەکانی قوتابییەکی خۆی نیشاندام و پێی وتم : « بچۆ بە مامۆستا (ن) بڵێ فڵانە قوتابی لە لیستی سەرچاوەکانیدا دوازدە بەرهەمی د. وریای ڕیزکردووە تاکە بەرهەمێکی تۆ چییە یادداشتی نەکردووە ... و ئەوجا بەپێکەنینەوە بڵێ (وریانامە)یە.... ».

داوای لێبووردنم لەو برا خۆشەویستەم کرد و پێم وت ، کە من گاڵتەی وا لەگەڵ ئەو خوشکە بەڕێزەمدا ناکەم ... گەر یەکجار تامەزرۆی ئەو گەمەیەیت و مەبەستێکت هەیە ، خۆت بفەرموو ... وەک دواییش بۆی گێڕامەوە لە ڕێی مامۆستاییکی دیبەوە ، نیاز و مرازی خۆی هێنابووە دی . ئەوەتە « بە باڵی یەکێکی تر دەفڕێ » .

ئەم گێڕانەوەیە ڕاستییەکی تاڵم پێ دەدرکێنێ :

مامۆستا وریا نەک هەر مرۆڤێکی سەرڕاست و ڕاستگۆ نییە ، بەڵکو لە فێڵ و تەڵەکەبازیدا کەم وێنەیە ... کارێک ئەنجامی باشی نەبێ ، بە خەڵکی دەکات و خۆیشی ئاسوودە و خاترجەم ... تازەترین نموونەی ئەو هەڵسوکەوتەی ئەمەیە :

لەم چەند مانگەی دواییدا مامۆستاییکی بەشەکەمان لەبەر هەر هۆیێک بێ ، دەوام ناکات . ئەمیش نایەوێ بە عەمیدی

رابگەیەنێ و چاکیش دەکا ... بەڵام ئەو مامۆستایە قوتابی‌یێکی دوکتۆرای هەیە و ، مامۆستا وریا فشاری خستووەتە سەر سکاڵاییێک بۆ عەمید بنووسێ ، کە چەند مانگێکە مامۆستاکەی دیار نییە ... ئافەرم قوتابی ، کە وا زوو سەرۆکی بەشەکەتت ناسیوە و ناچیتە ژێر باری ئەو کارەوە ... هەمووش دەزانین ، بێتو ئەو قوتابی‌یە سکاڵاکە بنووسێ ، ئەوە کاکە وریا فوتوکۆپی دەکات و سبەینێ ، کە سزای مامۆستاکە بدرێ ، ئەوە وێنەیێکی سکاڵاکەی دەداتێ ... قوتابیی کلۆڵ پیاوخراپ دەردەچێ و خۆیشی مەرد و خاوەن هەڵوێست ... ئەمەش نموونەی خەروارێکە و هەر یەکێک لە بەشی کوردی چەندین ڕووداوی پڕ گزی و فزیی لەو چەشنەی ئەو برا ڕۆح سووکەمانی لە لایە ... کورد وتەنی «دەڵێی میچی قومارخانەیە» ...

ئەوە چەندین ساڵە ، کە ئارەزووی کردبێ و ویستبێتی یەکێک بکاتە جێگری خۆی ، یان ئەندامی لیژنەییێک ... پرسی بە کەس نەکردووە و ڕای کەسی وەرنەگرتووە - واتە بێ ئاگاداریی ئێمە فەرمانی کارگێڕیی بۆ دەرکردووە ... بەڵام کاتێ لەگەڵی تێکچووە ، هەمووماتی کۆکردووەتەوە و بە بڕیاری ئەنجومەنی بەش پاڵی پێوەناوە و دووری خستووەتەوە ... بڵێین چی ، ئێمەش هەموو وەخت ئەقڵ میوانمان نەبووە .

مامۆستا وریا بەدوا سازادانی ئەو تۆمەتە ناڕەوایەدا ، کە گوایا بەندە وتبێتی : «نامەکانی ماجستێر و دکتوراه[18] هەموو ( وریانامە )ن ... » ، نووسیویە : کەچی ئەورەحمـــان « لەم ڕەخنەیەدا ئەمەی سەرەوژێر کردوتەوە و وای دەرخستووە کە (سەرچاوەکان لە نامەکان ورگیراون) » ( ل ١٩ - ٢٠ ) .

من هێندە نەفام و بێئاوەز نیم ، قسەی وا بێسەروبەر و نابەجێ بکەم و ، بڵێم ئەو سەرچاوانەی نووسەری نامەیێک کەڵکیان لێوەردەگرێ ، ئەوان لە نامەکەوە وەرگیرابن - واتە نامەکە پێش سەرچاوەکان بخەم ، یان نامەکە بکەمە سەرچاوەی سەرچاوەکان ... بێگومان مامۆستا وریا ئەو نەزانە نییە شتی وا سەیر و سەمەرەی بەبیردا بێت ... کەواتە شوکرانە بژێریی دەوێ، کە هۆی ئەو دەربڕینە خواروخێچەی لە دوو هۆیێ سووکەڵە بەدەر نەبن :

١- لەبەر ئەوەی زمانی کوردی باش نازانێ ، نەیتوانیوە ئـــەوەی لە مێشکیدا بووە بە شێوەیێکی ڕەوان و بێگرێ دەریبڕێ و تۆماری بکا .

---

(١٨) کورد دەڵێ ( دکتۆرا ) ، نەک ( دکتوراه ) .
وێرای ئەوە ، گەر بە شێوە عەرەبییەکەش بوترێ ، ئەوە (ە)ی کۆتایی دەبێ بە (ە) بنووسرێ ، چونکە لە کوردیدا ئەو (ە)بە بەرانبەر سەر ( فتحة )ی عەرەبی دەوەستێ .

٢- لەز و پەلەی بووە ، وەڵامەکەی ڕۆژێ زووتر بڵاوبێتەوە .

ئەو دێڕانەی بەدوا ئەو دەربڕینــە نادروستەدا دێن ، پتر وێرانی و سەرگەردانیی نووسینەکەی نیشاندەدەن :

« ئەو شتانەی د. ئاورەحمان ئەڵێ من لەو نامانەم وەرگرتووە گەر دووبارە سەیرێکیان بکاتەوە چاوێ بە سەرچاوەکانیان بخشێنێ ... » ( ل. ٢) .

١- دەبوو نەڵێ ( وەرگرتووە ) و بڵێ ( وەرگرتوون ) ، واتە کردارەکە لە حاڵەتی کۆدا بێ ، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ ( ئەو شتانە ) ، کە کۆیە .

٢- ڕاست وایە بوترێ (ئەو شتانەی د. ئاوڕحمان ئەیانڵێ ) ، یان هیچ نەبێ ( ئەیڵێ ) ، نەک ئەو وتەنی (ئەڵێ ) .

٣- ( بە سەرچاوەکانیان ) ناتەواوە و تەواوەکەی ( بە سەرچاوەکانیاندا )یە .

سەرباری ئەو هەڵانە ، شێوازی لاواز و خەوشی ڕێنووس و خاڵبەندیی یەکەشی لە نووسینی کەسێکی کوڵکەخوێندەوار دەچێ ... بڵێین چی « ئومێدمان بە وەیس بوو ، وەیسیش سوورنی دەرچوو » ...

پاشان مامۆستا وریا یەکجارەکی سنوور دەپسێنێ و فرە چاوقایمانە دەڵێ : « هەموو ئەوان لە منیان وەگرتووە » (ل. ٢)

... ئەلحەق ڕووینکی دەوێ مرۆ قسەی لەو جۆرە بکا ... « تا خاوەن ماڵ دزی گرت ، دز خاوەنماڵی گرت » ... لێرەدا سەرپاکی ئەو گلەیی و گازندە و لۆمە و ناڕەزاییانە ناگێڕمەوە ، کە چەندین قوتابی دەربارەی ئەو ناھەقییە داد و بێداد و هاواریانە . بۆ گڕ و کڵپەی کاری ئەو زوڵمە تەنیا دوو ڕووداو دەگێڕمەوە :

ڕۆژێک لە هۆڵێکدا وتووێژی نامەیێکی ماجستێر کراوە و مامۆستا وریاش یەکێک بووە لە بەشدارانی . دوکتۆر ع. ح. وا گەیشتووەتە تینی ، ویستوویەتی دەرگا بکاتەوە و بچێتە نێو کۆڕەکەوە و لە پێش چاوی هەموان کاری ناڕەوا و ناپەسەندی مامۆستا وریا ئاشکرا بکا و ، دانیشتوان لەوە ئاگادار بکا ، کە ئەو مامۆستایە چی و چەندی لە نامەی دوکتۆرییەکەی ئەم وەرگرتووە و کردوویەتە موڵک و ماڵی خۆی .

هەرچی مامۆستا فەتتاحی مامەی ئارام و هێمنی بەسزمانە ، جاران بوکڕووزی دەگەیشتە ئاسمان ... کەچی مامۆستا وریا بە ئاین‌وئۆینی فریودان ئەو پیاوە گڕگرتووەی ساردکردووەتەوە و وا دەسخەڕۆی کردووە و لە خشتەی بردووە ، نەک هەر دەستبەرداری هەموو مافێکی خۆی بێ و واز لە گشت هەقێکی ڕەوای خۆی بهێنێ ، بەڵکو نامەی ماجستێرییەکەیشی بۆ بکاتە نەزر ...

دەبێ بڕوا و هیوای خوێنەر بەو مامۆستا و قوتابی‌یە چەند بێ، کە ئەمیان هێندە بە کەین‌ویەین و ئەویان ئەوەندە بێ‌هەڵوێست...

گوناهی گەورە لە ئەستۆی مامۆستادایە ، کە قوتابی‌یەکەی بە ڕێگەی وا چەوت وچەوێڵدا دەبات و نامەی وا پڕ سەیر و سەمەرەی پێ دەنووسێ ... بێتو قوتابی‌یەکەش ، بۆ بەرژەوەندیی خۆی بیویستایە نامەی ماجستێری‌یەکەی بکاتە قوربانی تۆزی ڕێی مامۆستاکەی ، دەبوو مامۆستا پچێک وژدانی هەبوایە و قایل نەبوایە ، ڕاستی و زانست وا بشێوێنرێ ...

دیارە ئەمڕۆ داوای شتێکی مەحاڵ لە کاکە وریا دەکەین ... ئەوێک چەندین ساڵ ئەو هەڵس و کەوتە دزێوە کار و پیشەی بووبێ ، واتە : « گوریسی ڕاخستووە و دنیای تێ‌خستووە » ، ئیدی ئێستاکە بۆ ئەو فێڵ وفەرەجەی نامەکەی مامۆستا فەتتاحی مامە ، چاوەڕوانی چی لێ‌بکەین ...

مامۆستا وریا وا تێ‌دەگا خەڵکی لە گوێی گادا نوستوون و هەست بە خاپاندن و خەڵەتاندنەکانی ناکەن . ڕووناکبیری کورد وشیارە و ئەو درک دروێنە دەکات .

نووسەری وتار بەدوا ڕستەی « هەموو ئەوان لە منیان وەرگرتووە »دا بۆ فریودان و تەفرەدانی خوێنەر ، ئەو نامەیەی

مامۆستا فەتتاحی مامەی بڵاوکردووەتەوە ، کە بەندە بە سەرناوی « قەرەبووی خوێندکارێک بۆ مامۆستاکەی»یەوە وەڵامی داوەتەوە ... گەرچی هەندێ زانیاریی دیم لەبارەی ئەو نامەیەوە لە لایە، بەڵام ســـەری خوێنەری پێوە نایەشێنم و هەر هێنـــدە دەڵێــم « مریشک خۆی خوڵ نەکا بە سەری خۆیا ، کەس ناتوانێ خوڵی بە سەردا بکا » .

☆ ☆ ☆

کاکە وریا دەیەوێ وا نیشان بدا ، کە ئەو باش سەری لە فەلسەفە دەردەچێ و بۆیە لە نووسینەکانیدا چەندین جار ، ئەوە دەڵێتەوە ، کە ئەمڕۆ لێکۆڵینەوەی زمان فەلسەفەیە و لە کۆتایی ئەم وتارەشیدا گوایا فەلسەفەی نواندووە و نووسیویە : « هەموو تاریکی جیهان ناتوانێ کزترین مۆم بشارێتەوە » ( ل.٢ ) .

پێم وایە کاکە وریا بۆ ئەو فەلسەفە نابەجێیەی ، پێوستە ئەو ڕاستییانەی خوارەوە بزانێ :

١- دنیا چەند تاریکتر بێ ، ڕۆشنایی مۆمی کز چاکتر دیارە ... مۆمی کز لە ڕووناکیی تەواودا باش نابینرێ ... کەواتە ئەو دەربڕینــە لە هەمــوو ڕوویەکەوە نیشانی نەپێکاوە. ڕاست وابوو بڵێ :

أ- هەموو تەمومژی جیهان ناتوانێ کزترین مۆم بشارێتەوە» .

ب- هەموو ( گێژەڵووکە ، گەردەلوول ، باهۆز ، ڕەشەبا ...)ی جیهان ناتوانێ کزترین مۆم بکوژێنێتەوە .

ج- خۆ گەر کەمێک ئاگاداری سامانی کەلەپووری نەتەوایەتیمان بوایە ، دەبوو ئەو پەندە بەرزە کوردییە بێنێتەوە ، کە دەڵێ « جوگەلە دەریا لێڵ ناکا » .

.... هتد .

٢- نە من ( هەموو تاریکیی جیهان )م و ، نە ئەو (کزترین )مۆمە .

٣- ئەو مۆمێکی ( ڕۆشنا و بەشەوقە ) ، بەڵام خۆی خستووەتە دومان و تۆز و غومارەوە .

٤- ڕەنگە بەندە تاریکی بێ ، بەڵام زۆرنا ... برا ئاوێکی خراپت ڕشتووە .

٥- هەمیشە و هەردەم هەوڵمداوە باروودۆخ و دەوروبەری مۆمە تازە هەڵکراوەکان وا خۆشبکەم و بگونجێنم ، بۆ ئەوەی ڕووناکی و شەوقیان تا دێ بەرز و بەرزتر بێتەوە ، تا ئەوانیش کوردستانمان بۆ بکەنە چراخان ... بەرانبەر ئەو ڕەشەبایەی ویستبێتی مۆمێک بکوژێنێتەوە سنگ و قەڵەمم کردووەتە لەمپەر و بەرهەڵست و پشت و پەنای ڕاستەقینەیان بووم ...چەندین مۆمی باریکەڵەم ئەستوور کردووە و گەلێکی شکاوم

پێکەوە ناوەتەوە و بە دەستی خۆم دامگیرساندوون ... بە چەندین نامەی ماجستێری و دوکتۆریدا چوومەتەوە ، کە خۆم سەرپەرشتیان نەبووم و تەنانەت ڕێم‌نەداون لە پێشەکیدا سوپاسیشم بکەن ... لە هەموو ژیانمدا تاکە مۆمێکم نەکوژاندووەتەوە و بە شانازی و سەربەرزی‌یەوە ، دەڵێم دەیان مۆمم هەڵکردووە و وەک پەپوولە بە دەوریاندا سووڕاومەتەوە ...

بەڵێ ، مامۆستا وریاش مۆمی داگیرساندووە ، بەڵام کەمیشی خامۆش نەکردووە ... جاری وا هەبووە ، ئەو دەنکە شخارتەیەی کوژاندووەتەوە ، کە بە دەستی ئێمەوە بووە و ویستوومانە مۆمێکی پێ داگیرسێنین . خۆشبەختانە زۆر جار ڕێمان نەداوە فوو لە ئاگری دەنکە شخارتەکانمان بکات .

فەتتاحی مامەیەک شەش ساڵێک بەر لە وتاری « لیلی لە زمانی کوردیدا »ی ئەو ، نامەیەکی ماجستێری دەربارەی هەمان باس نووسیبێ و ، ئێستاکە لەم بەرهەمەیدا بە هیچ چەشنێک ناوی نەبردبێ ، ئەمە گەر مۆم کوژاندنەوە نەبێ ، دەبێ چی بێ ؟

بەناو سەرپەرشتی نامەی دوکتۆریی مامۆستا ڕەفیق شوانی بوو و خۆی ڕۆژی ڕتوێژ لەپێش چاوی دانیشتوان ددانی بەوەدا نا ، نامەکەی نەخوێندووەتەوە و ، بە دڵ ئارەزووی دەکرد دەری‌نەچێنین . گەر ئێمە ، بەتایبەتی مامۆستا عادیل گەرمیانی

نەبوایە ، مامۆستا ڕەفیق توند بە ڕوویدا دەتەقییەوە ... دیارە ڕقی لە مۆم داگیرساندنە ! ...

چەندین خوێندکاری ماجستێر و دوکتۆرای بە شەش مانگ بە شوێنیدا دەگەڕێن و بۆیان دەستگیر نابێ ... تا بەم شێوەیە کادری نوێ پێدەگەیەنێ ؟ ...

خۆ کاکە وریا هەر لەگەڵ ئەو خوێندکارە هەرزەکارانەدا وا نییە ... ئەی کێ بوو دەستنووسی « کێشەیەک لە زمانی کوردیدا »ی مامۆستا ڕەئووفی ئالانی ، کە لە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردییەوە بۆ هەڵسەنگاندن بۆیان ناردبوو ، ڕەفزکردەوە و دوایی بە هەوڵ و تەقەلا و بەرپرسیاریی مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی و بەندە ڕێی لە چاپدانی درا ... نازانم چۆن ڕێی بە خۆی دا ببێتە ڕێگری ئەو بەرهەمە شاکارەی ئەو سوارچاکەی زمانی کوردی ... وا دیارە وستوویە گڕ و بڵێسەی مۆمی کافووریش خامۆش بکات ... سەد شوکور ئاواتی نەهاتە دی ... بێگومان « چاڵ هەڵکەن هەمیشە لە چاڵدایە »...

... و گەلێکی دی .

☆ ☆ ☆

گەر ئەو نامیلکەی « ڕێزمانی ڕاناوی لکاو »ەی کاکە وریا یەکجار شانازی پێوە دەکات و زۆری کات بە دەستییەوەیە و

هەر کەسێک مەرحەباییەکی لێ بکا ، دانەیەکی پێشکەش دەکا ،
بە دوور و درێژی و تەواوی هەڵسەنگێنین ، ئەوە خۆشحاڵ و
خوێنەریش وا وەرز و جاڕز ەبێ ، ئەو زمانە شیرینەی کوردیمان
لە لا تاڵ ببێ و ، لە لێکۆڵینەوەشی دڵمان ڕەش و کرمێ ببێ
... بە چەشنێکە ، مەگەر هەر گزگل بکەین بە گوێزەبانەی ...
جا بۆ ئەوەی لەو بەڵایە بەدووربین ، تەنیا بە چەند لاپەڕەیێک
دەربارەی هەندێ لایەنی دەدوێین :

نووسەر لە پێشەکیدا وا ڕادەگەیەنێ « ساڵی ١٩٧٥ » ،
کە « خەریکی شیکردنەوەی هەندێ ڕستەی کوردی » بووە لە
ئاڵوگۆڕکردنی دەوری جێناوە لکاوەکاندا – واتە لە ( کارا )وە بۆ
( بەرکار ) ، یان بەپێچەوانەوە « دووچاری دیاردەیێکی سەیر »
هاتووە و « زۆری سەرنج ڕاکێشاوە » ... (ل٤) ... لە
بێخەبەران کەشکەک سڵاوات ! ...

ساڵی ١٩٢٨ ، کە (٤٧) ساڵ بەر لە ساڵی ١٩٧٥ دەکات ،
مامۆستا سەعید صدقی کابان ، ئەوی یادداشت کردووە ، کە
جێناوە لکاوەکان دەبن بە کارا و بەرکار و موزافوئیلەیهی و ، لەو
بارەیەوە نووسیویە :

« ضمیر متصل دەبی بە فاعل ، دەبی بە مفعول ، دەبی بە
مضاف الیە . مثال بو بونی بە فاعل . وکو –

( نوسیم ، نوسیت ، وادەنوسم ، وادەنوسیت ، دەخوینم ، دەخوینیت الخ )

مثال بو بونی بە مفعول . وکو -

( نوسیمی ، نوسیتی ، وا دەمنوسی ، وا دەتنوسی ، دەمنوسی ، دەتنوسی ... الخ )

مثال بو بونی بە مضاف الیە . وکو -

( دفترم ، قلمت ، کتیبی ، دفترمان ، قلمتان ، کتیبیان .) ... هتد » [19] .

مامۆستا تۆفیق وەهبیش بەسەر لەو بیرکردنەوەیەی ، کاکە وریا و ، (٥٧) ساڵ پێش بڵاوکردنەوەی نامیلکە سانیلکەکەی ، حەڤدە لاپەڕەی لەبارەی هەمان کێشەوە نووسیوە ، کە لە هەردوو ڕووی چۆنێتی و چەندێتییەوە بەسەر ئەوەی ئەودا دەشکێتەوە .

وەهبی بەگ لە ژێر سەرناوی « بۆتاوی کەسیی پێوەنووساو»دا (ل٨٥-١٠٢ )[20] بە دوور و درێژی لـــە جێناوە لکاوەکان دواوە و زۆربەی زۆری باسەکەی دەربارەی ئەرکەکانی جێناوی لکاوە ئەم نووسەرە کە بە پێی ئەرک جێناوە لکاوەکانی دیاریکردووە و بە گوێرەی ئەو چـــوار دەورە لێیـــان دواوە و

---

(١٩) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بغدا ، ١٩٢٨ ، ل ٣٠ - ٣١ .

(٢٠) تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جیزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .

چوار خشتەی داناوە .[٢١]

هەروەها مامۆستا نووری عەلی ئەمین و کەسانی دیش لەو کێشەیە دواون .

بێتو کاکە وریا نکوڵی لەمانە بکات ، ئەی دەبێ وەڵامی بۆ ئەوە چی بێ ، کە (١٠) ساڵ بەر لە بڵاوبوونەوەی نامیلکەکەی ئەو لە کتێبی « زمان و ئەدەبی کوردی - بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی »دا ، (٢٢) لاپەڕە دەربارەی ( ئەرکی جێناوی لکاو لە ڕستەدا ) نووسراوە[٢٢] و نموونە ساکارەکان و ئەرکە دیارەکانی هەردوو لایان وێکدەچن ... هەرچی نموونە نا سادەکان و حاڵەتە ئاڵۆزەکانیتی ، مامۆستا وریا خۆی لە قەرەیان نەداوە و ڕەنگە ئێستاش پەیان پێ نەبا و تێیان نەگا .

گەر ئەو برایە بۆ نیشاندانی ئەرکی دیار و ئاشکرای جێناوە لکاوکان چەند خەتێکی کێشابێ ، ئایا ئەمە ، ئەوە دەگەیەنێ ، پێشتر ئەرکی جێناوە لکاوەکان باس نەکرابێ و دەستنیشان نەکرابێ ؟... یان بەمە هەموو ئەوەی کراوە دەسڕێتەوە ؟... یاخود ئەوانی زوو دەچنە خانەی پەیڕەوی چاولێکەرییەوە ، ئەو وتەنی : شێوازە « لەقەکانی ڕێزمانی تەقلیدی »یەوە(ل٤) ... و ئەوی ئەویش « بە پێی پەیڕەوی گوێزانەوە » (ل٦)یە ؟...

---

(٢١) سەرنجڕاکێش ئەوەیە ، بەشێک لە نموونەکانی کاکە وریا و مامۆستا توفیق وەهبی وێکدەچن .

(٢٢) عەبدوڵلا شالی ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، د. ئەمین عەلی ، نووری عەلی ئەمین ، فەرەیدوون عەلی ئەمین ، عەلائەددین سەجادی ، کەمال مەحموود فەرەج ، ئەبووزەید مستەفا سندی - زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ، بەغدا ، ١٩٧٦ ل ٦٩-٩٠ .

چاک دەزانم کاکە وریا خراپ دەکا ، بەڵام تێناگەم چ پێویستی‌یێکی بەمەیە و دەبێ کەڵک و سوود؛ چێژ و تامی کاری ناڕەوا و دوور لە دەستپاکی و ڕاستگۆیی چی بێ ؟

بەڵێ باسێک نابینرێ لە نامیلکەکەی کاکە وریادا هەبێ و لەو سەرچاوانەی سەرەوەدا نەبێ . بەپێچەوانەشەوە ، گەلێ زانیاریی ورد لەو بەرهەمانەدا هەیە و لە کارەکەی ئەو برایەدا سێبەریشیان نییە ... جیاوازیی لێدوان لە کێشە وێکچووەکانی ئەوان و ئەم لەوەدایە ، نووسەرانی ئەو کتێبانە بە کوردی‌یێکی ڕەوان و شێوازێکی ئاسان خوێنەریان تێگەیاندووە ، بەڵام هەرچی کوردییەکەی مامۆستا وریایە ، مەگەر هەر خۆی تێی بگا و ، خەت و خشتە و نەخشەکانیشی وا بە کوێرانە وەرگرتووە ، تەواو تێکی داون .

لەبەر ئەوەی کرۆکی مەسەلەکە ، ئەو دیاردە ئاشکرایەیە ، نێدی ناکرێ گلەیی لە خوێنەر بکرێ لە لێدوانەکانی شاگردەکەی چۆمسکی نەگەن . ئەوەتە خۆی لە دێڕی (١-٣)ی پێشەکیی نامیلکەکەیدا نووسیویە : « هەندێ جار لە خوێنەران ئەبیستم کە بە ئاسانی لە هەندێ وتارە زمانەوانی‌یەکانم ناگەن ... هەشە ئەڵێ هیچیان لێ‌تێناگەم » (ل٣) .

قوتابخانە نوێکانی زمانەوانی تەمی لێکۆڵینەوەی قوتابخانەی چاولێکەری‌یان ڕەواندووەتەوە . بە شێوە و شێوازی ئاسانتر و ڕوونتر و ڕێکوپێکتر لە کێشەکان دواون . کەواتە وەڵامی کاکە وریا بۆ تێنەگەیشتنی خوێنەر لە نووسینەکانی ، ئەوە نییە ، کە دەڵێ : « هەر نووسینێ ... سەر بە هەچ بابەتێک بێ گەر زۆریە

توانی‌یان تی‌ی بگەن ئەوە هێشتا لە قۆناغی ( سرد ) و (سطحیەت ) دەرباز نەبووە ... » ( ل٣ ، د٨-.١ ) ، بەڵکو ئەوەیە ، کە بەندە لە سەرەوە باسی کردووە .

بەو پێوانەیەی ئەو ، دەبێ ( خشتەی مەندەلیڤ )و فەلسەفەی ئەرستۆ و ... دەیان کاری وا بەرز « لە قۆناغی (سرد)و (سطحیەت) دەرباز نەبوو »بن ... یاخود ، کە هەموو بێ هیچ تەگەرە و گیروگرفتێک لە لێکۆڵینەوە یەکجار زانستی‌یەکانی د. کەمال مەزهەر و د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ... ی خۆمان حاڵی دەبین ، ئەمە نیشانەی ساکاری و نەزانی‌یانە ؟ ...[٢٣] .

بە کورتی و بێ سێ‌ودوو تی‌نەگەیشتن لە نووسینەکانی کاکە وریا ، ئەو دوو هۆیەن ، کە لە سەرەوە ناوم بردوون .

بۆ هۆی یەکەم ، بەغوونە دەڵێم ، ئەو کە لە دوو دێڕی کۆتایی پێشەکی‌یەکەیدا بە کوردی‌یێکی وا ناڕەوان بنووسێ : « هەر کارێکیش هەر چەن بێ پلەی ڕەسەنایەتی ، تەواوکەری ئەوانی پێشوویەتی و هەنگاوێکە لە ڕێگای بی‌ێندا » (ل٦) ، ئەو باش دەرنەبڕینە بووەتە هۆی تی‌نەگەیشتنی خوێنەر ...

---

(٢٣) ناسیاوێکی کەم ئەوەزی کەسانی لالەپەتەرم هەیە ... جگە لە گێژی و زمانگرتنەکەی ، وشەش تێکدەشکێنێ ... بە ( بەلووعە) دەڵێ : ( بەعوولە ) و لە بریتی ئەوەی بڵێ ( مشزکام ) ، دەڵێ ( شەپزکام ) ...گەر جاری جاران بە زەحمەت لە یەکدوو وشەی تێدەگەیشتم ، بەڵام ئێستا ، کە چووەتە تەمەنەوە و ددانی لە دەمدا نەماوە . هەر هیچی لێ تی‌ناگەم ... ماڵی مامۆستا وریا و فەلسەفە نوێکەی ئاوابێ !... ئیتر بۆم ڕوونبووەوە ، ئەو ناشنایەم ، زانایێکی لوتکەیە و من لە گوێی گادا نوستبووم

له بەندی یەکەمی ئەو دەربڕینەدا ، ڕاست وایە دەستەواژەی «هەر چەن بێ » ، بخرێتە پاش « ڕەسەنایەتیی » - واتە ، بنووسرێ « هەر کارێکیش پلەی ڕەسەنایەتیی هەر چەن بێ » .
کورد ( دەریای بێ‌بن ) دەڵێ ، بەڵام کەی وەک کاکە وریا « ڕێگای بێ‌بن »ی وتووە ... لە کوردیدا ( ڕێگای نەبڕاوە ) ، ( ڕێگای دوور ) ، ( ڕێگای سەخت ) ، ( ڕێگای دژوار ) ... هەیە .

یاخود لە لاپەڕە (٢٢)دا هێلکاریی بۆ دوو ڕستەی « تۆ ئەوانت بۆ ئێمە نارد » و «من ئەوانم بۆ تۆ نارد » کردووە و ئەنجامەکەیانی وا هێناوەکەوە ، کە ئەوەی یەکەمیان دەبێت بە : «تۆ بۆت ناردنین» و ئەوی دووەمیشیان بە : «من بۆم ناردنیت» ... مەگەر منداڵێک تازە زمانی گرتبێ ڕستەی وا شێواو بە زاریدا بێت ... ڕاستی‌یەکەی کورد دەڵێ : (تۆ بۆمانت ناردن) ، ( من بۆتم ناردن ) .
لە لایێکی دیشەوە هێلکاری‌یەکانی ئەو ڕستەیەی بە هەڵە وێنە کێشاوە .

ئەوە فۆتۆکۆپیی یەکەمیان :




تۆ بۆت نارد - ن - ین

بەلام ڕاستەکەی ئەمەیە




تو بو - مان - ت نارد - ن

فەرموون ئەویش فۆتوکۆپیی دووەمیان :




من بۆ ـ م نارد ـ ن ـ یت

کە دەبێ بەم چەشنە بێ :




من بۆ – ت – م نارد–ن

بەڵێ ئەمەیە تێگەیشتنی مامۆستا وریا لە قوتابخانەی چۆمسکی ... ئەلحەق ناشی نەزان خوا دەیگێرێ و واش پێدەچێ بەخت ڕاست بێ ... ئەوەتە هەندێ ڕووناکبیری کورد بێ‌ئەوەی لە هێڵکارییەکانی وردببنەوە ، پێیان وایە ، کاری گەورەی ئەنجامداوە ... بەداخەوە ، نازانن چ قوڕێکی بۆ زمانی کوردی گرتووەتەوە .

لە لاپەڕە ( ١٦ -١٧ )دا ، کە ڕستەی « ئێمە تۆ بۆ ئەو ئەنێرین »ی بە جێناوی لکاو دەربڕیوە ، ڕاست دوو حاڵەتی : «ئێمە بۆ ئەوت ئەنێرین »و « ئیمە تۆی بۆ ئەنێرین»ی یادداشت کردووە ، بەڵام گەر لە هەر کوردێکی بپرسیایە ، پێی دەوت ، کە ( ئێمە بوتی ئەنێرین )یش ، نەک هەر هەیە ، بەڵکو لەوانەی ئەو ناوی بردوون ، پتریش بەکاردێنرێ .

لە گۆڕینی ڕستەی « ئەوان منیان بۆ تۆ نارد »یشدا ، گەرچی « ئەوان بۆ تۆیان ناردم »و « ئەوان منیان بۆ تۆ نارد »ی باش دیاریکردووە ( ل١٧-١٨) ، بەڵام خراپ نییە ، بزانێ ، کە کورد ( ئەوان بۆتیان ناردم )و ( ئەوان منیان بۆت نارد )یش دەڵێ .

بۆ ڕستەی « تۆ ئوتومبیلەکەی منت فرۆشت »[٢٤] ، تەنیا « تۆ ئوتومبیللەکەت فرۆشتم »ی[٢٥] داناوە و پەنای بۆ کەسێک نەبردووە ، تا پێی بڵێ ( ئوتومبیلەکەمت فرۆشت )یش

(٢٤) ( فرۆشت ) ، نەک کاکە وریا وتەنی ( فرۆشت ) .

(٢٥) (ئوتومبیللەکەمت ؛ هەڵەیە و ، ڕاستەکەی ( ئوتومبیلەکەت )ە - واتە بە یەک ( لام) دەنووسرێ ... (.)ی (فرۆشت)یش قەڵەو نییە و لاوازە .

هەیە.

... هتد .

بۆ هۆی دووەمیش ، ئەوەتە لە کتێبی « زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی »دا بە ڕوونی وتراوە ، گەر نموونەی وەک ( ئێوە ئێمە - تان نارد ) بە جێناوی لکاو دەربڕرێ ، دەبێتە ( ئە - تان - نارد - ین )و ئەوەش یادداشت کراوە ، کە (تان) - (کارا)یە و ، (ین) - (بەرکار)ە ... و چ گۆڕانێکیش هاتووەتە ئاراوە ( بڕوانە : ل ٧٥-٧٨) ... ئیتر ئەمە بۆ بە لێکدانەوە « لەقەکانی ڕێزمانی تەقلیدی » دابنرێ و هێڵکاری‌یە وەرگیراوەکەی لاپەڕە (٢٤)ی مامۆستا وریاش ، کە لە خوارەوە فۆتۆکۆپی‌یەکەی دەخەینە پێش چاو ، ئەوپەڕی زانست بێ ؟




ئە ـ تان ـ نارد ـ ین

ئەوەتە کاکە وریا نەک هیچی زیادی نەخستووەتە سەر ئەو خەرمانە ، بەڵکو گڕیشی تێبەرداوە .

☆ ☆ ☆

ئێستاش سەرنج بۆ سێ لایەنی سەرسوڕهێنی هەندێ لەو باسانەی مامۆستا وریا لەبارەی جێناوی لکاوەوە بڵاوی‌کردوونەتەوە، ڕادەکێشم :

١- مامۆستا وریا تا ساڵی ١٩٨٦ جێناوە لکاوەکانی بە سێ دەستە دانابوو(٢٦) ... دواتر کە تێگەیشت سێ دەستە نین و دوون، بە بێ‌دەنگی و بێ پێ لە هەڵەی خۆ نان ، گەڕاوەتەوە سەر ئەوەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی دەیان ساڵ بەر لەو دیاری‌یان کردبوو ، کە ئەویش دوو دەستە جێناوی لکاون . ئەوەتە ساڵی ١٩٨٧ لە وتاری « ڕێزمانی ڕاناو - هەندێ شی‌کردنەوەی مۆرفۆلۆجی »دا(٢٧) و چەند مانگێکیش لەمەوبەر لەو نووسینەیدا، کە بە ناوی « پاشبەندی /ی/ لە ڕەخنەی نارەخنەدا »وە(٢٨) بڵاوی‌کردووەتەوە ، کردوونی‌یە دوو دەستە ...

---

(٢٦) بە وێنە ، بڕوانە :

أ- د. وریا عمر امین ، ڕاناو لە کرمانجیی خوارووودا ، ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، ژ٦١٦ ، ١٩٨١/١٢/١٧ ، ل ٦ .

ب- د. وریا عمر امین ، ڕێزمانی ڕاناوی لکاو،گۆڤاری « کاروان » ، ژ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٦٨ .

ج- وریا عمر امین ،ڕێزمانی ڕاناوی لکاو ، بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل٨ .

(٢٧) د. وریا عمر امین ، ڕێزمانی ڕاناو - هەندێ شی‌کردنەوەی مۆرفۆلۆجی ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ ، ل ١١٥ ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل ١٩٣ .

(٢٨) وریا عمر امین ، پاشبەندی / ی / لە ڕەخنەی نارەخنەدا ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ١٤٢ ، بەغدا ، ١٩٩٨ ، ل١٥ .

ئەو کە دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکان : (م) ، (ی/یت)، (Ø ،ی/ێت ، ا/ا ت ) ، (ین) ، (ن) ، (ن)ی کردبووە دوو بەش و بەمە بووبوونە سێ کۆمەڵ ، تووشی هەڵەیێکی زمانەوانیی گەورە هاتبوو ... چونکە ئەو گرووپی دووەمەی ئەو بە دوو پۆلی دانابوون ، هەر یەک کۆمەڵن و تەنیا کەسی سێیەمی تاکی بە یەک شێوە خۆی نانوێنێ .

خاوەنی ئەو ڕا نابەجێیە ، کە بۆ پاساوی ئەم کارە نادروستەی لە لاپەڕە (٨)ی نامیلکەی « ڕێزمانی ڕاناوی لکاو »دا نووسیویە : « هەر چەندە جیاوازیی کۆمەڵی (2 ) و (1) تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدایە . بۆ مەبەستی شیکردنەوە جیایان ئەکەینەوە » ، پتر خۆی خستووەتە هەڵەوە . گەر بە پێی ئەو پێوانەیە بێ ، ئەوە دەبێ ، دەستەی دوومی جێناوە لکاوەکان نەکرێن بە دوو کۆمەڵ ، بەڵکو بە سێ‌چوار تاقم ، چونکە لە کەسی سێیەمی تاکدا بە چەند شێوەیێک ( Ø . ا/ات ، ێ/ێت) خۆی دەنوێنێ .

٢- کاکە وریا نە لە خشتەی جێناوە لکاوەکانی ئەو نامیلکەیەیدا و ، نە لـە خشتەی بەرهەمەکـانی دیبدا ، لەتەک ( ێت)دا (ێ)ی دانەناوە و لەپاڵ (ات)یشدا (ا)ی نەنووسیوە . لەم بارەیەوە پەنجە بۆ سێ ڕاستی ڕادەکێشم :

أ- ئاشکرا دیارە ، مامۆستا وریا پەلەی بووە و هەر هێندە فریاکەوتووە لە یەک‌دوو لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە ، لە نێو شێوەکانی جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکدا ، تەنیا (ێت)و (ات) وەربگرێ . چونکە گەر ئاوڕی لە سەرجەمی سەرچاوەکانی ئەو باسە بدایەتەوە ، بوی دەردەکەوت ، کە زۆربەی نووسەرانی ڕێزمانی کوردی ، لەتەک (ێت)و (ات)دا ، (ێ)و (ا)شیان یادداشت کردووە .

بۆ نموونە :

مامۆستا سەعید صدقی کابان لەبارەی ئەو جێناوە لکاوانەوە ، کە دەچنە سەر کرداری ڕانەبوردووی تێنەپەڕ ، نووسیویە : « ... (یْ) بۆ مفرد غائب لە بعضی فیعلا (الف) وکو ( دەخوا ، دەڕوا ... »[29] .

لە کتێبی « دەستووری زمانی کوردی »ی مامۆستا تۆفیق وەهبی[30] ، و « ڕێزمانی کوردی »ی مامۆستا نووری عەلی ئەمیندا[31] (یْ/یت) و (ا/ات) بۆ کەسی سێیەمی تاکی دەستەی دووەمی جێناوە لکاوەکان دانراون .

مامۆستا مەسعوود محەممەد وای لێکداوەتەوە ، کە لە وشەکانی ( دەچێت ، دەنووسێت )دا ، (ت)ی دوای (یْ) زیادەی گەردانی‌یە و جێناوەکە (یْ)یە[32] .

د. مەکەنزی باسی (یْ/یت)ی کردووە[33] ، د. جۆیس بلۆش لە (یْ/یت ، ا/ ات) دواوە[34] .

... و گەلێکی دی[35] .

---

(٢٩) سەرچاوەی ناوبراو ، مختصر صرف ونحوی کوردی ، ل ٢٩ .

(٣٠) سەرچاوەی ناوبراو ، دەستووری زمانی کوردی ، ل ٩٢-٩٦ .

(٣١) نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٩٣ .

(٣٢) مەسعوود محەممەد ، سووڕێکی خامە بە دەوری ( ڕاناو )دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب٢ ، ژ١ ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل ١١٢ .

(33) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961, P. 172 .

(34) Joyce Blau, Manue De Kurde, Paris, 1980. P. 52 .

(٣٥) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو لەبارەی ئەو جێناوە لکاوانەوە ، بڕوانە :

د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم - ( وشەسازی) ، بەشی دووەم - ( جێناو ) ، بەغدا ، ١٩٨٧ ، ل١٩-٧١ .

ب- لەبەر ئەوەی ، ئەو برایەم دڵسۆزی زمانەکەی نییە و لە پێناوی ساخکردنەوەی یاسا و دەستوورەکانیدا ئامادە نییە خۆی ماندوو بکا ، بۆیە نەک هەر بە هیچ چەشنێک توخنی باسی مێژوویی و بەراوردی ناکەوێ ، بەڵکو دژیشیان دەوەستێ . دەنا لەو باوەڕەدام ، باش ئەوە دەزانێ ، کە گەلێ لە گرێکوێرەکانی زمانی کوردی لەو ڕێیانەوە دەرەوێنرێتەوە .

ئەوەتە ، گەر زۆر دووریش نەڕۆین و پێمان نەکرێ بچینە نێو تێکستەکانی ئاوێستا و پەهلەوی و زمانانی ئەمڕۆی ئێرانیەوە ، خۆ دەتوانین ئاوڕێک لە نووسینە کوردییەکانی دووسێ سەدەی پێش ئێستا بدەینەوە و بزانین ئەو جێناوە لکاوە کەسیە ، چی بووە ، چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە ... بۆ ئاسانکردنی ئەمەشیان ، تەنیا چاوخشتاندنێک بە لاپەڕەکانی (١٢٨-١٣٨)ی کتێبی « ڕێزمانی کوردی - جێناو »دا[٣٦] ، شێوەی ڕاستی ئەو جێناوەمان لێ ئاشکرا دەکا .

ج- بێتو مامۆستا وریا لە ئاخاوتن و نووسینی خۆی وردبوایەتەوە ، ئەوە تێدەگەیشت ، کە شێوەی (ێ)و (ا)ش ، نەک هەر ڕەسەنترن ، بەڵکو خۆیشی یەکجار زیاتر لە (ێت)و (ات) بەکاریان دێنێ . بۆ نموونە ، ئەوەتە لە تێکستی نامیلکەی ( ڕێزمانی ڕاناوی لکاو )یدا دەوروبەری شەست کرداری وای تۆمارکردووە ، کە دەبێ جێناوی کەسی سێیەمی تاکیان (ێ/ێت) وەربگرن و لە نێوانیاندا تەنیا بۆ دوانیان (ێت)ی نووسیوە و سەرپاکی ئەوانی دی بە (ێ) کۆتایی هێناوە - واتە تەنیا لە دێڕی (٦١)ی لاپەڕە (١٧)دا (ئەکرێت)و لە دێڕی (٩)ی لاپەڕە

---

(٣٦) هەمان سەرچاوە

(٢٣)دا (ئەبێت) بەرچاو دەکەون... هەرچی ئەوانی دین ، بەم چەشنەن :

| کردار | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|
| ئەیانەوێ | ٣ | ٢٠ |
| دەرئەکەوێ | ١٠ | ١١ |
| وەرگیرێ | ١١ | ٩ |
| ئەلکێنرێ | ١١ | ١١ |
| وەربگیرێ | ١١ | ١٧ |
| ئەگۆڕێ | ١٢ | ٣ |
| ئەلکێ | ١٢ | ٥ |
| ئەلکێ | ١٢ | ٨ |
| ئەبێ | ١٢ | ١٠ |
| ئەبێ | ١٣ | ١٣ |
| ئەلکێ | ١٣ | ١٥ |
| ئەلکێ | ١٣ | ١٧ |
| ئەبێ | ١٤ | ٩ |
| ئەبینێ | ١٥ | ١ |
| ئەبینێ | ١٥ | ١٤ |
| جێگیرئەکرێ | ١٥ | ١٦ |
| هەلئەبژێررێ | ١٥ | ١٧ |
| دەس‌نیشان ئەکرێ | ١٥ | ١٩ |
| ئەکرێ | ١٦ | ٩ |
| ئەلکێ | ١٦ | ١٢ |
| ئاوای‌لێ‌دێ | ١٦ | ١٥ |

........

له لاپەڕە (١٩)دا ، له دیْر و نیوێکدا سێ کرداری بەو چەشنە نووسیوه :

« ... به بەرکاری راستەوخۆوه ئەبینیْ دوای لاچوونی ناوی خاوەن دەورەکەی نامێنیْ و لائەچیْ » (د ٧-٨) .

٣- به تەنگەوه نەهاتن و بێسەلیقەیی بووەته هۆی ئەوی ، له خشتەی وتاری « ڕیزمانی ڕاناو - هەندێ شیکردنەوەی مۆرفۆلۆجی »دا ، حاڵەتی دەرنەکەوتنی جیْناو لەبیر بکات .

– ماوێتی –

## شیرەبەفرینە

لە نیوەی دووەمی ساڵانی هەشتادا ، مامۆستا حەمە شوان ڕەسووڵ چەندین جار بە زمانە شیرینە پاراوەکەی گلەیی و گازندەی ئەوەی لە لا کردووم ، کە کاکە وریا دەستپاک و ڕاستگۆ و ئەمین نییە و ، نووسینەکانی جێی متمانە و بڕوا نین .. واشی ڕادەگەیاند و بە گوێیدا دەدام ، کە وتارێکی پەنجا لاپەڕەیی دەربارەی ناڕەوایی و نابەجێیی کارەکانی نووسیوە .

ماوێک لەمەوبەر دەستنووسی ئەو وتارەم دەستکەوت .. لەبەر ئەوەی ئێستاکە و لێرەدا مەودای ئەوە نییە ، سەرجەمی ئەو ڕەخنەیەی بخەمە بەر دیدەی خوێنەران ، بۆیە جارێ تەنیا بەرکوڵ و نۆبەرەیێکی بڵاودەکەمەوە ، کە ئەویش بریتییە لە بەیەکگرتن و بەرانبەر یەکدی دانانی بەشێکی وتاری «دەربارەی زمانی دروستکراو»ی کاکە وریا[1] لەگەڵ لاپەڕە (١٦٣ - ١٦٦)ی کتێبی «أصوات وإشارات»ی أ. کوندراتۆڤدا[2] ....[3] .

---

(١) د . وریا عومەر ئەمین ، دەربارەی زمانی دروستکراو ، ڕۆژنامەی (عیراق) ، ١٩٨٦/١/٨ ، ل ٧ .

(٢) أ . كوندراتوف ، أصوات وإشارات - دراسة في علم اللغة ، نقله عن الانكليزية : ادور يوحنا ، بغداد ، ١٩٧١ .

(٣) لە بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەماندا هەوڵدەدەین ، ئەو بەشەی وتارەکەی کاکە حەمە شوان پێشکەش بکەین ، کە بە ناوی - «وتارێک بە دوو ناونیشانی جیاواز»ەوەیە.

گەر کاکە وریا جاری پێشوو پێی کرابێ ، مامۆستا فەتتاحی مامەی بەسزمان و بەلەنگاز بخەڵەتێنێ و تەفرە بدا ، خۆ ئێستاکە ناشێ گڵکۆی أ. کۆندراتۆڤ هەڵداتەوە و بە ئێسک و پروسکی نامەیێکی لەو چەشنە هەڵبەستراو بهۆنێتەوە .. یاخود ئەو سڵنەکاتەوە و بێپەروا بە زمانەوانانی کوردی وتبێ : «هەموو ئەوان لە منیان وەرگرتووە»، خۆ هەنووکە ناکرێ بفەرمووێ (کۆندراتۆڤ)ی ڕووسیش (کە ساڵی ١٩٧١ کتێبەکەی لە ئینگلیزیەوە کراوەتە عەرەبی) لە منی وەرگرتووە ..

مامۆستا وریا ، کە بە کەرەستەی کتێبی «أصوات وإشارات» ئەو وتارەی - «دەربارەی زمانی دروستکراو»ی ئامادەکردبێ و ڕۆنابێ، بە لایەنی کەمەوە ، دەبوو پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشێ ، کە بۆ نووسینی ئەم کارەی ، کەڵک و سوودی لە فڵانە بەرهەم وەرگرتووە .. جا لەبەر ئەوەی دەستپاک نییە ، ئەو ڕاستییەی شاردووەتەوە .. ئەو کەرەستە و لێکۆڵینەوەیەی کۆندراتۆڤ بە هەوڵ و تەقەلای بێوچانی چەندین ساڵ خڕیکردووەتەوە و ئەنجامی لێهەڵهێنجاوە ، بێباکانە دەستی بەسەردا گرتووە و هێندە کورتبین بووە ، بیری لەوە نەکردووەتەوە ، ڕۆژێک لە ڕۆژان جار لە کردەوەی ناپەسەندی دەدرێ .

ئەو برایەمان ، کە لە پێناوی وەدیهێنانی کام و ئارەزووی خۆپەسنی و خۆهەڵکێشاندا ئەو کارە دەکا ، دەبێ بزانێ ، نە بە فڕوفێڵی ئەو ناوی مەزنی زانایان کوێردەبێتەوە و ، نە بە هاژوهووژی تەلاری باڵایان هەرەس دێنێ و ، خۆیشی بەوە زل دەبێ واتە مەرامی نارەوای نایەتەدی و تەنیا ناوی خۆی دەزڕێنێ و سنعەتەکەی ڕەزیل دەکا . کورد وتەنیش «هەرچی لە دیزەدا بێ ، بە ئەسکوێ دەردێ».

دیاره توان و تابشت ؛ یارا و بەهرە ؛ کارامەیی و لێهاتوویی خۆرت و لاوی کورد بە کەم دادەنێ و پێی وایە بێ‌تەزموونن و هەرچییەک ئەو بیڵێ بە ئنجیلی دەزانن .. نەخێر، ئەوەی نوێ «موو و ، ماست لێک دەکاتەوە ».. بەوێنە ، ئەوەتە کاکە حەمە شوان کە هێشتا لە تەمەنی ۲۰ - ۲۵ ساڵاندا بوو و لە بەشی فەلسەفە (نەک زمانــی کوردی) دەیخوێند ، لەمەڕ هەڵپە و تەماحی مامۆستا وریا قەڵەمی وەگەڕ خستبوو .

دەبا ئێستاکە خوێنەر خۆی سەرپشک و حەکەم بێ و ، ئەوەش فۆتۆکۆپی دەقی هەندێ بەندی ، هەردوو وتار :



دکتـور وریـا عـلی امـین

له سالی ١٨٧٠ دا قەشەیەکی پیری کاسۆلیکیی سەر بە گوندیکی وولاتی بەقاریا ناوی جۆهان مارتن شلایشەر بوو ، دراوسی یەکی ئەبی .. ئەم دراوسی یەی نامەییک بۆ کورپکی ، کە لە دوور وولاتا ئەژی ، ئەنیری . دوای ماوەیەك نامەکەی بۆ ئەگەرپتەوە چونکە لەو وولاتەی کورەکەی تیا بوو کەسی نەبوو زمانی ئەلەمانی بزانی و بتوانی ناو و نیشانەکە بخوینیتەوە .. بۆیە نامەکە نەگەیشت و گەرایەوە .

# أصوات وإشارات

## دراسة في علم اللغة

تأليف

أ . كوندراتوف

نقله عن الانكليزية

ادور يوحنا

في منتصف عام ١٨٧٠ كان أسقفا كاثوليكيا يسمى جوهان مارتن شلير يعيش في قرية بهادئة نائية وقد اختمرت في ذهنه فكرة لغة كتابية موحدة كرد فعل لرسالة احد جيرانه المرسله الى ولده في امريكا والتي كانت قد اعيدت اليه بعبارة غير مفهومة . كيف يتوقع لعلاج بسيط الالمام باللغة الانكليزية .

ئەم ڕووداوە کاری لە شلایشەر

کرد و وای لێ کرد بیر لە دانانی ئەلف و بێیەکی جیهانی بکاتەوە هەموو زمانێکی پێ بنووسرێتەوە . هەچ شتێ بە هەچ زمانێ بنووسرێ لە هەموو شوێنێکا بخوێنرێتەوە .

ئەم پێشنیارەی خستە قالبێکی ئاینییەوە و ووتی چۆن هەموو جیهان پێویستی بە بڕوایەکی یەکگرتووە .. ئاواش پێویستی بە ئەلف و بێیەکی یەکگرتووە .

شلایشەر لەم پرۆژەیەیدا زیاتر ڕۆیی و لەساڵی ١٨٧٩دا نەك ئەلف و بێیەکی جیهانیکی بەڵکو زمانێکی جیهانیی دامەزراند ناوینا ڤۆلاپووك .

ڕێزمانەکەی بە جۆرێ دانا هیچ ناوێزەکی تیدا نەبێ .. ووشەکان چۆن ئەنووسران ئاواش ئەخوێنرانەوە . نەبرە هەمیشە لەسەر دوا برگەی ووشەدا بوو .. زۆربەی زۆری ووشەکانی لە ڕەگی ووشەکانی زمانە ئەوروپییەکانەوە وەرگرت دوای شێواندنیان . بۆ نموونە لە ( World ـ جیهان و Speak قسە ) ی ئینگلیزییەوە ( vol و puk ) ی وەرگرت .. لەم دوو ووشانەوەش ناوی زمانەکەی داڕشت Volapuk واتا زمانی جیهانی .

کەنیسەی کاسۆلیکی بە پەرۆشەوە یارمەتیی شلایشەری دا و پشتیوانیی ئەم پرۆژەیەی کرد .. کۆمەڵەیێك دامەزێنرا بۆ لێکۆڵینەوە و بلاو کردنەوەی زمانی ڤۆلاپوك .. کۆنگرەی بۆ بەسترا .. کۆمەڵەی ڤۆلاپوك ناوی نرا ئەکادیمیای ڤۆلاپوك ..

كانت فكرة شلير تكوين ( الف باء عالمية ) قادرة على رسم أصوات جميع لغات العالم • كان شلير كاثوليكيا متحمسا لذا فعندما نشر مشروعه المسمى ( الالف باء العالمية ) جسد مفهومه فيما يلي ( ان اوربا المسيحية بحاجة الى الف باء موحدة بقدر ما هي بحاجة الى ايمان موحد • )

ان عزيمة هذا القس لم تثبط ولم يكف عن العمل رغم استمرار اوربا في استعمال الالف باء الاعتيادية دون الف بائه • وفي عام ١٨٧٩ اخرج لغته المعروفة فولابوك •

واللغة الاصطناعية هذه كانت خالية من الشواذ • فالكلمات كانت تلفظ مثلما تكتب وان النبر كان في كل الاحوال يقع على المقطع الاخير • ان اغلب مفرداتها كانت تتكون بصورة رئيسة من جذور انكليزية اضافة الى كلمات المانية ولاتينية وفرنسية غير ان الكلمات كانت قد شوهت اكثر مما تتصور فالعالم كان يسمى (Vol)(من كلمة "World" الانكليزية) واللغة (Pük) (من كلمة "Speak" الانكليزية) • ومن هاتين الكلمتين نحت كلمة (Volapük) أي اللغة العالمية • وحتى أسماء المدن كانت قد حورت فسميت Bodugan و Portugal .

والكنيسة الكاثوليكية قد ساندت هذه اللغة الجديدة بحماس وشكلت جمعية لدراسة ونشر اللغة وبعدها دعي الى عقد مؤتمر لها • ان الكنيسة ساعدت على انتشار الفولابوك في العديد من الاقطار الاوربية والامريكية • وقد تحولت جمعية الفولابوك الى نظام فروسي شاق يقف على رأسه شلير نفسه •

زۆری پێ نەچوو ئەم کۆمەڵەیە دژی شلایشەر هەڵگەڕایەوە .. شلایشەر بێ شەرعیەتی ئەم کۆمەڵەیەی ڕاگەیاند و یەکێکی نوێی دامەزراندەوە لقی بۆ لە هەموو وڵات و شارێکی ئەوروپی یا دانا

---

لە ساڵی ١٨٩٩ بنکەکانی کۆمەڵەی ڤولاپوك بوو بە ( ٢٨٣ ) . ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی بەم زمانە دەرئەچوون بوو بە ( ٢٥ ) . زیاتر لە هەزار مامۆستا و مختص کەوتنە پروپاگەندە کردن و بڵاو کردنەوەی ئەم زمانە .. سەدەها کتێب و بڵاوکراوە بەم زمانە دەرچوو ..

لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵدان و ئەرك کێشانە .. پرۆژەی ڤولاپوك سەری نەگرت .. شلایشەر خەتای ئەم سەرنەگرتنەی خستە ئوباڵ ئەو هاوڕێیانەی لەبەر هۆی شخصی بوونە تەگەرە و نەیانهێشت پرۆژەکەی سەرکەوێ .

لە ساڵی ١٩١٢ دامەزرێنەری ڤولاپوك شلایشەر مرد .. لەگەڵ مردنیا مەسەلەی ڤولاپوکیش پشتگوێ خرا .

بەناوبانگترین زمانی دروست کراو ئەوەیە بە ئەسپیرانتۆ ناو ئەبرێ .

زمانەوانی پۆلۆنی لویس زامنهوف لە ساڵی ١٨٨٧ ئەم زمانەی داهێنا ..

ن جمعية الفولابوكيين Volapükisis التي كانت تسمى بأكاديمية فولابوك سرعان ما اصطدمت بآراء شلير نفسه ( ضمت الجمعية عددا كبيرا من اللغويين المجدين الذي كانوا في البداية من المتحمسين لفكرة معه العملية ) . ثم اعلن شلير حل الجمعية وتشكيل جمعية اخرى .

وبحلول سنة ١٨٩٩ كانت هنالك ٢٨٣ جمعية مختلفة منهمكة في دراسة الفولابوك الى جانب ٢٥ مجلة تنشر في اللغة نفسها . ثم ان اكثر من الف مدرس من حملة الشهادات كانوا يروجون دون كلل لهذه اللغة الجديدة التي بدأت تخرج المئات من الكتب والكراريس . وأخيرا خفت الموجة .

ان الكثير أبدوا استياءهم من هذه اللغة المضحكة التي لم تمت بأية صلة مشتركة الى لغات العالم الحية الاخرى . وفي مطلع هذا القرن اصبحت الدعوة اليها في حالة من السكون الفعلي التام .

لقد اعتبر شلير كافة الذين خانوا بنت أفكاره ( الفولابوك ) من المسيئين الى شخصه . ورغم كل ذلك ارتفع عدد المرتدين . ان العاطفة التقليدية « لرجال العالم المثقفين » ( الذين قال شلير نفسه ان لغته قد كرمت لهم ) قد ماتت وبعدئذ وفي عام ١٩١٢ مات خالق الفولابوك نفسه .

قد يبدو ان المخرج من فوضى الفولابوك جاء في عام ١٨٨٧ عندما عرض الدكتور لازاروس زامينهوف الهولندي لغته العالمية المسماة الاسبرانتو

مرۆ چەند هێمن و هێدی و هێور ؛ ئارام و نەرم و نیان ؛ دڵسۆز و دڵفراوان ؛ پشوودرێژ و خوددار و خۆڕاگر .. بێ ، بەڵام کە ماوەیێکی دوور و درێژ ئامۆژگاری و ڕاوێژی هاوڕێ و هاوکارێکی ؛ ئاوەڵ و ئامپاییێکی یەکجار نێزیك و فرە دەلال و خۆشەویستی زرنگ و زیرەکی ؛ بەتوان و توانستی بکا ، واز لە دەبە و گزی ؛ فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی بێنێ ... کەچی ئەویش ، نەك هەر دەستی لێ هەڵنەگرێ ، بەڵکو ڕۆژ دوای ڕۆژ تا دێ زیاد و زیادتری بکا و پەرە و برەوی پێبدا و ، شێوە و شێوازی نوێی بۆ بدۆزێتەوە ... ئێدی بێزمانیش بێ ، دێیتە زمان ... دیارە هۆی ئەو نەگۆڕانەش ، هەر ئەوەیە (( ئاوی شیرین لە گڵی سوێر دەرناچێ )).

من لێتان ناشارمەوە و ئێوەش گلەییم لێمەکەن ... پتر لە بیست ساڵ هەوڵ و کۆششی زۆر و زەوەندی بێوچان و بەردەوامم لەگەڵ مامۆستا وریا عومەر ئەمین دا ، ئەو ڕێگە چەوت و چەوێڵ و خواروخێچەی بەردا .. بەڵام ، گەر ڕاستتان دەوی . ئەو ماندووبوونەم ، نەك هیچ بەروبوومێکی نەبوو ، بەڵکو تەواوی ڕەنجیشم بە زایە و فیڕۆچوو ... بەڵێ ، من نەمدەزانی (( دڕك ترێ ناگرێ ))...

با نهێنی و پەنامەکی نەبێ ... من کۆڵم نەدا و دەستم نەکێشایەوە ... بۆ ئەوەی هەرچۆنێ بێ بیهێنمە سەر ڕێی ڕاست ، کەوتمە سەر ئەوەی بە نووسین و ڕەخنە تەکانی پێ بدەم ، تا لەم ڕێگەیەوە لە کاری نادروست و ناڕەوا دایبڕم و دووری بخەمەوە ... ئەوە بوو زنجیرە وتارێکم لەمەڕ کار و کردەوە و هەڵسوکەوتییەوە نووسی ... برادەرانی سانسۆری ڕێیان لە چاپدانی ئەو نووسینەم گرت ... هاوڕێیانی هەولێر و سلێمانێم ، هەزار جار ماڵیان ئاوابێ ، دوو بەرگیان بۆ لێ چاپکردم ...

ماوەی سالێك لەمەوبەر ، كە بەرگی سێیەم لە چاپ بوو ، هەوالیان دامێ ، كاكە وریا تووشی نەخۆشییەكی قورس و سەختی زراو بووە و لە نەخۆشخانە كەوتووە ... بێ دوودلی و بەپەلە و هەلەداوان چوومە نەخۆشخانە ... خۆشبەختانە كاركێڕانی ئەو سازمانە بە مژدە و مزگێنیی چاك‌بوونەوە و چوونە دەرێ ، دلیان خۆش كردم . هەر ئەو ڕۆژە دەستنووسی بەرگی سێیەمی كتێبەكەشم لە چاپخانە وەرگرتەوە ...

مامۆستا وریا بە چەند هەفتەیێك بەر لە نەخۆشییەكەی لە پاداشت و چاكە و قەرەبووی ئەو هەموو ڕاژە سەخت و ئەركە گرانەم ، كۆمەلێك جوێن و دژون ؛ درۆ و دەلەسە ؛ تانە و تۆمەت ... ی بۆ هەلبەستووم و لە چەند لاپەڕەییێكی تایپ كراودا بلاوی‌كردووەتەوە ... بە ئەقلێ و خەیالی خاوی خۆیشی كە خوێنەر ئەو (بوختاننامە )یە بە كردەوەی ئەو نەزانێ و نەناسێتەوە و لۆمەی نەكا ، ناوی خۆی لەسەر نەنووسیوە و داویشێتە كوردیزانیك دەستی بۆ پێدابێنێ و بۆی بڕازێنێتەوە ... كورد دەلێ : (( دار هەلبڕە سەگی دز دیارە )) .

پاش ئەو هەموو كەین وبەین و ئاین و ئۆینەشی ، دوو مانگێك لەمەوبەر ، كە نۆژدارییان بۆ كرد ، د. كەمال مەزهەری براگەورەم ئەو هەوالەی پێڕاگەیاندم و پێیوتم : دەلێی چی سەرێكی لێبدەین ... دیسان بێچەندوچوون ، یەكەندەردوو وتم : زۆر باشە ... و چووینە خزمەتی ... بەدل تێر ئەملاوئەولایم ماچ كرد ... شاد و دلخۆشم ، كە ئێستاكە باری تەندروستیی باشە و بە هیوا و هومێدم لە نەخۆشی و ناخۆشی بە دووربێ ...

ئەمڕۆ پشت بە ساغ و سەلامەتیی كاكە وریا و بایەخدان بە بەجێهێنانی داوا و خوازی ، كە ڕوونكردنەوە و وەلامی لێم دەوێ ، دەخەمە سەرچاوان و دلی‌ناشكێنم و ناڕەنجێنم ... بەلام بەر لەوەی بێمە

سەر وەدیهێنانی داواکاری و داخوازییەکانی ، وا بە باش دەزانم ، سەرنجی خوێنەر بۆ چەند خاڵێکی زەق و زۆپ ڕابکێشم :

١ـ کەسێك تەمەنی لە پەنجا ساڵ بەرەوژوور بێ ؛ خوێندەوار و پرۆفیسۆر بێ ؛ لە شارە پیرۆزەکەی حاجی قادری کۆیی هاتبێتە دنیاوە ؛ وەچەی بنەماڵەیێکی ناوداری شاری تێکۆشەری منارە و قەڵات بێ ؛ کورد بێ و لە وڵاتێکی پێشکەوتووی وەك ئینگلتەرە خوێندبێتی ... ( بوختاننامە )یێك بڵاوبکاتەوە و ناوی خۆی لەسەر نەنووسێ ، ئەویش لەبەر شەرم و ئابڕووتکان بێ ؛ یان بوودەڵەیی و ترسنۆکی ؛ یان لۆمە و تانەی خەڵکی ؛ یان ... یان ... ئێدی دەبێ کێش و سەنگ ؛ ئاست و ڕادەی ئەو کەسە چەند و چۆن بێ ؟ ... لەو ڕایەدام ، تەنانەت زوربەی کەسانی خوێڕی و بەرەڵلاّ و بێحورمەتیش هێندە شەرم و شکۆ شك دەبەن ، خۆیان لەو شێوازە لە سنووربەدەرە نزم و نەوییە نەدەن و بپارێزن ... ڕاستە ((پەرژین بۆ حەلاّلزادەیە)) و ((حەیا باریکردووە)) ... بۆ ئەمە ، بەدڵ گلەیی لە م . وریا دەکەم ، چونکە بە ناونەبردنی خۆی کارێکی کردووە ، دوور لە گشت داب و نەریتێکی کوردانە و زانستانە ...

٢ـ ئەوەی وتوویە و گێڕاوێتەوە ، سەرجەم و سەرپاکی درۆن و هەڵی بەستوون و هۆنیونیەتەوە و هیچی ڕاستیان تێدا نابینرێ ... تەنانەت هەندێ باسی چاك و پڕ شکۆ ، کە دۆست و برادەران سەبارەت بەندە کردوویانە ، هەڵگێڕاوەتەوە و شێواندوونی ... چ خەمم بەوە نییە ، م . وریا لە بەرانبەر من هێندە بێباك بێ ، چونکە لە مێژە ئاشنا و بەڵەدی ئەتوار و ڕەوشت و کردەوەی جوانیم ... چاکیش دەزانم ، تا ئەو ڕادەیە چاوقایمە و دەڵێی (( بەردی ئاوەسووە )) ، لە بەردەم ئەو هاوڕێیانەشدا شەرم نایگرێ ... بەلاّم مەخابن ، دەبێ ئەو زاتانە بە چ چاوێك تەماشای بکەن و چ لەبارەی ئەو ئاکار و نەجابەتەوەی بڵێن ... بەڵێ (( تەپڵی

بیٚعاریی کوتاوه )) ...

٣ـ لەو شوێنانەدا کە بە دز و نەزان و بیٚبڕوانامە و بیٚئاگام ... دادەنیٚ . لەبەر ئەوەی هەر قسەی ڕووت و تۆمەتن ، هیچ بەڵگەییٚکی بۆ ئەو وتانەی نەهیٚناوەتەوە ... بەڵام بەندە لە هەردوو بەرگی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە )) دا ، کاتیٚ لە کارە ناڕەوا و نالەبار و نابەجیٚکانی م . وریا دەدویٚ ، چەندین بەراورد و لیٚکۆڵینەوە و نموونە و بەڵگەی خستووەتە ڕوو ... بیٚگومان ، ئەم ڕیٚگە و ڕیٚبازەی ئیٚمە ڕاستی و زانست نیشان دەدەن ، نەك ئەو ئاوە خراپەی ئەو ڕشتوویەتی .

٤ـ گەرچی زوربەی دۆست و هاوڕیٚیانم پیٚیان باش نییە ، بە هۆی وەڵامدانەوەی نووسینیٚکی وا نزمەوە ، ماوەییٚك لە کارە گرنگەکانم دابپڕیٚم ، بەڵام :

أ) بە پیٚویستی دەزانم ، کاری خویٚنەری هیٚژا ئاسان بکەم ، تا بۆ دۆزینەوەی نووسەری ئەو ( بوختاننامە )یە خۆی خەریك و ماندوو نەکا ... یان لە خۆڕایی لە کەسیٚکی پاك و بیٚگەرد و ، بیٚخەبەر و بیٚ ئاگا نەکەویٚتە سۆ و گومان و دڕدۆنگییەوە [1] و باوەڕیشی بەوە پتەوتر بیٚ (( هەر کەسیٚ چاڵ بۆ یەکیٚك هەڵکەنیٚ خۆی تیٚی دەکەویٚ )) ...

---

(١) بوودەڵەیی و ترسنۆکیی م . وریا گەیشتوونەتە ئاست و ڕادەییٚك ، نەك هەر نەویٚریٚ و سڵ بکاتەوە خۆی بکاتە خاوەنی ئەو بوختاننامەیە ، بەڵکو دڵ ودەروونی بیٚویژدانی لیٚی نەگەڕاوە و وای پیٚکردووە لەملاوئەولا ئەو کارە چەپەڵ و گەمارە بخاتە ئەستۆی کەسانیٚکی ساخلەم و بەئەمەك و بەوەفا : دۆست و هاوڕیٚی گیانی بەگیانیم : نموونەی ئاکار و ڕەوشت بەرزی : کارامەیی و لیٚهاتوویی ، کوردی و مەردی ...

هەندیٚك لەو برادەر و دۆستانە نامەی پاکانەیان بۆ ناردووم ، منیش لە وەڵامدا ، ئەوەم وتووە ، کە وەها کاریٚك لەوان ناوەشیٚتەوە و بە هیچ چەشنیٚك ، گومانم لە هیچ کامیٚکیان نییە ... گەر خوانەکردە هەشم بیٚ ، تاکە بەڵگەییٚك چییە نیمە ... زۆر چاکیش دەزانم ، یەکیٚك هەبیٚ خەریکی ئەو جۆرە کارانەبیٚ ، هەر م. وریایە و م. وریا ... ویٚڕای ئەوە ( ٢٦ ) بەڵگەم بەدەستەوەن ، کە شایەتیی بۆ ئەو ڕاستییە بدەن.

ب) هـەر بـەو بۆنـە و سـۆنگەیەوە ، وا بـە بـاش و دروسـت دەزانم ، لە لایەکەوە پـەردە لەسـەر ڕاسـتی هەڵدەمـەوە و تـەم و مـژی فریـودان و تـەفرەدانی خوێنـەر بڕەوێنمـەوە و کـار و کـردەوەو و هەڵسـوکەوتی نابەجێ و ناپەسەندی بخەمە ڕوو .. لە لایێکی دییشەوە ، با ئەو هـەموو بوختانـەی بۆی هەڵبەستووم ، دواڕۆژ نەبنـە مـاڵ بەسـەرمەوە ... ئـەمڕۆ کاتێتی و کوردیش باشی وتووە : (( درۆ هێشتا لـە دەم دەرنـەچووە لۆقە دەکات )) .

... هتد .

ئێسـتاش فــەرموون پێکــەوە بڕوانینــە کــرۆك و نــاوەڕۆکی (بوختاننامە)کەی د. وریا ، کە لـەو بڕوایـەدام ، ڕەوانبێژی و تـەڕزمانی و پاراوییەکەی لە بازاڕی شێخوڵڵای هەولێر و ژێر پردەکەی سلێمانیش دانسقە و دەگمەن و بێوێنە بێ .

ئەوەتە لە سەرەتا و دەستپێکدا دەفەرمووێ : (( ئەو چارەگە سـەدەیێك زیاترە ئاورەحمانی حاجی مارف خۆی کردۆتە مدیر طاپۆ و کوڕە ئازای زمـان و ڕێزمـانی کـوردی ... وەك فـس فـس پاڵـەوان سـینگی خـۆی لـە مەیدانی نووسین و ڕەخنە بازیدا دەر پەڕاندوە .. لە گیـان ئـەم خەڵکە بەر بووە ( چ بە نووسین چ بە قسە ) .. هەر ڕۆژەی بە یێکێکەوە ئەنووسێ ... پەلاماری ئەم و ئەو ئەدات .. بەگژ ئەم و ئەوا ئـەچێ .. توانج لـەم خەڵکە ئەگرێ .. قسەی ناشیرینیان پـێ ئـەڵێ و .. بـەردەوام ئەیـەوێ لە قـەدریان کەم کاتەوە .. )) ل(١) .

منێك ، کە بۆ ڕاژە و خزمەتی زمانی شیرینی کوردی ، هەر لە سەرەتای ژیانی زانستیمەوە ، ویسـت و ئـارەزووم ؛ هیـوا و ئـاواتم ، ئـەوە بووبـێ ئێمەی زمانەوانان دەست بخەینە دەست و شـەو بخەینـە سەر ڕۆژ ... یان بـێ بـاس کـردن و وەرگرتنـی خـەڵات بـە چـەندین کـاری هاوکـارانمدا

چووبمەوە و لەو پێناوەدا ئیشی خۆم وەلاوە نابێ و دواخستبێ .. یان کتێب و نامیلکەم بۆ چاپ کردبن و ناوی خۆم نەبردبێ ... ئیتر چۆن خۆم (( کردۆتە مدیری طاپۆ )) ؟...

گەر بەندە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە نووسینێکیدا ، نەك هەر بە شان و باڵی خۆیدا هەڵینەدابێ ، بەڵکو خۆی بە زانا و کارامەش دانەنابێ و بگرە زێدە لەخۆبوردوویی بوویێتە مایەی ئەوەی برادەرانی گلەیی ئەو خۆ بە شت نەزانینەی لێبکەن ... جا بەڵگەی م. وریا چییە ، کە دەڵێ : خۆی کردۆتە : (( کورە ئازای زمان و ڕێزمانی کوردی )) ؟ ..

بۆ بنبڕکردن و تەواو ڕەتکردنەوەی ئەو وتانەشی ، هەندێ نموونە لە پێشەکی چەند بەرهەمێکمەوە دێنمەوە :

لە لاپەرە (١١)ی بەرگی یەکەمی کتێبی (( سەرەتایێکی زمانناسی ))دا نووسیومە

(( کۆڵەورام و هەر هێندەم لە دەست دێت ... خۆزگە کاری گەورەم لەباردا بوایە ... خەجاڵەتی قاپیی دڵسۆزیی میللەتەکەمم ، کە هێندە دڵپاك و لەخۆبوردوون دەست بە ڕوومەوە نانێن و ئەو جۆرە دیارییانەم لێوەردەگرن ... )) .

پێشەکیی کتێبی (( ڕابەری سەرچاوە لەبارەی زمانی کوردییەوە ))م بەم دێڕانە کۆتایی پێهێناوە : (( مایەی بەختەوەریم دەبێ و ئاواتێکی گەورەم دێتەدی ، ئەگەر بەم کارە خزمەتێکی بچووکم پێشکەش بە زانیاریی گەلەکەمان کردبێ و تکاش لە گشت دڵسۆزێکی وشەی پیرۆزی کوردی دەکەم ، لەم نووسینەدا هەر ناتەواوی و هەڵەییێك دەبینن ، چاو نەپۆشن و دۆستانە ڕاستی بکەنەوە )) (ل٧) .

لە بەشی پێنجەمی کتێبی (( ڕێزمانی کوردی ـ کردار ))دا وتوومە : (( هیوامە خوێنەری هێژا لەسەر کارێك گلەییم لێنەکا ، کە لە دەستی

خۆمدا نەبێ ... ئاواتمە ئەم نیو چەپکە گوڵەم لێ وەرگرێ و بەختەوەرم بکا ... بەڵێن بێ دەسکە گوڵی گەورەتر و جوانتری بۆ بچنم )) ( پێشەکی ، ل٥) .

لاپەڕە (٤)ی بەرگی دووەمی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە )) ، ئەم وشانەم تێدا یادداشت کردوون : (( ... لە بەرگێکدا پێکەوە دەبەستم و ، دەیانخەمە بنرێسمەی دەرگای کەوشکەنی پێشخانەی بارەگای دڵسۆزان و خەمخۆرانی زمانی کوردییەوە )) .

... و گەلێکی دی

بەندە لە تێکرای پتر لە سی کتێب و نامیلکەیدا ، کە تا ئەوڕۆ بلاْوی کردوونەتەوە ، بەو شێوە و شێوازە ڕووی لە خوێنەر کردووە ... هەرچی م . وریایە ، کە خاوەنی تاکە نامیلکەیەکە ، ئەویش ئەوەتە لە پێشەکیەکەیدا وا لە بەرزییەوە دەڕوانێ و دەدوێ :

(( هەندێ جار لە خوێنەران ئەبیستم کە بە ئاسانی لە هەندێ لە وتارە زمانەوانییەکانم ناگەن ... هەشە ئەڵێ هیچیان لێ تێناگەم ... بۆ ئەمانە هەموو ئەڵێم : ))

(( هەر نووسینی ... سەر بە هەچ بابەتیك بێ گەر زۆربە توانییان تێی بگەن ئەوە هێشتا لە قۆناغی ( سرد ) و ( سطیحەت ) دەرباز نەبووە و خۆی بە پەیرەوێکی تایبەتییەوە نەبەستۆتەوە و نەچۆتە خانەی اختصاصی وردەوە )) ...

(( هەر کەسێ شتێ لەبارەی پێناسینە لەقەکانی ڕێزمانی تەقلیدی ( بکەر ـ بەرکار ـ وشە ـ پاشگر ... هتد ) بزانێ ، ئەتوانێ بڵێ فلاْنە رستە لە فلاْنە وشە و بکەر و بەرکار ... هتد پێك هاتووە و فلاْنە وشە لە فلاْنە رەگ و پێشگر و پاشگر پێك هاتووە ... بەلاْم گەر لە ژێر تیشکی دەسکەوتەکانی مەیدانی زانستی زمانی تازە و کێشەی نێوان

قوتابخانەکان سەیری ئەم پێناسین و جۆرە شی کردنەوەیە بکرێ .. دەر نەکەوێ کە کار لە کار ترازاوە )) ( رێزمانی راناوی لکاو ، ل٣ـ٤) .

بەڵێ (( بەرزفڕین ملی پیاو دەشکێنێ )) .

پاش ئەم گەشتە ، پێویست بە لەسەر رۆیشتن ناکا و با خوێنەر خۆی ئازاد و سەرپشك بێ و بڕیار بدا : ئەوڕەحمان : ((وەك فس فس پاڵەوان سینگی خۆی لە مەیدانی نووسین ... دا دەرپەڕاندووە)) ، یان کاکە وریا ؟

لە پێناو رێگەی خزمەت و ڕاژەی زمانی شیرین و دەلالی کوردیدا هەرگیزاوهەرگیز نە گوێم بەوە داوە و ، نە سڵم لەوە کردووەتەوە فلانە کەس لێم زیز دەبێ ، یان بە گژمدا دێ ... بۆیە بەوپەڕی سەربەستی و ئازادییەوە ، هەر شتێکم بەلاوە ڕاست و دروست نەبووبێ ، سێ‌ودووم لێ‌نەکردووە و بێ پێچ و پەنا دید و بۆچوونی خۆمم لەبارەیانەوە دەربڕیوە ..

من بڕوام بەوە زۆرە ، کە ڕەخنەی باش جێی خۆی دەگرێ و چاکیش دەزانم ، کە دەگمەن هەڵدەکەوێ لێکۆڵینەوەیێك هیچ خەوشێکی تێدا نەبێ . هەر لەو ڕوانگە و نیگایەشەوەیە ، کە لە پەراوێزی هەندێ کتێبی ئەم دواییەمدا ڕەخنەم لە ناتەواویی کارەکانی پێشووم گرتووە ؛ یان بۆ ئەو خوێندکارانەی خوێندنی بالاً ، کە سەرپەرشتیی نامەکانیان دەکەم ، بە دەستی خۆم و بە خەتی خۆم خەوشی نووسینەکانم بۆ تۆمارکردوون .

جا گەر م. وریا بۆ ئەم کارە پیرۆزەی من بڵێ : (( ... لە گیان ئەم خەڵکە بەربووە ( چ بە نووسین و چ بە قسە ) .. هەر ڕۆژەی بە یێکێکەوە

ئەنووسێ ... پەلاماری ئەم و ئەو ئەدات .. بە گژ ئەم و ئەوا ئەچێ ... توانج لەم خەڵکە ئەگرێ .. قسەی ناشیرینیان پێ ئەڵێ و ... بەردەوام ئەیەوێ لە قەدریان کەم کاتەوە )) ، ئەوە دیارە :

١ـ لە نرخ و بەهای ڕەخنە تێناگا ... گەر تێشی بگا ، پێی گرانە .

٢ـ یان پەروەردەی کووچە و کۆڵانانە ، یان واتای ئەو وشە و دەربڕینانەی خۆی باش نازانێ ... یان (( سواری گای هار بووە )) و (( لاتانە دەفرۆشێ )) .

م . وریا بەدوا سازدانی ئەو چەند تۆمەتە ناڕەوایانەدا ، لە بەردەوامیی هەمان بابەتدا بە زمانە شیرینە سپەهی و خۆشیکەکەی دەڵێ : (( کێ ماوە تا ئێستا ئاورەحمانی حاجی مارف زمان و قەڵەمە دەغەزارە کیندارەکەی خۆی دژی نەخستبێتە کار ... زانا و مەزنان و مامۆستایانی وەك ( شێخ محمدی خاڵ ـ گیوی موکریانی ـ د . جەمال نەبەز ـ پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار ـ فاضل نظام الدین ـ د. کاوێس قفطان ـ جمال بابان ـ مصطفی نریمان ـ پرۆفیسۆر کامل بصیر ـ د. نسرین فخری ـ د. کوردستان موکریانی ـ پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین ـ صباح غالب ـ د. فاروق عمر صدیق ـ د. فتاح مامە علی ـ طالب حسین .. زۆری تر (ئەمانە بە نووسین) چی‌ی پێ نەوتوون و چی‌ی پێ نەکردوون )) (ل١).

گەر ئەو ، قەڵەمی بوێری بێگەردی ڕووسووری بەندە بە (( دەغەزار و کیندار )) ناوبەرێ ، ئەدی قەڵەمی ترسنۆك و بێشەرم و ڕووڕەشەکەی جەنابی ، کە زاتی‌نەکردبێ و نەیوێرابێ ناوی خۆی پێ بنووسێ ، دەبێ چ قەڵەمێ بێ ؟ ... ئایا من قەڵەمم دژی زانایان و مەزنان خستووەتەکار ، یان بەرهەمەکانیانم هەڵسەنگاندووە و لەبارەیانەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانستیم کردووە ... خۆ لەو نووسینانەمدا تەنیا ڕووی

کەموکورتی و ناتەواویم باس نەکردووە ، بەڵکو لە ڕەخ و ئالیی گەش و باش و سەرکەوتوویشیان دواوم ... نایشارمەوە ، بەشێکی کەمی ئەو زاتانە لێم زیز و دڵگیر بوون ... هەرچی بەشە زۆرەکەیانە ، کە تەنانەت لەگەڵ هێندێکیان پێشتر بە هیچ چەشنێك ئاشنایەتی و دۆستایەتیم نەبوو ، ئێستاکە بەوپەڕی سەربەرزی و شانازییەوە و ، بەڕشکاوی دەڵێم : ئەو قەڵەمەی م . وریا بێئینسافانە بە (( دەغەزار و کینەدار ))ی دادەنێ ، کردمییە برا و هاوڕێ و کەسوکار و جێی متمانە و باوەڕی تەواوی ئەو مامۆستایانە :

- لە سەردەمی مێردمنداڵیمدا و بەر لەوەی بۆ خوێندن بچمە یەکێتیی سۆڤێت ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵم تەنیا لە ڕێی بەرهەمە بەهادارەکانییەوە ناسیوە و چەند جارێکیش لە دوورەوە بە چاوە کزەکانم بینیومە ... پاش دە ساڵێك ، واتە لە یەکەم ساڵی خوێندنی دوکتۆرامدا ، کە شارەزاییێکی باشم لە فەرهەنگەکەیدا پەیداکرد ، زنجیرە وتارێکم لەبارەیانەوە نووسی و بۆ ڕۆژنامەی (( هاوکاری ))م نارد[٢] .

کاتێ دوکتۆرام تەواوکرد و لە مانگی شوباتی ١٩٧٣دا گەڕامەوە وڵات ، ئێوارەی ڕۆژی دووەم لە دەمەدەمی ڕێژنە بارانێکی بەتاوی توندا ، کاتێکم زانی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ بەو هەموو گەورەییەی خۆیەوە ، بۆ بەخێرهێنانەوەم خۆی کرد بە دیوەخانی ماڵی باوکمدا ... دواتر لە کۆڕی زانیاری کورد ، بووینە باوك و کوڕ و تەنانەت متمانەی پێکردم ، هەڵەبژێریی بەشێکی بەرگی سێیەمی فەرهەنگەکەی بۆ بکەم .. تا ئەمڕۆش چەند نامەیێکی پڕ دڵسۆزیی ئەو کەڵەپیاوەم پاراستووە و ناوبەناوە بە شانازییەوە دەیانخوێنمەوە .

---

(٢) ئەم وتارە لە ژمارە (١٩) و (٢٠) و (٢١) و (٢٢)ی ساڵی ١٩٧١ی ڕۆژنامەی ((هاوکاری ))دا بڵاوکراوەتەوە .

فەرموون ، ئەوە یەکێك لەو نامانە :


سلیمانی
١٩٧٥/٣/١٥

زۆر خۆشەویست دکتۆر عبدالرحمان

دوای سڵاو ڕۆژی ١٩٧٥/٣/١٢ هاتم بۆ کۆڕ بەداخەوە نەم دیین وتیان نەخۆشە ، زۆرم نزای باش بۆ کردن ، بەیانی سەعات پێنج و نیو گەڕامەوە .

چل لاپەڕەی ترم لە فەرهەنگی خاڵ هێنا لەگەڵ خۆما ، شەو دامە دەست کاك ئیحسان وا بزانم هەر لەبەردەمی ئەوا مایەوە ، ٢٦ی ئەم مانگە دێم خوا یار بێ چەند لاپەڕەیەکی تری لێ ئەهێنم .

زۆر سڵاووم هەیە بۆ مامۆستا شکر بەڕاستی زۆرم پێ خۆش بوو کە هاتۆتە کۆڕ ، ئەمە ئەبێ هەمەتی ئێوە بێ .

دەقی نامەی ناوبراوی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ :

سلیمانی
١٩٧٥/٣/١٥

زۆر خۆشەویست دکتۆر عبد الرحمن

دوای سڵاو ڕۆژی ١٩٧٥/٣/١٢ هاتم بۆ کۆڕ بەداخەوە نەم دیین وتیان نەخۆشە ، زۆرم نزای باش بۆ کردن ، بەیانی سەعات پێنج و نیو گەڕامەوە .

چل لاپەڕەی ترم لە فەرهەنگی خاڵ هێنا لەگەڵ خۆما ، شەو دامە دەست کاك ئیحسان وا بزانم هەر لەبەردەمی ئەوا مایەوە ، ٢٦ی ئەم مانگە دێم خوا یار بێ چەند لاپەڕەیەکی تری لێ ئەهێنم .

زۆر سڵاووم هەیە بۆ مامۆستا شکر بەڕاستی زۆرم پێ خۆش بوو کە هاتۆتە کۆڕ ، ئەمە ئەبێ هەمەتی ئێوە بێ .

وا بە حمە ئەمینی سائقا مەلزمەی گۆڤاری کۆرم بۆ ناردنەوە دوای ڕاستکردنەوەی ، بەراستی ماموستا شکریش زۆری عەزیّت تیا کیّشاوە زۆر سوپاسی ئەکەم ، ئیتر بە خواتان ئەسپیّرم

محمدی خالّ

ئەمە لە لاییّك .. لە لاییّکی دییەوە ، لە خوارەوە چەند بەندیّکی کەمی ئەو وتارەی دەربارەی (( فەرهەنگی خالّ )) بلاّوم کردووەتەوە ، دەخەمە بەر چاوی خویّنەری هیّژا ، تا وتەی هەڵبەستراوی کابراییّکی بیّویژدانی ئاژاوەچی نەیخاتە گومانەوە و دڵسۆزی و ڕیّزی منی بەرانبەر زانایانی کورد بۆ دەرکەویّ ... گەلۆ ! گەر ئەوەی من دەیلّیّم ، وا نەبوو ، ئامادەم بەردەبارانم بکەن ... خۆ بیّتو کاکە وریا ڕاست نەبیّ ، بۆ دڵدانەوەی من ، تەنیا سەرزەنشت کردنیّکی سەروزیادە .

هەندیّ بەندی وتاری ناوبراو

(( تاوەکو ساڵی ١٩٦٠ فەرهەنگیّکی کوردی ــ کوردیمان نەبوو ، هەست و چالاکیی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ توانییان ئەم کەلەبەرە پڕ بکەنەوە . ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦٠ـ ١٩٦٤دا بەرگی یەکەم و دووەمی (فەرهەنگی خاڵ) دەرچوو ، کە تا کۆتایی پیتی (ڤ) دەگریّتەوە ... ))
( هاوکاری ، ژ ١٩ ، ل٤)

(( فەرهەنگی خاڵ یەکیّکە لە هەرە چاکترین فەرهەنگە چاکەکانی کوردی . بەرهەمیّکی باشی پیّگەیشتووی نویّیە ، کەڵکیّکی زۆری هەیە بۆ زوربەی خویّندەوارانی کوردستان ، ئەویش هۆی ئەو ڕیّگا ڕاستەیە کە مامۆستا خاڵ گرتوویەتی لە نووسینی فەرهەنگەکەیدا ، بەوەی کە ناوەرۆکی فەرهەنگەکەی بریتییە لە وشەکانی گەلیّك لە ناوچەکانی کوردستان ، وەك مامۆستا خاڵ خۆی ئەڵیّ : ( لە ساڵی ١٩٣٥ەوە

به هەموو هێزو تەواناى خۆمەوە خەریكى كۆكردنەوەى وتەى كوردیم بە هەموو ئاهەنگ و شێوەكانیەوە بە وتەى بابان و سۆران و ، زازاو ، بۆتان و ، بادینان و ، لوڕ و ، فەیلى و ، لەك و ، موكریان و ، ئەردەڵانەوە وە لەم ڕێیەدا زۆر ڕەنجم داوەو كۆششم كردووە تا وتەى ڕاست و دروستم كۆكردۆتەوە ...) . ئەم جۆرە ڕێگایە بۆ ئەوەى فەرهەنگ بەكەڵك بێت نەوەك تەنها بۆ خوێندەوارانى ناوچەیەك لە كوردستان بەڵكو بەكەڵك بێت بۆ زوربەى كوردان ڕێگایەكى ڕاست و پێویست و نوێ و بەسوودە بۆ ئەوەى كە لە فەرهەنگ كۆمەڵێكى فراوان و زۆر لە كوردان كەڵك وەربگرن و هەروەها ڕێبازە بۆ یەكخستنى شێوەكانى زمانى كوردى و سەرچاوەیە بۆ سازبوونى زمانى ئەدەبى بۆ گەلى كوردمان .

وەك لە سەرەوە وتمان ( فەرهەنگى خاڵ ) یەكەم فەرهەنگى كوردى ـ كوردییە ، لەبەر ئەوە گەلێك كۆسپ لە ڕێگاى دانانى ئەم فەرهەنگەدا هەبووە ، ئەوەتە مامۆستا خاڵ خۆى لەم بارەوە ئەڵێ : ( ئەوى لەم فەرهەنگە ورد ئەبێتەوە ئەبێ بزانێ كە تا ئێستا لەم ڕووەوە سەرمەشقێكمان بۆ دانەنراوە تا چاوى لێبكەین و فەرهەنگێكى تێكڕاییمان بە زمانى كوردى بۆ نەنووسراوە تا لاسایى بكەینەوە ... ) .

بێگومان نەبوونى سەرچاوە و نووسراوێكى پێشوو لەم چەشنە بووە بە هۆى ئەوەى ( فەرهەنگى خاڵ ) دوور نەبێت لە چەند ناتەواوییەك )) ( هاوكارى ، ژ ١٩، ل٤)

(( مامۆستا خاڵ لە لاپەڕە (٧ـ١٠)دا زۆر بە وردى باسى پێویستى و نرخى فەرهەنگ ئەكات بۆ مانەوە و پێشخستنى زمان )) ( هاوكارى ، ژ ٢٠، ل٣) .

(( لە لاپەڕە (١٠ـ ١٥)دا بە كورتى باسى ئەو فەرهەنگە كوردییانە ئەكات ، كە لە پێش فەرهەنگەكەى ئەوەوە نووسراون ... ئەتوانرێ كەڵكى

باشی لیٚوەربگیرێ ... لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لە فەرهەنگی کوردی کەم دواون ، ئەم باسەی مامۆستا خاڵ کەڵك و سوود دەگەیەنێ )) (هاوکاری ژ.٢ ، ل٣)

(( لە لاپەڕە (٣١ ـ ٣٨)دا بە کورتی و ڕاست و جوان چەند زانیارییٚکی پێویستی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە داوە ، کە بەتەواوی لەگەڵ مەبەستی فەرهەنگەکەدا ئەگونجێ و بۆ گۆڕینی وشە بەپێی پێویست بەکارهێنەری فەرهەنگەکە ئەتوانێ سوودی لێببینێ )) ( هاوکاری ، ژ ٢٠، ل٣) .

(( لە لاپەڕە (٣٨ـ ٣٩)دا ئەو نیشانانە ئەدات ، کە لەناو فەرهەنگەکەدا بەکاری هێناوە . ئەو فەرهەنگانەی لە کوردستاندا تا ساڵی ١٩٦٠ دەرچوون ئەم پێویستییەی تیایاندا باس نەکراوە ، تەنها مامۆستا خاڵ بۆ یەکەم جار هەستی بەوە کردووە و بەمە کاری بەکارهێنانی فەرهەنگەکەی ئاسان کردووە .

بەگشتی ئەم فەرهەنگە لەسەر شێوەیەکی جوان و ڕاست دانراوە . گەلێك لەو گرانیی و زەحمەتی و ناتەواوییانەی لەناو فەرهەنگەکانی پێش ئەودا هەبوون ، مامۆستا خاڵ ئاسانی کردوون و پڕی کردوونەتەوە . دیارە نووسەر خۆی زۆر لەگەڵ نووسینی فەرهەنگەکەیدا خەریك کردووە . هەروەها بۆ کۆکردنەوەی وشەی کوردی زۆر گەڕاوە و خوێندنەوەی فەرهەنگەکەی ئەو ڕاستی‌یە دەردەخات و زوربەی وشەکانی زمانی کوردی بەرچاو ئەکەون .

بۆ لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی مانای وشە ، نووسەر چەند ڕێگایەکی ڕاستی زانستی گرتووە . بۆ ئەو وشانەی بتوانرێ بە یەك وشە مانای نیشان بدرێ ، نیشانی‌داوە . وەك ( ئامشۆ ) بەرامبەری نووسیوێتی ( هاتوچۆ ) ؛ بەرامبەر بە (ئاڵۆشدار) نووسیوێتی ( ئاڵۆشاوی ) ...

هەروەها کە هاتۆتە سەر وشەی (هاتوچۆ) و ( ئالۆشاوی ) بەجیا ڕاڤەی کردوون ، نەوەك یەکێك مانای ئەم وشانەش نی٘نەگات )) ( هاوکاری ، ژ ۲۱، ل٦) .

(( ... بە تێکڕایی مامۆستا خالٚ ڕاڤەی وشەی زۆر باش کردووە . بۆ ڕاستیی ئەمە ، ڕاڤەی چەند وشەیەك نیشان ئەدەین :

( ئاوانتە ) ـ خواردن و بردنی شتی مەردووم بە خۆڕایی

( ئۆقرەگرتن ) ـ ئارام گرتن و دابین بوون

( ئەخترمە ) ـ ولآخێکە لە جەنگا لە دوژمن گیرابیٚ

( ئارد ) ـ هاڕاوی دانەوێڵە

... هتد .

بەم نموونانەدا بۆمان دەرئەکەویٚ ، کە نووسەر لە ڕاڤەکردنی وشەدا هونەرێکی زۆر بەرزی نیشان داوە و خوێنەر ئەتوانیٚ بە ئاسانی لە مەبەست و واتای وشە تی٘بگات...)) ( هاوکاری ، ژ ۲۱، ل٥) .

(( چ لەبارەی نووسینی فەرهەنگەوە یا لە بارەی بەکارهێنان و سوودلی٘بینینەوە ، چ لەبارەی زانستی فەرهەنگ نووسیی کوردییەوە یا لە مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا ، ئەم فەرهەنگە دەورێکی گەورەی بینیوە و ئەبینیٚ ئەم فەرهەنگە سەرچاوەیەکی ئێجگار گەورەیە بۆ نووسینی گەلێك فەرهەنگی هەمەچەشنە ، وەك لە کوردییەوە بۆ زمانێکی بێگانە یان بەپێچەوانەوە لە زمانێکی بێگانەوە بۆ کوردی ... هتد .

ئیتر سوپاس ، هەزاران سوپاس بۆ مامۆستا شێخ محەمەدی خالٚ کە ئاواتی چەند ساڵەی گەلی کوردمانی هێنایەدی)) (هاوکاری ، ژ ۲۲، ل٤) .

* دووەم وتـارم بـە نێـوی (( چـالاکیی مامۆسـتا گیـو موکریـانی لـە مێـژووی فەرهەنگنووسـیی کوردیـدا ))وە بـوو[٣]... هـەندێ کەسـی بێویژدانـی وەك م. وریـا لـەبریتی دەستخۆشـی لێکـردن ، لێـم کەوتنـە لاقرتـێ ... یـەکێك بـە نازنـاوی ( مجـەور )ەوە لـە یـەکێ لـە ژمارەکـانی ڕۆژنامەی ( هاوکاری )دا ، گاڵتەی بەوە کردبوو ، کە منْ ڕێزم لە هەوڵ و کۆششی مامۆسـتا موکریـانی گرتـووە و فەرهەنگـەکانیم بـە کـاری بـاش لەقەڵـەم داوە ... برادەرێکـی نـێزیکی م . وریـاش بەگاڵتەجارییـەوە دەیووت ، ئەوڕەحمان لەسەر فەرهەنگە پڕوپووچەکانی مام گیو بڕوانامەی دوکتۆری وەگرتووە ...

بە هەر حاڵ . من تا لە یەکێتیی سۆڤێت بووم ، نە لە نزیك و نە لە دوور چاوم بە مامۆستا گیوی موکریـانی نەکەوتبوو .. بـەڵام دوای گەڕانـەوەم ، بووە مـامم و منیـش برازای ... ئـەو تـا لـە ژیـاندا بـوو ، گـەر بهاتایـە بـۆ بەغدا و یان من بچوومایە بۆ هەولێر چاومـان بەیـەك دەکـەوت ... تەنانـەت چەندین جار لەپێش چاوی کەسانێکی زۆردا ، فەرموویـە : مـن قـەرزداری دوکتۆر ئەوڕەحمانم و هەر ئەو لە من باش تێدەگا ...

ئەوەش چەند بـەندێك لـەو وتـارەم و بزانـن ، ئەمـە وریـا وتـەنی قەڵـەمی (( دەغەزار و کینداره )) ، یان هی پیاوی ڕاستگۆ و زانست پەروەرە :

(( مامۆسـتا گیـو موکریـانی دەورێکـی گـەورە و بـەرزی بینیـوە لـە مێـژووی فەرهـەنگ نووسـیی کوردیـدا . ئـەو زۆر چـاك تێئـەگات ، کـە فەرهەنگ تا چ ڕادەیەك پێویستە ، چۆن لە ڕێگـەی فەرهەنگـەوە ئـەتوانرێ خزمەتی زمان بکرێ ، چۆن فەرهەنگ زمان ئەپارێزێ و دەوڵەمەندی ئەکا ، چۆن فەرهەنگ ڕێگایە بۆ یەکخستنی زمانی کوردی ... هەستی مامۆستا گیـو موکریـانی بـە پێویسـتیی فەرهـەنگ و هەسـتی کوردایـەتی وای

---

(٣) ئەم بەرهەمـە لـە ژمـارە (١٠٠) و (١٠١) و (١٠٢) و (١٠٣) ی سـاڵی ١٩٧٢ی ڕۆژنامـەی (هاوکاری)دا بڵاوکراوەتەوە .

لـیْکردووه بە دەها ساڵ لە ژیانی لاوی و پیری بۆ نووسـینی فەرهـەنگ تـەرخان بکـا هـەر بـۆ ئـەوەی وشـەی کـوردی کۆبکاتـەوە و بـۆ ئـەوەی وشەیەکی کوردی لەناو نەچێت شار و گوندی کوردستان نەماوە خـۆی نەگەیەنێتیْ . ئەوەتە ماموستا لـەم بارەیـەوە لـە پێشـەکیی ( فەرهـەنگی مەهاباد )دا نووسیویـتی : (( زاراوەی موکریانی بە هـەموو هۆز و تـیرە و دێهاتەکانەوە لەگـەڵ هـی شـکاك و عـەبدۆیی و جـەلالی و لـوڕ و کـەلهوڕ و سـنە (ئـەردەلآن) بـەپێی توانـا... کۆکـردەوە . بـۆ زاراوەی سـورچی و خۆشناو و زرایی و ئامێدی ساڵێکی لە باتاس دانیشتم لە (۱۹۲۹)دا . کە بە ماڵـەوە هاتمـە هـەولێر زاراوەی ئـەو ناوچەیـە و بادینـان و کۆیـە و پژدەریشم دەست کـەوتن ... (۳) جـاران چوومـە سلێمانی و هەڵەبجـە و هـەورامان و زاراوەی سـلێمانی و شـارەزوور و جـاف و تـاوکۆزی و هـەورامان و ئـی دیکـەم ئـەوەندەی لـە توانـای سـەلیقەمدا بووبـیْ کـۆم کردوونەتەوە ... )) .

ماموستا گیو موکریانی نرخی فەرهەنگەکانی بەرزئەکاتەوە ، بـەوەی ناوەرۆکەکانیان بریتـی نین تەنها لە وشـەی شـارێك یـاخود ناوچەیـەکی تەسکی کوردستان ، بەڵکو بریتین لـە وشـەکانی گـەلێك لـە شار و گوند و ناوچەکانی کوردستان بەم جۆرە فەرهەنگەکانی سوودبەخشن نەك تەنها بۆ کۆمـەڵێکی کـەم لـە کـورد ، بـەڵکو سوودبەخشـن بـۆ زوربـەی کـوردان . بەلآم بەداخەوە ئێمە نرخی ئەو بیرە وردە و ئەو کارە پیرۆزەی ماموسـتا نازانین . هـەندیْ جـار کـە وشـەیەك لـە فەرهەنگـەکانیدا دەبینـین و لێـی تیْناگەین ، وا دەزانین دانەر ئەو وشەیەی دروست کـردووە و بە خۆڕایـی یەخـەی دەگریـن ، کـەچی بـیر لـەوە ناکەینـەوە ، کـە ئێمـە لـە سـنووری شارەکەی خۆمان دەرنـەچووین و وا دەزانین زمانی کـوردی تـەنها ئەوەیـە لـە شـارەکەماندا بـە کـاردبریْ . جـا گونـاهی خۆمـان بەسـەر ماموسـتا

گیو موکریانیدا دەدەین .

ڕاستە لە فەرهەنگەکانی مامۆستا گیو موکریانیدا کەم و کوڕی زۆرە ، بەڵام ئەمە لە نرخی فەرهەنگەکانی و لە نرخی مامۆستا کەم ناکاتەوە . هۆی ئەو ناتەواوییانەش زۆرن .

لەپاش فەرهەنگی ئەحمەدی ، کە ساڵی (١٧٩٥) دانراوە تاکو دەرچوونی (( فەرهەنگی ڕابەر )) ( ساڵی ١٩٥٠) کە پتر لە سەدە و نیوێك دەکات ، لە کوردستانی عێراق هیچ فەرهەنگێکی ئەوتۆ دەرنەچووە شایانی باس بێت . جا ئەمە هۆیەکی گەورەیە کە بووبێ بە هۆی بوونی هەندێ ناتەواوی و کەم و کوڕی . نەبوونی فەرهەنگ ، واتە نەبوونی کارێکی پێشوو ، نەبوونی سەرچاوەیەك کە مامۆستا سوودی لێ ببینێ و شوێن پێی بکەوێ و لەسەر ڕێگای بڕوات . جگە لەوە مامۆستا لە زانستگەیەکی بەرزی دەرەوە نەیخوێندووە تا بە تەواوی لەو جۆرە کارانەدا شارەزاییەکی تەواو وەربگرێت . ئەوەی هەبووە تەنها کۆششی خۆی بووە کە بە هەندێ زمانی بێگانە چەند فەرهەنگێکی خوێندۆتەوە و بینیونی ، یاخود بە بیروباوەڕی خۆی وای بە باش زانیوە بەو جۆرە بیکات . بێ گومان ئەو کۆسپ و تەگەرانەی هاتوونەتە ڕێگای بە جۆرێك بوون ، کە ڕزگاربوون لێیان گران بووە ، بەتایبەتی لەو سەرەمەدا . جگە لەوە مامۆستا خۆی زۆر ڕاست ئەفەرموێ : (( چۆن چاوەڕێی فەرهەنگێکی ڕاست و بێ هەڵە لە دانەرێك دەکرێ کە خۆی بەو پیرییەوە لە چاپخانەدا کارگەر بێت و بەدەستی خۆی چاپی بکات لە کاتێکدا کە بە ناچاری ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەیانییەوە تا ئێوارە بو پەیداکردنی نانی (١٠) سەر منداڵی ورد و بێدەسەڵاتی گیان بدات )) . لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا گیو موکریانی بەسەر زوربەی ئەو تەنگ و چەڵەمانەدا سەرکەوتووە و کارەکانی لەسەر شێوەیەکی تازەو زانستین . لە زۆر شوێندا هونەرێکی

بەرزی نواندووە ، زۆر دەروازەی کردۆتەوە ، کە لەپێش ئەودا بەرامبەر بە فەرهەنگ نووسیی کوردی داخرابوون . ڕێگای بۆ ئەو فەرهەنگ نووسانەی لەپاش ئەوەوە فەرهەنگی کوردییان نووسیوە ، تەخت و ئاسان کرد . گەلێك کاری ئالۆزی خاوکردۆتەوە و لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگەکانی ئەم ڕاستی‌یانە نیشان ئەدا و ئەیخاتە ڕوو .

هەرچەندە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا جووڵانەوەی نەتەوایەتیی میللەتی کورد لە کورستانی عێراقدا پەرەی سەند و ڕۆژ بە ڕۆژ چاوی گەلی کوردمان پتر دەکرایەوە و گەلێك ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبی کوردی ، بەتایبەتی لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەرئەچوون و بایەخێکی زۆریان بە زمانی کوردی دەدا ، بەڵام لەو چەند وشانە زیاتر ، کە لە هەندێ گۆڤاردا وەك بەشی فەرهەنگۆك بڵاوئەکرانەوە هیچی تر لەبارەی کاری فەرهەنگ نووسییەوە نەبوو . لەم مەیدانەدا هەنگاوی یەکەم مامۆستا گیوی موکریانی نای . ئەوە بوو ساڵی ١٩٥٠ ((فەرهەنگی ڕابەر))ی لە چاپدا .

(( ڕابەر )) فەرهەنگێکی قوتابخانەیی عەرەبی کوردی‌یە . لە ساڵی ١٩٥٠دا لە چاپخانەی کوردستان درچووە . پەیدابوونی ئەم فەرهەنگە هەنگاوێکی گەورەیە لە مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا . نزیکەی ١٥هەزار وشەی عەرەبییە ، کە ماناکانیان بە کوردی دراون . تاکو بڵێی کارێکی گەورە و خاوێنە و نووسەر زۆر خۆی لەگەڵیدا خەریك کردووە . هەرچەندە بەسەر دەرچوونیدا نزیکەی ٢٠ ساڵ تێ‌پەڕیوە ، بەڵام تاکو ئێستا بە یەکێك لە فەرهەنگە باشەکانی کوردی ئەژمێررێ ...

لە لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی مانای وشەدا ، لە وەرگێڕانی وشە عەرەبییەکان بۆ کوردی و ڕاڤەکردنی ئەو وشە عەرەبییانەی لە کوردیدا بەرامبەریان نییە ... بەتێکڕایی سەرکەوتووە)) (هاوکاری ، ژ ١٠٠ ، ل٤) .

(( له پاش دەرچوونی (( فەرهەنگی ڕابەر )) پێنج ساڵ تێپەڕی بێ ئەوەی لە کورستان یاخود لە دەرەوەی کوردستان هیچ فەرهەنگێکی کوردی دەربچێت . هەنگاوی دووەم لە دانانی فەرهەنگی کوردیدا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا هەر مامۆستا گیو موکریانی نای .

ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٥دا فەرهەنگێکی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی لەژێر ناوی (( کۆلکەزێرینە ))دا لە چاپدا . (( کۆلکەزێرینە )) بە ڕەنگ بچووکە ، بەڵام کارێکی ئێجگار بەنرخە . ئەمە یەکەم فەرهەنگە ، کە لەسەر ئەم شێوەیە نووسرابێ . لەپێش دەرچوونی ئەم فەرهەنگەدا نە لە کوردستان و نە لە دەرەوەی کوردستان فەرهەنگی کوردی لەم جۆرە نەبووە )) ( هاوکاری ، ژ ١٠١ ، ل٦) .

(( جگە لەوەی ، کە مامۆستا گیو موکریانی ڕێگای نیشانی فەرهەنگ نووسانی کورد دا ، خۆشی نەوەستا و چالاکانە بەرەو پێشەوە ڕۆیشت . بەرهەمی ئەم تێکۆشانەش ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦١دا فەرهەنگێکی کوردی ـ عارەبی لە ژێر ناوی(( فەرهەنگی مەهاباد ))دا لە چاپ دا و ئەمیش هەنگاوێکی کەیە بەرەو پێشەوە لە مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا .

ئەم فەرهەنگە چ لە ڕووی زۆری وشەوە ، چ لەبارەی شێواز و جۆری دانانی‌یەوە جیاوازی زۆرە لەگەڵ فەرهەنگەکانی پێشوویدا ، بەتایبەتی لەوەی ( فەرهەنگی مەهاباد ) زۆر باشترە و کەم و کوڕی کەمترە لە فەرهەنگەکانی کەی . ئەویش لەبەر ئەوەیە ، کە دانەر لەو ماوەیەدا پتر چاوی کراوەتەوە و پتر فێربووە و هەروەها پیشکەوتنی فەرهەنگ نووسیی کوردی کاری کردۆتە سەری . بەم جۆرە مامۆستا گیو موکریانی لە ( فەرهەنگی مەهاباد )دا گەلێك کاری ئاڵۆزی خاوکردۆتەوەو چەوتیی پێشووی ڕاست کردووەتەوە .

ژمارەی وشە کوردییەکانی ئەم فەرهەنگە نزیکەی (٣٠) هەزار وشەیەکە ـ واتە دوو ئەوەندەی ( فەرهەنگی رابەر )ە . لە چۆنیەتی ریزکردن و ڕێکخستنی وشەکاندا لەسەر رێگایەکی ڕاست و جوان ڕۆیشتووە . گەلێك وشەی تازەپەیدابووی تێدایە و ئەم جۆرە رێگایە تەنها نرخی فەرهەنگ بەرزدەکاتەوە . ئەم فەرهەنگە بە تەواوی لەگەڵ ئەو مەبەستەی بۆی دانراوە ئەگونجێ )) (هاوکاری ، ژ١٠٢، ل٣ ) .

(( جگە لەو فەرهەنگانەی باسمان کردن مامۆستا گیو موکریانی ( فەرهەنگی کوردستان )یشی داناوە ، بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستا لەبەر هەژاری و دەست کورتی نەیتوانیوە لە چاپی بدا . هەروەها تاکو ئەمڕۆ نە کەسێك نە کۆمەڵێك نەبووە یارمەتی مامۆستا بدەن و ئەو ئەرکە بخەنە سەر شانیان . (( لەناو گۆڤاری هەتاوی هەتیووو جوانەمەرگیشدا زۆر جارانم هاوارکرد کە دەستە جوامێرێکی دڵسۆز وەیا چەند دەوڵەمەندێکی بێنە پێش فەرهەنگی کوردستانیان بە خۆڕایی بە هەموو مافێکەوە پێشکەش دەکەم ، داخەکەم کەس سەری هەڵنەدا )) .

(( فەرهەنگی کوردستان )) لە کوردییەوە بۆ کوردییەو بریتییە لە (٤٠) هەزار وشە .

لەبەر ئەوەی دەستنووسی ئەم فەرهەنگەمان نەبینوە ناتوانین لێی بدوێین . ئەوەندە هەیە هیوامانە کوردانی دڵسۆز یان هەندێك ڕێکخراو یارمەتی مامۆستا گیو موکریانی بدەن بۆ چاپکردنی (( فەرهەنگی کوردستان )) . چاپکردنی (( فەرهەنگی کوردستان )) تەنها یارمەتی نییە بۆ مامۆستا گیو موکریانی ، بەڵکو کارێکی زۆر گەورەیە بۆ خزمەتی زمانی کوردی . ڕەنگە هەندێك لەبەر ئەوەی کارەکانی مامۆستا کەم و کوڕییان تێدایە ، بیخەنە پشت گوێ . هەرچەندە کەم و کوڕی زۆربن لە ( فەرهەنگی کوردستان )دا ، بەڵام دەرچوونی ئەم فەرهەنگە لە سوود

بەولاوە زیان نادات و گوناهە ئەو بەرهەمە گەورەیە بە خۆڕایی لە دەست بچێت . ئەگەر ( فەرهەنگی کوردستان ) نەتوانێ ببێ بە فەرهەنگێکی سەرکەوتوو . خۆ ئەبێ بە سەرچاوەیەکی گەورە و پێویست بۆ فەرهەنگ نووسیی کوردی .

چالاکی مامۆستا گیو موکریانی لە نووسینی فەرهەنگی کوردیدا و لە چۆنیەتی دانانی فەرهەنگەکانیدا لەگەڵ ناوەرۆکەکانیدا پلەیەکی بەرزی نوێ نیشان ئەدات لە کاری فەرهەگ نووسیی کوردیدا لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا .

لێکۆڵینەوە لە بیروباوەڕی مامۆستا لە فەرهەنگ نووسیندا و لە چۆنیەتی پێکهاتنی فەرهەنگەکانی کەڵکێکی تایبەتی گەورەی هەیە بۆ ئەمڕۆی فەرهەنگ نووسیی کوردی و بۆ گەلێك ڕێگای چۆنیەتی دانانی فەرهەنگ . لە فەرهەنگەکانی مامۆستادا ئەتوانرێ زۆر شتی بەکەڵك و بەنرخ بدۆزرێتەوە ، کە سوودیان هەبێت نەك تەنها بۆ فەرهەنگ نووسیی کوردی ، هەروەها بۆ گەلێك کاری زانستی زمان .

کۆشش ی مامۆستا گیو موکریانی لاپەڕەیەکی گرنگە لە مێژووی پێشکەوتنی زمانی کوردیدا . لێکۆڵینەوە لە زمانەوانیی مامۆستا بەگشتی و کاری فەرهەنگ نووسیی بە تایبەتی سەرنجی هەموو زمانەوانانی کورد و کوردناسان ڕائەگێشێ))( هاوکاری ، ژ۱۰۳، ل۵) .

*مانگی ئابی ۱۹۷۱ لە شاری لێنینگراد وتاری ((چەند سەرنجێك دەربارەی فەرهەنگی (زاراوەی پارێزگای سلێمانی) ))م نووسی و ناردم بۆ عێراق و لە پۆستەدا ون بوو ... خۆشبەختانە ڕەشنووسەکەیم مابوو و لەگەڵ خوم هێنابوومەوە و بێ هیچ دەستکارییێك لە ژمارە (١٦١) و (١٦٢)ی ڕۆژی (٦) و (١٢)ی نیسانی (١٩٧٣)ی ڕۆژنامەی ((هاوکاری ))دا

بڵاوم کردەوە ، یەکێك لە دانەرانی ئەو فەرهەنگۆکە ، کە مامۆستا ئالانی‌یە لە ژمارە (١٦٨و ١٦٩)ی هەمان ڕۆژنامەدا لەژێر ناوی (( وەڵامی چەند سەرنجێکی دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف ))دا بیروڕای خۆی بەرانبەر بە وتارەکەی من نیشان داوە . بە وتارەکەی مامۆستا ڕەئووفدا وا دەردەکەوێ ، کە خۆی ئەندامێکی چالاك و بە پەرۆشی لیژنەی ناوبراو بووە و بۆ بەجێ‌هێنانی ئەو کارە پیرۆزە هەوڵ و تەقەلاییکی زۆری داوە و ئەمەش بێ‌گومان لە کاکە ڕەئووف دەوەشایەوە . شایانی باسە ، هێشتا کە لە دەرەوەی وەڵات بووم ، جاروبار وتارەکانی مامۆستا ئالانیم دەخوێندەوە و هەستم دەکرد بەرهەمی قەڵەمی مرۆڤێکی دڵسۆز و بەهرەدارن . ئەمەش لەدڵمدا ڕێز و تەقدیری بەرانبەر بە مامۆستا پەیداکردبوو ، بۆیە دوای گەڕانەوەم بەدڵ ئارەزووم دەکرد بە دیدەنی شادبم . خوای من و تۆ کردی و چەند ڕۆژێك بەر لە دەرچوونی وتارەکەی خۆیم دی و ئەوەندەی تر چوو بەدڵمدا ... هەر لەم یەکەم چاوبەیەك کەوتنەوە ، بووینە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی و بڕیاری دا وەڵامەکەی وەربگرێتەوە و بڵاوی نەکاتەوە ... تێم گەیاند ، کە ئەمە زانست و بیروبۆچوونە و داوا و تکام لێی کرد ، ڕێ لە وتارەکەی خۆی نەگرێ و بەگوێی کردم .

به شایەتیی چەندین کەڵە شاعیر و چیرۆکنووسی سلێمانی ، مامۆستا ئالانی لە هەموو شوێن ستایشت و تاریفی منی دەکرد ... کۆچی دوایی ئەو برا دڵسۆزەم ، پەژارە و خەمێکی زۆری بۆ بەجێ‌هێشتم .

ئەویش چەند بەندێك لەم وتارەم :

(( چەند مانگێك لەمەوبەر لە لایەن لیژنەییکی تایبەتی‌یەوە فەرهەنگۆکێك ، کە بریتییە لە کۆمەڵە وشە و زاراوەی عەرەبی ـ کوردی ، لەژێر ناوی (زاراوەی سلێمانی)دا لەچاپ درا . ئەم فەرهەنگۆکە

( بەمەبەستی نووسین لە نێوان فەرهەنگ و دام و دەزگاکانی فەرمانی )دا دانراوە  کە یەکێکە لە بەندەکانی بەیانی (١١)ی ئازاری مێژوویی .

لە لیژنەی نووسینی ئەم فەرهەنگۆکەدا گەلێك لە زانا و دانا و کوردناسی شارەزا ، وەك مامۆستایان : شێخ محەمەدی خاڵ ، شاکیر فەتتاح ، محەمەد مستەفا کوردی ، محەمەد صالح شەعید ، ڕەئووف ئەحمەد ئالانی ، ئەحمەد هەردی ... هتد . هاوبەشی‌یان کردووە . ئەم هێزە گەورەیەش کە کۆبووەتەوە بۆ ئەم مەبەستە ، بووە بە هۆی سەرکەوتنی فەرهەنگۆکەکە . خوێنەر هەر کە چاوی بە ناوی ئەندامانی لیژنەکە دەکەویٚ ئەو هەستە پەیدا دەکات ، کە نووسراوێکی بە کەڵك و پوخت و پێویست ... ی لەبەر دەستدایە . ئێمەش هەر لەو باوەڕەداین و ئەو هەستەشمان بەرامبەر بە ( زاراوەی پارێزگای سلێمانی )هەیە .

فەرهەنگۆکی ناوبراو نزیکەی (١٤٠٠) وشەیەکی عەرەبی دەبێت ، کە بەرامبەریان ماناکانیان بە کوردی دراوە . وشەکانی ئەم فەرهەنگۆکە بەتەواوی لەگەڵ مەبەستی دانانیدا ئەگونجێن . بەڵگەش بۆ ئەمە ، ئەوەیە زوربەی ئەو وشانە بەرچاو دەکەون ، کە بۆ نووسین لە نێوان فەرمانگاو دام و دەزگای فەرمانی‌دا پێویستن )) ( هاوکاری ، ژ١٦١ ، ل٣) .

(( ئەو کەم و کورییانەی باسمان کردن کەم بن یا زۆر لە نرخی فەرهەنگۆکەکە کەم ناکەنەوە ، چونکە ئاشکرایە کە دانەرانی فەرهەنگۆکی ( زاراوەی پارێزگای سلێمانی) کارێکی گەورە و گرانیان پیٚ‌سپێررابوو . جیٚ‌بەجیٚ کردنی ئەم کارەش ئاسان نەبوو .

لەو باوەڕەداین گەلێك تەگەرە و کۆسپ هاتۆتە ڕێگایان ، کە چارەسەرکردنیان ئاسان نەبووە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هونەری بەرزی خۆیان نیشان داوە و لە نووسینی فەرهەنگۆکەکەدا سەرکەوتوو بوون . ئەو کەم و کورییانەش کە هەن دەتوانریٚ لە چاپی دووەمدا

دووربخرێنەوە .

ئومێددەکەین ، کە مامۆستایانی بەڕێز ، دانەرانی ئەم فەھەنگۆکە ، ئەو زانایانە ، کوردپەروەرانەی ئەم هەنگاوە گەورەیەیان ناوە گەلێك هەنگاوی تر بهاوێژن لە ڕێگای پێشخستنی زمانەکەماندا . داواشمان ئەوەیە کە بەدڵێکی فراوان ئەم بیروڕایەی ئێمە وەربگرن )) ( هاوکاری ، ژ١٦٢، ل٥) .

ئەمەش دوا بەندی ئەو وەڵامەمە ، کە بۆ وەڵامەکەی نووسیومە :

(( دوا وشەم ڕێز و تەقدیرە بۆ گشت ئەندامانی لیژنەی نووسینی فەرھەنگۆکی ( زاراوەی پارێزگای سلێمانی )و سوپاسە بۆ مامۆستای خۆشەویست کاك ڕەئووف ئالانیی بەڕێز . کە هیوامە لەوە دڵنیا بێت کە وا زۆر دڵسۆزانە ( دەستمان داوەتە پێنووسەکەمان )و بەپێی توانامان بە وردی ( باری کۆمەلەکەمان هەڵدەسەنگێنین ) و قەت لە خۆمانەوە نانووسین ( وابوو و وایە و وا بکرێ )و هەر ئەوەشە وا لە من و لە هەموو ڕۆشنبیرێکی دڵسۆزی کورد دەکا بە ئەوپەڕی خۆشەویستی و قەدر و ڕێز و شانازییەوە سەیری کۆششی دڵسۆزانەی پیاوی لێهاتووی وەك ئەندامانی دانانی فەرھەنگۆکی ( زاراوەی پارێزگای سلێمانی ) بکەین و زیاتر لە دواڕۆژی گەلی کوردی سەربەرزمان دڵنیابین .. هیوامە ئەم چەند وشەیەم بە چەپکە گوڵی وەفا و خۆشەویستی لەقەڵەم بدەن و لە هەموو هەڵەیەکم ببورن ، کە دیارە خۆم هەستم پێیان نەکردووە . ئەگینا هەرگیزاوهەرگیز مافی ژیانم نەدەدانێ )) ( هاوکاری ، ژ١٧٥ ، ل٦) .

خۆزگە م. وریا کەمێ ڕاستگۆبایە و ئەم پێوەندییە پڕ سەروەری و شکۆدارەی بە دژایەتی و کینداری ناونەدەبرد ... بریاش پچێك ئازابوایە و ددانی بەوەدا بنایە ، بۆچی دەستنووسی کتێبی (( کێشەیەك لە زمانی کوردیدا ))ی مامۆستا ڕەئووفی ئالانی ، کە لە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردییەوە بۆ هەڵسەنگاندن بۆیان ناردبوو ،

ڕەفزکردەوە و دوایی بە هەوڵ و تەقەلا و بەرپرسیاریی ماموٚستا محەمەد ئەمین هەورامانی و بەندە ڕێی لەچاپدانی درا و ، سەد شوکور ئاواتی نەهاتەدی ... نازانم چۆن ڕێی بە خۆی دا ببێتە ڕێگری ئەو بەرهەمە شاکارەی ئەو سوارچاکەی زمانی کوردی ...

گەر کاکە وریا بەڕێی ڕاستدا بڕۆیشتایە ، هەڵبەت بوختانی بۆ من نەدەهۆنییەوە ، بەڵکو خراپەکارییەکانی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە و دواییش تۆبەی دەکرد

* لەگەڵ ماموٚستا محەمەد ئەمین هەورامانیدا ، چ بە نووسین و چ بە وتووێژ ڕا و بۆچوونی جیاوازی زۆرمان لەبارەی کارە زمانەوانییەکانی یەکدییەوە دەربڕیوە ، بەڵام بۆ چرکەیەکیش دڵمان لە یەکتر نەیەشاوە و هەمیشە و هەردەم شانازیمان بە بەرهەمی یەکدی و دۆستایەتیی توند و تۆڵمانەوە کردووە ...

* بەڵێ لێکدانەوە و توێژینەوەی ورد و قووڵ ؛ هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی سی ساڵەی ماموٚستا مەسعوود محەمەدی براگەورەم کاریگەرییێکی زۆری بەسەر بیری زانستی و ژیانی تایبەتیمەوە هەیە ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، چەندین جار ڕەخنەمان لە یەکدی گرتووە[٤] و ئەمە

---

(٤) بەوێنە :

ا) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، پێداچوونەوەیێکی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی ماموٚستا مەسعوود محەمەد . گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، بەشی یەکەم ، ژ ٩٠ ، بەغدا ، ١٩٨٢، ل١٠ـ١٥؛ بەشی دووەم ، ژ٩٢، بەغدا ، ١٩٨٢، ل٣١ـ١٨.

ب) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چەند وشەیەک دەربارەی ( لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا ) ، گۆڤاری (( بەیان )) ، ژ٩٠، بەغدا ، ١٩٨٣، ل٦٢ـ٦٩.

ج) مەسعوود محەمەد ، لەگەڵ دەنگسازیی کوردیدا ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ٩٥ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل١٧ـ ٣٢.

نەك هەر نەبووە بە هۆی ئەوەی دڵی هیچمان گەردی لێ بنیشێ ، بەڵكو پتر و پتر لێك نێزك بووینەتەوە .

*من كە ڕەخنەم لە هەندێ لایەنی خەوشی وەرگێڕانی كتێبەكەی لازاریڤ گرتووە ، د. كاوسی مامۆستا و براگەورەم ، چەند جارێك پێی ڕاگەیاندووم ، كە لە چاپی دووەمدا ، كەڵك لە سەرنج و تێبینییەكانم وەردەگرێ و دەستخۆشی و ئافەرینی لێ كردووم .

* ئەگەر د. نەسرین فەخری و د. فارووق عومەر صدیق بەر لە من لە كێشەیێكی زمانەكەمان كۆلیبنەوە و ، منیش دواتر لە هەمان بواردا باسێكم نووسیبێ ، ئەدی چۆن ناویان نەبەم و ڕای خۆم سەبارەت كارەكانیان دەرنەبڕم ...

دیارە م. وریا دەیەوێ منیش بێنێتە سەر ڕێگە چەوتەكەی خۆی ـ واتە لێیان وەربگرم و ناویان نەبەم ... بۆم هەیە لەو برایەم بپرسم ، گەر من ویستبێتم لە قەدری ئەم مامۆستایانە كەم بكەمەوە ، ئەی بۆ نێوانی بەندە لەگەڵیان گەلێ خۆشترە ، وەك لە هی ئەو و ڕێزی من زیاتر دەگرن ؟ ... بەڵێ ((بە دەستی خۆی ئاگری بەرداوەتە گیانی خۆی)) ...

وەنەبێ كارێكی خراپ ، یان دۆخێكی نامۆ بێ ، گەر بەندە لە هەندێ بیر و بۆچوونیدا لەگەڵ ئەو خۆشك و برایەییدا یەكیان نەگرتبێتەوە ... بۆ دەبێ هەر ئەم دیوەی ناسەكە ببینرێ و ئەو دیوەی یەكێتیی ڕامان پەردەپۆش بكرێ ...

---

-

د) مەسعوود محەمەد ، تیر و پشكێ لە دەنگسازی ، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ)) ، ژ ۱۰۱ ، بەغدا ، ١٩٨٤ ، ل٢٨ـ ٥٢

... و هەندێكی دی .

ئەویش چەند نموونەییێك :

١ــ لــە بەشــی پێنجــەمی کتێبــی (( ڕێزمــانی کــوردی ــ کــردار ))دا نووسیومە :

أ) (( دەربارەی ئەم پێشگر و پاشگرە ، واتە ( ـ ەوە ) د. نەسسرین فەخری لەژێر ناوی ( پاشگر و پێشگری ڤ ــ یان ــ وە لـە زمانی کوردیـدا )دا (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل٢٣٤ـ ٢٧٣) وتارێکی بڵاوکردووەتەوە و تێیدا بە درێژی و بەڵگەوە لە واتا و دەور و پێکهاتن و ... ی دواوە و گەلێك ڕووی ئەو کێشەیەی ڕوون کردووەتەوە )) ( ل٨٦ ، پ٧٠).

ب) (( د. نەسرین باش بۆ ئەوە چووە ، کە ئەم پاشگرە ( ـ اندن )ە ، نەك ( ـ اند ) یان ( ـ دن ) . ڕاستترین بەڵگەشــی ئەوەیـە ، کـە لـە نـاوی کرداردا ( ناڵە ـ ناڵاندن )دا بە ڕەوانی دەردەکەوێ ... )) ( ل٩٠،پ٨٢) .

... و هەندێکی دی .

٢ـ لە بەشی یەکەمی کتێبی (( ڕێزمانی کوردی ـ ناو ))دا وتوومە :

أ) (( د. فاڕووق لە لاپەڕە (٤٦٤ ــ ٤٦٥)ی هەمان وتاردا بە شێوەیەکی ڕاست و زانستی ئەوەی نیشان داوە ، کە دەنگی (ە) لە پاشگری ( ـ یە)دا تیٚچووە و (ی) ماوەتەوە ... )) ( ل ١١٥، پ ٢٤) .

ب) (( د. فاڕووق عومەر صدیق ڕاست بۆ ئەوە چووە ، کە پاشگری ( ـ گا) و (ـ گە )ی شێوەی مۆرفێم (Allomorph)ی بەرانبەر (گاس)ی فارسیی ناوەڕاست ، کە بە مانای ( کات ، شوێن ... ) دێت دەوەستیٚ )) ( ل١١٦ ، پ٢٨)

ج) (( د. فـاڕووق عومــەر صدیــق بــە شـێوەیێکی گشـتی لــە باســی پاشگرەکانی ئەم گرووپەدا لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە و لەبار و گونجاوی کردووە . ئەوەی شایانی باس بێ ، ئەوەیە کە بە شێوەییێکی ڕێك و پێك

تێکڕای ئەو پاشگرانەی دەوری بچووك کردنەوە دەبینن ، بەسەر پێنج دەستەدا دابەش کردووە : ... )) (ل١٢١ ـ ١٢٢ ، پ٣٩).

... هتد

* بەندە لە تێکڕای ئەو بەرهەمانەیدا ، کە لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوەن ، بەڕێزەوە ئاوڕی لە کارەکانی مامۆستایان : سەعید صدقی کابان ؛ تۆفیق وەهبی ؛ نووری عەلی ئەمین .. داوەتەوە ... بەڵام م. وریا لە نووسینەکانیدا هەرگیزاوهەرگیز ناویان نابا ... پێم باشە ، کاکە وریا ئەوە بزانێ ، گەر ئەو پێشڕەوانە نەبوونایە ، نە من و نە ئەو پەیمان بە گەلێ یاسا و دەستوور و زاراوەی زمانەکەمان نەدەبرد ... چەندین جار مامۆستا نووری عەلی ئەمین ئەو ڕاز و گلەییی‌یەی لەلا کردووم ، کە م. وریا لە وتارەکانیدا هەر نووسینەکانی خۆی دەکاتە سەرچاوە و بە هیچ چەشنێك حساب بۆ ئیمەومانان ناکا ... هەرچی تۆی ، لەو شوێنانەدا کە لایەنگیریی بۆچوونەکانم دەکەی ، بێگومان زۆرم پێخۆشە ... لەو باسانەشدا ، کە ڕاتَ لەگەڵ لێکدانەوەکانمدا ناگونجێ ، گەلێ لەوەم پێ باشترە ، کە وەك م. وریا پشت گوێم بخەی .

قەڵەمی بەندە چ لەگەڵ ئەو زاتانەی لە سەرەوە ناوم بردن و چ لەگەڵ گەلێکی‌دی ، بەو شێوە و شێوازە ڕێز و شکۆیەیە ، کە گێڕاومەتەوە و نموونە و بەڵگەم هێناوەتەوە ، نەك ئەوەی م. وریا فەرموویە : (( ... ئەوە ساڵەهای ساڵە بەردەوام و بێ وەستان ئەم خەڵکە بەردەباران دەکا )) ( ل١) ... بۆ ئەوەیش . ئەو وتانەی هەر قسەی ڕووت نەبن و هیچ نەبێ خوێنەر کەمێك بڕوای پێبکا ، خۆ دەبوو چەند بەڵگەیێك لە وتە نابەجێکانی منیان بخاتە پێش چاو .

نکۆڵی لەوەش ناکەم . کە دوان سیانێك لەوانەی ڕەخنەم لێ‌گرتوون ،

لێم زیزن . ئەوانیش دوو بەشن .. بەشی یەکەمیان ، کە م. وریا و عەریفەکەیەتی ، لەبەر ئەوەی لە بنی کوولەکەکەم داوە و دەستەکەیانم خستووەتە ڕوو و ئیدیعای ناڕاستی ساڵەهایانم پووکاندۆتەوە ، شێتگیر بوون و تەنانەت لێم تووڕە و بەقینن ...

ئەوی دییش مامۆستا جەمال بابانی خزممە ، کە مەسەلەکەمان لە سنووری جیاوازییەکی کەمی بۆچوونماندایە لە بەکارهێنانی هەندێ وشەدا ... بێتو لەو باسەدا سەدی سەد منیش ڕاست بم هیچ لە پلە و پایە ؛ گەورەیی و سەروەری ؛ بەرهەمی بە بەرەکەتی ئەو نووسەرە بەناوبانگە کەم ناکاتەوە ... تەنیا هێندە هەیە کاشکی مامۆستا جەمال بەرانبەر ئەو وتارەم دڵاوا و دڵفراوانتر دەبوو و بە چاوی نازی خزمایەتی و ڕاژەی زمانی کوردی تێی دەڕوانی .

ئەوڕۆ ، کە م. وریا ناوی مامۆستا جەمالی لەو لیستەیەیدا ڕیزکردووە ، نەدەبوو ئەوەی لەبیر بچێ ، کە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو وتارەم فەرمووی : (( جا جەمال بابان شتە تۆ خۆتی پێوە خەریك بکەی )) ... بەندەش لە وەڵامدا پێی وت : (( ئەو نووسەری چیرۆکی ( خانزاد )و چەندین کتێب و وتاری بەرزە و ، تۆ هێشتا لە دایك نەبووبووی ، کە ئەو ناوبانگی دەرکردبوو ... )) .

ئیتر چی لەگەڵ سروشت و بارودۆخ بڵێین ، کە ئادەمیی وەك م. وریامان دێنێتە ڕیز ...

دیارە م. وریا لەو سەرەتایە بێئاگایە ، کە هەر زانستێك لەسەر بناخەی زانینی مەردووم و بنچینەی ڕەخنە و تێگەیشتنی هەموو ئەوەی لە زوودا کراون ، دابڕێژرێ پێش دەکەوێ و گەشەدەکا ... گەر وا نەبا ، هەڵبەت ئەو خزمەت و ڕاژەیەی بەندەی بە عەیب و عار دانەدەنا ...

بۆ ئەوەش ، کە بڵێ ئەورەحمان خۆی پڕ عەیبە ، ئەم شیعرە

عەرەبییەی خوارەوەی هێناوەتەوە :

لسانك لا تذكر به عورة أمري فكلك عورات وللناس السن

خۆزیا م. وریا :

١ـ دەگەیشتە ئەو ئاست و ڕادەیەی یادداشت کردنی کەموکورتیی کارێك لە پلار و توانج گرتنە کەسێك لەیەك جیابکاتەوە ...

٢ـ پەروەردەی ئەو شارە ڕەنگینە ـ ( کۆیە ) دەبوو ، کە لێی هاتووەتە دنیاوە و لە بریتیی ئەو شیعرە عەرەبییە ، شیعرێکی حاجی قادری کۆیی یان مەلای گەورەی دەکردە نموونەی زەدە و شوورەیی .

* *
*

م. وریا لە پەلەقاژێی ناوزڕانیدا هێندەی دی چووەتە ئاستێکی نزمترەوە و بۆیە شێتانە و بێپەروا بوختانەکانی گەورەتر دەکا و دەڵێ :
(( هەموو ئەوانەی لە بواری زمانەوانیدا کار ئەکەن دەمێکە دەرکی ئەوەیان کردووە کە بەرهەمە زمانەوانی یەکانی ئاوڕەحمانی حاجی مارف هیچ پێڕەو و ئامانج و ڕەسەنایەتی یەکیان تیا بەدی ناکرێ . هەموو ئەرشیفی و (اعداد) و جوونەوە و دووبارە کردنەوەن . هەر شتەکانی پێش خۆیەتی بە شێوەیەکی تر ئەیاننووسیتەوە و پڕ نموونەی شیعر یان ئەکات لاپەڕەکانی پێ زیاد ئەکات ))(ل٢).

بەداخەوە بۆ وەڵامی ئەمە ، ناچارم هەندێ ڕاستی بخەمە ڕوو :

١ـ هەر لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە تا ئەمڕۆ لە بەشی کوردیی پاریس دوو کتێبم کراونەتە بەرنامەی خوێندن .

٢ـ زوربەی مامۆستایانی زمانی کوردیی هەر سێ زانکۆکانی کوردستان ، کە دەچنە دەرسەوە ، کتێبی منیان بە دەستەوەیە و ددان

بەوەدا دەنێن ، کە سەرچاوە سەرەکیی وانە وتنەوەیانن ...

٣- بێ ئەوەی ئاگام لێبێ ، لە هەولێر و ئێران و ... چەند کتێبێکیان چاپ کردووەمەتەوە .

٤ . چەندین وتاری پەسەندکردن دەربارەی بەرهەمەکانم بڵاوکراونەتەوە(٥) و ژمارەیەك نامەی ڕاڵیبوونیانم بۆ نێرراوە(٦).

٥- دەیان دەستوور و یاسا و کێشەی زمانی کوردی بۆ یەکەم جار لە نووسینەکانی بەندەدا ناویان براوە و لێیان کۆڵراوەتەوە .

٦ــ ساڵی ١٩٨٦، کە کتێبی (( نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیی )) م بڵاوکردەوە ، م. وریا وتی : (( ئەمە ئەنسکلۆپیدیای ئیملای کوردییە )) ... هەرچی کاکە حەمەی مەلا کەریمە ، کە لەبەر بەرزیی و شارەزایی و ڕووناکبیری لە زۆر بەرهەم ڕازی نییە ، بەڵام لەبارەی ئەو بەرهەمەی منەوە ، ئەوساش و ئێستاش وتوویە و دەڵێ : (( جوهەرێکی جەبیارە )) ... مامۆستا مەسعوود محەمەدیش ، کاتێ کتێبی (( وشەی

---

(٥) بەنموونە :

ا) عبد الستار کاظم ، ملاحظات حول کتاب اللغة الکردیة فی ضوء الفونتیك ، مجلة (( شمس کردستان )) ، العدد ٦٢، بغداد ، ١٩٨١ ، ص١٥- ١٧ .

ب) محەمەد ئەحمەد سەعید ، چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ٨٥ ، بەغدا ، ١٩٨١، ل١٢- ١٧.

ج) م. ش . کۆچەر ئەلفوبێی کوردی بە پیتی لاتینی ، گۆڤاری ((نووسەری چیا)) ، ژ ٢ ، ١٩٨٥ ، ل٦ــ ١٨ . ئەوەتە ، ئەم نووسەرە لە پەراوێزی ( ژ٧ )دا وتوویە : (( بەشێك لەو سەرچاوانە لە کتێبەکەی مامۆستای زانا و شۆڕەسواری مەزنی ڕێگای زانستی زمانەوانی کوردی دوکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف وەرگیراوە )) (ل١٨) .

... و هەندێکی دی .

(٦) بەوێنە :

ا) وێنەی چەند دێرێکی نامەیێکی مامۆستا حەسەنی قزلجی :

کاکی بەنرخ و بەڕێز دوکتور ئەورەحمانی خوشەویست

دیاریە بەنرخەکانتم پێگەیشت زور سوپاست دەکەم .
تو کە لە تافی لاوێتیدا دەست و قەلەمت ئاوا بەنرخ و ڕەنگینبێ -
ئەدەب و زانیاری گەلەکەمان دەتوانی چاوەڕوانی پیت و بەرەکەتی پتری
قەلەمەکەت و بەرهەمی بەنرخی زیاترت بێ .

برات حسن قزلجی

**دەقی ئەو چەند دێڕە**

**(( کاکی بەنرخ و بەڕێز دوکتور ئەورەحمانی خۆشەویست**

**....**

**دیاریە بەنرخەکانتم پێگەیشت زور سوپاست دەکەم . تۆ کە لە تافی لاوێتیدا دەست و قەلەمت ئاوا بەنرخ و ڕەنگین بێ - ئەدەب و زانیاری گەلەکەمان دەتوانی چاوەڕوانی پیت و بەرکەتی پتری قەلەمەکەت و بەرهەمی بەنرخی زیاترت بێ ...**

**حسن قزلجی ))**

**ب) وێنەی چەند دێڕێکی نامەیێکی مامۆستا شێرکۆ بێکەس :**





**دەقی ئەو چەند دێڕە :**

**سلیمانی**

**١٩٨٣/٥/١٠**

**برای خۆشەویست و بەرێز**

**کاکەوڕەحمان**

**کاکە گیان : نووسینی بەردەوام و بەرهەمتان هەمیشە چاومان ڕوون ئەکاتەوە . لەگەڵ برایان کاکە مستەفا و کاکە ڕەئووف دا گەلێ جار باستان ئەکەین ...**

**کاکە گیان زنجیرە وتارەکانی ئەم دواییەتم هەر لەوەی نووسەرەوە تا دەگاتە ئەوانی تری عیراق کە یەکەیەکە بە وردی خوێندۆتەوە . من تێکڕا لەگەڵ بۆچوونی مەنتیقی و سەرنج و تێبینییە وردەکانتم ، ئەشزانم دڵی پاکتان سەرچاوەیانە...**

**......**

**شێرکۆ بێکەس**

-

ج) وێنەی چەند دێڕێکی نامەیێکی مامۆستا فەرهاد شاکەلی :



FERHAD SHAKELY

١٩٩٤/٨/١٨

برای هێژا و خۆشەویست کاک دوکتۆر ئەورەحمان ،

بەداخەوە ئەو ساڵانەی کە هێشتا لەوێ خوێندکار بووم پەکدیمان
نەدەناسی . بەڵام بێگومان ، ئەوە ساڵانێکە ئاشنای لێکۆڵینەوە و بەرهەم
هێژا و بە پێزەکانی ئێوەم و گەلێ جاریش لە کاری لێکۆڵینەوە و دەرزوتنەوەدا
کۆمەکیان کردووم .

دەستخۆشانە / فەرهاد شاکەلی

دەقی ئەو چەند دێڕە

١٩٩٤/٨/١٨

برای هێژا و خۆشەویست کاک دوکتۆر ئەورەحمان

.......

بەداخەوە ئەو ساڵانەی کە هێشتا لەوێ خوێندکار بووم یەکدیمان نەدەناسی . بەڵام بێگومان ، ئەوە ساڵانێکە ئاشنای لێکۆڵینەوە و بەرهەمە هێژا و بە پێزەکانی ئێوەم و گەلێ جاریش لە کاری لێکۆڵینەوە و دەرزوتنەوەدا کۆمەکیان کردووم .

......

فەرهاد شاکەلی

زمانی کوردی )) (١٩٧٥) خوێندەوە ، لەبەردەم کۆمەڵێك ڕووناکبیری گەورەدا . کە زوربەیان لە ژیاندان ، بە (( ئیبتیکار )) ناوی برد ...

... و هەندێکی دی

جا کە من (( پشتم سەفین بێ ، تف لە ئاسنیش دەکەم )) ...

هەقمە ، گەر لە م. وریا بپرسم : لەو بەڵگە و خاڵانەی دەربارەی بەرهەمەکانم خستمنەڕوو ، ئەو دەتوانێ تاکە یەکێکیان چییە ، سەبارەت بەوانی خۆیمان بۆ باس بکا ؟

کاکی هاوکارم ، بەدوا ئەو هەڵبەستەیەی باسی نووسینەکانمدا ، بۆ چۆنیەتیی دەرس وتنەوەم بوختانێکی شاخدارتر ڕێك دەخا و دەڵێ :
(( تەنانەت بەم دوایی یە یەکێ لە قوتابی‌یانی خوێندنی بالا کە ئاوەرحمان دەرسیان پێ ئەڵێتەوە پێ‌ی وتووە { مامۆستا باسی شتێ بۆ ئێمە بکە و شتێ بە ئێمە بڵێرەوە ئێمە نەیزانین ... ئەوانەی تۆ بە ئێمەی ئەڵێیتەوە هەمووی لەسەردەمی بەکالۆریۆسا وەرمان گرتوون .. و .. ئەیانزانین .. ئێمە قوتابی‌ی دوکتوراین ... } )) (ل٤) .

بەر لە هەر شت ، ئەوە چەند ساڵێکە من تەنیا دەرسی خوێندنی بالا دەڵێمەوە و بۆ هەر وەرزێکی خوێندنیش یەك بابەت ، یان ئەگەر زۆرم لێ‌بکەن لە دوو بابەت پتر وەرناگرم ، ئەویش لە پێناو فریاکەوتن بۆ خۆ باش ئامادەکردن و بەئەنجام گەیاندنی ئەو کارانەی بە دەستمەوەن ... هەرچی ئەو برایەیە ، وێڕای چەند بابەتێکی زمان ، ئەدەبیش و زمانی ئینگلیزی‌یش وەردەگرێ ... لە پۆلی یەکیش بابەتی ( وتووێژ ) ؛ لە پۆلی سێ ـ ( ئەدەبی بەراورد ) ... لە بەشی ئێواران و کۆلێژی شەریعە و شوێنانی‌دی فرکەی دێ ... (( لە هەر لا ئاشە ، کتك فەڕاشە )) ...

من جارێ تەنیا باسی ئەو دەرسانەی دەکەم ، کە لە خوێندنی بالای

بەشی کوردیی کۆلێژی پەروەردەی بەغدا وەریان دەگرێ ... بابەتی وەرزێکی ، هەر یەکێك لە بابەتی ( فۆنەتیك و فۆنۆلۆژی ) ، یان ( واتاناسی ) ، یان ( ڕستەسازی ) ، یان ( زمانناسی ) ، یان ( قوتابخانە زمانەوانییەکان ) ... بێ ، بە لای ئەوەوە هەر یەکە ، چونکە دە وتارێکی سەرەمقەستیی ، کە لە ڕۆژنامەی (( هاوکاری )) یان (( عیراق ))دا بڵاوی کردوونەتەوە ، فۆتۆکۆپی دەکا و دەیانداتە خوێندکارەکان ، بیانخوێننەوە . خۆ بێتو دوان لەو وتارە ڕۆژنامەییانە ، پێوەندییان بە بابەتەکەوە هەبێ ، ئەوە شوکرانە بژێری دەوێ .. خۆ گەر لە مانگێکدا دوو جارێك بێت ، ئەوە بەختی خوێندکاران یارە ... لەو دوو جارەشدا جارێکیان بۆ ماوەی چارەکێك باسی زانایی خۆیان بۆ دەکا و جاری دووەمیش بە سەرپێوە و بەهەڵەداوان سڵاوێکیان لێدەکا و عوزرخواییان بۆ دێنێتەوە ، کە کارێکی یەکجار گرنگی هەیە و نەڕۆن و نیو سەعاتێکی تر دێتەوە لایان ... بەڵام نەك هەر پاش نیو سەعات ، بەڵکو گەر هەفتەی ئایندە دەرکەوێتەوە ئافەرینی گەرەکە ... (( سەرێکی هەیە و هەزار سەودا )) ... لە هەر خوێندکارێکی خوێندنی باڵای هەر خولێك بپرسی ، بەوپەڕی پەژارە و گلەییەوە ، دەڵێ : هەمووی چەند جارێکی کەم بینیوومانە و هیچی پێنەوتووین ...

بۆ ئەو دەرسانەش ، کە دەبێ لە پۆلی یەك و سێ بیانڵێتەوە ، د. فوئاد حسێنی سەرۆکی بەشەکەمانی تەواو جاڕس و ماندوو کردووە ، چونکە بەردەوام زەنگ لێدراوە و بەشێکی کات تێپەڕیوە ، م. وریا نەچووەتە پۆل و لە ژوورەکەی خۆی دانیشتووە ... د. فوئاد ناچاردەبێ ، هۆشیاری بکاتەوە ... ئەویش بە پەلەپرووزە بەرەو پۆل دەڕوا ... پاش چارەکێك ، سەرۆکی بەش کە بەسەر پۆلەکاندا دەگەڕێ ، دەبینێ م. وریا لە پۆل نەماوە و خوێندکارەکان دەڵێن : هات و چەند دەقیقەیێك لامان بوو و بە

کارێکی پێویست ڕۆی بۆ کۆلێژی فلان ...

سەرجەم و سەرپاکی خوێندکاران لێی بە گلەیین و چەندین جار لای سەرۆکی بەشەکەمان و ئێمەی مامۆستایان ، چ لە دەرزنەوتنەوەی و چ لە ناڕاستیی و چەوتیی ڕاز و سکالاّیانە ...

بە شایەتیی هەموان - چ خوێندکاران و چ مامۆستایانی بەشەکەمان ، هەر دەرسەی سی کاتژمێری ڕەبەق خۆم و خوێندکار بە دەرسەکەوە ماندوو دەکەم ... ئەوجاش ئەوەتە خوێندکارەکانمان بە بەردەوامی لای د. کەمال مەزهەری براگەورەمان و د. فوئادی سەرۆکی بەشەکەمان ئەو ڕاستییە دەدرکێنن ... ئەمە وێڕای ئەوەی پێوەندیم لەگەڵ تێکڕایاندا وەك باوك لەگەڵ کوڕ و کچی خۆیدا وایە ... بۆ من جێی شانازی و سەروەرییە ، کە د. کەمال چەندین جار بە خاتوو شەهلای دلاّوای هاوسەری وتووە : کە دەبینم و دەبیستم ئەوڕەحمان بە زانست و زانیاریی دەولەمەند هێندە خۆی لەگەڵ خوێندکاران ماندوو دەکا و ئەوانیش بە شێوەییێکی بەرز ڕێزی لێدەگرن ... وا کاری تێ کردووم لە جاران پتر خۆشم بووێ ... د. فوئادیش دەڵێ : کە لەگەڵ طالبەکان کۆدەبمەوە ، مەدح هەر مەدحی تۆیە .

م. وریا (( ددان لە سنگی هاتووە )) و خۆی باش دەزانێ ، لەبەر درۆ و فڕی زۆری مامۆستایان و خوێندکاران ، کە ئاگادارن (( ڕاستیی وەك گۆچان وایە )) ، ناویان ناوە ( م. ڕاستگۆ ) یان ( أستاذ صادق ) .. بۆ تەڵەکەبازی‌یەکەشی مامۆستاییێکی بەشەکەمان دەڵێ : ئەم کابرایە ، هەتا فێڵ هەبێ دەیکا ...

م. وریا گەر ڕاستی بکردایە ، دەبوو ناوی ئەو خوێندکارەی خوێندنی دوکتۆرای پێ‌بووتینایە ، کە بەو چەشنە بە ناوییەوە ، ئەو درۆیەی هەڵبەستووە ... من بەش بە حاڵی خۆم کەسێکی وام پێ شك نایە و جێی

حەیف و داخە ، خەڵکی لە کەسانی چاك و بەئەمەك دەخاتە گومانەوە ...

م. وریا جارەها وتوویە : وەرە سەرپەرشتیی کاری دوکتۆرا بکە و دواییش ببێ بە دوژمنت ...

من ناڵێم گەر خوێندکار ببێتە دوژمنی مامۆستاکەی کارێکی باشە ... بەلاّم ، کە سەرپەرشت چ لە ڕووی یاریدەدان و چ لە ڕووی پێوەندییەوە لەگەڵ خوێندکارەکەی باش و ساخڵەم بوو ، مەحاڵە ئەو دوژمنایەتییە پەیدابێ ... ڕاستیتان دەوێ ، ئەمانە هەمووی گوناه و خەتای خۆیەتی ... ئەو دەڵێ من : (( سەرپەرشتی (١١) نامەی قوتابیی دوکتۆرا ...))م کردووە[٧] بەلاّم پێ لەوە نانێ لەگەڵ تاکە یەکێکیاندا چییە خۆی ماندوو نەکردووە . بۆ بەڵگەی ئەم بێباکییەی تەنیا لەو دوو نامەیە دەدوێم ، کە چەند مانگێك لەمەوبەر وتووێژیان لەمەڕ کرا و ئەم سەرپەرشتیان بوو :

١ـ گشت لایەکمان ئاگادارین چ ڕووداو و کارەساتێکی جەرگبڕی کەم وێنە لە مامۆستا عادل گەرمیانی قەوما ... لەو سەروبەرەدا چەندین ڕووناکبیری بەشەرەفی لەخۆبوردوو کەوتنەخۆ و ، پەڕە پەرش و بلاّوەکانی ڕەشنووسی نامەی ئەو برادەرەیان کۆکردەوە و هەر یەکە لە لایەنێکەوە هاریکاری کرد ، تا نامەکەی گەلاّڵە بوو ... تاکە کەسێك ، کە نەك هەر هێندەی سەرەداوێك یاریدەی نەدابێ و تەنانەت بۆ ڕۆژی لێدوانیشی نەیخوێندبێتەوە ، کاکە وریای مامۆستای سەرپەرشتی بوو ! ...

٢ ـ بەناو سەرپەرشتی نامەی مامۆستا نەوزەت ئەحمەد محەمەد زێباری بوو ... ڕۆژی وتووێژ و دەمەتەقێی نامەکە ، ئەندامانی لیژنە ڕەخنە و تێبینی زۆریان لە چاودێری کارەکە گرت .. م . وریاش بۆ داکۆکی لە

---

(٧) وریا عمر امین ، ڕۆژگیران و دەسکەوتی مەزن ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ١٤٤ ، بەغدا ، ١٩٩٩، ل٤٨ ( نووسەر لە چەند دێڕێکدا ).

خۆی لە وتەی کۆتاییدا لە پێش چاوی ئامادەبووانداا فەرمووی ((لەبەر ئەوەی کاتم نەبوو ، تەنیا فریای خوێندنەوەی سێ لاپەڕەی سەرەتای کەوتم ... داوام لێکرد بە پارە یەکێك بەکرێ بگرێ بۆی پێدابچێتەوە)) ... ئەم فەرمایشتە ئەندامانی لیژنە و دانیشتوانی ئەبڵەق کرد ...

نازانم م. وریا چۆن ویژدانی لێیگەڕاوە ، ئەو پارەیەی بۆ سەرپەرشتی کردنی دوکتۆرانامەکەی مامۆستا نەوزەت وەریگرتووە ، بخاتە تەنگەی باخەڵییەوە ؟... یان چۆن ڕووی هاتووە ، داوای لێ بکا بە پارە یەکێك بگرێ بۆی پێدابچێتەوە ؟ ... دەبا هیچ نەبایە بیوتایە ، ویستم بە بەشێکی ئەو پارەیەی وەرم گرتووە یەکێکی بۆ بگرم ... [٨] .

جا م . وریا ، کە بە لووت بەرزییەوە دەڵێ : من (( سەرپەرشتی (١١) نامەی قوتابیی دوکتۆرا ... ))م کردووە ، ئەوە هەمووی بە چەشنی ئەو دوو نموونەیەی سەرەوەن .. (( ئاش گرمەی دێ و ئاردی دیار نییە )) ... هەر بۆیەش ئەو خوێندکارانەی دەبنە بەشی ئەو ، شیوەنی بەدبەختیی چارەنووسی خۆیان دەکەن و دێنە لای سەرۆکی بەشەکەمان و داوای لێدەکەن ، هەر مامۆستاییێکی دییان لە جێی ئەو بۆ دانێ ، چاکەی لەبیر ناکەن ...

هیچ زێدە ڕۆیی ناکەم ، گەر بڵێم لە سەرپەرشتی کردنی نامەی ئەو خوێندکاری خوێندنی باڵایەدا ، کە بە باوەڕی خۆم کەم کارم لەگەڵ کردبێ و باش یاریدەم نەدابێ ، پتر لە چەند یازدەییێکی م. وریا خۆم لەگەڵ ماندوو کردووە ... جا هەر هۆی ئەوەشە سەرپاکی خوێندکارانی خوێندنی باڵا هانا دەبەنە بەر د. کەمال مەزهەر و د. فوئاد حسێن و لێیان دەپاڕێنەوە ، داوا لە بەندە بکەن ، سەرپەرشتیی نامەکانیان بکا ...

* *

---

(٨) سەیر ئەوەیە ، ئەو سێ لاپەڕەیەی سەرەتای نامەکە هەڵە و خەوشی زیاتر بوو ...

لە بەردەوامیی تاوانبارکردنم و هێرش بردنە سەرمدا نووسیویە :

(( ڕەخنەکانیشی ... حکە لە پووچییان لە ڕووی زانستییەوە تۆزقاڵێ گیان و ڕەوشتی ئەکادیمی یان پێوە بەدی ناکری ... هەموو شەڕە جنێوون )) (ل٢) .

گەر ئەم وتانە سەدی یەك ڕاستییان تێدا بوایە ، ئەو دەم :

١ـ گۆڤار و ڕۆژنامەکان ئەو وتارانەیان بۆ بڵاونەدەکردمەوە .

٢ـ زوربەی ڕەخنەلێگیراوان سوپاس و ستایشیان نەدەکردم .

٣ـ د. کاوس قەفتان بڕیاری نەدەدا بۆ چاپی دووەمی وەرگێڕانەکەی کەڵك و سوود لە تێبینی و سەرنجەکانم وەربگرێ .

٤ـ لە کتێبی (( ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی ( مامۆستا عولەما )دا ، کە مامۆستا عەلی کەریمی چاپی کردووە و نە بینیوومە و نە دەیناسم ، نەدەهات ئەو ڕەخنەیەی ساڵی ١٩٧٩ لە د. جەمال نەبەزم گرتبوو ، بخاتە دووتوێی ئەو کتێبە بەهایەیەوە [٩] .

... هتد

هەرچی ئەوەشە ، کە لە دوو بەرگی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە ))دا دەربارەی م. وریا تۆمارم کردووە ، بەلای کەمەوە ئەو ڕاستییانەی خوارەوەم یادداشت کردووە :

* ئەگەر م. وریا بە چوار وشەی ( ماڵ ، هەڤاڵ ، ساماڵ ، تاڵ ) یاساییێکی نابەجێ بۆ زمانی دەوڵەمەندی کوردی ڕۆبنێ و بڵێ :

(( .. هەموو لامێکیش دوای ئەلف بێ لە زمانی کوردیدا قەڵەوە )) ، ئەوە بەپێی پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی مەنتیقی کاردەکا و کارەکەی هەمە لایەنە .. بەڵام یەکێکی دی دەیان وشە بهێنێتەوە ، کە ( ل )ی دوای

---

(٩) عەلی کەریمی ، ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی ( مامۆستا عولەما ) سوید ، ١٩٩٩ ... ( ل ٤٣١ ـ ٤٤٥ ـ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، با ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ٧٢ ، بەغدا ، ١٩٧٩ ) .

( ا )یـان لاوازبـیٚ ، وەك : (ئـالان ، ئـالودە ، ئـالیك ، ئالیكـار ، ئالیسـۆر ، ئالك ، ئالگ ، ئالنگ ، بالۆرە ، بالووكە ، چالاك ، چوالـە ، زالـە ، سـالار ، قالۆنچە ، كالیار ، لالۆ ، لالـەباس ، لالـەزار ، لالـووت ، لالغاو ، مالوان ) .. ئـەوە كـاری ئـەو كەسـە هـەر دیـوی دەرەوەی زمـان دەبینـیٚ و سـاكار دەردەچـیٚ ... یـاخود ئەوێكی ڕێبازی تازەگـەری ، كە لـەو چـەند دیٚـڕەدا جیاوازی لە نێوان مەفهوومی دەنگ و پیتدا نـەكردبیٚ و ئێمـە و مانـانێك ، كـە هـەرگیز هەڵـەی وای لـیٚ ڕوونـەدابین ، ئـەوە چ لایـەكمان هـەر دیـوی دەرەوەی زمان دەبینین ؟

* ئێمـە بیسـت سـاڵێك لەمەوبـەر ئـەوەمان یادداشـت كردبـیٚ ، كـە لـە دیالێكتی كوردیی خواروودا ، لە دۆخی بانگهێشتن و دۆخی تیاندا نێر و مـیٚ جیادەكرێنـەوە و لـە دەقـەری جیـاوازەوە نموونـەمان هێنابێتـەوە .. كەچی دواتـر و بـە دوا ئـەو دۆزینەوەیەدا م. وریـا بیٚئاگایانـە بڵـیٚ : (( لـە كوردیی خواروشدا لە نیدادا نەبیٚ جنس جیاناكرێتەوە )) ، ئیتر بۆ دەبیٚ لێكۆڵینـەوە دروسـت و ڕاسـتەكە ساكار بیٚ وقسە بیٚ بەڵگە و هەڵەكـەش زانستی بیٚ ؟

*یـەكێك ئیدیعـای پـەیڕەوی كردنـی ڕێبـازە تازەكـانی زمانـەوانی و مـەنتیقی بكـات و وشـەی هـاوبێژ (Homonym)و وشـەی فرەواتـا (Polysemantic) تێكەڵ بە یەك بكات ، كەچی منێكی ساكاری ڕێبازی چاولێكـەری پـتر لـە بیسـت سـاڵ لەمـەو پێـش لێكم جیاكردبنـەوە ، ئـەوە ڕێبازی كاممان باشترە ؟

* نووسـەرێك دوور لـە گشـت داب و نـەریتێكی زانسـتانە ، بـە ڕۆژی ڕووناك كەرەستە لە بەرهەمی ڕێزماننووسانی كورد و نامـەی ماجستێر و دوكتۆریی خوێندكارانی كوردەوە وەربگـریٚ و بە هیچ چەشـنێك ناویـان نەبا و بیكا بە موڵكی خۆی و سەرباری ئەو كارە ناڕەوایە ـ بە سووك و

ئاسانی پەردەپۆش کردنی ئەو ڕاستی‌یە ـ بە هەق و بە ڕێبازی نوێگەری بزانێ .. کەچی خەڵکی دی ، کە ئەمانەت دەپارێزن و گەشە بە لێکۆڵینەوەی باووباپیرانیان دەدەن ، بە ناشارەزا و لە دنیا نەگەیشتوو دابنێ .

* لە ئەنجامی کەم ئاگایی و قووڵ نەبوونەوە و ئاوڕ لە سەرچاوە نەدانەوە ، زانیاری‌یێکی ناتەواو دەربارەی تایبەتێتی‌یێکی شێوەیێکی کوردی وەربگرێ و بە یاسایێکی گشتیی بۆ سەرلەبەری زمانی کوردی ناوبەرێ و بە فرەڕوویی و مەنتقیی و تازەگەریی دابنێ ، بەلاّم زانیاریی تەواو و گشتیی زمانەکەمان لە قاڵبی زانستیدا جێگیر بکرێ ، بە لای ئەوەوە یاسای یەك لایەنە بێ ...

* زمانەوانێك بۆ وتنەوەی دەستوورێکی ڕێکوپێکی دەیان ساڵ لەمەوبەر باسکراو ، سێ وشە بهێنێتەوە ، کە دوانیان بیژۆك بن و بەر دەستوورەکە نەکەون و تاکە یەکێکیان بەپێی یاساکە بڕوات .. ئەوە ناچارین هەزار شاڵلاّ و خۆزگە بۆ ( تەقلیدی )یەکەی خۆمان بخوازین .

* پرۆفیسۆرێك ئاگای لەوە نەبێ ، کە لە چەندین لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا چوار جنس باددداشت کراوە و بڵێ : سێ‌جنس دەست نیشان کراوە .. یان وشەیێکی یەکجار باوی ڕووسیی جنسی مێ بە نێر دابنێ .. ئیتر بە کام لێکۆڵینەوەی نوێ هەردوو دیو دەخوێنێتەوە .

* تۆژەرێك خۆی چەندین ساڵ باسی بوونی کرداری سادەی کردبێ ، کەچی ئێستا ئاگای لەو وتانەی خۆی نەمابی و بەرانبەر ئەو بۆجوونە وەستابێ ، کە لەگەڵ ڕایەکەی خۆی دەگونجێ ، دەبێ نرخ و بەها و سەنگی ئەو وتە نازانستی‌یەی چەند بێ ؟ ...

* بێتو قوتابی‌یەکیش وشەکانی ( ئازا ) و ( پیاو ) بە ڕەگی کردار دابنێ ، بەهیچ جۆرێك لێی قبووڵ ناکرێ ... کەواتە م . وریا چۆن ڕێ بە

خۆی دەدا باسی ساکاریی زانایانی کورد بکا ؟ .

* بە کوردی و بە کورتی ، وا پێدەچێ بە لای م. وریاوە ، قسەی ڕووتی بێ بەڵگە و بێ نموونە ؛ بێ ئاگایی و بێ خەبەری لە بەرهەمی دیار و بەرچاوی زانایانی کورد ؛ ناونەهێنانی سەرچاوە و بە چاوی سووك تەماشاکردنی کاری زمانەوانان ؛ قسەی خراپ بە گەورە پیاوانی کورد ؛ لەملاو لەولا زانیاری وەرگرتن و کردنە موڵکی خۆ و مافی خاوەنەکەی زەوت کردن ؛ دیاردەی دزێو و نابەجێ و نادروست ؛ بێ سەلیقەیی و ساکاریی کەرەستە و زانیاری و هەڵەی گەورە ؛ وشەی دژ بە یەکی بێ سەروبەر ؛ لەنگی و خواروخێچیی کوردی نووسین : شێوازی نزم و زمانی کووچە و کۆڵانان ..(( پێڕەوە تازەکانی زمانەوانی و مەنتیقی )) بن و هەرچی قسەی بە کاکڵی بە بەڵگە ؛ ئاگاداری و خەبەرداری لە کاری زانایانی کورد ؛ ناوهێنانی سەرچاوە و بایەخدان بە بەری ڕەنجی زمانەوانان ؛ ڕێزگرتنی گەورە پیاوانی کورد ؛ دەست نەگرتن بەسەر ملکی خەڵکی و زەوت نەکردنی مافی خاوەنەکەی ؛ دیاردەی ڕاست و بەجێ و دروست ؛ وردی و بە سەلیقەیی و کەرەستە و زانیاریی باش ؛ وشە و بیری پتەو ؛ ڕەوانی و پاراویی کوردی نووسین ؛ شێوازی بەرز و زمانی ئەدەبی .. یشە ڕێبازی سادەی چاولێکەری بن[١٠] .

- هاوکاری هێژام بەرانبەر ئەوەی دەستەواژەی ( بێ بیر کردنەوە )م بەکارهێناوە ، کە دەڵێ : ئەو دەربڕینە (( لە زانستا نییە و جێی نابێتەوە و نابێ خاوەنی ناسناوی ئەکادیمی ئەم جۆرە دەربڕینانە بەکاربێنێ )) . ئەمانە لە قسەی زانای لوتکە و فریشتەی ئاسمان دەچن .. یەکێك بەو چەشنە زانست پەروەر بێ و قسەی هێندە بەجێ بێ ، بە ڕۆژی ڕووناك کەرەستە لەملاو لەولا وەرناگرێ و بیکاتە موڵکی خۆی و شێوازی

---

(١٠) بۆ پتر زانیاری لەو بارەیەوە ، بڕوانە : د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕەخنەی ناڕەختە ، بەرگی یەکەم ، سلێمانی ، ١٩٨٨، ل ٥٥ ـ ٥٨.

نووسینی زمانی لاکۆڵان نابێ و ناڵێ : (( .. ڕایەکی پووچە و بەتیشکی نەزەری‌یەی فۆنێم فش دەبێتەوە )) و توانج و تانە ناگرێتە کەڵەمێرانی کوردو و کفری وا ناکا زاتێکی وەك مامۆستا مەسعوود محەمەد بە ( .. درێژدادر ) ناوبەرێ ..

جا گەلۆ ! ئەو ( بێ بیرکردنەوە )یەی بەندە لە زانستدا جێی نابێتەوە ، یان ئەو ڕەفتار و تەڕ زمانی‌یەی م. وریا ؟

گەر مەرج وابێ ، خاون ناسناوی ئەکادێمی دەست بەسەر ماڵی خەڵکی‌دا بگرێ ، لە بێ ئاگایی یاسای سەیر و سەمەرە بێنێتە ناوان ؛ بە زمانی کووچە و کۆڵانان بدوێ ؛ پلار و تەوس بگرێتە زانایان .. ئەوە یاران ببورن ، من ناسناوی ئەکادێمیم ناوێ و هەر پیرۆز بەوانە بێ ، کە چێژ لەو شێواز و ڕێبازە وەردەکردن[11].

* بایەخ بە ئێتیمۆلۆجیی وشە نادات ، کە ئەمە لایەنێکی یەکجار گرنگی هەر زمانێك و کێشەیێکی گەوری زمانەوانی‌یە .. بە نموونە لە زمانی ڕووسیدا وشە نییە ئەسڵ و ڕەگەزی ئاشکرا نەکرابێ ، بۆیە لێکولێنەوە لەو زمانە بەپێی پەیڕەوی کردنی پێڕەوە نوێکان کارێکی ژیرانەیە ، بەڵام ، ئێمەیێکی کورد کە لەو مەیدانەدا هێشتا شتێکی ئەوتۆمان ساخ نەکردبێتەوە ، ئیتر چۆن بیانخەینە بەر تیشکی پێڕەوە نوێکانی زمانەوانی

* زمانەوانێك واتا و ڕۆنانی سەدان وشەی زمانەکەی نەزانێ ، چەندین وشە بە هەڵە بەکاربێنێ و بنووسێ ؛ ڕستە بە خواروخێچی دابڕێژێ .. نەك هیچ شێواز و ڕێبازێکی لێکۆڵینەوە دادیی نادا ، بەڵکو کۆمپیوتەریش فریای ناکەوێ ..

---

(١١) هەمان سەرچاوە ، ل٥٩ - ٦٠.

* زمانەوانێك لە باسی جێناوە كەسی‌یە جوداكانی دیالێكتی كرمانجیی ژووروودا ( هوون = ئێوە ) بە ( هون ) تۆماربكا ؛ لە لێدوانی جێناوە لكاوەكانی دیالێكتی خوارووی كوردیدا ، ڕستەی وەك : ( من بۆم ناردنیت ) و ( تۆ بۆت ناردنین ) .. نموونەی بن ؛ لە چیرۆكیدا بە ( دارلاستیك ) كۆتر ( بگرێ ) ، یان ڕستەی ناقۆلای وەك ( لە ڕۆژێكی یەكجار سارد لە زستانا ) دارێژی .. ئەوە ئەو جۆرە دەربڕینانە ، كە كورد بەو چەشنەی م. وریا نەیانڵێ ، بێ گومان كەرەستەی وا وێران ، مەنتیق دەشێوێنێ و بەرەو نشوستیی دەبا ، بۆیە هیچ ڕێباز و پێڕەوێك پێی ناكرێ ، هەردوو دیوی لێك بداتەوە ، بەڵكو تەنانەت دیوی ساكاری دەرەوەشی پێ ساخ ناكریتەوە [١٢] ..

... و چەندینی دی

ئەم جۆرە باشاگەردانی و بەربادییە بە زوربەی بەرهەمەكانییەوە دیارە .

جا خۆی كە نەك هەر تا ئەم شوێنە ، بەڵكو لە تێكڕای لاپەڕكانی دواتری ( بوختاننامە ) هەشت لاپەڕەییەكەیدا ، لەو وشە ناشیرین و ڕەزاقورس و گرانانە بەولاوە ، هیچی تری نەوتووە ... نە بەڵگەیێك ، نە نموونەییێك ... و كەچی بەندە بە جوێن فرۆش و پووچ و نەزان ناودەبا .

لەوەش سەرنج ڕاكێشتر ئەوەیە ، هۆی تاوانباركردنی بەندە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی گوایا (( هەمووی ڕەنگدانەوەی عونجوهییەت و خۆ بەشت زانینی بێ ئەساس ))ن (ل٢) .

ئەگەر م. وریا بە چرای ڕۆن گەرچەكیشەوە بە هەموو نووسینەكانمدا بگەڕێ ، ناتوانێ یەك ڕستە چییە بدۆزێتەوە ، كە بیكاتە بەڵگەی (( خۆ بە شت زانینی )) من . دیارە ئەم برایە لە خۆیەوە دەڕوانێ ، چونكە سەری

---

(١٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٧٢.

زمانی و بنی زمانی باسی خۆیەتی ... هەمیشە دەیڵێ و دەیڵێتەوە : من ئیسپاتم کردی‌یە ئەرز بە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێتەوە ... هەموو ڕێزمانی ئینگلیزیم کردۆتە یەك لاپەڕە ... و گەلێ لەوانە سەیرتر ، کورد وتەنی (( ئەوەی دەیڵێ نایڵێتەوە )) ... ئەمە بە دەمی .

فەرموون ، ئەویش چەند وێنەیێك ، کە بە نووسین لە پاشکۆی وتاری ((ڕۆژگێران و دەستکەوتی مەزن))دا [١٣] باسی سوارچاکیی و لێهاتوویی خۆی دەکا .

* (( سەدان باس و وتاری زانستی‌ی بواری ( فەلك و فیزیا و جوغرافیا و ئیکۆلۆجی ... هتد ) بڵاوکراوەتەوە )) (ل٤٩) .

لێرەدا لە دوو ڕووەوە گومان لە نووسەری ئەم وتانە دەکرێ .

١ـ لە واتای وشەی ( سەدان ) تێنەگات و نەزانێ ( کە چەند جار سەد ) دەکاتە ( سەدان ) ، چونکە لە زۆر شوێنی دیشدا ، بەهەمان شێوە ، بە گۆترە و بێ کێشانە و پێوانە داوێتی‌یە بەری ... بەوێنە ، ئەوەتە مانای یەکەم وشەی ئەم وتارەی خۆی ـ واتە وشەی (کۆنینەکان) : (( کۆنینەکان .. بە چاو و دڵ و هەستێکی پڕ لە ترس و گومانەوە سەیری دیاردەی ڕۆژگیران و مانگ گیرانیان ئەکرد )) ( ل ٤٥ )ی بەهەڵە بەکارهێناوە ، گوایا ئەو ویستوویە بڵێ (مرۆ ، ئادەمیزاد ، ئینسانی زوو... ) ، کەچی لەبەر ئەوەی لە زمانی بابی ناشارەزا و نابەڵەدە ، ((کۆنینەکان)) ، کە واتای (ئاسەواری کۆن) دەگەیەنێ بە ( مرۆی کۆن ) تێگەیشتووە... ئاخر کاکە برا ، کە گلەییت لێ‌دەکەم و دەستەوداوێنت دەبم ، ئاوڕ لە نووسراوان بدەیتەوە ، لەبەر ئا ئەمەیە... کورد وتەنی ، خۆ کفر نەدەبوو تەماشایێکی ((فەرهەنگی مەهاباد))ی مامۆستا گیوی موکریانی بکەی و بزانی ((کۆنینەکان)) یانی چی !...

---

(١٣) وریا عمر امین ، ڕۆژگیران و دەسکەوتی مەزن ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ١٤٤، بەغدا ١٩٩٩، ل٤٥ ـ ٤٩.

ئەوەتە مامۆستا گیوی موکریانی لە لاپەڕە (٤٩١)ی ئەو فەرهەنگەیدا وتوویە :

کۆنینە ـ آثار ، آثار قدیمە.

ئەمە ((هەڵمەتە کاسەیە)) و هەزار ڕەحمەت لە پێشینان ، کە وتوویانە : (بەیار کێڵان و گای لەڕ).

٢ـ بیەوێ لای کەسانی بێئاگا خۆی هەڵبکێشێ... چونکە بەپێی ئەو وتانەی ، دەبێ لەو بوارانەدا بەلای کەمەوە سێسەد[14] وتارێکی بڵاوکردبێتەوە... ئەوەی ئێمە ئاگادارین ، ئەو جۆرە نووسینانەی لە دەپازدە سەرەمقەست و سێچوار وتاری دە لاپەڕەیی تێناپەڕن ، کە گشتیشیانی یان لە کتێبی قوتابخانەکانەوە وەرگرتووە ، یان لە عەرەبی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوە .

چەند نموونەیێك :

أ) لەبارەی ئەو وتارەی بە نێوی ((کارەساتی کۆچەرەکان))ەوە لە ڕۆژنامەی (عیراق ، ژ ٣١٦٥ ، ١٩٨٦/٦/١٨)دا بڵاوی کردووەتەوە ، لە (ل٣٠ ـ ٣١)ی بەرگی یەکەمی نامیلکەی ((ڕەخنەی ناڕەختە))دا نیشانم داوە ، کە دەستپاك نییە و وەری گێڕاوە... بەڕاستی ((کل لە چاو دەفڕێنێ)) .

ب) وتاری ((ڕۆژگیران و دەسکەوتی مەزن)) ، کە بابەتی ئەم بآسەمانە ، چ لێکۆڵینەوە و چ وێنەکانی لە کتێبی فیزیای پۆلی سێیەمی ناوەندی (ل١٢٦ ـ ١٣٢)یەوە وەریگرتووە... بۆ ئەوەش ، کە نەناسرێتەوە لە کتێبی جوگرافیاشەوە یەك دوو لاپەڕە و وێنەی دەرهێناوە و هەندێکیش سەروگوێلاکی کوردییەکەی کوتاوەتەوە...

---

(١٤) (سەدان) ـ لە سێسەد بەرەوژوور دەگرێتەوە.

ج) له فایلەکەی مامۆستا حەمە شواندا ، دوو وتاری لەم بابەتەی م. وریا و ئەسڵە عەرەبییەکەیان ، کە لە گۆڤارێکی کوێتیدا بڵاوکراونەتەوە ، هەیە... هیوامە لە دەرەفەتێکدا ، ئەوانەش بخەمە پێش چاوی خوێنەری ئازیز...

... هتد .

له بەندی دووەمی ئەم بەخۆ هەڵدانەدا ، ئەوەی دەیان ساڵە زانایانی کورد هێناویانەتە بەرهەم ، تەفروتوونا دەکا و خۆی دەکاتە شاسواری مەیدان و بە یەکجاری سنوور دەبەزێنێ و لەبارەی خۆیەوە دەڵێ : ((یەکەم نووسەری کوردە هەوڵ ئەدات دیاردەکانی سروشت و باسی زانستی بە زمانێکی ئەدەبیی سادە و ڕەوان پێشکەش بکات))(ل ٤٩).

واپێدەچێ بیەوێ ڕایبگەیەنێ ، کە ((مەل نەماوە ، کوڕکوڕە بووە بە شای مەلان))...

باسی ئەو کارە زانستیانە ناکەم ، کە بەر لە ساڵانی حەفتادا بڵاوکراونەتەوە... بەڵام هەر لە سەرەتای (١١)ی ئازاری ١٩٧٠وە هەڵمەتی وەرگێڕانی سەرجەمی کتێبەکانی قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکان دەستی پێکرد و تا ساڵی ١٩٧٤ ( کە م. وریا تازە کۆلێژی تەواو کردبوو ) ، نەوەد کتێب وەرگێڕران ، کە دەیان پسپۆڕ و شارەزای بوارە جیاجیاکانی زانست بەشدارییان تێدا کردبوو... باسەکانی هەر یەکێك لەو کتێبانە . گەلێ لەوانەی م. وریا شانازییان پێوە دەکات ، زانستیانەتر و وردتر و تێروتەسەلتر و ڕەوانترن...

هەر لەو ماوەیەدا بە کوردی دوو گۆڤاری (زانیاری) و (پەروەردە و زانست) دەردەچوون و دەیان وتاری زانستییان بڵاوکردووەتەوە .

زانایانی وەك : جەمال عەبدوول ؛ کەمال جەلال غەریب ؛ عەبدولخالق مەعرووف ؛ ئەکرەم قەرەداغی ، شێخ صدیق بەرزنجی... کتێبی بە بەها و

بەنرخی زانستی‌یان بەچاپ گەیاندووە... دەوری مامۆستایان : نەوزاد عومەر محێدین و نووری عارف قەرەداغی و ڕەئووف جەلال و محەمەد ئەمین حەسەن و چەندینی دی لەبیر ناکرێن...

لەم چەند ساڵەی دواییشدا لە سلێمانی و هەولێر و دهۆك ژمارەیێك كتێبی كەم‌وێنەی ئەو بوارە كەوتوونەتە بەر دەست خوێنەران... ئەمە وێڕای ئەوەی گۆڤاری باڵای تەرخان كراو بۆ وەرگێڕان و لێكۆڵینەوەی زانست و بەتایبەت گۆڤاری (( زانستی سەردەم )) ، كە لە هەندەرانیش دەنگی داوەتەوە .

جا ئەمانە مشتێكن لە خەرواریك... بەڵێ چ زانست و زانیاری ؛ چ باس و بابەت ؛ چ پاراوی و ڕەوانیی كوردیی مامۆستایانی ئەو بەرهەمانەش هی ئەوە نین لەگەڵ ئەوانی م. وریا بەراورد بكرێن... خەڵكی هۆشیار و ئاگادارە و هاژە و هووڕی خۆدەرخستنی ئەو، بۆ چركەیەكیش خۆری ئەو زاتانەی پێناگیرێ و كاری گەورە و گران و سەنگینیانی پێ پەردەپۆش ناكرێ.

* م. وریا لە پێناوی وەدی‌هێنانی كام و ئارەزووی خۆپەسنی و خۆهەڵكێشاندا فرە چاوقایمانە دەڵێ : ((سەدان لێكۆڵینەوە و وتار و باسی زمانەوانیی بڵاوكراوەتەوە)) (ل ٤٩)

نووسەری ئەم وشە قەبانە لە بواری زمانەوانیدا خاوەنی یەك نامیلكە و حەوهەشت باسی دەپازدە لاپەڕەیی و بیست وتارێكی سێ‌چوار لاپەڕەیی‌یە و (ئاو بێنە و دەست بشۆ)... ئەوجا :

١ـ بیست كورتە وتارەكەی لە شەش حەوت دانە تێناپەڕن ، بەڵام بەوەی ، كە ماوەیێك بەسەر یەكێكیاندا دەڕوا ، دێت ناونیشانی دەگۆڕێ و چەند وشەیێكی دەخاتە سەر و سەرلەنوێ بڵاوی دەكاتەوە .

فەرموون ئەوە نموونەیێك :

له ڕۆژنامەی (عیراق)ی ڕۆژی ١٩٨٤/١٢/١٢دا بە نێوی (زمانەوانی)یەوە وتارێکی نووسیوە... پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ و شتێك ـ واتە لە ١٩٨٨/١/٢٠دا هەر لەو ڕۆژنامەیەدا ، دیسان هەمان وتاری بڵاوکردووەتەوە و بۆ نەناسینەوەی ناونیشانەکەی کردووە بە (زانستی زمانی وەسفی) .

ئەویش فۆتۆکۆپیی هەردوو چاپەکە :

## أ) (زمانەوانی) ، ڕۆژنامەی (عیراق) ١٢ / ١٢ / ١٩٨٤

# زمانەوانی

د. وریا عمر امین

زانستی زمانی وەسفی دوو ئەرك و ئامانجی زۆر جیاواز بەڵام بە یەك بەستراوی هەیە .

یەکەم وەسف کردنی تاکە زمانەکان وەك دیاردەیەکی سەربەخۆ . بۆ دەرخستن و پیشاندانی شێوەو جۆنیەتی کار کردنی ئەم زمانە کە لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێکەوە لە کاتێکی دەست نیشان کراودا بەکار ئەهێنرێ . لێکۆڵینەوەی زمان لەسەر بناغەی زانستی زمانی وەسفی بایەخ بە زمانەکە ئەدات تەنیا لەو سانە تایبەتیەدا . بێ ئەوەی باسی هیچ قۆناغێکی تری مێژوویی زمانەکە بکرێت یا باسی هیچ زمانێکی تر بکرێت چ دوور چ نزیك ئێ . واتا سیمای ئەو سانە تایبەتیەی زمانەکە دەست نیشان ئەکات .

ئامانجی دووەمی زانستی زمانی وەسفی بەدی هێنانی ئەزمەری یەکی گشتیە بۆ زمان بکرێ بەپێوەی لە ناو جوار جێوەیا زمانە جیاوازەکانی جیهان شی بکرێنەوەو هەبوون و نەبوون و دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی هەر دیاردەیەك لە زمانێکا بخرێتە پاڵ هۆیێکەوە بەپێی ئەو مەنتیقەی ئەزمەری یەکەی لەسەر دامەزراوە .

## ب) (زانستی زمانی وەسفی) ، ڕۆژنامەی (عیراق) ٢٠ / ١ / ١٩٨٨

# زانستی زمانی وەسفی

وریا عمر امین - بەغدا

• زانستی زمانی وەسفی دوو ئەرك و ئامانجی زۆر جیاواز بەڵام بەیەك بەستراوی هەیە .

• یەکەم - وەسف کردنی زمانەکان .. هەر یەکە بەجیا وەك دیاردەی سەربەخۆ بۆ دەرخستن و پیشاندانی شێوە و جۆنیەتی کار کردنی ئەو زمانە کە کۆمەڵە خەڵکی لە کاتێکی دەست نیشان کراوا قسەی پێ ئەکەن (بۆ نموونە زمانی کوردی ، ئیستاسان ، زمانی ئینگلیزی ی سەردەمی جۆسەر ... هتد ) .

لێکۆڵینەوەی زمان لەسەر بناغەی وەسفی سیمای زمانەکە دەخاتە ڕوو لەو کاتە تایبەتی بە دەست نیشان کراوەدا بەکار هێنراوە . لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا نابێ باسی هیچ قۆناغێکی تری مێژوویی زمانەکە بکرێ و نابێ باسی هیچ زمانێکی تر بکرێ و لەگەڵیا بەراوورد بکرێ . (بۆ ئەمانە لقی تر هەن لەزانستی زمانا ) .

• دووەم ئامانجی زانستی زمانی وەسفی بەدی هێنانی ئەزمەری یەکی گشتی بە بۆ زمان ، بکرێ بەپێوەی زمانە جیاوازەکانی جیهانی پێ شی بکرێنەوە . هەبوون و نەبوون و دەرکەوتن و دەرنەکەوتنی هەر دیاردەیەك لە زمانێکا بخرێتە پاڵ هۆیەکەوە بەپێی ئەو مەنتیقەی ئەزمەری یەکەی لەسەر دامەزراوە .

زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بە جۆری یەکەمی بەشە بنچیەکانی رستە تیایانا بەم جۆرە ریز ئەبن ( بکەر ـ فرمان ـ بەرکار ) .

زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بە کۆمەلی دووەمن ریز بوونی بەشە بنچیەکانی رستە بەم جۆرەیە ( بکەر ـ بەرکار ـ فرمان ) .

زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بە کۆمەلی سێیەمن ریز بوونی بەشە بنچیەکانی رستە بەم جۆرەیە ( فرمان ـ بکەر ـ بەرکار ) .

بە بەراوورد کردنی ئەم سێ جۆر زمانانە دەرئەکەوێ کە لە هەموو زمانانی جیهانا هەمیشە بکەر پێش بەرکار ئەکەوێ ... فرمانە شوێنەکەی ئەگۆڕێ یا پێش بکەر یا لە نێوان بکەرو بەرکار یا لەدوای بەرکارا دێ ..

هەرگیز ناشێ بوترێ فلانە زمان لە فلانە زمان باشترە یا پێشکەوتووترە .. چونکە ئەولانە زمان فرمان پێش ئەخرێ .. یا دوا ئەکەوێ .. پەیوەندی، بەنیتیقی لە هەر سێ حالەتدا یەکەو بیناغەیەکی ریازی هەیە ..

• زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بەجۆری یەکەمن ریز بوونی بەشە بنچیەکانیان دارشتنی رستەدا بەم جۆرەیە بکەر ـ فرمان ـ بەرکار

• زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بە جۆری دووەمن ریز بوونی بەشە بنچیەکانیان بەم جۆرەیە بکەر ـ بەرکار ـ فرمان ..

• زۆربەی زۆری ئەو زمانانەی سەر بە جۆری سێیەمن ریزبوونی بەشە بنچیەکانیان بەم جۆرەیە فرمان ـ بکەر ـ بەرکار

• بە بەراوورد کردنی ئەم سێ جۆر زمانانەی دەرکەوت کە لە هەموو زمانانی جیهانا بکەر پێش بەرکار ئەکەوێ . فرمانە شوێنەکەی ئەگۆڕێ .. پێش بکەر یا لەنێوان بکەر و بەرکارا یا لەدوای بەرکارا دەرئەکەوێ بە بەراوورد کردنی لایەنەکانی تری زمان دەرکەوت کە لە

هەموو زمانانی جیهان ( ناو ـ فرمان ـ ئاوەلناو .. ئاوەلکار ـ ئەل .. هتد ) هەیە . رستەی هەموو زمانانی جیهان بکەر و بەرکار و فرمانی هەیە ...

**((بەرەو بە کاڵی ، بەرەو بە کوڵاوی ، بەرەو بە برژاوی)) .**

گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ)) ، ژ ١١٨ ، بەغدا ، ١٩٨٨ .

لێکۆڵینەوەی زمانەوانی

# لێکدانی وشەکان

د. وریا عمر امین
بەشی کوردی - کولیجی پەروەردە
زانکۆی بەغداد

سادەترین کەرەسەی زمان ئەو ئاکە دەنگانەن کە بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. ئاڵۆزترین دانەش لە زماندا رستەیە. پەیوەندیی نێوان ئەم دوو دانەیە لەسەر پەیرەوێکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.



گۆڤاری ((رۆشنبیری نوێ)) ، ژ ١١١ ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

# بیناغەی سادەترین رستەی کوردی

د. وریا عمر امین
کۆلێجی پەروەردە - زانکۆی بەغدا

سادەترین کەرەسەکانی زمان ئەو تاکە دەنگانەن کە بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست دەکرێن. گەورەترین و ئالۆزترین دانەی (رێزمانی)ش رستەیە. پەیوەندیی نێوان دەنگ و رستە لەسەر پەیوەندیکی هەرەمیی ئەم جۆرە دامەزراوە.



# ڕێزمان چــی‌یە

د. وریا عمر امین

بچووکترین و سادەترین کەرەسە لە زمانـــا ئەو تاکە دەنگانەن لە بە مۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دروست ئەکرێن . گەورەترین و ئاڵۆزترین دانەش لە (ڕێزمانی) زمانا رستەیە . پەیوەندیی نێوان ... دەنگ و ڕستە لەسەر پەیڕەوێکی هەرەمــــی ئەم جۆرە دامەزراوە .




منتدى إقرأ الثقافي

٣ـ هەرچی نامیلکەکەیەتی ـ ((ڕێزمانی ڕاناوی لکاو)) ، شتێکی ئاسایی‌یە ، کە پێشتر کەرەستەکەی بە دوو وتارێك بڵاوکردووەتەوە و بەتایبەت ئەوی بە نێوی (( ڕێزمانی ڕاناوی‌لکاو )) ، گۆڤاری "کاروان" ، ژ ٨ ، مایسی ١٩٨٣ ، ل ٦٨ ـ ٧٤) هوەیە[٢٠]... بەلام سەیرو سەمەرە ئەوەیە ، سالی ١٩٨٦ لە دووتوێی نامیلکەیەکدا بەچاپی گەیاندووە و کەچی لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ بۆ هەندێ نووسینی ، زانیاریی ئەو نامیلکەیەی دەگوێزێتەوە .

بۆ درێژە پێ‌نەدان ، لەم بارەیەوە بڕوانە (ل ١٧ ـ ٢٤)ی بەرگی دووەمی نامیلکەی ((ڕەخنەی ناڕەختە)) ، کە پڕن لە بەلگەی ئەو هەلس و کەوتەی.

خوێنەری هێژا ! ئەوە ((سەدان لێکۆلینەوە و وتار و باسی زمانەوانی))ی م. وریا بوون ، کە نیشانم دان... بە ڕاشکاوییەوە دەلێم ، گەر لە ڕووی چەندێتی‌یەوە ئەوەی بلاوی کردووەتەوە ، سەدی دەی ئەوە بێ ، کە ئیدیعای دەکا ، بەم تەمەنەوە سەری ڕێز و نەوازشتی بۆ دادەنەوێنم... هەرچی باری چۆنێتی‌شێتی ، زمانەوانێك (پیاو) و (ئازا) بە کردار دابنێ و جیاوازیی نێوان (دەنگ) و (پیت) نەکا و... بێ‌گومان مایەی خەم و پەژارەیێکی سەخت و گرانە ، زانست و زانیاریی زمانەوانێك لەو ئاست و ڕادەیەدا بێت :

ئەوەتە لە کۆتایی وتاری ((لەیاسا دەنگی‌یەکانی زمانی کوردی))دا[٢١] ، دوو وشەی (ئازا) ـ کە ئاوەلناوە و (پیاو) ـ کە ناوە ، بە ڕەگی کردار داناوە... لەو بارەیەوە نووسیویە :

(( ئەگەر ڕاناوی لکاو (ین ـ یت) لەگەل ڕەگی فرمان دەرکەوتن...

... ...

---

(٢٠) ئەمە لە هەموو جیهاندا باوە ، کە نووسەر چەند وتارێکی خۆی بکاتە کتێبێك .

(٢١) وریا عومەر ئەمین ، لە یاسا دەنگی‌یەکانی زمانی کوردی ، گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ))، ژ ١٣٨، بەغدا ، ١٩٩٦ ، ل ١٨ ـ ٢١.

ئێمە ئازاین ))

(( ئەگەر ڕەگی فرمان بە کپ کۆتایی هاتبێ... :

تۆ پیاویت )) (ل ٢١)

یاخود لە وتاری ((ئیملای کوردی و چەند تێبینییەك))دا[٢٢] ، کە وتوویە ((... هەموو لامێکیش دوای ئەلف بێ لە زمانی کوردیدا قەڵەوە...)) (ل ٤٤٢) ، گوایا لێرەدا لە ڕووی فۆنۆلۆجییەوە لە دوو فۆنیمی ( ڵ ) و ( ا ) دەڕوانێ . کەچی ئەوەی نەزانیوە ، کە (لام) و (ئەلف) ناوی پیتن ، نەك ناوی فۆنیم...

... و گەلێکی دی.[٢٣]

((بەڵێ وا نەدڕاوە ، کە پینە بگرێ)) و کەچی ڕووشی دێ لە مەدحی خۆیدا بڵێ : ((بە دامەزرێنەری ڕێبازێکی تازەی زمانەوانیی کوردی لەقەڵەم ئەدرێت)) ( ل ٤٩ )... دیارە پەردەی شەرم بەیەکجارەکی دڕاوە و ئەمەش ((چرای نابووتی هەڵکردنە))...

خۆ دەبوو پێمان بڵێ ، کام زمانەوان ((بە دامەزرێنەری ڕێبازێکی تازەی زمانەوانیی کوردی لەقەڵەم)) داوە و ئەو ڕایە لە کوێدا بڵاوکراوەتەوە... ڕێی تێدەچێ گێلەپیاوێك لە نەزانیدا ؛ یان ماستاوکەرێکی تەڵەکەباز بۆ ئەوەی کاری خۆی لای مەیسەر بکا... بە دەمی ئەوەیان پێ وتبێ... یان دەشێ لە خەوندا وا خۆی بینیبێ... یان وەك ئەو ڕێوییەی دەمەو ئێوارە بە سێبەری زلی ، خۆی لێ‌بووبووە شێر... یان بۆ مەبەستی خۆبەرزکردنەوە ، ویستبێتی خوێنەر هەڵبخەڵەتێنێ... بەڵێ ((بزنێك دەقاڕێنێ ، کە چۆڕێ شیری ببێ))...

---

(٢٢) وریا عومەر ئەمین . ئیملای کوردی و چەند تێبینییەك ، ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کورد )) ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٣٤ ـ ٤٤٩ .

(٢٣) بۆ زێدە زانیاری لەمەڕ ئەو دوو باسەوە ، بڕوانە (ل ٧٠، ٣١ ـ ٣٢)ی بەرگی یەکەمی نامیلکەی ((ڕەخنەی نارەختە)).

* م. وریا باش دەزانێ ، ئەو ڕێبازەی زمانەوانێکی گەورەی وەك د. محەمەد مەعرووف پێڕەوی دەکا ، گەلێك لەوەی ئەو نوێتر و تازەتر و زانستییانەترە و بەرهەمەکانیشی لە هەموو ئاست و ڕەخ و ئالییەکەوە لەگەڵ ئەوانی م. وریادا ، نێوانیان ((ئاسمان و ڕێسمانە))... گەرچی من لە هەندێ بۆچوون و چەشنی لێکدانەوەی د. محەمەد مەعرووفدا بیروڕام جیاوازە ، بەڵام ئەمە گەرد ناخاتە سەر گەورەیی زانایی و قوتابخانەی باڵای ئەو کەڵە زمانەوانە و لێکۆڵینەوە بەپێز و نوێکانی... بەڵام بەپێچەوانەوە ، ڕێبازی م. وریا لە فڕوفێڵ و غەل و غەش و تەڵەکەبازی بەولاوە هیچی دی نییە .

* د. محەمەد مەحوی هەمووی دوو ساڵێك دەبێ گەڕاوەتەوە وڵات... لەو ماوە کەمەدا وێڕای هەندێ وتار ، سێ کتێبیشی بڵاوکردووەتەوە(٢٤) . ئەم زاتە ، بەو ماوەی دوو ساڵە چ لە ڕووی چۆنێتی و چ لەباری چەندێتییەوە ، زۆر لە م. وریای تێپەڕاندووە . د. محەمەد مەحوی ، کە بە ڕێبازی نوێ کاردەکا ، تێی دەگەین چی دەڵێ . هەرچی م. وریایە ، ڕەنگە خۆشی باش لە خۆی تێنەگا...

م. وریا کە چەند ساڵ بە ئیدیعای شارەزایی لە قوتابخانەی چۆمسکیدا لافوگەزاف لێدەدا و گوایا ئەم خۆی لێزانە و هەر ناوی ڕێزمانی گوێزانەوە ( TransformationGrammar ) دەبا ، کەچی تائێستاش ((ڕێزمانی گوێزانەوە))ی بە خوێنەر نەناساندووە... وا دەردەکەوێ لەو بابەتە هەر ((دوو پیت و لەتێکی خوێندووە))... بەڵام

---

(٢٤) أ ـ د. محەمەدی مەحویی ، چەند لایەنێکی فۆنۆلۆژیی ڕێزمانی کوردیی و ڕێزمانی عارەبیی ، سلێمانی ، ٢٠٠٠.

ب ـ د. محەمەدی مەحویی ، زمان و زانستی زمان ـ سەرەتایەك بۆ زانستی زمان ، سلێمانی ، ٢٠٠١.

ج ـ د. محەمەدی مەحویی ، ڕستەسازیی کوردیی، سلێمانی ، ٢٠٠١ .

د. محەمەد مەجوی ، ئەوەتە لە دووەم کتێبیدا ( ٨ ) لاپەڕەی لەمەڕ ((ڕێزمانی بەرهەمهێنان)) نووسیوە ( ل ١٧٣ ـ ١٨٠ ) و خوێنەری لەو مەسەلەیە تێگەیاندووە...

* چەند مانگێك لەمەوبەر لە کۆلێژی زمانی زانکۆی سلێمانی ، وتووێژ دەربارەی دوکتۆرانامەی مامۆستا (هۆگر مەحموود فەرەج) کرا... ئەم بەرهەمە بە نێوی ((پراگماتیك و واتای نیشانەکانی))ەوەیە و (١٩٨) لاپەڕەی چڕی فولسکابە و د. محەمەد مەعرووف فەتتاح سەرپەرشتی کردووە . وەك دەزانین ، لێکۆڵینەوە لەم لایەنەی زمان لە کوردیدا نەبووە و تەنانەت لە زمانانی ئەورووپیشدا نوێیە... جا ئەم توێژینەوەیە ، کە ڕچەشکێنێکی ئەو ئاست و بوارەیە ، نووسەرەکەی تێیدا تەواو سەرکەوتووە و بە پلەی بالا بڕوانامەی پێدرا...

... و چەندین کاری دی.

ئێدی تێ ناگەم ، م. وریا لەم کارانە بێئاگایە ، یان دەیەوێ کاری هاوکارانی پەردەپۆش بکا و سنگی خۆی دەرپەڕێنێ... بە هەر حاڵ ، مەبەستی لەو وتانەی هەرچییەك بێ ، کارێکی چاك نییە و ڕاستی و دروستی دەشێوێنێ... ((بەردی زل هەڵگرتن نیشانەی لێنەدانە))...

تۆ بڵێی م. وریا ئەوە نەزانێ ، کە هەر چەند ساڵێك لە هەموو بوارێکدا زانای کارامەتر و تیۆریی پێشکەوتووتر دێنە مەیدان... ئایا ئاگای لەوە نییە ، کە لە پاش چۆمسکییەوە ، چەندین ڕێبازی دی پەیدابوون... ئەی ئەوە نازانێ ، کە گەلێك ڕەخنە بەرەو ڕووی چۆمسکی بووەتەوە و وەڵامی هەندێ لە ڕا و بۆچوونەکانی دراوەتەوە... بۆ بەئاگاهێنانەوە و وریاکردنەوەی م. وریا ، دەڵێم با هیچ نەبی ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بخوێنێتەوە :

فهم اللغه : نحو علم

لغه لما بعد مرحله

چومسكی

تألیف

تیرینس موور و کریستین کارلنغ

ترجمة

الدكتور حامد حسين الحجاج

بغداد ـ ۱۹۹۸

م. وریا وا دەزانێ لە کۆڕی بێئاگایان و نەزاناندا قسەدەکا ، بۆیە لە بەردەوامیدا دەڵێ : ((چەن لێکۆڵینەوەیەکی ڕەسەنیشی لەباری زمان و عەرووزی عەرەبی‌یەوە پێشکەش کردووە)) ( ل ٤٩) .

دەیان زانای زمان و ئەدەبی عەرەبی ، کە لە ماوەی سەدان ساڵدا گشت بوار و دەرەتانێکی ئەو مەیدانانەیان ساخ کردبێتەوە ، ئێستاکە ئەوێك ، کە زمانی بابی خۆی باش نازانێ و تا ئەمڕوش لێکۆڵینەوەییێکی ڕەسەنی لەبارەی زمانی کوردییەوە نەهێنابێتە بەرهەم و لەمەڕ ئەدەبی کوردیش لەوە بەدەر ، کە هەندێ شیعری لەبەرە ، هیچی نەکردبێ... ئیتر ئەمەی لە چی ؟...

بەڵێ ، ئاگاداری ئەوەین ، کە دەربارەی عەرووز هەندێ زانیاریی لە کتێبی ((فن التقطیع الشعری والقافیة))ی دوکتۆر (صفاء خلوصي) وەرگرتووە و بە زمانێکی شەق و شڕ کردوویە بە کوردی و تەنانەت ئەمە یەکێکە لەو باسانەی بۆ بوونی بە پرۆفیسۆر پێشکەشی کردووە...

سەبارەت بوونیشی بە پرۆفیسۆر دەڵێ : ((یەکەم زمانەوانی کوردە لە عیراقا پلەی پرۆفیسۆری لە زمانی کوردیدا وەرگرێ و بە کاتێکی قیاسی)) (ل ٤٩). بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پلە و پایەیەی چەند ڕاستی‌یێك دەخەمە

پوو :

١ـ له هیچ وڵاتێ و زانستگاییێك زمانەوان بە لێكۆڵینەوەی ئەدەبی پلەی بەرزتری نادرێتێ... ئەم فێڵ و نهێنییە چییە ، كە م. وریا توانیویێتی وەها باسێك ـ (دەربارەی عەروون)ی تێهەڵكێشێ ، بەتایبەتیش وەك لە سەرەوە پەنجەم بۆ ڕاكێشاوە ، كە وەریگرتبێ و كردبیەتە كوردی .

٢ـ سەرجەمی بەرهەمەكانی ئەوەیان تێدا نابێ ، نەك پلەی پرۆفیسۆر ، بەڵكو پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەریشیان پێوەربگرێ .

٣ـ لەبەر ئەوەی ئەو دەمە سەرۆكی بەشی كوردی بوو ، لە ژێرەوە كارەكانی خۆی بەهەر ڕێگەیەكدا بوایە ، لە ماوەییێكی زۆر كەمدا بەڕێ دەكرد... هەرچی هی مامۆستایانی دی بوو ، ئەمساڵ بۆ ئەوساڵ و چەندین كۆسپ و تەگەرە و بڕوبیانوو...

٤ـ لە كاتی تەرقیەكەیدا ماستاوی بۆ دووان لە پرۆفیسۆرەكان دەكرد و بووبووە پۆلیسی سێیەمیان... ((لە هەموو دیزەیەكدا ئەسكوێیە))...

٥ـ د. ئەمین مۆتابچی و د. جەمال جەلال زۆر پێش ئەو گەیشتوونەتە پلەی پرۆفیسۆری

٦ـ هەندێك ، كە درەنگ نازناوی پرۆفیسۆرییان وەرگرتووە (بەتایبەت بەندە) ، هۆی ئەوە بووە ، درەنگ هاتوونەتە زانستگا و لەو دەزگایە خزمەتیان نەبووە . دەنا زۆر پێش ئەو پلەی پرۆفیسۆرییان وەردەگرت .

... هتد .

ئەم مامۆستایە لە بە شان و باڵی خۆدا هەڵدان بەولاوە هیچی دی بەلاوە گرنگ نییە و ئامادەیە لەو پێناوەدا هەموو ڕاستییێك بشێوێنێ... بۆ ئەمەش و بۆ ئەوەی بە كورتی بیبڕمەوە و سەری خوێنەر نەیەشێنم ، لە هەموو ئەو باسكردنەی خۆی ، لەم وتارەیەوە ، تەنیا چوار نموونە هەڵدەبژێرم :

١ـ نووسیویە : ((لە ساڵی ١٩٩٤دا بەشی خوێندنی باڵای (دکتۆرا و ماجستێر)ی لە بەشی کوردیدا دامەزراندووە و بووە بە سەرۆکی)) (ل ٤٨).

تێکڕای مامۆستایانی بەشی کوردی ئاگادارن ، کە کردنەوەی خوێندنی باڵا بیرۆکەی د. ئەمین مۆتابچی‌یە و ئێمەش : د. نەسرین محەمەد فەخری و م. وریا و بەندە پشتگیریمان کرد... بەڵێ بە هەوڵ و کۆششی هەموومان دامەزرا ، نەك ئەو بەتەنیا... بەڵام خواهەڵناگریّ و هەموو مامۆستایان و خوێندکارانی خوێندنی باڵای بەشەکەمان شاهیدن ، کە سێ ساڵێك لەمەوبەر بەوپەڕی بێ‌پەروایی‌یەوە پێی ڕاگەیاندین ، کە ڕاپۆرتی بۆ داخستنی نووسیوە و دەیووت ، چونکە من پێیان دەگەیەنم و کەچی ئەوان دەبنە دوژمنم... بە کورتی ((بە گورگان خواردووی دا))... د. ئەمین زۆر لێی دڵگران بوو و دەیووت و دەیووتەوە ، بەشەکەی کردووە بە دووکانی باوکی[٢٥] . خوا و ڕاستان کردی ، ساڵێکی پێ‌نەچوو ، ئەو کورسییەی بە هەموو دنیای نەدەدا ، لە ژێریان هێنایە دەرێ ((دار درا بە ڕۆحیدا)) و د. فوئاد حسێنیان کردە سەرۆکی بەش... بۆ مێژوو دەڵێم ، یەکەم کاری ئەم سەرۆکە نوێیە ، ئەوە بوو قەرەبووی ئەو زیانە گەورەیە بکاتەوە ، کە م. وریا دابووی... چاك بوو لە ماوەیێکی کەمدا ، بە هەوڵ و ئارەقەی ناوچەوانی ، دڵسۆزانە توانی کارێ بکا سەرلەنوێ خوێندنی باڵا بەرقەرار بێ و هەزار جار ماڵی ئاوابێ .

---

(٢٥) پرۆفیسۆر ئیبراهیم باڵدار چەندین جار گلەیی ئەوەی لەلا کردووم و وتوویە : کاتێ لەبەر چاوی م. وریا لێم دەپرسن ، ئێستا لە کوێ کاردەکەی ؟... هێشتا فریانەکەوتووم دەم بکەمەوە ، ئەو یەکسەر فەرموویە : لای من... وا دەزانێ شاگردیم...

بەندەش بە زەردەخەنەوە دڵنەوایی پرۆفیسۆر باڵداری کردووە و پێی وتووە : دڵت لە خۆت نەمێنێ و بۆ منیش هەر بە هەمان شێوە مەعریفەت دەنوێنێ... د. ئەمین وتەنی : ئەو کابرایە پێی وایە ئەم بەشە کوردییە دوکانی باوکی بووە و ئەو ئێستا میراتگرێتی...

٢ـ بەر لەو وتانەشی ئەوەی وتووە ، کە گوایا ((لە ساڵی (١٩٨٢)ەوە تا (١٩٩٩) سەرۆکی بەشی کوردی بووە.. کە ئەکاتە (١٧) ساڵ و بە ویستی خۆی وازی هێناوە)) (ل ٤٨).

هۆی ئەوەی ، کە (١٧) ساڵ سەرۆکی بەشی کوردی بووی ، ئەوەیە کەسمان بەو پلە و پۆستە ڕازی نەدەبووین و ئارەزووی ئەو کارەمان نەدەکرد... چونکە ، ئێمە پلەی زۆر لەوە بەرزتریان داوینێ و قبووڵمان نەکردووە... وێڕای ئەوە پێویستمان بەوە نەبووە لە ژێرەوە کاروباری خۆمان تێپەڕێنین و لە سۆ خۆ هەوڵدان دووربووین... ئێمە کاری زانستیمان هەڵبژاردووە...

ئەوی م. وریا بناسێ ، چاك دەزانێ چەند شانازیی بەو کورسییە نزمەوە دەکرد و چۆن توند خۆی پێوە گیر کردبوو... تا ئێستاش هەناسەی ساردی بۆ هەڵدەکێشێ و ، کەچی دەیەوێ وای نیشان بدا ، کە ڕزگاری بووە و ((بە ویستی خۆی)) جێی هێشتووە... کاتێ فەرمانی ئازادکردنی گەیشت ، زمانی گوێی نەدەکرد و تا دوو مانگێك شێواو و پەرێشان... ڕاگری کۆلێژەکەمان هێندە پیاو چاکە ، بۆ ئەوەی هەندێ هێوری بکاتەوە ، فەرمانەکەی وا بۆ گۆڕی ، کە لەسەر ویستی خۆیەتی...
گەر م. وریا ئارەزووی وازهێنانی هەبوو ، ئەی بۆ :

أ) داوای لە د. فوئاد حسێن دەکرد ، چەند مانگێك لەسەری بووەستێ و ئەوسا بێتە جێگەکەی ؟

ب) لە ماوەی (١٧) ساڵدا جارێك چییە ، داوای وازهێنانی نەکرد ؟... ... هتد

ئەمانە هەموو بەڵگەن ، کە م. وریا زۆر پەرۆشی ئەو لابردنەیەتی و بە سووکایەتی پێ کردنی تێدەگا ، چونکە گەر وا نەبا ، نەیدەنووسی ((بە ویستی خۆی وازی هێناوە))... بۆچی گەر لایانبردبێ ، چی لەو کەم

دەکاتەوە... ئەوە دنیایە و کورسییە و دەوران دەورانە... لە لایەکی دیشەوە وا دەزانێ ، بەو جۆرە بۆرە بەڵگانە ، لای خەڵکی گەورە دەبێ... ((هەموو دەردێك دەرمانی هەیە ، گەوجی نەبێ))...

٣ـ وتوویە : ((ئەندام و سەرۆکی دەیان لیژنەی زانستی‌ی بەرز... بووە)) (ل ٤٩):

أ) ئەندامی دە لیژنەیێك بووە ، نەك دەیان... ((ناوی گەورە و دێی وێران))...

ب) من خۆم لە بەشێکی ئەو لیژنانەدا لەگەڵی ئەندام بووم... لە ماوەی چەندین ساڵدا تاکە جارێك چییە لە کاتی دەست پێکردنی کۆبوونەوەکەدا نەهاتووە... هەمیشە نیوەی کات تێپەڕیوە ، ئەوجا دەرکەوتووە... وێڕای ئەوە ، چارەکە سەعاتێك دانیشتووە و بە بیانوویێك ڕۆیشتووە و ئێمەش بە زەردەخەنەوە تێمان ڕوانیوە... دەتووت ((نە بای دیوە و نە باران))... هەموو ئەوانەی لەو لیژنەیەدا بوون ، شایەتیی ئەو ڕاستییە دەدەن .

ج) ساڵی ١٩٨٨ ئەو و د. نەسرین فەخری و د. مەولوود حەمە نەبی و بەندە وەك لیژنەیێك بڕیارمان دا مەلزەمە بۆ بابەتە کوردییەکانی هەر چوار پۆلی بەشەکەمان دابنێین ، کە تا ئەو دەمە بێ بەرنامە دەیانخوێند . بەندە و د. مەولوود دانانی سەر و سێ مەلزەمەمان گرتە ئەستۆ ، د. نەسرین ـ دوو ، م. وریا ـ یەك . ئێمە ـ (د. نەسرین و د. مەولوود و بەندە) لەو ماوەی مانگەدا ، کە بۆ بەجێهێنانی ئەو کارە دیاریمان کردبوو ، هەر هەشت مەلزەمەکەمان تەواوکرد و پێشکەشمان کردن... بەڵام م. وریا ـ تاکە کەسێك ، کە تاکە مەلزەمەیێکی بەرکەوتبوو ، تاکو ئەمڕۆش نەینووسی... تا ڕادەیێك لەوە دەبووڕین ، بەڵام دوای ئەوەی د. مەولوود لە وەزارەت دەیان دانەی لەو هەشت مەلزەمەیە فۆتۆکۆپی کرد ،

ئیتر خوێندکارەکانمان کەوتنە ئەوەی لەو بابەتانەی ئێمەدا بەپێی مەلزەمە و بەرنامە و بە کوردی بخوێنن... ساڵێك تێپەڕی... ڕۆژێك لە ژوورەکەی خۆی گلەیی ئەوەمان لێیکرد ، کە ئەو کارەی بەجێنەهێنا... لە وەڵامدا وتی : جا ئەوانە مەلزەمەن ئێوە داتان ناوە !...

لێرەدا هیچ ناڵێم و با خوێنەر خۆی سەرپشك بێ...

د) چەند جارێك لە بەڕێوەبەرێتیی خوێندنی کوردییەوە بۆ دانان و وەرگێڕانی هەندێ لە کتێبی قوتابخانەکان کردوویانەتە ئەندام ، بەڵام نەك ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆی بەو کارەوە ماندوو نەکردووە ، بەڵکو قەڵەمیشی بۆ نەخستووەتە سەر کاغەز...

... هتد.

٤ـ دەڵێ : ((لە ساڵی ٧٢ ١٩٧٣ دا لە کۆلێجی ئامادەیی زانکۆی مۆسکۆ زمان و ئەدەبی رووسی ی خوێندووە و بە پلەی امتیاز دەرچووە)) (ل ٤٨).

هەر هێندە دەڵێم ، ئایا ڕێی تێدەچێ یەکێك لە ((زمان و ئەدەبی رووسی))دا ((بە پلەی امتیاز)) دەرچووبێ و ئەوە نەزانێ ، وشەیێکی یەکجار باوی وەك ((دەفتەر ـ Titrad )) ، کە مێیە و ئەو بە نێری دابنێ[٢٦] ... ((ئەم نانە بەو ڕۆنە))...

*　*

*

(٢٦) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو لەو بارەیەوە ، بڕوانە (ل ٤١)ی بەرگی یەکەمی ناميلکەی ((ڕەخنەی نارەختە)) .

م. وریا لە نیوەی دووەمی لاپەڕە (٢)ی (بوختاننامە)کەیدا هاتووەتە سەر باسی نزمیی ئاستی زانستیی بەندە و دەڵێ : ((نزمی مستوای ئەکادیمیی ئاورەحمانی حاجی مارف ئەخرێتە پاڵ دوو هۆی سەرەکییەوە . یەکەم ـ ئاورەحمان هەر لەسەرەتاوە هیچ ئارەزوو و بڕوایەکی بە بواری رۆشنبیری و زمانەوانی یەوە نەبووە. فەشەل و نوشستی بەرەو ئەم جیهانەی راماڵیوە و کردوویەتی بە ماڵ بەسەریا... دووەم ـ سروشتی خوێندنەکەی بە رادەیێ شلۆق و بێ بیناغە بووە. رێی نەداوەتێ تۆزقاڵێ شارەزایی لە پێڕەوی ئەکادیمی پەیا بکات بتوانێ لەگەڵ گیانی هاودەم بگونجێ و پەرە بە خۆی بدات...)).

* بەندە لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە ئاشق و شەیدای بواری ڕووناکبیریی کوردی بوو و هەفتانە ڕۆژنامەی ((ژین))ی دەکڕی و دەیخوێندەوە و دەیپاراست . هەتا ئەوڕۆش بیست ژمارەیێکی ئەو سەردەمە لە کتێبخانەکەیدان... کاتێ لە قوتابخانەی ناوەندییش بوو بە (خانزاد)ی مامۆستا جەمال بابان و (گۆمی شڵەقاو)ی مامۆستا موحەڕەم محەمەد ئەمین و... چەند بەرهەمی دی ئاشنا بوو... لە پۆلی سێی ناوەندی بووم ، کە لە قوتابخانە گەڕامەوە ، بینیم بەرگێکی (یادداشت)ەکانی مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەرچووە و یەکسەر کڕیم... گەرچی بۆ سبەینێ تاقیکردنەوەی (فیزیا)مان هەبوو ، بەڵام زۆری ئەو شەوەم بە خوێندنەوەی یادداشتەکانەوە بردە سەر و کەمێکیش بە پێداچوونەوەی فیزیادا... لەبەر ئەو هۆیە لە فیزیادا (٥٧)م وەرگرت و یادی بەخێر ، حاجی باقی ـ واتە مامۆستای فیزیا لێم تووڕە بوو و (طارق)ی شێخ ڕەئووفی نەقیبیش ، کە برادەرێکی زۆر نێزیکم بوو و مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە ، وەك هاوڕێیەکی دڵسۆز ، سەرزەنشتی کردم... ئەگەرچی لە هەردوو وانەی وێژەیی و زانستی (بەتایبەت بیرکاری)دا باش

بووم و بەدڵ حەزم لە هەموویان بوو ، بەڵام مەیل و ئارەزووی ڕووناکبیری پتر کاری تێکردم و بەرەو بەشی وێژەیی بردم... لە پۆلی پێنجەمی وێژەیی ، کە حەڤدە قوتابی بووین ، لە خولی یەکەمی تاقیکردنەوەی بەکەلۆریدا تەنیا شەش کەسمان لێ دەرچوو ، کە یەکێکیان من بوو...

* من لە یەکێك لە زانستگا هەرە بەرزەکانی جیهان ، واتە زانستگای لێنینگراد . بەکالۆریۆس و ماجستێرم تەواوکردووە... لەهەر ئاگادارێکیش بپرسی ، پێت دەڵێ ، کۆلێژی ئادابی زانستگای لێنینگراد ، تەنانەت لە کۆلێژی ئادابی زانستگای مۆسکۆ زۆر دێرینتر و پێشکەوتووتر و بەهێزترە... لە بەشی زمان و ئەدەبی ڕووسیی ئەو کۆلێژە کەڵە زمانەوانان و ئەدەبناسان دەرسیان وتووەتەوە و دەڵێنەوە... منیش پەروەردە و دەرچووی ئەو بەشەم...

لە لایێکی دییەوە ، هەموو کات و توانستم بۆ خوێندن تەرخان کردبوو و پۆلی یەکەم و دووەم و سێیەمم بە دوو ساڵ تەواوکرد... چەند جارێك ڕۆژنامەی زانستگا لەبارەی چالاکی و کارامەییمەوە نووسیویێتی... سەدی نەوەدی نمرەکانم باڵا بوون... ئەوەش فۆتۆکۆپیی یەکەم لاپەڕەی لیستی نمرەکانم :

=

During his stay at Leningrad State University from 1963 to 1968 ABDUL RAHMAN MAROOF passed the examinations in the following subjects: (speciality Russian Language and Literature)

1. Russian (practical course) ... good
2. General Linguistics (introductory course) .............. excellent
3. Theory of Literature (introductory course) .............. good
4. Modern Russian (theoretical course):

   Part I. Phonetics Graphics. Orthographie. Orthoepy ....... excellent

   Part II. Lexicology Lexicography Word-building ................ excellent

   Part III. Morphology ......... excellent

   Part IV. Syntax .............. excellent
5. Historical Grammar of the Russian Language ............. excellent
6. History of the Russian Literary Language ..................... excellent
7. Science of Style (practical course) ...................... credit
8. Russian Folklore ............. excellent
9. Latin ........................ excellent
10. Pedagogics ................... credit
11. Teaching Practice ............ excellent
12. Methods of Teaching Russian as a foreign language ........... credit
13. Educational Films ............ credit
14. History of Old Russian Literature..excellent
15. History of the Russian Literature of the XVIII-th century.. excellent

لەسەر نامەی ماجستێرەکەشم ، لەتەك ئەوەی پلەی باڵایان پێدام ، بۆ خوێندنی دکتۆراش کاندیدیان کردم ...

هەرچی خوێندنی دوکتۆراکەمە لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی سەر بە ئەکادیمیای زانستیی سۆڤێتی بوو ... ئیتر کاکە وریا گیان ، کام ((فەشەل)) ؟ ؛ کام ((نوشستی)) ؟ ؛ کام ((شلۆقی)) ؟ ؛ کام ((بێبیناغەیی)) خوێندنی من دەفەرمووی ؟ ...

ئەمەی وتویوە ، هێشتا بەلایەوە کەمە ، بۆیە گوێ بە هیچ نادا و دەڵێ : ((ئاورەحمان حاجی مارف کە لە ساڵی ١٩٦٠ دا پێنجی ئەدەبی ی تەواو کرد ... تاکە بەشێ لێ‌ی وەرگیرا بەشی کوردی بوو چونکە ئەوسا وەرگرتن لەم بەشەدا بێ دەرەجە بوو )) (ل ٢) .

من لە بەشی جوگرافیا و مێژوو ؛ کۆلێژی یاساش وەردەگیرام ... تەنانەت بەڵێنیان پێدام بۆ خوێندنی ئابووری بمنێرنە چیکۆسلۆڤاکیا ... بەڵام ئارەزووی بەشی کوردییەکە ، ئەوانی تری لەبەرچاو ڕەش‌کردبووم .

ئەوسا ، واتە ساڵی ١٩٦٠ ، وەرگرتن لە بەشی کوردی بە نمرە بوو و بەندەش بە پێی زۆریی نمرە ، یەکەم ناوی لیستەکە بوو ... هەرچی ئەو ساڵەیە ، کە کاکە وریای تێدا وەرگیرا ، لە بەختی ئەو مەسەلەی نمرە نەمابوو و بۆیە لەوێ وەرگیرا و نەکرا بە سەرباز ...

بۆم هەیە لە م . وریا بپرسم ، گەر قوتابییێکی پۆلی پێنجی زانستی نمرەی باش بهێنی ، هیچ بیر لەوە دەکاتەوە بچێتە بەشی کوردی ؟ ... دیارە ، ئەو کە لەو بەشە خوێندوویەتی ، تەنها لەبەر ئەوە بووە ، کە نەك هیچ کۆلێژێکی زانستی وەری‌نەگرتووە ، بەڵکو لە بەشە وێژەییەکانیش (جگە لە بەشی کوردی) ئاوڕیان لێ‌نەداوەتەوە ...

دێر دوای دێر بوختانەکانی ڕەزاقورستر دەبن ... ئەوەتە وا ڕادەگەیەنێ ، کە ئەوڕەحمان لەو بەشە کوردییە ((بێزی لێ‌بووەوە ...

گاڵتەی پێکرد ... ئیهانەی کرد و وازی لێهێنا و خۆی گەیاندە یەکیەتی سۆڤێت بۆ خوێندنی پزیشکی ... دوای چەند ساڵ نوشستی ... ئەنجام دەرەقەتی نەهات و فاشیل بوو ... تەرقین قەید کرا)) و چووە بەشی زمان و ئەدەبی ڕووسی .

ئەو ساڵەی لە بەشی کوردی خوێندم ساڵێکی پڕ بیرەوەری و سەروەری و شانازیمە ... چ مامۆستایان ، چ هاوڕێیان ئەمەك و وێنەیان لە پێش چاومە ... کاتێ ساڵی یەکەمم تەواوکرد و پشووی هاوین هات ، چەند برادەرێکی نێزیکم بیرۆکەی پێکەوە چوونە هەندەرانیان خستە مێشکمەوە و بریاری ڕۆیشتنمان دا ... لە ڕێگە هەندێکیان بەوە پێدەکەنین . کە یەکێك لە جانتاکانم پڕ کتێبی کوردی بوون و لە نێوانیاندا ((مێژووی ئەدەبی کوردی))ی مامۆستا عەلائەددین سەجادی دیاربوو ...

بەڵێ توانست و بەخۆدا ڕاپەرموون و گەنجێتی بەرەو ئەوەیان بردم بچمە کۆلێژی پزیشکی ... وەرزی یەکەمم بە سەرکەوتوویی تەواو کرد ... لە دوای ڕۆژانی پشووی نیوەی ساڵدا تووشی نەخۆشییەکی گران بووم و سێ مانگێك لە نەخۆشخانە کەوتم ... کە هاوڕێکانم ، بەتایبەت د . کاوس قەفتان و د . مارف خەزنەدار ... دەهاتنە سەردانم ، تاکە داوام لێیان ئەوە بوو ، گۆڤار و کتێبی کوردیم بۆ بێنن ... چاکەیان هەگیز لەبیر ناکەم و چاپەمەنی بەنرخ و بە بەهایان بۆ دەهێنام ... لەو ماوەیەدا بەشێکی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری ((گەلاوێژ)) و ((هیوا)) و ((شەفەق)) ... و چەندین چیرۆك و شیعرم خوێندەوە ... بەهەمان شێوە ، لە نەخۆشە ڕووسەکانیش کتێبی ڕووسیم وەردەگرت ... لە کۆتایی مانگی یەکەمی ئەو ناساغییەمدا ، خوێندنەوەی زۆر وای هەژاندم بیر لە پزیشکی نەکەمەوە ... دوو مانگەکەی دواییش ، بەتایبەت کە زمانی ڕووسییەکەم پتر گەشەی سەند و ئەدەبی باڵای ڕووسی کاری تێکردم ،

هاتمە سەر ئەو باوەڕەی گەر لەو مەیدانەدا قاڵ ببم ، دوایی دەتوانم خزمەتی زمانەکەی خۆم بکەم ... بۆیە هەر کە لە نەخۆشخانە هاتمە دەرێ ، چوومە بەشی زمان و ئەدەبی ڕووسی . ئەمڕۆش چاك هەست دەکەم ، کە ئەو بەشە باشی پێگەیاندم و گەر ماوەی ئەم چارەکە سەدەیە کاری باشم کردبێ ، کاریگەریی ئەو قوتابخانەیەیە .

ئەوە کاکڵی مەسەلەکەیە . نەك ئەو بوختان و تۆمەتەی م . وریا دەیانداتە پاڵ بەندە ... هەر بۆ مەبەستی ئەوەی ، من وەك کەسێکی خراپ و نەزان بە خەڵك بناسێنێ ، لەگەڵ ئەوەشدا ، کە باش ئاگاداری هەندێ ڕاستییشە ، کەچی هەڵیان دەگێڕێتەوە و وا دەزانێ ، دەتوانێ خوێنەری وشیار و بەئاگا چەواشە بکا ... گەر نیازی پاك بوایە ، چۆن ڕووی دەهات بڵێ : ((بەڵگەی تر ئەوە ساغ ئەکاتەوە کە ك . ئاورەحمان ئەندامێکی (طارئ)ی بواری نووسین و ڕۆشنبیری یە ئەوەیە هیچ جۆرە جم و جۆڵ و ئارەزوویەکی زمانەوانی یارۆشنبیری یا ئەدەبی ی لە سەردەمی گەنجیدا نەبووە ... و تا ساڵی ١٩٧٣ دوای وەرگرتنی کاندیداتەکەی و گەرانەوەی بۆ وڵات هیچ نووسین و بەشدارییەکی ڕۆشنبیریی بۆ تۆمار نەکراوە ...)) (ل ٣) .

م . وریا بەرانبەر ئەم چەند نموونەیەی خوارەوە چی دەفەرمووێ :

* لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩ ـ ١٩٦٠دا بە نازناوی (سکاڵا)وە لە گۆڤاری ((هیوا))دا چەند وتارێکم بڵاوکردووەتەوە و بەتایبەت ئەوەیان ، کە دەربارەی (وەفایی)یە ، بەلاوە نازدارە .

* ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩ چەند کورتە چیرۆکێکم لە ڕووسییەوە کردووەتە کوردی و چیرۆکی ((ماتەم))ی چێخۆف ، کە لە ڕۆژنامەی ((هاوکاری))دا چاپکراوە ، لە نێوانیاندا دیارە .

* ١٩٧٠ ـ ١٩٧٢ دوو وتارم بە ڕووسی و زنجیرەیەکیش بە کوردی لە

بارەی فەرهەنگە کوردییەکانەوە نووسیوە . ڕووسییەکان لە گۆڤاری ((ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی))دا بڵاوکراونەتەوە و کوردییەکانیش لە گۆڤاری ((پرشنگ)) و ڕۆژنامەی ((هاوکاری))دا .

* ساڵی ١٩٧٢ کتێبی ((هەندێ بیروباوەڕی هەڵە لەبارەی زمان و مێژووی کوردەوە))ی د . قەناتی کوردۆم لە ڕووسییەوە کردە کوردی و ناردم بۆ کۆڕی زانیاری کورد و ساڵی ١٩٧٣ ، کە گەڕامەوە لەژێر چاپدا بوو .

... و هەندێکی دی .

سەرنج ڕاکێش ئەوەشە ، ئەو نەك هەر وا نیشان دەدا هیچ بەرهەمێکم نەبووە ، بەڵکو دەشڵێ : ((تا ئەوسا)) ـ واتە تا ساڵی ١٩٧٣ ((تەنانەت نەیزانیوە بە کوردی بنووسێ)) (ل ٣) .

من ئامادەم لیژنەیێك پێك بێت بۆ بەراوردکردنی ڕەوانیی کوردی و ڕێنووسی ئەو وتارانەی ساڵی ١٩٥٩ ـ ١٩٦٠ نووسیوومن ، یان ئەوانەی سەرەتای حەفتاکان بڵاوم کردوونەتەوە لەگەڵ هەر بەرهەمێکی ساڵی (٢٠٠١)ی م . وریادا ، کە خۆی هەڵیبژێری و دیاری بکا ... گەر بڵێن ڕێنووس و کوردییەکەی ئێستای ئەو لە هی سی‌چل ساڵ لەمەوبەری من باشترە ، ئەوە ئامادەی هەموو بڕیارێکیانم ...

بۆ ئەوەش ، کە تۆمەتەکەی باش بچەسپێنێ ، بوختانێکی شاخداری بە دەمی د . کەمال مەزهەرەوە کردووە و دەڵێ : ((فەرموون ئەمەش بەڵگە.

د . کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرۆکی لیژنەی موناقەشەی نامەی ماجستێری کاك محمد زەهاوی بوو کە ئاورەحمان سەرپەرشتی بوو و لە بارەی ئیملای کوردی یەوە بوو . موناقەشەکە ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی (١٠ ـ ٢ ـ ٢٠٠٠)دا لە بەشی کوردی‌ی کولێژی پەروەردەی سەر بە زانکۆی بەغداد کرا . لەم موناقەشەیەدا سەرۆکی لیژنە د . کەمال

مەزهەر ئەحمەد کە ئاگاداری تەواوی سەرگوزشتەی خوێندنی ئاورەحمانە .. لەبەر دەم دەیان رۆشنبیرو ئەدەب دۆست و ئامادەبووان رایگەیاند کە [ئاورەحمان کە لە سۆڤیەت گەڕایەوە .. لە ساڵی ١٩٧٣ دا و لە کۆری زانیاریی کوردی دامەزرێنرا .. ئیملای کوردیی نەئەزانی ... ئەوسا فێری بوو ...])) (ل ٣) .

لێتان ناشارمەوە ، د . کەمال لەو بوختانەی بە دەمییەوە هەڵبەستراوە ، زۆر پەست و دڵگرانە ... چاوەڕوانی نەدەکرد ، ئەو ئامۆژگاری و پەندە بەرز و باڵایانەی ؛ ئەو وتە شیرین و ڕۆح سووک و جوانانەی لەبارەی بەندەوە دەریبڕین ، کە مەبەستی بوو ، لە سەرێکەوە هەندێ ڕاستی لە پێشکەوتنی منی شاگردیدا بدرکێنێ و ، لە سەرێکی دییشەوە ، ڕاوێژی خەڵکی دییان پێبکا ، تا لە پێناو فراوانکردنی ئاسۆی زانین و زانستییاندا خۆیان فرە ماندوو بکەن ... شریتی ئەو وتووێژ و دەمەتەقێیە لای کاك محەمەد زەهاوی هەیە ... لەبەر ئەوەش ، کە زۆر بەسەر ڕووداوەکەدا تێنەپەڕیوە ، هێشتا لەو هۆڵی هەڵسەنگاندنەدا سەدای دەنگی زوڵاڵ و دلێری دوکتۆر کەمال ئاسەواری ماوە و لە گوێی بەشدارانیشدا دەزرنگێتەوە ... ئیتر م . وریا چۆن وا زوو ئەو بوختانەی هۆنییەوە و ڕێی بەخۆیدا دڵی ئەو زاتەش زویر بکا . چاك دەزانم م . وریا خراپ دەکا ، بەلاّم تێناگەم چ پێویستییێکی بەمەیە و دەبێ کەڵك و سوود ؛ چێژ و تامی کاری ناڕەوا و دوور لە ڕاستگۆیی چی بێ ؟ ...

د . کەمال لەو کۆڕ و کۆبوونەوەیەدا وتی : هیوامە هەموو وەك د . ئەورەحمان بن ... بە ماندووبوون و شەونخوونی ؛ هەوڵ و تەقەللای بێوچانی ... وای لێهاتووە ، بووە بە یەکێك لە کوردیزانە گەورەکانمان ... هێندە ڕەوان و بێگرێ دەنووسێ ، کە ناتوانی دەست لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی هەڵبگری ... بەڵێ ، هەر ئەم د . ئەورەحمانە

کە تازە لە هەندەران گەڕابووەوە ، وەك ئێستا نەبوو ... ئەمەیە ئەنجامی دڵسۆزی لە کاردا ... بەداخەوە کەسانێکیش هەن ، نەك هیچ پێش ناکەون ، بەڵکو بەرەو دواشەوە دەڕۆن ... لە کاری سەرپەرشتیکردنی نامەی خوێندکارانیشدا ، بە چەشنێك ئەرکی سەرشانی بەجێدێنێ ، سەروەر و سەربڵند بێ ... ئەم نامەیەی کاکە حەمە زەهاوییش یەکەم نامەیە ، کە وا ڕەوان و بێ هەڵەی ڕێنووس بێ ...

لەم باسەدا بەتایبەت سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، ئەو بوختانەی بۆ د . کەمالی هۆنیوەتەوە ، وەك دەقی وەگیراو خستووەتە کەوانەوە ، کە ئەمەش وا دەگەیەنێ ، ئەو وتانە بێ زیاد و کەم ، بەو چەشنە وترابن ...

هەرچی بۆ شەخسی خۆمە ، هیچ گلەیی زۆر لەو مرۆ بوختانکەرە ناکەم ، بەڵام بۆ د . کەمال ، نەك هەر گلەیی ، بەڵکو لۆمە و سەرزەنشتیشی دەکەم ... گەلۆ ! ئێمەی کوردی کلۆڵ و چارەڕەش ، چەند زانا و دانا ؛ پایەبەرز و پایەدار ؛ گەورە و کەڵەمێر ...ی وەك د . کەمالمان هەیە ، تا بە ناوییەوە بوختان هەڵبەسترێ و وا سووك تەماشا بکرێ ... ئەگەر زمان بۆ ئەو جۆرە وشانە ببزوێ ، ئەی قەڵەم چۆن قایل دەبێ ، بیاننووسێ ؟ ...

م . وریا ، کە لە پێناوی وەدیهێنانی کام و ئارەزووی ناڕەوایدا ئەو کارە نابەجێیە دەکا ، دەبێ بزانێ ، نە بە فڕوفێڵی ئەو ناوی مەزنی زانایان لەکەدار دەبن و ، نە بە هاژوهووژی تەلاری بالآیان هەرەس دێنێ و ، خۆیشی بەوە زل دەبێ ... واتە مەرامی ناڕەوای نایەتە دی و تەنها ناوی خۆی دەزڕێنێ و سنعەتەکەی ڕەزیل دەکا ... کورد وتەنیش : (( بزن کە خوا بیگرێ نانی شوان دەخوا )) ...

ئەوێك بە ڕۆژی ڕووناك کەرەستە لە زمانەوانانی کورد و نامەی

ماجستێری و دوکتۆریی خوێندکارانی کوردەوە وەربگرێ و بیکا بە ماڵ و موڵکی خۆی و بە بیانوو و بەهانەی هەرزان بەها هەولی شاردنەوەی بدا ... یاخود کە دەقی بڵاوکراوە وەردەگرێ ، بۆ وەدیهێنانی مەبەستی ناڕەوا و نابەجێی بیشێوێنێ و تێکوپێکی بدا ... ئێدی دەمێ وتووێژ و دەمەتەقێیێك بگێڕێتەوە ، دەبێ چی بەسەربێنێ و بەرانبەرەکەشی تووشی چ دەردەسەری و گرفتارییێك بکا ، بەتایبەت ، چونکە خۆ ئەمەیان ماست نییە بە دەمییەوە دیار بێ .

لەلایێکی دییەوە مایەی خۆشی و بەختەوەرییە ، گشت بەشدارانی وتووێژی ماجستێرنامەی کاك محەمەد زەهاوی لە ژیاندان ، جا گەر ئەو شەرم لە من و د. کەمال نەکات ، ئەو تۆمەتە بخاتە ئەستۆمان ، ئەدی لەمەودوا چۆن ڕووی دێ لە پێش سەد کەسێکدا سەرهەڵبڕێ ... (( زاڵم زەواڵت بێ ))...

وەك م. وریا بەناوی د. کەمالەوە دەڵێ : (( ئاورەحمان کە لە سۆڤیەت گەڕایەوە ... لە ساڵی ١٩٧٣دا و لە کۆڕی زانیاریی کورددا دامەزرێنرا ... ئیملای کوردیی نەئەزانی .. ئەوسا فێربوو ...)) (ل٣) . گەر ئەمە ڕاستیش بێ ، ئەوە :

١ـ هیچ نەبێ من ساڵی ١٩٧٣ لە کۆڕ فێربووم ... باشە ئەی ئەو وەڵامی چییە ، کە نەك هەر بە شەش ساڵ لە لەندەن ، بەڵکو بە بیست ساڵیش لە بەشی کوردیی کۆلێژی پەروەردە هەر کۆڵەوار و دەستەپاچەیە ... بۆ ئەوەی وتەکانی منیش وەك ئەوانی م. وریا ڕووت و ڕەجاڵ نەبن ، فەرموون ئەوە چەند نموونەیێك :

أ) لە وتاری (( ڕەخنەی نارەخنە ))یدا[٢٦] ئیملای چەندین وشەی هەڵەیە و بەتایبەتی ئەوەی لەبریتی ( تەئکید ) ، نووسیویە ( تاکید )

---

(٢٦) وریا عومەر ئەمین ، ڕەخنەی نارەخنە ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ١٤٠ ، بەغدا ، ١٩٩٧ ، ل٢٢ـ٢٤.

(ل ٢٣، س١ ، د٢٥) ؛ لەجیاتی ( بەراورد ) ، ( بەراووردِ ) (ل٢٣، س ١ ، د٣٠ ، ل٢٣، س٢ ، د٥) ...

ب) ئەو کە یەکێکە لەوانەی بەتەواوی لایەنگیری دانانی چوکڵەیە لە ژێر ( ڕ )ی سەرەتای وشەدا و ئەمەی لە وتاری ((ئیملای کوردی و چەند تێبینیی‌یەك)) ( ل٤٢٢) دا دەربڕیوە ، کەچی لەم وتاری (( ڕەخنەی نارەخنە ))یەیدا لە نووسینی سەرجەمی ئەو جۆرە وشانەدا (٧)ی نیشانەی قەڵەویی لەژێر ئەو پیتانەدا دانەناوە ... ئەم دیاردەیەش وەنەبێ هەر لەم وتارەیدا بێ ، بەڵکو لە زوربەی نووسینەکانیدا بەهەمان چەشنە ... زێدە ڕۆیی نییە ، گەر بڵێم نامیلکەی ( ڕێزمانی راناوی لکاو ) پتر لە سەد وشەی وای گرتووەتە خۆ و تاکە یەکێکیان چییە ، چوکڵە لەژێر ( ڕ )ەکەیدا نییە . بۆ نموونە سەرناوی ئەو نامیلکەیەی لە سێ وشە پێکهاتووە : ( ڕێزمانی راناوی لکاو ) و دوانیان بە ( ڕ ) دەست پێدەکەن و لەژێر ( ڕ )ی هیچ کامێکیاندا چوکڵە دانەنراوە ...[٢٧]

جـ) لە وتاری (( پاشبەندی / یّ / لە ڕەخنەی نارەخنەدا ))[٢٨] نووسیویّتی :

(( دکتوراه )) ( ل ١٩ ) . کورد دەڵێ ( دکتۆرا ) ، نەك ( دکتوراه ) ... وێڕای ئەوە : گەر بە شێوە عەرەبییەکەش بوترێ ، ئەوە (ه)ی کۆتایی دەبێ بە ( ه ) بنووسرێ ، چونکە لە کوردیدا ئەو ( ە )یە بەرانبەر سەر ( فتحە )ی عەرەبی دەوەستێ ...[٢٩]

... و گەلێکی دی .

---

(٢٧) بۆ زانیاریی پتر لەمەڕ ئەم باسە ، بڕوانە : ( ل ٦٩- ٧٠)ی بەرگی یەکەمی نامیلکەی (( ڕەخنەی نارەخنە)) .

(٢٨) وریا عومەر ئەمین ، پاشبەندی / یّ / لە ڕەخنەی نارەخنەدا ، گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ)) ، ژ ١٤٢ ، بەغدا ، ١٩٩٨ .

(٢٩) هەمان سەرچاوە ، ل١٥.

لـەو جـۆرە هەڵانـەی ڕێنـووس ، کـە وێرانـی و سـەرگەردانی نیشـان دەدەن ، لە نووسینی کەسێکی کۆلکەخوێندەوار دەچن ... لەبەر ئەوەی م. وریـا دڵسـۆزی زمـانی کـوردی نییـە و لـە پێنـاوی سـاخکردنەوە و دەستوورەکانیدا ئامادە نییە خۆی ماندوو بکا ، بۆیە قوڕێکی خەستی بۆ زمانی زگماکی گرتووەتەوە ... سەرباری ئەوە ، ئەلحەق ڕووییێکی دەوێ بوختـان بۆ کەسانی دیـی هەڵبەستێ .. ئیتر خوێنـەری وشیار و وریـا و زرنگی کورد چۆن بەو قسە و قسەلۆکانەی ناخەنن ؟ ...

٢ـ د. کەمال لە چەند کۆڕ و کۆبوونەوە و سیمینارردا بە سۆز و جۆش و پەرۆشەوە ئەمانەشی درکاندووە :

أ) کوردییەکەی د. ئەورەحمان ئەڵێی سیمفۆنیایە ...

ب) لەوانـەی لـە یـەکێتیی سـۆڤێت خوێندوویانـە ، کەسـیان وەك د. ئەورەحمان زمانی ڕووسی نازانن ...

جـ) لـە وتوویـژی هـەڵبژاردنی ناونیشـانی بابـەتی ماجسـتێرنامە و دوکتۆرانامەدا بە زۆری ڕوو لە بەندە دەکات ...

... هتد .

خۆ م . وریا چاك ئاگاداری ئەم ڕاستییانەیە ... دەبێ ئەو ویژدانەی چـی بـێ ، کـە بـۆ چرکەیـەکیش بەخەبـەر نـەهاتبێ ... مـن بـە ئاکـاری ڕاهـاتووم و بۆ خـۆم چـاوەڕوانی قسـەی خـێری لـێناکەم ... بـەڵام هیـچ نەبوایە ، با لـەو خەرمانە بە بەرەکەتـەی ئەو د. کەمالە خێرخوازە ، یـەك دوو نموونەی لەبارەی هەر کەسێکەوە بوایە ، بگێڕایەتەوە ...

هەر لـەو وتانـەی بـەدەم د. کەمالـەوە هەڵیبەسـتوون ، کـە نووسـیویە : (( د. کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد کـە ئاگـاداری سەرگوزشـتەی خوێندنـی ئاورەحمانە )) (ل٣) مەبەستی ئەوەیە ، ئەو زاتـە (( ئاگاداری تـەواو ))ی (( فەشەل و نوشستی )) ؛ (( شلۆق و بێ بیناغە ))یی ؛ (( نزمی مستوای

ئەکادیمی ))... بەندەیە .

ئەلحەق د. کەمال ، نەك هەر ئاگاداری تەواوی سەرگوزەشتەی خوێندنمە ، بەڵکو ئاگاداری گشت کاروبارێکمە و هێندەش چاکەی بەسەرمەوەیە ، کە هی سەرجەمی هاوڕێیانی دی و تەنانەت براکانم پێکەوە ، ناگەنە نیوەی ئەوەی ئەو ... جا ئەو :

١ـ لە یەکێتیی سۆڤێت ئامۆژگاریی خوێندکارە کوردەکانی دەکرد ، کە وەك ئەوڕەحمان بخوێنن و سەری سوڕدەما چۆن فریادەکەوتم زوربەی تاقیکردنەوەکان پێش کاتی دیاریکراو بدەم .

٢ـ لەو ڕۆژەشەوە ، کە گەڕاومەتەوە وڵات لە چەندین دانیشتندا باسی چاك خوێندن و باش کەڵك وەرگرتن لە وانەکان و چوست و چالاکیم و بەرزیی ئاستی زانستیمی کردووە .

٣ـ بە نووسینیش لە چەند بەرهەمێکیدا ئەو زانیارییانە و هەندێکی دیی تۆمارکردووە .

... هتد .

ئەگەر کەسێکی ڕاستگۆی خۆشەویستم پێم بڵێ : د. کەمال یەك دوو وشەی خراپی بەرانبەر بە تۆ کردووە ، نەك بە هیچ چەشنێك بڕوای پێناکەم ، تەنانەت گەر بەرەو ڕوو بە خۆشم شتێکی لەو جۆرە بڵێ ، دەڵێم ئەوە د. کەمال نییە ... ئەم زاتە تەنانەت خەوشەکانیشم دەپۆشێ ، ئیتر چ گەمژەیێك بڕوا بەوە دەکا لای م . وریا باسی خراپ خوێندنی من و سەرگوزەشتەی (( فەشەل و نوشوستی ))یمی کردبێ ... گوایا بە ئەقڵی خۆی دەیەوێ بەندە بەرانبەر د. کەمال بخاتە گومانەوە و بە شانی ئارداوی کردنیشی ، عەریفەکەی ڕازی و دڵخۆش بکا ...

ئەو وتە ناشیرینانەی بەدەم د. کەمالەوە ڕێکی خستوون ، جێی نیگەرانی و دڵتەنگیی سەرجەم و سەرپاکی دۆست و هاوڕێیانە .

* *

له لاپەڕە (٣٩)ی بەرگی دووەمی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە))دا ، ئەوەم یادداشت کردووە ، کە م. وریا (( ماوەیەکە نازناوی (استاذ علم اللغة)ی لە خۆی ناوە . ئەمیش دوای ئەوەی بیست ساڵێك ئەو خەڵکەی بەوە خەڵەتاند ، گوایا بڕوانامەی دوکتۆرای هەیە ))... پاش ئەوەی بەم جاڕی هەقە دەستەکەی کەوتەڕوو ، بەداخەوە هێندە بوێر نەبوو پێ لە هەڵە و گوناهی خۆی بنێ . بەڵکو بۆ پۆشینی ئەو ناپاکییە ، هەوڵیدا بە منجەمنج و وتەی وڕێنەئاسا و بە بڕوبیانووی سەیر و سەمەرە ئەو خەڵکە چەواشە و چاوبەست بکا ، کە گوایا دوکتۆرانامەکەی هەندێ باسی سیاسیی گەورە و زەقی تێدایە ، دەستی بەسەردا گیراوە و د. عەبدولستار تاهیر شەریف فریای کەوتووە و ڕزگاری کردووە ...

لەبەر ئەوەی هەر ڕۆژە بەیت و بالۆرەییێکی نوێ دەهۆنێتەوە ، بۆیە ئەوەی ئەمڕۆ دەبووت ، سبەینێ لەبیری دەچووەوە .. (( درۆزن شتی لەبیرنامێنێ )) ... جا ئەو وتانەی بووبوونە نوکتەی نێو برادەران ...

ئەوجا کە تێگەیشت هەموو پێکەنینیان بەمە دێ ، بۆ خەفەکردنی خەڵکەکە و ئاگرەسوورە لە خۆ دوورخستنەوە ، فێڵێکی تازەی دۆزییەوە ... ئەویش ئەوە بوو ، کە دەیووت : ئەوڕەحمان ، نەك دوکتۆرا ، بەڵکو ماجستێریشی نییە و ئەم بیرە نوێیەشی لە بوختاننامەکەیدا بە دوور و درێژی باس کردووە ... (( هەزار تەڵەی بە کلك تەقاندووە )) ... ئێمە بۆ ماندوونەکردنی خوێنەر تەنیا شتێکی یەکجار کەمی لێدەگێڕینەوە :

((ئاورەحمان ئیدیعای ئەوە ئەکات دکتۆرای هەیە)) (ل ٥، د ١٨ـ ١٩) .

(( ئاورەحمانی حاجی مارف ... ئیدیعای ئەوە ئەکات کە

ماجستێریشی هەیە )) ( ل٥ ، د ٢٠-٢٣).

(( کەی لە سیستەمی کاندیداتا ماجستێر هەیە ( ل ٦، د ٩) .

((گەر ئاورەحمان راست ئەکات ماجستێری هەیە ... هەر دوو نامەکەی عەرز کات)) (ل ٦، د١٠-١١) .

((... ئاورەحمانی حاجی مارف .. بڕوانامە بێ ناوەکەی خۆی کردۆتە پەساپۆرت)) ( ل ٨ ، د ١٣-١٤)

... هتد .

خزمینە ! جارێ من هیچ ناڵێم ، ئێوە خۆتان بیڵێن .. فەرموون چی دەبینن ... ئەوە فۆتۆکۆپیی هەردوو بڕوانامەکەم :

١) فۆتۆكۆپیی بڕوانامەی ماجستێرەكەم :

UNION OF SOVIET SOCIALIST REPUBLICS

# DIPLOMA



ДИ № 005442

This is to certify that *Abdul Rahman Maroof*

was admitted in 19*63* to *the Leningrad "A. A. Zhdanov" State University (Order of Lenin)*

and in 19*68* completed the full course of *the University*

having specialized in *the Russian Language and Literature*

The State Examination Commission certifies that he is qualified as: *philologist specialist, Russian philology, teacher of the Russian Language*

Special decisions of the Council:

*Abdul Rahman Maroof is conferred the degree of Master of Arts (M. A.) (philology)*

He/she is entitled by this Diploma to carry out independent work of any kind connected with the above-mentioned qualification and speciality.

Chairman of the State Examination Commission

Rector

Dean of Faculty

*Leningrad* 19*68*

Reg. No. *145*

ب) فۆتۆکۆپیی بڕوانامەی دوکتۆراکەم :

SUPREME ATTESTATION COMMISSION

upon the recomendation of *the Council of the Leningrad State University*

Hereby confers on

*Abdul Rahman Maroof*

the degree of

DOCTOR OF PHILOSOPHY (Ph. D) *Philology*

in recognition of his proficiency in the general and special studies and research prescribed by said *University* for such degree.

Given this day under the seal of the Commission at Moscow, USSR.

Chairman

General Secretary

МКАП № 002327

Moscow, *November 1*, 19*72*

وەنەبیٚ ئەم تۆانج و تۆمەتەی م. وریا هەر من بگریٚتەوە ، بەڵکو تیکڕای ئەوانەشی بەردەکەویٚ کە لە سۆڤیٚت و ڕووسیا دوکتۆرایان وەرگرتووە ... گەر تۆ لە ئەورەحمان تووڕەی ، تەنیا ئەو بەردەباران بکە ... بۆ تەڕ و وشك پیٚکەوە دەسووتیٚنی ؟ یان بۆ شەلم کویٚرم تیریٚکی وا زەهراوی دەهاویٚژی چەندین زانا و دانای ناودار و بەناوبانگی کوردیشی پیٚ بریندار بکەی ... باشە ، بیرت لەوە نەکردووەتەوە ، کە زوربەیان نەك هەر ڕابەر و مامۆستاتن ، بەڵکو برادەر و هاوڕیٚشتن ... خۆ گەر گویٚت بەمەش نەدابیٚ ، دەبوو ئەوە لەبیرنەکەی ، کە ئەوە پتر لە سی ساڵە ئەم زاتانە :

( ١ـ د. کەمال مەزهەر

٢ـ د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

٣ـ د. مارف خەزنەدار

٤ـ د. کاوس قەفتان

٥ـ د. نەسرین فەخری

٦ـ د. شوکرییە ڕەسووڵ

٧ـ د. کوردستانی موکریانی

٨ـ د. ئیحسان فوئاد

٩ـ د. ئەحمەد عوسمان

١٠ـ د. فارووق عومەر صدیق

١١ـ د. ڕەشاد میران

١٢ـ د. ئەنوەر قادر جاف

١٣ـ د. جەمشید حەیدەری

... و چەندینی دی) لە بوار و دەرەتانی میٚژوو و ئەدەب و زمان و ئەتنۆگرافیا... ی کورددا خزمەت و ڕاژەیان یەکجار دیار و بەرچاوە و

بەرهەمە بە بەرکەت و بەهادارەکانیان مایەی سەربەرزی و شانازیی میللەتەکەمانن ...

گەلێ خوو و ڕەوشتی وەك بێوەفایی و بێئەمەکی و فڕوفێڵ و گزیوفزی ... لەو پیاوەدا کۆبوونەتەوە . ئەوەتە هەر بۆ مەبەستی ئەوەی بەرانبەر نامەکانم و بڕوانامەکانم پتر خوێنەر بخاتە گومانەوە و تەواو سەری لێبشێوێنێ ، هاتووە لە لاپەڕە (٣٠)ی کتێبی ((ڕابەری سەرچاوە لە بارەی زمانی کوردییەوە )) ، کە دەربارەی (کورتەی نامەی دوکتۆری)یەکەم دواوم ، نەك (نامەکە) ... لەبارەی (کورتە) کەیەوە نووسیومە :

(( مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردی و شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی - کوردی ، ١٩٧٢.

* ئەم نامیلکەیە کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەیەتی و (٢١) لاپەڕەیە . لە پێشەکی و دوو بەش و سێ فەسڵ و ئەنجام و پاشبەند پێکهاتووە )).

جەنابیشی وشەی ( کورتە )ی لێ لابردووە و کردوویە بە :

(( مێژووی فەرهەنگ نووسیی کوردی و دانانی فەرهەنگی رووسی ــ کوردی ١٩٧٢ــ ئەمە نامەی دوکتۆری یەکەیەتی و (٢١) لاپەرەیە . لە پێشەکی و دوو بەش و سێ فەسل و ئەنجام و پاشبەند پێك هاتووە )) (ل ٤)

ئەوجا بە گاڵتەجارییەوە ، ڕوودەکاتە خوێنەر ، کە گوایا هەموو نامەی دوکتۆرییەکەی ئەوڕەحمان (٢١) لاپەڕەیە .

هەر کەسێ لە سۆڤێت خوێندبێتی ، چاك دەزانێ بە تایپ چوار دانە لە نامەی دوکتۆری چاپ دەکرێ ... نامەی دوکتۆرییش بێ (کورتە) نابێ ، کە ئەویش بە چاپ سەد دانەیێکی لێ بڵاودەکرێتەوە ...

جا بەندە لەو ( ڕابەر )ەیدا باس لەو ( کورتە )یە دەکات و خۆ ئەویش

لای خۆی ئەو وتانەی منی وەك دەقی وەرگێراو وەرگرتووە ... خۆ ناشێ بڵێ هێندە بێئاوەز و بێسەلیقەم و وشەی (کورتە)کەم نەبینیوە ؛ یان بفەرمووێ هێشتا فێری ئەوە نەبووم ، چۆن دەق وەربگرم ؛ یان ددان بەوەدا بنێ ، لەبەر کاری دی لە سۆڤێت نەپەرژاومەتە سەر ئەوەی ( نامە ) و ( کورتە ) لێك جیابکەمەوە ... یان وا نیشان بدا ، کە شێواز و ڕێبازی تازەگەریی دەبێ شێواندنی ڕاستی بێ ... ئەمانە بە هیچ سەنگ و پێوانەیێك لە هیچ بوارێکی زانستی و ڕەوشتیدا جێیان نابێتەوە و نابێتەوە و پەسەند نین ...

لێرەدا وتەی ئەو برادەرە دووپات دەکەمەوە ، کە دەڵێ : م . وریا هەتا فێڵ هەبێ دەیکا .

ئەوە ئیسپاتم کرد ، کە بڕوانامەی ماجستێریش و دوکتۆراشم هەیە ... نکۆڵی لەوە ناکەم ، کە م. وریا ماجستێری هەیە ، بەڵام دوکتۆرای نییە ... چەند بەڵگەیێك :

أ) ئەوە ماوەی ساڵێکە بۆ ئەوانەی بڕوانامەی دوکتۆرایان هەیە ، دەرماڵەی بیست هەزار دیناریان بڕیوەتەوە و بۆ ئەوانەش ، کە خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرن - دە هەزار دینار .

* خاوەن بڕوانامەکانی بەشی کوردی ، چ ئەوانەی لە یەکێتیی سۆڤێت وەریان گرتووە ، یان ئەوانەی لە عیراق ، وەك :

( ١- د. کەمال مەزهەر

٢- د. نەسرین فەخری

٣- د. فوئاد حسێن

٤ - بەندە ) لەیەك لیستەدان و مانگانە سەر و بیست هەزار دیناریان دەدەنێ .

* ئەوانەی ماجستێریان هەیە ، وەك :

( ١ـ م. ئەحمەد حەسەن فەتحوڵڵا .

٢ـ م. وریا عومەر ئەمین

٣ـ م. لەیلا جەلیل دەلۆ

٤ ــ م. نازەنین جەلال )یش لەو لیستەیەدان ، کە دە هەزار دینار وەردەگرن .

ب) تاکو ئێستا چەندین ئیستمارە ، کە بۆ مەبەستی جیاجیا پڕی‌کردووەتەوە ، لە بەرانبەر پرسیاری ئەوەی چ بڕوانامەیێکی هەیە بە خەتی خۆی نووسیویە : ( ماجستێر )

جـ) سەرپاکی ئەوانەی لە ئینگلتەرە لەگەڵی خوێندوویانە ، ئەوە ناشارنەوە ، کە دوکتۆرای نییە و ماجستێری هەیە و ، لەو کردەوەیەی سەرسامن ...

د) لە پاشکۆی وتاری ناوبراوی (( ڕۆژگێران و دەستکەوتی مەزن ))دا خۆی نووسیویە ، کە بڕوانامەی (M.phil)ی هەیە (ل ٤٨) ... هەمووشمان دەزانین ، کە ماجستێر دەکا ...

... هتد .

ئەو پرسیار و داوای زۆری کرد و ئێمەش بەدڵی خۆی وەڵامیمان دایەوە و بەجێمان هێنا ... با ئێستا ئێمەش چەند پرسیار و داوەکاری‌یێکی لێ بکەین :

ا) ئەو نووسیویە : (( بۆ ماوەی شەش ساڵ لە زانکۆی لەندەن خوێندوویەتی )) (ل ٤٨)... ماوەی ماجستێر چ لە ئینگلتەرە و ، چ لە عیراق دوو ساڵە و گەر کێشەیکیش هاتەپی دەکرێتە سێ ساڵ ... جا تۆ ، کە بە شەش ساڵ تەواوت کردووە ، هی تەممەڵیت بووە ، یان بە کاری دییەوە خەریك بوویت ؟...

ب) مەکەنزی بتۆ چەند مانگێك كاری لەگەڵ کردیت و دوایی وازی نیْهێنایت و دەستبەردارت بوو ؟ ...

جـ) دەزانین لەبەر چی تۆ و تێکڕای قوتابییەکانی دییان لە سۆڤێت گەڕاندەوە ... بەڵام پێمان بڵێ ، لەو دەستە کەمەی نێررانە ئینگلتەرە ، چۆن تۆی کەوتیتە ناو ؟

د) گەر ڕاست دەکەی و بڕوانامەی ( دوکتۆرا)ت هەیە ، ئەوە تکایە وەك بەندە وێنەکەیمان بخەرە پێش چاو ...

* *

*

م. وریا بەتەواوی سەری لێ شێواوە و یەکجارەکی بێئاوەز بووە و خۆشی نازانێ چی دەڵێ ... ئەوەتە لە لایەکەوە بە گوێی خوێنەردا دەدا ، کە ئەورەحمان نە بڕوانامەی دوکتۆری هەیە و ، نە نامەی دوکتۆری نووسیوە ... کەچی لە لایێکی دییەوە دەڵێ : (( بۆ ئەم نامەیەی تا ئێستا نەکردۆتە کوردی ... وەك لە ناونیشانەکەیەوە دەرئەکەوێ کردنی بە کوردی دە ڕۆژ نابا چونکە بەشە هەرە زۆرەکەی فەرهەنگە و خۆی کراوەتە کوردی ... و ... ئەو بەشەی کە بە رووسی‌یە گومانی تیا نی‌یە سەرەتا بە کوردی یا عەرەبی نووسراوە و بۆی کراوەتە ڕووسی ... ))(ل ٤) .

م. وریایێك ، کە خۆی بە شاگردی چۆمسکی دەزانێ و تا ئێستا لە تیۆری و لێکۆڵینەوەکانی تێنەگەیشتبێ ، ئیدی دەربارەی تیۆریی فەرهەنگنووسی دەبێ ئاستی زانستی چەند بێ ؟ ... خۆزگە ئەم ڕاستییانەی ڕەچاودەکرد :

١ـ لێکۆڵینەوەیێك یان بەراوردێك یان فەرهەنگێك لە نێوان ڕووسی و کوردیدا بێت ، گەر بەشە ڕووسییەکەی بکرێتە کوردی ، ئەوەچۆن

لێکۆڵینەوەیێکی بەراوردیی ئەو دوو زمانە سازدەبێ ... یاخود با بڵێین بێتو فەرهەنگێکی ئینگلیزی ـ کوردی ، بەشە ئینگلیزییەکەشی بکرێتە کوردی ، چۆن وەك فەرهەنگی ئینگلیزی ـ کوردی دەمێنێەوە !...

٢ـ کارێك کە بە هیچ چەشنێك نەیبینیبێ :

ا ) چۆن لێی بێگومانە ، کە بەشە ڕووسییەکەی سەرەتا بە کوردی یا عەرەبی نووسراوە ؟

ب) ئایا دەشێ بەشی ڕووسیی کارێك بە زمانێکی دی بنووسرێ و دوایی بکرێ بە ڕووسی ؟ ... بڕواناکەم نەزان و گەمژەش شتی وا سەیر و سەمەرە بڵێن .

جـ) ئەدی د. کەمال مەزهەر و د. کاوس قەفتان و کەسانی دی باسی چاك ڕووسیی زانینی منیان کەم بۆ کردووە ؟ ... ئەی بۆ خۆی لەو ڕاستییە گێل کردووە ؟

د) بێتو نامەی دوکتۆرییەکەم بۆ کرابێتە ڕووسی ، کەواتە ڕووسی نەزانێکی وەك من چۆن توانیوێتی لە بواری جیاجیادا چەندین کتێب و وتار لە ڕووسییەوە وەربگێڕێتە سەر کوردی و بەتایبەت کتێبی (( سەرەتایێکی زمانناسی )) ، کە (٣٣٩) لاپەڕەیە و هەمووی تیۆری و لێکۆڵینەوەی ورد و قووڵی زمانە ؟ ...

هـ) گەر بەشە ڕووسییەکەی بشکرێتە کوردی بە چ ڕێگەیێك (( کردنی بە کوردی دە ڕۆژ نابا ))؟ ... ئەو کە ڕێبازی وا شك دەبا و هێندە گورج و گۆڵە ، ئەی ئەوە بیست ساڵە بۆ نامەی ماجستێرەکەی خۆی نەکردووەتە کوردی ؟

ئەوە من ڕووسی نەزانم و کەچی لە بواری زمان و ئەدەب و مێژوو و ئەتنۆگرافیادا هەزار لاپەڕەیێکم لە ڕووسییەوە کردووەتە کوردی ... بەڵام م. وریا ، کە گوایا ئینگلیزیزانە و خۆیمان بە ( استاذ علم اللغة )

پیٚدەناسێنیٚ ، بۆ تا ئەمڕۆ نامیلکەیێکی سەبارەت زانستی زمان و یان هەر بابەتێکی دیی کوردناسی لە ئینگلیزییەوە وەرنەگێڕاوەتە سەر کوردی ؟ ... خۆی ئەو چەشنەیە ، کەچی لەو وتارەیدا ، کە باسی وەرگێڕانی کتێبی (( ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی ))ی ق. کوردۆ لە لایەن د. کوردستانی موکریانییەوە دەکات ـ ( ڕۆژنامەی (( هاوکاری )) ، ژ ٧٦٨، ١٩٨٤/١٢/٢٠ ، ل ٤ ) ڕوودەکاتە ئەوانەی لە هەندەران خوێندنیان تەواوکردووە و زمانی بێگانە دەزانن ، لە ڕووی وەرگێڕانەوە سستی و کزییان تێدا بەدی دەکریٚ و بۆ لەو بەرهەمە زۆرەی دەربارەی کورد و کوردستان هەیە ، شتێکی ئەوتۆیان لیٚنەکردوونەتە کوردی و ئەوجا بە گلەییەوە دەڵیٚ : (( بەداخەوە زۆر مامۆستا و دوکتۆرمان هەیە دە پانزە بیست ساڵیٚ ئەبیٚ خوێندنیان تەواو کردووە و گەڕاونەتەوە وولاٌت ـ تاك و تووك ـ نەبیٚ ـ لەم ماوەیە دوور و درێژەدا دەستیان بۆ چەن لاپەڕەیەك درێژ نەکرد خۆماڵییان بکەن )) (س١) ... ڕاست ئەوەیە (( دەرزییەك بکە بە خۆتدا ، ئنجا سووژنێك بکە بە خەڵکدا ))... هیوادارم گلەییم لیٚنەکریٚ ، گەر بڵێم ئەو شێوازە وازوازی و بیٚباکییەی ، چ بەندە و چ سەرجەمی دۆستان سەرسام ناکا ، چونکە ئەمە کار و پیشەی ڕۆژنامەیەتی ... هەر ڕۆژە دەهۆڵێك دەکوتیٚ و قسەکانی باجیان لەسەر نییە ...

... هتد.

لە سەرەتای ئەو وتە بیٚ سەروبەرانەیدا نووسیویە ، ئەوڕەحمان (( سەرەڕای ئەو هەموو نووسین و حەزکردنی لە بلاٌوکردنەوەی زۆر ))(ل٤)...

کەسێك گەیشتبێتە ئەو ئاستەی ئاشق و شەیدای زمانی شیرینی بابی بووبیٚ ، ئێدی گەر بە شەونخوونی و نووسین و حەز لە بلاٌوکردنەوە ،

خزمەت و ڕاژەی نەکا ، ئەی بە چ شێوە و شێوازێك ئەركی پیرۆزی بەجێبێنێ ؟ ... یەکەم جارە لە ژیانمدا ببیستم لەسەر ئارەزووی نووسین و ڕاژەی میللەت ڕەخنە لە خەڵك بگیرێ ... وا پێدەچێ م. وریا دەیەوێ بمباتە ڕیزی خۆی و منیش بە ڕاکەڕاکە و گیرفانپڕکردن و فڕوفێڵ و خەڵك خەڵەتاندن و بە شان و باڵی خۆدا هەڵدانەوە خەریك بم .. نەخێر ، ئەو ڕێبازە نەك هەر بە خەسڵەت و ئاکاری بەندە نامۆیە ، بەڵکو بە زۆرینەی ئادەمیزادیش نابەجێیە ... و تۆیش (( دوای کڵاوی بابردوو کەوتووی ))...

م. وریا بێ ئەوەی ، نە ( نامە )کەم و نە ( کورتە )کەی بینیبێ ، کەوتووەتە ڕەخنە لە بەشی دووەمی نامەکە ــ (( شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ))و دەڵێ : (( ئەمەشیان .. ناچێتە ڕیزی کاری ئەکادیمی‌یەوە ... چونکە ئەوسا کە ك. ئاورەحمان ئەم نامەیەی ئامادە ئەکرد دەیان فەرهەنگی ڕەسەنی وەك ( رووسی ـ عەرەبی )... و تەنانەت ( رووسی ــ کوردی )یش هەبوون .. بەتایبەتی فەرهەنگە ( رووسی ـ کوردی)یەکەی مامۆستای خۆی قەناتی کوردۆئیڤ ...))( ل ٥)

با بفەرمووێ :

أ) تۆ لێکۆڵینەوەیەکت نەدیبێ و نەخوێندبێتەوە ، بە چ سەنگ و تەرازوویێك وای دادەنێیت (( ناچێتە ریزی کاری ئەکادیمی‌یەوە )) ؟.

ب) بەخێری لە گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ ))دا فەرمووتە : لە ساڵی ١٩٧٣/٧٢دا لە کۆلێجی ئامادەیی‌ی زانکۆی مۆسکۆ خوێندووتە و بە پلەی امتیاز دەرچووی ... بیست ساڵیشە چۆمسکی تاووتوێ دەکەی ، ... ڕەخنە لە کاری فەرهەنگنووسیی بەندە دەگری .. کەچی فەرهەنگی ( کوردی ـ ڕووسی )ی د. قەناتی کوردی بە ( ڕووسی ــ کوردی ) تێگەیشتووی ... دیارە کوردی و ڕووسی وەك یەك خراپ دەزانی ، بۆیە وا

بەپێچەوانەوە باسی دەکەی

جـ) گەر بەر لەو کارەی من دەیان فەرهەنگی دی هەبووبن ، بۆ دەبێ مافی ئەوەم نەبێ بە شوێن شێوە و شێواز و ڕێبازی تازە و ساناتردا بگەڕێم ... یان تۆ بە چیدا دەزانی ، کە من ڕای لەبار و نوێم نەهێنابێتە ئاراوە ؟

... هتد .

چەند دێڕێك دواتر شتێکی سەیرتر دەڵێ : ((... یەکێ لەم فەرهەنگانەی دووبارە نووسیوەتەوە ... بەتایبەتی فەرهەنگە ( ڕووسی ـ عەرەبی )یەکەی ( گریگۆری شریاتۆف )کە چەن ووشەیەکی لێ لابردووە و عەرەبی‌یەکەی کردۆتە کوردی)) (ل٥).

١ـ هەموو ئەوانەی من دەناسن و لەگەڵیشیاندا م. وریا ، ڕاست و ڕەوان دەزانن ، کە بەندە ڕووسی لە عەرەبی باشتر دەزانێ ، ئیتر بۆ دەبێ عەرەبی‌یەکەی ئەو فەرهەنگە بکاتە کوردی و ڕووسییەکەی وەرنەگێڕێ ؟

٢ـ ئەو کە فەرهەنگەکەی د. قەناتی کوردۆ بە ( ڕووسی ـ کوردی ) تێکەیشتبێ ، خۆ ئاسانتر بوو بڵێ ، ئەوەی ماموستاکەی وەرگرتووە ... لەو بارەدا پێویستی بە وەرگێڕانیش نەدەکرد .

٣ـ گەر ئەو فەرهەنگە ( ڕووسی ـ عەرەبی )یەشم وەرگرتبێ ، ئەوێك کە نامەکەی نەبینیبم ، چۆن دەڵێ : ( چەن ووشەیەکی لێ لابردووە )) ... ئەی بۆ نابێ چەند وشەیەکم خستبێتە سەر ؟ ... ئا ئەوەیە ویژدان و کار و کردەوەی ئەو برایەمان !...

... (( دەرەقەتم نایە و خەوی گولیم پێوە دەبینێ))

م. وریا لە ئەنجامی ئەو خەوەدا ، کە بە من و نامەکەمەوە بینیوێتی دەڵێ : (( ئەم نامەیەی ئاورەحمان ... ناشێ نزمترین بڕوانامەشی پێ وەربگیرێ ... هەر بۆیەشە هەڵگری ئەم بڕوانامەیە لە زانکۆدا بە پلەی

( معيد ) دائەمەزرێنرا )) (ل٥) .

پێم باشە ، م. وریا بزانێ :

١ـ لەسەر ئەو نامەیەی ئەو نەیبینیوە ، ئەنجومەنی ئەکادیمیەی زانستیی سۆڤێت بە پلەی بالاّ بڕوانامەی دوکتۆری پێدام .

٢ـ پێویستە بەر لەوەی شتێك بڵێ ، کەمێك بیربکاتەوە ... چونکە وەك ئاشکرایە ، (( نزمترین بڕوانامە )) ، هی پۆلی شەشی سەرەتاییە .

٣ـ تا بیست ساڵێکیش لەمەوبەر هەڵگری بڕوانامەی دوکتۆرا بە پەنجا دینار دادەمەزرا ، بەلاّم بەندە بە حەفتا دینار ـ واتە بە پلەییێك بەرزتر و بە ( باحث علمي ) ... هەرچی ئەوە (٣٦) دیناری بۆ بڕرایەوە و کرا بە ( معید )

فەرموون ، ئەوەش فەرمانی کارگێڕیی دامەزراندنم :

بسم الله الرحمن الرحيم

THE KURDISH ACADEMY
WAZIRIYA - BAGHDAD
IRAQ

کۆڕی زانیاری کورد
المجمع العلمي الكردي
الوزيرية ـ بغداد

العدد/ ١٤٥
التاريخ ٢٨/ ٣/ ١٩٧٣

امـــــــر اداري

استنادا الى موافقة مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتاريخ ١١/٣/١٩٧٣ على تعيين الدكتور عبدالرحمن معروف عبدالله بوظيفة باحث علمي في المجمع العلمي الكردي وتحديد راتبه بـ (٧٠/ـ) سبعين دينارا المبلغة الينا بكتاب وزارة التربية ـ المكتب الخاص السري المرقم ٦٠٠ والمؤرخ ١٥/٣/١٩٧٣ ولتوفر الشروط القانونية المنصوص عليها في المادة السابعة من قانون الخدمة المدنية رقم ٢٤ لسنة ١٩٦٠ المعدل.

يعين الدكتور عبدالرحمن معروف عبدالله بوظيفة باحث علمي في المجمع العلمي الكردي، ويحدد راتبه بـ (٧٠/ـ) سبعين دينارا اعتبارا من تاريخ مباشرته.

احسان محمد شيرزاد
رئيس المجمع العلمي الكردي.

صورة منه الى/

وزارة التربية ـ المكتب الخاص/اشارة الى كتابها المشار اليه أعلاه
وزارة المالية
رئاسة مجلس الخدمة العامة
رئاسة ديوان الرقابة المالية
مديرية الحاسبات العامة
مديرية التقاعد العامة
المديرية العامة لصندوق التقاعد
الحاسب
الحسابات / دگرل بيرفرزاني گرجما

دەقی ئەو فەرمانی کارگێڕییە :

کۆڕی زانیاری کورد

أمر اداری

أستنادا الی موافقة مجلس قيادة الثورة بجلسته المنعقدة بتأريخ ١٩٧٣/٣/١١ علی تعيين الدكتور عبدالرحمن معروف عبدالله بوظيفة باحث علمي في المجمع العلمي الكردي وتحديد راتبه بـ (ــ/٧٠) سبعين دينارا المبلغة الينا بكتاب وزارة التربية ــ المكتب الخاص سري المرقم ٦٠٠ والمؤرخ ١٩٧٣/٣/١٥ ولتوفر الشروط القانونية المنصوص عليها في المادة السابعة من قانون الخدمة المدنية رقم ٣٤ لسنة ١٩٦٠ في المومأ اليه .

يعين الدكتور عبدالرحمن معروف عبدالله بوظيفة باحث علمي في المجمع العلمي الكردي ويحدد راتبه بـ (ــ/٧٠) سبعين دينارا اعتبارا من تأريخ مباشرته.

احسان محمد شيرزاد

رئيس المجمع العلمي الكردي

صورة منه الی /

وزارة التربية ــ المكتب الخاص / اشارة الی كتابها المشار اليه أعلاه .

وزارة المالية

رئاسة مجلس الخدمة العامة

رئاسة ديوان الرقابة المالية

مديرية المحاسبة العامة

مديرية التقاعد العمة

المديرية العامة لصندوق التقاعد

المحاسب

المومأ اليه

٤ـ کاتێ گەڕامەوە وڵات ، بۆ کارلێکردن دەرگای چەند دەزگایەك بۆم واڵابوون... لە زانکۆی سلێمانییەوە د. کەمال خەیات و د. صەلاح حەفید بەتایبەتی هاتنە لام بۆ بەغدا و پێشنیازی پۆستێکی بەرزیان لە لای خۆیان بۆ کردم ، بەڵام من کۆڕی زانیاری کوردم پەسەندکرد ... بۆ م. وریاش ، جگە لە بەشە کوردییەکەی کۆلێژی پەروەردە ، کە چەند ساڵێك بوو کرابووەوە و مامۆستای کەم بوو ، هیچ شوێنێکی دی پێی ڕازی نەدەبوون ، ئەویش چونکە :

أ) بڕوانامەی دوکتۆرای نەبوو .

ب) تا ئەو دەمە لەبارەی زمانی کوردییەوە هیچی بڵاونەکردبووەوە و کەسێکی نەناسراو بوو .

ئەو بەو هەموو حاڵە شڕەی ئەوسای و ئێستایەوە ، هێندە بێ‌چاو و ڕووە بەندە بە (( ئەندامێکی (طارىء) )) (ل٣) دابنێ ... تەنیا هێندە دەڵێم ، من تازە بڕوانامەم وەرگرتبوو و هێشتا نەگەڕابوومەوە وڵات ، د. ئیحسان شێرزادی سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد و وەزیری شارەوانی ئەم نامەیەی بۆ ناردبووم :

وێنەی چەند دێڕێکی نامەکەی د. ئیحسان شێرزاد :



دەقی ئەو چەند دێڕە :

(( ... من و دکتور کمال بەدائمی چاوەروانی ئەوەمانە کە بگەرینەوە و کوری زانیاری کورد لە تواناتان سوود وەرگریت ...

زورمان پی خۆش بو کە اطروحەکەتان جیگای تقدیر بو هەروەها دفاعەکەتان

....))

دلسۆزتان

احسان شیرزاد

١٢/٢٠

ئەمانــە مشــتێکن لــە خــەروارێك و ... خۆزگــە ئــەویش یـــەك دوو بەڵگەنامەی لەو چەشنەی نیشان دەداین ...

*   *

گشت لاپەڕەکانی (بوختاننامە )کەی م. وریا بە هێرشی ناڕەوا و قسەی ناشیرینی کووچە و کۆڵان تەنراون و بـە شـێوە و شـێوازی دوژمنکارانـە بەرانبەر بەندە بووەتەوە :

لە لاپەڕە (١)دا پێم دەڵێ : ((خۆی کردۆتە مدیری طاپۆ و کوڕە ئازای زمـان)) (دا)... (( وەك فـس فس پاڵـەوان سـینگی خـۆی لــە مــەیدانی نووسین و رەخنەبازیدا دەرپەڕاندووە )) ( د ٢ )... (( لە گیان ئەم خەڵکە بەربووە )) ( د٣ ) ... (( هەر رۆژەی بە یەکێکەوە ئەنووسێ )) ( د٣ـ ٤) ... (( پەلاماری ئەم و ئەو ئەدات )) ( د٤ ) ؛ (( بـەگژ ئـەم و ئـەودا ئـەچێ )) ( د ٤ ) ... ((توانج لەم خەڵکە ئەگرێ)) ( د ٤ ) ... ((قسـەی ناشـیرینیان پێ ئەڵێ)) (د ٥) ... ((بەردەوام ئەیەوێ لە قەدریان کەم کاتەوە)) (د٥)... (( کێ ماوە تا ئێستا ئاورەحمان ... زمان و قەڵەمە دەغەزارە کینـدارەکەی خۆی دژی نەخستبێتە کار )) ( د ٦ـ ٧ ) ... (( بێ وەستان ئـەم خەڵکـە بەردەباران ئەکات )) ( د١٤ـ ١٥) ... (( کـاتی ئـەوە هـات لـە جیـاتی ئـەو هەموو خەڵکەی ئاورەحمان بەردەبارانی کردوون ... ئێمەش هـەندێ وردە چەوی بۆ بهاوێژین )) ( د ٢٠ـ ٢١ ) ... هتد .

لاپەڕە ( ٢ )

(( ڕەخنەکانیشـی جگـە لـە پووچیـان ... تۆزقـاڵێ گیـان و رەوشـتی ئەکادیمی‌یان پێوە بەدی ناکرێ ... هـەر شـەڕە جنێون )) ( د١٠ـ ١١ ) ... (( هەوڵدانن بۆ لە قەدر کەم کردنەوە و تەوس و گاڵتە پێکردن )) ( د ١١ ـ ١٢ ) ... (( هەمووی رەنگدانەوەی عونجوهییەت و خۆ بە شت زانینی بـێ ئەسـاس و نزمـی‌ی مسـتوای ئـەکادیمیین )) ( د ١٢ ــ ١٣ ) ... (( نزمـی

مستوای ئەکادیمی‌ی ئاورەحمان )) ( د ١٤ ) ... (( فەشەل و نوشستی بەرەو ئەم جیهانەی رامالیوە )) ( د ١٦ ) ... (( خوێندنەکەی بە رادەیێ شلۆق و بێ بیناغە بووە )) ( د ١٧ ) ... (( بێزی لێ بووەوە )) (د٢٢) ... (( گالتەی پێ کرد و ئیهانەی کرد )) (د ٢٢) ... هتد .

لاپەڕە ( ٣ ) :

((ئێستاش موزایەدە بە زمانی کوردی ئەکات)) (د ٣) ... ((فاشیل بوو)) (د ٥) ... (( تەرقین قەید کرا )) (د ٦) ... (( ئاورەحمان هەر لە ئەساسەوە ئەندامێکی (طاریء)ی جیهانی نووسین و رۆشنبیری‌ی کوردی‌یە )) ( د١٠ـ ١١ ) ... (( فەشەل و ناچاری بەرەو ئەم بوارەی رامالیوە )) ( د ١١ـ ١٢ ) ... هتد .

لە لاپەڕەکانی دیشدا بە هەمان چەشن شەکر دەشکێنێ و تەنانەت لە ناوەڕاستی لاپەڕە (٦)دا بۆ ئەنجامی ئەو ناسکۆیژییەی دەفەرمووێ : (( ئەمە بوو بە کورتی سەرگوزشتەی خوێندن و بڕوانامە بائیسەکەی ك . ئاورەحمان لێیەوە دەرئەکەوێ کە زەمینەی خوێندنەکەی یەکجار ناسروشتی و ساکار و پووچ بووە . ڕێی نەداوەتێ تۆزقالێ گیانی ئەکادیمی لێ بنیشێ و فێری شیکردنەوە و لێکۆلینەوەی زانستی بێ )) .

بەدوا ئەم هەموو وێڵ و مەعریفەتە بەرزەی سەبارەت کەسایەتیی بەندە نواندوویەتی و پاش هۆنینەوەی گشت ئەو درۆ و دەلەسە بێسەروبەرەی لەبارەی خراپ خوێندن و نەزانی و بێبڕوانامەیی منەوە فەرموویە ، بەهەمان شێوە و شێوازی شیرین و ڕەنگین دێتە سەر ڕەتکردنەوەی بەرهەمەکانم :

لە سەرەتای ئەم بابەتەدا نووسیویە : (( ئەوەتا کتێبێکی زل و زەبەللاحی ( ٣٠٥ ) لاپەڕەیی لەسەر مۆرفۆلۆجیای جێناوەوە داناوە ... کەچی ( تەحەدای ئەکەین و با وەلامی ئەمە بداتەوە ) گەر یەك دێری تیا

بێ پەیوەندی بە مۆرفۆلۆجیای جێناوەوە هەبێ )) ( ل ٧ ) .

کێ بڕوا بەوە دەکا ، کتێبێکی ( ٣٠٥ ) لاپەڕەیی لەسەر مۆرفۆلۆجیای جێناو نووسرابێ و یەك دێڕی تێدا نەبێ پێوەندی بە مۆرفۆلۆجیای جێناوەوە هەبێ ؟ ... ئەمە ئاخاوتنی - بێبیرکردنەوەی منداڵانە و دیارە م . وریا بە قسە و بیر و هەڵسوکەوت هێشتا هەر لەو تەمەنەدایە و بەتایبەتیش کە نووسیویە : (( تەحەدای ئەکەین )) .

من ئیدیعای ئەوە ناکەم ، بڵێم لەو کتێبەدا بە هیچ چەشنێك لە باسی مۆرفۆلۆجیا لام نەداوە ... چ لە باسی ئەم بەشە ئاخاوتنەی (جێناو)دا و ، چ لەو چوار بەرگەی باسی بەشە ئاخاوتنەکانی دیم کردووە ، ناوەناوە وێڕای باری مۆرفۆلۆجییان ، لە چەند کێشەیێکی تریشیان دواوم ... لە هەموو بەرهەمێکدا پێویست نووسەر ناچاردەکا لە هەندێ شوێندا بەلای بابەتی دیدا لابدا و ئەمە شتێکی ئاساییە ... داوا و تکام لە م . وریا ئەوەیە ، لەو کتێبەی ئەو بە زمانە پاراوەکەی بە (( کتێبێکی زەبەللاح ))ی ناوبردووە ، بیست لاپەڕەیەکمان بۆ بهێنێتەوە ، کە پێوەندی بە باسە سەرەکییەکەوە نەبێ و ئێمەش دەستخۆشی و ستایش و ئافەرینی لێ بکەین ...

بەدوا ئەمەدا ئامۆژگاریم دەکا و دەڵێ : (( با بچێ هەندێ سەرچاوە لە بارەی مۆرفۆلۆجیاوە بخوێنێ و بزانێ مۆرفۆلۆجیا چیە )) ( ل ٧ ) .

منێکی ( فاشیل ) و ( نەزان ) و ( بێبڕوانامە ) ... گەر تا ئەم تەمەنە لە مۆرفۆلۆجیا تێنەگەیشتبم ، تازە فێری نابم ... بەلام ئەو لەم هەرەتی لاوییەیدا کە (( سەدان لێکۆڵینەوە و وتار و باسی زمانەوانی ))ی بڵاوکردووەتەوە و (( دامەزرێنەری ڕێبازێکی تازەی زمانەوانی ))یە و هێندە زانا و دانایە ، دەبوو ئەو زانستە بۆ خوێنەر باس بکا و تێیبگەیەنێ و قەرەبووی ئەو زیانەیان بکاتەوە ، کە من پێم گەیاندوون .

پاش ئەوەی بێ هیچ نموونە و بەڵگەیێك میرازی كتێبی (( جێناو )) دەكا ، ئەوجا دەكەوێتە وێزەی كتێبێكی دیم و لەبارەیەوە دەڵێ : (( كتێبێكی تری بەناوی فۆنەتیكەوە بڵاوكردەوە )) ( ل٧).

ئەو كتێبە ناوی (( زمانی كوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیكدا ))یە ، نەك ئەو وتەنی : بەناوی (( فۆنەتیكەوە )) بڵاوكردەوە .

لە بەگژچوونیشیدا ، كە نووسیویە : (( شەش حەوت لاپەرەی نەبێ پەیوەندی یان بە فۆنەتیكی تەقلیدییەوە هەیە ( ئەویش بە تێكەڵی و پێكەڵی ) .. باقی تری فرِی بەسەر فۆنەتیكەوە نییە )) ( ل ٧ ) ...

یان دەبوو ئەو شەش حەوت لاپەڕەیەی بەلای ئەوەوە پێوەندییان بە بابەتەكەوە هەیە بخاتە روو ، یان ئەو وتەنی ئەو باقییەی تری ، كە فرِی بەسەر فۆنەتیكەوە نییە یادداشت بكا ... مرۆی بێپەروا و بێویژدان دەتوانی قسەی وا بەرانبەر هەر كتێبێكی زانستی بكا ، با كتێبەكە بە زمانێكیش بێ ، كە نەیزانێ ... بەڵام ئەم جۆرە بۆرە وتانە لەناو بازاڕیشدا كەس بە فلسێكیان ناكڕێ ...

لە لایێكی دییەوە ، كە م . وریا لە بواری زمانەوانیدا جیاوازی لەنێوان دوو مەفهوومی یەكجار روون و ئاشكرای ( دەنگ ) و ( پیت )دا نەكات و ، (پیت) و (ئەلفوبێ) وەك یەك ناوبەرێ ، ئیتر چۆن (استاد علم اللغة)یەكە و، چۆن ئەو ناوە قەبەیە لە خۆی دەنێ و بە چ ڕوویەكەوە توخنی فۆنەتیك دەكەوێ. [٢٨]

بەندە لە هەر كێشەیێك دوابێ ، لە سەرەتادا گەشتێكی فراوانی بەراوردكردن و هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بەو نووسراوانەدا كردووە ، كە هەر لە زووەوە تاكو ئەمڕۆ لەو بارەیەوە بڵاوبوونەتەوە ... بەم كارەش

---

(٢٨) بڕوانە : (( ڕەخنەی ناڕەختە )) ، بەرگی یەكەم ، ل٣٢ ، ٣٥ ، ٤٤ ، ٥٥-٥٦ ...

نەك هەر ئەمەك و وەفای خۆی بەرانبەر پێشڕەوان نیشان داوە و مافیانی پاراستووە ، بەڵکو توانیویشێتی ئەوەی دەربارەی ئەو باسە ، ڕاست و زانستییانە نووسراون وەربگرێ و بچەسپێنێ و ئەوەی خەوش و هەڵەشە وەلاوەبنێ . بێگومان ئەمەش هەڵسوکەوتی کەسێکە هەوێنی دزێتی لە خوێنیدا نەبێ و ڕاستەشەقامی زانستی گرتبێتە بەر . جا م . وریا بۆ خۆقوتارکردن لە کاری ناڕەوای خۆی ـ واتە وەرگرتنی کەرەستە و زانیاری لە ڕابەران و پێشەنگان ، پەنا دەباتە بەر سووکایەتی کردن بە بەرهەمەکانی من و دەڵێ : (( ئەم پێڕەوی ( ئەرشیفی ) و ( اعداد )ە بوونەتە سیمای سەرەکی و ئەساسی هەموو نووسینەکانی )) ئەوڕەحمان ( ل ٦ ) .

بەڵێ م . وریا بەم تۆمەتەی نەك تەنیا سووکایەتی بە بەندە دەکا ، بەڵکو زانایانی لوتکەش تێوە دەگلێنێ ... چونکە بەپێی ئەو سەنگ و تەرازووە ، دەبێ :

١ـ کتێبە بایەخدارەکەی د. کەمال مەزهەر ((مێژوو ـ کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو))[٢٩] لە سەرەتاوە تا کۆتایی و بەتایبەت بەشی سییەم (ل ٩٩ ـ ٢٥٥) تێکڕای ( ئەرشیفی ) و ( اعداد ) بێ ، چونکە لە سەرجەم و سەرپاکی ئەو بەرهەمانە دەدوێ ، کە زانایانی کورد دەربارەی مێژووی گەلەکەیان نووسیویانە .

٢ـ بەرهەمێکی بەهاداری وەك (( ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ))ی د. عیزەددین مستەفا ڕەسوول[٣٠] ، کە لە دەیان پەراوێزیدا و لە سەرەتای چەندین باسیدا لە کارەکانی ئەو بوارە دەدوێ و بەتایبەتیش کاتێ لە ( پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ) دەکۆڵێتەوە ، لە کۆنترین کۆمەڵەی

---

(٢٩) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ، مێژوو ـ کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو ، بەغدا ، ١٩٨٣.

(٣٠) د. عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ ، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٠.

کۆکراوەوە ، کە سالی ( ١٩٣٣ ) مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیس گردی کردووەتەوە تا ئەوانەی ئەم دواییەی زانایانی سۆڤێت لە فەوتان ڕزگاریان کردوون ، بەسەرکردووەتەوە ، بکەوێتە خانەی کاری (ئەرشیفی) و ( اعداد )ەوە ..

... هتد .

لەبارەی ئاستی نزم و نەزانیی بەندەوە ناوی بەرهەمێکی دیم دەبا و دەڵێ : (( یەکەم بەرهەم و کتێبی بە ناوی ( چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ـ ١٩٧٣) ... یەکێ بڕوانامەیێکی ئەکادیمی بەرزی لە سەر زمانی کوردی لە دەرەوەی وڵات وەگری و بگەرێتەوە ... چاوەڕێی ئەوەی لێ ئەکرێ لە یەکەم نووسینەکانیا شتی تازە لە بارەی زمانی کوردی و زمانەوانی یەوە پێشکەش بکات ... پیشانی بدات چ سوودێکی لە خوێند نەکەی وەرگتووە ... و .. هێزی خۆی لە بوارەکەیدا دەرخا ... نەك بە کتێبێکی بیبلیۆگرافیی ساکار خۆی بناسێنێ کە دانانی لە دەست هەر نیمچە خوێندەوارێکیش دێت )) ( ل ٧ )

ئەو ماوەیەی لە یەکێتیی سۆڤێت بووم ، لە کتێبخانەکانی لێنینگراد و مۆسکۆ ژمارەیێك کتێبم لەبارەی زمانی کوردییەوە بەرچاو کەوتووە و خوێندووەتەوە ، کە بەر لە چوونم بۆ ئەو وڵاتە ، نەك هەر نەم بینیبوون ، بەڵکو ناویشیانم نەبیستبوو ... پاش گەڕانەوەم لە کتێبخانەی ڕازاوەی کۆڕی زانیاری کورد لەم بارەیەوە کتێبی نایابم دییەوە ، کە تا ئەو ماوەیەی دوایی چاوم پێیان نەکەوتبوو ... بەو مەبەستەی نیشانی بدەم ، کە تاکو ئێستا لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا چی کراوە ، چونکە لە توێژینەوەی هەر کارێکی نوێدا ، ئاوڕدانەوە لە کاری پێشوو بایەخ و سوودی خۆی هەیە و هەروەها بۆ ئەوەی خوێنەرانی کوردی هێژا

( بەتايبەتی خوێندكارانی خوێندنی كوردی ) بزانن دەربارەی زمانەكەمان چی نووسراوە و بڵاوكراوەتەوە ، بڕیارم دا ، ئەو نامیلكەیە لەبارەی ئەو نووسراوانەوە دابنێم .

مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەم نامیلكەیەی وا هەڵسەنگاندووە :

(( ئەم نووسینە لە ڕووی ناوەڕۆكەوە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لەبەر دوو هۆی گرنگ :

یەكەم ـ تا ئێستا لەم بابەتەوە كەس ، چ كورد چ غەیری كورد ، بەرهەمێكی ڕێ نیشاندەری پێشكەش بە كوردناسی و خوێنەرانی كوردی نەكردوە . یەكێك بیەوێ سەرچاوەی نووسین لە بارەی زمانی كوردییەوە بدۆزێتەوە دەبێ ماڵەوماڵ و شارەوشار پرسیاری بۆ بكا . ئەم كتێبە ، با بڵێم ئەم نامیلكەیە ڕێگەی درێژی پرسیاركردن دەپێچێتەوە و دەیكا بە یەك تاكە هەنگاو .

دووەم ـ نووسینەكە سوودبەخشترە لە بیبلۆگرافی ڕووت ، چونكە دەربارەی گەلێك لەو كتێبانەی لەسەر زمانی كوردی نووسراون ، تا ڕادەی پێویست ، ڕەخنە و نرخاندنی تێدایە ، سەرەڕای ئەوە كە پوختەیێكی مێژووی نووسینەكان ڕوون دەكاتەوە و بەمەدا لیستەیێكی زەمەنیش ئامادە دەكا بۆ ئەو كەسە بیەوێ بە مێژووی نووسینی كوردییەوە خەریك بێ )).[31]

هەر لەبارەی ئەم نامیلكەیەوە ، كە بە فەرمایشتی م . وریا (( داناناني لە دەست هەر نیمچە خوێندەوارێك دێت )) ( ل ٧ ) ، مامۆستا جەمال بابان لە وتارێكی دوور و درێژی دوو ئەڵقەییدا زۆر بەرز هەڵیسەنگاندووە و ، ئەویش چەند بەندێكی :

---

(٣١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، چی لەبارەی زمانی كوردییەوە نووسراوە ، بەغدا ، ١٩٧٤، ل ٣ ـ ٤ .

(( لەم بەینەدا و لە یەك ڕۆژدا سێ کتێبی بەنرخی کاك ئەوڕەحمانی حاجی مارف ( باحث علمي ) لە کۆڕی زانیاری کورد کەوتنە بازاڕەوە .

......

کتێبی ناوبراوی سەرەوە ( چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ـ ئەوڕەحمان ) کە لێی ئەدوێین ، پێشەکی ئەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کەوا نووسینی ( عیلمی ) لەسەر بناغەی زانستی ، خەریکە لە ناوماندا پەرە ئەسێنێت و بڵاوئەبێتەوە . ئەویش بەهۆی ئەو گەنجە بەنرخانەمانەوەیە کە زۆریان لە دەرەوە خوێندوویانە ، کە زیاتر خوێندنەکەشیان لە بارەی مێژوو ، ئەدەب و زمانی کوردەوەیە ، تایبەتی ئەوانەی لە یەکیەتی سۆڤیات خووێندوویانە . کە بەڕاستی جموجۆڵێکی زانایانەیان خستۆتەوە . داواکارین کە وێنەی خۆیان و بەرهەمەکانیان هەر ڕوو لە زیادی بن . یەکێك لەو گەنجە بەنرخانە دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف کە دکتۆرای لە ( فەرهەنگ )دا وەرگرتووە لە یەکیەتی سۆڤیەت و خاوەنی ئەم باسەیە و کۆڕی زانیاری کورد بە ڕازاوەیی خستوویەتیە بەر دەمی خوێندەوارانی کورد ...

من خۆم یەکێکم لەوانەی کەم بەم جۆرە فراوانە ئەم ئەزانی ئەوەندە نووسراو لەبارەی زمانی کوردییەوە هەیە تا کتێبە بەنرخەکەی دوکتۆر ئەوڕەحمانم نەخوێندبووەوە ...

..... ))[٣٢]

(( بەکورتی کتێبەکە بەلای منەوە گەلێك بەنرخ و بایەخدارە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

یەکەم : وەك لە وتاری پێشوودا وتم نووسەر بناغەی کتێبەکەی لەسەر زەمینێکی زانستی داڕشتووە ، قسەی گۆترە و بایی هەوای نەکردوە ،

---

(٣٢) جەمال بابان ، چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ، ((ڕۆشنبیری نوێ)) ، بەشی یەکەم ، ژ ٢٤، بەغدا ، ١٩٧٤/٧/١١ ، ل٣ .

هەرچییەکی وتوە پەنجەی بۆ سەرچاوەکەی ڕاکیشاوە و پەراوێزی پەڕەکان جمەیان دێ ... ئەو کتێبە حەفتا لاپەڕەییە ، هەشتا و پێنج ئیشارەت و ڕوون کردنەوەی تیایە کە شتێکی هێجگار زۆرە لەچاو قەوارەی کتێبەکەدا . جگە لەوە کاکی نووسەر ، ئەو نووسینانەی نرخاندوە یان ڕەخنەی لێ گرتوون کە ئەمەش کارێکی گرنکە لە هەر نووسین یا لێکۆڵینەوەیەکدا کە نابێ بخرێتە پشت گوێ .

دووهەم :....

سێهەم : نووسینی کتێبەکە به شێوەیەکی هێجگار ڕەوان و خۆش و ئاسانە ، وشەی قەبە و قارس کراوی بەکارنەهێناوە ....

....))[٣٣]

ئێستاش فەرموون لەگەڵ چەند بەندێکی بەشێك لەو وتارانەی بە زمانی عەرەبی لەمەڕ ئەو نامیلکەیەی بەلای م . وریاوە بێکەڵکە :

(( يقع هذا الكتاب في ٧٠ صفحة الفة الدكتور عبد الرحمن الحاج معروف وهو من مطبوعات المجمع العلمي الكردي . تكمن أهمية الكتاب في أنه يشكل دليلاً للمختصين بالدراسات الكردية إذ يتضمن عشرات المراجع للمؤلفين الأكراد وغير الأكراد ، ولايكتفي المؤلف بعرض هذه المراجع بصورة مجردة إنما خضعها لملاحظاته الخاصة ويلقى الأضواء على أهداف ومرامي مؤلفيها باسلوب علمي دقيق يتحرى النقاط التي تفتقر الى الموضوعية ويضع يدها على مواطن الضعف و القوة في كل مرجع وينبه الى خطورة الأراء العفوية التى يطرحها المؤلفون في كتاباتهم تجاه اصل اللغة الكردية وقواعدها .

---

(٣٣) هەمان سەرچاوە ، بەشی دووەم ، (( ڕۆشنبیری نوێ )) ، ژ ٢٦ ، بەغدا ، ١٩٧٤/٨/١ ، ل٢.

والدكتور عبدالرحمن من خلال كتابه هذا يقدم خدمة جليلة لكل من يريد أن يساهم في كتابة تأريخ اللغة الكردية ...

...))[٣٤]

(( يعتبر هذا الكتاب بمثابة مدخل لتعريف الكتب و الأبحاث المكتوبة عن اللغة الكردية مع تقيمها وأبراز أهميتها العلمية والتأريخية ...

...))[٣٥] .

(( بعد ان اطلعت على كتاب مصادر البحث فى اللغة الكردية للأستاذ الدكتور عبد الرحمن معروف عضو المجمع العلمى الكردي ، استثارت رغبتى بعض المواضيع والكتب التى لم اطلع عليها والتي نشرت حول اللغة الكردية ولهجتها خارج كردستان ، ورأيت من الارجح اعطاء نماذج مختصرة للقارى العربي الذي هو الان بحاجة اكثر من أي مستشرق او متخصص اخر للتتبع والدراسة حول الجوانب الحية في اللغة الكردية ...

... ))[٣٦]

(( بعد أن تصفحت هذا الكتاب وجدته من الكتب القيمة جداً بحيث من الضرورى أن يترجم ليس الى اللغة العربية فحسب ، بل الى اللغات العالمية الأخرى ، وذلك لأن مايحويه الكتاب من اسماء العلماء والباحثين المهتمين بدراسة اللغة الكردية ونتاجاتهم من المقالات والكراريس و الكتب المنتشرة هنا و هناك في الجرائد و المجلات الكردية و العالمية ، وموجز لتلك الدراسات وتثمين بعضها من الناحية

---

(٣٤)كمال غمبار ، ماكتب عن اللغة الكردية ، جريدة (( طريق الشعب )) ، العدد ٢٤٠، بغداد ، ١٩٧٤/١١/١، ص٣.

(٣٥) ابن المستوفى ، اللغة الكردية و ماكتب عنها ، جريدة (( التاخى )) ، العدد ١٦٨٦، بغداد ، ١٩٧٤/٨/١٢، ص٣.

(٣٦) محمد على ابراهيم ، مصادر البحث في اللغة الكردية ، جريدة ((التاخي)) ، العدد ١٧٥٦، بغداد ١٩٧٤/١١/٤ ، ص ٣ .

العلمية أكبر قيمة ، أكثر فائدة للذين يهمهم التبع والتعمق بدراسات اللغة الكردية من غيرها من الكتب كالبيبلوكرافيا المجردة مثلاً ))[٣٧].

... و هەندێکی دی .

ئەم نامیلکەیە دڵی خوێنەرانی کوردی زۆر خۆش کرد ، چونکە تا ئەو دەمە نەیاندەزانی ، کە لەبارەی زمانەکەیانەوە ، ئەو کارە گەورە و گرانانەی لەو بەرهەمەدا لێیان دواوم ، نووسراون ... بەڵێ کەسێك نەبوو ئاگاداری ئەوە بووبێ لە ڕۆما ، ساڵی ١٧٨٧ ماوریزۆ گارزۆنی کتێبی دەربارەی زمانی کوردی بڵاوکردبێتەوە ... بێگومانم ، م. وریا تا ئێستاش ئەو کتێبەی نەبینیوە و لە ڕێگەی نامیلکە بێبەهاکەی بەندەوە ناوی بیستووە ... نەك هەر ئەم بەرهەمەی گارزۆنی ، کە بە زمانی ئیتالییە و کارەکانی لێرخ و ئابۆڤیان و یەگیزارۆڤ و ... کە بە ڕووسین و ، نووسینەکانی ئۆسکار مان کە بە ئەڵمانین ـ واتە بەو زمانانەن کە نایانزانێ ـ نەبینیوە ، تەنانەت بڕواناکەم ، ئەوانەی ( مێجەر سۆن ) و ( ل . و . فۆسسوم ) و ( ر . ف . جاردین ) ... کە بە ئینگلیزین ، چاوی پێیان کەوتبێ .

م. وریا ڕاست ناکا و ئەو بەرهەمەم تەنیا ((کتێبێکی بیبلیۆگرافیی ساکار)) نییە ، بەڵکو لێکۆڵینەوەشە و ئەوەتە چەندین نووسەر پەنجەیان بۆ ئەو ڕاستییە ڕاکێشاوە .

ئەوەشی هەر زێدە ڕۆییە ، کە دەڵێ ئەم جۆرە کارە (( دانانی لە دەست هەر نیمچە خوێندەوارێکیش دێت )) ، چونکە نیمچەخوێندەوار زمانەکەی خۆی کوڵەوارانە دەزانێ ، ئیدی چۆن پێی دەکرێ بە چەند

(٣٧) محمد أمين الهوراماني ، كلمة لابد منها ، جريدة (( التآخي )) ، العدد ١٩٩٩ ، بغداد ، ١٩٧٥/٨/٣٠.

زمـانێك بخوێنێتـەوە و زانیـاری وەربگـرێ و لـە قـاڵبێكی ڕێكوپێكـدا دایڕێژێ ...

م. وریا وێڕای فێڵ و فەرەجی ، لە گوێی گاشـدا نوسـتووە ، ئەوەتـە دەڵێ (( دوای ئەمە كتێبەكەی كرد بە عەرەبی ( ماكتب عن اللغة الكردية ) بەمـە بـوو بـە دوو كتێـب )) ( ل ٨ ) ... زمانـەوانێك هێنـدە بێخەبـەر و بێئاگا بێ ، نـەزانێ ئـەو كتێبـە مـن وەرم نـەگێڕاوە و مامۆسـتا محەمـەد ئەمین هەورامانی كردوویە بە عەرەبی ، ئیتر دەبێ چ هیوا و هومێدێكمان پێی بێ ! ...

بەدوا ئەمەدا لۆمەم دەكا و دەڵـێ : ئاوڕەحمـان (( شـانازی بـەوە ئـەكات ئەڵێ ( ٢٠ ) كتێبم هەیە )) ( ل ٨ ) .

١ـ نەخێر ( ٣٠ ) كتێبم هەیە ، نەك ( ٢٠ ) .

٢ـ گەورەترین شانازیی و سەروەریی من بەرهەمەكانمن ... دیارە وات پێ باشە ، وەك تۆ شانازی بە تەڵەكەبازی و گیرفان پڕكردنـەوە بكـەم ... نەخێر ، ئەوە لە بەندە ناوەشێتەوە .

دوای تۆمـەتی بێبڕوانامـەیی و نـەزانیم ، دەشـم كاتـە ( دز ) و دەڵـێ : (( ئینجا كەوتـە دزینـی كارەكـانی مامۆسـتای خـۆی كوردۆئیـڤ و ( هـی تریش ) و كردنـی بـە كـوردی و بـە نـاوی خـۆی بـلاوی كردنـەوە ... بـۆ نموونـە باسـیكی ( ٦٩ ) لاپـەڕەیی بـە نـاو و نیشـانی ( كوردناسـی لـە رووسـیا و لـە یەكیـەتی سـۆڤیەت ) كـە لـە بـەرگی ( ٢ )ی ژمـارە ( ١ )ی گۆڤاری كۆڕی زانیـاریی كـورددا بلاوكردۆتـەوە ... ئەمـە وەرگێڕانێكی دەقاو دەقی باسێكی قەناتی كوردۆئیڤە )) ( ل ٨ ) .

... (( لە دز وایە هەموو كەس دزە )) ...

بۆ ئەوەی بە م . وریا بڵێین ڕاست دەفەرمووی ، پێویست بوو :

١ـ ئەو باسەی من ، گەر هی قەناتی کوردۆی مامۆستام بێ و کردبم بە کوردی ، نیشانی بداینایە کوردۆییڤ دەقە ڕووسییەکەی لە چ گۆڤارێکدا بڵاوکردووەتەوە .

٢ـ گەر ئەمەی من (( وەرگێڕانێکی دەقاو دەقی باسێکی قەناتی کوردۆئیڤ )) بێ ، ئەی بۆ چەند بەندێکی ئەوی هەردووکمانی بەرانبەر یەك دانەناوە ...

ئەوەتە من لە هەردوو بەرگی (( ڕەخنەی ناڕەختە ))دا چەندین بەندی ئەو و ئەوانی لێی وەرگرتوون بەراوردکردووە .

٣ـ ناوی ئەو بەرهەمانەی دیی مامۆستام و کەسانی تریش ناوبەری ، کە لێیانم دزیون ، ئەوسا بڵێ : (( ئینجا کەوتە دزینی کارەکانی مامۆستای خۆی کوردۆئیڤ و ( هی تریش ) )) .

لەبەر ئەوەی چاك دەزانێ ، کە ئەمە تۆمەتە و کەس بڕوای پێناکا ، بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەوەی بڵێ : (( د. کوردستان موکریانی لە لاپەڕە ( ١٢ )ی کتێبەکەی ( قواعد اللغة الكردية ـ بغداد ـ ١٩٨٩)دا ئەم دزیەی ئاشکرا کرد )) (ل٨) .

بەڵێ د. کوردستان لەو کتێبەیدا تا لاپەڕە ( ١٢ ) کەمێ لەو بەرهەمانە دواوە ، کە لە زوودا لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراون ... ئەوجا لە پەراوێزدا وا ڕادەگەیەنێ ، کە کەرەستەی سەرەکیی ئەم لێدوانەی لە پێشەکیی کتێبی (( ڕێزمانی کوردی ( بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو ) ))ی قەناتی کوردۆیە ... بەدوا ئەمەدا نووسیویە :

(( كان من المفروض الأطلاع ايضا على المادة المعدة من قبل الدكتور عبدالرحمن الحاج معروف والموسومة ( حول الدراسات الكردية في روسيا و الأتحاد السوفيتي ) والمنشورة في المجلد الثاني من مجلة المجمع

العلمي العراقي عام ( ١٩٧٤ ) للأستفادة منها ، الا اننى لاحظت معظم مواظيع مادته والتي تخص عرض نتاج كل من ( ڤ . ديتيل ، پ . ليرخ ، ئابۆڤيان ، ى . بيريزن ، ف ، يوستى ، ا . يكيزارۆڤ ، ا . ژابا ) مطابق تماما مع مانشره الدكتور كوردوييڤ قبله بعشر سنوات ودون الأشارة اليه ماعدا مرة واحدة وفي عرض نتاج ا . ژابا فقط )) .

١ـ م . وريا دەربارەی ئەو وتارەی من وتوویە : (( ئەمە وەرگێڕانێكی دەقــاو دەقـــی باســێكی قـــەناتی كوردۆئیڤـــە )) ، بــــەڵام د. كوردستان نووسیویە : (( ... أن معظم مادتــه.... متطـابق ... )) ... ئەو برایە ، یا جیاوازیی ( دەقاودەق ) و ( معظم ) ناكات ، یان دەستپاك نییە .

٢ـ د. كوردستان كە فەرموویە : ( أن معظم مادتـه ... متطابق ... مع مانشره ... كوردوييڤ ... ودون الأشارة اليه وماعدا مرة واحدة في عرض نتاج ژابا فقط )) ، ڕاست وابوو :

أ) ئـەوە لـە خوێنـەر نەشـارێتەوە ، كـە لـە سـەرەتای ئـەم وتـارەمدا نووسیومە : (( ... تـا ئێسـتە ژمارەیـەك وتـار ... لـە بـارەی كوردناسـیی ڕووس و سـۆڤیەتەوە نووسـراوە ، وەك ( بـاری كوردناسـیی سـۆڤێت و ئامانجەكانی )[38] ، ( لە بارەی پێشكەوتنی كوردناسیی سۆڤێتەوە )[39] ، ( كوردناسی )[40] ، ( مێژووی لێكۆڵینـەوەی زمانی كوردی لـە ڕووسـیا و

---

(٣٨) د. ڕەحیمی قازی ، باری كوردناسیی سۆڤێت و ئامانجەكانی ، گۆڤاری (( هەواڵەكانی ئەكادیمیایی زانستیی ئازەربایجانی یەكێتیی سۆڤێت )) ، باكۆ ، ١٩٥٩، ل ١٢١ـ ١٤٢.

(٣٩) د. قەناتی كوردۆ ، لەبارەی پێشكەوتنی كوردناسیی سۆڤێتەوە ، گۆڤاری (( بەڵگەنامە زانستییەكانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی )) ، مۆسكۆ ، ١٩٦٠ ، بەرگی ٢٥، ل ٥٧ـ ٦٧.

(٤٠) د. قـەناتی كـوردۆ ، كوردناسـی ، كتێبـی (( مۆزەخانـەی ئاسـیایی و ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسیی لێنینگراد )) ، مۆسكۆ ، ١٩٧٢ ، ل ٢٨٠ـ ٢٩٧.

یەکێتیی سۆڤێت )[41] و چەند وتارێکی تر کە نووسەری ئەم وتارە کەڵکی لە هێندێکیان وەرگرتووە ... )) ( ل٤٤٩ ـ ٥٠٠)

ئەوەتە نەك پەنجەم تەنیا بۆ ئەو وتارەی مامۆستا کوردۆ ڕاکێشاوە ، بەڵکو ناوی بەرهەمێکی پێشتریشیم بردووە ... وێڕای ئەوانەش ، ئاوڕم لە بەرهەمی د ڕەحیمی قازی و د. چەرکەزی بەکۆش داوەتەوە ... ئێدی بە چ ویژدانێك دەڵێ : (( دون الأشارة اليه )) ؟ ...

ب) ڕاستگۆبێ و نەڵێ : (( وماعدا مرة واحدة وفي عرض نتاج ا . ژابا فقط )) . ئەوەتە بەندە لە پێنجەم لاپەڕەی باسەکەیدا ( واتە لە ل ٥٠٥ی گۆڤارەکەدا - پەراوێزی ١٣) پەنجەی بۆ ئەو وتارەی د. کوردۆ ڕاکێشاوە ، کە بە نێوی (( خ . ئابۆڤیان وەك کوردناس و توێژەر ))ەوەیە و لە کتێبی ( مێژووی ڕۆژهەڵاتناسیی ڕووس )دا بڵاوی کردووەتەوە ... لە لاپەڕە ( ٥١٥ ) ، پەراوێزی ( ٣٦ ) دا ( نامەی دوکتۆرییەکەی ) ق . کوردۆ ــ (( بەراوردکرنی ڕێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ))ی کردووەتە سەرچاوە بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ بیروڕای نادروستی ف . یووستی ... وتاری (( ڕەخنە لە بیروباوەڕی چەوت بەرانبەر بە زمانی کوردی )) ، گۆڤاری ( کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای ڕۆهەڵاتناسی ) ، ١٩٥٥، ب ٢ ، ل ٤٣ ــ ٦١ )ی مامۆستاکەی بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکانی ن . مارر بەکارهێناوە ...

و هەندێکی دی .

جـ ) ورد نووسراوان بخوێنێتەوە و هێندە ساکار نەبێ بڵێ (( ... وفي عرض نتاج ژابا فقط )) ... ئەو پەراوێزەی ئەو دەیڵێ بو کاری ( ژابا )

---

(٤١) د. چەرکەزی بەکۆ ، مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە ڕووسیا و یەکێتی سۆڤێت )) ، کتێبی (( لە بارەی مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانییەکانەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ١٠٠ـ ١١٧.

نییە ، بەڵکو بۆ بەرهەمەکانی ( لێرخ )ە ... بڕوانە : پەراوێزی ژمارە ( ٢٣ ) ، لاپەرە ( ٥١٠ ) ، کە ئەمەیە :

ق . کوردۆ ، کارەکانی پ . لێرخ لەبارەی کوردناسییەوە ، (( لە بابەت مێژووی ڕۆژهەلاتناسیی ڕووسەوە )) ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩، ب ٤ ، ل ٥١.

من چەندین نووسراوی بلاْونەکراوەی د. کوردۆم لە ڕووسییەوە کردووەتە کوردی ... ئەگەر هەوێنی دزێتی لە بەدەنمدا هەبوایە ، بەناوی خۆیەوە چاپم نەدەکردن ، چونکە زۆر بەئاسانی دەمتوانی لێی بدزم ، بەلاْم ئەوەی م . وریا دەیکا بە من ناکرێ ... ئەو دەیەوێ (( دەستە چەورەکەی خۆی بەسەر مندا بسوێ )) و بەمەش دابێن نابێ و ئەوجا دەڵێ : (( د. جەمال ڕەشید ... دزییەکی تری ئاشکرا کرد )) ( ل ٨ ) .

د. جەمال ڕەشید ، کە لە تاریکیدا چێو دەکوتێ و وا ڕادەگەیەنێ ، گوایا بۆ کتێبی (( چی لەبارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە )) کەڵکم لە د. کوردۆ وەرگرتووە و ناوم نەبردووە ...

بەندە لە لاپەرە ( ٦ )ی ئەو کتێبەیدا نووسیویە : (( ... بۆ ئەم کارە کەڵکێکی زۆرم لە نامەی دوکتۆریی مامۆستای بەڕێزم قەناتی کوردۆ ( بەراوردکردنی ڕێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ) ... وەرگرتووە )) . وێڕای ئەوەش ، لە چەندین پەراوێزدا پەنجەم بۆ بەرهەمەکانی دیی ڕاکێشاوە ...

ئەم کتێبە ساڵی ١٩٧٤ چاپکرا .. هاوینی ساڵی ١٩٧٥، کە سەری لێنینگرادم دا ، مامۆستام دەستی بەسەرمدا هێنا و وتی : (( ئافەرم کە هێندە دەستپاك و بەئەمەکی ... تۆ بۆ نووسینی ئەو کتێبەت کەمت سوود لە من وەرگرتووە ، کەچی نووسیوتە کەڵکێکی زۆر ) ... بەلاْم هەندێك وەریدەگرن و دەیکەنە موڵکی خۆیان و ناویشم نابەن )) .

هەر ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەشم بوون لەگەڵ مامۆستا کوردۆدا

کردبووینـه بـاوك و کـوڕ ؛ هـاوڕێی گیـانی بـەگیانی ... بووبوومـە جێـی متمانـەی تـەواو و یەکەم کەسی نـێزیکی . بەڵگـەی ئـەم قسانەشـم ، ئـەو دۆستانەن ، کە لـەو ماوەیـەدا لەگەڵماندا بوون و ئەو نامانەشـن ، کـە تـا چـەند مـانگێك پێـش کـۆچ کردنـی ، بـۆی نـاردووم ... تەنانـەت ، کە هاوینـانیش سـەری لێنینگـرادم دەدایـەوە ، یەکـەم ڕۆژ دەهاتـە لام و تـا شـەو درەنـگ لام دادەنیشـت و بـەزۆر بـۆ چـەند ڕۆژێـك دەیبردینـە ڤیلاّیەکـەی قـەراخ شـاری لێنینگـرادی و بـەو پیریـیـەوە میدیـای کچمـی دەکردە کۆڵی ...

من بیرم لـەوە نـەدەکردەوە ڕۆژێك لـە ڕۆژان وەلاّمـی ئـەو وتـە ناڕاسـتە بێبەڵگانـەی د. کوردستان و د. جەمال بدەمـەوە ، بەلاّم م . وریـا کـە لـە ( بوختاننامـە )کـەیدا تـرش و خوێـی کـردوون و هەندێکیشـی لـێ زیـادکردوون ، هەنووکـە ئـەو ڕوونکردنەوەیـەی سـەرەوەم بەپێویسـت زانی ... م . وریا پشتێنی لـێکردووەتەوە و بە ئارەزووی خۆی تـەراتێن دەکا و دەڵێی بەرزەکی بانانە و بیر لەوە ناکاتەوە چاو بە چاو دەکەوێ و ڕوو بە ڕوو ...

لەبەر ئەوەی بەندە لە بەرگی دووەمی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە )) دەیـان پـەندی بێشـینان و قسـەی نەسـتەقی لـە شـوێنی پێویسـتدا هێناوەتەوە ، م وریاش ویستوویە خۆی بنوێنـێ و ئەو شێوازە ڕەچاو بکا ، بۆیە لە کۆتایی زل کردنی ڕەخنەکانی د. کوردستان و د. جەمالدا نووسیویە : (( ... ئاورەحمان لە ئاسـت ئەمانـەدا بۆتـە تەڵـەی تـەقیو )) ( ل ٨ ، د ١١ ـ ١٢ ).

مەکـەنزی ناهـەقی نـەبوو خـۆی لێـت ڕزگـارکرد ... دەبـێ زوو تێگەیشتبێ ، کەسێکی کوردیـنـەزانی وەك تۆی بۆ پێناگەیەنرێ ... تۆ کە لە گۆڤاری (( ڕۆشنبیری نوێ ))دا بە شان وباڵی خۆتدا هـەڵدەدەی و

زمان پاراویت و زمان ڕەوانیت و سەرکەوتوویت لە چیرۆکنووسیدا و شارەزایی زۆرت لە ئەدەبی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و .... دا باس دەکەی ، ئێمە چۆن باوەڕت پێبکەین ، گەر تۆ پەندێکی یەکجار باوی کوردی بە هەڵە بڵێیت ... کورد دەڵێ : (( دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو )) . واتە دەبوو بنووسیێ : (( ئاورەحمان لە ئاست ئەمانەدا دەمی بۆتە تەڵەی تەقیو )) ، چونکە پەندەکە مەبەستی ئەوەیە ( دەم )ی ئاورەحمان ( داخراوە ، پێوەدراوە ، قفڵی لێدراوە ... ) ، نەك ئاوڕەحمان خۆی ... جا ئەوەی تۆ هەڵەیە و وا دەگەیەنێ ئەوڕەحمان ( داخرابێ ، پێوەدرابێ ، قفڵی لێدرابێ ... ) ، کە کورد هەرگیز ڕاز و نیازی وا چەوت و چەوێڵ دەرنابڕێ و م . وریاش ((مایەی بوو بە مایەی پیازفرۆش)) .

* *

*

ئەرێ کە بەندە لە هەردوو بەرگی نامیلکەی (( ڕەخنەی ناڕەختە )) دا ، بە بەڵگە و نموونەی زۆرەوە ، شێوازی نزم ؛ کەموکورتی و ناتەواوی ؛ هەڵە و خەوش ؛ لەملاوئەولا زانیاری وەرگرتن و کردنە موڵکی خۆ ؛ بە چاوی سووك ڕوانینە کاری پێشڕەوان ... و چەندین دیاردەی دیی درێوی نووسینەکانی ئەو مامۆستایەی نیشان دابێ ، ئەوە ئەو ڕەخنە زانستییەیە ، کە مایەی پێشخستن و گەشەپێکردنی زمانەکەمانە و هەڵوێستی بوێرێکە ڕاستی و زانستی نەکردبێتە بالاگەردانی برادەرەکەی ...

ئەوەم نیشان داوە ، دەبوایە نەك هەر ئاگادارییێکی باشی لە

تایبەتێتیی و بنەماکانی زمانی کوردیدا هەبێ ، بەڵکو پێویست بوو کوردیییێکی ڕەوان و پاراو بزانێ ، بەڵام بەداخەوە کوردییەکەی لە گێژاوی دەریاییکی سەرگەردانیدایە و لە بریتی ئەوەی خواروخێچی ڕاست بکاتەوە و بە دەربڕینی ڕەوان و بێگریێ بانگ بە گوێی نەوەی نوێدا بدا ، کەچی دروستەکەشی شێواندووە .

بەندە دڵنیا و خاترجەمە ، کە ئەو مامۆستایە چەند کەم لە زمانی بابی بەڵەدە ، گەلێ کەمتریش لە پێڕەو و یاساکانی قوتابخانەی چۆمسکی ئاگادارە ... وەلێ ، ئەو تەنیا سەوداگەری و بازرگانی بە ناوی قوتابخانەی چۆمسکییەوە دەکا ... گەرنا ، ئەوە چەندین ساڵە بۆ بەرهەمێکی ئەو زاتەی نەکردە کوردی ؟ .

م. وریا لەبریتی ئەوەی پێ لەو ڕاستییانە و هەندێکی دی بنێ و بەڵێن و پەیمان بدا واز لەو کارە ناڕەوایانە بێنێ ، کەچی کەوتووەتە بوختان و بڕوبیانووی بێسەروبەر و بازاڕییانە و وتنی وشەی ناشیرین بە بەندە .

لە هەمووش سەیر و سەمەرەتر ئەوەیە ، خاوەنی ئەو هەموو خەوش و عەیب و عارە ، هێندە چاوقایمە ، (بوختاننامە)کەی ناوناوە ((ئەوەی ماڵی لە شووشە بێ)) ... گوایا بەمە دەیەوێ زەدە و شوورەییەکانی خۆی بشارێتەوە و پەردەپۆش بکا و بەندە بە لەکەدار دابنێ ... (( وتیان ڕێوی چەند پەند دەزانی ؟ وتی : نەوەدونۆ ، چاکتریان پێچ کردنەوەیە )) ...

ماڵی من هەر لە بنچینەوە ڕەخت و تۆکمەیە و بە چەشنی قەڵایە ... ڕۆژ دوای ڕۆژیش پتەوتر و مەحکەمتر دەبێ ...

نکوڵی لەوە ناکەم ، ئەویش دەیتوانی وەها ماڵێك ڕۆبنێ ، بەڵام ڕێگەی چەوت و چەوێڵی گرتەبەر و کەوتە دەرهێنانی شووشەی ماڵان ... ئاخر بۆیە هێشتا فریا نەدەکەوت لەوەی بردووییە دیوارێکی لێ دروست

بكا ، گەورە و بچووك بۆيان دەرماند ... جا گەر نەيەتە سەر ڕێی ڕاست ، ئەوە دەبێ تا ماوە لە نێو شووشەی ورد و خاش کراودا بژی و فڕکەی خڕکەی بەرد هەراسانی بکا ...

جا بائەوەش بزانێ ((ئەوی تۆوی دڕك بچێنی ، تا ماوە گوڵ نابێنێ)) .

د . ئەورەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی



## کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی

لەگەڵ دوو پاشکۆ

سلێمانی ـ ٢٠٠٤

# پێشەکی

لە کۆتایی ساڵەکانی شەستدا ، خوێندکاری دوا پۆلی کۆلێژی ئادابی زانستگای لینینگراد بووم و تازە (( فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی ))ی ئاخمانۆڤا ئۆلگا سیرگێیڤنا پەخشکرابوو[١]... پاش خوێندنەوەی و ئاشنابوونی ، بیر و هزری دانان و نووسینی وەها فەرهەنگێك بۆ ئەویندارا و ئاشقان و هەوادارانی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زمانی شیرین و دەلالی کوردی هەژاندمی ... لێتان ناشارمەوە و چاك دەمزانی وەدیهێنانی ئەم خەون و هیوا پڕ کێشە قورس و گرانە ؛ ئەم ئاوات و پرۆژە دژوار و ناهەموارە تا دە ساڵێکیش لەمەوبەر ، هێشتا لە هێز و وزە ؛ توان و توانستی بەندەدا نەبوو . دوای ئەوەی بەخۆمدا ڕابینی و زوربەی ئاست و ڕەخ و ئالیەکانم بۆ سانا و ئاسان بوو ، کەڵك و سوودم لەو هەل و دەرفەتە وەرگرت و ، شانم دابە بەری و لە ماوەی دوو ساڵدا ئەم فەرهەنگەم ڕێکخست و پێکەوەنا[٢]

بۆ تێگەیشتن و حاڵی بوون لە زاراوەکانی ئەم فەرهەنگەمان : (( فەرهەنگی زاراوەی زماننناسی )) ( کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی ) بەپێی

---

[١] ئۆ . س . ئاخمانۆڤا ، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .

ئەم فەرهەنگە نزیکەی (٧ هەزار زاراوەی گشت بوار و ئاستەکانی زمانناسی لەخۆگرتووە و پێناسەیان کراوە . بەرانبەر زاراوە ڕووسییەکانیش ، شێوەیان لەم چوار زمانەدا : ( ئینگلیزی ، فەرەنسی ، ئەڵەمانی ، ئیسبانی ) دانراوە .

نەك ساڵی ١٩٦٦ ، بەڵکو ئێستاش ، واتە ـ دوای تێپەڕبوونی (٣٦) ساڵ بەسەر بڵاوبوونەوەی ئەو فەرهەنگەی ئاخمانۆڤادا سەرپاکی ئەو زاراوانەی زمانناسانی کورد لە دەرەتان و مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا بەکاریان هێناوە ، ناگاتە چارەکی ئەوەی ، ئەو تۆماری کردووە ، کەواتە ڕەوای هەق نییە ، بۆ کەمیی زاراوەکانی ئەم فەرهەنگەی ئێمە ، گلەیی لە بەندە بکرێ ...

[٢] گەرچی فەرهەنگەکەی ئاخمانۆڤا سەرچاوەی سەرەکیی ئەم کارەم بووە و ئەوی ئەو ( ڕووسی ، ئینگلیزی ، فەرەنسی ، ئەڵەمانی ، ئیسپانی )یە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ کورد ئەم سێ زمانە : ( کوردی ، عەرەبی ، ئینگلیزی ) پێویستن ، بۆیە بەو شێوەیەم داناوە .

پێویستیی هەر زاراوەیەك ؛ یان بە گوێرەی کێش و سەنگی مەرام و نیاز و مەبەستی ڕاگەیاندنیان ، هەوڵمان داوە ، بە پێناسەکردن بێ ، یان بە لێدوان و لێکدانەوە بێ ، یان تەنیا بە بەرانبەر یەکدی دانانیان و ڕاگرتنیان بێ ... کار و ئەرکمان بە ئەنجام بگەیەنین ...[٣] .

لەبەر ئەوەی خوێندکاری ئەمڕۆی کورد زاراوە زمانناسییەکان بە کوردی دەبیستێ . بۆیە وامان بەباش زانی کوردییەکە بخەینە سەرەتاوە ، واتە فەرهەنگەکە ( کوردی - عەرەبی - ئینگلیزی ) بێ .. بۆ ئەوەش ، گەر یەکێك زاراوەیەکی بە عەرەبی یان بە ئینگلیزی بێتە بەرچاو و بیەوێ بزانێ بە کوردی چی بۆ دانراوە ، ئەوە بۆ دانەمانی و ئاسانکردنی خواز و کاری ، هەڵمان گێڕاوەتەوە و ، بە دوو پاشکۆ هێناومانەتە سەر بار : لە پاشکۆی یەکەمدا کردوومانە بە (عەرەبی ــ کوردی ــ ئینگلیزی) ؛ لە پاشکۆی دووەمیشدا بە (ئینگلیزی ــ عەرەبی ــ کوردی) . بۆ دووپیات نەکردنەوەی پێناسە و لێدوان و لێکدانەوەیان ، تەنیا زاراوەکانمان بەو سێ زمانە بەرانبەر یەکدی ڕیزکردووە . بۆ دۆزینەوەی پێناسە و لێدوان و لێکدانەوەکانیشیان ژمارەی ئەو لاپەڕانەمان تۆمارکردووە ، کە زاراوە کوردییەکان کەوتوونەتە بەراییەوە ، واتە ـ بۆ فەرهەنگە سەرەکییەکەی پێش دوو پاشکۆکەوە .

وەك ئاشکرایە ، بۆ بەشێك لەو بابەت و دۆز و مەبەستانەی زمانناسی ، کە لە ئینگلیزی و عەرەبیدا بە تاکە زاراوەیێك جێگیربوون ، لە کوردیدا زاراوەی جۆراوجۆریان بۆ دانراوە . بەوێنە بۆ ( Pronoun ـ الضمير ) لە کوردیدا (جێناو ، ڕاناو ، بۆ ناو) بەکاردەبرێ . بۆ ( Verb ـ الفعل ) . ( کار ، فرمان ، کردار ) دەوترێ .. جا ئێمە ، گەرچی سەرجەمی ئەو زاراوانەمان

---

[٣] بەندە وەك ئاخمانۆڤا هەر بە پێناسەوە بەند نەبووە ، بەڵکو چووەتە مەودا و مەیدانی لێدوان و لێکدانەوە ؛ هێنانەوەی نموونە و بەڵگە لە زمانی کوردییەوە .

تۆمـارکردووه ، بـەڵام جـەختمان کردووەتـە سـەر ئـەوەیان ، کـە بەلامانــەوه نەبارتر و گونجاوتره ، واته - پێناسەکردن و لێدوان و لێکدانەوەکەمان لێرەدا کردووه .. هەروەها :

١ـ لـە ژێـر زاراوه پەسـەندەکەدا نیشـانەی ( = ) مـان دانـاوه و بـەدوایدا هاوواتاکانیمان ڕیزکردووه وەك :

**جێناو**

= ڕاناو ، بۆناو

**کردار**

= کار ، فرمان

...

٢ ـ بۆ هاوواتاکـانیش هێمـای ( بـ . : ) واتـه ـ ( بڕوانـه ) لـه خـوارەوەی نووسراوه و ئەوجا زاراوه پەسەندەکه . وەك :

**ڕاناو**

بـ . : جێناو

**بۆناو**

بـ . : جێناو

**کار**

بـ . : کردار

**فرمان**

بـ . : کردار

وێڕای ئەمـه لـه باسـی هـەندێ زاراوەدا ، هێمـای ( هـ . ، بـ . : ) ، واتـه ـ ( هەروەها بڕوانه ) بەرچاوەکەوێ و بەدوایدا نـاوی زاراوەیێکـی دی بـراوه . لەمـەش مەبەسـت ئەوەیـه ، کـه زانیـاری دەربـارەی ئـەم بابەتـه ، هـەروەها لـه لێدوانی ئەو زاراوەیەی دووەمیشدا دەبینرێتەوه .

بۆ دانان و ڕێکخستنی ئەم فەرهەنگە سەرباری سەرچاوەیێکی زۆری ڕووسی و هەندێ لە بەرهەمەکانی خۆم ، بێ سێودوو دەڵێم ، نەك هەر کەڵك و سوودم لە زوربەی زۆری لێکۆڵینەوە ( کتێب ، نامیلکە ، وتار ، نامەی دوکتۆرا ، نامەی ماجستێر .. )ەکانی زمانەوانانی کورد وەرگرتووە ، بەڵکو گەلێ باس و توێژینەوەشیانم بەدەستکارییەکی کەمەوە ڕاگوێزاوەتە ئێرە ... ئەو نووسینە کوردییانەی زانیاریم لێ وەرنەگرتبن ، دەگمەنن ... ئەلحەق زۆرینە و زۆراتییان ماف و بەش و هەقیان دەکەوێتە سەر بەندە و ئەم فەرهەنگە بەهیوا و هومێدم پێنووسیان بەبڕشتتر بێ و خۆشیان بەکار و بەکارلەدەست هاتووتر بن ... ئەوەیش لە توان و توانستی مندا بێ ، پەیمان و بەڵێن بێ ، درێخی نەکردن بێ .

سوپاس و پێزانینم بۆ هەر سێ کوڕ و برا و هاوڕێ و خوێندکاری زێدە ئازیزم : ئازاد ئەمین باخەوان و ئەحمەد حەسەن فەتحوڵلا و محەمەد حسەین زەهاوی ، کە لە دەستخستنی سەرچاوە و سازکردنی پاشکۆکان و کۆمپیوتەرکردنی ئەم بەرهەمەدا ، بە سینگێکی فراوان و گیانێکی ماندوونەناسیەوە ، دڵسۆزانە و کوردانە کۆمەك و هاریکارییان کردووم .. مل کەچی ئەمەك و وەفایانم ... هیوامە بۆ کورد و بۆ گشت ، تەمەن درێژ و لەشساغ بن .

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

## ـ ئـ ـ

**ئاخافتن**

**بـ . : ئاخاوتن**

**ئاخاوتن** **الكلام** **Speech**

**ئاخافتن = وتن ، گوتن ، قسه**

**ئاخاوتن له ڕێی پێوەندی‌یەوە لەگەڵ زمان دیاری دەکرێ ، بەڵام دیارتر .**

**ئاخاوتن ـ بریتی‌یە لە کاری سەربەخۆی خواز و تێگەیشتن ، کە وا پێویستی بە جیاکردنەوەیە**

**١ـ ئاوێتەیێك بە یاریدەی ئەوەی کە وا قسەکەری کارا کەڵك لە یاسای زمان وەردەگرێ بەو مەبەستەی بیری خۆی دەربڕێ .**

**٢ ـ ئامێرایەتیی دەروونی و بەدەنی بە پێشکەوتنی بابەتەکی‌یەتی ئەو ئاوێتەیە . لە دابەش‌کردنی زمان و ئاخاوتندا ، ئەوەش جیادەکرێتەوە :**

**أ ـ کۆمەڵایەتی لە تاکایەتی .**

**ب ـ کرۆکی و بنەڕەتی لە لاوەکی یان ڕێکەوت .**

**ئەو دیاردەیە ، هەمیشە تاکە و بە تەواوی تاکایەتی حوکم دەکا تێیدا و بە ئاخاوتن ناودەبرێ ، بەڵام لەم دیاری‌کردنەدا شتێکی زۆر نەساز ونە : یان تەنیا (( ئاخاوتن )) تاکایەتی‌یە ، لاوەکی‌یە تەنانەت ڕێکەوتیشە و تەنیا یان ئەو ئاوێتەیە ، کە بە یاریدەی ئەوەی کە وا قسەکەری کارا کەڵك لە یاسای زمان وەردەگرێ ، کە بە هیچ جۆرێك ناشێ لاوەکی بێت و بە تایبەتی هەر ناشێ ڕێکەوت بێ و تەنانەت ناتوانێ تاکایەتی‌یش بێ .**

**دیاری‌کردنی پێناسەی ( ئاخاوتن ) کارێکی گرانە . بەر لە هەر شت ئەمە زمان نییە و هەروەها کاری جیاوازی ئاخاوتن نییە . ئێمە باسی ئاخاوتنی بێژەکی و ئاخاوتنی نووسین دەکەین و ئەمە بە تەواوی هاوسەنگن . ئێمە**

باسی ئاخاوتنی منداڵ و قوتابی ؛ ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ؛ ئاخاوتنی کارگێڕی و هونەری ؛ ئاخاوتنی وتووێژ ... دەکەین .

زمان زیاتر ئاخاوتنە تا نووسین ... زمانناسەکان باوەڕیان وایە ، کە ئاخاوتن بنچینەی زمانە . ئەم پێشتریيەی ئاخاواتنیش لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

١- زۆر بەر لەوەی نووسین دابێت ، شێوی قسەکردنی زمانی زانیوە و تا ئەمڕۆش گەلێك زمان هەیە ، کە شێوەی نووسینی نییە .

٢ - منداڵی ساوا یەکەم جار فێری قسەکردن دەبێت و پاشان دەکەوێتە سەر باری فێربوونی نووسین .

٣ - لە کاروباری ڕۆژانەماندا ئاخاوتن دەورێکی باڵاتر لە نووسین دەبینێ . بە واتای ئەوەی ئێمەی مرۆڤ زۆرتری کاتمان بە قسەکردن دەڕوات ، وەك لەوەی بە خوێندنەوە و نووسینەوە .

... هتد

کاری ئاخاوتن تاکایەتی‌یە و هەر جارە بەکارهێنانێکی زمان وەك ئامێری لەیەکترگەیشتنی تاکی جۆربەجۆر . کاری ئاخاوتن پێویستە و دەبێ دوو لایەن بێ : گوتراو و بیستراو ، کە یەکێتی‌یێکی نەپچڕاو پێك دێنن و مەرجی لەیەکترگەیشتنی تێدایە . کاری ئاخاوتن بەر لە هەر شت ڕەوتێکە ، کە زانایانی فیزیۆلۆژی و بیستن و دەروون و زمان لێی دەکۆڵنەوە . کاری ئاخاوتن مەرج نییە هەر ببیسترێ ( لە قسەی بێژەیی‌دا ) ، بەڵکو هەروەها دەشێ نووسراو بێ ( لە نووسیندا ) . هەروەها لە حاڵەتی پێوەندیی بێژەیی ئاخاوتندا کە لەسەر شریت تۆمار کرابێ . کاری ئاخاوتن دەشێ بەپێی ڕای جۆربەجۆر و بە شێوازی زانستی هەمەچەشن لێی بکۆڵرێنەوە و باس بکرێ .

| | | |
|---|---|---|
| ئاخێوەر | المتكلم | Speaker |

= قسەکەر

| | | |
|---|---|---|
| ئارام | الصبر | Petention |

ئارام پاراستنی دۆخی پێویستی دەربڕینی دەنگە . لە باری دەربڕینی دەنگی کۆنسۆنانتی کۆسپەکی کپدا ، بەوێنە دەنگی ( ت ) ، ئارامی‌یەکەی بەرانبەر سفرە . لەباری دەربڕینی کۆنسۆنانتی کپی درێژ و بەتایبەتیش ئاوازەدار و زرینگۆکدا بە ڕوونی هەست بە ئارام دەکرێ .

| | | |
|---|---|---|
| ئارەزوو | الرغبة | Desire |
| ئاست | مستوى | Level |
| ئاسمانە | الحنك ، سقف الفم | Palate |
| ئاسۆیی | الأفقي | Horizontol |
| ئاشکرا | صريح | Indicative |
| ئاکار | صفه ، سمة ، خلق | Feature |

ئاکام

ب : ئەنجام

ئاگا | الشعور ، الوعي | Consciousness

ئامراز | الأداة | Particles

- ئامرازی ئاواتخواستن | اداة التمني والدعاء
Subjunctive Particles

وەك ( خۆزگە / خۆزیا ... كاشكی ، بریا ... ) :

خۆزگە ئەو شەوە بهاتنایە .

كاشكی لەگەڵ ئێوە بهاتایە .

بریا گوڵەكەم بڕواندایە .

- ئامرازی بانگهێشتن | اداة النداء | Vocative Particles

ئـامرازی بانگهێشـتن بـۆ ڕووكردنـە هــەموو جـۆرە بـانگكراوێـك ، چ ئادەمیزاد . چ غەیری ئادەمیزاد ، چ ناوی مـادی ، چ نـاوی مەعنـەوی ... بێت بەكاردەبرێ . وەك : ( ئەی ، هۆ ، هێ ، یا ... ) :

ئەی ئەوانەی كۆڵنادەن .

ئەی مانگ ..

ئەی بەختی بەد چیت پێكردم .

....

هۆ كاكەی شوان ....

هێ كچێ

یا خوا

یا شێخ

... هتد

## ـ ئامرازی پێوەندی   اداة العطف ، ادوات الوصل/الربط
Conjunction Particles

= ئامرازی بەستنەوە ، ئامرازی لێکدەر ، ئامرازی گەیەنەر ، ئامرازی یەکخەر، ئامرازی پێبەست ، ئامرازی پەیوەستدار .

ئامرزای پێوەندی ئەو جۆرە ئامرازانەن ، کە دوو ڕستەی سادە بەیەکەوە دەبەستنەوە و بە زۆری یاریدەی ڕۆنانی ڕستەی لێکدراو دەدەن ، یان لە ڕستەی ئاوێتەدا ڕستەی شوێنکەوتوو دەگەیەننە ڕستەی سەرەکی .

ئەم ئامرازانە لە زمانی کوردیدا ژمارەیان زۆرە : ( و ، ش/یش ، هەم ، بەڵام/ بەڵاَن ، یا / یان / یاخود .. نەك / نەوەك ، کە ، چونکە ، ئەگەر ، دەنا ، ئەنجا ، بەڵکو ، کەچی  و گەلێکی دی ) و ئەرکی جۆراوجۆر دەبینن .

چەند نموونەییێك :

تۆ هەتە تیغی دەبان و من هەمە تیغی زبان .

هەندێ ئامۆژگاریم کرد ، ئەویش بەدڵ گوێی لێگرتم .

.....

هاوینی بەغدا گەرمە ، بەڵام شەوانی فێنکە .

یا / یان ... ئێمە دەبین ، یا / یان ئێوە دەبن .

... هتد

ﻫ ., ب . : ڕستەی لێکدراو ؛ ڕستەی ئاوێتە ؛ ڕستەی شوێنکەوتوو .

## ـ ئامرازی سەرسوڕمان   اداة التعجب   Interjection Particles

ئەو جۆرە ئامرازانەن ، کە سەرسامیی هەستی ئاخێوەر بەرانبەر شتێك یان کارێك ڕادەگەیەنن  ئەم ئامرازانە نابنە بەشێکی ڕستە .

وەك ( پەکوو / پەك  ئەدی ، دەك ، پەح / پەحا ... ) :

پەکوو چ کابرایەکی جاڕسە !

ئەدی نەتبیست گوڵە مێردی کرد !

...

پەح ئەم گوڵە چەند ناسکە !

... هتد

٥ . ، ب : ڕستەی سەرسوڕمان

- ئامرازی وریاکردنەوە اداة التنبية Hortatory Particles

ئەم ئامرازانە (ئا ، ئەها ، دادەی ، ها ...) بۆ وریاکردنەوە و بەهۆش هێنانەوە بەکاردەهێنرێن . بەنموونە :

ئا مەڕۆ ، ئیشێکم پێتە .

ئەها ، کەروێشکەکە دەرپەڕی .

...

ها ئەوە دەفتەرەکەت ، ئیتر ونی مەکە .

ئامێرایەتی الالیة Mechanism

ئاواز نغمة الكلام Intonation

چۆن مەفهوومی زەنگ لە خاسیەتی بیستنی دەنگدا شتێکی بنەڕەتی‌یە ، بە هەمان چەشن مەفهوومی ئاوازیش لە خاسیەتی ڕستەدا شتێکی سەرەکی‌یە ، ئەویش چونکە ئاواز ، ساز و کێشی پێکهاتنی ڕستە دیاری‌دەکا

بێ ئەوەی هێزی ڕستە شوێنی خۆی بگۆڕێ ، ئاوازیش دەتوانێ مانای ڕستە جیابکاتەوە . بۆ نموونە ، ڕستەی خەبەری (( شیرین گەڕایەوە )) و ، ڕستەی پرسی (( شیرین گەڕایەوە ؟ )) ئاشکرا دیارن و گوێگر ئەم دوو ڕستەیە تێکەڵ ناکا و وەك یەك وەریان ناگرێ ، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە ،

کە وا ڕستەی یەکەم - واتە (( شیرین گەڕایەوە )) ئاوازێکی نزمی هەیە ، بەڵام ڕستەی دووەم - (( شیرین گەڕایەوە ؟ )) بە ئاوازێکی بەرز دەردەبڕرێت .

ماکەکانی ئاواز بریتین لە :

١- ئاهەنگی ئاخاوتن .

٢ - هێز . النبرة - Stress

٣ - وەستان - توقف - Pause

٤ - خێرایی - السرعة Quickness

٥ - زەنگ - الجرس Timber

ئاهەنگ و هێز کە ماکی پێشڕەوی ئاوازن لەسەر بناغە یان دانەی ئاوازی ( ummomeuea ) و ( Syntagme ) دادەمەزرێ .

ئاهەنگی ئاخاوتن - بزووتنەوەی دەنگ بەپێی بەرزیی ئاوازە . ئاهەنگی برگە و وشە ، هێزی فرەئاوازی مۆسیقا پێك دێنێ . ئاهەنگی ڕستە ، وێنەی ئاوازێ دەکێشێ ، کە لە بناغەی ئەوجۆرە ئاوازەدا هەیە . جاران بە یاریدەی نۆتە ئاهەنگیان نیشان دەدا ، بەڵام ئێستا بۆ دەربڕینی بزووتنەوە خەتی پێچاوپێچ ( بەرز و نزم ) بەکاردێنن و سەرەتا و کۆتایی بزووتنەوەی ئاوازی پێ دیاری دەکەن . خەت لە فۆرمی گونجاندندا بەپێی باری ئەستوونی بەرزیی ئاوازی بنەڕەتی بە هێرز HZ دەپێورێ ، بەڵام لە باری ئاسۆیی‌دا - کات . خەتی درێژەوە بوو زۆر جار نیشانی بزووتنەوەی ئاوازی بنەڕەتی دەدا لە تەلەفوزکردنی بزوێندا .

خاسیەتی ئاهەنگی ڕستەی پرس لەوەدایە ، کە لە برگەی هێزداری ئەو وشەیە پرسیاری لەسەر دەکرێ ئاواز بەرزدەبێتەوە . ڕستەی خەبەری و سەرسوڕمانیش ئاوازی خۆیان هەیە ...

ummomnuca ئاواز لەگەڵ پێکهاتنی ڕستەسازی‌دا پێکەوە گرێ‌دەدا ، کەوا خاسیەتە بۆ ئەم یان ئەو زمان . ژمارەی umioneuca سنووردارە ، بەوێنە ( پ . دێلاتر ی دەنگسازی فەرەنسایی (١٠) جۆر ئاوازی بنەڕەتی

دیاری کردووه . ئاواز تەنیا یاریدەی دەربڕینی پێکهاتنی ژیربێژی — ڕێزمانیی ڕستە نادات ، بەڵکو واتای وتراو و هەستی قسەکەریش دەردەبڕێ هەست بەر لە هەر شت بە زەنگ دەردەبڕرێ ، واتە بە بزووتنی ئاواز لە تەنیشت نۆتی ناوەڕاستەوە ، کە مرۆ لەوێوە لە دۆخی هێوەرەوە دەست بە قسە دەکات .

بە دوا سینتاگمەدا ، ئاهەنگ و هێز و خێرایی و وەستان پەیدادەبێ . سینتاگمە دوو ئەرکی هەیە : دەنگسازی و واتاناسی . سینتاگمەی دەنگسازی ، وتە بەسەر ئەو جۆرە تریانەدا دابەش دەکا ، کە خاسیەتی زمانێکی دیاریکراو بن . دابەش کردنی سینتاگمەیی ڕستە یاریدەی باشتر دەربڕینی واتای کەمدیار و شێوازی جیاوازیی واتا و هەروەها پێوەندیی قسەکەر بەناوەرۆکی وتنەکەیەوە دەدات . دابەشکردنی سینتاگمەیی ڕستە ، لەتەك ڕیزبوونی وشەدا ، بریتییە لە کەرەستەی چالاکی دابەشکردنی ڕستە ، کە ئەمەش لە ڕستەسازیدا باسی لێوە دەکرێ .

| | | |
|---|---|---|
| ـ ئاوازی سەروو | النغمة التوافقية | Overtone |
| ـ ئاوازی فرەئاواز | متعدد النغمات | Polytonic |
| ـ ئاوازی هاودەنگ | اللفظة المجانسة | Homophonus |
| ـ ئاوازی یەك ئاواز | احادى النغمه | Momotonic |
| ئاوازەدار | المجهور | Voiced |

ئاوەڵکردار وەك بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن لەسەر بناغەی خاسیەتی وشەسازی و ئەرکی ڕستەسازی و واتاناسی‌یەوە جیادەکرێتەوە .

ئاوەڵکردار خاسیەتی ڕوودان ( کە کردار دەری‌دەبڕێ ) ؛ خاسیەتی خاسیەت (کە ئاوەڵناو دەیگەیەنێ ) ؛ خاسیەتی بارودۆخ ( کە ئاوەڵکردار نیشانی دەدا ) دیاری دەکا ئاوەڵکردار چۆنێتی ، یان ڕادەی ڕوودان ، یان ڕادەی چۆنێتی شتێك ، یان بارودۆخی جیاوازی ڕوودانی کارێك : شوێن ، کات ، هۆ ، مەبەست ... ڕادەگەیەنێ .

هەروەها دەشی بوترێ : ئاوەڵکردار ئەو بەشە ئاخاوتنەیە ، کە بارودۆخ و شێوەی ڕوودان و جۆری چۆنێتی نیشان دەدا .. ئاوەڵکردار لە ڕووی ڕستەسازی‌یەوە خاوەنی ئەو تایبەتێتی‌یەیە ، کە لە ڕستەدا بە کردارەوە ، یان ئاوەڵناوەوە ، یان ئاوەڵکردارێکی دی‌یەوە بەندە .

بەوێنە کە دەوترێ ((ئازاد زۆر دەخوات)) ، ئەوە ((زۆر)) کە ئاوەڵکردارە ، بە کردارەکەوە بەندە ـ واتە وەسفی کرداری (( دەخوات )) دەکات . لە ڕستەی (( ئازاد زۆر جوان دەنووسێ ))دا ـ ( زۆر ) کە ئاوەڵکردارە بە ئاوەڵناوەکەوە بەندە ـ واتە ئاوەڵناوی ((جوان)) دەردەخا ، لە ڕستەی ((ئازاد زۆر کەم دەنوێ))دا ـ ((زۆر)) کە ئاوەڵکردارە بە ئاوەڵکردارەکەی دی‌یەوە بەندە ـ واتە ئاوەڵکرداری (( کەم )) ڕوون دەکاتەوە .

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ کرداردا :

منیش ئەم قەرارەم <u>زۆر</u> پێ‌خۆش بوو .

(لە خەوما ، ل٣١)

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناودا :

ئەمیش نە <u>زۆر</u> کەڵەگەت بوو نە کورت .

( لە خەوما ، ل ٦٤ )

* هاتنی ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵکرداردا :

بەخوا ئەگەر (بەد)ی ناوخۆمان لێمان بگەڕێن ، ئێمە بۆ خۆمان زۆر چاك ئەژین

( لە خەوما ، ل٧٠ )

ئەگەر لە ڕووی تایبەتێتی واتاناسی و ڕستەسازی‌یەوە ، ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناو و ناودا بەراورد بکەین ، ئاشکرا هەست بەوە دەکەین ، کە ئاوەڵکردار خاوەنی تایبەتێتی خودی خۆیەتی .. بەشێکی زۆری ئاوەڵکردار لەگەڵ ئاوەڵناودا خاوەنی یەك بنەمان و واتایان وەك یەکە ، بەڵام جیاوازییان لە ڕووی دەوری ڕێزمانی‌یەوە هەیە .

ئاوەڵکردار وەسفی کردارێك یان ئاوەڵکردارێك دەکات ... هەرچی ئاوەڵناوە چۆنێتی و خاسیەتی شتێك نیشان دەدا ، کە ناوێك ڕای دەگەیەنێ ، بۆ نموونە :

( باش ) وەك ئاوەڵکردار : ( ئازاد باش وەڵامی دایەوە ) .

( باش وەك ئاوەڵناو : ( ئازاد بە وەڵامی باش دەرچوو ) .

واش ڕێ دەکەوێ هەندێ فۆرمی ناو دەبێتە ئاوەڵکردار ، وەك :

سەربانی ماڵ .

وشەی (( سەربان )) بە ڕەسەن ناوە ، بەڵام لێرەدا واتای (شوێن) دەگەیەنێ و نیشاندانی شوێن مەبەستی سەرەکی‌یە . بۆیە دەبێتە ئاوەڵکردار .

لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی ئاوەڵکردار نیشانەی مۆرفۆلۆژی وای نی‌یە ، کە لە ڕێگەیەوە بتوانرێ وەك بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ جیابکرێتەوە ، بەڵام هەندێ خاسیەتی لێکسیکی و مۆرفۆلۆژی و سینتاکسیی ئەوتۆی هەیە ، کە دەبنە بنەمای جیاکردنەوەی لە بەشە ئاخاوتنەکانی‌دی .

## ـ ئاوەڵکرداری ئاوەڵناوی    الظرف الوصفي    Adverb adjective

ئەم جۆرەش ئەگەرچی ، وەك ئاوەڵکرداری ناوی لە سێ ڕێگەوە پەیدادەبێ ( ١ـ بە یاریدەی پێشگر و پاشگر ، ٢ـ بە یاریدەی پێشبەند و پاشبەند ، ٣ـ دووپات کردنەوە ) ، بەڵام جۆری دووەم کەم و سستە .

یەك ـ بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر . وەك :

بەگوڕ ، بەپەلە ...

ژیرانە ، ئازایانە . .

بەژیری ، بەخۆشی ... بەسپیەتی ... بەپانایی ...

.. هتد .

دوو ـ بە یارمەتیی پێشبەند و پاشبەند ، وەك :

بە گوڕەوە ... لە گەورەوە ..

سێ ـ دووپات کردنەوە ، وەك :

جوان جوان ، هێدی هێدی ، وردورد ...

هتد .

## ـ ئاوەڵکرداری تەئکیدی    الظرف التوكيدي    Affirmative adverb

ئەم جۆرە ئاوەڵکردارە تەئکیدکردنە سەر بەجێهێنانی کارێك نیشان دەدا. وەك :

هەڵبەت ، هەر .. بێگومان ، بێسێودوو ، بێچەندوچوون ...

هەڵبەت ـ

وتیان نابێ ، هەڵبەت ئەمە شتێکی لەژێر سەردا هەیە .

( لە خەوما ، ل ٣٢ )

... ئەو تۆزە پرووپیتەشیان کە ماوە هەڵبەت بردوویانە .

( لە خەوما ، ل٣٦ )

- ئاوەڵکرداری جێناوی الظرف الضميري Pronominal adverb

لە نێو ئەو ئاوەڵکردارانەدا ، کە لە جێناوەوە سازبوون ، بەر لە هەر شت ، ئەوانەیان دیارن ، کە لە زووەوە لە جێناوی چەندێتییەوە وەرگیراون . وەك : ئەوەندە .. هێندە .. چەند ..

- ئاوەڵکرداری چەندێتی ظرف الكمية Quantitative adverb

ئاوەڵکرداری چەندێتی ، چەندێتی ڕوودان ، ڕادەی توونديی ڕوودان ، ئەندازەی چەندێتی ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار دیاری دەکا و لە دیالێکتی کرمانجیی خوارودا وەڵامی پرسیاری (چەند ؟) ، (کەم ؟ یان زۆر ؟) ؛ (تا چ ڕادەیەك ؟)...و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەڵامی پرسیاری (چقا ؟) ، (چقاس ؟) دەداتەوە .

أ ) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بەهێز بوون :

زۆر ، فرە ، گەلێ / گەلێك ، یەکجار ، تەواو .. پڕ .. گەلەك ...

زۆر -

منیش چونکە بە عومری خۆم ئەحواڵی وام نەدیبوو ، <u>زۆر</u> ئەترسام .

( لەخەوما ، ل٣٠)

دۆستیی کورد و عەرەب <u>زۆر</u> کۆنە تەئریخ شاهیدە

ناحەزی ڕوورەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕێ

( بێکەس ، ل ٨٣)

گەلێ -

لە گەرووی شمشاڵ ، لە تەلەی کەمان

<u>گەلێ</u> هەڵساوە ئاوازی جوان جوان

( گۆران ، ل١٠)

گەلەك ـ

مەمێ تاخم عەجباند گەلەك خەلاٚتێن باش دانە سەرٖاجانە تاقم گشگی خەملاندینۆ ب چینانە

(مەمێ ئالان ، ل٤٥ )

ب ) ئاوەڵکرداری چەندێتی لەگەڵ واتای بێهێزبوون :

کەم / کەمێ / کەمێك ، پچێك ، نەختێ / نەختەك ، تۆزێ / تۆزێك .. کێم ...

کەمێ ـ

تو خوا ئاوەکەی بۆن گوڵاٚوەکە

بۆ سەرچاوەکە کەمێ لاوەکە

( پیرەمێرد ، ل١٢٥)

نەختێ ـ

بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان کە

دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە

( بێ کەس ، ل١٥٢)

تۆزێك ـ

کابرای خانچی سەرێکی لێ لەقاندم و .. تۆزێك پێکەنی .

( لە خەوما ، ل٣٦)

تێبینی :

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێ وشە هەیە ، وەك ( قووڵ ، دوور ، پان ، بەرز ، نزم .. ) ، کە واتای ئەندازە و پێوانەیان تێدایە و دەکەونە نێوان هەردوو ئاوەڵکرداری چۆنێتی و ئاوەڵکرداری چەندێتییەوە :

نزیك ، دوور ـ

ویڵ و ئاوارەی ئێلی مرادیم

نزیك لە مەرگم دووریش لە شادیم

( پیرەمێرد ، ل ١٢٦)

- ئاوەڵکرداری چۆنێتی ظرف الكيفية Qualitative adverb

ئاوەڵکرداری چۆنێتی واتای ڕووداۆن یان دەلالەت نیشان دەدا . وەك :
خێرا . هێدی ، هێمن ، جوان ، باش ، خراپ .. بەژێری ، بەسواری ، بەگورجی ، بەخۆشی ، بەپەلە ، بەگوڕ ، بەکوڵ .. لەسەرخۆ ، لەسەرلا ، لەسەرسنگ ، لەسەرپشت .. بانەوبان ، شاخەوشاخ .. ڕند . خراب ، ئارام ...
چەند نموونەیەك :

ورد -

بە باغچەی پاشادا ورد گەڕام ، خوار و ژوور ،

زەرد هەبوو ، بۆم چنیت ، چنگ نەکەوت گوڵی سوور

( گۆران ، ل١٧)

بەخۆشی -

ئەم ڕۆژیساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە

جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی بەهاتەوە

( پیرەمێرد ، ل١١٩)

ڕند -

هەردوو ماعرا گوهداری خەبەردانا وان دکرن ؛ وانا ڕند بهیست چ گەلی عەلی مەمەد گلی کر .

( کوردۆ ، ٣٨)

دەبینین وشەکانی ( خێرا ، هێدی ، جوان .. بەپەلە .. لەسەرخۆ ... لەسەرسنگ ... بانەوبان ... ڕند ... ) ڕوودان لە ڕووی چۆنێتییەوە دیاری

دەکەن . ئەم جۆرە ئاوەڵکردارانە لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا وەڵامی پرسیاری ( چۆن ؟ ) - چلۆن ؟ کوو ؟ ) و لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەڵامی پرسیاری ( چەوا ؟ ، چاوا ؟ ) دەدەنەوە .

ئەگەرچی بەشێکی زۆری ئاوەڵکرداری چۆنێتی لە بنەڕەتدا ئاوەڵناون ، وەك (خێرا ، هێدی ، هێمن ، جوان ، باش ، خراپ .. لەسەرخۆ .. بەپەلە .. ڕند ..) ، بەڵام کاتێ چۆنێتی کردارەکە دیاردەخەن ، وەك ( شەماڵ خێرا دەنووسێ ؛ نەسرین هێدی دەڕوات ؛ لانە جوان دانیشتووە .. ) دەبنە ئاوەڵکردار . هەر لەبەر ئەوەشە ، ئەو جۆرە وشانە تەنیا لە ڕستەدا دەردەکەون ، کە سەر بە چ بەشە ئاخاوتنێکن .

## - ئاوەڵکرداری داڕێژراو الظروف المشتقة Derivational adverb

= ئاوەڵکاری داڕێژراو ،

ب . : وشەی داڕێژراو

لە زمانی کوردیدا پێشگر و پاشگر جاروبار یارمەتیی دروستکردنی ئاوەڵکرداریش دەدەن

أ . پێشگر

١- ( بێ - ) : بێگومان ، بێشك ..

٢- ( بە - ) بەگوڕ ، بەکوڵ ، بەتەنیا ...

ب - پاشگر

١- ( - ێ ) : هاوینێ ، بەهارێ ، شەوێ ..

٢- ( - انە ) : ژیرانە ، پیاوانە ...

٣-( - ئاسایی ) : شێرئاسایی ، کوێرئاسایی ...

٤- ( - ەکی ) : شەوەکی ، بەیانەکی ...

**ـ ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی      الظرف شبه الجملة**

Cyntactic adverb

ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی بەو ئاوەڵکردارە دەوترێ ، کە لە دەستەواژەیەك پێك هاتبێ ـ واتە کۆمەڵە وشەیەك بێ و کرداریان لەگەڵ نەبێ.

جۆری هەرە دیار و سادە و چالاکی ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی ئەوەیە ، کە بە یاریدەی پێشبەند و پاشبەند سازدەبێ :

١ـ پێشبەندی ( لە ) و :

اـ پاشبەندی ( ەوە ) . وەك :

لەماڵەوە ، لە چەپەوە ، لە ڕاستەوە ، لە بازاڕەوە ، لە هەولێرەوە ...

لەوێوە ، لێرەوە .. لەسەرەتاوە ..

ب ـ پاشبەندی ( دا ) ، وەك :

لە ماڵدا ، لە کتێبدا ، لە گیرفاندا ..

جـ ـ پاشبەندی ( ڕا )

لە هەولێرڕا ، لە سلێمانیڕا ..

٢ـ پێشبەندی ( بۆ ) و پاشبەندی ( ەوە ) . وەك :

بۆ ماڵەوە ، بۆ ژوورەوە ..

٣ـ پێشبەندی ( بە )و :

اـ پاشبەندی (ەوە) . وەك :

بە ئاسمانەوە ، بە دارەوە ، بە بەرگەوە ...

ب ـ پاشبەندی (دا ). وەك :

بە زەویدا ، بە کوندا ، بە دەمدا

٤ـ پێشبەندی ( تا ، هەتا .. ) و پاشبەندی ( ەوە ) ، وەك :

تا ماڵەوە ، تا دەرەوە ..

... و گەلێکی دی .

ئەويش چەند نموونەيەك بۆ جۆری ناسادەی ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی:

* لای سەرەوە

لای خوارەوە

بۆ لای سەرەوە

بۆ لای خوارەوە

بۆ لای ڕاست

بۆ لای چەپ

* لە هەموو لا

لەمەولا

لە هیچ کوێ

لەسەر دارەکە

لەبن دارەکە

لەلای دارەکەوە

* بە هیچ چەشنێ

بە هیچ شێوەیەك

بە هیچ ڕەنگێ

بە هیچ کلۆجێ

* هەفتەی ئایندە

ساڵی نوێ

مانگی داهاتوو

وەك جاری جاران

وەك گەڵای دار

.. و گەلێکی دی .

ـ ئاوەڵکرداری دووبارەکردنەوە الظرف التكراري

Recursiveness adverb

ئاوەڵکرداری دووبارەکردنەوە پەنجە بۆ دووپات بوونەوەی ڕوودانەکە ڕادەکێشێ . وەك :

دووبارە ، دیسان ، سەرلەنوێ ، جارێکی دی / جارێکی تر . هەرجارە / هەرجارێ / هەرجارێك / هەرجارەکی .. ئەمجارەش ...

دیسان ـ

بولبولی طەبعم ئەوا <u>دیسان</u> ثەنا خوانی دەکا

نوکتە سەنجی و ، بەذلە گۆیی و ، عەنبەر ئەفشانی دەکا

( نالی ، ل١٠١)

ئەمجارەش ـ

... دواجار سەیرم کرد ، گەورەم <u>ئەمجارەش</u> بەدەنگێکی بەرزەوە وتی ...

( لە خەوما ، ل ٥٣ )

سەرلەنوێ ـ

تازە سەوزەگیا <u>سەرلەنوێ</u> ئەڕوێ ،

مەل لە ماجەرای عەیش و نۆش ئەدوێ !

(گۆران ، ل ١٦٨ )

ـ ئاوەڵکرداری ژمارەیی الظرف العددي

Numeral (number ) adverb

ئەو ئاوەڵکردارانەی لە ژمارەوە ڕۆنراون ، کەمن و بە زۆری لێکدراون و لە ڕێگەی دووپاتکردنەوەی بێیاریدە ، یان دووپاتکردنەوە بە یاریدەی ناوبەندی ( بە ، لە ... ) سازدەبن . وەك :

یەك یەك ، دوودوو ...

یەكبەیەك ، دووبەدوو ...

یەكلەیەك ،، دوولەدوو ...

### ـ ناوەڵکرداری سادە  الظرف البسیط  Simple adverb

ب . : وشەی سادە

وەك : خێرا ، هێدی ، باش ، زۆر ، کەم ، پڕ ، ئێستا ، پار ، سەر ، ژێر ، خوار ، بن ، کن ، پاش ، پێش ، دەر ، بەر ، ناو . . .

### ـ ئاوەڵکرداری شوێن  ظرف المكان  Adverb of place

ئاوەڵکرداری شوێن ، شوێنی ڕوودانی کارێك یان ڕووی بزووتنەوەی شتێك نیشان دەدا و وەڵامی پرسیاری ( لە کوێ ؟ لە کوێندەرێ ؟ ... ) ؛ ( بۆ کوێ ؟ ) ؛ ( لە کوێوە ؟ ) دەداتەوە . لە دیالیکتی کرمانجیی ژووروودا پرسیارەکە ( ل کوی ؟ ) ، ( کویدا ؟ ) ؛ ( ژ کوی ؟ ) . . . یە ، وەك :

سەر ، ژێر ، خوار ، بن ، کن ، پاش ، پێش ، ناو/نێو ، دەر ، بەر ، تەنیشت ، چەپ ، ڕاست  لەسەر ، لەژێر ، لەخوار ، لەبن ... لە سەرەوە ، لە ژێرەوە ، لە خوارەوە ، لە بنەوە ، لە پێشەوە ، لە ناوەوە ، لە ڕاستەوە ، لە چەپەوە ... بۆ لای سەرەوە ، بۆ لای ڕاست ، بۆ لای چەپ ... ئێرە ، ئەوێ ، لێرە ، لەوێ ، لێرەوە ، لەوێوە .. تا ئێرە ، تا ئەوێ .. لە هەموولا ، لە هیچ کوێ ... نك / کن ، ژ خارێ ، ل خارێ ، د ناڤ ، ژێرێ ، ژوورێ ، بنڕا ، ڤڕا ، دوورڤا ...

لە ژێر ، لەپاڵ ـ

لە ژێر ئاسمانی شینا ،
لە پاڵ لووتکەی بەفرینا ،
کوردستان گەڕام ،
دۆڵاو دۆڵ پێوام .

( گۆران ، ل٢٨)

لە نێو ـ

جۆشش و تابە لە نێو دیدەیی گریانمدا

چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی گۆفانمدا

( نالی ، ل ٨٩ )

لەوێ ـ

... لەوێ بەچەند پلیکانەیەکدا سەریان خستم

( لەخەوما ، ل٤١)

ل نك ـ

میری و پادشاهی موویەك ل نك مەلایی

نادەم ب مولکێ عالەم یەك ذەرەیەك عنایەت

( جزیری ، ل١٥١)

لڤر ، ناڤ ـ

مێرکی گوتێ : دێ لڤر بە حورمەت هەرم ناڤ باژێر

( خالید حسێن ، ل٨ )

بەشێکی ئەم ئاوەڵکردارانەش ، وەك ( سەر ، ژێر ، ناو ، پێش ، پاش ، چەپ ، ڕاست ...) لە بنەڕەتدا ناوی شوێنن و دەمێك دەبن بە ئاوەڵکرداری شوێن ، کە جێگەی ڕوودانی کردارەکە دیاری بکەن .

## ـ ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێبەجێ بوون

Adverb of manner الظرف الشكلي أو كيفية التحقق

ئەم ئاوەڵکردارە شێوەیەك یان جۆری جێبەجێ بوونی کارێك نیشان‌دەدا و وەڵامی پرسیاری ( چۆن ؟ ) ؛ بە چ جۆرێك ؟ ) ؛ ( بە چ شێوەیەك ؟ ) ؛ ( بە چ چەشنێك ؟ ) ... دەداتەوە . لە دیالێکتی کوردیی ژووروودا پرسیاری ( چ جۆرە ؟ )ی بۆ دادەنرێ ..

بەشێك لە ئاوەڵكرداری شێوە یان جۆری جێبەجێبوون ، دەشێ لە ڕێگەی بەراوردکردن یان لێك چواندنەوە دیاری بکرێ ، وەك :

شێرانە ، ژیرانە ، ئازایانە ، پیاوانە ، مەردانە ، منداڵانە .. گورگ ئاسایی ، تۆئاسایی ... وەك پایز ، وەك گەڵا ، وەك جاری جاران ...

شێرانە -

ڕۆڵە ، لای لایە .. ( شێرکۆ ) لای‌لایە ...

یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە ...

(بێ کەس ، ل١٥٣)

وەکو شێت -

... بێ‌پەروا وەکو شێت ڕاپەڕیم .

( لەخەوما ، ل٣٥)

بەشێکی دی‌یان لە ڕستەدا بەدوایەکترهاتنی کردارەکە نیشان دەدەن . وەك :

دەستەدەستە ، پۆل پۆل ، تاقم تاقم ، یەك یەك ، قوم قوم ، تنۆك تنۆك ، کەم کەم ، وردەوردە هێدی‌هێدی ، چیتی‌چیتی ...

پۆل پۆل -

.. هەر فڕکان فڕکانی تەریدە و جەردە بوو . پۆل پۆل ئەهاتنە سەر ڕێگەمان .

( لەخەرما ، ل٣٠)

گورج گورج ، جوان جوان -

بە ڕەوتی کەو ، لەنجەی تاوس و قومری

گورج گورج ، جوان جوان ئەهات و جادەی ئەبڕی ..

( گۆران ، ل٣٥)

چیتی چیتی -

ماعری ڕەش چیتی چیتی کرن .

( کوردۆ ، ل٤٩ )

هێدی هێدی -

پیرێ کازی مەلەکێد قەنجەیی کر .

هێدی هێدی خوە نێزیکی دەنگ کر .

( سیابەند و خەجێ ، ل١٩ )

دوا بەشیش ، ئەو وشانەن کە گشتێتی شێوەی ڕوودانەکە و بەجێهێنانی ڕادەگەیەنن ، وەك :

بەدووقوڵی . پێکەوە ، بەگشتی ...

پێکەوە -

سا تو خوا ، خێراکە ، با بڕۆین ، دست بگرین ،

بە کامی دڵداری پێکەوە هەڵپەڕین !..

( گۆران ، ل١٦ )

## - ئاوەڵکرداری کات ظرف الزمان Adverb of time

ئاوەڵکرداری کات پەنجە بۆ دەمی بەجێهێنانی کارێك ڕادەکێشی و وەڵامی پرسیاری ( کەی ؟ ، کەنگێ ؟ ؛ کەنگی ؟ ؛ کەنگین ؟ ، کەنگینێ ؟ ؛ کەینێ ) ؛ ( لە کەیەوە ؟ ) ، ( تاکەی ؟ ) ، ( چ کاتێ؟ ، چ وەختێ ؟ ، چ چاخێ ؟ ) ... دەداتەوە . بۆ نموونە :

ئێستە / ئێستا ، ئەمڕۆ ، سبەی / سبەینێ ، دوێنێ ، پێرێ ، ئێوارە / ئێوارێ ، بەیانی ، نیوەڕۆ ، چێشتەنگاو ، شەوێ ... دەست بەجێ ، یەکسەر ... هاوینێ ، زستانێ ، پایزێ ، بەهارێ ... بەم زووانە ، لەم ڕۆژانەدا ، چەند ڕۆژێکی دی ، جاران ، ئەمساڵ ، پار ، پێرار ... پار نا پێرار ، دەمێکە ، لە مێژە ، هەمیشە ، هەندێ جار ... لەمەولا ، لە زووەوە ، لەو

ـاوه ، له سه‌ره‌تاوه ... تا به‌یانی ، تا مردن ... نها / نهۆ ، شه‌ڤێ ، سبا ، ـیڤارێ / ئیڤارا ، به‌رێ ، ئیرۆ ...

ـێستە ـ

گریانی من و خه‌نده‌یی تۆ ئیسته ده‌شوبهێ

به مه‌وسیمی بارانه که‌وا خونچه ده‌پشکووت

( نالی ، ل١٥٣)

ئه‌مرۆ ـ

که ده‌ڵێن ئه‌مرۆ ده‌شت و کێو شینه

چه‌نده مه‌ڵبه‌ندی ئێمه شیرینه

( پیره‌مێرد ، ل٣٥٥)

هه‌میشه ـ

ئه‌زانی بۆچی وا کورد زه‌لیله

بێناو و نیشان هه‌میشه دیله

( بێکه‌س ، ل٩٩)

نها ـ

... نها ئه‌ز کوشتنا خوه ڕازیمه

( کوردۆ ، ل٤٠)

به‌شێکی زۆری ئه‌و ئاوه‌ڵکردانه ، به‌تایبه‌تی ( شه‌و ، ئێواره ، پار ، به‌یانی ، نیوه‌ڕۆ ، هاوین ، زستان ... ) له بنه‌ڕه‌تدا ناوی کاتن و ده‌مێک ده‌بنه ئاوه‌ڵکردار که ڕوودانی کرداره‌که نیشان بده‌ن .

ـ ئاوه‌ڵکرداری کرداری    الظرف الفعلي    Deverbative adverb

وه‌ك :

به‌گریان ، به‌گریانه‌وه

بەمردوویی ، بەکوژراوی ، بەسووتاوی ..

.. هتد .

## ـ ئاوەڵکرداری لێکدراو الظروف المركبة Compound adverb

بـ . : وشەی لێکدراو

ئاوەڵکرداری لێکدراو لە زمانی کوردیدا دەگونجێ پێکهاتبێ لە :

١ـ دووپات کردنەوەی ناو ، ژمارە ، ئاوەڵناو ، ئاوەڵکردار . وەك :

پۆل پۆل ؛ دوودوو ؛ کەم کەم . . .

٢ـ دووپات کردنەوە بە هاریکاریی ناوبەند . وەك :

أ ـ ( او ) وەك :

پشتاوپشت . . .

ب ـ ( ەو ) وەك :

بانەوبان ، پاشەوپاش ...

٣ـ ئاوەڵناو + ناوبەندی ( بە ) + ناو . وەك :

پڕبەدڵ ، پڕبەدەم . . .

. . . و هەندێکی دی .

## ـ ئاوەڵکرداری ناوی الظرف الاسمي Noun adverb

دەستەی هەرە چالاکی ئاوەڵکرداری ناسادە ، ئەوانەن کە ناو هاریکاری ڕۆنانیان دەکا ئەمانیش سێ جۆرن :

یەك ـ بەیارمەتیی پێشگر و پاشگر . وەك :

بێگومان ، بێناز .. بەناو ، بەدڵ ..

هاوینێ ، شەوێ .. پیاوانە ، ژنانە ..

بێناوی ، بێئاگایانە .. بەپیاوەتی ، بەبرایەتی ...

... هتد .

دوو ـ بە یارمەتیی پێشبەند و پاشبەند . وەك :

لە ماڵ ، لە هەولێر . بۆ ماڵ ، بۆ هەولێر ...

لە ماڵەوە ، لە هەولێرەوە .. لە ماڵدا ، لە هەولێردا ..

بە ئاسمانەوە ، بە دارەوە .. بە کوندا ، بە زەویدا ...

تا هەولێر .. تا ماڵەوە .

... هتد .

سێ ـ لە ڕێگەی دووپاتکردنەوەی بێیاریدە یان دووپاتکردنەوەی بەیاریدەوە . وەك :

پۆل پۆل ، دەستەدەستە ، تاقم‌تاقم ..

شاخەوشاخ ، ماڵەوماڵ .. ساڵبەساڵ ، ڕۆژبەڕۆژ ...

... هتد .

## ـ ئاوەڵکرداری نەفی  الظرف النفي  Negative adverb

ئەم جۆرە ئاوەڵکردارانە نەفی کردارەکە ڕادەگەیەنن . وەك :

هەرگیز ، هەرگیزاوهەرگیز ، بە هیچ جۆرێ ، بە هیچ چەشنێ ، بە هیچ شێوەیەك ، بەهیچ ڕەنگێ ، بەهیچ کلۆجێ ...

هەرگیز ـ

عاجز مەبە هەرگیز لە درۆ و ئیفکی حەسوودان

دونیایە ، دەبێ سەگ بووەڕێ ، شیعە بکا سەب

( نالی ، ل١٣٤)

هەرگیزاوهەرگیز -

بەلاّم تەبیعەت هەرگیزاوهەرگیز

بیٚ ڕووناکی‌یە بیٚ بزەی ئازیز

( گۆران ، ل١٠)

## - ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست ظرف السببی والمقصود
## Adverbs of circumstance

ئاوەڵکرداری هـۆ و مەبەسـت پەنجـە بـۆ هـۆی ڕوودانەکـە ڕادەکێشـیٚ و مەبەستی بەجیٚهێنانی کارێك دەردەخـا و وەلاّمـی پرسـیاری ( بۆچـی ؟ ) ؛ ( لە بەرچی ؟ ) ؛ ( بۆ چ مەبەستێك ؟ )... دەداتەوە . وەك :

لـە بیٚئـەقڵیدا ، لـە تووڕەییـدا ، لـە ترسـا ، لـە برسـا ، لـە خۆشـی‌دا ... بە خۆڕایـی ، لەبەرئەوەی ، چونکە ، بە دەم خەوەوە .. لە داخا ، لە قینـا ، بە ئەنقەست ...

چونکە -

هیچ گویٚ نادەیتە دەرد و ئاواتم

چونکە ئەیزانی بیٚدەسەلاّتم

(بیٚکەس ، ل ٧٦ )

## ئاوەڵناو الصفة Adjective

ئاوەڵنـاو وەك بەشـە ئاخـاوتنێك ، واتـای چۆنێتـی و خاسـیەت و نیشـانە ڕادەگەیەنیٚ لە ئاوەڵناودا ئەم ڕاگەیاندنە چ لە بەکارهێنانی ڕستەسازی‌دا و چ لە تایبەتێتی وشەسازی‌دا ڕوون و ئاشکرا بەدیاردەکەویٚ .

ـە مەیدانی ڕستەسازی‌دا جیاوازیی ئاوەڵناو لەگەڵ ناودا لەوەدایە ، کە
ـەر لـە هـەر شت بـە بـەردەوامی وەك دیارخـەر بـەکاردەبرێ . ئاوەڵنـاو لـە
ـروشتیدا دیارخەری خاسیەتی ناوە .

ئاوەڵناو لە پاڵ ئەوەدا کە دەوری دیارخەر دەبینـێ ، هـەروەها دەشتوانـێ
ـەك بەشێکی گوزارە خۆی بنوێنێ . بەڵام لەبەر ئەوەی بەشە ئاخاوتنی دیش
ـتوانـن ببنـە بەشـێکی گـوزارە و لـە نێویـاندا نـاویش ، بۆیـە لـە ڕاسـتیدا
ـتوانرێ ئەو ئەرکە وەك تایبەتێتی سەربەخۆی ئاوەڵناو تەماشابکرێ .

لەبەر ئەوەی ئاوەڵنـاو وەك ئـەندامی دی ڕستە کـەم بـەکاردەهێنرێ ، بۆیـە
ـبینین مەیدانی ئەرك و وەزیفەی لە هی ناو تەسکترە .

لـە حـاڵێکدا ئەگـەر دوو ئاوەڵنـاو یـان پـتر بەیەکـەوە بێـن ، ئـەوە هیـچ
یەکێکیان لەژێر باری ئـەوی دی‌یـاندا نی‌یـە ، بـەڵکو هـەردووکیان سـەر بـە
ناوەکەن . بەوێنە :

کوڕێکی چالاك و زیرەك .

شووتی‌یێکی سووری شیرین .

پیاوێکی ئازا و نەبەرد .

کچی جوان و نازدار .

... هتد .

لـە بـاری وشەسـازی‌یەوە ئاوەڵنـاو لـەچاو نـاودا لـە بوونـی فۆرمـی
هەمەچەشندا هەژارە .

لـە ڕووی فۆرمـەوە ئاوەڵنـاو لـە زمـانی کوردیـدا هیـچ جیـاوازی‌یێکی
لەگەڵ ناودا نی‌یە ـ واتە هیچ نیشانەیێکی ڕێزمانی نی‌یە ئاوەڵناو لەناو
جیابکاتەوە و دەشێ چ ئاوەڵناو و چ ناو بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن
کۆتایی‌یان بێت . بۆ نموونە :

گەورە ، سپی ... ورد ، راست ...

بەرە ، شووتی ... کورد دەست ...

جیاوازیی ئەم دوو بەشە ئاخاوتنە لە گەیاندنی واتا و بینینی ئەرکدا دەردەکەوێ و هەروەها ئاوەڵناو دۆخ و جنس و ژمارەی نییە و بەلآم ناو هەیەتی . دەلالەتی دۆخ و جنس و ژمارەی ئاوەڵناو دەمێك بەدی دەکرێ ، کە ناوەکە دیاریدەکا ـ واتە دەلالەتی دۆخ و جنس و ژمارەی ئاوەڵناو لە رێی پێوەندی بە ناوەوە ئاشکرا دەبێ .

ئەگەرچی ئاوەڵناو دۆخ و جنس و ژمارەی نییە ، بەلآم خاوەنی خاسیەتێکی تایبەتی خۆیەتی ، ئەویش بوونی پلەیە . بەم چەشنە لەلایەنی وشەسازییەوە پێوەندی ناو و ئاوەڵناو لەم شێوەیەدا دەردەکەوێ : لە سەرێکەوە ناو سێ حاڵەتی هەیە ( دۆخ و جنس و ژمارە ) ، کە ئاوەڵناو نییەتی . لە سەرێکی دییەوە ئاوەڵناو خاوەنی حاڵەتێکە ـ ( پلە ) ، کە ناو نییەتی . بەو پێیە بە گشتی ئاوەڵناو و ناو لە چوار لایەنەوە لە یەك جیادەبنەوە جا لە رێگای ئەو چوار حاڵەتەوە دەشێ بە روونی ناو و ئاوەڵناو لەیەکتر جوێ بکرێنەوە .

ئەگەرچی لە زمانی کوردیدا دەلوێ لە رێگای ئەو چوار حاڵەتە بنەرەتییەوە ناو و ئاوەڵناو جیابکرێنەوە ، بەلآم دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە لە هەندێ رووی دییەوە ئاوەڵناو تایبەتێتی وای هەیە ، ناو نییەتی . یاخود بە پێچەوانەوە تایبەتێتی ئەوتۆ لە ناودا هەیە ، کە لە ئاوەڵناودا نییە . وەك :

هەرچەندە گەلێ پێشگر و پاشگر هەن و وەك یەك دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادە و دەیانکەنە ناوی دارێژراو یان ئاوەڵناوی دارێژراو ، بەلآم هەندێ پێشگر و پاشگر هەن ، کە هەر ناو رۆدەنێن و ئاوەڵناو سازناکەن ، یاخود بە پێچەوانەوە تەنیا ئاوەڵناو دروست دەکەن و یارمەتیی دارشتنی ناو نادەن .. هەندێ پێشگر و پاشگر هەن دەچنە سەر ناو و ناچنە سەر ئاوەڵناو ، یان بەپێچەوانەوە بە ئاوەڵناوەوە دەلکێن و بە ناوەوە نالکێن . نموونە :

پاشگری (بان) لەگەڵ ئەوەدا کە یاریدەی ڕۆنانی وشەی ((سەربان)) دەدا ، کە ناوی دارێژراوە ، هەروەها هاریکاریی سازکردنی وشەی ((فیڵبان))یش دەکا ، کە ئاوەڵناوی دارێژراوە . . .

پێشگری ( بێ ـ ) و پاشگری ( ـ ێنە ) یاریدەی ڕۆنانی ناوی دارێژراو دەدەن (( پێویست ، پێخەف ... )) ، (( نیسکێنە ، زەردێنە .. )) و یاریدەی سازکردنی ئاوەڵناوی دارێژراو نادەن .. بەپێچەوانەوە پێشگری ( بێ ـ ) و پاشگری ( ـــ ن in ـــ ) هاریکاییی ڕۆنانی ئاوەڵناوی دارێژراو دەکەن بێهۆش ، بێکار ... )) ؛ ( ورگن ، تووکن ... )) و لە پێکهێنانی ناوی دارێژراودا بەشداری ناکەن ..

پێشگری ( بە ـــ ) و پاشگری ( ـــ گەر ) دەچنە سەر ناو (( بەهێز ، بەجەرگ ..)) ؛ (( ئاسنگەر ، مزگەر .. )) و ناچنە سەر ئاوەڵناو ... بەپێچەوانەوە پاشگری ( ـ ەك)دەچێتە سەر ئاوەڵناو (( بەرزەك .. )) و ناچێتە سەر ناو ...

وێنەیێکی دی لە جیاوازیی ناو و ئاوەڵناودا ئەوەیە ، لەگەڵ ئەوەدا کە ناو دەبێ بە ئاوەڵناو و ئاوەڵناویش دەبێ بە ناو ، بەلاّم ناو نابێ بە ئاوەڵکردار و هەرچی ئاوەڵناوە بە ئاسانی دەبێ بە ئاوەڵکردار . بەوێنە :

وشەی (( جوان )) لە ڕستەی (( نەسرین کچێکی جوانە )) دا ئاوەڵناوە ، چونکە وەسفی ناو دەکا ، بەلاّم ئەگەر بوترێ : (( نەسرین جوان دەڕوا )) ، ئەوە وشەی (( جوان )) دەبێتە ئاوەڵکردار ، چونکە لێرەدا وەسفی کردار دەکا ـ واتە چۆنیەتیی ڕۆیشتن نیشان دەدا . . . وشەی (( منداڵانە )) لە ڕستەی (( دارا ڕەوشتی منداڵانەیە )) دا ئاوەڵناوە ؛ لە ڕستەی (( دارا منداڵانە دەجووڵێتەوە )) دا ئاوەڵکردارە .. هتد .

لە بەراوردکردنی ناو و ئاوەڵناوی ناسادەدا ، ئەوە بەدی دەکرێ ، کە هەر یەك لەو بەشە ئاخاوتنە بەشداری لە ڕۆنانی یەکدیدا دەکەن . بەوێنە لە

ڕۆنـانی نـاوی داڕێـژراوی (( بـەرزی ... گەورەیـەتی ... سـپێتی ... بڵندایەتی ... قووڵایـی ... چاکـە ... سەوزەڵان .. زەردێنـە ... ڕەشـکە ... پاکانــە .. )) دا ئاوەڵنــاوی (( بــەرز ... گــەورە ... ســپی ... بڵنــد ... قــووڵ ... چــاك ... ســەوز ... زەرد ... ڕەش ... پــاك ... )) هاوکــاری کــردووە .. یــان لــە ســازکردنی نــاوی لێکــدراوی (( مێرگەســوور ..... ڕەشماڵ ... سەوزەگیا .. )) دا ئاوەڵناوی (( سوور .. ڕەش ... سەوز .. )) بەشدارە .. بەپێچەوانەشەوە دەبینـین لـە پێکهێنانی ئاوەڵنـاوی داڕێـژراوی (( بێهۆش ... بەهۆش ... بەهێز ... جیهانی ... شەرمن ... زێڕین ... کرمـێ ... ژنانـە ... خێڵـەکی ... غـەمناك ... شـەڕانی ... نـازدار ... فێڵبـاز ... )) دا وشـەکانی (( هـۆش ... هـێز ... جیـهان ... شـەرم ... زێڕ ... کرم .. ژن .. خێـڵ ، غـەم ، شـەڕ ، ... نـاز .. فێـڵ .. )) ، کـە نـاون هاریکـارن .. یـاخود لـە دروسـت بوونـی ئاوەڵنـاوی لێکـدراوی (( دڵڕەق .. خۆشباوەڕ .. پیرەمێرد .. )) دا وشـەکانی (( دڵ ... بـاوەڕ ... مێرد ... )) کە ناون بەشدارن .. هتد ..

جیاوازیی ئەو دوو بەشە ئاخوتنە ـ ناو و ئاوەڵناو ـ شتێکی بنەڕەتییە. ئاوەڵناو بەپێی سروشتی سەربەخۆیی تەواوی نییە و هەمیشە مەبەستی ناو نیشـان دەدا . کـە لەگـەڵیدا هەڤاڵـە . ئاوەڵنـاو خـۆی نـاوی گیـاندارێك یـان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری ناکا ، بەڵکو چۆنیەتی و خاسیەت و نیشـانەیان ڕادەگەیـەنێ . بـە واتـایێکی دیکـە ـ دەتوانـین بڵێـین واتـای ڕاگەیاندنی جۆنیەتی و خاسیەت و نیشانەی ئاوەڵناو ، پەیوەندە بە نـاوی گیـاندارێك یـان بـێ گیـانێك یـان بـیرێك یـان کارێکـەوە ـ واتـە چۆنیـەتی و خاسیەت و نیشانە لە مەودای ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێکدا . لە ئاوەڵناودا هەمیشە خەیاڵ لەبارەی گیانداری یان بێگیـانی یـان بیر یان کارەوە هەیە . جا ئەمەیە کە یاریدەی ئەوە دەدا بـە ئاسـانی و بـە

ـمو نـی ئاوەڵنـاو بـەبێ نـاو بەکاربـهێنرێ . بەوێنـە ، کـە دەوتـرێ (( قەڵـەمێکم ـــەرێ ! ئـەوە نـا ، سـەوزەکە )) دیـارە مەبەسـت (( قەڵـەمی سـەوزە ))ە . ـ وەلنـاوی (( سـەوز )) واتـای شـتێکی ( سـەوز ) دەگەیـەنێ . خـاوەنی ئـەو خـسیەتە لـە سـەرپاکی ڕستەکەدا ئاشـکرا دەبێ . خـۆ ئەگـەر نیشـانەکە ـ سەوز ) ، بەبێ پێوەندی خاوەنەکەی ( قەڵەم ) بوترایە ، ئـەوە هیـچ ئاشکرا ـنەبوو .

ئەو جێناوانەی ئیشارەت بۆ ناوی گیانداریك یان بێگیانێك یان بیرێك یـان کـارێك دەکـەن ، هەمیشـە دەچنـە ڕیـزی دواوە ، چونکـە ناوەکـە خـاوەنی خاسیەتەکە ـ پتر مانا و مەبەستی وتراوەکـەی هـەڵگرتووە . نـاو بە ئاوەڵنـاو بـووە بـە دیـارخراو ـ (( قەڵـەمی سـەوز )) . ئەگـەر نـاو لـە ئـارادا نـەبێ ، ئاوەڵناوەکـە جێنـاوی نیشـانەکە دەردەخـا ( هـەروەك نموونەکـەی سـەرەوە ( ئەوە نا )) .

## ـ ئاوەڵناوی چۆنێتی الصفة الكيفية Qualitative adjective

ئاوەڵناوی چۆنێتی ئەو ئاوەڵناوەیە ، کە وا ڕاستەوخۆ واتـای چۆنێتـی و خاسیەت و نیشانە ڕادەگەیـەنێ . واتـای لێکسـیکی‌ی ئاوەڵنـاوی چۆنێتـی هەمەجۆرە : ڕەنگ نیشان دەدەن ( سپی ، سوور ، سەوز ، ئاڵ ، ڕەش .. ) ؛ خاسیەت ڕادەگەیەنن ( ترش ، سوێر ، گەرم ، قورس ، پتـەو ... ) ؛ جـۆری سـیفەت دەردەبڕن ( ڕەزیـل ، ڕووخـۆش .. ) ؛ شـێوەی مـرۆڤ و گیانلەبـەر دەخەنـە پێـش‌چـاو ( خـڕ ، قەڵـەو ، لاواز ، ڕووت ... ) ؛ چـەمکی دەوروبـەر دەردەبڕن ( ڕاست ، چەپ ، پان ... )و هەندێکی دی .

ئاوەڵنـاوی چۆنێتـی خـاوەنی ئـەو تایبەتی‌یە لێکسـیکی و ڕێزمانی‌یانـەی خوارەوەیە :

١ـ تواناى پێكهێنانى پلەى بەراورد و پلەى باڵاى هەيە ، وەك :

گران ـ گرانتر ـ گرانترين

قەڵەو ـ قەڵەوتر ـ قەڵەوترين

٢ـ دەشێ سادە يان دارێژراو يان لێكدراو بێ . وەك :

ا ـ سادە . وەك :

جوان ، ڕەش ، لەڕ ، سوور ، ترش ...

ب ـ دارێژراو :

* بە يارمەتيى پێشگر . وەك :

بێهۆش ، بەهێز ، نەخۆش ، ناخۆش ...

* بە يارمەتيى پاشگر . وەك :

دانا ، زانا ، لەرزۆك ، نازدار ، فێڵباز ، نەرمۆڵە ، پيسۆكە ...

ج ـ لێكدراو . وەك :

بالاعەرعەر ، ڕووڕەش ، خۆش باوەڕ ، پيرەمێرد ...

٣ـ دەلوێ زۆربەى ئاوەڵناوى چۆنێتى وەك ئاوەڵكردار بەكاربهێنرێ . بۆ نموونە :

زۆر ، كەم

... كاروانچييەكان زۆريان وت و ئەوان كەميان بيست .

( لە خەوما ، ل٣٢)

گورج و گۆڵ

هات و چۆيانە بە گورج و گۆڵى

بەڵام پێك نايە ئيش بۆ كلۆڵى :

( گۆران ، ل ١٣٦)

٤ـ بەشێكى زۆريان دەتوانن ببنە ناوى تايبەتى و نازناو . وەك :

شيرين ، نازدار .. بێكەس ، پيرەمێرد ...

قەدیٚ گولٚ و دەمی گولٚ ئەمەی کە قووتی جانە

لە باغی یاسەمیندا شکۆفەیی گۆڵانە

بەهاری بیٚخەزانە ، شیرین تەشی دەڕیٚسیٚ

(وەفایی ، ل ١٩٥)

بیٚکەس بوو وەك پاڵەوان

پەنجەی لە چاوی چەقان

(گۆران ، ل٨٤)

٥- بەشیٚکی کەمی ئاوەڵناوی چۆنیٚتی دەتوانیٚ دەوری ناو ببینیٚ . وەك :

نازداری جافان / نازدارانی جاف ،

گەورەی کورد ، جوانی لادیٚ ، زانای بەناوبانگ ...

ئای بۆ پەریخان نازداری جافان

ئاهووی زەرپاهووی عەنبەر کلافان

( پیرەمیٚرد ، ل١٢٤)

بۆچ پیٚم نانویٚنی ویٚنەی فۆتۆغراف

ویٚنەی شیرینی نازدارانی جاف

( پیرەمیٚرد ، ل١٢٤)

٦- هەندیٚ ئاوەڵناوی چۆنیٚتی دەتوانیٚ لە یەك کاتدا جیٚی خۆی و ناوەکەش بگریٚ . ئەمیش دوو جۆرە :

ا- پیٚشتر ناوەکە دەوتریٚ و جاری دووەم ناوتریٚتەوە . بەویٚنە لە لاپەڕە (٤٧)ی چیرۆکی (( لە خەوما ))دا باسی (( پیاویٚکی کوڵەبنە )) کراوە ، بەڵام لە لاپەڕە (٤٨)دا کە باسی هاتۆتەوە ، وشەی (( پیاو )) کە ناوە ، نەوتراوەتەوە نووسراوە : (( کوڵەبنەکە کە لای خوارەوە وەستابوو ، ئەویش هەڵیدایە ... )) .

ب - ئەگەرچی ناوەکە لە هیچ شویٚنیٚکدا نەوتراوە ، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەیە . وەك :

گەورە ئاو ئەڕیژێ و بچووك پێی تێئەخا .

( پەندی پێشینان ، ل٣٧٧)

گەورە قەدری خۆی بە خۆیەوەیە .

( پەندی پێشینان ، ل٣٧٧)

(( عەیبە .. عەیبە ... )) ئەی ڕەفیان ماڵی خەڵك وێران ئەکا

پیاو ئەخاتە سواڵ و سووکی ، گەورە سەرگەردان ئەکا

( بێکەس ، ل٨٨)

لە ناوەڕۆکدا دیارە ، مەبەست لە ((گەورە)) و ((بچووك)) پیاوی گەورە ؛ مرۆڤی گەورە ... پیاوی بچووك ، مرۆڤی بچووك ... ە .

ڕوونکردنەوەی تایبەتێتی لێکسیکی و ڕێزمانیی ئاوەڵناوی چۆنێتی جیاوازی لەگەڵ ئاوەڵناوی نیسبی نیشان دەدەن .بەڵام وەنەبێ هەموو ئاوەڵناوێکی چۆنێتی تێکڕای ئەو تایبەتێتییانەی تێدابێ ، کە لێیان دواین . هۆی ئەو جیاوازییەش بەندە بە کات و سەردەمی پەیدابوونی ئەو ئاوەڵناوە لە زماندا یان بەندە بە واتا و پێکهاتنی ڕێزمانی و شێوازی بەکارهێنانییەوە .

ئەو ئاوەڵناوی چۆنێتییانەی ، کە دەلالەت لە شتێك دەکەن و زۆری و کەمییان نییە ، پلەی بەراورد پێکناهێنن . وەك : کوێر ، شەل ... ئەگەرچی هەندێکیان بە ئاشکرا نیشانەی ( تر ، ترین ) وەردەگرن ، بەڵام لە ڕووی مەنتیقەوە (( کوێر )) هەر (( کوێر ))ە وئیدی ((کوێرتر ، کوێرترین)) زیادە .

بەم چەشنە ئەو تایبەتێتییە لێکسیکی و ڕێزمانییانەی ئاوەڵناوی چۆنێتی ، کە نیشانمان دان تا ڕادەیێك گشتین و دەتوانن ببنە بەڵگە بۆ جیاکردنەوەی ئاوەڵناوی چۆنێتی لە ئاوەڵناوی نیسبی .

ئاوەڵناوی چۆنێتی لە ڕووی پێکهاتنی فۆنەتیکییەوە لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا چەند جۆرێکی هەیە :

ـ بەشێکی زۆریان بە تەواوی وێک دەچن و هیچ جیاوازییێک لە
...ـدا نییە . وەك :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| چاك | چاك |
| باش | باش |
| درێژ | درێژ |
| سپی | سپی |
| ڕەش | ڕەش |
| پیر | پیر |

... هتد

٢ـ هەندێکیان جیاوازی لە نێوان بەشێك لە فۆنێمەکانیاندا هەیە ، بەڵام
...وەنی یەك ڕەگن . بۆ نموونە :

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|
| تاڵ | تێل |
| سوور | سۆر |
| هەرزان | ئەرزان |
| وشك | هشك |
| هەژار | ژار |
| سارد | سار |
| زەرد | زەر |
| نوێ | نوو |
| کوێر | کۆر |

...هتد .

٣ـ دەستەیەکیان خاوەنی ڕەگی جیاوازن .. بەوێنە:

| کرمانجیی خواروو | کرمانجیی ژووروو |
| --- | --- |
| هەژار | بەلەنگاز ، کەسیب |
| ئازا | عەگید ، فێرز ، جندی |

... هتد ..

## ـ ئاوەڵناوی دارێژراو  الصفة المشتقة  Derivational adjective

بـ . : وشەی دارێژراو

لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوی دارێژراو بە یارمەتیی پێشگر و پاشگر ساز دەبێ . بۆ ڕۆنانی ئاوەڵناوی دارێژراو هەندێ پێشگر و پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار)ی سادە و دەیانکەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

أـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیکەنە ئاوەڵناوی دارێژراو :

* پێشگر

١ـ( بێ ـ ) : بێهۆش ، بێهێز . . . ٢ـ ( بە ـ ) : بەهێز ، بەجەرگ ..

* پاشگر

١ـ ( ـ ی) : جیهانی ، هەولێری .. ٢ـ ( ـ ن in ـ ) : ورگن ، گۆشتن ...

٣ـ ( ـ ین) : زێرین ، ئاگرین .. ٤ ـ ( ـ ەکی) : خێڵەکی ، دەشتەکی . . .

٥ـ ( ـ اك) : غەمناك ، ترسناك ... ٦ـ ( ـ انە ) : ژنانە ، پیاوانە ...

... هتد .

ب ـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و ئاوەڵناوی دارێژراوی لێ دروست دەکەن :

* پێشگر

١ـ(نه ـ) : نەخۆش ، نەساخ ... ٢ـ(نا ـ) : ناڕێك ، ناپاك ...

* پاشگر

١ـ( ـ انی) : تەختانی ، ڕەقانی .. ٢ـ( ـ اك ) : ڕووناك ...

٣ـ( ـ کەلە) : سوورکەلە ، جوانکەلە ... ٤ـ ( ـ ەڵە) : نەرمەڵە ، سەوزەڵە ... هتد .

جـ ـ ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەچنە سەر ڕەگ و قەدی کردار و ناوی چاوگ و دەیکەنە ئاوەڵناوی داڕێژراو :

* پێشگر

١ـ ( نە ـ ) :نەمر ، نەبەز ... ٢ـ (بـ ـ ) : بوێر ، بنووس ...

* پاشگر

١ـ( ـ ۆك ) : لەرزۆك گەڕۆك .. ٢( ـ ار ) : دیار ..

٣ـ ( ـ ا) : زانا ، توانا ... ٤ـ( ـ وو) : مردوو ، نوستوو ...

... هتد .

بۆ سەر ئاوەڵکرداری سادە :

* پاشگر

١ـ ( ـ ەکی) : سەرەکی ، پێشەکی ... ٢ـ ( ـ وو) : سەروو ، خواروو ..

٣ـ( ـ ین ) : بەرین ...

... هتد .

## ـ ئاوەڵناوی سادە الصفة البسيطة Simple adjective

بـ . : وشەی سادە

وەك : شین ، مۆر ، جوان ، پاك ، خڕ ، درێژ ، گران ، ترش ، سوێر ، ڕووت ، لەڕ ...

## ـ ئاوەڵناوی لێكدراو          الصفة المركبة          Compound adjective

ب .: وشەی لێكدراو

لە زمانی كوردیدا ئاوەڵناوی لێكدراو دەكرێ پێكهاتبێ لە :

١ـ دوو ناو   وەك :

گەردن + بلوور = كەردن بلوور

بالاّ + عەرعەر + بالاّعەرعەر

... هتد

٢ـ ناو + ئاوەڵناو . وەك :

ڕوو + ڕەش =.ڕووڕەش

بالاّ + بەرز = بالاّبەرز

... هتد .

٣ـ دوو ناو بە یاریدەی ناوبەندی (بە)

لێو + بە + بار = لێوبەبار

ڕوو + بە - خاڵ = ڕووبەخاڵ

... هتد .

٤ـ ئاوەڵناو + ناو . وەك :

خۆش + باوەڕ = خۆش باوەڕ

پڕ + سوود = پڕسوود

... هتد

٥ـ ناو + ڕەگی كردار . وەك :

دەست + بڕ = دەست بڕ

پیاو + كوژ = پیاوكوژ

...هتد .

٦ـ ئاوەڵناو + ڕەگی كردار . وەك :

ڕەش + پۆش = ڕەش پۆش

ڕاست + گۆ = ڕاست گۆ

... هتد .

٧ـ ژمارە + ناو . وەك :

دوو + دڵ = دوودڵ

چوار + چاو = چوارچاو

... هتد .

و گەلێ حاڵەتی دی .

## ـ ئاوەڵناوی نادیار الصفة المبهمة Indefintite adjective

ئاوەڵناوی نادیار ئەو جۆرە ئاوەڵناوەیە ، کەوا دەلالەت لەسەر شتێکی دیاری کراو ناکا و واتای کەوتووەتە چوارچێوەی عەهدێکەوە .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ئاوەڵناوی نادیار هەیە .

یەك ـ ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوە . وەك :

تر ، کە ، دی ، دیکە ، دن ...

ئەم کۆمەڵە وشەیە ، کە تێکڕایان واتای ( Other)ی ئینگلیزی و (اخر)ی عەرەبی دەگەیەنن ، ئاوەڵناوی نادیاری جیاکەرەوەن و بەتایبەتی لە دۆخی ئیزافەدا دەبینرێن و دەوری دیارخەر دەبینن و بەدوا دیارخراودا دێن . دەشێ سەرپاکیان لە رستەدا لە جێی یەکتر بەکاربهێنرێن و بە یەکدی بگۆڕدرێنەوە .

ئاوەڵناوی ( تر ) :

ئاوەڵناوی ( تر ) تەنیا لە ناوچەی سلێمانی و کەمێ بەشە دیالێکیتی کرمانجیی خواروودا بەکاردێنرێ .

چەند نموونەیێك :

**تا ئەسیری داوی تۆم ڕەحمێ بە حاڵم کە تو خوا**

**مودەییێکی تر لە دەستت ڕادەبوورم دەرفەتە**

**( کوردی ، ل٦٧)**

**هەر ئەوەندەم زانی یەکێکی تریان لە پشتەوە زرموهوڕ دامیە بەر پێلەقە ... ئەوی تریشیان لێم هاتە پێشەوە بە پاڵەپەستۆ بە هەرسێکان دایان‌گرتم ...**

**( لە خەوما ، ل٣٨)**

**با ڕەنگیان پەرداخت بێ و جێگەیان سەرچڵ بێ ،**

**بە واتەی خەڵکی تر با ناویان شاگول بێ**

**( گۆران ، ل٤٥)**

**دەزگا و دوکانی شارەکان دادەنرێ**

**ئەمیان دەفرۆشیت ئەوی تر دەکڕی**

**( کۆیی ، ل٣٠)**

**... هتد .**

**ئاوەڵناوی ( کە ) :**

**ئاوەڵناوی ( کە ) کورتکراوەی ( دیکە = دی + کە )یە و هەر لە ناوچەی سلێمانی و چەند شوێنێکی کەمی دی بەرچاو دەکەوێ . ئەگەرچی هەندێ لە نووسەرانی ڕێزمانی کوردی لەو ڕایەدان ، کە ئاوەڵناوی ( کە ) تازە پەیدابووە و کەم بەکاردێنرێ ، بەڵام کەرەستەی بەردەست ئەو ڕایە ڕەت دەکاتەوە . ئەوەتە لە خوێندنەوەی سەرپاکی شیعرەکانی نالیدا ، گەیشتینە ئەو ئەنجامە کە نالی لە شیعرەکانیدا نەك هەر ( کە )ی زۆر وتووە ، بەڵکو لە ( تر ) و ( دی ) و ( دیکە ) ... شی زیاتر بەکارهێناوە .**

بە نموونە :

حۆری ئەوا بە مونتەظیری دێتە مەنظەرە

لایێکی کەش لە جەننەت و ڕیضوان تەدارەکە

( نالی ، ل٤٤٢)

هەر دەمە فەرشی کەسێکی کەیە بێ مەهر و نیکاح

دوورە لە چاکانی ، عەجەب فاحیشە دنیاییێکە !

( نالی ، ل٤٦٣)

... هتد .

ئاوەڵناوی ( دی ) :

(دی) کورتکراوەی ( دیکە )یە . هەرچەندە نووسەران ڕاستن لەوەدا ، کە ئەم وشەیەیان داوەتە شێوەی موکری ، بەڵام دەبێ ئەوەش لەیادنەکەین ، کە لە زوربەی دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا بەکاردێنرێ .

چەند نموونەیێك :

خونکار جوابی نووسیوە : (( مانگێکی دی لەشکری دەگاتێ )) .

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ١٨١)

ئەوی دی نازانم چییە ...

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ل٣٧٢)

برایم لەکن میرحەجی بەجێما ، هەتتا ساڵێکی دی ؛ زستانیان بەسەردا هات .

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ٣٧٣)

ڕەقیب و موددەعی هەردوو لە خەودان

هەتا چەن ساعەتێکی دی نەما باس

( نالی ، ل٢٣٣)

.. شەقا دی ڕەنگەکی دێ جلکا لبەر خوە کر و خولێك دا و چو سەر بالی

( خالید حسەین ، ل٦٢)

جارەکا دێ ژن باب بگری ڤەهاتە خواریٚ و چۆ نك مێریٚ خوە ...

( خالید حسەین ، ل٢٧)

... هتد

ئاوەڵناوی ( دیکە ) :

( دیکە ) کە لە زمانی فارسیدا لە شێوەی ( دیگر )دا دەبینریٚ ، هەر لە شێوەی موکریان و چەند شوێنێکی کەمی دیدا بەکاردەبریٚ .

چەند نموونەیێك :

... کابرا زۆر مات بوو ، هیچ کاسبی دیکەی نەدەزانی ...

( تحفەء مظفرية ، ب١ ، ١٨٧)

لە لایەکی تەکیەیە ، لە تەرەفی دیکەیان خانەقا ڕۆنانە

( تحفەء مظفرية ، ب١ ، ل٣٠١)

لە لایەکی دە ملێی شەکر و شەربەت و ، لە لای دیکە نوغل و نەباتی

( تحفەء مظفرية ، ب١ ، ٣٧٦)

... هتد .

ئاوەڵناوی ( دن ) :

ئاوەڵناوی ( دن ) لە هەندیٚ بەشە دیالێکتی ژووروودا بەتایبەتی لە زمانی کوردەکانی سۆڤیەتدا لە کاردایە . وەك :

پادشا گۆت : (( حەلالی و ڕاست گۆییا تە عەیان بوو ، تە خوەست قەنجییێ بکی ، لیٚ تشتەکی دن قەومی ، گونیٚ تە تونە ، ئەز نکارم تە بکوژم .. ))

( کوردۆ ، ل٤٠)

دوو ـ ئاوەڵناوی نادیاری دیاری کردن . وەك :

وا ، ئاوا

وەها ، ئاوەها ، وەهە

ئەوها ، ئاوها

وەسا ، وسا ، وسان

ئەم چەند وشەیە ، کە سەرپاکیان بەمانای (Such)ی ئینگلیزی دێـن ، ئاوەڵنـاوی نادیـاری دیـاری کردنـن و هـەروەك (( تـر ، کـە ، دی ، دیکـە ، ـن ...)) بە زۆری لە دۆخی ئیزافەدا دەبینرێن و دەوری دیارخـەر دەبینـن و بەدوا دیارخراودا دێن . دەلوێ تێکڕایان لەجێی یەکتر بەکاربـهێنرێن و بـە یەکدی بگۆڕدرێنەوە .

( وا ) و ( ئـەوها ) لـە هـەردوو دیـالێکتی سـەرەکیی کوردیـدا ـ واتـە لـە کرمانجیی ژووروو و خوارووا ـ بەکاردێنرێن .

( وەها ) و ( ئاوەها ) و ( ئاوها ) هەر لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووا لە کاردایە .

( وەهـە ) و ( وەسـا ) و ( وسـا ) و ( وسـان )یـش سـەر بـە دیـالێکتی کرمانجیی ژوورروون .

چەند نموونەیێك :

لـە خۆمـەوە .. دەسـتم کـرد بـە قاقـای پێکـەنین ، پێکـەنینێکی وا کـە لەودیوەوە هەموو ڕاچڵەکین

( لە خەوما ، ل ٧١ـ٧٢)

پیاوێ بوو ئەما ، زۆر تەواو پیاو بوو

خاوەن کردار و مەوقیع و ناو بوو

پیاوی وا نامرێ ، دیارە ئەمێنێ

لەناو عالەما بەرز و ناسراو بوو

( بێکەس ، ل١٤٣)

.. قسێکی وا پەیدابوو لە مەنزڵی کاکم .

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ل٢٨٧)

بە نووری بادە کەشفی ظوڵمەتی تەقوا نەکەم ، چبکەم !

بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم ، چبکەم !

( مەحوی ، ل٢٣٠)

## ـ ئاوەڵناوی نیسبی      الصفة النسبية      Relative adjective

ئاوەڵناوی نیسبی ئەو جۆرە ئاوەڵناوەیە ، کەوا ڕاستەوخۆ دەلالەتی شتێك ڕاناگەیەنێ ، بەڵکو لە ڕێگای پێوەندییەوە بەشتی دییەوە واتا دەدات ـ واتە بەهۆی پێوەندی بە دیاردەیەکەوە یان ڕووداوێکەوە دەردەکەوێ

جیاوازیی دیاری مۆرفۆلۆژیی نێوان ئاوەڵناوی چۆنێتی و ئاوەڵناوی نیسبی لە زمانی کوردیدا ئەوەیە ، کە ئاوەڵناوی نیسبی لە ڕووی پێکهاتنەوە تێکڕا ناسادەیە ، هەرچی ئاوەڵناوی چۆنێتییە بە زۆری سادەیە .. لە زمانی کوردیدا هەندێ پاشگر و پێشگر هەن یارمەتیی ڕۆنانی ئاوەڵناوی نیسبی دەدەن ، کە لە ناویاندا هەندێ پاشگر ، وەك ( ـ ی ، ـ ین . . . ) ؛ ( ـ نە ، ـ ەکی ، ـ ە . . . ) پتر دیار و چالاکن .

چەند نموونەیێك :

( ـ ی ) :

کوردی ، کرمانجی ، عێراقی ، کێوی ، پۆلایی ، شیری ، زستانی . . .

( ـ ین ) :

زێڕین ، ئاسنین ، بەردین ، پۆلایین ، دارین ..

( ـ انە ) :

پیاوانە ، ژنانە ، ئازایانە ، مەردانە . . .

( ـ ەكی) :

دەشتەكی ، خێڵەكی ...

( ـ ە ) :

بەهارە ، زستانە ، هاوینە ...

... هتد .

مانای گشتیی لێكسیكی ئاوەڵناوی نیسبی ناگۆڕێ و دەشێ وەك (( پێوەندی بەرانبەر شتێك )) یان (( خاسیەت بۆ شتێك )) دیاری بكرێ . ئەم بارودۆخە یارمەتی گۆڕینی ئاوەڵناوی نیسبی دەدا بە ناو ـ واتە ئەو ناوەی ئاوەڵناوەكەی لێ دروست كراوە . بەوێنە :

قاپی زێڕین ـ قاپی زێر

گوڵی بەهارە ـ گوڵی بەهار

... هتد .

لە زمانی كوردیدا هەر ناوێك تاك بێ یان كۆ ، ئەگەر لە دۆخی ئیزافەدا دەوری دیارخەری بینیبێ ، ئەوە ئەركی ئاوەڵناوی نیسبی بەجێدێنێ و دەتوانێ واتای پێوەندی بە كەسێكەوە نیشان بدا (( شیری دایك ، باغچەی منداڵان ... )) ؛ مانای پێوەندی بە ڕووداوێكەوە دەربڕێ (( داسی دروێنە ، دەرزیی دروومان ... )) پێوەندی بەكات و شوێنەوە ڕادەگەیەنێ (( بارانی بەهار ، ڕەشەبای هاوین ، چیای كوردستان ، ڕێگای كوێستان ... )) ؛ پێوەندی بە واتای تەجریدەوە دەخاتە بەرچاو (( دووكانی هەلاجی ، هێزی برایەتی ... )) ... هتد

لە زۆر زماندا ئاوەڵناوی نیسبی ، وەك دەستوور پلەی بەراورد و پلەی باڵای لێپەیدا نابێ و نابێتە ئاوەڵكردار .

لە زمانی كوردیی ئەمڕۆدا ئاوەڵناوی چۆنێتی و نیسبی دوو كۆمەڵی تەواو لەیەكتر دابڕاو نین و سنووری ڕێزمانی لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕی بەسەردا

دێت ، لەبەر ئەوەی خاسیەتی سیمانتیکی ڕێگە بە جیاکردنەوەی گروپێك لە گروپێکی دی دەدا و مەودای گۆڕان پەیدا دەبێ .

لە واتای زوربەی ئاوەڵناوی نیسبیدا ڕەنگی چۆنیەتی هەیە ، کە وا لە ئەنجامی هەندێ هۆی دیاریکراودا ، گەشەدەکا بۆ بوون بە واتایێکی سەربەخۆ . بۆ نموونە : ئاوەڵناوی نیسبی (( ئاسنین ، ژنانە ... و گەلێکی دی )) چۆن دەتوانرێ بە واتای بنەڕەتیی خۆی ، کە ئاوەڵناوی نیسبییە بەکاربهێنرێ (( ڕێگای ئاسنین ، جلی ژنانە ... )) ، هەروەها بەو چەشنە دەشێ بەواتای ئاوەڵناوی چۆنێتییش بەکاربهێنرێ : (( سەری ئاسنین ؛ ڕەوشتی ژنانە ... )) .

ئاوەڵناوی نیسبی کە دەبێتە ئاوەڵناوی چۆنێتی ، هەندێ جار خاسیەتی مۆرفۆلۆژیی ئاوەڵناوی چۆنێتی وەردەگرێ . بەوێنە کەمێکیان دەتوانن نیشانەی پلەی بەراورد و پلەی بالاَ وەربگرن و پچێکیشیان دەشێ ببنە ئاوەڵکردار .

هەندێ ئاوەڵناوی نیسبی لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی بە واتای ئاوەڵناوی چۆنێتی ، واتای زووی ون دەکا و دێتە ڕیزی ئاوەڵناوی چۆنێتییەوە

- ئاوەڵواتا

ب . : میتافۆر

- ئاوسترالۆپیتیك — Australis Pithekos

ب . : مەیموونی سەرەتایی

ئاوێتە — خلیط — Mixed

Peation التفاعل ـ پێکەبوون

Melody اللحن ـ ئاهەنگ

Function الوظيفة ئەرك

Functions of language وظائف اللغة ـ ئەركەكانی زمان

مەبەست لە ئەركەكانی زمان ئەو كارانەن ، كە مرۆڤ بە هۆی زمانەوە لە كۆمەڵدا جێبەجێیان دەكات . ئەم كارانەش هێندە زۆر و ئاڵۆز و وردن ، هەروا بە ئاسانی جیاناكرێنەوە و هەرچەندێكیش هەوڵبدرێ ، كەلێن هەر دەكەوێتەوە دابەشكردنەكەوە ... بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەشدا زۆربەی زمانەوانەكان ، لەسەر ئەم حەوت ئەركەی خوارەوە كۆكن :

١ـ هەواڵگەیاندن ؛ ٢ ـ پرسیاركردن ؛ ٣ ـ هەست دەربڕین ؛ ٤ ـ وروژاندن ؛ ٥ ـ فەرمان كردن ؛ ٦ ـ راپەڕاندن ؛ ٧ ـ جێخۆش كردن .

زانیاری یان هەواڵگەیاندن بە ئەركێكی هەرە سەرەكیی زمان دەژمێررێ ... مرۆڤ بە هۆی ئەو بەكارهێنانەی زمانەوە ، لە دەورووبەری خۆی و دیاردەكانی دەوروپشتی دەدوێ . هەواڵگەیاندن پێوەندی بە زانین و هۆشی مرۆڤەوە هەیە و لەبەر ئەمەیە لە هەموو بەشەكانی زانستیدا ئەم بەكارهێنانە زۆرە . ئاخێوەر لە دەربڕینی زانیاری یان گەیاندنی هەواڵدا دەیەوێ بوون و نەبوون ، یان ڕاستی و ناڕاستیی دیاردەكان نیشان بدا و ، هەر لەبەر ئەمەشە ، ئەو ڕستەیەی هەواڵگەیەنە ، دەبێت لە هەڵكەوتدا یان ڕاست بێ ، یان هەڵە . بە واتایێكی دی ، دەبێ لەو جۆرانە بێ ، كە بتوانێ یان ڕاستییەكە بسەلمێنێ ، یان ڕەتی بكاتەوە . وەك :

١ ـ هەنگوین شیرینە .

٢ ـ هەنگوین تاڵە .

کەواتە مەرج نییە هەموو گوتنێکی هەواڵگەیەن ڕاست بێ ( ئەوەتە ڕستەی دووەم ـ ناسەلمێنرێ ... جا لەمەدا ڕستەی هەواڵ یان هەواڵگەیەن لە ڕستەی پرسیار ( ئێوە بۆ کوێ دەچن ؟ ) و فەرمان ( باش بخوێنە ) و سەرسوڕمان (ئای چەند نازدارە !) جیایە ... ئەم جۆرە ڕستانە : ( پرسیار ، فەرمان ، سەرسوڕمان ) نە ڕاستن و نە درۆ ... ڕاستی و ناڕاستی تەنیا لە ڕستەی هەواڵگەیەندا سەرهەڵدەدات .

مەبەست لە پرسیار دەستخستنی زانیارییە ، بە واتای ئەوەی بە هۆی پرسیارکردنەوە ، قسەکەر دەتوانێ کەلێنێك یان چەند کەلێنێك لە زانیاریی خۆی بەرانبەر دیاردەیێك پڕبکاتەوە . لەمەدا پرسیارکردن پێچەوانەی هەواڵگەیاندن دەوەستێ، چونکە ڕستەی هەواڵگەیاندن زانیاری دەگەیەنێ ، یان بلاوی‌دەکاتەوە و سەرچاوەی زانیارییەکەش قسەکەرە ... هەرچی لە ڕستەی پرسیاردایە پرسیارکەر ، گوێگر یان خوێنەر بە سەرچاوەی ئەو زانیارییە دادەنێ ، کە لای ئەم دەست ناکەوێ . بۆ نموونە ، کاتێ پرسیارکەر، ئەم پرسیارانە لە گوێگر / خوێنەر دەکا ، کە خۆی وەلامیان نەزانێ :

- ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا ؟
- کەی ئازاد دەڕوا ؟

لە سەرێکی دییەوە ، ڕستەی هەواڵگەیەن و ڕستەی پرسیارکردن وێکدەچن ، چونکە هەردووکیان لە بارەی (زانین)ی هۆشەوەن . هەرچەندە ڕستەی هەواڵگەیەن ، وەك لە سەرەوە نیشانمان دا ، دەربارەی ئەو زانیارییەیە ، کە لای قسەکەرە و ڕستەی پرسیاریش بەپێچەوانەوە ، لەو زانیارییە دەدوێ ، کە لای گوێگر / خوێنەر دەستدەکەوێ . ڕستەی هەواڵگەیەن و پرسیار لەبەر ئەوەی هەردووکیان دەربارەی زانین و زانیارین ، بۆیە بە شێوەیێکی گشتی بەتەواوکەری یەکدی دادەنرێن و بە هەردووکیان جووتێك پێکدێنن .

کاتێ ڕستە یان گوتن بۆ هەست دەربڕین بەکاردێ ـ واتە دەمێ هەست و ـ ڕمزوو و باوەڕی قسەکەر بەرانبەر دیاردەکانی دەوروبەری دەردەخات ، ـادەترین جۆری هەست دەربڕین لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ ، کە ئەویش ـوونی سەرسوڕمانە . وەك :

ئەلحەق زۆر نازدارە !

چاك سەری‌کردووەتە سەر خوێندن !

ئای کە بێ‌فەرە !

کاتێ زمان بە ئەرکی وروژاندن بەکاردێ ، هەست و ئارەزوویێکی تایبەتی لای گوێگر / خوێنەر پەیدا دەکا . بە واتای ئەوەی گوێگر دەوروژێنێ ؛ دڵی خۆش دەکا ؛ ڕایدەپەڕێنێ ؛ هەڵی‌دەدا ... ئەم بەکارهێنانەی زمان ، بە زۆری لە نوکتەگێڕانەوە و پروپاگندە و تراژیدیدا دەردەکەوێ . ئەو گوتنەی دایك ساواکەی پێ ژێردەکاتەوە و ئەو گوتنەی لاوێك یارەکەی پێ دڵخۆش دەکا و ئەو گوتنەی وتاربێژێکی ڕامیاری یان دینی خەڵکی پێ دەوروژێنێ ... ئەمانە هەموو نموونەن دەربارەی بەکارهێنانی زمان بە مەبەستی وروژاندن یان بزواندن و هەژاندن و دڵخۆشکردنی گوێگر و خوێنەر .

دەمێ زمان بۆ فەرماندان بەکاردەبرێ ، کە قسەکەر بیەوێ کارێك بە گوێگر ڕاپەڕێنێ . ئەرکی فەرماندان لەوەدا لە وروژاندن جیادەبێتەوە ، کە تێیدا قسەکەر دەیەوێ گوێگر کارێك جێ‌بەجێ‌بکات ، نەك هەستێکی تێدا پەیدا بێت ، یان هەڵوێستێکی دیاری‌کراوی تێدا دروست‌بکا . سادەترین فەرمان لە شێوەی داخوازیدایە . وەك :

چۆڕێ ئاوم بدەرێ .

ئەمشەو سەرێکمان لێ بدە .

ئەرکی ڕاپەڕاندن لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ ، کە خۆیان بریتین لە ڕاپەڕاندنی کارێك . بە واتای ئەوەی لە جیاتی ئەوەی قسەکەر کارێك بە گوێگر ڕاپەڕێنێ . خۆی کارەکە بەجێ‌دێنێ و گوتنەکەشی ڕاپەڕاندنی

کارەکەیە . بۆ نموونە ، کە مەلاییێك لە کاتی ناونانی منداڵێکدا دەڵێ ، ئ
ئەم منداڵەمان ناونا (ئاسۆ) ، ئەوا گوتنەکە خۆی ڕاپەڕاندنی کارەکەیە ، ک
بریتییە لە ناونانی منداڵەکە . دەربارەی ئەم ئەرکەی زمان حاڵەتی دی زۆرە
وەك :

بەڵێن دەدەم ئەو کارەت بۆ بکەم .

سوێند دەخۆم ڕاست بڵێم .

گرەو دەکەم دەرناچێت .

دوا ئەرکی زمان ـ ئەرکی جێخۆشکردن ، لەو ئەرکانەیە کە زۆر بڵاوە و لە هەموو زمانێکی سروشتیدا هەست بە بوونی دەکرێ . ئەم ئەرکە ( کە دەشتوانین پێی بڵێین ئەرکی کۆمەڵایەتیی زمان ) پتر لەو گوتنانەدا دەردەکەوێ ، کە ڕۆژانە بەکاردێ و بەسەر زاری هەموو کەسێکەوەیە بۆ مەبەستی ئاگاداری لە بار و سەربردەی یەکتر و یەکدی دوان و ڕێز و حورمەتنان ... وەك : سڵاوکردن و خواحافیزی و پرسینەوە و لە خۆشی و ناخۆشی ...

ـ ئەرکی ڕێزمانی    الوضيفة القواعدية    Grammar function

ئەرك گۆڕی    التبادل الوظيفي    Function change

ئەرێ    الأثبات ، المثبت    Affirmative

شێوازی ئەرێ ڕوودانی کردار و بوونی شتێك ؛ یان بارێك باسدەکات ، کە دەشێت باسەکە ڕاست بێت ، یان درۆ . وەك :

ئازاد سێو دەخوات .

هەنارەکە ترشە

...هتد .

هـ . ، ب . : ڕستەی ئەرێ

ستوونی العمودي Vertical

ئەلەفۆن الألفون ، نمط الفونيم(عضو الوحدة الصوتية) Allophone
- شێوەی فۆنێم

بە چەند دەنگێك كە لە یەك فۆنێمدا كۆدەبنەوە ( واتە ـ دەربڕینی یەك فۆنیم بە چەند جۆرێك ) دەوترێ ئەلەفۆن ( شێوەی فۆنێم ) . لەبەر ئەوەی ئەلەفۆن لە ئاخاوتندا ناتوانێ دەوری گۆڕین و جیاكردنەوەی مانای وشە ببینێ ، بۆیەكا زۆر سەرنجی قسەكەر و گوێگر ڕاناكێشێ .

بەشێك لە ئەلەفۆن ، ئەوانەن كە بەتایبەتی بە شێوە و جۆری وتنی كەسانی جیاوازەوە بەستراون . یاخود هەر یەك كەس ، بەڵام بە گوێرەی شوێن و پێویست تەلەفوزی خۆی دەگۆڕێ . بەوێنە ( ا ) دەتوانرێ بەرز یا نزم ؛ درێژ یا كورت بوترێت . یاخود دەبینین هەموو كەس وەك یەك دەنگی (ش) دەرنابڕن . جگە لەوە ئەم جۆرە ئەلەفۆنانەی فۆنێم لە زمانی كوردیدا بە هۆی بوونی دیالێكت و بەشە دیالێكتی جیاوازەوە زۆر بەر گوێ دەكەون . بۆ نموونە ، لە شێوەی هەوراماندا بەر گوێ دەكەوێ ، كە دەنگی ( س ) وەك (ث) و ، دەنگی (ز) وەك (ذ) تەلەفوزدەكرێ . ناوچەی كۆیە و خۆشناوەتی و دزەییاتی و گەردییایەتی (ڵ) دەكەن بە (ر) ، شاری هەولێر دەیكا بە (ل) . لە شاری سلێمانی وشەی (دەربەند) دەكرێ بە (دەربەنگ) . بەڵام ئەمانە هیچیان مانای وشە ناگۆڕن و فۆنێم نین . ئەو جۆرە شێوەیەی فۆنێم ، پێی دەوترێ شێوەی فۆنێمی تایبەتی

بەشێكی دیكە لە ئەلەفۆن ، ئەوانەن كە بە هۆی جێگە و شوێن و كاركردنی دەنگی ترەوە ، شێوەی دەنگێكی تایبەتییان وەرگرتووە و هەمیشە بەو جۆرە دەوترێن . بەوێنە (گ ، ك) لە پێش (ی ، ێ ، وی ، وێ)دا دەگۆڕێن . شێوەی دەربڕینیان وەك (چ) یاخود (ج)ی لێدێت ، واتە ـ (گ) و

(ك) له حاڵەتی ئاساییدا له بنی ئەوکەوه تەلەفوز دەکرێن ، بەلآم له حاڵەتی دووەمدا زمان نزیك مەلآشوو دەبێتەوه .

هەروەها ( ت ) کاتێ دەکەوێتە پێش بزوێنەوه بە تەوژمێکی بەهێز دەردەبڕرێت ، وەك ( تا ، تە ، تۆ ...) ، بەلآم کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوه تەوژمی لاواز دەبێت ، وەك ( پەت ، ڕەت ، جووت ...) . لە زانستی زماندا بەم جۆره ئەلەفۆنە دەڵێن : شێوەی فۆنێمی پەیوەند ـ Dependent (conditioned) Allophone

| ئەلفوبێ | الألفباء ، الأبجدية | Alphabet |
|---|---|---|
| ـ ئەلفوبێی دەستی | الألفبائية اليدوية | Daktylos |

ئەلفوبێی دەستی لەسەر بناغەی وێنەکردنی دەنگ بە یارمەتیی پەنجە دامەزراوه لەگەڵ نیشانەکانی پەنجەدا ئیشارەتیش هەیە ، کە نیشانەی جیاکردنەوەی هاوجووتی و هاوشانیی دەنگ دەدا . بۆ نموونه دەست لەسەر سنگ دانان نیشانەی دەنگی ئاوازەداره ؛ دەست لەسەر سنگ لابردن نیشانەی دەنگی کپە ... ئەم جۆره ئەلفوبێیانه بۆ ئەوه سازکراوه تا له کەڵك وەرگرتنی زماندا یاریدەدەری کەسانی کەڕ و بێچاویان پێبدرێ ... بەوێنه ، ئەو نووسینەی لوون برایل بۆ کوێرانی داناوه ، پیتەکانی به یاریدەی شەش خاڵ پێکهاتووه .

لوون برایل (پاریس ١٨٠٩ ـ ١٨٥٢) ـ مامۆستایێکی گەورەی فێرکەری کوێران بوو خۆی له تەمەنی سێ ساڵیدا کوێربووه . ساڵی ١٨٢٩ پیتی بۆ کوێران سازکردووه ، کە تا ئەمڕۆش له گشت جیهاندا بەکاردێنرێ . یەکەم کتێب ، کە بە سیستەمی برایل چاپ کرابێ ـ (( مێژووی فەرەنسا ))

١٨٣٧)يه . له ڕووسياش ساڵی ١٨٨٥ بەم پيتانە دەست كرا بە چاپكردنی كتێب .

ب . : پيتی برايل

## ئەلۆمۆرف الالومورف (عضو الوحدة الصرفية) Allomorph

ئەلۆمۆرف بەو شێوە جياجيايانەی مۆرفێمێك دەوترێ ، كە لە جغز و چوارچێوەی ديدا ئەرك و دەوری مۆرفێم دەبينن ... بەوێنە ( ـ ەكە )ی ناسياوی بە چەشنی جۆراوجۆر بەرچاودەكەوێ : ( ـ ەكە ) ؛ ( ـ يەكە ) ؛ ( ـ ێكە ) ؛ ( ـ ۆكە ) ؛ ( ـ ەك ) :

( ـ ەكە ) : كوڕەكە

( ـ كە ) : براكە

( ـ يەكە ) : برايەكە

( ـ ێكە ) : كانێكە

( ـ ۆكە ) : خانۆكە

( ـ ەك ) : كوڕەكان

لەبەر ئەوەی تێكڕای ئەم شێوانە لە ڕووی فۆنەتيكەوە لە يەكدی دەچن و سەرجەميشيان هەمان ئەرك دەبينن و شێوەكانيشيان بەپێی ياسا گۆڕراون ، دەشێ بە سەرپاكی ئەمانە بوترێ ئەلۆمۆرفی ( ـ ەكە ) .

هەروەها مۆرفێمی ( ـ ان )ی كۆ ، كە لە شێوەی ( ـ يان)يشدا دەبينرێ . ياخود فۆرمی ( ـ ات ) و ( ـ هات ) و ( ـ جات ) و ( ـ وات ) ، كە هەمان ئەرك دەبينن ... جگە لەمانەش مۆرفێمی ( ـ گەل ) لەگەڵ هەندێ وشەدا ناو كۆدەكاتەوە :

١ ـ ( ـ ان ) : كچان ، كوڕان

( ـ يان ) : برايان ، مەلايان

٢ ـ ( ـ هات ) : ميوەهات ، دێهات

( ـ جات   میوەجات

( ـ وات   ئاغاوات

٣ ـ ( ـ گەل   کورگەل ، مێگەل

ئایا هـەموو ئـەو شـێوانەی سـەرەوە ، دەتوانـرێ بـە ئەلـەمۆرفی ( ـ ان ) دابنرێن ؟

هـەندێ زمانـەوان هـەر ئەوانی یەکەم بە ئـەلۆمۆرف دادەنـێ ، چونکه یـەك ئەرکیان هەیە و لە ڕووی فۆنەتیکەوە وێکدەچن و گۆڕانی ( ـ ان ) بۆ ( ـ یان ) بـە هـۆی یاسـایێکی فۆنۆلۆژییـەوە لێکدەدرێتـەوە . هـەندێکی دی کۆمـەڵی یەکەم و دووەم پێکەوە دەبەستن و هەموویان بە ئەلۆمۆرفی ( ـ ان ) دادەنێن ، ئـەویش لەبـەر هـۆی هاوئـەرکیی هـەردوو دەسـتـە . هەرچـەندە گۆڕانـی فۆنـەتیکیی کۆمـەڵی دووەم وا بە ئاسانی لێك نادرێتـەوە ، بەڵام تـا ڕادەیێـك باوەڕەکە ڕێی تێ دەچێ ، چونکە هەموو ئەو ئەلۆمۆرفانە لە شێوەدا لە یەکدی دەچن . بەشێك لە زمانەوانانیش لەسەر ئەوە سوورن ، کە کۆمەڵی سێیەمیش هـەر ئـەلۆمۆرفی ( ـ ان )ە ، چونکـە ئـەمیش هـەر وەك ئـەوانی پێشـوو هـەمان ئەرك دەبینێ ، واتە ـ ناو کۆدەکاتەوە .

پەسەندکردنی ئەم ڕایەی دوایی گشت بنـەما سـەرەکییەکانی مۆرفێم تێك دەدات ، چونکـە ئەگـەر گوێ نەدەینـە شـێوەی فۆنــەتیکی ، ئـەوا دەبـێ بـۆ چەندین بیری نابەجێ دەرگا بخەینـە سـەر پشـت و بـە نموونـە ڕێگـە بدەیـن هەموو وشە و ڕستە هاوواتاکانی وەك : (دارستان ـ لێڕ ـ جەنگەڵ ـ مێشە)... ( ناچم ـ ناڕۆم ) ... ببنە ئەلۆمۆرفی یەکدی .

لە لایێکی دیشـەوە دانانی ( ـ گەل ) بە ئـەلۆمۆرفی ( ـ ان ) کێشـەیێکی دیمان بۆ پەیدا دەکا ، چونکـە دەمانخاتـە دوو هەڵوێسـتی دژبەیـەکترەوە : لـە لایەکەوە وشە وەك مۆرفێم پێکدێنین و ، لـە لایێکی دیشـەوە ئـەلۆمۆرفێکمان دۆزیوەتەوە ، وشەیە .

پێویسته تێبینی ئەوە بکرێ ، کە هاتنەکایەی ئەلۆمۆرف دەگەڕێتەوە بۆ سێ هۆکار :

١ ـ کاری دەنگی دراوسێ . وەك ئەو گۆڕانانەی بەسەر مۆرفێمی ( ـ ەکە) و ـ ان )دا هاتووە .

٢ ـ شێوە و شێوازی ئاخاوتن . وەك ئەو گۆڕانەی بەسەر مۆرفێمی ـ ەکە )ی ناسیاویدا دێ وەك ( پیاوەکە ـ پیاوە ) . ئەلۆمۆرفی ( ـ ە ) جێی ـ ەکە )ی گرتووەتەوە .

٣ ـ زارەکانی زمان . بەوێنە گۆڕانی ئەلۆمۆرفی ( ـ ەکە ) بە ( ـ کە ) و یەکە ) و ( ـ ێکە ) و ( ـ ۆکە ) و ( ـ ەك ) لە وشەکانی ( برا ) و ( کانی ) و ( خانوو ) و ( کوڕ )دا بەپێی زارەکانی زمانی کوردی .

ئەنترۆپۆلۆژی انثروبولوجیا( علم المجتمعات البشرية )
Anthropology

= مرۆناسی

نیاز و مەبەستی زمانناسی و ئەنترۆپۆلۆژی لە دوو باردا یەك دەگرن : یەکەم ـ لە دابەشکردنی نەژاد و زماندا ؛ دووەم ـ لە لێکۆڵینەوەی کێشەی پەیدابوونی زماندا .

ئەنجام النتيجة Result

= ئاکام

ئەندازە المعيار ، المقياس Criterion

ئەندام العضو Organ

## ـ ئەندامەكانی ئاخاوتن    اعضاء النطق    Organs of speech

= ڕشتەی ئاخاوتن

دەنگەكانی ئاخاوتن لە ڕێگای ئەندامەكانی ئاخاوتنی مرۆڤەوە دروست دەبن .

ئەندامەكانی ئاخاوتن لە پێنج بەشی سەرەكی پێكهاتوون :

١ ـ ڕشتەی هەناسە (الجهاز التنفسي) .

٢ ـ ئەوك (الحنجرة) .

٣ ـ مەلاشوو (الحنك) .

٤ ـ ئەندامەكانی تەلەفوزكردن .

٥ ـ ڕشتەی دەمارە ناوەندییەكان (الجهاز العصبي المركزي) .

ڕشتەی هەناسە لە قەفەزی سنگ (قفص الصدر) ؛ ناوپنچك (الحجاب الحاجز) ؛ بۆریچە (الشعبة) ؛ بۆریی هەوا (القصبة الهوائية) پێكهاتووە . هەوا لە سییەكانەوە بە بۆریی هەوادا بۆ ئەوك دەچێت . ئەوك لە چەند كرکراگە (الغضروف)یێكی بزۆز (المتحرك) پێكهاتووە ، كە بە ماسوولكە پێكەوە بەستراون . یەكێك لە كرکراگەكان بەرەو پێش دەبزوێ و لە ڕووی پێشەوە مل دەردەپەڕێ . دەنگەژێكان بە پانایی ئەوك بە شێوەیێكی ئاسۆیی كشاون . لە نێوان ژێكاندا بۆریی هەوا هەیە .

مەلاشوو لە بۆشایی دەم و لە بۆشایی لووت پێكهاتووە . بۆشایی دەم لە كاتی دەربڕینی دەنگەكاندا بارست و شێوەی دەگۆڕێت . بەشێك لە دەنگەكانی زمانی كوردی بە دەم كردنەوەیەكی فراوان دەوترێن ، وەك (ا) . بەشێكی دیكەیان دەمكردنەوەیێكی مام ناوەندی ، وەك (ێ ، ۆ ، ە) . بەشی سێیەمیش دەمكردنەوەیێكی كەم ، وەك : ( ی ، وو ، و ، i ) و دەنگە كۆنسۆنانتەكان . بۆشایی لووت تەنیا لە دەربڕینی دەنگی ( ن ، م )دا هاوبەشی دەكا . لە دەربڕینی تێكڕای دەنگەكانی دیكەی زمانی

کوردیدا زمانە بچکۆلە دەبێت بە لەمپەرێك و نایەڵێ هەوا بۆ بۆشایی لووت بڕوا .

ئەندامەکانی تەلەفوزکردن بەتایبەتی بریتین لە زمان و دەم و لە جووڵانەوەیاندا چالاکانە هاوبەشیی دەربڕینی دەنگ دەکەن . بەوێنە ـە دەربڕینی دەنگی (ڤ)دا لێوی خوارەوە لە ددانەکانی سەرەوە نزیك دەبێتەوە ؛ لە دەربڕینی دەنگی (س)دا سەری زمان لە ددانەکان نزیك دەبێتەوە .

کاری ئەندامەکانی ئاخاوتن پێوەندیی تەواو و ڕاستەوخۆی لەگەڵ مێشك) ـ (ڕشتەی دەمارە ناوەندییەکان)دا هەیە و ئەمیش ڕابەر و سەرکاری هەموویانە .

ئەندامەکانی ئاخاوتن ئامێری فووپیاکردنی مۆسیقا دێنێتەوە یاد : سی‌یەکان ــ وەك مووشەدەمە ؛ ئەوکی هەناسە ــ بۆری ؛ بۆشایی دەم ــ دەرچە .

## ـ ئەندامەکانی هەناسە اعضاء التنفس

Organs of respiration (breahing)

ئەندامەکانی هەناسە ـ بریتی‌یە لە سی‌یەکان و بۆریچە (الشعبة) و بۆریی هەوا . سی‌یەکان و بۆریچە ـ چاوگ و بەڕێوەبەری لووزەوی ئەو هەوایەن ، کە ئەندامەکانی ئاخاوتنیان لێ پەیدا دەکا . هەناسەدان خۆی لە خۆیدا کارێکی نائاگایە (خۆنەویستە ــ لاارادی) . هەناسەی ئاخاوتن ئەگەرچی وەك هەناسەی فیزیۆلۆژی بە دەمدا تێدەپەڕێ ، بەڵام خاوەنی ئەو تایبەتی‌یەیە ، کە هەناسەکێشانی لە هەناسەدانەوەی زیاترە و بەو جۆرە هەوا لە سی‌یەکاندا هێندە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ بەردەوامیی هەناسەدانەوە و پێکهێنانی فشاری هەوای پێویست بۆ لەرینەوەی دەنگەژێکان دابین بکرێ لە باری هەناسەدانی ڕاستی ئاخاوتندا ، دروست

بوونی دەنگ - واتە دروست بوونی دەنگی دەربڕراوی ئاخاوتن ـ دەستی پێکرد .کە لەگەڵ دەست پێکردنی هەناسەدانەوەدا جووت دێن .

**ئەوک** **الحلق ، الحنجرة** Throat

= گەروو

ئەوک - بەشی سەرووی بۆریی هەوایە . لە ئەوکدا ڕشتەی دەنگ هەیە . ئەوک لە چەند کرکڕاگەیێکی بزۆز پێکهاتووە ، کە بە ماسوولکە پێکەوە بەستراون . یەکێك لە کرکڕاگەکان بەرەو پێش دەبزوێ و لە ڕووی پێشەوە مل دەردەپەڕێ . دەنگەژێکان بە پانایی ئەوك بە شێوەیێکی ئاسۆیی کشاون . لە نێوان ژێکاندا بۆریی هەوا هەیە .

بۆ پێکهاتنی دەنگەکانی ئاخاوتن سێ باری دەنگەژێکان ـ سێ فۆرمی بۆشایی دەنگ ـ گرنگن . لە دەمی هەناسەدانی ئاساییدا (بەتایبەتی لە هەناسەکێشاندا) و هەروەها لە دەربڕینی کۆنسۆنانتی کپدا ، دەنگەژێکان دەکشێن و خاوەبنەوە ؛ بۆشایی دەنگیش قاڵبی فراوانی سێ سووچی وەردەگرێ ؛ لە ڕشتەی دەنگدا هیچ دەنگێك دروست نابێ . باری دووەم لە دروست بوونی دەنگدایە ـ واتە لە درکاندنی دەنگە بزوێنەکان و زرینگۆکەکان (resonant) و کۆنسۆنانتە ئاوازدارەکاندا . دەنگەژێکان لە یەك نێزیك دەکەونەوە و تورت دەبن ؛ لەژێر فشاری لووزەوی هەوادا دەنگەژێکان دەکشێن ، بۆ ئەوەی ڕێگە بە دەرچوونی پاڵنانی هەوا بدەن و ئەمجا دەبزوێن ؛ دەنگەژێکان دەلەرێنەوە ؛ لە بۆشاییدا لەسەر دەنگەژێکانەوە لەرینەوەی هاوئاوازی هەوا پەیدا دەبێ ـ دەنگ یەکێکە لە جۆرەکانی دەنگی مۆسیقی . باری سێیەم : دەنگەژێکان لە یەك نێزیك و خاون ؛ بۆشایی دەنگ داخراوە ؛ لەم بارەدا هەوا بە زەحمەت بە ئەوکدا تێدەپەڕێ . بەم جۆرە چرپە

ـڕوست دەبیٚ ؛ دەنگی تەوژمۆکی ئەوکی ـ کۆنسۆنانتی کپی کۆسپەکی ـەوکی ـ پەیدا دەبیٚ .

## ئێتیمۆلۆژی الاتيمولوجيا (علم اصل الكلمة وتأريخها) Etymology

ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە ، کە لە پەیدابوون و وەرگرتن و گەشەکردنی وشە و ئەو دەورانەی پێیدا تێپەڕیوە دەدویٚ .

بەوێنە لە لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردیدا ، پێویستە بەتایبەتی بنج و بناوانی زمانی کوردی ساغ بکرێتەوە ؛ وشەی ڕەسەنی کوردی و وشەی ئێرانی و هیند و ئەورووپایی دەست نیشان بکرێن ؛ وشەی بێگانە و ڕەگی بێگانە لە زمانی کوردیدا دیاری بکرێن ، چالاکی و سستیی موفرەداتی زمانی کوردی بخرێتە پێش چاو ... هتد .

( Etymology ) لە ( etymos ـ ڕاستی ؛ دروستی ؛ چوون یەك ) و (logos ـ لێکۆڵینەوە ، زانست )ی یۆنانی‌یەوە ڕۆنراوە .

## ئیدیەم

ب . : فرێز

= ئیدیۆم ، فریزیۆلۆژی . فرێزی گیراو

## ئیدیۆم

ب . : فرێز

## ئێزافە الأضافة Izafet , Postpositional attributive group

ئیزافە ئەو دۆخەیە . کە دیارخەر و دیارخراو دەکەونە پاڵ یەکدی و پێوەندیی وەسفی و خاوەنێتی و چۆنیەتیی نێوانیان دەردەکەویٚ .

ه . ، ب . : نیشانەی ئیزافە ؛

دیارخراو ؛

دیارخەر .

**ئینتەرفیکس**

ب . : ناوبەند

لە (Interfixus)ی لاتینییەوە وەرگیراوە .

**ـ ب ـ**

| | | |
|---|---|---|
| **بابەتەکی** | **الموضوعي** | Objective |
| **بەرتەك** | **رد فعل** | Reaction formation |

**بەرزی**

ب . : بڵندی

Object المفعول بەرکار

= کراو ، تەواوکەر

ئەو وشەیە یان ئەو فرێزەی ڕستەیە ، کە کردەوەی دەکەوێتە سەر .

- بەرکاری ڕاستەوخۆ المفعول المباشر Dierect object

= بەرکاری یەکسەر ، کراوی یەکسەر ، تەواوکەری ڕاستەوخۆ .

ئەو وشەیەیە یان ئەو فرێزەیە ، کە ڕاستەوخۆ کارەکەی دەکەوێتە سەر .

- بەرکاری ناڕاستەوخۆ المفعول غیر المباشر Indirect object

= بەرکاری نایەکسەر ، کراوی نایەکسەر ، کراوی تیان ، تەواوکەری ناڕاستەوخۆ .

بەرکاری ناڕاستەوخۆ ئەو جۆرە بەرکارەیە ، کە ڕووداوی کردارەکەی ڕاستەوخۆ ناکەوێتە سەر ، بەڵکو بەهۆی ئامرازی تایبەتییەوە دەبێت .

بەرگر الانظوائی ، یطوق ، یحبس Enclitic , Syneclitic

ئەو وشەی بێهێزە که بەپێچەوانەی دواگرەوە ، بە وشەی پێشەوەیەوە دەبەسترێتەوە . جێناو و پاشبەند و نیشانە و هەندێ ئامراز دەبنە بەرگر . وەك : ( باوکی تۆ ... ) .

بەرنامە المنهج Method

بەریان الاتجاه Direction

- بەریانی فراژۆبوون اتجاه النمو Developmental direction

بەشەکانی ئاخاوتن ، کە باسی هەرە سەرەکیی وشەسازین ، لە هەموو زمانێکدا پەیدا دەبن و لە ڕێگەی سێ تایبەتییەوە لەیەك جیادەکرێتەوە و دیاری دەکرێن : ١ـ مانای ڕێزمانی ؛ ٢ـ گۆڕان ؛ ٣ـ بەکارهێنانی سینتاکسی.

ئەوەی پتر لە نێو زماناندا هاوبەش بێ ، مەسەلەی بەشەکانی ئاخاوتنە . لە لێکدانەوەی کێشەی بەشەکانی ئاخاوتنەوە باسی ڕێزمانی هەموو زمانێك دەست پێدەکات .

بۆ یەکەم جار نەخشەیێکی لەباری بەشەکانی ئاخاوتن لە لایەن زانا یۆنانییەکانی ئەسکەندەرییەوە ( سەدەی دووەمی پێش زایین لە شاری ئەسکەندەری یە ) ، کە بۆ زمانی خۆیان سازکردبوو هاتە ناوانەوە .

ڕۆمانەکان ئەو نەخشەیەیان بە دەستکاری‌یێکی کەمەوە بۆ زمانی لاتینی وەرگرت . لە سایەی دەوری زمانی لاتینییەوە لە کولتووری سەدەکانی ناوەڕاستدا . ئەو نەخشە کۆنە بۆ لێکۆڵینەوەی هەندێ لە زمانە ئەورووپاییە نوێیەکان بەکارهێنرا و دواتر بۆ زمانەکانی دیکەی جیهان کەڵکی لێوەرگیرا .

لەو نەخشە یۆنانی ـ لاتینی‌یەدا ، هەشت بەشی ئاخاوتن ـ کە ئەو دەمە پێیان دەوتن ( بەشەکانی وشە ) ـ دیاری کرابوون ... لە زۆر زماندا تا ماوەییکی درێژ هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهێنرا ، بەلام دواتر گەشەی پێدرا . بەوێنە لە یەکەم کاری ڕێزمانیدا ، کە دەربارەی زمانی ڕووسی ( نەك زمانی کلیسەی سلاڤیانی ) نووسراوە و خاوەنەکەی زانای بەناوبانگ ( میخائیل ڤاسیلۆڤیچ لۆمۆنۆسۆڤ ) ە ، ساڵی ١٧٥٥ ، هەروەك لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی کلێسەی سلاڤیانی و هەروەها لاتینی و یۆنانی ، هەشت بەشی ئاخاوتنی دیاری‌کردووە . ئەم ڕێزمانەی ( م . ڤ . لۆمۆنۆسۆڤ ) ماوەی ( ٧٥ ) ساڵێك بنکەی ئەو ڕێزمانە کورتانە بوو ، کە بۆ

خوێندن دادەنران ، واتە لەمانەشدا ددان هەر بە هەشت بەشی ئاخاوتن نرابوو .

ئەلێکساندر خریستۆرۆڤیچ ڤۆستۆگۆف بە بڵاوکردنەوەی کتێبی (( ڕێزمانی ڕووسی )) ، چاپی یەکەم پیترسبورگ ، ۱۸۳۱ ؛ چاپی دووەم ، پیترسبورگ ، ۱۸۳۵و ، چوونە ناو زمانی زگماکەوە ، کارێکی نوێی لە زمانی ڕووسیدا هێنایە ئەنجام . ئەم زانایە نۆ بەشی ئاخاوتنی دیاری کردووە ، واتە بەشە ئاخاوتنی ( ژمارە )ی لێ زیادکردووە ... دواتریش ( ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤ ) بەشە ئاخاوتنی ( پارتیکل )ی خستنە پاڵ .

ئەو نووسەرانەی لەبەر ڕووناکیی ڕێزمانی ئینگلیزیدا باسی ڕێزمانی کوردییان کردووە ، لە هەشت بەشە ئاخاوتن ( ۱ ـ ناو ؛ ۲ـ ئاوەڵناو ؛ ۳ـ جێناو ؛ ٤ـ کردار / چاوگ ؛ ٥ـ ئاوەڵکردار ؛ ٦ـ پێشبەند ؛ ۷ـ ئامرازی پێوەندی ؛ ۸ ـ ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن ) دواون . هەرچی ئەو نووسەرانەشن ، کە سوودیان لە ڕێزمانی ڕووسی وەرگرتووە ، دە بەشە ئاخاوتنی ( ۱ـ ناو ؛ ۲ـ ئاوەڵناو ؛ ۳ـ جێناو ؛ ٤ ـ ژمارە ، کردار / چاوگ ؛ ٦ـ ئاوەڵکردار ؛ ۷ـ پێشبەند ؛ ۸ ـ ئامرازی پێوەندی ؛ ۹ـ ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن ؛ ۱۰ ـ پارتیکل )یان دیاریکردووە .

جیاوازیی ئەو دوو بەرەیە لەوەدایە ، کە بەرەی یەکەم ـ ( ژمارە ) و ( پارتیکل )یان بە بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ دانەناوە . بەڵام بەرەی دووەم جیایان کردوونەتەوە و مامەڵەی بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆیان لەگەڵ کردوون .

ئەو دە بەشە ئاخاوتنەی لە زمانی کوردیدا دەبینرێن ، دەتوانرێ بەسەر دوو جۆردا دابەش بکرێن :

۱ـ وشەی تەواو ( الكلمة التامة ـ Autosemantic word )

وشەی تەواو ، ئەو وشانەن کە سەربەخۆ و ڕاستەوخۆ مانای دیاردەیێکی مەوزووعبی واقیعی جۆراوجۆر دەبەخشن و دەتوانن وەك ئەندامێکی ڕستە خۆیان بنوێنن .

بەگوێرەی ئەو پێناسەیە ، شەش بەشی ئاخاوتنی کوردی : ( ١ـ ناو ، ٢ـ جێناو : ٣ـ ئاوەڵناو ؛ ٤ ـ ژمارە ؛ ٥ـ کردار / چاوگ ؛ ٦ـ ئاوەڵکردار ) بەر وشەی تەواو دەکەون .

٢ـ وشەی ناتەواو ( الكلمة الناقصة ـ Syntactic word )

وشەی ناتەواو ئەو وشانەن ، کە ڕاستەوخۆ پێوەندییان بە دیاردەی واقیعییەوە نییە و سەربەخۆ ناتوانن وەك ئەندامێکی ڕستە خۆیان بنوێنن ، بەڵکو دەوریان یاریدەدانی وشە تەواوەکانی بەشەکانی ئاخاوتنە لە بەجێهێنانی ئەرکەکانیاندا ، بەتایبەتی لە دەبڕینی واتایاندا و پێکەوەبەستنیان لە ڕستەدا .

بەپێی سەرنج دان چوار بەشەکەی دیکەی ئاخاوتن : ( ١ـ پێشبەند ؛ ٢ـ ئامرازی پێوەندی ؛ ٣ـ ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن ، ٤ ـ پارتیکل). بەر گرووپی وشەی ناتەواو دەکەون .

| | | |
|---|---|---|
| بەڵگە | دليل | Evidence |
| بەهرە | الحدس | Intuition |
| بەهرەکی | الحدسي | Intuitional |
| بچووك کردنەوە | التصغير | Diminutive |

ئەو ناوە گشتی و تایبەتییانەی لە کوردیدا بەکاریان دەهێنین ، زۆر جار لە ئاخاوتن و نووسیندا ، یان لەبەر ئەوەی خۆیان لە ڕاستیدا بچوکن ،

یان لەبەر ناز و خۆشەویستی و ، جارجاریش بۆ شکاندنیان ، واتە ـ کەمکردنەوە لە نرخیان ـ لە شێوەی بچووک کراودا ، دەریان دەبڕین . بۆ ئەم مەبستەش بە زۆری ئەم پاشگرانە : ( ـ چە ؛ ـ ۆڵە ؛ ـ ۆلە ؛ ـ یلە ؛ ۆڵکە ؛ ـ چکە ... و چەندینیدی ) بەکاردەبرێن . وەك :

باخ ـ باخچە ؛ کیژ ـ کیژۆڵە ؛ بەرخ ـ بەرخۆلە ؛ کار ـ کاریلە ؛ گرد ـ گردۆڵکە ؛ خانوو ـ خانووچکە ... هتد .

## بڕگە — المقطع — Syllable

ئەو هەوایەی لە کاتی ئاخاوتندا لە بۆشایی دەمەوە دێتە دەرێ ، بەیەك جار دەرناچێ ، بەڵکو بەچەند تەکانێك دەرباز دەبێ . هەوای تەلەفوزکردنی هەر وشەیێك بە چەند تەکان لە دەمەوە دێتە دەرێ ، ئەوە ئەو وشەیە بەسەر ئەوەندە بەش . یاخود بڕگەدا دابەش دەبێ . بەوێنە لە وشەی ((سۆ ـ ران))دا ـ دوو بڕگە ؛ لە وشەی (( سۆ ـ را ـ نی ))دا سێ بڕگە ، لە وشەی (( دوو ))دا یەك بڕگە هەیە .

بڕگە بریتی‌یە لە بچووکترین دانەی سروشتیی تەلەفوزکراوی دەنگەکانی ئاخاوتن . ئاخێوەر کە وشەیێك تەلەفوز دەکا بەسەر تاکە تاکەی دەنگەکانی ئاخاوتندا دابەشی ناکات ، بەڵکو بەسەر بڕگەدا دابەشی دەکات . بڕگە یەکێتیی وتن و بیستن دەگرێتە خۆ .

چەند تیۆری‌یێکی بڕگە هەیە و ئەوەی لە نێوانیاندا پتر بڵاو و ناسراوە ، دوانە : زرینگۆکی و ماسوولکەیی . تیۆریی زرینگۆکی بڕگە وەك یەك‌کەوتنی ماکی پتر دەنگدار لەگەڵ ماکی کەمتر دەنگدار تەماشا دەکرێ . دەنگەکانی ئاخاوتن بەپێی توانستی پێکهێنانی بڕگە دابەش دەبن بەسەر پلەی جیاوازی دەنگداریتیدا ـ بزوێن ؛ کۆنسۆنانتی زرینگۆك ، کۆنسۆنانتی ئاوازەدار ، کۆنسۆنانتی کپی خشۆك و تەوژمۆك .

بڕگە خاوەنی خاسیەتی یەکێتیی کرواەیی یان داخراوەیی بۆشایی دەمە. بەپێی ئەم بۆچوونە سەرجەمی بڕگە بەسەر کراوە و داخراودا دابەش دەبیٚ .

بـ . : ( برگەی کراوە ) و ( بڕگەی داخراو ) .

بڕگە و ڕەگ یەکسان نین . دەزانین لەگەلٚ وشەی یەك بڕگەییدا ، وشەی فرەبڕگەیی یەك ڕەگی هەیە . بەوێنە (شووتی ، بەهار ، سەهۆلٚ ، چۆلەکە ..). وشەی فرەبڕگە زۆر جار بە فرەبڕگە دەردەچن . دابەشکردنی بەسەر مۆرفێم و بەسەر بڕگەدا وەك یەك نییە . بەوێنە ، وشەی ( بەرە ) لە دوو مۆرفێمی (بەر ـ ە) و دوو بڕگەی ( بە ـ رە ) پێکهاتووە . کەواتە دابەشبوونی مۆرفێمی و دابەشبوونی بڕگەیی جیاوازن . وشەی ( شووتی ) لە یەك مۆرفێم ـ ( شووتی ) و دوو بڕگە ( شوو ـ تی ) دروستبووە ..

لەتەك ئەو زمانانەی جیاوازی لە دابەشکردنی وشە بەسەر بڕگە و مۆرفێمدا هەیە . زمانانی ئەوتۆش دەبینریٚ ، کە ژمارەی مۆرفێم و بڕگەی وشە تێیاندا یەك دەگرنەوە و ڕەگی وشەشیان یەك بڕگەییە . بەو جۆرە زمانەنەش دەوتریٚ زمانی یەك بڕگەیی و زمانی فرەبڕگەیی .

- بڕگەی بیٚهێز المقطع غير منبور Unstressed syllable

- بڕگەی داخراو المقطع الساكن Closed syllable

بەو بڕگەیە دەوتریٚ ، کە بە دەنگێکی کۆنسۆنانت کۆتایی هاتبیٚ . وەك :

بەر ـ مالٚ ، سەر ـ دار ، بار ـ گیر ، تالٚ .. بەو پیٚیە بڕگەی داخراو لەباری داخراویی بۆشایی دەمدا سازدەبیٚ . لوتکەی ئەم جۆرە بڕگەیە و ماکی بڕگەپێکهێنی دەکەوێتە سەرەتای بڕگەوە ، دوای ئەوە خاوبوونەوەی گرژی و کەمبوونەوەی دەنگدارێتی ڕوودەدات .

- **برگەی كراوە** **المقطع المتحرك** Open syllable

بەو برگەیە دەوترێ ، كە بە كراوەیی بۆشایی دەم دەوترێ . بەو پێیە نوتكەی برگە ماكی برگە برگەپێكهێنی دەكەوێتە كۆتایی برگەوە . لەم بارەدا بزوێن ماكی برگەپێكهێنە : دا ـ را ؛ جوو ـ تە ؛ بۆ ـ نە ؛ ڕێ ـ گە .. بە واتایێكی دی ، برگەی كراوە ، ئەو برگەیەیە ، كە بە دەنگێكی بزوێن كۆتایی هاتبێ .

- **برگەی هێزدار** **المقطع المنبور** Stressed syllable

**بڕوا** **العقیدە ، الاعتقاد** Belief

**بزرۆكە** **الكسرة المختلسة** Schwa ( )

**بزوێن** **حرف العلة ، الصوت الصائت** Vowel

بزوێن بەو دەنگانە دەوترێ ، كە لە دەربڕینیاندا هەوا بێ تەگەرە و بەرەوانی بە بۆشایی دەمدا تێدەپەڕێ . واتە ئەو لووزەو ( تیار)ی هەوایەی لە سییەكانەوە دێ ، لە دەمدا هیچ كۆسپ و بەرهەڵستێكی نایەتە ڕێ .

لە زمانی كوردیدا هەشت دەنگی بزوێن هەیە :

( ا ، ە ، ێ ، ی ، ۆ ، وو ، و ، i )

- **بزوێنەكانی خواروو** **الصائت المنخفض** Low vowel

وەك : ( ا ، ە )

واتە ئەو بزوێنانەی لە کاتی وتنیاندا زمان لە بەشی خوارووی دەمدا دەبێ . ئەویش کاتێ هەڵبڕین و دانەواندنی زمان لە شێوەی ئەستوونیی جووڵانەوەیدا لە کاردایە .

- بزوێنەکانی ڕیزی پشتەوە الصائت الخلفی Broad vowel, Deep vowel

سێ بزوێنی ( ا ، ۆ ، وو ) دەگرێتەوە.

ئەم دەنگانە لە بارەی چۆنیەتیی جووڵانەوەی زمانەوە بە شێوەی ئاسۆییدا ، زمان لە پشتەوە لە ( قووڵایی ) دەمدا دەبێ .

- بزوێنەکانی ڕیزی پێشەوە الصائت الامامی Front vowel , Slender vowel

واتە ـ ئەو بزوێنانەی لە کاتی تەلەفوزکردنیاندا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت . وەك ( ێ ، ی ) کە ئەمەش لە باری جووڵانەوەی زماندا بە شێوەی ئاسۆیی ئەنجام دەدرێ .

- بزوێنەکانی ڕیزی ناوەڕاست الصائت المتوسط

Abnormal vowel

وەك ( و ، ە ، i )

لە بارەی چۆنیەتیی جووڵانەوەی زمانەوە بە شێوەی ئاسۆیی بە دەربڕینی ئەم بزوێنانە زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێ .

- بزوێنەکانی سەروو الصائت العالي High vowel

لە بارەی ڕادەی هەڵبڕین و دانەواندنی زمانەوە ــ واتە لە شێوەی ئەستوونیی جووڵانەوەیدا ، بۆ دەربڕینی هەندێ بزوێن ، زمان بەرەو سەروو هەڵدەکشێ ..وەك ( ی ، وو ) .

| | | |
|---|---|---|
| **ـ بزوێنەکانی ناوەڕاست** | **الصائت المتوسط** | Intermediate |

**واتە ــ ئەو بزوێنانەی لە بارەی هەڵبڕین و دانەواندنی زمانەوە ــ بە واتایێکی دی لە شێوەی ئەستوونیی جووڵانەوەیدا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەوەستێت . وەك : ( یٚ ، ۆ ، و ، i)**

| | | |
|---|---|---|
| **ـ بزوێنی درێژ** | **المد ، الصائت الطويل** | Long vowel |

**ـ بزوێنی دوولانە**

**بـ . : دیفتۆنگ**

| | | |
|---|---|---|
| **ـ بزوێنی کورت** | **الحركة** | Short vowels |

**= کورتەبزوێن .**

| | | |
|---|---|---|
| **بزۆز** | **المتحرك** | Active |
| **بڵندی** | **علو ، ارتفاع** | Hight |

**= بەرزی**

| | | |
|---|---|---|
| **بنەما** | **اساس** | Stem |
| **ـ بنەمای کردار** | **اساس الفعل** | Verbal stem |

**لە شێوە و ناوەرۆکی هەموو کردارێکدا ، ڕابوردوو بێت یان ڕانەبوردوو ، بنەمایێك هەیە ، کە هەڵگری واتای کردارەکەیە و لە قاڵبەکانی کرداردا دووبارە دەبێتەوە و ناگۆڕێت و دەشێ پێی بوترێ ( بنەما ) .**

له زمانی کوردیدا ، هەروەك زمانه ئێرانییەکانی دی ، کردار خاوەنی دوو بنەمایه : بنەمای کاتی ڕابوردوو و بنەمای کاتی ڕانەبوردوو . بە زۆری وا ڕۆیشتووە بە بنەمای کاتی ڕابوردوو بوترێ ( قەد ) و بۆ بنەمای کاتی ڕانەبوردووش زاراوەی ( ڕەگ ) بەکاربهێنرێ .

له زمانی بلووجیدا کردار خاوەنی دوو بنەمایه : بنەمای کاتی ڕابوردوو و بنەمای کاتی ڕانەبوردوو . له هەموو دیالێکتەکانی گرووپی زمانه شوگانو ـ ڕووشانیيەکاندا دوو بەنەمای کردار جیادەکرێتەوە : بنەمای کاتی ئێستا و بنەمای کاتی ڕابوردوو . له زمانی یازگولیامی و ڤاخانی و ئیشکاشیمی و مونجانی.. یشدا بنەمای کاتی ڕابوردوو کاتی ڕانەبوردوو هەیه .

| | | |
|---|---|---|
| بنی زمانی | مؤخره اللسان | Dorsum |
| بۆچوون | التصور | Think , Conaider |
| بۆریچه | الشعبه | Bronchial tubes |
| بۆریی هەوا | القصبة الهوائية | Windpipe |
| بۆشایی دەم | التجويف الفمي | Oral cavity |

دەورێکی دیار له دروستکردنی دەنگەکانی ئاخاوتندا بۆشایی دەم دەبینێ . له بۆشایی دەمدا ژاوەژاو و ئاوازی زرینگۆکی هەمەڕەنگ دروست دەبێ ، کە بۆ پێکهاتنی زەنگ زۆر گرنگن . لێو ( خوارەوە و سەرەوە ) دەمی داپۆشیوە . له بۆشایی دەمدا : ددان ( سەرەوە و خوارەوە ) ؛

پووك ـ ( alveolar ) ( بەتایبەتی لای کۆتایی ڕەگی ددانەکانی سەرەوە ) ؛ ڕەقە ئاسمانە ( ئەمیش لە بەشی پێشەوە و ناوەڕاست پێکهاتووە ) ؛ نەرمە ئاسمانە ( تا لای زمانە بچکۆلەوە دەگرێتەوە ) ؛ زمان ـ ئەندامی هەرە بزۆزی ئاخاوتنە و لە سەری زمان و پشتی زمان ( ئەو بەشەی ڕووی لە ئاسمانەی دەمە ) و بنی زمان پێکهاتووە . هەرچی پشتی زمانیشە بەسەر سێ بەشدا دابەش دەبێ : پێشەوە و ناوەڕاست و پشتەوە .

ئاسمانەی نەرم ، هەروەها بە پەردەی ئاسمانەش ناودەبرێ ، چونکە لە ڕاستیدا کونی لووت دەکاتەوە و دادەخا . لە دادانەوەی پەردەی ئاسمانەدا ، کاتێ تەوژمی هەوا بێ‌تەگەرە دەچێتە کونە لووتەوە ، زرینگەی بیڤلۆکی سازدەبێ ، کە خاسیەتی بزوێنی بیڤلۆکی و سۆنانت و کۆنسۆنانتە . لە کاتی هەڵبڕینی و نووساندنی بە دیواری پشتەوەی گەرووەوە ، پەردەی ئاسمانە ـ ئاسمانەی نەرم ڕێ لە تەوژمی هەوا دەگرێ ، کە بۆ کونەلووت بچی ، جا لەم بارەدا دەنگی ئاخاوتنی بیڤلۆکی دروست دەبێ .

**بۆشایی لووت** **الخیشوم (التجویف الأنفی)** Nasal cavity

ـ کونەلووت

**بۆناو**

ب . : جێناو

**بێڤل**

ب . : لووت

**بیر** **الذاکرة** Memory

بیژۆک | الشاذ | Irregular
= ڕیزبەڕ

بیستن | سمعی | Acoustic

## - پ -

پارچە | قطعة ، جزء | Segment
= کەرت

- پارچەبەدەرایەتی قطعة جزئیة صوتیة ، تقطیعة
Supersegment

پاڕستە
بـ :: ڕستەی شوێنکەوتوو

**پاشبەند** **لفظة مؤخرة** Postposition

= پۆستپۆزیشن

پاشبەند ئەو مۆرفێمە ڕێزمانییە ناسەربەخۆیانەن ، کە بە تەنیا هیچ واتایەك نابەخشن و ئەرکیان لەگەڵ پێشبەندەکاندا بەدەردەکەوێت ـ واتە ئەم پاشبەندانە لەگەڵ پێشبەندەکاندا یەك دەگرن و پێشبەندی ناسادە پێکدەهێنن .

لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا ئەم پاشبەندانە بەرچاون ( دا ، ەوە ـ وە ) هەندێك جاریش لە هەندێك ناوچەدا ( ڕا ) لە جێگەی ( ەوە ) بەکاردەهێنرێت .

کەواتە پاشبەندەکان بە تەنیا واتایان نییە و لە ئەنجامی یەککگرتنیان لەگەڵ پێشبەندەکاندا بۆ دروستکردنی دەستەواژە واتایان بەدەردەکەوێت . ئەم حاڵەتەش دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای پێشبەندەکان و بە دیوێکی دیکەیدا دەخات . بۆ نموونە ، دەستەواژەکانی : (بە تۆ ، بە تۆوە ، بە تۆدا) بەکارهێنانی تایبەتییان هەیە ، یان بە هەمان شێوە ( لە تۆ ، لە تۆوە ، لە تۆدا ) هەر یەکێکیان سەربەخۆیی خۆیان هەیە و باری پەرپووتی و هەرەمەکی پەسەند ناکەن . ئەمیش ئەوە دەردەخات ، کە هەر یەك لەو پاشبەندانە وەك دانەیەکی ڕێزمانی و مۆرفێمێکی ناسەربەخۆ واتایان لە نێو ڕستە و دەستەواژەدا بە دەردەکەوێت .

**پاشگر** **اللاحقه** Suffix

پاشگر کە بە لاتینی بە ( Sufixus ) ناسراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە : ( Su ـ پاش ... ) و ( Fixus ـ گیر ، لکاو ، نووساو ، چەسپاو ... ) ، ئەو مۆرفێمەیە کە بە کۆتایی بناغەی وشەوە دەنووسێ و ڕواڵەت و ناوەرۆکی وشە دەگۆڕێ و دەوری ڕۆنانی وشە دەبینێ .

لە وشەی ناسادەی زمانی کوردیدا پاشگر هەمیشە لە دوای ڕەگی وشەوە دێت و ئەوجا بە دوای ئەودا نیشانە ـ واتە هەرگیز پاشگر پاش نیشانە ناکەوێ . بەوێنە : وشەی (( فێڵبازتر )) ، کە لە وشەی (( فێڵ )) و پاشگری (باز) و نیشانەی ( تر ) پێکهاتووە ؛ وشەی (( ئاسنگەران ))، کە لە وشەی (( ئاسن )) و پاشگری ( گەر ) و نیشانەی ( ان ) پەیدا بووە ؛ وشەی (( مۆمدانەکە )) ، کە لە وشەی ( مۆم )) و پاشگری ( دان ) و نیشانەی (ەکە) دروستبووە .. بەڵام مەرج نییە لە هەموو زمانێکدا پاشگر یەکسەر لە دوای ڕەگی وشەوە بێت و ئەوجا نیشانە بێت . لە هەندێ زماندا ڕێ دەکەوێ پاشگر دەکەوێتە دوای نیشانە ، واتە بەپێچەوانەی زمانی کوردییەوە . بەوێنە ، لە زمانی ئەڵمانیدا ، وشەی (( Kind )) بە مانای (( منداڵ ) دێت و (( Kinder )) بە مانای (( منداڵان )) ، بەڵام (( Kinerchen )) دەبێتە (( منداڵۆچکان )) . لێرەدا ( er )) کە نیشانەی کۆیە کەوتۆتە پێش ( chen )ەوە کە پاشگرە بۆ واتای بچووککردنەوە .

ب .: مۆرفێمی وشەداڕێژ

| پەردەی ئاسمانە | لهاة | Uvula |
|---|---|---|

پەلیۆگرافی

ب . : زانستی نووسین

پەیدابوونی بزوێن

ب . پەیدابوونی دەنگ

| پەیدابوونی دەنگ | ظهور الصوت | Appearance the sound |
|---|---|---|

**بە بۆچوونی هەندێ زمانەوانان ، مەبەستی پەیدابوونی دەنگ ـ واتە پەیدابوونی دەنگێکی نوێ لە نێوان دوو دەنگدا ، لەبەر ئەوەیە هێشووە کۆنسۆنانت یان هێشووە بزوێن لە وشەیەکدا دروست نەبێ .**

**بەشێکی دییش وا ڕادەگەیەنن ، پەیدابوونی دەنگ لە ئەنجامی کۆبوونەوەی هەندێ دەنگ ، کە ناتوانرێ لەگەڵ یەکدا بێن ، ڕوودەدات ... ئەو دەنگە نوێیەش ، کە دێتە نێوانیانەوە ، دەبێتە هۆی کار لە یەکدی کردنی دەنگەکان .**

**لە زمانی کوردیدا دوو جۆر ( پەیدابوونی دەنگ ) بەدی دەکرێ :**

**١ـ پەیدابوونی کۆنسۆنانت**

**٢ـ پەیدابوونی بزوێن**

**حاڵەتی یەکەم ، ئەوەیە زۆر جار لە نێوان دوو بزوێندا ، کۆنسۆنانتی ( /ی — y/ ؛ / و — w / ؛ / د / ؛ / ه / ؛ / ز / ؛ / ن / ؛ / ج / ؛ / ر /...) پەیدادەبێ و لە نێوانیاندا / ی ـ y ) لە هەموویان چالاکترە . بەوێنە :**

**برا + ی + ان = برایان**

**برا + ی + ەکە = برایەکە**

**مووروو + و + ەکە = موورووان**

**جوو + و + ەکە = جووەکە**

**گۆڕ + د + را = گۆڕدرا**

**ژمێر + د + را = ژمێردرا**

**چوار + ه + ەم = چوارهەم**

**دێ + ه + ات = دێهات**

**دوو + ز + دە = دوازدە**

**نۆ + ز + دە = نۆزدە**

**میوە + ج + ات = میوەجات**

**بگە > بگەرە**

بچۆ > بچۆره

پـەیداوبونی کۆنســۆنانت چـەند چـالاك و کاریگـەره ، بەپێچەوانـەوه پەیدابوونی بزوێن تەنیا لە چەند حاڵەتێکی یەکجار کەمدا دەبینرێ و ئەویش بە شێوەیێکی سست .. ئەو بزوێنانەش ( / ە / ، / ۆ/ ، / ێ / ) ن .

چار ⟵ چارە

خاڵ ⟵ خاڵۆ

دەر ⟵ دەرێ

...

**پەیدابوونی کۆنسۆنانت**

بـ .: پەیدابوونی دەنگ

**پەیوەندی**

بـ .: پێوەندی

**پراگماتیک** علم التداول Pragmatics

پراگماتیك مامەڵـە لەگـەڵ ئـەوەدا دەکـات ، چـۆن ئـاخێوەر بـە شـێوەیێك بەکاردەبات . کە ناتوانرێت بە تەنها لـە رێـی زانیارییـەکانی زمانەوانییـەوه پێشبینی لـێ کردبێت . پراگماتیك وەك مەودایەکی نوێ لە لایەکەوه پێوەندی بە واتا و واتالێکدانەوەوه هەیە و لـە لایـەکی دییشـەوه بە جیهانی دەرەوەی زمانەوه دەبەستن .

**پرۆتسێس**

بـ . : رەوت

## - پرۆتسێسی فۆنەتیکی العملیة الصوتیة Phonetical process

### - پرۆتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەر

پروتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەر بە شێوەیێکی سەرەکی کۆنسۆنانتەکان دەگرێتەوە . پرۆتسێسی فۆنەتێکیی دەوروبەری بنەڕەتی بریتی‌یە لە : ( وێکچواندن ـ assimilation ) و ( گۆڕین ـ dissimilation ) و ( گونجاندن ـ accommodation)

هـ . ، ب . : وێکچواندن ، گۆڕین ، گونجاندن

### - پروتسێسی فۆنەتیکی شوێنەکی

پرۆتسێسی فۆنەتیکی شوێنەکیی بنەڕەتی بریتی‌یە لە : کورتکردنەوەی بزوێنی بێ‌هێز ، هاودەنگی بزوێن : کپ‌بوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار لە کۆتایی وشەدا ؛ کەوتنی دەنگ لە سەرەتای وشەدا .

پەیدابوونی هێزی وشە نەك تەنیا بووە هۆی پەیدابوونی بزوێنی هێزدار ، بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی بزوێنی بێ‌هێزیش . بزوێنی بێ‌هێز دەکەوێتە ژێر باری کورتکردنەوە ـــ واتە لاوازبوونی چۆنەکیی دەنگدارێتی . کورتکردنەوە بەسەر چەندەکی و چۆنەکی‌دا دابەش دەبێ . لە باری کورتکردنەوەی چەندەکی‌دا بزوێنی بێ‌هێز درێژی و وزە لەدەست دەدا . بەوێنە ( وو ) لە ( نووسین ) و ( نوسرا )دا .

کورتکردنەوەی چۆنەکی بەو جۆرە گۆڕانەی بزوێنی بێ‌هێز دەوترێ ، کە نەك تەنیا درێژی و وزەی دەنگ دەگرێتەوە ، بەڵکو زەنگیش ڕەچاو دەکا .

هاودەنگیی بزوێن ، وێکچواندنی بزوێن دێنێتە یاد : هەندێ لە زمانناسان بە وێنە : ( ئی . ئا . ڕیفۆرماتسکی ) هاودەنگیی بزوێن وەك

ویکچواندنی نێو برگەیی تەماشا دەکەن و کورتکردنەوەش وەك گۆڕین .
ویکچواندنی بزوێن و بە نموونەی وەك ( بووە ) ـ ( بۆتە ) .. نیشان دەدرێ .
بۆ کپ بوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار لە کۆتایی وشەدا دەتوانین وشەی ( دش )ی کوردی بکەینە نموونە ، کە ( ژ )ی کۆنسۆنانتی ئاوازەداری کۆتایی بووە بەدەنگی کپی ( ش ) .
کەوتنی دەنگ لە سەرەتای وشەوە لە زمانی مەکدۆنیدا زۆر باوە . لەم زمانەدا کۆنسۆنانتی ( خ ) بە زۆری لە سەرەتای وشەدا تیدەچێ . وەك ( لیب ) لە بریتی ( خلیب ) .. لە زمانی کوردیشدا ئەم دیاردەیە بەرچاو دەکەوێ ، بەوێنە لە کرداری داخوازیی ناسادەدا ، گەلێ جار ( ب )ی داخوازیی پێش ڕەگی کردارەکە دەکەوێ ، وەك : ( هەڵگرە ) لە جێی ( هەڵبگرە ) : ( شەرمکە ) لە بریتی ( شەرمبکە ) ..

**پریپۆزیشن**

بـ .: پێشبەند

| | | |
|---|---|---|
| **پل** | **نبض** | Impulse |
| **پلە** | **درجة** | Degree |

**ـ پلەکانی ئاوەڵناو** **درجات الصفة** Degrees of adjective

لە هەندێ لەو کارانەدا کە لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە نووسراون کێشەی (( پلەکانی ئاوەڵناو )) لە بەشی (( وشەڕۆنان )) دا باس کراوە و لە هەندێ بەرهەمیشدا لە باسی (( جۆرەکانی ئاوەڵناو ))دا لێی کۆڵراوەتەوە .
بۆ ڕەتکردنەوەی دانەنانی پلەکانی ئاوەڵناو بە حاڵەتی ڕێزمانی و تێگەیشتنی پێوندی (درێژ ـ درێژتر ـ درێژترین) بە نیشاندانی پێوەندیی

وشەی جیاواز ، نەك فۆرمی جیاوازی یەك وشە ، گەلێك بەڵگەی زمانەوانی هەیە .

نەك لە بارەی خاسیەتی ڕۆنانی پلەکانی ئاوەڵناوەوە ، بەڵکو لەبارەی خاسیەتی حاڵەتی ڕێزمانیی پلەکانی ئاوەڵناوەوە ئەوە شایەتیدەدا ، کە لە فۆرمی هەمەچەشنی حاڵەتی پلەکانی ئاوەڵناودا واتای لێکسیکی ئاوەڵناو هەر یەك شتە . ڕاستە لە یەکەم تەماشکردندا ، زۆر جار وا دێتە پێشچاو ، کە وا جیاوازیی لە نێوان پلەکانی ئاوەڵناودا دەبێتە شتی جیاواز ، واتە بەوێنە ـ درێژ و درێژتر و درێژترین ـ وا پێدەچێ واتای شتی جیاواز بگەیەنن . بەڵام لە ڕاستیدا درێژ و درێژتر و درێژترین ـ خاسیەتی هەر یەك شت ڕادەگەیەنن ، بەتایبەتی نیشانەی درێژی . بەڵام لە حاڵەتی ( درێژ )دا خاسیەتی واتای سەربەخۆیی بێپێوەندێتی بە شتی ترەوە نیشان دەدا . لە حاڵەتی ( درێژتر )دا هەر ئەو خاسیەتە واتای بەندێتی و پێوەندێتی نیشان دەدا بە شتیترەوە لە ڕێی بەراوردکردنیانەوە . فۆرمی ( درێژتر ) دوو شت ( یان دوو پۆل یان دوو دەستە .. ) بەرانبەر یەکتر ڕادەگرێ . یەکێکیان لە ئاست ئەوی تردا پتر ( درێژ )ە . لە مەوە دەبینین لە بەکارهێنانی تایبەتی ئاوەڵناو لە پلەی بەراورددا لە پێکهاتنیدا پێشبەندی ( لە ، ژ .. ) هاوبەشی دەکات ، وەك :

منیش لە تۆ زیاتر
پەسەندکەر و گوێلێگر

( گۆران ، ل١٠٥ )

شەڕ ژ بێکارییێ چێترە

( کوردۆ ، ل ٢٤٠ )

لە حاڵەتی ( درێژترین ) دا نیشانەی درێژی ، هەروەك لە حاڵەتی (درێژتر)دا سەرلەنوێ نیسبی واتا دەدا ، بەڵام جیاوازی لەگەڵ (درێژتر)دا ئەوەیە کە فۆرمی ( درێژترین ) وا دەگەیەنێ ، کە ئەم نیشانەیە لە پلەیەکی

بالآدایە لـە ئاسـت هـەموو حاڵەتـەکانی تـری هـەمان نیشـانەدا . بـەم پـێـیـە (درێژتریـن) وا دەردەخـا کـە خاسـیەتی ئـەو نیشـانەی شـتە لەگـەڵ هـەموو پۆلەکانی ئەم یان ئەو شتەدا بەراورددەکرێ ، کە خاوەنی ئەو نیشانەیەن و لە نێوان هـەموویاندا ئەم پلەی بالآیانە . شت هەیە خۆی لە ئەسـڵدا درێـژ نیـیە ، بەوێنـە ( دەرزی ) ، بـەڵام دەتوانـێ وەك هـەرە درێـژ خۆی بنوێنـێ لـە بەراوردکردنیدا لەگەڵ کۆمەڵەی دەرزی تردا . لەمەوە دەردەکەوێ ئەگەر شت بە تـەنیا وەربگیرێ ، ئـەوە لـە باری خاسیەتی درێژی‌یـەوە هـەر دەشـێ وەك ( درێـژ ) تەماشـابکرێ ( دەرزی درێـژ ) . ئـەم فۆرمـەش فۆرمـی چەسـپیوی ئاوەڵناوە بەکارهێنانی فۆرمی ( درێژتـر ) یـان ( درێژتریـن ) ، ئـەوە نیشـان دەدا ، کە شتەکە بە تەنیا تەماشانەکراوە ، بەڵکو لە بەرانبـەر هاوجنسـەکانی ڕاگیراوە

هەر ئەو نیسبی‌یەت ڕاگەیاندنەی دەلالەتـە ڕێ بە فۆرمـی پلـەی بـەراورد و پلەی بالآ نادات لە نێو ڕیزە وشەی تری هاوخاسیەتدا شوێنی هەمیشەیی بۆ خۆیان بدۆزنەوە . بۆ نموونە ، ئەگەر لە نێو ئەو ڕیزە وشانەدا کە خاسیەتی ڕادەی گەرمی و ساردی لەیەك نزیك دەخاتەوە ، ناوی وشەی (فێنـك) بێنـین ، ئـەوە دەبینـین جێگـایێکی دیـاریکراوی لـە نێـوان وشـەکانی ((گـەرم)) و (( سارد ))دا هەیە . بەڵام هەرچی کێشەی دەستنیشانکردنی شوێنی فۆرمی (( فێنکتر ))ە شتێکی تـرە و جێـی لێدوانـە : دەمـی بوونـی نیسـبی‌یەت لـە گەیاندنی واتای دەلالەتی (( فێنکتر ))دا پێوەندی ناوبراوی لەگەڵ ((گەرم)) و (( سارد ))دا تێك دەدا . لە ڕاستیدا ئەو جۆرە حاڵەتانەی وەك :

( ئەمڕۆ ساردە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لـە دوێنـێ گـەرمترە ) نیشـانی ئـەوە دەدات ، کـە جیـاوازی لەگـەڵ (( فێنـك ، فێنکـتر ))دا ، ئەوەیـە دەتوانـێ وا ڕابگەیەنێ کە بەبێ نیسبی‌یەت (( ساردتر ))ە

بەو پێیـە لـە هـەر سـێ فۆرمـی پلـەکانی ئاوەڵنـاودا مەبەسـت هـەر یـەك دەلالەتە . بەڵام جیاوازیی پلەی بەراورد و پلەی بالآ لەگەڵ پلەی چەسپیودا ،

ـرمیە ئەوان خاسیەتی نیسبی‌یان تێدایە . پلەی بەراورد و پلەی بالاّ شتێك
ـجیا نیشان نادەن ، بەڵکو نیشانی بەراوردیان دەدەن لەگەڵ شتی تردا .

نیسبی‌یەت )) واتای پلەی بەراورد و پلەی بالاّ یەك دەخا و پێکەوە
ـرانبەر پلەی چەسپیو ڕایان دەگرێ . بە واتاییێکی دی سێ پلەی ئاوەڵناو
ـیەك ڕادەدا نین : بەگشتی دۆخی پلەی ئاوەڵناو دابەش دەبێ بەسەر پلەی
چەسپیو و پلەی نیسبی‌دا . هەرچی پلەی نیسبی‌یشە دابەش‌دەبێ بەسەر
پلەی بەراورد و پلەی بالاّدا .

لەبەر ئەوەی هەموو پلەکانی ئاوەڵناو هەر یەك شت نیشان‌دەدەن ، بۆیە
ڕاست نی‌یە وەك وشەی جیاجیا تەماشابکرێن ، واتە وشەی نوێ ڕۆنانێن ،
بەڵکو فۆرمی جۆربەجۆری یەك وشە دەردەبڕن . کەوابوو مەسەلەکە
وشەگۆڕی‌یە ، نەك وشەڕۆنان .

ئەو بارودۆخەی کە وا ژمارەییێکی زۆر لە ئاوەڵناو پلەی بەراورد و پلەی
بالاّیان لێ‌پەیدا نابی ، دژی ئەوە ناوەستێ کە پلەی بەراورد و پلەی بالاّ بە
حاڵەتی ڕێزمانی دانرێن . وەك دەزانین لە بەشە ئاخاوتنەکانی تریشدا
هەندێ وشە هەن بەر ئەم یان ئەو حاڵەتی ڕێزمانی ناکەون و ئەمە نابێتە
کۆسپ و بەرهەڵست لە ڕێگای بوونی دەستوورە گشتی‌یەکەدا . جا بۆیە
سەیر نی‌یە ئەگەر هەندێ ئاوەڵناو پلەی بەراورد و پلەی بالاّیان نەبێ .
ئەمەش بەندە بەوەوە کە وا ئەو دەلالەتەی ئەو ئاوەڵناوە دەیەگەیەنێ لە
چۆنیەتی‌دا مەودای بەراوردی نەبێ .. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ، دەلوێ واتای
ئەو جۆرە وشانە بە ڕێگاییێکی‌تر دەربرِدرێ ـ واتە بە گۆڕینی واتایان دەتوانن
ئەو خاسیەتە وەربگرن و لە پلەی بەراورد و پلەی بالاّدا بەکاربهێنرێن . بۆ
نموونە :

پلەی بەراورد :

ئەمڕۆ پرچی لە دوێنێ پتر زێڕین بوو .

پلەی بالاّ :

ئەمرۆ پرچی لە هەموو ڕۆژ پتر زێرین بوو .

لە بارەی ئەوەوە ، کە پلەکانی ئاوەڵناو فۆرمی ڕێزمانی جیاوازی وشەن نەك وشەی جیاجیان ، هەروەها ئەو ڕاستییەش شایەتیدەدا ، کە هەموو پلەکان هەمیشە بە ڕێكوپێکی لە یەك ڕەگەوە سازدەکرێن ، لە کاتێکدا ئەو وشانەی دەلالەتی جیاواز نیشاندەدەن خاوەنی ڕەگی جیاوازن ، وەك :
سارد . فێنك ، گەرم ...

لە سەرەتادا جیاوازی لە نێوان پلەکانی ئاوەڵناودا لە زمانە هیندو ئەوروپاییەکاندا بەندبوو بە حاڵەتی تاك و جووت و کۆوە . پلەی چەسپیو پێوەندییکی دیاری کراوی بە ژمارەی تاکەوە هەبوو . پلی بەراورد پێوەندی بە جووتەوە ؛ پلەی بالا بە کۆوە هەبوو . پاشماوەی ئەو پێوەندییە تاکو ئێستا لە هەندێ زماندا ماوەتەوە ، بەتایبەتی پێوەندیی کۆنی پلەی بەراورد بە ژمارەی جووتەوە .

بوونی سێ حاڵەت بە دوو - واتە نەمانی حاڵەتی جووت و بوونی بە کۆ ، بووە هۆی تێکدانی پێوەندیی پلەی ئاوەڵناو بە فۆرمی ژمارەوە . بە وێنە فۆرمی پلەی بالا هاتە سەر ئەو بارەی بە هەمان دەلالەت نەك هەر لەگەڵ کۆمەڵێ شتدا بەکاربهێنرێ و بەراوردبکرێ ، بەڵکو لەگەڵ دوو شتیشدا بەرانبەر یەکتر ڕابگیرێن ، کە زووتر ئەمە نەدەگونجا .

ئەگەرچی پلەکانی ئاوەڵناو حاڵەتی ڕێزمانین ، بەلام هەندێ جار وا ڕوودەدات ئەو جیاوازییەی پلەکان گەشەدەکات بۆ بوون بە وشەی جیاواز .

لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا ئاوەڵناو سێ پلەی ( ١ـ چەسپیو ؛ ٢ـ بەراورد ؛ ٣ ـ بالا )ی هەیە . بۆ نموونە لە زمانی لاتینیدا (( پلەی چەسپیو ـ gradus positivus )) و ((پلەی بەراورد ـ gradus compartivus)) و (( پلەی بالا gradus superlativus )) بەرچاودەکەوێ . بۆ سازکردنی پلەی بەروارد لە زمانی لاتینیدا نیشانەی (ior) کە هی جنسی نێر و مێیە و ( ius ) کە هی جنسی بێلایەنە دەخرێتە سەر ڕەگی ئاوەڵناو ، بەوێنە :

longus , a , um ، درێژ ـ longus - ior درێژتر )) ( بۆ جنسی نێر و مێ) ؛ ((long - ius درێژتر )) ( بۆ جنسی بێ‌لایەن ) . پێکهێنانی پلەی بالاش بە هۆی لکاندنی نیشانەکانی (( issimus ) ـ بۆ نێر ؛ ( issima ) بۆ مێ ؛ ( issimum ، . بۆ بێ‌لایەن ))ەوەیە بە ڕەگی ئاوەڵناوەوە . وەك : long - issimus درێژترین )) (( بۆ جنسی نێر )) ؛ ( ( long issima درێژترین )) بۆ جنسی مێ ) ؛ (( long issimum درێژترین )) ( بۆ جنسی بێ‌لایەن )) . جگە لەو ڕێگا مۆرفۆلۆژی‌یە ، هەروەها هەندێ ئاوەڵناو لە ڕێگای لیکسیکی ( وەسفی ، تەحلیلی )یەوە پلەی بەراورد و پلەی بالآیان پێ دەدرێ . بەوێنە وشەی (( magis پتر ، زیاتر )) لە پێش پلەی چەسپیودا دادەنرێ و واتای پلەی بەراورد پەیدادەبێ ، یاخود وشەی maxime لە هەموان پتر ، لە هەمان زیاتر )) دەخرێنە بەردەم پلەی چەسپیو و واتای پلەی بالآ ساز دەبێ ..

لە زمانی فەرەنسیدا پلەی بەراورد ( le comparatif ) و پلەی بالآ ( le superlatif ) بە یاریدەی ئاوەڵکرداری چەندێتی سازدەبن و فۆرمی ئاوەڵناوەکە هیچ ناگۆڕێ . پلەی بەراورد ئەگەر بۆ دەربڕینی چۆنێتی‌یێکی بەرزتر بێ ، ئەوە وشەی (( Plus ـ پتر ، زیاتر )) بەکاردێنرێ . بێتو مەبەست لە ڕادەی چۆنێتی‌یەکە نزمتر بێ ، ئەو دەم وشەی (( moins ـ کەمتر )) دەوترێ . کاتێ شتە بەراوردکراوەکان لە یەك ڕادەدا بن ، ئەوسا وشەی aussi ـ هەر هێندەی )) یان (( Si ـ هێندەی )) بەکاردەبرێن . بەشی دووەمی بەراوردەکەش بە یاریدەی ئامرازی ( que )ەوە بە بەشی یەکەمەوە دەبەسترێتەوە ... هەرچی پلەی بالآشە بە یاریدەی ئامرزای (Ie , Ia , Ies) سازدەبێ و لە پێش وشەی دووەمی بەراوردکراوەکەشەوە پێشبەندی ( de ) دادەنرێ ...

پلەی بەراورد و پلەی بالآ لە زمانی ڕووسیدا لە دوو ڕێگەوە سازدەبن :

١ـ سادە (واتە ڕێگەی مۆرفۆلۆژی) ؛ ٢ـ ناسادە (واتە ڕێگەی لێکسیکی) .
ڕێگەی سادە بە یاریدەی هەندێ نیشانە پێك دێ : بۆ پلەی بەراورد بە زۆری نیشانەی (( ee (eu) )) بەکاردێ و نیشانەی (( ێ ، شێ ))یش ناونـاوە . پلەی بالاّ بە هۆی نیشانەی (( یێشی ( ئایشی ) ))ەوە ڕۆدەنرێ . هەرچی ڕێگەی ناسادەشە ، ئەوەیە کە بۆ پلەی بەراورد وشەی (( بۆلێ ـ پتر ، زیاتر )) و بۆ پلەی بالاّ وشەی (( سامیی ، سامەیا ، سامۆێ ـ هەرە )) دەوری پێکهێنانی ئەو حاڵەتە دەبینن .

لە زمانی ئاوێستادا بۆ پێکهێنانی پلەی بەراورد و پلەی بالاّ دوو حاڵەت هەبوو :

١ـ پێکهاتنی ڕاستەوخۆ لە ڕەگەوە .

لەم حاڵەتەدا پلەی بەراورد نیشانەی (( YAS , YAS ـ بەش ، باش )) وەردەگرێ و پلەی بالاّش نیشانەی (( ISTA . یشتە ))ی دەچێتەسەر .

٢ـ پێکهاتنی لە قەدی ئاوەڵناوەوە .

لەم بارەدا پلەی بەراورد نیشانەی (( TARA ـ تەرە )) وەردەگرێ و لە چەند فۆرمێکیشدا شێوەی (( ARA ـ ەرە )) دەبینرێ . هەرچی پلەی بالاّیە نیشانە ((TAMA ـ تەمە))ی پێوە دەلکێ و ناوەناوەش شێوەی (( AMA)) بەرچاودەکەوێ .

لە زمانی فارسیی ناوەڕاست ( پەهلەوی )دا پلەی بەراورد بە یاریدەی نیشانەی ( تەر ) پێك دێ ، وەك : (( سەخت + تەر ـ سەختتەر )) ؛ (( سپووك ( سووك ، ئاسان )) + تەر ـ سپووکتەر ))) .. چەند وشەیێکی کەمیش لە ڕێگای گۆڕینی دەنگی ناوەندەوە پلەی بەراوردیان وەردەگرت ، ((کەم (کەم) ـ کێم (کەمتر)) ، ((ڤەس ( فەر ، زۆر) ـ ڤێس (فرەتر ، زۆرتر) )) ؛ ((ڤەه (باش) ـ ڤێه (باشتر) )) ... نیشانەی هەرە باوی پلەی بالاّ ((توم)) بوو ، وەك : ((خوەس (خاس ، باش)) ـ خوەستوم (خاسترین ، باشترین) )) ...

هـەرچی نیشـانەی ( یسـت )ە کـەمتر بـەکاردەهێنرا ، وەك : (( مەسیسـت مەزنترین ) )) ...

لـە ڕسـتەدا کـە بـەراوردی دوو شـت دەکـرا پێشـبەندی (( هــەرچ )) یـان ( کوو )) .. بەکادردەهێنران ، کە واتای (( لە ))ی کوردی دەگەیەنن . هەرچی پێشبەندی ( هەرچ )ە بۆ پلەی بالاًش بەکاردەهێنرا ...

لـە زمانی فارسـیی نوێدا نیشـانەی ( تـەر ) پلـەی بەراورد و ( تـەر + یـن ) پلەی بالاً سازدەکەن

پلەی بەراورد لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا بەیاریدەی نیشانەی (تر) پێك‌دێ و لـە دیـالێکتی ڕۆژهەلاًتیشـدا بە هـۆی ( تـر ، تـەر )ەوە . پلـەی بالاًش لە هەردوو دیالێکتدا لـە پلـەی بـەراورد و هـەندێ جێنـاو پـەیدادەبێ و هـەندێ وشـەش لـە دیـالێکتی ڕۆژئـاوادا بـە یـاریدەی نیشـانەی ( تریـن ) سازدەبێ .

لە زمانی پشتۆدا پلەی بەراورد بە یاریدەی پێشبەندی ( تـر ) پێك دێ و پلەی بالاًش بە هۆی دەستەواژەی ( تر تولو )ەوە سازدەبێ ، وەك :

احمد تر محمود مشردی ( ئەحمەد لە مەحموود گەورەتر )

احمد تر تولو مشردی ( ئەحمەد لە هەموان گەورەترە )

لە زمانی کوردیدا ئاوەلًناو لە ڕووی پلەوە سێ جۆرە :

١- پلەی چەسپیو

٢- پلەی بەراورد

٣- پلەی بالاً .

- پلەی بالاً الدرجة التفضيلية Superlative degree

لە زماتی ئەدەبیی کوردیـدا پلـەی بالاًش هـەروەك پلــەی بـەراورد لـە دوو ڕێگەوە ڕۆدەنرێ :

١- ڕێگەی مۆرفۆلۆژی ، کە ئەویش بەیارمەتی نیشانەی ( تر + ین = ترین ) سازدەبێ . واتە یان ( ین ) دەخرێتە سەر ڕێژەی پلەی بەراورد یان ( ترین دەخرێتە سەر پلەی چەسپیو . وەك : جوانترین ، ئازاترین ، ناسکترین

ئەمەوێ کە دەرچووم لەم دێیە بەیانی
خاتیرەم هەڵگری جوانترین نیشانی !

( گۆران ، ل٢٦)

کاتێ نیشانەی ( تر ) یاخود ( تر + ین ) دەخرێتە سەر وشەیێك ، هەندێ دیاردەی فۆنەتیکی دێتە کۆڕێ :

١- ئەگەر وشە کۆتایی بە دەنگی ( ت ) بێت و دەنگی پێشیشیەوە نەبزوێن بێ ، ئەوە لە دەربڕیندا یەکێك لەو دوو ( ت ) ە - واتە ( ت )ی کۆتایی وشەکە یان ( ت )ی سەرەتای نیشانە - قووت دەردرێ . ئەمەش بەر یاسای کورت کردنەوە و تێداچوون دەکەوێ . وەك :

کورت + تر ( تر + ین ) = کورتر ، کورترین
پت + تر ( تر + ین ) = پتر ، پترین
درشت + تر ( تر + ین ) = درشتر ، درشترین
ڕاست + تر ( تر + ین ) = ڕاستر ، ڕاسترین
خەست + تر ( تر + ین ) = خەستر ، خەسترین

٢- بێتو وشە کۆتایی بە دەنگی (ت ) بێت و دەنگی پێشیشیەوە بزوێن یان نەبزوێنی ( و - W ) و ( ی - Y ) بوون ، ئەوە هەردوو (ت)ەکە دەوترێن . وەك :

(ا) : مات + تر ( تر + ین ) = ماتتر ، ماتترین
(ە) : بلیمەت + تر ( تر + ین ) بلیمەتتر ، بلیمەتترین
(وو) : پەرپووت + تر + تر + ین ) = پەرپووتتر ، پەرپووتترین
(و) قوت + تر ( تر + ین ) = قوتتر ، قوتترین

**(ی) زیت + تر ( تر + ین ) = زیتتر ، زیتترین**

**(یٚ) شێت + تر ( تر + ین ) = شێتتر ، شێتترین**

**(و۔ W) : چەوت + تر ( تر + ین ) = چەوتتر ، چەوتترین .**

**... هتد .**

**٣۔ ئەگەر وشە کۆتایی بە دەنگی ( د ) بێت ، ئەوە لە دەربڕیندا ( د )ەکە ناوترێ . هۆی ئەمەش کلۆرکردنە یان تواندنەوە . وەك :**

**زیاد + تر ( تر + ین ) = زیاتر ، زیاترین**

**بڵند + تر ( تر + ین ) = بڵنتر ، بڵنترین**

**توند + تر ( تر + ین ) = تونتر ، تونترین**

**سارد + تر ( تر + ین ) سارتر ، سارترین**

**٤۔ بێتو وشە کۆتایی بە دەنگی ئاوازەداری ( ز ، ژ ... ) بێ ، ئەوە کپ دەبن و وەك (س ، ش ...) دەوترێن . لێرەدا بەر یاسای تواندنەوە دەکەون . وەك :**

**بەرز + تر ( تر + ین ) = بەرستر ، بەرسترین**

**تیژ + تر ( تر + ین ) تیشتر ، تیشترین**

**٥۔ ئەگەر وشەیێك کۆتایی بە هەر دەنگێکی بزوێن یان نەبزوێن ( جگە لە (( ت ، د ، ز ، ژ )) ) بێت ، ئەوە بێ هیچ گۆڕانێك (( تر + ین )) وەردەگرێ ، وەك :**

**گەورە + تر ( تر + ین ) = گەورەتر ، گەورەترین**

**سپی + تر ( تر + ین ) سپیتر ، سپیترین**

**ماندوو + تر ( تر + ین ) = ماندووتر ، ماندووترین**

**......**

**خراپ + تر ( تر + ین ) = خراپتر ، خراپترین**

**سوور +تر ( تر + ین ) = سوورتر ، سوورترین**

**تەڕ + تر ( تر + ین ) تەڕتر ، تەڕترین**

پیس + تر ( تر + ین ) = پیستر ، پیسترین

باش + تر ( تر + ین ) = باشتر ، باشترین

پاك + تر ( تر + ین ) = پاكتر ، پاكترین

تاڵ + تر ( تر + ین ) = تاڵتر ، تاڵترین

نەرم + تر ( تر + ین ) = نەرمتر ، نەرمترین

جوان + تر ( تر + ین ) جوانتر ، جوانترین

هتد .

ئەو رێگە سەرەكی‌یە ( واتە ـ رێگەی مۆرفۆلۆژی ) ، كە لە زمانی ئەدەبیی كوردیدا فۆرمی پلەی باڵا رۆدەنێ و لێی دواین ، لە ناوچەی موكریان و سۆران ... یشدا بە هەمان شێوە دەبینرێ .

٢ـ رێگەی لێكسیكی . ئەمیش دوو جۆری هەیە :

أ ) بەیارمەتیی وشەی (( هەرە ) و ئاوەڵناو لە پلەی چەسپیودا . وەك :

هەرە شیرین ؛ هەرە ئازا ؛ هەرە گەورە .

ئازاد كوڕی هەرە گەورەی مام بارامە .

ب) بە یارمەتیی دەستەواژەی وەك ( لە هەموو ؛ لە هەموو شت ؛ لە سەرتاپایان ؛ لە تێكڕایان) و ئاوەڵناو لە پلەی بەراورددا . نموونە :

جگە لەوەش لە هەموو شت خراپتر :

دڵ خاڵی‌یە ، كوورەم تیا نی‌یە ئاگر ،

( گۆران ، ل١١٥)

لەهەموان پێشتر سای سینە سافان

مخدومی ( معدوم ) مەولەوی جافان

( پیرەمێرد ، ل ٢٤٤)

ئەو دوو جۆرەی ڕێگەی لێکسیکی ، کە لە زمانی ئەدەبیدا هەیە و لێی دواین ، بە هەمان چەشن لە بەشە دیالێکتی موکریان و سۆران .. یشدا دەبینرێ .

نموونە :

بەزمی ئەمشەو لە هەموو شەوان زیاترە

( تحفەء مظفرية ، ب ١ ، ل١٨٦ )

ئەمنیش یەکم لەوان عالەمان ، خۆدەگرم ، لە هەموان کەمتر

( تحفەء مظفرية ، ب ٢ ، ل٣٤٢)

نیشانەی ( تر + ین = ترین ) ، کە لە بەشە دیالێکتەکانی سلێمانی و موکری و سۆران ... دا نیشانەی پلەی بالایە ، لە شێوەی هەوراماندا لە وێنەی ( تەر + ین = تەرین ) دا بەدەردەکەوێ ، وەك ( کەمتەرین ... ) .

نموونە :

هەر گاه جەرووی لوتف ، زوڵفان عەنبەرین

ئەر پەرسی ، ئەحواڵ بەندەی کەمتەرین

( صەیدی ، ل١٦١ )

لە ئەدەبی کۆنی کاکەییەکانیشدا ، هەروەك ناوچەی هەورامان ( تەرین ) بەکارهێنراوە .

نموونە :

مەعلووم جە فیرقەی گوناهکارانم

کەلب کەمتەرین قاپی یارانم

(حیلمی ، ل٢٦٠)

لە بەشی هەرە گەورەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی تایبەتی نییە ، کە پلەی بالای پێ ڕۆبنرێ ، بۆیە ئەو مەبەستە بە ڕێگەی لێکسیکی سازدەبێ . ئەم ڕێگە لێکسیکییەش بە هۆی چەند وشەیەکەوە پێك دێ :

ا) به یاریدەی وشەی (( هەرە ))وە ، کە لە پێش ئاوەڵناوی چەسپیوەوە دێت . ئەمەش ڕێگەی هەرە باوە و لە زوربەی زۆری دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەبینرێ .

چەند نموونەیێك :

ئەحمەدی خانی مێرەکی هەرە مەزن بوو

نەسرین کەچەکی هەرە جوان و زیرەکە

ب ) لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتدا بە هۆی وشەی (( لاپ ))ەوە کە هەر مانای ( هەرە ) دەگەیەنێ پلەی بالاّ سازدەبێ . وشەی (( لاپ ))یش هەروەها دەکەوێتە پێش ئاوەڵناوی چەسپیوەوە . وەك :

ئادەمی لاپ باش ( ئادەمیزادی هەرە باش )

کەچکێ لاپ ڕند ( کچی هەرە جوان )

جـ ) لە ناوچەی بادینان ( هەر یێ ؛ هەر یا ؛ هەر یێد )) لە پێش ئاوەڵناوی پلەی بەراوردەوە بەکاردێنن و پلەی بالاّ دروست دەبێ . وەك :

هەر یا شیرنتر

هەر یا بلنتر

د) لە بەشە دیالێکتی کوردەکانی ئەرمەنستان و زمانی ئەدەبییاندا ((هەری)) بۆ نێرینەو ((هەرە)) بۆ مێینە و بۆ کۆ ؛ (( تەوری )) بۆ نێرینە و (( تەورە )) بۆ مێینە و بۆ کۆ ، کە واتای (( هەرە )) دەگەیەنن ، بۆ سازکردنی پلەی بالاّ بەکاردێنرێن و دەخرێنە پێش پلەی چەسپیوەوە .

ه) لە بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤێتدا بە یارمەتی وشەی وەك : ( حەمووی ؛ حەمووشك ؛ تەڤ ؛ گشك / گشت / گشتێك ، سافك ... ) و پێشبەندی ( ژ ) پلەی بالاّ سازدەبێ . لەم بارەدا ئاوەڵناوەکە لە پلەی چەسپیودایە . بەلاّم لە هەندێ بەشە دیالێکتدا ناوەناوە ئاوەڵناوەکە نیشانەی (تر)ی بەراورد وەردەگرێ ، .. لە ناوچەی بادیناندا بە پێچەوانەوە ئاوەڵناوەکە بێتر نیشانەی ( تر )ی لەگەڵ دێت . وەك :

ڕابە خوە بکە عەتار ... هندە گوستیلکا بکڕە لگەڵ بازنکا لگەل خوە ببە ... گوستیدەکێ ژ هەمبا جوانتر و مەستر ژەهری بکە و ...

( خالید حسەین ، ل ٢٧ )

- پلەی بەراورد الدرجة المقارنة Comparative Degree

لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا بۆ ڕۆنانی فۆرمی پلەی بەراورد دوو ڕێگەی سەرەکی هەیە :

١- ڕێگەی مۆرفۆلۆژی کە ئەویش بە یارمەتی نیشانەی ( تر )ە ، دەخرێتە سەر ئاوەڵناوی چەسپیو .

وەك :

خۆش + تر ——— خۆشتر

چاك + تر ——— چاکتر

باش + تر ——— باشتر

نموونە :

زەردەخەنەکەت پڕ نەشئە وەك مەی

گڕوگاڵەکەت خۆشتر لە صەد نەی

( بێکەس ، ل١٥٤ )

وتی : ڕاستە منیش باوەڕ ئەکەم و ئەزانم کە وایە و بۆ ئێوە ئەمە چاکە و لەوە چاکتر و باشتر چارەیێك نی‌یە

( لە خەوما ، ل٦١ )

لەو ڕستەیەشدا کە بەراوردی تێدا دەکرێ پێشبەندی (لە) دەخرێتە نێوان ئەو دوو وشەیەوە یان ئەو دوو دەستەواژەیەوە یان ئەو دوو ڕستەیەوە ـ بە واتایێکی‌تر ئەو دوو شتەوە ـ کە بەراوردەکرێن .

چەند نموونەیێك :

تریٰ لە سێو خۆشترە

تریٰ کەڵکی زۆرە و لەسێویش خۆشترە

نازەنین لە تۆ زیرەکترە

نازەنین ئەگەرچی کچێکی سستە ، بەڵام لە تۆ زیرەکترە

زانین لە نەزانین چاکترە

زانین ئەگەر کەمیش بیٰ لە نەزانین هەر چاکترە

یەك لە دوو ئاساناترە

یەك جار بێت لە دوو جار ئاسانترە .

... هتد .

لە تێکرای ئەو نموونانەدا دەبینین ، ئەو ئاوەڵناوانەی نیشانەی ( تر )یان وەرگرتووە و پلەی بەراورد ڕادەگەیەنن ، کەوتوونەتە دوا ئەو دوو وشەیەوە ، کە لەگەڵ یەکتردا بەراورد کراون ... بەڵام دەبیٰ ئەوە لەبیر نەکەین ، لە زمانی کوردیدا ئەوەش دەبینریٰ ، کە ئاوەڵناوەکە دەکەوێتە نێوان دوو وشە یان دوو دەستەواژە یان دوو ڕستە بەراوردکراوەکەوە . وەك :

کانییێکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو :

لە بنیا ملەرزیٰ مرواری زیخ و چەو ،

جوانترە لە لای من لە دەریای بیٰسنوور

( گۆران ، ل٤٦)

زاوای بەردەگای ئاواتی دڵ ( عیو ! )

بووکی ڕازاوەی جوانترە لە گوڵ ( عیو ! )

( گۆران ، ل١٤٩)

... کابرای کاروانچی وتی باوکم خوا هەڵناگریٰ ئێوە سەعاتیٰ زیاترە ، بەم تاریکە و سەرما و لێزمەیە ، ئێمەتان لەم قوڕەدا ڕاگرتووە .

( لە خەوما ، ل٣٤ )

لەو بەرزیەدا ئاوازی شایی

بەرزتر لە تەپڵ و ئاوازەی شایی

... هتد

ئەو ڕێگە سەرەکی‌یەی لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا فۆرمی پلەی بەراورد پۆدەنێ و لێی دواین ، لە ناوچەی موکریان و سۆران ... یشدا بە هەمان شێوە دەبینرێن . بەوێنە

خولاّ لە سوڵتان مەحموودی گەورەترە

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ل١٨٦ )

ئەوان لە مە بەغیرەت ترن

( تحفەء مظفریة ، ب٢ ، ل٥ )

ڕۆڵە ، ئەو ئەنگوستیلەی هەڵگرە ، لە پادشایەتیی تۆ چاترە .

( تحفەء مظفریة ، ب١ ، ل١٩٦ )

کوڕە کەچەر وەرە پێشتر

دەم و لێوت کەللەی شەکر

تەتۆ لۆ من لە برام چێتر

( فۆلکلۆر ، ل١١٩ )

.. و گەلێکی تر .

٢ـ ڕێگەی لێکسیکی ، ئەمیش بە یارمەتیی وشەی وەك ( پتر ، زیاتر ، زۆرتر ، کەمتر .. ) سازدەبێ . وەك :

پتر جوانە

زیاتر ئازایە

کەمتر ترشە

زۆرتر باریکە

... هتد .

ئەم ڕێگەیە بە هەمان شێوە لە بەشە دیالێکتی موکریان و سۆران ...یشدا خۆی دەنوێنی

هەرچی نیشانەی ( تر )ە ، کە لە بەشە دیالێکتەکانی سلێمانی و موکریان و سۆران ... دا نیشانەی بەراوردە لە شێوەی هەوراماندا لە وێنەی ( تەر )دا بەدەردەکەوێ ، وەك ( مەزنتەر ) ..

بۆ نموونە

فەرشێ پەی شیرین شۆخ شیرین ڕەنگ

خاستەر جە دیبای کارخانەی فەرەنگ

( خانای قوبادی ، ل٦١)

نمانا ظول `مەت چیهرەی سەوادی

سیاتەر جە بەخت ( خانای قوبادی )

( خانای قوبادی ، ل ٥٧)

واتش : ئەی مەژنوون سالار سەرمەشق

بەدبەختەر جە من تۆ چە سەودای عەشق

( میرزا ئۆلقادر ، ٩١ )

- پلەی چەسپیو الدرجة الثابتة Positive degree

پلەی چەسپیو کە ئاوەڵناوێکی ڕووتە و هیچ نیشانەیێکی مۆرفۆلۆژی نییە (تیژ ، گەرم ، سوێر ، سوور ، ترش ، تاڵ ، سەوز ، ئازا ، ناسك ، پاك ... بێبەرهەم ، بەختەوەر ، ئاگادار ، غەمناك ، نازدار ... سەرگەرم ، قوربەسەر ، سەربەست ، ڕاستکۆ ... ) دەبێتە بناغەی دروست بوونی پلەی بەراورد و پلەی بالاّ .

چەند نموونەیێك .

دەموت دو چلوی خۆمە ئەگەر ( بەکرەجۆ )یی ئەشك
نەبوایە تیژ و بیّ ثەمەر و گەرم و سۆێر و سوور
(نالی ، ل ١٨٠)

لەجیّمانەوە ترش و تاڵت دەکا
تریّ بوو بە سرکە ، عەسەل بوو بە سەم
(مەحوی ، ل ٢٣٦)

## پۆستپۆزیشن
ب . : پاشبەند

| | | |
|---|---|---|
| پۆل | صنف | Class |
| پۆل کردن | التصنیف | Classification |
| پووك | اللثة | Alveolar ridge |
| - پووکەمەلاشوویی | اللثة حنکی | Palatal alveolar |
| - پووکی | السنخی | Alveolar |
| پێبەست | الرابطة | Connective, Relatio |
| پێچەوانە | العکس | Invers , Contray |

## پێشبەند حرف الجر Preposition

= پریپۆزیشن .

لە زوربەی کارە ڕێزمانییە ئینگلیزییەکاندا بۆ پێشبەند ئەم پێناسەیە دەبینرێت : (( پێشبەند ئەو وشەیەیە ، کە لەگەڵ ناو یاخود جێناودا بەکاردێت و پێوندی لەگەڵ وشەیتردا دەردەخات و دەچێتە نێو پێکهاتەی ڕستەوە . بۆ نموونەی :

- لە پەنجەرەکەوە ڕوانیم . - بۆی دووام .
- نامەیەکم لێیان وەرگرت ... هتد

بە بەردەوامی پێشبەند دەبێتە هۆی دیاریکردنی ناو یاخود جێناو لە حاڵەتی بەرکاریدا )) .

لە ڕووی ماناشەوە وتوویانە : (( ڕەنگە نەتوانرێت هەموو مانای پێشبەند بزانرێت ، بەلاّم لە بنەڕەتدا هەموو هێماکردنە بۆ شوێن یان بۆ ئاراستە )) .

لە ڕووی ئەرکیشەوە ئەم خاڵەیان دیاری کردووە : (( یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی پێشبەند دروستکردنی دەستەواژەیە (phrase) ، لەگەڵ ئەو ناوانەی بەدوایدا دێت و ئەم دەستەواژانەش زۆر جار ئاوەڵکردار دروست دەکەن )) . سەبارەت بە شوێنی پێشبەند لە نێو ڕستەی ئینگلیزیدا وتراوە : (( شوێنی پێشبەند ، هەروەکو تێبینیمان کردووە پێشەند بە زۆری دەکەوێتە پێش ئەو ناوەی یان ئەو (شوێنی ناوەی ) کە کاریتێدەکات ، بەلاّم هەر کاتێك ئەو وشەیەی کە پێشبەند کاریتێدەکات وشەیەکی پرسیاری بێت و بکەوێتە سەرەتای ڕستەوە ، ئەوا لەم حاڵەتدا (هەمیشە لە زمانی ئاخاوتندا ) دەکەوێتە کۆتایی ڕستەوە .

نووسەرانی ڕێزمانی کوردییش ئاماژەیان بۆ پێشبەندەکان کردووە و هەر یەك بە پێی بۆچوونی تایبەتی خۆی پیناسەی بۆ داناوە ـ ئێمەش بەم جۆرە پیناسەی پیشبەند دەکەین : ـ پێشبەند ئەو مۆرفێمە ڕێزمانییە ناسەربەخۆیانەن کە ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە بەستنەوەی بەشەکانی ڕستە و پێوەندی ناوەکی دروست دەکەن . پێشبەندەکان لە ڕووی ڕواڵەتەوە سەربەخۆن و بە تەنیا واتا نابەخشن ، بەڵکو لە پاڵ وشەی تردا واتایان بەدەردەکەوێت . پێشبەندەکان دەکەونە پێش ناو ، یا خود جێناو یان ئاوڵناوەوە بۆ نیشاندانی پێوەندی نێوان ئەو وشانە لەگەڵ وشەکانی دیکەی هەمان ڕستەدا . هەروەها پێشبەندەکە و وشەکەی دوای بە جووتە دەبنە تەواوکەر بۆ وشەکەی پێش پێشبەندەکە .

پێشبەندەکان لە هەر دوو ئاستی زمان (مۆرفۆلۆژی و سینتاکس )دا دەوری گرنگ دەبینن لە پێکەوە گرێدانی بەشەکانی ڕستەدا .

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووی زمانی کوردیدا چوار پێشبەندی سەربەخۆی بنجی ڕۆڵی سەرەکی دەبینن ، وەك : (لە ، بە ، بۆ ، ە )و دوو مۆرفێمی دیکەش وەك پێشبەند بەشێوەیەکی لاوەکی دەوری پێشبەند دەبینن ، وەك :

(تا ، بێ) .

مۆرفێمەکانی (لە ، بە ، بۆ ، ە ) ڕوخساری ناسادەیان هەیە ، کە لەگەڵ پاشبەندەکاندا وشەیەك دەخەنە نێوانیان و دەبنە هۆی گۆڕینی واتا و بەخشینی واتای جۆربەجۆری دیکە . بۆ نموونە پێشبەندی (لە) دەبێت بە ڕوخساری (لە ... دا ) ، و (لە ... ەوە) و پێشبەندی (بە)ش دەبێت بە (بە ... دا ) و (بە ... ەوە پێشبەندی ( بۆ ) تەنها یەك ڕۆخساری هەیە و لەیەك حاڵەتدا بە دەردەکەوێت ، وەك : (بۆ ... ەوە) (بۆ سەرەوە ، بۆ خوارەوە ...) . هەروەها پێشبەندی (ە)ش وەك مۆرفێمێکی سەربەخۆی بنجی تەنها یەك ڕوخساری هەیە ، ئەویش لە قاڵبی (ە ...... ەوە ) دایە .

پێشبەندەکانی (لە ، بە) لە ئاستی سینتاکسدا ڕوخساری لکاویان هەیە . مۆرفیمی (لە) دەبیت بە ( لێ ، لێ ... دا) و (لێ ، لێ ... ەوە ) . هەروەها لە قالبی ( تێ ، تی ... دا) و ( تێ ، تێ ... وە) دەردەکەوێت .

پێشبەندی (بە)ش بە ڕوخساری (پێ ، پێ ... دا ) و (پێ ، پێ ... ەوە)دا دەردەکەوێت هەروەها مۆرفیمی (ە)ش دەتوانێت لە ئاتی سینتاکسدا جێگەی پێشبەندەکانی دی بگرێتەوە وەك :

- ئەوان هاتن بۆ کەرکووك ⟵ ئەوان هاتنە کەرکووك .
- من دەبم بە مامۆستا ⟵ من دەبمە مامۆستا .
- تۆ ئاگرت لە من بەردا ⟵ تۆ ئاگرت بەردایە من .

... هتد .

ھ . ، ب . : پاشبەند

پێشگر | السابقة | Prefix

پێشگر کە بە لاتینی ( Praefixus )ی پێ دەڵێن و لە ( Prae ـ پێش ، بەردەوام ... ) و ( Fixus ـ گیر ، لکاو ، نووساو ، چەسپاو ... ) پێکهاتووە ، ئەو مۆرفیمەیە ، کە بە پێشی وشەوە دەلکێ و ڕواڵەت و ناوەرۆکی وشە دەگۆڕێ و دەوری ڕۆنانی وشە دەبینێ .

ب . : مورفیمی وشەدارێژ

پێکەڵ بوون | التطابق | Accordance , Conformity

پێوار | الرمز | Symbol

ب . : تەن

| | | |
|---|---|---|
| پێوارەتی | الرمزية ( مذهب) | Symbolism |
| پێوانە | القياس | Measur |
| پێوەر | مقياس | Measurer , Criterion |
| پێوەندی<br>= پەیوەندی | الارتباط | Communication |
| پێویستی | الضرورة | Necessity |
| پیت<br>= تیپ | الحرف | Letter |

**پیتی برایل**

**لوون برایل ، پاریس ( ١٨٠٩ ـ ١٨٥٢ ) . مامۆستاییێکی گەورەی فێرکەری کوێران بوو . خۆی لە تەمەنی سێ ساڵیدا کوێربووە . ساڵی ١٨٢٩ پیتی بۆ کوێران سازکردووە کە تا ئەمڕۆش لە گشت جیهاندا بەکاردێنرێ . یەکەم کتێب ، کە بە سیستەمی برایل چاپ کرابێ ((مێژووی فەرەنسا)) (١٨٢٧)یە . لە ڕووسیاش ساڵی ١٨٨٥ بەم پیتانە دەستکرا بە چاپکردنی کتێب .**

**هـ . ، بـ . : ئەلفوبێی دەستی**

# ـ ت ـ

**تاف**

**ب . : كات**

| **تاك** | **المفرد** | Singular |
|---|---|---|

**ناوی تاك**

**ناوی تاك ئەو ناوەیە كە تەنیا كەسێك یان تەنیا شتێك نیشان دەدا .**

**لە زمانی كوردیدا فۆرمی ناوی گشتی ، ئەگەر نیشانەیێك ، یاخود وشەییێكی بۆ دووپاتكردنەوە لەگەڵ نەبێ ، ئەوە چۆن بۆ تاك ، هەر بەو جۆرەش بۆ هەموو ڕەگەزی هاوچەشنەكەی بەكاردێت .. بەلاّم بێتو بە دوای فۆرمی ناوی تاكەوە ( ـ ەكە ) ، ( ـ ە )ی نیشانەی ناسیاوی ؛ ( ـ ێك ) ، ( ـ ێ )ی نیشانەی نەناسیاوی بلكێن ؛ یاخود جێناوی نیشاندانی ( ئەم ) و ( ئەو ) ؛ ژمارەی ( یەك ) لە پێشیەوە بێن ، ئەو كاتە ناوەكە جەخت لەسەر تاك دەكا و تاك دەگەیەنێ .**

| **تاكایەتی** | **فردي ، شخصي** | Individual |
|---|---|---|
| **تایبەتی** | **الخاصة ، الخصوصي** | Special |

تەقەڵ ( - ) الشرطة Hyphen

ئەو کۆمەڵە دەستوورەی تەقەڵ لەسەر بناغەیان دادەنرێ ، بەپێی ڕەچاوکردنی ڕێزمانیی ڕستە دادەمەزرێ . بەوێنە

١- دانانی تەقەڵ لە نێوان دەستەی نیهاد و گوزارەدا . وەك :

مردن مردنە - لنگ بڕاوتن چییە ؟

شەش کەڕەت شەش - سی و شەش

٢- جیاکردنەوەی وتەی ڕاستەوخۆ ، واتە جیاکردنەوەی گفتوگۆ لە نێوان دوو کەسدا . وەك :

شەباب دەبیرکردنەوەیدا بوو ، لە نکاو ژنێکی ڕەشتاڵە سەر و کەللە خشتی ، مل بە متومۆری ، دەست پڕ لە بازنی بەغدایی بەپیریەوە هات ، گوتی :

- برا فەرموو پیادە بە ، بۆ بە سواری وەستاوی ؟

- خوشکم پیادە نابم . کارم بە مێردەکەتە ، پێی بڵێ وەدەرکەوێ ..

- مێردەکەم لێرە نیە . دوێنێ بۆ قەڵا گەڕاوە . نازانم چۆن ملی ئەو ڕێگا دوورەی گرت ڕۆی ؟ قەتیش بە پێ نەڕۆییوە .

( دمدم ، ل ١٢٣ )

٣ - تەقەڵ لە پاش وشە هاوخاسیەتەکان و پێش وشەی ڕاگەینەر دادەنرێ ، وەك :

ئازایەتی ، وەفا ، سوارچاکی - ڕەوشتی کوردە .

٤ - لە شێوەی ڕێزمانیدا ، هەروەها دەلوێ تەقەڵ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی شوێنکەوتوو بەکاربهێنرێ . وەك :

ئەوان بۆ وا دەکەن - کەس نازانێ .

٥- تەقەڵ دەشێ لە نێوان وشەی دژواتادا دابنرێ ، ئەگەر وشەی پێوەندی لابرێ . وەك

ئەو نەدەڕۆیشت - ڕاوەستابوو .

کاتیٚ دارا هات من نەنووستبووم - بەخەبەربووم .

تەقەڵ ئەگەرچی لەسەر بناغەی کۆمەڵیٚ دەستووری ڕیٚزمانی بەڕیٚوەدەچی ، بەڵام هەروەها دەشیٚ لە چەند لایەنی دیشەوە دەور ببینیٚ . وەك :

١- ئەگەر تەقەڵ لە جیٚی کۆما بەکاربهیٚنریٚ ، ئەرکی دەربڕین و خستنەڕووی باری ڕیٚزمانی دەبینیٚ .

٢- وا ریٚدەکەویٚ تەقەڵ لەسەر بناغەی واتا دادەنریٚ . بەویٚنە لە ڕستەی لیٚکدراودا ئەگەر پیٚویست بکا لە ڕستە شویٚنکەوتووەکەدا ئەنجامیٚکی چاوەڕوان نەکراو یان هەواڵیٚکی سەیر یان گۆڕینی باس یان ڕوونکردنەوە نیشان بدریٚ ، ئەوە بە تەقەڵ دەردەبڕیٚ . بەویٚنە :

هەموویان ماوەیەك لە شویٚنی خۆیاندا هاتن و چوون و دوایی قوتابخانەکە تیٚکڕا - وەك قوتابخانەیەکی خویٚن گەرم - دوایی هات ..

( مەحوی ، ل سیٚویەك )

٣- تەقەڵ چۆن ئەرکی ڕیٚزمانی یان ئەرکی واتایی دەبینییٚ ، هەروەها دەتوانیٚ لەیەك کاتدا هەردوو ئەرکەکە ببینیٚ .

٤ - تەقەڵ لە هەندیٚ باردا دەتوانیٚ واتای ئاواز بگەیەنیٚ ، ئەویش کاتیٚ بۆ گەیاندنی واتای وەستانی تایبەتی دادەنریٚ .

٥- جاری وا هەیە تەقەڵ بۆ نیشاندان و خستنە پیٚش چاوی وشەیەك دەنووسریٚ . کە لەناکاو دیٚتە ناو ڕستەوە بەویٚنە :

بەناسکیی پەل و پۆی تۆ - مەحاڵە - فیٚر نابیٚ !

| تەکدانەوە | الانعکاس | Reflex |
|---|---|---|

**تەلەفوزکردن** **التلفظ** Pronunciation

= دەربڕین ، گۆکردن

**تەن** **الجسم** Figure , Body

پەیدابوونی بارودۆخی بێ سنووری ژمارەی نیشانە لەوەوە دێ ، کە هەموو نیشانەکانی لەسەر شتێ ڕۆدەنرێن ، کە نیشانە نین و ژمارەیان سنووردارە ، ئەو نانیشانانە ، کە بەشێکی نیشانە دەکەونە سیستەمی نیشانەوە پێیان دەترێ تەن ( Figure ) . ئەمە زاراوەییەکی برینسازییە و لێردا بەکارهێنانی لەبارە بەم شێوەیە زمان کۆکراوەییەکی وایە ، کە بە یاریدەی تەنی ئامادبوو لە ڕێگەیەوە دەتوانێ ژمارەییەکی بێشومار نیشانەی نوێ ڕۆبنێ ...

هەروەها باوەڕییەکی وەهاش هەیە ، کە ئەوەی ئێلمسلێڤ ناوی ناوە تەن ( Figure ) پێی دەڵێن نیشانەی جیاکەرەوە ( Diacritical mark sign ) .

ئەوەش کە بە نیشانەی تایبەتی ناوبردووە ، بە نیشانەی پێوار ( الرمز – Symbol ) دادەنێن هەروەها دەشێ نیشانەی جۆری یەکەم ( تەن و جیاکەرەوە ) و جۆری دووەم ( پێوار )یشیان پێبوترێ .

**تەوەرە** **المحور** Axis

**تەوژم** **الضغط** Pressure

= فشار

**ترازان** **التفكك** Differentiation *

ترازان ئەو دابەشبوونە ناوچەیی‌یەی زمان دەوترێ ، کە لە ئەنجامیدا زمان و دیالێکتی خزم پەیدادەبن .. ترازان ژمارەی زمان زیاد دەکا . ترازن و نزیککەوتنەوە پرۆتسێسی کۆمەلآیەتین ، چونکە جیابوونەوە و یەکگرتنی زمانان بە هۆی حاڵەتی ڕوودانی ترازان لە سیستەمی کۆمەڵگەی سەرەتایی‌دا بە ڕادەی نشێوی و کزیی هێزی بەرهەمهێنان و کەمیی ژمارەی تیرە و خێڵ و نزمیی پەلی چڕیی دانیشتووان ڕوون‌دەکرێتەوە . ئەم سێ ڕاستی‌یە وایان لە مرۆی زوو کردبوو بە بارودۆخی جوگرافی و ئاو و هەواوە پتر بەندبێ . گەڕان بە دوا خواردن و بەرگری لە خۆکردن ( دارستان ، چیا ، ڕوبار ) بوونە هۆی کۆچ‌کردنی هۆز و عەشرەت ، یان گیربوونیان لە شوێنێك ..

**ترپە** **الایقاع** Breath group , Rhythm

ترپە دوو یان چەند برگەیەکە ، کە هێز یەکی خستبن . ترپە دەتوانێ هاوسەنگی وشە بێ و وشە لە گرووپی یەك‌کێشیدا یەك‌بخا .

ئەو جۆرە دابەشکردنەی ترپەیی ڕستە لە بنەمای ئاوازی شیعردا هەیە ، کە کێشەکەی گۆڕینی ژمارەیێك برگەی بێ‌هێز بە برگە و دێڕ دەگرێتە خۆ .

**توانست** **القدرة ، الامکانیة** Ability

**توخم**

بڕ .: جنس

---

* لە ( Differo )ی لاتینی‌یەوە وەرگیراوە ، کە واتای ( بلأودەکەمەوە ، جیای دەکەمەوە دەگەیەنێ ) .

**تیان** **غیر مباشر** Indirect

= ناڕاستەوخۆ

**تێچوونی دەنگ** **التصحیف** Metaplasm , Misspelling

لە زۆر زماندا ئارەزووی تێچوونی دەنگ هەیە ، بەتایبەت کاتێك لە وشەیەکدا یان لە دوو وشەدا ، کە پێکەوە بێن و دوو دەنگی وێکچوو یەك بەدوا یەکدا بێن ... ئەمەش بۆ خۆ دوورخستنەوە لە زۆریی بزووتنەوەی ئەندامانی ئاخاوتن و ئاسانکردنی کاری دەربڕینە ..

بە واتایێکی دی دەتوانین بڵێین ( تێچوونی دەنگ ) بریتییە لە سوانی دەنگێك یان زیاتر لە مۆرفێمێکدا و ئەمە مەبەست ئاسانکردنی دەربڕینە . ئەم جۆرە گۆڕانەش . کە بەسەر وشە یان مۆرفێمەکاندا دێ لە ئەنجامی هەڵکەوت و دەرکەوتنیان لە سنووری جیاوازدا دێتە کایەوە ، لە هەندێ حاڵەتدا شێوە قاڵبی جیاواز وەردەگرن بێ ئەوەی ئەرك و واتایان کەمبێتەوە .

لە زمانی کوردیدا تێچوونی دەنگ لە سێ باردا دەبینرێتەوە :

أ ـ تێچوونی کۆنسۆنانت ، ب ـ تێچوونی بزوێن ، جـ ـ تێچوونی کۆنسۆنات و بزوێن پێکەوە .

١ـ شەش دەنگی کۆنسۆنانتی / د/ ، / ت / ، / ب / ، / ه/ ، / ك / ، / ئـ / تێچوونیان زۆر بەرچاوە و بە تایبەتی سیانی یەکەمیان ـ واتە :/ د/، / ت / ، / ب / . ئەمەش دەکرێ بە دیاردەی بەرەو ئاسانبوونی زمان دابنرێ ...

بەڵگەی مێژووییش ئەوە دەردەخا ، کە لە زوودا تێچوونیان وەك ئێستا چالاك نەبووە .

چەند نموونەیەك بۆ تێچوونی ئەو شەش کۆنسۆنانتە :

منداڵ > مناڵ ؛ زیادتر > زیاتر

دەست > دەس ؛ کەوت > کەو

نیشانمبدە > نیشانمدە ؛ هەڵبگرە > هەڵگرە

هورد > ورد ؛ خۆرهەتاو > خۆرەتاو

چاکتر > چاتر ؛ پیاوێك > پیاوێ

گوڵ > ئاو > گوڵاو ؛ دائم > دایم

٢- دەنگی بزوێنی /ە/ ، /ا/ ، /ێ/ ، / i /، بەتایبەت کە بزوێنێکی‌دی بێتە پاڵیان دەشێ تێبچێ .. بەڵام لایەنی تێنەچوونیشیان هەیە ، بەمەرجێك کۆنسۆنانتێك بۆ پاراستنیان بێتە نێوانەوە .

نموونەی تێچوونی ئەو دەنگە بزوێنانە :

خەندە + ان = خەندان

چەقۆ + ەکە = چەقۆکە

بمگرت + با + ایە = بمگرتبایە

شکان + اندن = شکاندن

دانان : دا - نێ + ەر = دانەر

سووتان : سووتێ + ەن = سووتەن

گەنم > گەنمەکە

...

٣- / ئە/ کە لە کۆنسۆنانی / ئ/ و بزوێنی / ە / پێکهاتووە ، یان / ئا / کە بریتییە لە کۆنسۆنانتی / ئـ / و بزوێنی / ا / ، یاخود / با / کە لە کۆنسۆنانتی ب/ و بزوێنی/ ا / سازبووە ، لە زۆر وشەدا تێدەچن :

ئەمن > من

ئەگەر > گەر

گا + ئاسن = گاسن

کانی + ئاسکان = کانێسکان

بکەوتبامایە > بکەوتمایە

بچووبامایە > بچوومایە

- تێچوونی دەنگی بزوێن

بـ.: تێچوونی دەنگ

- تیچوونی دەنگی کۆنسۆنانت

بـ.: تێچوونی دەنگ

- تێچوونی دەنگی کۆنسۆنانت و بزوێن پێکەوە

بـ.: تێچوونی دەنگ

تیپ

بـ.: پیت

تین الشدة Strenghth , Force

جنس | الجنس | Gender

= زایەند ، ڕەسەن ، توخم

- جنسەکانی ناو

لە زۆر زماندا جنسەکانی ناو بەهۆی کۆتاییی وشەوە بێت یاخود هەر نیشانە و خاسیەتێکی‌تر بیّ لە یەك جیادەکرێتەوە . بەوێنە لە زمانی لاتینیدا ، ناو سیّ جنسی هەیە : جنسی نێر ( genus masculinum ) ؛ جنسی میّ (genus femininum)؛ جنسی بیّلایەن ( genus neutrum ).
ئەم سیّ جنسە یا لە ڕێی واتاوە، یا لە ڕێی نیشانەی کۆتایی‌یەوە ، یا لە ڕێی پاشگرەوە لە یەکتر جیادەکرێنەوە . ناو لە زمانی ڕووسیشدا ، وەك لاتینی خاوەنی سی جنسە ، بەلاّم لێرەدا نیشانەی کۆتایی دەوری سەرەکیی جیاکردنەوە دەبینیّ . لە زمانی ڕووسیدا جگە لەو ناوانە کە کەسانی نێرینە و مێینە دەگەیەنن ، ئەوە لە ڕێی نیشانەوە جنس ئاشکرا دەبیّ ، بەوێنە : ١ـ ئەو ناوانەی کۆتایی‌یان بە ( ا ) و ( یا ) دێت بە جنسی میّ دادەنرێن ، وەك : (( ڕۆدینا ـ نیشتمان ) )) ، (( زیملیا ـ (زەوی ) )) ... ؛ ٢ـ ئەو ناوانەی نیشانەی کۆتایی‌یان نی‌یە و دوا دەنگیان کۆنسۆنانتی توندە بە جنسی نێر دادەنرێن ، وەك : ((لێس ـ (دارستان) )) ، ((گۆرۆد ـ (شار) )) ، (( مۆست ـ ( پرد ) )) ، (( دۆم ـ ( خانوو ) )) ... ؛ ٣ـ ئەو ناوانەی کۆتایی‌یان بە (( ۆ ( یۆ ) ێ )) دێت بە جنسی بیّلایەن دەژمێررێن ، وەك : (( پیسمۆ ـ ( نامە ) )) ، (( ڕوژیۆ ـ ( چەك ) )) ، (( مۆریّ ـ ( دەریا ) )) ... ؛ ٤ ـ ئەو

ناوانەی نیشانەی کۆتاییییان نییە و دوا دەنگیان کۆنسۆنانتی نەرمن یاخود کۆنسۆنانتی ( ژ ، ش  چ )ن نێریش و مێیشیان تێدایە ، وەك : ا (( دێن ــ ( ڕۆژ ) ) ) ، ( ئوگۆل ـ ( خەلووز ) ) )، (( نۆژ ـ ( چەقۆ ) )) ، (( کارانداش (قەڵەم) )) ، (( لووچ ـ (تیشك) )) . لە جنسی نێرن ؛ ب ـ (( تێن ـ (سێبەر) ))، (( ستال ـ ( پۆلا ) )) ، (( نۆچ ـ ( شەو ) )) لە جنسی مێن ... ؛ ٥ـ دە وشە هەن کۆتاییییان بە ( میا ) دێت لە ڕیزی جنسی بێلایەنن ؛ ٦ـ وشەی بێگانە کە وەك وشە ڕەسەنەکان کۆتاییییان بە نیشانەی جنسی بێلایەن هاتووە ، هەروەها لە ڕیزی جنسی بێلایەن دادەنرێن ، جگە لە وشەی (( کۆفێ ــ ( قاوە ) ) ) نەبێ کە لە پاڵ ناوی جنسی نێر دانراوە ...

لە زمانی فەرەنسیدا ناو دوو جنسی هەیە : جنسی نێر le genre masculin و جنسی مێ ( le genre feminin ) . لە نووسینی زمانی فەرەنسیی ئەمڕۆدا ناوی جنسی مێ بەزیاد کردنی ( e ) بۆ سەر ناوی جنسی نێر پەیدادەبێ . لەم کارەدا چۆن لە ڕووی نووسینەوە ، هەروەها لە ڕووی تەلەفوزەوە گۆڕان دێتە گۆڕێ : ١ـ ئەو ناوانەی کۆتاییییان بە دەنگی بزوێن هاتووە تەنیا لە نووسیندا گۆڕانیان بەسەردا دێت ، وەك : (( um ami ـ هاوڕێی نێرینە )) ـ (( um amie ـ هاوڕێی مێینە ))... ؛ ٢ـ ئەو ناوانەی کۆتاییییان بە کۆنسۆنانتی قووتدراو دێت ، ئەوە لە ڕووی دەربڕینیش و نووسینیشەوە گۆڕانیان بەسەردا دێت . ئەویش ئەوەیە کە ئەو کۆنسۆنانتانە کاتێ (e)یان دەچێتە سەر تەلەفوز دەکرێن ، وەك : (( chat ـ پشیلەی نێر )) (( chatte پشیلەی مێ )) ؛ ٣ـ ئەو ناوانەی لە حاڵەتی نێریدا کۆتاییییان بە دەنگی بیقلۆك ( الانفي Nasal )ی ( ن ) دێت ، کە دەبنە مێ ، ئەوە (ن) ڕوون دەبێتەوە و دەردەبڕێت ، لە حاڵەتی نووسینیشدا دوو ( ن ) تۆمار دەکرێ ، وەك :(( Lion ــ (نەڕەشێر) )) ــ (( Lionne ــ (دەڵەشێر) )) ؛ ٤ ــ ئەو ناوانەی لە حاڵەتی نێردا کۆتاییییان بە دەنگی (ف)ی تەلەفوزکراو دێت ، ئەوە (ف) دەکرێتە (ڤ) ، وەك : (( veuf ــ (بێوەژن) )) ــ (( veuve ــ

( بێوەپیاو ) )) ؛ ٥- هەروەها ناوی جنسی مێ لە ڕێگەی ئیزافەکردنی هەندێ پاشگریشەوە پەیدادەبێ ..

لە زمانە ئێرانییە دێرینەکان ( ئاوێستا و فارسیی کۆن )دا ناو بەپێی جنس گۆڕانی بەسەردا دەهات . جنسەکانی ناو خاوەنی دەستوورێکی تەواو ڕێکو پێک بوون و لە کاری مۆرفۆلۆژیدا دەورێکی ئاشکرا و دیاریان دەبینی .. لە دەوری ناوەڕاست و نوێی زمانە ئێرانییەکاندا چارەنووسی جنسەکانی ناو لە زمانە ئێرانییە جیاجیاکاندا وەك یەك نەبوون . لە بەشێکیاندا بەتایبەتی لە فارسی و تاجیکیدا نەماون و لە هەندێکیشیاندا پارێزراون ، بەڵام لەگەڵ ئەو پاراستنەدا گۆڕانیشیان بەسەردا هاتووە . جنسەکانی ناو وەك حاڵەتێکی ڕێزمانی زیندوو لە زمانە ئێرانییە ناوەڕاستەکانی ، وەك : سوگدی و خۆتەنی و ، لە زمانی ئێرانییە نوێکانی ، وەك : ئەفغانی ( پشتۆ ) و دیالێکتەکانی خوارووی تاتی و دیالێکتی ڤووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووی کوردیدا خۆی دەنوێنێ . پاشماوەی جنسەکانی ناو ، ناوناوە لە هەندێ لە زمانە ئێرانییە نوێکانی وەك : خوارەزمی و ڕووشانی و دیالێکتی خوارووی کوردی .. دا خۆیان نیشان دەدەن .

لە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا ناو سێ جنسی هەبووە : نێر و مێ و بێلایەن . ئەو سێ جنسە لە دوو ڕێوە لە یەك جیا دەبوونەوە :

١- ناوی نێر و ناوی بێلایەنی بە (ە) کۆتایی هاتوو ، بەرانبەر بە ناوی مێی بە (ا) کۆتایی هاتوو دەوەستان . بەوێنە لە ئاوێستادا وشەی (( ئەسپە aspa - ( ئەسپ ) )) لە جنسی نیرە و بەرانبەری وشەی (( ئەسپا aspá - (ماین ) )) کە حنسی مێیە دەوەستێ . وشەی (( ئەکە aka - ( خراپ ) )) کە لە جنسی نێر و بێلایەنە ، بەرانبەر بە وشەی (( ئەکا aká - ( تووڕە ) کە لە جنسی مێیە دەوەستێ ...

**٢ـ بەرانبەر بە ناوی نێر و ناوی بێلایەنی سەر بە کۆمەڵانیدیکە ، ناوی مێی بە ( ی ـ î ) کۆتایی هاتوو دەوەستێ . بەوێنە لە ئاوێستادا وشەی (( مەس mas ـ (مەزن ) )) بۆ جنسی نێر و بێلایەنە ، ئەگەر بکرێتە (( مەسی masî )) ئەوە بۆ جنسی مێیە ، وشەی ( نەپت napt )) واتای ( نەوەی نێرینە ) دەگەیەنێ ، بەلام کاتی ( نەوەی مێینە ) ببێتە مەبەست ، ئەوە دەوترێ (( نەپتی naptî )) .**

**لەزمانی ئاوێستادا ئەو هەردوو ڕێگەیە زۆر لە کاردا بوون ، بەلام لە زمانی فارسیی کۆندا ڕێگەی یەکەم پتر دەوری دەبینی .**

**لە زمانە ئێرانییەکانی دەوری ناوەڕاست و نوێدا جنسەکانی ناو گۆڕانێکی زۆریان بەسەردا هات . لە زمانی فارسیی ناوەڕاست و هەندێ زمانی ئێرانیی نوێدا نەمان . لە هەندێ زمانی تریشدا وایان لێهات کە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی جیاکردنەوەیان پێوە نەمێنێ و تەنیا لە ڕستەدا بتوانن بەدەربکەون ...**

**لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا ، بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانی و هەندێ شوێنی تردا لە مێژە جنسەکانی ناو دەوریان نەماوە و بەرگی سستییان لەبەرکراوە . بەلام لە دیالێکتی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی خواروودا هەرچەندە لە حاڵەتی ئاساییدا نیشانەی جیاکردنەوەی جنس بەسەر چووە ، بەلام لە ڕستەدا بەتایبەتی لە دۆخی تیان و دۆخی بانگهێشتن و دۆخی ئیزافەدا ڕوون و ئاشکرا خۆیان دەنوێنن . بەوێنە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ناوی جنسی مێ لە دۆخی ئیزافەدا نیشانەی (ا) وەردەگرێ . بێگومان ئەمەش سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە ئەم (ا)یەی نیشانەی جنسی مێی ئیزافەی دیالێکتی ژووروی کوردی لەو ( ا)یەی نیشانەی جنسی مێیەی حاڵەتی ئاساییی ئاوێستاوە مابێتەوە کە لە سەرەوە لێیدواین .**

لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیی ئەمڕۆدا ( بەتایبەتی لە زمانی ئەدەبیدا ) نیشانەی تایبەتیی وەها نییە کە لە دۆخی ئاساییدا جیاوازیی جنسی ناو دەربخا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕێی واتاوە دەتوانین چوار چەشن دیاری بکەین :

١ـ ناوی نێر

٢ـ ناوی مێ

٣ـ ناوی دوولایەن

٤ـ ناوی بێلایەن

## ـ جنسی ڕێزمانی الجنس النحوي Grammatical Gender

مەبەست لەو ناوانەیە ، کە لە زماندا نێر و مێیان ئاشکرا نییە ، یاخود بۆ هەردوو لایان بەکاردەهێنرێن . ئەو ناوانە لە ڕێگای مۆرفێمە ڕێزمانییەکانەوە ، یان بێ مۆرفێم لە شێوەی لێکداندا جنسەکانیان دیاری دەکرێت .

بۆ ئەم مەبەستە لە کرمانجیی ژووروودا ئەو ڕێگایانە دەخەینە ڕوو ، کە جنسیان پێ دیاریدەکرێت :

١ ـ لەیەکدانی بێ مۆرفێم :

أ) لەیەکدانی دوو پارچە ( Component )، کە یەکەمیان دیارخەرە بۆ دووەم ، کە دیارخراوە ـ واتە بە یاسای ( دیارخەر + دیارخراو ) . وەك :

مامر، ماکەو ، ماکەر..

دیارخەر واتایی چەمکی وشەکە یا فرێزەکە بۆ خۆی ڕادەکێشێت ، واتە بەپێی دیارخەر بڕیار لەسەر نێر و مێیەتیی دیارخراوەکە دەدرێت .

ب ) لە یەکدانی دوو پارچە ، کە وەکو پاشماوەی فرێزی ئیزافە دەردەکەوێت . لە هەموو فرێزێکی ئیزافەشدا بەردەوام دیارخەر دەکەوێتە دوای دیارخراوەوە ـ واتە بەم یاسایە : ( دیارخراو + دیارخەر ) بەوێنە :

ژنمام ، ژنخاڵ ، دۆتمان ، پسمام ..

٢ـ لە یەکدانی دوو پارچە ، یان زیاتر ، بە یارمەتیی ناوبەندی (ە) ، کە ئەمەش بە دوو ڕێگا دەبێت :

أ) یاسای ( دیارخەر + ە + دیارخراو ) .

هەرچەندە لە کرمانجیی ژووروودا جنسەکان بە وشەی سەربەخۆ واتای جنس دیاریدەکەن ، بەڵام هەندێ جار بەم ڕێگایەی سەرەوەش نێر و مێی ناوکە دەخەنە ڕوو . وەك :

نێرەکەو ، نێرەکەر

ب) هەندێ جار دوو پارچەکە کە لێکدراون ، هەردووکیان دەوریان وەك یەك وایە و هیچیان نابنە دیارخەری ئەوی دییان ـ واتە دیارخەر و دیارخراویان نییە . بە واتایێکی دی پێوەندیی سیمانتێکی دیارخەر و دیاخراو نییە .

ژنومن ، کچومچ . پیاوومیاو ، کوڕومڕ ...

لەو نموونانەی سەرەوەدا ، لە ڕووی جنسەوە وشەی دووەم ناتوانێت دژی وشەی یەکەم بوەستێت ، چونکە جنسی تێدا نییە .

لە لێکدانی وشەکاندا ، زۆر جار ئەو وشەیە پێش دەخرێت ، کە گرنگتر و بەهادارتر بێت ، بە واتایێکی دی ، جنسی مێ پێش دەخرێت ، یاخود بەپێی هەندێ هۆکار ، ئەم ڕیزکردنە ڕوودەدات ... وەك :

ژن و ماڵ (ژن) بەهادارترە لە (ماڵ)

ژن و پیاو (ژن) بەهادارترە لە (پیاو)

خوشك و برا     (خوشك) بەهادارترە لە (برا)

... و گەلێكی دی .

لەو نموونانەی سەرەوەدا ، مەرج نییە وشەی دووەم هەڵگری چەمكی هەمان جنسی وشەی یەكەم بێت .

هەموو ئەو ناوانەی لە كرمانجیی خواروودا بێلایەنن ، واتە جنسی نێر و مێیان نییە ، لە كرمانجیی ژووروودا بە هۆی مۆرفێمە ڕێزمانییەكانەوە دابەش‌كراونەتە سەر نێر و مێ ، بە واتاییكی دی ئەو ناوانەی لە بنەڕەتدا جنسیان دیار نییە ، بە هۆی مۆرفێمی ڕێزمانییەوە دابەش دەبنە سەر نێر و مێ و پێیان دەوترێت ( جنسی ڕێزمانی ) .

لە كرمانجیی خواروودا هیچ مۆرفێمێكی ڕێزمانی نییە ، كە بتوانێت ناوە بێلایەن و هاوبەشەكان دابەشكاتە سەر نێر و مێ . تەنانەت لە دۆخی بانگهێشتنیشدا ئەو مۆرفێمانەی دەچنە سەر ناو و دەلكێن بە كۆتاییانەوە ، لە بنەڕەتدا جنسەكانیان دیارن ، یان تایبەتن بە نێر و مێ .

لە كرمانجیی خواروودا ئەو جنسانەی لە ڕێگای لێكدانی وشەكانەوە دیاری دەكرێن ، هەندێ جار لەگەڵ ئەوانەی كرمانجیی ژووروودا جیاوازییان هەیە .

١ ـ لێكدانی بێ مۆرفێم :

لێكدانی دوو پارچە یان دوو وشە بە یاسای (دیارخەر + دیارخراو) . بەوێنە

براژن ، ژن‌برا ، ژن‌خوشك ...

لەو نموونانەدا دیارخراو واتای چەمكی وشەكە یان فرێزەكە بۆ خۆی ڕادەكێشێ ـ واتە بەپێی دیارخراو بڕیار لەسەر نێر و مێیەتیی فرێزەكە دەدرێت

٢ـ لێکدانی دوو پارچە یان دوو وشە ( ۆ ، ێ ) کە لە کرمانجیی ژووروودا لە دۆخی بانگهێشتندا دەچنە سەر ناوی نێر و مێ . واتە بەپێی یاسای (دیاخراو + (( ۆ ، ێ )) + دیارخەر ) وەك :

مامۆژن ، خالۆژن ، پیرێژن ..

٣ـ لێکدانی دوو پارچە ، یان دوو وشە ، بە یارمەتیی نیشانەی ئیزافەی ( ە ، ی ) :

أ) بە یاسای ( دیارخراو + دیارخەر ) ، کە ئەمانەش پتر وەك پاشماوەی فرێزی ئیزافە دەکەونە ڕوو . بۆ نموونە :

گیسکە نێر ـ گیسکی نێر

گیسکە مێ ـ گیسکی مێ

ب) بە یاسای ( دیارخەر + دیارخراو ) :

دەڵەسەگ .. گوڵەسەگ ..

## ـ جنسی سروشتی الجنس الطبيعي Natural Gender

جنسی سروشتی ئەو ناوانەن ، کە هەر لە بنچینەدا نێر و مێیان تێدا ئاشکرایە و هیچ تەمومژییەك لە دەست نیشانکردنیاندا نییە ... دەتوانین تایبەتێتییەکانی جنسە سروشتییەکانی دیالێکتی ژووروو لەم خاڵانەدا بخەینە ڕوو :

١ـ لە فەرهەنگی بنەڕەتیی زمانەکەدا هەیە . نموونە بۆ ناوی نێر : ( مێر ، کوڕ ، برا ، باب ، مام ، خاڵ ، خەزوور ، پسمام .. ) . نموونە بۆ ناوی مێ : ( ژن ، کیژ ، داك ، خەسوی ، دۆتمام ) .

٢. بە هۆی دووبارە بوونەوەی جنسە ڕۆنراوەکان ، واتە ئەوەی لە ئەنجامی لێکدانی دوو بەشی وشە یان مۆرفێم بۆ نێر و مێ تەرخان دەکرێن ، دەچنە

بازنەی جنسی سروشتییەوە و ئاخێوەر هەڵەیان تێدا ناکات . بۆ نموونە ( پسمام ) بۆ نێر و ، ( دۆتمام ) بۆ مێ .

٣ـ ئەو وشانەی بە شێوەیێکی سەربەخۆ واتا دەبەخشن ، دەکرێت ببنە بنەمای بواری واتایی بەپێی سیما واتاییەکان (پوور ، کچ ... خاڵ ، کوڕ ...).
ئەمانە هەموویان لە بواری کەس لە فەرهەنگدا ، ئەندامن .

٤ ــ مۆرفێمی ڕێزمانییان دەچێتە سەر ... هەموو ئەو کەرەستانە وەردەگرن ، کە ناو وەریان دەگرێت . بۆ نموونە :

کوڕ ـ کوڕەکە ـ کوڕێك ـ کوڕان

کچ ـ کچەکە ـ کچێك . کچان

کوڕێ مە

کچا مە

کوڕێن زیرەك

کچێن زیرەك

٥ـ ئەم ناوانە وێنەی هۆشەکییان وەکو جنسی نێر و مێ لە مێشکی مرۆڤدا هەیە .

٦ـ هەندێ جار ئەم ناوانە هاوواتایی و هاوبێژی دروست دەکەن . لێرەدا پێویستییان بەوە هەیە پەناببرێتە بەر ڕستەسازی یان سیاقی ڕستە بۆ دیاریکردنی واتاکانیان . بۆ نموونە :

تووشتیر ( چووشتیر ) : بەواتای بەرخی مێ . ئەم ناوە لە زوربەی ناوچەکانی کرمانجیی ژووروودا و هەندێ دەڤەری کرمانجیی خوارووودا بەکاردێت هەندێ جاریش هەر لە کرمانجیی خوارووودا بۆ جسنی هاوبەش بەکاردێ

٧ـ ئەم ناوانە لە ڕستەدا ئەرکی ڕێزمانیی جۆراوجۆر دەبینن ..

ژنەکێ بزن دۆت ـ کارا

ئازاد ژنێ مارەدەکەت ـ بەرکار

**مالا بیژن وەکی ئاشیێ ئاڤ لێبڕایە ( فرێزی ئیزافە )**

لە ناوی گیانلەبەراندا ، کرمانجیی ژووروو تا ڕادەیێک بۆ هەر یەك لە ناوەکان ، جنس دەست نیشان کراوە ، بە واتایێکی دی لە فەرهەنگی دیالێکتەکەدا هەیە و سەربەخۆ واتا دەبەخشێ . ( واتای جنسەکەی تێدا دیاریکراوە ) بۆ نموونە :

لە جنسی نێردا ( بەران ، گا ، گیسك ، یەکانە ، دیکل ... ) لە بەرانبەر ئەو ناوانە جنسی مێ لە فەرهەنگدا هەیە . وەکو : مەهـ ، چێلْ ، چوشێر ، مالوس ، مریشك ... ) .

ئەوەی پتر جێی سەرنجە ، کە ناوی نێر و مێ چ ناوی مرۆڤ بێت ، یان گیانلەبەر لە کرمانجیی ژوورودا پشت بە فەرهەنگ دەبەستێت ، بەپێچەوانەی کرمانجیی خواروو . بە واتایێکی دی لە کرمانجیی ژووروودا بەپێی هەندێ یاسای مۆرفۆلۆژی دروست بووە و چووەتە ناو فەرهەنگەوە، کەچی لە کرمانجیی خواروودا پەنا دەبرێتە بەر هەندێ یاسای سینتاکسی بۆ یەکالاکردنەوەی جنس .

جنسە سروشتییەکانی کرمانجیی خواروو لە ئەرك و خاسیەتدا هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ جنسە سروشتییەکانی کرمانجیی ژووروو ، ئەمانەش لە بنەڕەتدا وشەکان تایبەتی بە نێر یا بە مێ ، بۆیە هەر وشەیەك ناتوانێ شوێنی وشەیەکی دی بگرێتەوە ئەگەر لە جنسەکەی خۆی نەبێت . ئەم جنسانە لە شێوەی وشەی سەربەخۆدا بەکاردێن و لە ڕستەدا ئەرکی ( کارا و بەکار و بەرکاری بەیاریدە ... ) دەبینن ... لەم دیالێکتەدا بە شێوەیەکی گشتی ، ناو لە ڕێی واتاوە بەسەر جنسدا دابەش دەبن .

**جووت هاتن** **الاقتران** Coupling

## جیٚگرتنەوە تناوب Alternation , Gradation

جیٚگرتنـــەوەی فۆنـــەتیکی و میٚژوویـــی : جیٚگرتنـــەوەی فۆنـــەتیکیی دەوروبـــەر و شـــویٚنەکیی دەنگـــەکانی ئاخـــاوتن دەبیٚتـــە هـــۆی پـــەیدابوونی دیاردەی بوونـی دەنگیٚك بە دەنگیٚکی دی لـە سیستـەمی دەنگیدا . بەویٚنـە بوونی کۆنسۆنانتی ئـاوازەدار بـە کپ و کپ بـە ئـاوازەدار ؛ بوونـــی بزویٚنـــی دریٚژ بە کورت و کورت بە دریٚژ .

لە سیستـەمی دەنگیدا دوو جۆرە جیٚگرتنەوەی لەو بابەتە هەیە ـ نـویٚ و میٚژوویی . جیٚگرتنەوەی میٚژوویی دەنگی جیاوازی ئاخاوتن دەشیٚ لە تاکە مۆرفیٚمیٚکـدا بـەدی بکـریٚ . جیٚگرتنـــەوەی میٚژوویـــی بەهـــەل و مـــەرجی پرۆتسیٚسـی هاوچەرخـەوە بـەند نییـە . بەویٚنـــە : بوونـــی ( س ) بـــە ( ز ) : خواستن ـ خواس > خواز ؛ گەستن ـ گەس > گەز ... (ش) بە ( ژ ) : کوشتن ـ کوش > کوژ : کرۆشتن ـ کرۆش > کرۆژ ... یاخود بوونـی (ا)ی ڕەگـی کـردار بە (یٚ) : بژاردن ـ بژار > بژیٚر ؛ ناردن ـ نار > نیٚر ... (و) بـە (ۆ) : خـواردن ـ خو > خۆ؛ شوشتن ـ شو > شۆ ... ( i ) بە (ە) : بـردن ـ ب > بە ؛ کـردن ـ ك > کە ... (ی) بە (یٚ ) : بیستن ـ بی >بیٚ ، ویستن ـ وی > ویٚ ... و گەلیٚکی دی . ئەمانـە کـە جیٚگرتنـــەوە لـــە ڕەگـــدا بـــەجیٚدیٚنن و وەك کەرەســـتەی وشەسازی بەکاردیٚنریٚن و ڕەگی کاتی ڕانەبوردوو دروست دەکەن ، گـەلیٚ جـار بە جیٚگرتنەوەی وشەسازی ناودەبریٚن .

## جیٚگۆڕکیٚی دەنگ قلب المكان Reversal of place

هەندیٚ جار لـە نیٚوان دەنگـە درواسیٚکانی وشـەیەکدا جیٚگۆڕکـیٚ ڕوودەدات ، کـە ئەمـەش دەشـیٚ پیٚـی بوتـریٚ ( هەلگەڕانـــەوە ) ـــ واتـــە ( العكـب ـــ Metathesis) . هەروەها بە Intervrsion )یش ناودەبریٚ . نموونەی ئەمە وتنی هەندیٚك وشەی وەك emnity < enmity )یە .

بەشێك لە زمانناسان لەو ڕایەدان ، کە جێگۆڕکێی دەنگەکانی هێندێ وشە لە هەموو زمانێکدا هەیە و ، وادیارە لە سەرەتادا سەبارەت بە جیاوازیی دیالێکتەکان بووە . هێندێ زار وشەی زاری دیکەی بە هەڵەوگێڕاوی بەکارهێناوە . پاشان یەکێ لەو فۆرمانە لە بیرچووەتەوە ، یان هەردووکیان زۆر بڵاوبوونەتەوە ، کەوتوونەتە سەر دەم و زاری گشتی و بوونتە دوو وشە ...

لەم دیاردەیەدا دوو دەنگ یان دوو بڕگە جێگایان دەگۆڕنەوە . هەندێ جار وشەکە بەهەردوو شێوەکەی لەیەك زاردا دەبینرێن و ، هەندێ جاریش هەر شێوەی لە زارێکدا دەردەکەوێ و بەکاردێ .. جارجارەش جێگۆڕکێ پێوەندی بە چین و توێژی کۆمەڵایەتی و ئاستی ڕۆشنبیرییەوە هەیە و شێوەیێکی وشەکە مۆرکی کۆمەڵێکی تایبەتە .

لەبەر ڕووناکیی ئەم بۆچوونانە ، لە زمانی کوردیدا دەشێ چوار جۆر جێگۆڕکێ یادداشت بکرێ :

١ـ ئەوانەی بە هۆی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاوازەوە سازبوون . وەك :

بەفر < > بەرف

تەرزە < > تەزرە

٢ـ ئەوانەی لە تاکە زارێکدا جێگۆڕکێ دەکەن . وەك :

بڕوانە < > بنوارە

جگەر < > جەرگ

٣ـ ئەو جێگۆڕکێیانەی بە هۆی ڕادەی نزمیی ئاستی ڕۆشنبیریی ئاخێوەرەوە پەیدادەبن ... ئەمانەش دوو جۆرن :

أـ لە هەندێ وشەی عەرەبیدا

جومعە < > جوعمە

ڕوبع < > ڕوعب

ب ـ لە وشەی کوردیی ڕەسەندا

مێرووله > مێلووره

قازانج < > قانزاج ، قانجاز

...

٤ ـ لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا دوو دەنگی / و/ ، / ۆ / بەدوا / ی/ دا نایەن ، بۆیە کورد ناچارە ، ئەو وشە بێگانانەی ( یو ) ، ( یۆ )یان تێدایە ، جێگۆڕکێیان پێبکات و بیانکاتە (وێ ) بەوێنە :

یوسف > وێسف

یۆنان > وێنان

....

## جێناو الضمير Pronoun

= ڕاناو ، بۆناو

جێناو بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆیە و ئیشارەت بۆ دەلالەت و ماددە دەکا ، بەلاّم ناویان نابا .. جێناوی کەسی پێوەندیی کەس بەرانبەر بە قسەکەر و بەشداریکەری قسە نیشان دەدا . سێ کەس لە گفتوگۆدا نیشان دەدا : جێناوی کەسی یەکەم ـ قسەکەر ڕادەگەیەنێ ؛ جێناوی کەسی دووەم ـ ئەو کەسەیە کە قسەکەر ڕاستەوخۆ لە گەڵی دەدوێ ؛ کەسی سێیەم ـ ئەو کەسەیە کە لە گتوگۆدا بەشداری ناکا و کەسانیدی باسی دەکەن ...

بەر لە هەر شت تایبەتێتیی واتای جێناو لەوەدایە ، کەوا نەك تەنیا واتای کەس و شت و چۆنیەتی و چەندێتی نیشان دەدا ، بەڵکو پێوەندییان لەگەڵ شت و چۆنیەتی و چەندێتیشدا ڕادەگەیەنێ و خاسیەتیان لە ڕووی ئەو پێوەندییەوە دیاریدەکا . بەوێنە جێناوی (تۆ) لە ڕستەی : (( تۆ کتێبەکەم بۆ بێنەوە ))دا کەسێك ڕادەگەیەنێ ، کە پێوەندی بە قسەکەرەوە هەبێ . لە

ڕاستیدا ئەوە نیشان دەدا ، کە ئەو کەسە قسەبۆکراوە و وەك بەشداریکەری قسەکردنەکە دێتە ناوانەوە و قسەکەر ڕاستەوخۆ لەگەڵی دەدوێ .

جێناوی خۆیی پێوەندی کارا بە بەرکارەوە ؛ نیهاد بە گوزارەوە ڕادەگەیەنێ ، بەتایبەتی یەککەوتنی نیهاد لەگەڵ گوزارەدا . جێناوی خۆیی ( خۆ )ی کوردی دەتوانێ لەگەڵ هەرسێ کەسی تاك و کۆی جێناوی کەسیی جودادا ڕێك بکەوی . وەك : ( من خۆم هاتم ) ؛ ( تۆ خۆت هاتی ) ؛ ( ئەو خۆی هات ) ؛ ( ئێمە خۆمان هاتین ) ؛ ( ئێوە خۆتان هاتن ) ؛ ( ئەوان خۆیان هاتن ) . بەلاّم لە هەندێ زمانی وەك ئەڵەمانی و فەرەنسی ... دا جێناوی خۆیی هەر بە کەسی سێیەمەوە بەندە ...

جێناوی خۆ لە ڕستەی : (( کوڕەکە ئێمەی بۆ ماڵی خۆیان بانگکرد ، کچەش بۆ ماڵی خۆیان )) ، حاڵەتی یەکەم (( ماڵی کوڕە )) دەگەیەنێ ، بەلاّم حاڵەتی دووەم (( ماڵی کچە )) ... بەمەدا وەك نموونەکان نیشانی دەدەن ، واتای دیاریکراوی جێناو لە ڕێی بارودۆخی یاریدەدەری هەمەچەشنەی وەك : جۆری تێکست ؛ حاڵەت ؛ پێوەندیی نێوان بەشدارانی ئاخاوتن ؛ هەواڵی جۆراوجۆر ... هوە ئاشکرا دەبێ . بێ کارتێکرنی ئەو دەوروبەرەی واتای دیاری جێناوەکە ئاشکرا نابێ .

جێناوی نیشانەی (ئەم ، ئەمە ... ئەو ، ئەوە ) لەسەر بناخەی ئیشارەت بۆ شت یان چۆنیەتیی دیاری کردن ، مانای شت و چۆنیەتی دەگەیەنێ . لەم حاڵەتەدا بۆ تەواو گەیاندنی واتا ، ئیشارەت دەور دەبینێ . بەوێنە کە دەوترێ (( بڕۆ بۆ ئەو ماڵە )) ( بە دەست درێژ کردن ئیشارەت دەکرێ ) ؛ یان ئەگەر بوترێ (( ئەمە برامە )) ( دەشی بەسەر ئیشارەت بکرێ ) ؛ یاخود بیتو بوترێ (( ئەمە بالاّیەتی)) (دەلوێ بە دەست بەرزکردنەوە نیشان بدرێ) ... ئەم جۆرە بەکارهێنانەی جێناوی نیشانە ، تایبەتە بە زمانی ئاخاوتن ، بەلاّم لە زمانی نووسیندا دیاریکردنی واتای تەواویان لەسەر

بنەمای تێکستەکە دادەمەرزێ ، بۆ نموونە (ئەم) بۆ مەبەستی نزیک بەکاردێ و (ئەو )یش بۆ دوور .

جێناوی (کێ ، چی ، کام ، چۆن ... ) دەربڕینی تەقەلای قسەکەر دەگەیەنێ ، کە هاوبەشی بەشدارانی ئاخاوتنەکە شتێکی نائاشکرای لێ ئاشکرا ببێ ... جێناوی پرسیاری (کێ ، چی ) پرسیاری کەسێك یان شتێك دەکا ؛ (چۆن) هەواڵی چونیەتی دەپرسێ ؛ (کوێ) ـ جێگە ؛ (کەی) ـ کات ...

جێناو لە ڕووی واتاوە دابەش دەبن بەسەر چەند جۆرێکدا . ئەو جۆرانە لە ڕووی خاسیەتی ئەم پێوەندییەوە جیادەبنەوە ، کە وا هەندێ گرووپی جێناو دەیگەیەنن ... لە زمانی کوردیدا لە ڕووی واتاوە ، دەشێ جێناو بەسەر ئەو چەند جۆرەی خوارەوەدا دابەش بکرێ :

١ـ جێناوی کەسی :

أ جێناوی کەسیی جودا

ب ـ جێناوی کەسیی لکاو

٢ـ جێناوی خۆیی

٣ـ جێناوی نیشانە

٤ـ جێناوی پرسیار

٥ـ جێناوی چەندێتی

٦ـ جێناوی هەیی

٧ـ جێناوی نەفی

٨ـ جێناوی هاوبەشی

٩ـ جێناوی دیار

١٠ـ جێناوی نادیار

جگـە لـەو دابەشـکردنەی جێنـاو ، کـە لـە ڕووی واتـاوە خسـتمانە ڕوو ، هـەروەها دەشـی لـە ڕووی پێوەندییـەوە لەگـەڵ بەشـە ئاخاوتنـەکانی دیـدا تەماشابکرێ و ئەو جۆرانەی خوارەوەی لێ هەڵبهێنجرێ :

١- جێناوی ناوی ، وەك ( من ، تۆ ... کێ ، چی .. و هەندێکی دی ).

٢- جێناوی ئاوەڵناوی ، وەك : (ئەوە ، هی ، هەرکەس ... هەندێکی دی ).

٣- جێناوی ژمارەیی ، وەك : ( چەند ، هەندێ ، هیچ ... تاد ) .

٤ - جێناوی ئاوەڵکرداری ، وەك : ( کوێ ، هەمیشە ... ) .

دەربـارەی ئـەوەی جێنـاو چییـە و ئایـا لـە زمـانی کوردیـدا بەشـێکە لـە بەشەکانی ئاخاوتن ، باسێکی یەکجار گران و پڕ کێشەیە . ئەمە بەتایبەتی پێوەندی بەو جۆرانـەوە هەیـە ، لـە کاتێکدا کـە جێنـاون ، دەکرێ لـە هـەمان کاتدا لە ڕیزی بەشە ئاخاوتنێکی دی دابنرێن .

لە ڕاستیدا ئەگـەر وشـەیێك لە بنـەڕەتدا نـاوبێ نالوێ لە هـەمان کـاتدا لـە ڕیـزی ئاوەڵنـاو یـان ژمـارە دابـنرێ ( بێگومـان لـێرەدا مەبەسـت گوێزانـەوەی وشە نییە لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بۆ بەشێکی دی ) ... بەڵام هەرچی جێناوە بە شێوەیێکی دییە - واتەر هەر جێنـاوێك لەیـەك کـاتدا لەگـەڵ بەشـێکی تـری ئاخـاوتندا نزیـك دەبێتـەوە . بـەوێنە جێنـاوی کەسـیی جـودای ( مـن ، تـۆ ، ئەو ... ) لـە نـاو نزیـك دەبێـتەوە ، جێنـاوی نیشـانەی ( ئـەم، ئـەو ... ) لـە ئاوەڵناو نزیك دەبێتەوە

لە ڕێزمانی چاولێکەریی کوردی و گـەلێ زمـانی تـردا ، زاراوەی ( جێنـاو - Pronoun ) زۆرجـار تـەنیا بـۆ ئـەو شـانە بـەکاردەهێنرێن ، کـە لـە ڕسـتەدا هەمان دەوری ناو دەبینن ، واتە زاراوەی ناوبراو ، کە لە :

یۆنانی : antonymia = ( anto - جێ ) و ( nymia - ناو )

لاتینی : pronomen = ( pro - جێ ) و ( nomen - ناو )

ئینگلیزی : pronoun = ( pro - جێ ) و ( noun - ناو )

ڕووسی mestoemenye = ( mesto - جیَ ) و ( emya - ناو )

... هتد پێکهاتووه له ڕووی ئیتیمۆلۆژییەوە بە واتای دەقاودەقی (جیَ + ناو ) وەردەگرن ، کە گوایا لە جێی ناو ، لە بریتی ناو دێت .. بەو پێیە وشەی وەك ( ئەم ، ئەو .. ) و گەلێکی دی ، کە ئەرکی ئاوەڵناو بەجیَدێنن ، نابیَ لە ڕیزی جێناو دابنرێت .

دیارە پێویست ناکا بە دوور و درێژی لە نامەنتیقی و ناڕاستیی ئەو جۆرە تێگەیشتنەی جێناو بدوێین ، کە تەنیا لەسەر بناخەی ئێتیمۆلۆژیی زاراوەکە بنیات نراوە . لە ڕاستیدا ئەگەر وشەی (هی ، ئەم ، چەند ، چۆن...) جێناو نەبن و ئاوەڵناو بن ، لەسەر بنەمای ئەوەی جێی ناو ناگرن ، بەڵکو لە بریتیی ئاوەڵناو دێن ، ئەوە ئاشکرا نییە ، بۆچی وشەی وەك ( من ، تۆ ... ) هەر ئەو ئەرکە دەبینن ، کە ناو دەیبینیَ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەناو دانانرێن و وەك کۆمەڵە وشەیێکی تایبەتی بە ناوی جێناوەوە جیاکراونەتەوە . کەواتە ئەگەر (هی ، ئەم ، چەند ، چۆن ... ) بە ئاوەڵناو دابنرێن ، ئەوە دەبیَ بە پێی هەمان تێگەیشتن و بۆچوون ، وشەی ( من ، تۆ ... )ش بەناو بژمێررێن .

- جێناوی ئامارژە

ب .: جێناوی نیشانە

- جێناوی پرسیار ضمیر الاستفهام Interrogative pronoun

ب . : جێناو

لە دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا چەند دەستەیێك جێناوی پرسیار دێتە پێش چاو :

**١ـ کێ / کی :**

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەو کەسە بەکاردەبرێ ، کە کارێکی کردبێ ، یان بیکا .. وێکچوون و نێزیکیی ئەم جێناوە لەو زمانە کۆن و نوێیانەی لەگەڵ کوردیدا خزمایەتییان هەیە ، دەبینرێ . بەوێنە : لە ئاوێستادا (( کە )) ؛ لە فارسیی کۆن و هیندیی کۆندا (( کەیە )) ؛ لە پەهلەویدا (( کێ )) ؛ لە فارسیدا (( کە )) ؛ لە بلووجیدا (( کێ / کە )) ... یە .

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا ( چ لە زمانی ئەدەبی و چ لە بەشە دیالێکتەکانی موکریان و سۆراندا ) چۆن لە زوودا تەنیا فۆرمی ( کێ ) بەکاردەهێنرا ، ئەمڕۆش بەهەمان چەشن هەر فۆرمی ( کێ ) بەکاردەهێنرێ . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەگەرچی هەردوو شێوەی ( کێ )یش و ( کی )یش هەیە ، بەڵام ( کی ) زۆرتر بەکاردێنرێ . هەرچی ( کێ )یە پتر لە دۆخی تیاندا دەبینرێ .

**٢ـ چی /چ / چە :**

ئەم جێناوە بۆ پرسیار لە شت و هۆی ڕووداو بەکاردێنرێ .

لە ناوچەی سلێمانی بە زۆری شێوەی (چی) دەوترێ و کەمێ جاریش (چ) . لە ناوچەی خانەقین و سنە و کرماشان .. ( چە ) دەڵێن . لە بەشە دیالێکتی موکریان و سۆران و دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ( چ ) باوە ، بەڵام لە دۆخی تیاندا هەمیشە دەبێ بە ( چی ) .

ئەم جێناوە لە ئاوێستادا لە شێوەی (( چەهیە )) ؛ لە پەهلەویدا ((چی)) ؛ لە فارسیدا (( چ )) ؛ لە بلووجیدا (( چ ، چی )) ... دەبینرێ .

**٣ـ کام / کامە / کێهە / کێها / کێهان / کیژان / کیشك ...**

ئەم دەستە جێناوە خاوەنی یەك واتان و بۆ پرسیاری جوداکردنەوەی کەسێك یان شتێك لە نێو کۆمەڵێکدا بەکاردەهێنرێن .

لە زمانی ئەدەبیی کوردیدا فۆرمی ( کام / کامە ) دەبینرێ . ئەم فۆرمەش لە ئاوێستادا لە شێوەی (( کەتەمە )) و لە پەهلەویدا (( کەتام )) و لە فارسیدا (( کودام )) ... بەرچاوەدەکەوێ .

لە بەشە دیالێکتی موکریان و سۆراندا لەپاڵ بەکارهێنانی (کام / کامە)دا، فۆرمی ( کێهە / کێها / کێهان )یش هەیە .

فۆرمی سەرکیی ئەم جێناوە لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا ((کیژان))ە و لە هەندێ ناوچەی بادیناندا شێوەی (( کیشك )یش دەبیسترێ .

(( کیژان )) لە جێناوی پرسیاری (( کی ؟ )) و پێشبەندی (( ژی )) و جێناوی کەسیی ((وان))ی دۆخی تیان سازبووە ، کە واتای (کامە لە وان) دەبەخشێت .

وێنەی ئەم (( کیژان ))ە لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا لە شێوەی (( کوژان ))دا دەبینرێ .

٤ ـ چۆن / چلۆن / کوو /چەوا(ن) / چاوا(ن) .

ئەم جێناوانە بۆ پرسیارکردن لە شت و لە چۆنیەتیی ڕووداو بەکاردەبرێن .

لە زمانی ئەدەبیی ئەمڕۆی کوردیدا و لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجیی خوارووودا (( چۆن )) فۆرمی سەرەکییە .

وێنەی ئەم جێناوە لە زمانی فارسیدا (( چوون ))ە و لە پەهلەویدا ((چێگۆن))ە . کە لە جێناوی پرسیاری ((چی)) و ((گۆن)) ـ واتە (( شێوە ، وێنە ، ڕەنگ )) پێکهاتووە .

لە فۆلکلۆر و ئەدەبیاتی کۆن و زمانی ئاخاوتنی ئەمڕۆی ناوچەی موکریان و سۆراندا (( چلۆن )) فۆرمی سەرەکییە . ئەم فۆرمی (( چلۆن ))ە لە بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی کۆن و بەشێکی کەمی ئەدەبیاتی ئەمڕۆی ناوچەی سلێمانیشدا دەبینرێ .

له ناوچەی سۆران جگە لە (( چۆن )) و ((چلۆن)) ، هەروەها (( كوو ))ش زۆر بەرچاودەكەوێ ، ئەمەش ڕەنگە پێوەندی بە (( كووه ـ kuwa ))ی ئاوێستاییەوە هەبێ و ( و ـ w ) بووبێ بە ( ه ـ h ) و دواییش سوابێ .

فۆرمی (/چەوا ( ن ، چاوا ( ن /)) سەر بە دیالێكتی كرمانجیی ژوورووە .

٥ـ كەی / كەنگێ / كەنگی / كەنگین / كەنگینێ / كەینێ .

له ناوچەی سلێمانی و هەندێ هەرێمی دی تەنیا (( كەی )) بەكاردێنرێ .

لە دیالێكتی كرمانجیی ژوورودا (( كەنگێ )) و (( كەنگی )) ؛ فۆرمی (( كەنگین )) و ( كەینێ ))یش بەرچاودەكەون .

٦ـ كوا / كوانێ ؛ كا / كانێ .

بۆ پرسیار لە كەس و شت بەكاردێنرێن .

(( كوا /كوانێ )) سەر بەدیالێكتی خواروون و (( كا / كانێ ))یش سەر بە دیالێكتی ژووروون .

٧ـ كوێ / كێ / كێندەر / كوێندەرێ / كیرێ / كیدەرێ / كوێدەرێ / كوو .

بۆ پرسیاری شوێن و جێگە بەكاردێن .

لە ناوچەی سلێمانی و موكریان و هەندێ هەرێمی دیی دیالێكتی خواروی كوردیدا تەنیا فۆرمی ( كوێ ) دەبینرێ . لە ناوچەی هەولێر و كۆیە و ناو شوان فۆرمی ( كێ / كێندەر / كوێندەرێ ) باوە . فۆرمی ( كیرێ / كیدەرێ / كوێدەرێ كوو ) لە ناوچە جیاوازەكانی دیالێكتی كرمانجیی ژوورووودا دەبینرێن

٨ـ چەند / چەن / چەنگ ...

ئەم جێناوە بۆ پرسیاری ئەندازە و ژمارە ... بەكاردێ . ( چەند ) لە هەردوو دیالێكتی سەرەكیی كوردیدا وەك جێناوی پرسیار و جێناوی چەندێتی دەبینرێ .

وێنەی ئەم جێناوە لە ئاوێستادا (( چڤەتت )) ؛ لە فارسیی كۆندا (( چیەنت )) ؛ لە پەهلەویدا (( چەند ))ە.

لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا شێوەی (( چەن )) و (( چەنگ ))یش بەرچاودەکەوێ .

## - جێناوی چەندێتی ضمير الكمي Quantitative pronuon

ب : جێناو

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێ وشە هەن، کە بۆ مەبەستی گەیاندنی مانای چەندێتی بەکاردێن و دەکرێ بە ( جێناوی چەندێتی ) ناوببرێن ، وەك :

لە کرمانجیی خوارووداا :

١- چەند / چەندە / چەندی

٢- ئەوەند / ئەوەندە / ئەوەندی

٣- ئەمەند / ئەمەندە

٤- هێند / هێندە / هەند / هەندە

لە کرمانجیی ژووروودا :

چەند

هنەك / هندەك - ( هێندێ ، هێندێك )

چقاس - ( چەندێك )

ئەڤقاس - ( ئەمەندە )

ئەوقاس . ( ئەوەندە )

## - جێناوی خۆیی ضمير الملكية Possessive pronoun

ب : جێناو

وێنەی جێناوی خۆیی لە ئاوێستادا لە شێوەی ( هڤە ، خوە ، خوەتۆ )دا دەبینرێ و ، لە پەهلەویدا لە فۆرمی ( خوەت )دا بەرچاودەکەوێ و ، لە فارسیدا بووە بە ( خود )) ...

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا ئەگەرچی ( خۆ ) فۆرمی سەرەکیی جێناوی خۆییـیە بەڵام لە هەندێ بەشە دیالێکتدا شێوەی (خود)یش هەیە .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لەگەڵ ئەوەشدا ، کە ( خوە ) فۆرمی سەرەکییە ، بەڵام شێوەی ( خۆ ) و ( خوو ) و ( خۆن ) و ( خوا )یش دەبینرێن .

- جێناوی دیار ضمير التوكيد Emphatic pronoun

بـ .: جێناو

لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وشەکانی : ( هەر ، هەرکەس ، هەرشت / هەرتشت ، هەریەك ، گشت / گشك ، هەموو / هەمی ، تەواو / تەمام ، تەڤ ... ) وەك جێناوی دیار خۆیان دەنوێنن .

- جێناوی کەسیی جودا ضمير الشخصي المنفصل
Personal pronoun

= جێناوی کەسیی جوێ ؛ جێناوی کەسیی سەربەخۆ

بـ : جێناو

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروی کوردیدا دوو دەستە جێناوی کەسیی جودا هەیە ، کە ئەوانیش بەپێی دۆخی ڕاستەوخۆ (Direct case) و دۆخی تیان ( Oblique case ) دابەش دەبن :

| ژماره | کەس | دۆخی ڕاستەوخۆ | دۆخی تیان |
|---|---|---|---|
| تاك | یەکەم | ئەز | من |
| | دووەم | تو | تە |
| | سێیەم | ئەو | ئەوێ ، وێ ( بۆ مێ) |
| | | | ئەوی ، وی (بۆ نێر) |
| کۆ | یەکەم | ئەم | مە |
| | دووەم | هوون | وە |
| | سێیەم | ئەو ، ئەوان | ئەوان ، وان |

لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداً یەك دەستە جێناوی کەسیی جودا هەیە و پێوەندیی بە دۆخەوە نییە .

لە ئاخاوتنی ئەمڕۆی سلێمانی و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیدا جێناوەکانی کەسیی جودا ئەمانەن :

| ژمارە | کەس | جێناو |
|---|---|---|
| تاك | یەکەم | من |
| | دووەم | تۆ |
| | سێیەم | ئەو |
| کۆ | یەکەم | ئێمە |
| | دووەم | ئێوە |
| | سێیەم | ئەوان |

لە ئاخاوتن و فۆلکلۆری بەشە دیالێکتی موکریان و سۆراندا جێناوی کەسیی جودا بەشێوەییێکی سەرەکی دوو فۆرمی هەیە . یەکێکیان بە (ئە)

دەست پێدەكات و ئەوی دییان بە بێ (ئە ) . بوونی ئەو دوو فۆرمەش لەو بەشە دیالێكتانەدا پێوەندی بە دۆخەوە نییە :

| ژمارە | كەس | سەرەتا بە( ئە) | سەرەتا بە بێ (ئە) |
|---|---|---|---|
| تاك | یەكەم | ئەمن | من |
| | دووەم | ئەتۆ ، ئەتوو | تۆ ، توو |
| | سێیەم | ئەو | وی |
| كۆ | یەكەم | ئەمە | مە |
| | دووەم | ئەنگۆ | نگۆ |
| | سێیەم | ئەوان | وان |

- جێناوی كەسیی جوێ

بـ .: جێناوی كەسیی جودا

- جێناوی كەسیی سەربەخۆ

ب .: جێناوی كەسیی جودا

- جێناوی كەسیی لكاو ضمیر الشخصي المتصل

Enclitic pronoun

ب .: جێناو

جێناوی لكاو لە دیالێكتی خوارووی كوردیدا لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

١- جۆری یەكەم :

ئەم جۆرە ئەو جێناوانەن ، كە لە ڕابوردووی تێپەڕدا بەكاردێن ، وەك :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | م | ناردم ، فرۆشتم ، خواردم ، نووسیم .. |
| | دووەم | ت | ناردت ، فرۆشتت ، خواردت ، نووسیت .. |
| | سێیەم | ی | ناردی ، فرۆشتی ، خواردی ، نووسی .. |
| کۆ | یەکەم | مان | نووسیمان ، فرۆشتمان ، خواردمان ، نووسیمان .. |
| | دووەم | تان | ناردتان ، فرۆشتتان ، خواردتان ، نووسیتان |
| | سێیەم | یان | ناردیان ، فرۆشتیان ، خواردیان ، نووسییان |

**٢ـ جۆری بێهێز :**

**ئەوانەن کە لە ڕابوردووی تێپەڕدا دەردەکەون و بەدوا ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا دێن . وەك :**

**أـ ڕابوردووی تێنەپەڕ :**

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | م | نوستم ، چووم ، مردم ، گەڕام |
| | دووەم | ی(یت) | نوستی(یت) ، چووی(یت) ، مردی(یت) ، گەڕای(یت ) . |
| | سێیەم | Ø | نوست ، چوو ، مرد ، گەڕا ... |
| کۆ | یەکەم | ین | نوستین ، چووین ، مردین ، گەڕاین ... |
| | دووەم | ن | نوستن ، چوون ، مردن ، گەڕان ... |
| | سێیەم | ن | نوستن ، چوون ، مردن ، گەڕان |

ب ـ ڕابوردووی تێپەڕ :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | م | دەنێرم ، دەفرۆشم ، دەخۆم ، دەنووسم .. |
| | دووەم | ی ( یت ) | دەنێری (یت) ، دەفرۆشی(یت) ، دەخۆی (یت) ، دەنووسی (یت ) .. |
| | سێیەم | یٚ (ێت ) ا ( ات ) | دەنێریٚ(ێت) ، دەفرۆشیٚ(ێت) ، دەخوا (ت) ، دەنووسیٚ (ێت ) .. |
| کۆ | یەکەم | ین | دەنێرین ، دەفرۆشین ، دەخۆین ، دەنووسین . |
| | دووەم | ن | دەنێرن ، دەفرۆشن ، دەخۆن ، دەنووسن . |
| | سێیەم | ن | دەنێرن ، دەفرۆشن ، دەخۆن ، دەنووسن . |

ج ـ ڕانەبوردووی تێنەپەڕ :

| ژمارە | کەس | جێناو | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | م | دەنووم ، دەچم ، دەمرم ، دەگەڕێم ... |
| | دووەم | ی(یت) | دەنووی (یت ) ، دەچی (یت ) ، دەمری(یت) ، دەگەڕێی (یت)... |
| | سێیەم | یٚ(ێت) | دەنویٚ (ێت ) ، دەچیٚ(ێت) ، دەمریٚ(ێت) ، دەگەڕیٚ(ێت )... |
| کۆ | یەکەم | ین | دەنووین ، دەچین ، دەمرین ، دەگەڕێین .. |
| | دووەم | ن | دەنوون ، دەچن ، دەمرن ، دەگەڕێن ... |
| | سێیەم | ن | دەنوون ، دەچن ، دەمرن ، دەگەڕێن . . . |

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا دەستەی یەکەمی ئەو جێناوانە بەرچاو ناکەون و تەنیا دەستەی دووەم دەبینرێ ، کە ئەوانیش لەم شێوەیەی خوارەوەدا خۆیان دەنوێنن :

| ژمارە | کەس | جێناو |
| --- | --- | --- |
| تاك | یەکەم | م |
| | دووەم | ی |
| | سێیەم | Ø ، ە |
| کۆ | یەکەم | |
| | دووەم | ن |
| | سێیەم | |

- جێناوی گەیەنەر

ب ـ : جێناوی لێکدەر

- جێناوی لێکدەر ضمیر الوصل Conjunctive pronoun

ب ـ : جێناو

لە زمانی ئینگلیزیدا وشەکانی ( Who , Whose , Whome ) بە جێناوی لێکدەر دانراون . ئەوجۆرە وشانە لە ئینگلیزیدا سەربەخۆییان هەیە و لابردنیان مانای ڕستە دەگۆڕێ .. هەرچی ئەو زمانەوانە کوردانەن ، کە (کە) و (ی)یان لە کوردیدا بە جێناوی لێکدەر لە قەڵەم داوە ، بیریان لەوە نەکردووەتەوە ، کە ئەمانەی ئێمە سەربەخۆیی تەواویان نییە .. بەوێنە ئەگەر لە ڕستەی (( من کە بۆ ئازادی بجەنگم ، لە مەرگ ناترسم ))دا دەشێ ( کە ) لاببرێ و هیچی ئەوتۆش لە ڕستەکە ناگۆڕی ، واتە ـ هەبێ و نەبێ ، واتا و مەبەست هەریەکە ... بۆیە دەتوانین بڵێین لە زمانی کوردیدا جێناوی لێکدەر نییە .

**ـ جێناوی نادیار          ضمیر مستتر**

Indefinite ( Hidden ) pronoun

ب : جێناو

وشـەکانی ( یـەکێك ، کەسـێك ، هێندێـك ، شـتێك ، تشـتەك ، هنـەك / هندەك ... و هەندێکی دی ) لە هەردوو دیالێکتی سەرەکیی کوردیدا وەك جێناوی نادیار بەکاردەبرێن .

**ـ جێناوی نەفی          ضمیر النفي          Negative pronoun**

بـ .: جێناو

لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا بە شێوەیێکی سەرەکی ( هیچ ، چ ) وەك جێناوی نەفی بەکاردێن و زۆرجاریش وشەی ( کەس / کەسێ / کەسێك ؛ شت / شتێ / شتێك ؛ یەك / یەکێ / یەکێك )یان لەگەڵ دێ .

هەرچەندە لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا ( هیچ ، چ ) وەك جێناوی نەفی دەبینرێ ، بەلام وشەکانی ( تو ، قەت ) کە بە مانای ( هیچ ) دێن ، زۆرتر لە کاردان .. لەگەڵ ( تو ، قەت )یشدا ، زۆرجار وشەی ( کەس / کەسەك ، تشت / تشتەك .. ) دێت .

**ـ جێناوی نیشانە          ضمیر الاشارة**

Demonstrative pronoun

= جێناوی ئاماژە

بـ .: جێناو

لە زمانی ئاوێستادا (( تە  ئەێتە ، ئەێم )) ( ئەم ، ئەمە ) ؛ ((هاو ، ئەڤە )) ( ئەو ، ئەوە ) و لە زمانی سانسکریتیدا ((تا ، ئینا ، ئەیام)) ؛ ((ئەوساو))

(ئەو ، ئەوە) جێناوی نیشانەن ... لە ئاوێستاش و سانسکریتیشدا زۆری ئەو جێناوانە ژمارە و جنس و دۆخیان هەیە .

لە زمانی پەهلەویدا (( ئێن ، ئێ (ت) )) ( ئەم ، ئەمە ) ؛ (( ئان ، ئۆی )) ( ئەو ، ئەوە )) جێناوی نیشانەی سەرەکین و جاروبارەش (( ئیم )) ( ئەم ، ئەمە ) بەرچاودەکەوێ ... جێناوی (( ئۆی )) ( ئەو ، ئەوە ) فۆرمی کۆی هەیە .. (( ئۆشان )) ( ئەوان ، ئەوانە ) . لت هەندێ حاڵەتدا جێناوی (( ئێ (ت) )) ( ئەم ، ئەمە )یش ( ئاتە / ئەشان )) (ئەمان ، ئەمانە) فۆرمی کۆیەتی . هەرچی جێناوی (( ئێن )) ( ئەم ، ئەمە ) و (( ئان )) ( ئەو ، ئەوە )یە فۆرمی کۆیان نییە .. تێکڕای جێناوەکانی نیشانەی زمانی پەهلەوی دۆخیان نییە .

لە زمانی فارسیدا (( این )) و (( آن )) جێناوی نیشانەن . (( این )) بۆ نزیك و (( آن )) بۆ دوورە ، ئەم دوو جێناوە ئەگەر بۆ کەس بن لە حاڵەتی کۆدا دەبنە ( اینها ، آنها )) .

جێناوەکانی نیشانە لە زمانی کوردیدا وێڕای نێزیکی شێوەیان لەگەڵ جێناوەکانی نیشانەی ئەو زمانانەی خزمایەتییان لەگەڵیان هەیە ، لە ڕووی بەکارهێنانیشەوە زۆر وێکدەچن .

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا (ئەم ، ئەمە ، ئەمان ، ئەمانە) و ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) جێناوی نیشانەن . کۆمەڵی یەکەمیان ـ واتە ( ئەم ، ئەمە ، ئەمان ، ئەمانە ) بۆ نێزك و کۆمەڵی دووەمیان ، واتە ـ (ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە) بۆ دوور بەکاردێن ... هەرچی ( ئەم ، ئەمە )ی کۆمەڵی یەکەم و . (ئەو ، ئەوە )ی کۆمەڵی دووەمە تاکن و بە یاریدەی (ان)ی کۆ بوونەتە ئەمان ، ئەمانە ) و ( ئەوان ، ئەوانە )ە و جێناوی نیشانە سازبووە .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا (ئەڤ ، ئەڤە ، ئەڤان ، ئەڤانە) و ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) جێناوی نیشانەن . لەم دیالێکتەشدا ، هەروەك لە دیالێکتی خواروودا کۆمەڵی یەکەمیان ، واتە ( ئەڤ ، ئەڤە ، ئەڤان ، ئەڤانە ) بۆ نزیك و کۆمەڵی دووەمیان ، واتە ( ئەو ، ئەوە ، ئەوان ، ئەوانە ) بۆ دوور

بەکاردێن . هەرچی ( ئەڤ ، ئەڤە )ی کومەڵی یەکەم و ( ئەو ، ئەوە )ی کۆمەڵی دووەمە تاکن و بە یارمەتی ( ان )ی کۆ بوونەتە ( ئەڤان ، ئەڤانە ) و ئەوان ، ئەوانە) و جێناوی نیشانەی کۆ سازبووە .

- جێناوی هاوبەشی الضمير المتبادل
Peciprocal pronoun

بـ .: جێناو

لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا وشەی ( یەکتر ) جێناوی هاوبەشی هەرە دیار و چالاکە . ئەم جێناوە لە ژمارەی (یەك ) و ئاوڵناوی ( تر ) سازبووە .

لە هەندێ ناوچەی کرمانجیی خوارووداهەروەها وشەی ( یەکدی) و (یەکدوو)ش وەك جێناوی هاوبەش بەدی دەکرێن . ئەم دوو فۆرمەش دیسان لە ژمارەی (یەك) و ئاوەڵناوی (دی ، دوو) ـ کە لە (دن)ەوە کەوتوونەتەوە ـ پێکهاتوون .

لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا دوو فۆرمی (هەڤ) و (هەڤدو) باون .

- جێناوی هەیی الضمير العاكس Relative pronoun

بـ .: جێناو

جێناوی هەیی ئەو جێناوەیە ، کە خۆیەتی ( تملك ) ڕادەگەیەنێ .

لە زمانی پەهەلەویدا ( ئی ) جێناوی هەیی بووە و هەروەها کاری ئیزافەی بەجێهێناوە ـ واتە یاریدەی دانەپاڵ یەکتری دیارخەر و دیارخراوی داوە .

جێناوی هەیی کە لە ئاوێستادا ( یە / یا ) ، ( یەت / هیەت ) بوو لە هەمان کاتدا وەك نیشانەی پێکەوەبەستنی دیارخەر و دیارخراو خۆی نواندووە .

وێڕای تایبەتێتی هەندێ بەشە دیالێکت ، ئەوە دەمێنێتەوە کە لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا (هی / ئی) فۆرمی سەرەکیی جێناوی هەیی‌یە .

هەرچەندە وشەی ( هـی / ئـی ) لـە تێکسـتی کـۆن و ونوێـی کوردیـدا بـە شێوەیێکی سەرەکی وەك جێناوی هەیی بەرچاودەکەوێ ، بەڵام لە هـەندێ حاڵەتدا دەبینرێ ، کە دیارخەر و دیارخراوی پێکەوە بەستووە - واتە دەوری ئیزافەی بینیوە .

لە ئاخاوتن و نووسینی زوو و ئەمڕۆی سلێمانیدا فۆرمی زۆر باوی ئەو جێناوە (هی)یە.

لە ناوچەکانی موکریاڵن و سۆران ئەگەرچی دیسان هـەر فۆرمـی ( هـی ) باوە ، بەڵام فۆرمی ( ئی)یش زۆر بەرچاو دەکەوێ ... لە هەندێ شوێنیش فۆرمی ( هین ) بەکاردێنرێ ، وەك کە دەوترێ : ئەو خانووە هین تۆیە .

جێناوی هەیی لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا بەپێی جنس دەگۆڕێ :
( یێ - yé ) بۆ نێر و ( یا - ya ) بۆ مێ بەکاردێنرێ

- جێنشینی العلاقة العمودية ، العلاقة الرأسية
Paradigmatic

بـ: ڕێزمانی بناغەگر

**- چ -**

چاوگ المصدر Infinitive

چاوگ یان فۆرمی دیارنەخراو ئەگەرچی پێکهاتن و تایبەتێتیی خۆی هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوشەدا سەر بە فۆرمە گەردان نەکراوەکانی کردارە و

واتای ڕوودان ڕادەگەیەنێ بێ ئەوەی ئیشارەت بۆ پێوەندیێتی بە ڕێژە یان کات یان کەس یان ژمارەوە بکات . لەم ڕووەوە چاوگ وەك ناوی مەعنەوی لە کاردایە ، بەڵام ئەم پرۆتسێس نیشان دەدا و هەرچی ناویشە شت دیاری دەکا . چاوگ تایبەتێتی حاڵەتی کردار (ڕێژە ، کات ، کەس ، ژمارە)ی نییە ، بەڵام ئەرکی هەمەجۆری ڕستەسازی بەجێدێنێ و بەتایبەتی هەندێ ئەرکی ئەوتۆ ، کە فۆرمی گەردانکراو ناتوانێ جێبەجێی بکات .

پێوەندیی هەمیشەیی چاوگ بە کردارەوە بەڵگەی وشەسازی و ڕستەسازی ئیسپاتی دەکەن : بوونی تێنەپەڕی و تێپەڕی (مردن ـ مراندن) ؛ کارا دیاری و کارا بزری ( کوشتن ــ کوژران ) ؛ دیاریکردنی بە هۆی ئاوەڵکردارەوە ( خێرا ڕۆیشتن ) و بەرکار وەگرتن ( ئاوخواردنەوە )... هتد . لە باری ڕستەسازیشەوە چاوگ دەتوانێ وەك ئەندامی سەرەکیی ڕستە و وەك تەواوکەر خۆی بنوێنێ .

تایبەتێتیی ناویی چاوگ لەوەدا دەردەکەوێ ، کە چاوگیش بەهەمان چەشنی ناو نیشانەی ناسیاوی وەربگرێ : ( مردنەکەی باوکت بووە مایەی خەم و پەژارەی هەموان ) ؛ ( ئەوە چۆن هاتنێك بوو ؟ ) ... لەگەڵ پێشبەند و پاشبەندا دێت ( لە ڕۆیشتندا ئاگات لە خۆت بێ ) ... وەك دیارخراو و دیارخەریش دێ و نیشانەی ئیزافەی دەچێتە سەر : (هاتنی ئازاد بێمەبەست نەبوو ) ... لە ڕستەشدا وەك نیهاد خۆی دەنوێنێ : ( خوێندن کەڵکی زۆرە )و دەوری تەواوکەری ڕاستەوخۆ ( بەرکار ) دەبینێ : ( خوێندنم تەواوکرد ) و دەبێتە بەشی ناویی گوزارە : هەر خەریکی کوشتن و بڕینە )...

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و شێوی موکری و ئاخاوتنی هەندێ ناوچەی کرمانجیی خواروودا چاوگ وەك ناوی جنسی مێ خۆی دەنوێنێ .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەگەر دیارخراو ناو بێ و ژمارەی تاکی جنسی مێ بێ . نیشانەی (ـ ا) وەردەگرێ . چاوگیش کاتێ دەوری دیارخراو دەبینێ ، بەهەمان شێوەی ناو نیشانەی (ـ ا)ی جنسی مێی دەچێتە سەر .

ناوی جنسی مێ لە دۆخی تیاندا لە دیالێکتی ژووروو و هەندێ بەشە دیالێکتی خوارووداا چۆن نیشانەی ( ێ ) وەدەرگرێ ، چاوگیش لە دۆخی ناوبراودا وەك ناو هەمان نیشانەی (ێ)ی پێوە دەلکێ .

* *

*

لە زمانی ئاوێستادا کردار فۆرمی تایبەتی و گشتیی چاوگی نییە . بۆ ڕاگەیاندنی واتا و ئەرکی چاوگ و فۆرمی هەمەجۆری دۆخی تیانی ناوی ڕوودان لە کاردان . لە نێو ئەو دۆخانەدا زەحمەتە بتوانرێ فۆرمێك دیاری بکرێت ، کە بووبێتە چاوگ و چووبێتە سیستەمی کردارەوە . یەکەم نیشانەی ئاسایی ئەو جۆرە دیاریکردنە ، بریتییە لە کرداری ئاراستە و ئەویش ناتەواوە : لە زمانی ئاوێستادا گەلێ لەو ناوانەی لە کردارەوە کەوتوونەتەوە ، هێزی کرداریان تێدا پارێزراوە : (( یەت بە ڤانی ئەیوی ڤەنیا ( ئەبی ـ ڤەن ـ یاس ) ... ئەژیم دەهاکەم )) ـ واتە (بوومە سەرکەوتوو) .

یاخود ناوی ڕوودان لە دۆخی بەرکاریدا دەبێتە تەواوکەری ڕاستەوخۆ .. وەك (ڤەیدبەم) ، (مەنثرەم) .

لەبەر ئەوە دیاریکردنی چاوگ کەم یا زۆر لە جغزی گومان و نادیاریدا دەمێنێتەوە . جا لە نێو ئەو حاڵەتانەدا ، کە پتر پشتی پێ ببەسترێ ، ئەم فۆرمانەی خوارەوەن :

١ــ فۆرمی بەرکاری ناڕاستەوخۆی ناوی ڕوودانی هەمەچەشن و بەتایبەتیش ئەوانەی (ـ تی)یان تێدایە . وەك :

(سەپتەیەی ، سوپتەیەی )

٢ـ فۆرمێکی تایبەتی ، کە ئەویش هەر لە فۆرمی بەرکاری ڕاستەوخۆوە کەوتووەتەوە ، بەڵام لە دۆخەکانی دیدا هاووێنەیان نییە و وا

بیردەکەینەوە ، حاڵەتی هەرە نێزکی‌یان لە بۆچوونمانەوە بۆ چاوگ ئەوانەن ، کە لە ڕەگی کردارەوە وەرگیراون و کۆتاییان بە ( ـ دیای ) هاتووە :

(( جەی دیای )) ( کوشتن )

(( ڤۆیددیای )) ( زانین )

... هتد .

چاوگ لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا بریتی‌یە لە قەدی کرداری ڕابوردوو و + نیشانەی ( ـ ەن ) : ( کەرتەن )) (کردن ) ؛ (( ڕەفتەن )) ( ڕۆیشتن ) ؛ (( گوفتەن )) گوتن ) . لە ڕووی واتاوە چاوگ لە هەمان کاتدا ( ناوی ڕوودان )یشە و لەبەر ئەوەشە لەگەڵ پێشبەند و پاشبەنددا بێت .

وێڕای ئەوە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا چاوگ فۆرمی کورت ( بێ نیشانەی (( ـ ەن ))یشی) هەیە ، کە لەگەڵ قەدی کرداردا هاوشانن . وەك : (( کەرت )) ( کردن ) ؛ (( گوفت )) ( گوتن ) ؛ (( ڕەفتن )) ( ڕۆیشتن ) .. ئەم جۆرە فۆرمەش بەتەنیا بەکارنایەت و لەگەڵ کرداری دی‌دا دێت .

لە زمانی موجانی‌دا چاوگ لە قەدی کرداری ڕابوردوو و نیشانەی ( ـ ا ) یان ( ـ ان ) پێك دێ ، وەك (( نێوست + ا / ان = نێوستان )) ( دانیشتن ) .

لە هەموو دیالێکتەکانی کۆمەڵی زمانە شوگانۆ ـ ڕووشانی‌یەکاندا چاوگ فورمی کورت و فۆرمی تەواوی هەیە . فۆرمی کورتی چاوگی زوربەی کردارەکان لەگەڵ قەدی کاتی ڕابوردووی کرداردا وەك یەکن . بەوێنە : (( نڤشت ، نەڤشت )) (نووسین ) ... هەرچی فۆرمی تەواویشە بە یاردەی نیشانەی ( ـ ۆو ، ـ ەو ) پیك دێ ، وەك : (( نڤشتۆو ، نەڤشتەو )) ( نووسین ) ...

لە زمانی یازگولیامی‌دا چاوگ لە ڕەگی کاتی ئێستای کردار و نیشانەی ( ـ ەژ ) پێك‌دێ ، وەك : (( لەڤەژ )) ( گوتن ) ، (( مەرەژ )) ( مردن ) ...

لە زمانی ڤاخانی‌دا چاوگ بە ئیزافەکردنی نیشانەی ( ـ اك ) یان ( ـ ن ) بۆ سەر ڕەگی کاتی ئێستای کردار پێك‌دێ . وەك : (( گز + اك = گزاك ))

( هەڵستان ) ؛ (( جەڕ + اك = جەڕاك )) ( كردن ) ؛ (( ژۆی + ن = ژۆین )) ( خوێندنەوە ) ..

چاوگ لە زمانی بلووجیدا لە ڕەگی کاتی ئێستای کردار و نیشانەی ( ـ ەك ) پێك دێ . وەك : (( گر + ەك = گرەك )) ( بردن ) ؛ (( ژەن + ەگ = ژەنەگ )) ( لێدان ) ...

نیشانەی چاوگ لە زمانی فارسیی نوێدا (( ـ تن )) و (( ـ دن ))ە و ئەگەر ( ن ) لابرێ کاتی ڕابوردوو پەیدا دەبێ :

بستن ، فروختن ، زیستن ...

بردن ، کندن ، زدن ...

لە زمانی ڕووسیدا چاوگ کۆتایی بە دەنگی ( ت ) یان ( تی ) دێ ...

* *

*

گشت چاوگێکی زمانی کوردی کۆتایی بە دەنگی ( ـ ن n / in ) دێت ـ واتە لەم زمانەدا تاکە چاوگێك نییە کۆتایی بە دەنگی ( ـ ن ) نەهاتبێ . بەو ( ـ ن )ە دەوترێ ( ـ ن)ی چاوگ . لە پێش ئەو ( ـ ن)ی چاوگییەشەوە یەکێك لەم پێنج دەنگە ( ا ، ی ، وو ، ت ، د ) دێت و لە ڕێزمانی چاولێکەریی کوردیدا . چاوگ بە ناوی ئەو دەنگانەی پێش ( ـ ن ) ناونراون ـ واتە : چاوگی ئەلفی ؛ چاوگی یائی ؛ چاوگی واوی ؛ چاوگی تائی ؛ چاوگی دالی .

بەپێی فۆرمی چاوگ و پێوەندیی بنەمای ڕەگ و قەد ، دەتوانرێ کرداری سادە بەسەر پێنج کۆمەڵدا دابەش بکرێ :

١ـ کۆمەڵی بە ( ـ ان) کۆتایی هاتوو

٢ـ کۆمەڵی بە ( ـ ین ) کۆتایی هاتوو

٣ـ کۆمەڵی بە ( ـ وون ) کۆتایی هاتوو

٤ـ کۆمەڵی بە ( ـ تن ) کۆتایی هاتوو

٥ـ کۆمەڵی بە ( ـ دن ) کۆتایی هاتوو

| | | |
|---|---|---|
| چاولێکەری | التقليد | Imitation |
| چەندەکی | الكمي | Quantitative |
| چۆنەکی | الكيفي | Qualitative |
| چییەتی | الماهية | Substance |

## - خ -

| | | |
|---|---|---|
| خاڵ ( . ) | النقطة | Period, Full stop |

خاڵ واتای کۆتایی هاتنی گوتە دەگەیەنێ . خاڵ کاتێ دادەنرێ ، کە نووسەر بە پێویستی بزانێ بەتەواوی ڕستەیەك لە ڕستەیەکی دی جیا بکاتەوە . ئەم پێناسەیە پێوەندی ڕاستەوخۆی گوتە لە ڕووی واتاوە بە دانانی خاڵەوە زۆر بە ڕوونی نیشان دەدات .

لە ڕاستیدا ، ئێمە خاڵ بۆ جیاکردنەوەی بیرێك یان واتایەك دادەنێین ، کەوا لە شێوەی ڕستەیەکی سەربەخۆدا داڕێژرابێ . کاتێ تێکستێکی وا دەخوێنینەوە کە نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دانراوە ، لە نووسەر چاوەڕوان

دەکەین لەو شوێنانەدا خاڵی دانابێ ، کە پێویست بکات . جا لەسەر بناغەی بوونی خاڵ حوکم دەربارەی پێوەندی و دابەش‌کردنی ڕستە و بیر و واتا لە تێکستەکەدا دەدەین .

لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەگەر تێکستێك نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دانەنرابێ ، دەشێ هەرکەسە بەپێی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی خاڵ دابنێ .

بەم جۆرە دانانی خاڵ بەر ئەو حاڵەتانەی دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی دەکەوێ ، کەوا لە ڕاستیدا بەپێی تێگەیتشنی تێکستەکە دیاری دەکرێن - واتە لەسەر بناغەی مانای تێکستەکە . لەگەڵ ئەوەشدا ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نووسەر لە دانانی خاڵدا ئازادە . بەوێنە ئەگەر یەکێك بێت خاڵ لە شوێنێکدا دابنێ ، کە بیر و مەبەستی تێدا کۆتایی نەهاتبێ ، بێ گومان ڕاست نییە .

خاڵ دوو ئەرك بەجێ دێنێ : سنوور لە نێوان ڕستەیەك و ڕستەیەکی دیدا دیاری‌دەکا و کۆتایی ڕێزمانی‌یان نیشان دەدا ــ ئەمە ئەرکی سینتاکسی‌یە. جگە لەوە خاسیەتی هەواڵ گەیاندنێکی تایبەتی نیشان‌دەدا - ئەمەش ئەرکی واتایی‌یە . ئەو دوو ئەرکە لەگەڵ یەك پێوەندیی هەمیشەیی‌یان هەیە .

## خاڵبەندی　　　علامات الترقیم　　　Punction

نیشانەکانی خاڵبەندی لە نووسیندا بۆ دابەش‌کردنی تێکست لە ڕووی سینتاکس و واتاوە بەکاردەهێنرێن . با بزانین مەبەست لە دابەشکردنی تێکست لە ڕووی سینتاکس و واتاوە چی‌یە .

وتار ، نامیلکە ، کتێب دەکرێ بەسەر بەش یان فەسڵ یان بەند یان ڕستە یان پارچەکانی ڕستەدا دابەش بکرێ . لە نووسیندا ئەرکی دابەش کردنی

تێکست بەسەر ڕستەدا و ڕستەش بەسەر پارچەی جیاوازدا ئەو نیشانانە بەجێی دێنن ، کە بەناوی نیشانەکانی خالبەندی‌یەوە ناسراون .

بێگومان ، ڕاست نییە وا بە فراوانی بووترێ ، کە گوایا نیشانەکانی خاڵبەندی تێکست بەسەر ڕستەدا دابەش‌دەکەن ، چونکە ئاخاوتنی ئێمە خۆی لە خۆیدا بریتییە لە ڕستە و ڕستەش وەسیلەی پێکهێن و سازکەری زمانە . هەرچی نیشانەکانی خاڵبەندی‌یە تەنیا وەسیلەیەکی یاریدەدەرن بۆ نیشاندانی سنووری نێوان ڕستە و پارچەکانی ڕستە لە نووسیندا . لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کە وا نیشانەکانی خاڵبەندی دیاری‌کردنی ئەو سنوورانە بەتەواوی ئاسان دەکەن .

جاری وا هەیە بەهۆی لە بیرکردن یان ڕاست دانەنانی نیشانەیەکەوە ، سەرپاکی واتای ئەوەی وتراوە دەشێوێ . بەوێنە ئەو ڕووداوە زۆر ئاشکرایە ، کە ساڵی ١٨٦٥ لە ئەمەریکا کاتی لە چاپدانی ئیستیمارەی گومرگ ، چەند خاوەن کارگەیەکی ئینگلیز بۆیان هەڵکەوت ڕاستکەرەوەکانی چاپخانە بکڕن بۆ ئەو مەبەستەی لە ئیستیمارەکاندا شوێنی ڕاستەقینەی کۆمایەك بگۆڕن . بەهۆی ئەو جێگۆڕینەی کۆماکەوە ئەندازەی باجی پلێتە ئاسن وەك باجی ئاسنی خاوی لێهات . ئەو هەڵەی چاپە ( ڕاستتر ئەو فێڵە ) تەنیا دوای حەڤدە ساڵ هەستی پێکرا . ئەمەریکا لەو ماوەیەدا لە دەستکەوتی باجی گومرگدا ٤٩٩٥٥٧٦٦ دۆلاری لە کیس چوو .

بێگومان ئاواز و خاڵبەندی پێوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە . هەروەها چۆن ئاواز یاریدەی ڕاست دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی دەدات ، هەر بەوچەشنە یاریدەی باش تێگەیشتنی مەبەستیش دەدات .

ئاواز و خاڵبەندی دوو منداڵی یەك باوکن . چ ئەم و چ ئەو یاریدەی نیشاندانی پێوەندیی ڕێزمانی لە نێوان ڕستەکان و پارچەکانیاندا دەدەن و واتای دەقەکە دەردەخەن . بەڵێ دەق بەبێ نیشانەکانی خاڵبەندی مانای ونابێ ، هەر بەو چەشنەش بەبێ ئاوازیش . ئەگەرچی دەکرێ چەند

ڕستەیەك بە بیٚئاواز بوترێ ، بەڵام جوانی و جەوهەری نامێنێ و تێگەیشتن لێی زەحمەت دەبێ . بێگومان ، قسە نابێ لە ئاواز بێبەش بکرێ ، چونکە ئاواز جەوهەری قسەیە . تێکستی بێخاڵبەندیش وەك قسەی بێئاوازە .

لە ڕووی شێوەی دەربڕینەوە دوو جۆر دابەش‌کردنی وتە هەیە : دابەش کردنی وتەی ئاخاوتن و دابەش‌کردنی وتەی نووسراو . ئەم دوو دابەش‌کردنەش وێك ناچن و تەنیا یەك گرتنەویەکی دیاری‌کراو لە نێوانیاندا هەیە .

ئاخاوتن خاوەنی تایبەتێتی ڕاوەستانە لە نێوان بەدەمدا هاتنی وشەکاندا ( بێگومان نەك دوای هەموو وشەیەك ) . ئێمە کاتێ دەدوێین بۆ دیاری‌کردنی مەبەست . وشەکان لە گروپدا پێکەوە دەبەستین و لە نێوان گروپەکاندا کەم یان زۆر ڕادەوەستین . بەوێنە کە دەڵێین : ( کوڕە هەژارێك / لە بازاڕی گەورە/ سواڵی دەکرد ) ، ئەوە ئەم ڕستەیە لە تەلەفوزکردندا بەسەر سێ گروپی واتاداردا دابەش دەبێ . پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین گروپی واتادار کە لە زانستی زماندا (Syntagma)ی پێدەڵێن ، دەلوێ لە یەك وشە پێکهاتبێ ، وەك : (بێگومان / ئەو خاوەن سۆزە) ؛ (بەڵێ / تۆم خۆش دەوێ). یاخود دەشێ ڕستەیەکی سەرلەبەر بریتی بێ لە یەك سینتاگمە ، بەوێنە : ( ڕزگاریی کورد و کوردستانم دەوێ ) ...

جۆرەکەی دی دابەش‌کردن ، دابەش‌کردنی نووسینە . لێرەدا شێوازی دابەش کردن بە چەشنێکی ترە . لە نووسیندا بە نیگار گروپەکان جیادەکرێنەوە ، نەك بە ئاوازی دەربڕین . ئەگەرچی ئەمیش هەر پارچەی واتاداری ئاخاوتنمانن ، بەڵام دابەش‌کردنیان لەسەر بناغەی پێکهاتنی ڕێزمانی ڕستە دامەزراوە .

نیشانەکانی خاڵبەندی لە دەستووری نووسینی کوردیدا بۆ دەست نیشان‌کردنی شوێنی ڕاوەستان نین . لە بناغەی خاڵبەندیماندا پێکهاتنی ڕێزمانی ڕستە سەرەکی‌یە . نیشانەکانی خاڵبەندی هەروەها دەتوانن

مەبەستی دی بگەیەنن ، ئەویش بەتایبەتی نیشاندانی واتای گوتەیە . بەوێنە نیشانەی پرسیار واتای پرسیاری ڕستە دەست نیشان دەکا .

لە هەندێ باردا نیشانەکانی خاڵبەندی پێوەندی واتایی لە نێوان پارچەکانی گوتەدا دەست نیشان دەکەن . بەوێنە :

١ـ من قیژاندم ، ئەوان ڕایان کرد . ( لە گێڕانەوەی باسەکەدا ژماردنی ڕووداو ڕەچاوکراوە ) .

٢ـ من قیژاندم ـ ئەوان ڕایان کرد ( ئەوان ڕایانکرد، چونکە من قیژاندم ) .

٣ـ من قیژاندم : ئەوان ڕایان کرد . (من قیژاندم ، چونکە ئەوان ڕایانکرد).

بەو چەشنە نیشانەکانی خاڵبەندی بەر لە هەر شت دەوری دابەش‌کرنی تێکست بەسەر ڕستەدا لە ڕووی واتاوە دەبینن . وێڕای ئەوە ، هەروەها دەتوانن واتای گوتە دەست نیشان بکەن ، یان پێوەندی پارچەکانی گوتە دیاری بکەن .

لە کۆتاییشدا حاڵەتی وا هەیە ، کە نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دیاری‌کردنی ئاوازی گوتە بەکاردەهێنرێ .

| | | |
|---|---|---|
| خاوەنێتی | التملك ، الملكي | Possessive |
| خواز | الارادة | Volition |

خوازە

ب . : میتافۆر

| | | |
|---|---|---|
| خوازەکی | الارادي | Voluntary |

| Kurdish | Arabic | English |
|---|---|---|
| خواستن | | |
| ب : میتافۆر | | |
| خول | دورة | Cycle |
| = سووڕ | | |
| خۆگۆڕ | تنوع | Variation |
| = شێوەگۆڕ | | |
| خۆیەکی | الذاتی | Subjective |
| خێرانی | السرعة | Quickness |
| ب : ئاواز | | |
| داخوازی | الطلب ، حالة التمنی | Subjunctive |
| داڕشتن | الأشقاق | Derivation |
| داغ | الوصمة | Stigma |
| دانە | وحدة | Unit |
| داوەدەنگ | | |
| ب : دەنگەژێ | | |
| دەرەکی | الخارجی | Outsider , Stranger |

دەربڕین

بـ . : تەلەفوزکردن

| | | |
|---|---|---|
| دەروو | المخرج | Place of articulation |

دەستەواژە

= فرێزی بەرەڵلا

بـ . : فرێز

دەستوور

بـ .: ڕێزمان

| | | |
|---|---|---|
| ١ـ دەم | الفم | Mouth |

= ١ ـ زار

٢ـ دەم

بـ . : کات

| | | |
|---|---|---|
| ـ دەمنووقاندن | الاطباق | Velarization |

بزووتنەوەی بەشی پشتەوەی زمان بۆ دیوی ئاسمانەنەرمە ، وتنێکی پێچەوانەی تەواوکەر دێنێتە ئارا و بەمە دەوترێ ( Velarization ) .

| | | |
|---|---|---|
| دەنگ | الصوت ، الصوت اللغوي | Phone |

= دەنگەزمانی

- دەنگی چەندەکی        الصوت الكمي   Lautquantitaten

ئەو دەنگانەن ، هەرچەندە دەوترێن ، بەڵام مانا ناگۆڕن و وشە لە یەك جوداناکەنەوە

- دەنگی چۆنەگی        الصوت الكيفي        Lautqualitaten

بەو دەنگانە دەوترێن ، کە مانا دەگۆڕن و وشەیێك لە وشەیێك جودادەکەنەوە .

**دەنگەزمانی**

بـ .: دەنگ

**دەنگەژێ**        **الاوتار الصوتية**        Vocal gords

= ژێدەنگ ، داوەدەنگ

**دەنگەگۆڕکێ**        **الابدال**        Replacement

دەنگەگۆڕکێ بریتییە لەوەی دەنگێك جێگەی دەنگێکی دی بگرێتەوە بێ ئەوەی کار بکاتە سەر گۆڕێنی واتا .

دەنگێکی وشەیێك لە ئاخاوتنی هەندێ کەسدا دەگۆڕێ بە دەنگێکی دی لە ئاخاوتنی کەسانی دیدا بێ ئەوەی ئەم گۆڕانە ببێتە هۆی گۆڕانی واتای وشەکە . بە واتاییێکی دی ، هەمان وشە لە دوو فۆرم یان زیاتردا دەبینرێ ، بەهەمان واتا دیسانەوە هەندێ جار دوو فۆرمی وشەکە لە یەك زاردا هەن ، جاری واش هەیە هەر فۆرمەی لە زارێکی تایبەتیدا بەکاردێ .

به کورتی ئەمە ئەو حاڵەتە دەگەیەنێ ، کە لە وشەیەکدا دوو دەنگی جیاواز بەیەك بگۆڕرێنەوە و کارنەکەنە سەر واتای وشەکە ... ئەم دیاردەیەش لە زمانی کوردیدا یەکجار بەربڵاوە و لەم شێوانەی خوارەوەدا دەبینرێ .

١ـ کۆنسۆنانت بە کۆنسۆنانت . بەوێنە :

د > ئ : دەڕۆم > ئەڕۆم ... دەمزانی > ئەمزانی ...

د > ی ـ y : بادان > بایان    لە دنیادا > لە دنیایا

د> ت : نەوەد > نەوەت .. کرد > کرت

و < > ف : حەوت < > حەفت ... مزگەوت < > مزگەفت

و < > م : نیو < > نیم ... داوێن < > دامێن

و < > ڤ : ئاو < > ئاڤ    چاو < > چاڤ

خ < > غ : باخ < > باغ .. خونچە < > غونچە

...

٢ـ بزوێن بە بزوێن . وەك

ێ < > ا : پێ < > پا ... نێو < > ناو

ێ < > ە : پێوەندی < > پەیوەندی ... پێچە < > پەچە

ا < > ە : جێگا < > جێگە ... ڕێگا < > ڕێگە

وو < > ۆ : بووەتە < > بۆتە ... چووەتە < > چۆتە

٣ـ بزوێن و دیفتۆنگ :

وو < > وێ : خوون <  خوێن

ێ < > وێ : خێ < > خوێ

وو < > وی : سوور <  سویر

ـ دەنگەگۆڕکێی بزوێن بە بزوێن

ب . : دەنگەگۆڕکێ

ـ دەنگەگۆڕکێی بزوێن و دیفتۆنگ

بـ . : دەنگەگۆڕکێ

ـ دەنگەگۆڕکێی کۆنسۆنانت بە کۆنسۆنانت

بـ . : دەنگەگۆڕکێ

| | | |
|---|---|---|
| دەنگبڕان | الحبسة | Aphasia |

دەنگناسی

بـ . : فۆنەتێك

دەنگسازی

بـ . : فۆنۆلۆژی

| | | |
|---|---|---|
| ددان | الأسنان | Teeth |
| ـ ددانی بانین | الأسنان العليا | Upper teeth |

ـ ددانی خوارەوە

بـ .: ددانی ژێرین

| | | |
|---|---|---|
| ـ ددانی ژێرین | الأسنان السفلى | Lower teeth |

= ددانی خوارەوە

ـ ددانی سەرەوە

بـ .: ددانی بانین

دروستنووسی

بـ .: ڕێنووس

| | | |
|---|---|---|
| دریژی | الطول | Length |
| دژەکردار | رد الفعل | Reaction |
| دژواتا | الاضداد | Antonym |
| دواگر | میل ، نزعة | Proclitic |

لە زوربەی زمانەکاندا وشە گرنگەکان ، بەتایبەتی ناو تریەیێکی سەربەخۆ پێك دێنن و هێزی فەرهەنگی و ڕستەیی خۆیان هەیە ، ئاوەڵکردار و جێناو و ژمارە و پێشبەند و نیشانە و ئامرازی بەستن و هەندێ ئامرازی دی لە پێشەوە بە وشە گرنگەکەوە دەبەسترێن ، کەوا لەم حاڵەتدا نەك تەنیا خاوەنی هێزی وشەیی‌یە ، بەڵکو خاوەنی هێزی ڕستەیی‌یشە : (بەهاری کوردستان ؛ دوو ڕۆژ ، بێ مندالْ ...) . ئەو جۆرە وشانە ، کە هێز لە دەست دەدەن و خۆیان بە وشەکەی دی‌یەوە دەبەستنەوە ، پێیان دەوترێ دواگر .

| | | |
|---|---|---|
| دۆخ | الحالة | Case |

دووخاڵ ( : ) النقطتان Colon

له زۆر دۆخدا ، باری واتا ، دانانی دووخاڵ دیاری دەکات . بەوێنە لە سنووری ڕستەدا کاتێ دووخاڵ لە بڕیتی کۆما دادەنرێ ، کە ڕستەی دووەم ئەو هۆیە نیشان بدا ، کە لە ڕستەی یەکەمدا باسی هاتووە ، یاخود کاتێ ڕستەی دووەم ناوەرۆکی ڕستەی یەکەم ( یان یەکێك لە ئەندامەکانی ڕستەی یەکەم ) ئاشکرادەکات ؛ یاخود کاتێ ڕستەی دووەم ، ڕستەی یەکەم تەواو دەکات .

بۆ نموونە :

مامۆستایان ئەیانەوێ :

هەتاوی کورد زوو دەرکەوێ ،

ڕێی بیر بۆ مێشکمان خۆش کەن ،

زمانمان بە کوردی گۆش کەن ..

(گۆران ، ل٣١١ )

بازاڕی قەلاّ پڕبوو لە خەڵك : لە دەشتەکی و کۆچەر ، لە ئازربایجانی و خەڵکی وانێ ، لە خەڵکی ولاّتی ئاسۆریان و لە خەڵکی زۆر ناوچەی دیکەش .

(دمدم ، ل ٢٦)

وتم : ئاوێکی ڕەحمەت ، گەییە ڕۆحم ئاگری فیرقەت

وتی : لەم دۆزەخە زەحمەت کە دەر بێ هەرکەسی تێکەوت

( مەحوی ، ل٨٥)

ئەگەر نووسەر نەیەوێ پێوەندی ڕوونکردنەوە دەستنیشان بکات ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا بۆی هەیە کۆما دابنێ . وەك :

... به پێچەوانەی ئەوەوە کە مامۆستا عەلائەددین سەجادی دەیڵێ ، مەحوی شاعیرێك نەبووە زۆر لە خۆی بکا بۆ شیعر وتن .

(مەحوی ، ل بیست‌ونۆ )

وەك بینیمان ، دانانی دوو خاڵ لە سنووری ڕستەدا پێوەندی بە واتاوە هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا! ئەمە وەنەبێ لەگەڵ ئەوە ناکۆکی پەیدا بکات ، ئەگەر بڵێین دانانی دوو خاڵ پێوەندی بە پێکهاتنی ڕێزمانی ڕستەشەوە هەیە . دووخاڵ کە شایەتی خاسیەتێکی دیاریکراوی پێوەندی واتایی نێوان ڕستە دەدا ، لە هەمان کاتدا سنوورەکانی ڕستەش نیشان دەدات .

**دوودڵی**

ب .: گومان

**دووکەوانە ( )** **القوسان** Brackets

دەشێ پارچەیەکی ڕستە ، یان ڕستەیەکی سەرلەبەر ، یان چەند ڕستەیەك لە نێو دووکەوانەدا دابنرێ .

دووکەوانە نیشانەیەکی واتایی‌یە . بە زۆری سەرنجی تەواوکەری واتا و ڕوونکردنەوەی هەمەجۆرە دەخرێنە نێو دوو کەوانەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بەکارهێنانی نیشانەی دووکەوانە لە پلەی یەکەمدا بەندە بە واتاوە ، بەڵام وەك ئا . م . پیشکۆڤسکی ڕادەگەیەنێ ، ڕاست نییە وا دابنرێ کە دووکەوانە (( هیچ مانایەکی ڕێزمانی نییە )) . خۆ ناشێ هەر پارچەیەکی ڕستە بخرێتە نێو دووکەوانەوە . تەنیا ئەو پارچانە دەخرێنە نێو دووکەوانەوە کە نەك هەر لە ڕووی واتاوە ، بەڵکو لە ڕووی ڕێزمانیشەوە دیاری دەکرێن .

واش بووە بە باو کە ئەو پارچەیەی ڕستە یان ئەو ئەندامەی ڕستە دەخرێتە نێو دووکەوانەوە ، کە وا لە باری ڕێزمانەوە کەمتر پێوەندی بە

ئەندامەکانی تری ڕستەکەوە هەیە . هەروەها ئەو حاڵەتەش بەدی دەکرێ ، کە ئەندامی پێویست و گرنگی ڕستە لە نێو دووکەوانەدا دادەنرێ ..

لە نووسینی کوردیدا زۆر جار ناوی تایبەتی (ناوی مرۆڤ و چیا و ڕووبار و شار و دێ و وڵات و میللەت ...) ، بەتایبەتی هی بێگانە لە نێو دووکەوانەدا دەبینرێ . وەك ئاشکرایە لە نووسینی لاتینیدا ئەوجۆرە وشانە بە پیتی گەورە دەست پێدەکەن و بەمە سەرنجی خوێنەریان بۆ ڕادەکێشرێ . هەرچی پیتەکانی عەرەبییە لە ڕووی گەورەیی و بچووکییەوە وەك یەکن ، لەبەر ئەوە دەرخستنی ئەو چەشنە ناوانە بە ئەلفوبێکە جێبەجێ ناکرێ . جا لەبەر ئەو هۆیە و هەندێ هۆی دی لەگەڵ نووسینی کۆن و نوێی کوردیدا ئەو جۆرە وشانە خراونەتە نێو دووکەوانەوە .. لە (( تێگەیشتنی ڕاستی ))دا ئەو دیاردەیە نەك هەر زۆر بەرچاو دەکەوێ ، بەڵکو شارەزایانەش مامەڵەی لەگەڵ کراوە .

چەند نموونەیەك :

١ـ ( سیبریا ) و ( فلندا ) و ( اوکرانیە ) لە هرای روسیە استفادەیانکر ... ( ژ ٣ ، ل ١ . س ١ ، د١٦ ) .

٢ـ معاهدەکان لە (پاریس) و (لوندرە) و (برلین)دا همتیکی وایان کرد ... ( ژ ٥ ، ل١ . س٢ ، د ١٩ ـ ٣٠ ) .

٣ـ لە ( بکین)وە خبر هات .. ( ژ ٢ ، ل١ ، س٢ ، د٢٣ ) .

٤ـ ایتالیانەکان الین : ( کول دلروسو ) و شاخی ( ڤالیلا )مان گرتەوە ... ( ژ١ ، ل١ ، س١ ، د٢٢ )

... هتد

**دوولاگرایەتی** **الثنویە** **Dualism**

**دیارخەر الصفة ، النعت ، مضاف الیه**

Attributive (adherent ) adjunct , attribute

ئەو وشەیەیە کە وشەیێکی دی دەردەخات .

هەموو ( صفه ) و ( مضاف الیه )یەك دیارخەرن .

لە زمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی ( ناو ، جێناو ، ئاوەڵناو ... ) دەتوانن ببنە دیارخەر .

هـ . ، بـ .: نیشانەی ئیزافە .

**دیارخراو الموصوف ، المنعوت ، المضاف**

Dependent member , deretminatum

ئەو وشەیەیە کە بەهۆی وشەیەکی دییەوە دەرخرابێ .

گشت ( موصوف ) و ( مضاف)ێك دیارخراون .

لە زمانی کوردیدا بەشە ئاخاوتنی ( ناو ، جێناو ، چاوگ ... ) دەتوانن ببنە دیارخراو .

هـ . ، بـ.: نیشانەی ئیزافە .

**دیاردە ظاهرة** Possession

**دیالێکت لهجة** Dialect

= شێوە ، زار

**دیفتۆنگ ادغام حرفي علة ، الصائت المرکب** Diphthong

= بزوێنی دوولانە

دیفتۆنگ بە گرێکی واتای (دووبزوێنی ، جووتەبزوێن ، بزوێنی دوولانە) دەدات و لە دوو بەش پێکهاتووە : (( دی )) ( دووجار ) و (( فتۆنگ )) ( دەنگ ) .

لە زانستی زماندا بە تێکەڵبوونی دوو دەنگی بزوێن ، دەوترێ دیفتۆنگ (بزوێنی دوولانە) .

لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ سێ بزوێنی دوولانە دەستنیشان بکرێن :

١- وێ . وەك

توێژ ، نوێن . گوێز ، نوێ ، گوێ ، نوێژ ...

٢- وی . وەك

هەنگوین ...

٣- وی . وەك

دویر ، سویر . کویر ، موی ...

دیفتۆنگ واتە بزوێنی وتن ئاڵۆزی لە یەك برگە تەلەفوزکروای وەك یەك دەنگی ئاخاوتن خۆنواندوو . بەنموونە ، دیفتۆنگی( Ôu)ی ئینگلیزی لە وشەکانی ( go ) و ( home ) و ( no ) دا ، ( o )ی سەرەتا بە یەك گوژم تەلەفوزدەکرێ ( u )ی ماکی دووەم لە حاڵەتی ئاساییدا تەلەفوزکردنی کەمتر ڕوونە . واتە خلیسکاو و کورت و ناتەواوە . زمان لە دەربڕینی سەرەتای دیفتۆنگدا بۆ لای ڕەگ ناکشێ ؛ بەشی نێوان ناوەڕاست و دواوەی پشتی زمان دەنووشتێتەوە ؛ لێوەکان دەرناپەڕن . جا ⊖ ) شێوەی دەنگی ( Ɛ ) وەردەگرێ کەواتە هیچ یەکێك لە ماکەکانی ئەو دیفتۆنگە وێکچوونی تەواویان لەگەڵ دەنگی بزوێندا وەرناگرن ـ واتە لە دوو دەنگی بزوێن دەنگێکی دیفتۆنگی پەیدا دەبێ . تەلەفوزی باری بزوێنی ئەو دوو بزوێنەش جیاوازە لە باری یەککگرتنیان و پێکهاتنی دیفتۆنگیدا .

دیفتونگ دانەش دەبێ بەسەر داکشاو و هەڵکشاودا . لە دیفتونگی داکشاودا ماکی یەکەم بەتینە ، بەوێنەی دیتفونگی ( ôu ) ی ئینگلیزی و

( âe )ی ئەڵەمانی .. هەرچی دیفتونگی هەڵکشاوە ماکی دووەمی بەتینە ، بەوێنە( uô )ی ئیسپانی ..

هەردوو دیفتۆنگی ( وێ ) و ( وی )ی زمانی کوردی دیفتۆنگی داکشاون ، لەبەرئەوەی ماکی یەکەمیان بەتینە . ئەگەر ( وا ) : (سوار ، شوان ، توان ...) دیفتۆنگ بوایە ، ئەوە هەڵکشاو دەبوو ، چونکە ماکی یەکەمی لە ماکی دووەمی لاوازترە .

- دیفتۆنگی داکشاو الاصوات المدغمة المنسحبة (المنبسطة)
Outgoing diphthong

دیفتۆنگی داکشاو خاوەنی خاسیەتی لاوازبوونی تینی ئەندامانی ئاخاوتنە لە کۆتایی تەلەفوزکردندا . هەرچی چالاکییەکەیەتی دەکەوێتە سەرەتاوە .

- دیفتۆنگی هەڵکشاو الاصوات المدغمة الصاعدة
Rising diphthong

دیفتۆنگی هەڵکشاو خاوەنی خاسیەتی بەهێزبوونی تینی ئەندامانی ئاخاوتنە لە کۆتایی دەربڕیندا ، بەڵام لە سەرەتادا بە کزی دەست پێدەکات .

دیفتۆنگۆید Diphthongoid

دیفتۆنگۆید - ئەو بزوێنانەن ، کە هێز ( Stress ) یان لە سەرە و لە سەرتایانەوە یان کۆتاییانەوە تەئسیری بزوێنێکیدی لێوە نزیکیان لەسەرە.

دیمانە النظرية Theory

| | | |
|---|---|---|
| دیمانەکی | النظري | Theoretical |
| دیو | طور | Phase |

## - ڕ -

| | | |
|---|---|---|
| ڕاڕەو | المذهب | System |
| ڕاستەوخۆ | المباشر | Direct |

**ڕاستنووسی**

ب.: ڕێنووس

| | | |
|---|---|---|
| ڕاستوتن | اللفظ الصحيح | Orthoepy |

پرۆتسێسی فۆنەتیکی لە زمانی ئاخاوتنی میللیدا سنوور نازانێ . بەوێنە لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا نەك هەر گوێمان لە دەربرینی (خاڵ) ، (گەل) ، (ماندوو) ، (توند) ، (حاجی) ، (زارۆڵە) ، (زەلام) ، (منداڵ) ، ( سووتاندن ) ... دەبێ ، بەڵکو شێوەوتنی ( خار ) ، ( گەڵ ) ، ( مانگوو ) ،

**تونگ ) ، ( عاجی ) ، ( ذارۆڵە ) ، ( نەلام ) ، ( منالٚ ) ، ( سووتانن ...)یش** دەبیسین .

**ئاشکرایە ، دەربڕینی ڕیزی دووەم ، ئەگەرچی یاسای فۆنەتیکی تێدا ڕەچاوکراوە ، بەلاّم نابێ وەك کێشەکی ( المعیاری ـ Normative ) تەماشا بکرێ . بۆیە لە زمانناسیی کارەکیدا دابین‌کردنی تەلەفوز دەورێکی گەورە دەبینێ . لە دابین‌کرنی تەلەفوزکردناندا مەفهوم و تێگەیشتنی سەرەکی زمانی ئەدەبی و جۆری شێواز زۆر گرنگە .**

**ڕاناو**

**بـ.: جێناو**

**ڕەخسکان**

**بـ .: ڕەخسین**

| **ڕەخسین** | **التكامل** | Integration |
|---|---|---|

**= ڕەخسکان**

**ڕەسەن**

**بـ .: جنس**

**ڕەقەئاسمانە**

**بـ.: ڕەقەمەلاّشوو**

| **ڕەقەمەلاّشوو** | **الحنك الصلب** | Hard palate |
|---|---|---|

**= ڕەقە ئاسمانە**

| Root | جذر | ڕەگ |
|---|---|---|
| Roots of verb | جذر الفعل | ـ ڕەگی کردار |

ب ـ بنەمای کردار

ئەگەر لە ڕوانگەی چاوگەوە بۆ ڕەگی کرداری کوردی بگەڕێین ، ڕێگەیێکی بنەڕەتی و چەند حاڵەتێکی بیژۆك دەبینین .

ڕێگە بنەڕەتییەکە ئەوەیە ، کە زوربەی زۆری چاوگەکان ، چ تێنەپەڕ و چ تێپەڕ ، بە لابردنی (ن)ی چاوگ و دەنگەکەی پێشەوەی (ا ، ی ، وو ، د ، ت) پەیدا دەبن ـ واتە بەلابردنی نیشانەی چاوگ ( ان ، ین ، وون ، دن ، تن ) .

وەك :

تێنەپەڕ :

| چاوگ | نیشانەی چاوگ | ڕەگ |
|---|---|---|
| وەستان ـ | ان | وەست : دە ـ وەست ـ م |
| لەرزین ـ | ین | لەرز : دە ـ لەرز ـ م |
| چوون ـ | وون | چ : دە ـ چ ـ م |
| مردن ـ | دن | مر : دە ـ مر ـ م |
| کەوتن ـ | تن | کەو : دە ـ کەو ـ م |

تێپەڕ ـ

| چاوگ | نیشانەی چاوگ | ڕەگ |
|---|---|---|
| هێنان ـ | ان | هێن : دە ـ هێن ـ م |
| کڕین ـ | ین | کڕ : دە ـ کڕ ـ م |
| × ـ | وون | |
| خوێندن ـ | دن | خوێن : دە ـ خوێن ـ م |
| گرتن ـ | تن | گر : دە ـ گر ـ م |

ڕێگە بیژۆکەکەش ئەم حاڵەتانە لە خۆدەگرێ :

١ـ لابردنی دوا دەنگ ـ واتە (ن)ی چاوگ .

٢. لێکردنەوەی دوا دەنگ و گۆڕینی (ا)ی کۆتایی بە (ێ) یان (ە) .

٣ـ لابردنی دوو دەنگی کۆتایی ـ واتە نیشانەی چاوگ ـ و هەندێ گۆڕانکاری .

٤ـ لابردنی سێ دەنگی کۆتایی و گۆڕانکاری .

٥ـ لابردنی چوار دەنگی کۆتایی .

٦ـ لابردنی چوار دەنگی کۆتایی و کردنی ( و) بە ( ۆ ) .

٧ـ لانەبردنی هیچ دەنگێك و کردنی (ا) بە (ێ) .

٨ـ هەندێ چاوگ و ڕەگ هەیە ، کە لە شێوەی ئەمڕۆیاندا هیچ پێوەندییێك لە نێوانیاندا بەدی ناکرێ . هەر یەك لەو ڕەگانەش بە ڕێگەیێکی سەربەخۆدا ڕۆیشتووە .

* *

لە زمانی ئاوێستادا پتر لە سی گرووپ کردار بەرچاودەکەوێ .کەواتە پتر لە سی جۆر پێکهاتنی ڕەگی کردار هەبووە . لە زمانی فارسیی کۆندا نزیکەی پەنجا دەستە کردار دەبینرێ ... هەر لەبەر ئەوەشە لە زمانی فارسیی ناوەڕاستیشدا ڕەگی کردار هەمەجۆرە و چەشنی زۆرە . ڕەگی کرداری زمانی فارسیی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ ڕەگی کردار لە زمانی فارسیی کۆندا ، کە خاوەنی کۆمەڵی هەمەچەشن بوو و بە گرووپی جۆربەجۆری کردارەوە بەند بوو .

بێگومان هۆی هەمەجۆری و فرەچەشنیی ڕەگی کردار لە زمانی کوردیشدا دەگەڕێتەوە بۆ هەمان هۆ .

لە زوربەی زۆری زمانە ئێرانییەکاندا بۆ وەدەستهێنانی ڕەگی کردار ، بەهەمان شێوەی کوردی ، ڕێگەی بنەڕەتی و ڕێگەی بیژۆك لە کاردایە و

پسپۆڕانی ئەو زمانانەش ئەو دوو ڕێگەیەیان بە ناوی ڕێگەی ڕاست و ڕێگەی ناڕاستەوە ناوناوە . بەوێنە ، لە سەرجەمی دیالێکتەکانی گرووپی زمانە شوگانو - ڕووشانی‌یەکان و زمانی یازگولیامی ... دا ... ئەگەر لە باری ڕواڵەتەوە ، قەدی کردار و ڕەگی کردار بەراوردبکرێن (د) و (ت)ی کۆتایی دەبنە نیشانەی جیاوازیی زوربەی زۆری کردارەکان و دەشێ ئەمە بە ڕێگەی ڕاست دابنرێ . وەك (لووڤد ، لوڤد ، لێڤد) ـ ( لووڤ ، لوڤ ، لێڤ ) : ( ئاخاوتن ) ؛ ( نڤشت ، نەڤشت ) ـ (نڤش ، نەڤش) : ( نووسین ) ... هەرچی ڕێگە ناڕاستەکەیە ، هەمەجۆرە و فرەلایەنە ... لە زمانی بلووجیدا بنەمای کردار بەپێی جۆری پێکهاتنی دابەش دەبێ بەسەر پێکهاتنی ڕاست و پێکهاتنی ناڕاستدا ...

* *

ڕەگی کردار لە زمانی کوردیدا دەبێتە بنەمای هەموو جۆرە کاتێکی ڕانەبوردوو ( ئێستاو ئاینده )ی ڕێژەی ئیخباری و ئینشائی و داخوازی و کەرەستەی چالاکی ڕۆنانی ناوی کارا و ناوی بەرکار و ناوی چاوگ و ناوی جێگا و ناوی ئامێر .

| ڕەوانبێژی | البلاغة | Stylistics |
|---|---|---|
| ڕەوت<br>= پرۆتسێس | عملية ، سير | Process |
| ڕەها | المطلق | Absolute |

لە ڕێزمانی دێریندا وا پێناسەی ڕستە کراوە : ڕستە (( زنجیرە وشەیەکە بیرۆکەیەکی تەواو دەردەخا )) ؛ (( ئەو ئاخاوتنەیە ، کە لە دوو وشە ، یان پتر پەیدادەبێ .. مەبەستێك بەدەستەوە دەدات )) ؛ (( کۆمەڵە وشەیەکە ، کە بە شێوەیێکی تایبەتی ڕیزدەکرێن و هەموویان بەسەریەکەوە واتاییێکی تەواو دەبەخشن )) .. هتد .

ئەو پێناسانەی ڕێزمانی دێرین ، کە پتر پشتیان بە واتا بەستووە لەلایەن قوتابخانە زمانەوانییەکانی دوای خۆیان ، کەوتنە بەر ڕەخنە . ئەو ڕەخنانەی لەو جۆرە پێناسانە گیراون . لەو خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەکرێنەوە :

١ـ پێناسەکان هەموو ڕستەیەك ناگرنەوە ، چونکە ئەگەرچی ڕستەمان هەیە لە پتر لە وشەیەك پێك دێ ، بەلاّم ڕستەشمان هەیە لە تاکە وشەیك پێك دێ ، وەك : هات ، چوو ، مرد ...

٢ـ ئایا ( واتا ) یان ( مەبەست ) چییە ؟ چۆن دەپێورێ و چۆن پێناسە دەکرێ ؟ جیاوازیی نێوان واتای تەواو و ناتەواو چییە ؟ ئایا دەستەواژەی وەك (گوڵێکی جوان) ؛ (شاری قەلاّ و منارە) ؛ ( گۆرانی شاعیری سروشت و دەروون ) ... هتد واتایان هەیە یان نا ؟ ڕستەن یان نا ؟ بۆ ؟ ...

لە ئەنجامی ئەم پرسیار و کەموکورتییانە زمانەوانان کەلێنێکیان لەو پێناسانە دۆزییەوە ، ئەویش ئاماژەنەکردنە بۆ بوونی کردار لە ڕستەدا و هەوڵیان دا کەلێنەکە پڕبکەنەوە ، بەوەش هەنگاوێك ئەو زانستەیان بردە پێشەوە و بەم چەشنەی خوارەوە پێناسەی ڕستەیان کرد : ڕستە (( ئەو کۆمەڵە واژەیەیە کە بەکاری دێنین و کردارێکی لە تەکدا دەبێت و واتاییێکی تەواو دەبەخشێ )) ؛ (( ئەو ئاخاوتنەیە ، کە کرداری تێدایە و واتای تەواو دەبەخشێ )) ... هتد .

هەرچەندە ئەم جۆرە پێناسانە مەرجی نەبوونی کرداریان خستەڕوو ، بەڵام گرفتی کۆمەڵە وشە و واتای تەواو و دەرنەکەتنی کردار لە هەندێ ڕستەدا هەر مایەوە . دوای هەستکردنی زمانەوانەکان بەم کەموکورتییە ، بەتایبەتی کارتێکردنی قوتابخانەی ئەزموونگەریی دەروونناسەکان ، کە هەوڵی فەرامۆشکردنی واتایان دەدا ، چونکە بە ڕای ئەوان ( واتا ناکەوێتە بەر شیکردنەوەیێکی وردی زانستانە ) ، بۆیە پێناسەی ڕستەیان بەم جۆرە کرد : ((ڕستە بریتییە لەو کاردانەوەیەی لای گوێگر دروست دەبێ)) .

بێگومان زمانەوانی سوود لەم جۆرە پێناسەیە نابینێ ، چونکە ئاماژە بۆ کەرەستەکانی ڕستە ناکا . ئەوەش زەمینەی بۆ زمانەوانەکان خۆش کرد ، کە ئەو جۆرە مەفهوومانە لە پێناسەکانیاندا پەردەپۆش بکەن و بڵێن : (( ڕستە شێوەیێکی زمانیی سەربەخۆیە )) ؛ (( ڕستە ئەوەیە لە ڕۆنانی ڕستەسازی دروست بێ )) ... بەوەش گرفتەکە چارنەکرا ، چونکە ئەرکی ڕستەسازی لێکۆڵینەوەی کەرەستەکانی ڕستەیە .. زمانەوانە هاوچەرخەکان بۆ دۆزینەوەی هاوڕێکی لە نێوان زمانەوانیی نوێ و کەرەستە پێکهێنەرەکانی ڕستە ، ڕوویان کردە جۆرێکی دی لە پێناسە ، وەك (هەر ڕستەیەك لەسەر دوو بنچینە دادەمەزرێت ، بە بەشی یەکەمیان دەگوترێت ( نیهاد ) و بە بەشی دووەمیان دەگوترێت ( گوزارە )) ... (( ڕستە ئەو پێکهاتەیە کە بەلای کەمەوە .. لە بکەر و کارێکی ڕێکەکەوتوو پێکهاتبێ )) .. (( ڕستە پێکهاتووە لە پاڵدەر و پاڵدراو )) ..

ئەم جۆرە پێناسانە ئەگەرچی هەندێ گرفتیان چارە کرد وەك فەرامۆش کردنی واتا و ئامارژەکردن بۆ پێکهاتەکانی ڕستە ، بەڵام هەندێ گرفتی لاوەکی نایەوە . وەك :

١- ئایا لەم ڕستانەدا (کوردم) ؛ (مامۆستاین) ؛ (جوانن) ... کامە فرێز ناو (نیهاد)ە و ، کامە فرێز کردار (گوزارە)یە ؟ .

٢ـ ئەگـەر لـە ڕسـتەی ( دایکەکـە خـەوت ) ، ( دایکەکـە ) فرێـزی نـاوی نیهاد ) بێ و ( خەوت ) فرێزی کرداری ( گوزارە ) بـێ ، ئایا لـە ڕسـتەی ( دایکەکە منداڵەکەی خەواند )دا ، ( منداڵەکە ) چییە ؟

بۆ چارەسەری ئەم گرفتە دوو ڕێگەچارەیان دانا :

١ـ بەرکاریان دایە پاڵ بەشی فرێزی کرداری ( گوزارە ) .

٢ـ لە بری دابەشکردنی دوانی ، دابەشکردنی سییانیش سەری هەڵدا .

بەوەش گرفتەکان بنبڕ نەبوون ، چونکە :

١ـ هەندێ ڕستە جگە لە بکەر و بەرکار و کردار ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ و ئاوەڵناو و دیارخەر و ئاوەڵکرداری کات و شـوێن و چۆنیـەتی .. هتـدی تێدەکەوێ .

٢ـ هەندێ ڕستە لە کوردیدا لە تاکە وشەیەك پێكدێن و هـەموو کەرەستە پێکهێنەرەکانی ڕستەیان تێدایە ، وەك : ( چـوو ) ؛ ( نـابینێ ) ؛ ( هەیـە ) ؛ ( دەگەڕێنەوە ) ... هتد . جگە لەمەش لە هەندێ ڕستەدا تەنیا فرێزی ناوی ( بکەر / بەرکار ) لە ئاستی سەرەوە (Surface Structure)دا دەردەکەوێ . وەك : ( پ : کێ نانی خوارد ؟ و : ئازاد ) ؛ (پ : ئازاد چی خوارد ؟ . و: نان) ... هتد .

بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو کەلێنـە و دۆزینـەوەی ڕێگەچارەیـەکی گونجـاو پێناسەیەك هەیە ، کە هەموو کەرسەتە پێکهێنەرەکانی ڕستە دەگرێتە خۆی و هـەموو ڕاستییە زانستییەکانی زمانەوانی ڕەچاودەکا : (( ڕستە بریتییە لـە کردار و پێویستییەکانی )) لەم پێناسەیەدا ڕستە دابەشی دوو بەش کراوە : یەکەمیان ـ کردار ؛ دووەمیان پێویستیەکانی کردار .

بەشی یەکەم ـ کردار

مەبەست لە ( کردار ) ، قەدی کردارە . ( قەدی کرداریش ـ بریتییە لـەو مۆرفێمـەی گۆڕانکارییـەك دەردەخـا ) ، کە سـەرچاوەی هـەموو ڕوونانـەکانی کردارە و هەموو کردارێکیش تەنیا یەك قەدی هەیە ، کە بریتییە لەو چاوگەی

( ن )ی چاوگ و مۆرفێمی کاتی ڕابوردوو ( دەنگەکەی پێش (( ن )))ی چاوگ)ی لێ کرتاوە .

بەشی دووەم - پێویستیەکانی کردار ، کە دوو جۆرن :

أ) پێویستییە سەرەکییەکانی کردار .

بریتین لەو مۆرفێمانەی ناتوانین دەستبەرداریان بین و لە ڕستەدا لایان بدەین . لەبەر ئەوەی قەدی کردار ناوی گۆڕانکارییە و گۆڕانکارییش ، واتە : گۆڕانی توخمێك ، یان زۆرتر لە کاتێکی دیاریکراودا . کەواتە پێویست بە مۆرفێمەکانی کات و مۆرفێی توخمەکان ( جێناوە لکاوەکان هەیە ) .

ب) پێویستییە ناسەرەکییەکانی کردار .

بریتین لەو وشە و ئامرازانەی وەسفی پێویستییە سەرکییەکان دەکەن .

- ڕستەی ئالۆز

ب.: ڕستەی ئاوێتە.

- ڕستەی ئاوێتە الجملة المعقدة Composite sentence

= ڕستەی ئالۆز ، ڕستەی تێکەڵ ، ڕستەی گرێبەند .

ڕستەی ئاوێتە بە تیکەڵبوونی دوو ڕستەی لە ڕووی سینتاکسەوە جیاواز دەگوترێت . کەیەکێکیان ڕستەی سەرەکییە و ئەوی دییان ڕستەی شوێنکەوتووی ڕستە سەرەکییەکەیە .

پێوەندیی نێوان ڕستەی شوێنکەوتوو بە ڕستەی سەرەکییەوە ، باری شوێنکەوتنی بە کۆمەڵە هۆیەکی سینتاکسییەوە بەندە ، کە لە هەموویان گرنگتر و بەبایەختر ئامرازی پێوەندییە . ئەم ئامرازە دەچێتە نێو پێکهاتن و داڕشتنی ڕستەی شوێنکەوتووەوە و بوونی ئەم ئامرازە لە ڕستەدا یەکسەر ئەوە نیشان دەدا ، کەوا خۆی بەتەنیا واتابەخش نییە و لە ڕووی ڕێزمان و واتاوەش بەندە بە ڕستە سەرەکییەکەوە ، کە کارێکی دیاریکراو بۆ

ڕستەیەکی دی دەگـێڕێ پێوەندیـی ڕسـتەی شـوێنکەوتوو بـە ڕسـتەی سەرەکییەوە بە تایبەتێتیی ڕێزمانی ڕستەی ئاوێتە دەژمێررێت .

ڕستەی شوێنکەوتوو لە ڕستەی ئاوێتەدا دەوری بەشە سەرەکی و بەشە ناسـەرەکییەکانی ڕسـتەی سـادە دەگـێڕێت ، بۆیـە لـە کـاتی باسـکردن و نیشاندانی ڕستەی ئاوێتـەدا ، پێویستە گرنگیـی زۆر بـە لایـەنی دەوربینـی بدرێ ، بۆ ئەوەی بزانرێت ڕۆڵی کامە بەشی سەرەکیی ڕستە دەگێڕێت .

تـەبایی و ڕێککـەوتنی ڕستەی شـوێنکەوتوو لـە ڕسـتەی ئاوێتـەدا لەگـەڵ بەشـێك لـە بەشـەکانی ڕسـتەی سـەرەکیدا بـۆ نـێزیكبوونـی هـەردوو لا دەگەڕێتەوە . ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ، کەوا هەمیشە ئەو ڕێکەوتنە لە ئارادا هەبێت ، چونکە ئەم جۆرە ڕستە شوێنکەوتووانە پێوەندیی واتا و پێوەندیـی ڕێزمـانی ئـەوەند جۆراوجۆر دەبەخشـێت ، کـە بەشـە سـەرەکییەکانی ڕسـتە هێندە نابەخشن .

چەند نموونەییك :

ئاشکرایە ، کە تۆ ڕاست دەڵێیت .

ئەوە ئەو دەفتەرەیە کە تێیدا دەنووسم .

ئازاد کە هەڤالێکی نێزیکی من بوو ، لەپڕ کۆچی کرد .

ھ . ، ب .: ڕستەی شوێنکەوتوو .

- ڕستەی ئەرێ     الجملة المثبتة     Positive sentence

ڕستەی ئەرێ لەسەر ئەو پێوەندییە دەوەستێت ، کە واتای بیری ڕستەکە لـە ڕوی هـەبوون و ڕاسـتیی ڕوودانـی ڕووداوەکـە دەیبەخشـێت . ئـەو بیروڕایانـەی لـەنێو ئـەو جۆرە ڕستانەدا دەربڕراوە پێوەندیی دەربڕینیان لـە ڕستەدا هەیە . وەك

باخەکەمان جوانە .

ئازاد کورێکی زیرەکە .

... هتد

هـ . بـ .: ئەریْ

- ڕستەی ئیخباری

بـ . : ڕستەی هەواڵ گەیاندن .

- ڕستەی پرس

بـ.: ڕستەی پرسکردن

- ڕستەی پرسکردن الجملة الاستفهامية

Interrogative sentence

= ڕستەی پرس ؛ ڕستەی پرسیار

پرسیارکردن بە گشتی بە مەبەستی دەستخستنی ئەو زانیارییە بەکاردێت . کە ئاخێوەر نایزانێت و بە هۆی پرسیارکردنەوە دەیەوێت کەلێنێ یان چەند کەلێنێ لە زانیاریی خۆی پڕبکاتەوە . لێرەدا ( گوێگر / خوێنەر ) بە سەرچاوەی ئەو زانیارییە دادەنرێت .. لەمەدا پرسیارکردن پێچەوانەی ڕستەی هەواڵگەیاندن دەوەستێ ، چونکە ڕستەی هەواڵگەیاندن زانیاری دەگەیەنێ و بڵاوی‌دەکاتەوە ، بەڵام لە ڕستەی پرسکردندا گوێگر بەسەرچاوەی زانیاری دادەنرێت . ئاشکرایە ، پرسیارکردن فۆرمی تایبەتیی خۆی هەیە و بە هۆیەوە لە ڕستەکانی دی جیادەکرێتەوە .

ڕستەی پرسکردن لە ڕووی شێوە و پێکهاتنییەوە بە دوو جۆر دروست دەبێ ، بریتین لە : ١- بە هوی هێز ؛ ٢- بە هۆی ئامراز .

١- پرسیارکردن بە هۆی هێزەوە :

ئەم جۆرە پرسیارە ( پرسیاری گشتی ) و ( پرسیاری ڕستەیی )یشی پێدەوترێ . پرسیاری گشتی هیچ ئامرازێکی پرسکردن لە نێو کەرتە پێکهێنەکانیدا بەرچاو ناکەوێت و پێویستی بە ئامراز نییە ، بەڵکو بەهۆی هێزەوە دروست دەبێ . ئەم جۆرە ڕستەیە داوای زانیاری لە گوێگر ناکات ، بەڵکو ( ئاخێوەر / نووسەر ) ئاراستەی ( گوێگر / خوێنەر )ی دەکات تاوەکو بڕیاری لەسەر بدات . واتە . بڕیار لەسەر هەموو ڕستەکە ، کە ڕەزامەندی یان نارەزایی لەسەر دەربڕێت بە گۆکردنی یەکێ لەم وشانە : ( بەڵێ ، ئا ، ئەرێ ، ئەدی ، با ... نەخێر ، نا ، نەء ... ) بەتەنیا لە وەڵامدا جیاوازیی نێوان پرسیاری گشتی و ڕستەی هەواڵگەیاندن تەنیا لە شێوەی گۆکردندایە . هەموو ڕستەیەکی ڕاگەیاندن بە گوێرەی ئاوازەکەی دەبێتە ڕستەی پرسکردنی گشتی . وەك :

کاڵێ بەیەکەم دەرچوو ( ئاوازی بەرەوخوار )

کاڵێ بەیەکەم دەرچوو ؟ ( ئاوازی بەرەوژوور )

شوێنی هێزەکەش لە پرسیاری گشتیدا بەپێی مەبەستی پرسیارەکە دەگۆڕێت ، واتە ئاخێوەر بۆ دڵنیابوونی خۆی لەو زانیارییەی لە بارەیەوە پرسیار دەکا ، گومانەکەی لە کامە وشەدا بێت پرسیارەکە لەو وشەیە دەکات و هێزی دەخاتە سەر . بۆ نموونە :

پۆلی دووەم / دوێنێ هەموویان ئامادەبوون ؟

پۆلی دووەم \ دوێنێ / هەموویان ئامادەبوون ؟

پۆلی دووەم دوێنێ \ هەموویان / ئامادەبوون ؟

پۆلی دووەم دوێنێ هەموویان \ ئامادەبوون ؟

وەلآمی پرساری گشتی بە ( بەڵێ ، نەخێر ... هتد ) دەبێت و گوێگر دەتوانێ لەگەل وەلآمەکەدا بەشێکی ڕستەکە یان هەمووی دووبارەبکاتەوە :

پرسیار : نانتان خوارد ؟ وەلآم : بەڵێ .

بەڵێ خواردمان .

بەڵێ نانمان خوارد

وەك ڕوون‌بووەوە ، پرسیاری گشتی ڕۆنان و شێوەی تایبەتی نییە ، تەنیا لە نووسیندا بە یاریدەی نیشانەی پرسیار (؟) و لە ئاخاوتندا بە هۆی ئاوازەوە دەناسرێتەوە .

٢- پرسیارکردن بە یاریدەی ئامراز :

ئەم جۆرە پرسیارە ، کە ( پرسیاری تایبەتی ) و ( پرسیاری وشە )یشی پێ‌دەوترێت . هەموو ئەو ڕستانە دەگرێتەوە ، کە ئامرازی پرس بەشداریی ڕۆنانی دەکات . ئەو ئامرازنەش بنەمایەکن بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی پرس‌کردن . لە پرسیاری تایبەتیدا ئاخێوەر دەیەوێ زانیاری لە بارەی خاڵێکی تایبەتییەوە لە گوێگر وەربگرێ . دەبێ باوەڕی وا بێ ، کە گوێگر ئەو زانیارییەی لە لا دەست‌دەکەوێ .

لە زمانی کوردیدا دەیان وشە و ئامرازی پرس هەیە ، وەك : کێ ، چی ، چ ، کەی ، کوێ ، چۆن ، بۆ ، کوا ، کام ، چەند ، ئایا ... )

کێ دەڵێ ئەو ڕاستە ؟

چی ڕووی داوە ؟

... هتد

- ڕستەی پرسیاری

بـ .: ڕستەی پرس‌کردن

- ڕستەی تێکەڵ

بـ: ڕستەی ئاوێتە

- ڕستەی خەبەری

بـ: ڕستەی هەواڵگەیاندن

- ڕستەی ڕاگەیاندن

بـ: ڕستەی هەواڵگەیاندن

- ڕستەی زانیاری

بـ: ڕستەی هەواڵگەیاندن

- ڕستەی سادە　　　الجملة البسيطة　　　Simple sentence

ڕستەی سادە ئەو ڕستەیەیە ، کە بەلایەنی کەمەوە لە دوو وشەی بنجی پێك دێ و بەپێی یاسای زمان ڕیزکرابن و مەبەستێکی تەواو بگەیەنن .

واتە ، ئەم مەرجانەی تێدا بێ :

١ـ وشەکانی بەپێی یاسای زمان ڕێزکرابن ـ ڕێکخرابن .

٢ـ لەناو وشەکاندا دوو وشەی بنجی ـ ( نیهاد ) و ( گوزارە ) هەبێت .

٣ـ مەبەستێکی تەواو بدەن بە دەستەوە .

* کە دەوترێ وشەکانی بەپێی یاسای زمان ڕیزکرابن ، مەبەست ئەوەیە لە ڕستەی ئاساییدا ڕیزکردنی بەشە بنجییەکانی ڕستەی سادە بەم جۆرەیە :

أ) نیهاد

ب) گوزارە

ج) تەواوکەر ـ ئەم تەواوکەرە دەشێت سەر بە نیهاد ، یان گوزارە بێت .

بەوێنە

١ـ فەرهاد سێو دەخوات .

٢ـ قوتابی دەچێت بۆ قوتابخانە.

٣. بەهار خۆشە .

× لە ڕستەی یەکەمدا :

فەرهاد : نیهادە

دەخوات : گوزارەیە

سێو : تەواوکەری گوزارەیە .

× لە ڕستەی دووەمدا :

قوتابی : نیهادە

دەچێت گوزارەیە

بۆ قوتابخانە : تەواوکەری گوزارەیە

لە ڕستەی سێیەمدا :

بەهار : نیهادە

ە : گوزارەیە

خۆش : تەواوکەری گوزارەیە .

کە دەوترێ لە ناو وشەکاندا دەشێت وشەی بنجی هەبێت ، مەبەست ئەوەیە ، ئەگەر هاتوو یەکێك لەو دوو وشە بنجی‌یە لە ڕستەکەدا دەرنەکەوتوو ( پەنامەکی ) دەبێت ، وەك :

ا) ئەگەر زانیت ئەزم ، ئەگەر نەتزانی دزم .

ب) کە دەپرسین :

ـ کێ هات ؟

لە وەرامدا دەبێت ناوی ئەو کەسە بڵێین ،ِکە هاتووە ، گریمان ( سیروان ) بوو ، دەڵێین :

سیروان

واته لێرەدا گوزارە ـ ( هات ) پەنامەکی‌یە .

کە دەوترێ ( مەبەستێکی تەواو بدەن بە دەستەوە ) ، مەبەست ئەوەیە لە کۆمەڵە وشە یەکگرتووەکانی ڕستەکە ، قسەبۆکراو لە مەبەستی قسەکەر بەتەواوی بگات .

ڕستەی سادە ئەو ڕستانە لەخۆ دەگرێ ، کە :

١ـ تەنیا لە دوو بەشە سەرەکییەکەی ڕستە ، واتە ( نیهاد ) و ( گوزارە ) پێکهاتبێ . وەك :

ئاری نوستووە .

لانە جوانە .

یان : ٢ـ لە بەشە سەرەکییەکانی ڕستە : ( نیهاد ) ، ( گوزارە ) و بەشە ناسەرەکییەکانی ڕستە : ( بەرکار ) ، ( دیارخەر ) ، ( ئاوەڵگوزارە ) سازبووبێ ، وك :

ئاری نامە دەنووسێ .

منداڵی زیرەك خۆشەویستە .

... هتد .

## ـ ڕستەی سەرەکی الجملة الرئيسية Matrix sentence

ڕستەی سەرەکی ئەو ڕستەیەیە ، کە سەرەکییە و چەند ڕستەیێکی دی دەگەڕێتەوە سەر .

ﻫ . ، بـ .: ڕستەی ئاوێتە و ، ڕستەی شوێنکەوتوو .

## ـ ڕستەی سەرسوڕمان جملة التعجب Exclamatory sentence

ئەو ڕستەیەیە ، کە واتای سەیرمان و دامان و سەرسوڕمان و هەیهۆلان لە ڕووداوێك ، کارێك ، هەواڵێك ، شتێك ... هتد دەگەیەنێ . ڕستەی هەواڵ

گەیاندن و پرسکردن و فرماندان لەگەڵ بەهێزکردنی هێزیاندا مانای سەرسوڕمان دەگەیەنن و لە نووسیندا نیشانەی (!)ی بۆ دانراوە .

ڕستەی سەرسوڕمان لە ڕووی واتای گشتییەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە :

١ـ ئەو ڕستەیە دەگرێتەوە ، کە پێوەندیی کاریگەری و تەزووی هۆشی ئاخێوەر لەگەڵ شتێکدا یان ڕووداوێکدا نیشاندەدات ، کە واتای باوەڕکردن و گاڵتەپێکردن و بە نزمی یان بەرزی تەماشاکردن ... دەبەخشێت

بۆ نموونە :

پیاوەتی هەر لە ئازاد دێ !

بڕوانە لە چەقەڵ دەچێ !

٢ـ ئەو ڕستە سەرسوڕمانانە دەگرێتەوە ، کە کاریگەریی خودی ئاخێوەر دەبەخشێت . وەك ( ترس ، دڵخۆشی ، تووڕەیی ، پەژارە ، نەخۆشی ، خۆشەویستی .. هتد .

بەنموونە :

وەی لەو دڕندەیە !

ئۆخەی کارەکەم تەواوکرد !

ئای چەندم خۆشدەوی !

لە داڕشتن و پێکهێنانی ڕستەی سەرسوڕماندا ژمارەیێکی زۆر لە ئامراز بەشداری دەکەن . وەك :

ئاخ ، ئۆف ، ئەی ... بۆ دەربڕینی ئێش و ئازار

ئۆخەی ، ئاها ، وەه ، بەهبەه ... بۆ مەبەستی شادی

ئاخ ، ئۆخ ، وەی ... بۆ خەم و خەفەت و پەژارە

... و گەلێکیدی .

- ڕستەی شوێنکەوتوو    الجملة التابعة    Subordinate clause

لە زمانی کوردیدا ڕستەی شوێنکەوتوو چەند جۆرێکی هەیە :

١- ڕستەی شوێنکەوتووی نیهادی .    بـ .: ڕستەی شوێنکەوتووی نیهادی .

٢- ڕستەی شوێنکەوتووی گوزارەیی. بـ .: ڕستەی شوێنکەوتووی گوزارەیی.

٣- ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری  بـ.: ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری .

٤- ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری بـ . ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری.

٥- ڕستەی شوێنکەوتووی کات .    بـ.؛ ڕستەی شوێنکەوتووی کات .

٦. ڕستەی شوێنکەوتووی هۆ .    بـ.: ڕستەی شوێنکەوتووی هۆ .

٧- ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج .    بـ.: ڕستەی شوێنکەتووی مەرج .

٨- ڕستەی شوێنکەوتووی نیزا .    بـ.: ڕستەی شوێنکەتووی نیاز .

٩- ڕستەی شوێنکەوتووی ناچاری    بـ.: ڕستەی شوێنکەوتووی ناچاری .

١٠- ڕستەی شوێنکەوتووی ئەنجام    بـ.: ڕستەیشوێنەکەوتووی ئەنجام .

دابەشکردنی ڕستەی شوێنکەوتوو بەو شێوەیەی ژووروو ، تەنیا بە زانینی ڕێچکەی کاری دیارکراواندا دەبێت لە ڕستەی ئاوێتەدا .

بەشی زۆری ڕستەی شوێنکەوتوو بە ئامرازی پێوەندیی ( کە ) دەستپێدەکات .بەشێکی کەمیشیان بەیاریدەی ئامرازی پێوەندیی ( ئەگەر . تا / هەتا ، بۆ ئەوەی . ئەگەرچی ،   هەرچەندە ... ) .

- ڕستەی شوێنکەوتووی ئەنجام   الجملة التابعة للنتيجة

Clause of result

ڕستەی شوێنکەوتووی ئەنجام ، ئەنجامی مەبەستی ڕستەی سەرەکی لە ڕستەی ئاوێتەدا ڕوون دەکاتەوە . ئەم جۆرە ڕستەیە بۆ بەشێك لە بەشەکانی ڕستەی سەرەکی ناگەڕێتەوە ، بەڵکو بۆ سەرجەمی ڕستەکە . وەك :

هەڵۆ باش دەخوێنێ ، بۆیە بەیەکەم دەردەچێ .

هـ . ، بـ.: ڕستەی شوێنکەوتووو ، ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی شوێنکەوتووی بەرکاری   الجملة التابعة للمفعول

Object clause

ئەم چەشنە ڕستانە دەبنە بەرکاری یەکێك لە بەشەکانی ڕستەی سەرەکی . وەك :

چەند جار پێم وتووی ، کە گاڵتە بە ئازاد نەکەی .

ھ . ، ب : ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی شوێنکەوتووی پێچەوانە   الجملة التابعة الاضطرارية

Subordinate emepgent

ڕستەی شوێنکەوتووی پێچەوانە لە ڕستەی ئاوێتەدا ئەو لایەنە نیشان دەدا ، کە دەبوایە هۆی ڕوونەدانی ڕستەی سەرەکی ڕوون بکاتەوە. وەك :

تۆ خێرخوازیت ، هەرچەندە کەمتەرخەمیت .

ئەو بە پیاوچاك ناوی دەرکردووە ، ئەگەرچی خێری بۆ کەسیش نەبووە .

ھ. ب.: ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری   الجملة التابعة الوصفية

Attributive clause

ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری وەك دیارخەر بە دوای ناوێك دەکەوێ ، کە لە ڕستە سەرەکییەکەیدایە و تایبەتێتیی ئەو ناوە چ بەرجەستە بێ و چ دیاردە ، جۆری کاریگەری و باری ڕوون دەکاتەوە .. ئەو ناوەش ، کە ئەم جۆرە ڕستانەی بۆ دەگەڕێتەوە ، دەشێ لە ڕستە سەرەکییەکەدا نیهاد ، دیارخەر ، بەرکار ... بێ .

ئازاد ، کە هەڤاڵی دڵسۆزی من بوو ، لەپڕ کۆچی کرد

... هتد

ھ . ب .: ڕستەی شوێنکەوتوو.

- ڕستەی شوێنکەوتووی کات       الجملة التابعة للوقت

Subordinate of time

ئەم چەشنە ڕستانە ڕێچکەی کاتی ڕستەی سەرەکی نیشان دەدا . وەك :

سبەینێ ، کە دەچم بۆ قوتابخانە دەفتەرەکەم لە ئاری وەردەگرمەوە .

ھ . ب . : ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی شوێنکەوتووی گوزارەیی  الجملة التابعة للخبر

Predicate clause

ئەمە بەو ڕستە شوێنکەوتووە دەوترێ ، کە واتای بەشی ناوی گوزارەی ڕستە سەرەکییەکە ڕوون دەکاتەوە . وەك :

ئەمە ئەو دەفتەرەیە . کە تێیدا دەنووسم .

ھ . ، ب .: ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج      الجملة التابعة الشرطية

Conditional clause

ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج ، مەرجی ڕوودان و دیاردەی ڕستەی سەرەکی ئاشکرا دەکا   وەك :

ئەگەر ماڵت لە شووشە بوو ، ماڵی خەڵکی بەردەباران مەکە .

ھ . ب .: ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە

- ڕستەی شوێنکەوتووی نیاز      الجملة التابعة الفرضية

Clause of purpos

ئەم جۆرە ڕستانە نیاز و مەبەستی ڕستەی سەرەکی ڕوون دەکەنەوە و بۆ کرداری بەشی گوزارەی سەرەکی دەگەڕێنەوە . وەك :

ڕەنج ڕووی لە تۆ نا ، کە یارمەتییەکی بدەی .

ھ. ب .: ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

## - ڕستەی شوێنکەوتووی نیهادی   الجملة التابعة للمبتدأ
Subject clause

ڕستەی شوێنکەوتووی نیهادی ، ئەو جۆرە شوێنکەوتووەیە ، کە دەوری نیهادی ڕستە سەرەکییەکە دەبینێ . واتە کاتێ لە ڕستەی سەرەکیدا نیهاد نەبێ ، ئەوە ئەم ئەو ئەرکە دەبینێ . بۆ نموونە :

وا پێدەچێ ، کە تۆ کارێکت هەبێ .

ئاشکرایە ، کە ئێمە گوێی نادەینێ .

هـ. بـ. : ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

## - ڕستەی شوێنکەوتووی هۆ   الجملة التابعة السببية
Causal clause

ڕستەی شوێنکەوتووی هۆ ، هۆی هەواڵی ڕستەی سەرەکی دەگەیەنێت . ئەم جۆرە ڕستانە بۆ سەرجەمی ڕستە سەرەکییەکە دەگەڕێتەوە ، نەك بۆ تەنیا بەشێك لە بەشەکانی . وەك :

ناکرێ بەجێی بێڵم ، چونکە زۆر نەخۆشە .

هـ. ، بـ. : ڕستەی شوێنکەوتوو و ، ڕستەی ئاوێتە .

## - ڕستەی فەرماندان   الجملة الامرية   Imperative sentence

= ڕستەی فەرمان و داخوازی

ڕستەی فەرماندان باوترین شێوازی داخوازیکردنە . کەسی یەکەم داوا لە کەسی دووەم دەکات ، کارێك بەجێبێنێ یان هەڵوێستێك بنوێنێت ، یان بەپێچەوانەوە بۆ قەدەغەکردنی کارێك بەکاردەبرێ .

ڕۆنانی ڕستەی فەرماندان بەگشتی بە هۆی کرداری ڕستەکەوە دروست دەبێ . واتە کرداری فەرماندان دەوری بنەڕەتی و سەرەکی دەبینێ لە

پێکهاتنی شێوەی ڕستەی فەرماندانەدا ، بۆیە پتر شێوەی ڕستەی فەرماندان بەهۆی کرداری ڕستەکەوە لە جۆرەکانی دیی ڕستە جیادەکرێتەوە .

تایبەتیەکانی ڕستەی فەرماندان :

١ـ ڕستەی فەرماندان بەگشتی کرداری فەرماندانی تێدایە ، کە بەهۆیەوە لە جۆرەکانی دیی ڕستە جیادەکرێتەوە . وەك :

ئازاد نامە دەنووسێت

ئازاد نامە بنووسە

٢ـ بەرکار دەبێ کەسی دووەمی ( تاك ) یان ( کۆ ) بێ ، چونکە داواکە ڕووبەڕووی ( ئەو ) یان ( ئەوان ) دەکرێت .

٣ـ لە ڕستەی فەرماندانەدا کردارێك بەتەنیا دەتوانێ ڕستە پێکبێنێ ، چونکە توخمی سەرەکیی ڕستەکەیە و تەم و مژی واتایی دروست نابێ ، وەك :

بنووسە ، بنووسن

٤ ـ ڕستەی فەرماندان ڕاستی و هەڵە هەڵناگرێت ، واتە بەپێچەوانەی ڕستەی هەواڵگەیاندن . بەنموونە ، لە ڕستەی ( نامە بنووسە )دا نابێ لە دوای ڕاستی و هەڵەی ئەم ڕستەیە بگەڕێین ، چونکە تەنیا داواکردنە و زانیاریگەیاندن نییە .

أ) شێوەی داواکردنی بەجێهێنانی کارێك

بنووسە ، بڕۆ، بچۆ .

کە کەرسەتەی پێکهێنانی بریتییە لە ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار و نیشانەی (بـ ، ب ـ b ، bi) لە پێشییەوە و جێناوی کەسیی لکاو لە دوایەوە : (ە) بۆ کەسی دووەمی تاك و ( ( ن ـ n ، ن . in ) بۆ کەسی دووەمی کۆ .

ب) شێوەی داواکردنی نەکردنی کارێك یاخود قەدەغەکردنی :

ئەمەش بە هەمان یاسای خاڵی (أ) ڕۆدەنرێ و تەنیا جیاوازیی ئەوەیە ، کە نیشانەی سەرەتایی کردارەکە دەگۆڕێ بە ( مە ) .

- ڕستەی فەرمان و داخوازی

ب ـ : ڕستەی فەرماندان

- ڕستەی گرێبەند

ب ـ : ڕستەی ئاوێتە .

- ڕستەی لێکدراو الجملة المركبة Compound sentence

ڕستەی لێکدراو ئەو ڕستەیەیە ، کە لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکهاتبێ و بەیاریدەی ئامرازی پێوەندی بەیەکەوە بەسترابن . ئەو ڕستانەی بەشداریی ڕستەی لێکدراو دەکەن لە هەمان بار و ڕادەی سینتاکسیدان و خاوەنی هەمان پلەی سەربەخۆیین .

ئەرکی ئامرازی پێوەندی لە ڕستەی لێکدراودا تەنیا نیشاندانی پێوەندی نێوان ئەو ڕستە سادانەیە ، ، کە ڕستە لێکدراوەکەیان پێکهێناوە . ئامرازی پێوەندی ناچێتە نێو دارشتنی ڕستەکانەوە ، واتە بەشداریی دارشتنی ناکات . بەڵکو تەنیا لە نێوان ڕستەکاندا بەکاردێت .

دەمکاتی کردار لە زوربەی ڕستە لێکدراوەکاندا وەك یەك وایە ، کە کاتی پێوەندی کردنی ڕووداوەکان نیشان دەدات .

ڕستەی سادەی جیاواز ، کە لە ڕستەی لێکدراودا لێك دەدرێن ، یەك لە دوای یەك دێن ، کە هەریەکەیان واتای سەربەخۆی خۆی دەبەخشێت و لە ڕووی تایبەتییەکانی ڕێزماندا تەواون .

ژمارەی ئەو ڕستانەی بەشداریی دارشتنی ڕستەی لێکدراو دەکەن . دەشێ دوو ، سێ ، چوار و پتریش بن .

ڕستەی لێکدراو بەپێی واتای ڕستەکانی و ئەو ئامرازانەی بەشداریی لێکدانیان دەکەن ، دابەش دەکرێنە سەر سێ جۆر :

١ـ ڕستەی لێکدروای پێوەست — Conjuctive sentence

٢ـ ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە — Adversative sentence

٣ـ ڕستەی لێکدراوی جیاکەر — Disjunctive sentence

ڕستەی لێکدراوی پێوەست بە زۆری هەواڵ و وەسف ڕادەگەیێنیٚ و ئەم ئامرازانە : ( و ، بەڵیٚ ، نە ـ نە ) لە بەیەکەوە بەستنی ڕستە سادەکانیدا بەکاردەبرێن ، وەك

زەردەخەنەیەك دەیگرت و چاوی دەتروکاند و لێوی دەبزواند .

بەفرێکی زۆر بارییبوو ، بەڵی شار بووبوو بە بووك .

نە من چووم ، نە ئەو هات .

... هتد

زۆرجار ڕستەی لێکدراوی پێوەست بەبیٚ ئامرازی لێکدەر سازدەبیٚ . ئەویش لە ئاخاوتندا بە وەستان و لە نووسیندا بە کۆما دەردەبڕیٚ .

زەردەخەنەیەك دەیگرت ، چاوی دەتروکاند ، لێوی دەبزواند .

... هتد .

ڕستەی لێکدروای پێچەوانە جیاوازی و دژایەتیی نێوان دوو دیاردە ، ڕووداو ، بیر ... هتد نیشان دەدات . ئامرازی ( بەڵکو ، بەڵام ) ئەم جۆرە ڕستانە لێك‌دەدەن وەك :

من نەچووم ، بەڵکو ئەو هات

پیاوی چاکە ، بەڵام هەندیٚ ڕژدە

... هتد .

ڕستەی لێکدراوی جیاکەر پێوەندیی جیاوازیی نێوان ڕستەکان دەردەبڕیٚ . لەم ڕستانەدا ئامرازی (یا / یان / یاخود ...) دەوردەبینیٚ وەك :

یا گاڵ دێنیٚ ، یا پەموو

یان دانیشە ، یان بڕۆ

... هتد .

- ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە Adversative sentence

بـ ڕستەی لێکدراو .

- ڕستەی لێکدراوی پێوەست Conjunctive sentence

بـ: ڕستەی لێکدراو

- ڕستەی لێکدراوی جیاکەر Disjunctive sentence

بـ ڕستەی لێکدراو

- رستەی نەرێ الجملة المنفية Negative sentence

ڕستەی نەرێ لەسەر ئەو پێوەندییە دەوەستێت ، کە واتای بیری ڕستەکە لە ڕووی هەبوون و ڕاستیی ڕوونەدانی ڕووداوەکە دەیبەخشێت . لەم جۆرە ڕستانەدا پێوەندیی دەربڕین لە نێو ئەو بیرەدا نییە ، کە لە ڕستەکەدا هاتووە و باسکراوە . وەك :

ئێمە نەچووین

کەس ناڕوات

دوو ئامرازی ( نا ) و ( نە ) لە ڕستەی نەرێدا بەشداری دەکەن :

ئامرازی نا ) تەنیا لەگەڵ فۆرمی کرداری ڕانەبوردووی ڕێژەی هەواڵگەیاندندا بەکاردێنرێ . کردارەکەش تێپەڕ بێ یان تێنەپەڕ ؛ سادە بێ یان ناسادە شوێنی ( نا ) هەر پێش ڕەگەکەیە . وەك :

من ناکەوم . من سەرناکەوم

من چۆلەکە ناگرم .. من ڕێگاناگرم

ئامرازی ( نە ) کرداری ڕانەبوردووی ئینشائی و گشت جۆرێکی ڕابوردووی هەواڵگەیاندن و ئینشائی و تەنانەت هەندێ حاڵەتی فەرماندانیش بە ( نە ) نەفی دەکرێن .

باشتر وایە نەچم .

نەکەوی .

... هتد .

هـ . ، بـ.: نەرێ

- ڕستەی وەسفی

بـ.: ڕستەی هەواڵگەیاندن .

## - ڕستەی هەواڵگەیاندن الجملة الاخبارية

Indicative sentence

= ڕستەی خەبەری ، ڕستەی ڕاگەیاندن ، ڕستەی وەسفی ؛ ڕستەی زانیاری ، ڕستەی ئیخباری .

ڕستەی هەواڵگەیاندن بە شێوەیێکی زۆر فراوان لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکاردێت و سەرەکیترین جۆری ڕستەیە . جۆرەکانی دی ڕستە ، بەگشتی لە ڕستەی هەواڵگەیاندن دادەتاشرێن . ڕستەی هەواڵگەیاندن هەموو ئەو ڕستانە لە خۆدەگرێ ، کە هەواڵ یان زانیاری دەگەیەنن و باسی دیاردەکانی دەوروبەر دەکەن و خاوەنی ئەم تایبەتێتییانەیە :

١- ڕستەی هەواڵگەیاندن دەشێت ڕاست بێ یان هەڵە ، واتە دەتوانرێ ئەو زانیارییەی کە ڕایدەگەیەنێ ڕاستییەکەی بسەلمێنێ یا بە درۆ بخرێتەوە . بۆ نمونە :

میوانێکی زۆرمان هەیە .

٢ـ دانە پێکهێنەکانی ڕستەی گەیاندن مەودای شوێنگۆرکێیان هەیە ، کە لە سنوورێکی دیاریکراودا ئەو شوێنگۆڕینەی وشەکان نابنە هۆی گۆڕینی واتای ڕستەکە . وەك :

ئازاد بۆ بازاڕ دەچێت .

ئازاد دەچێت بۆ بازاڕ .

هەرچەندە هەندێ جار ، کە شوێنی کەرتە پێکهێنەکان دەگۆڕرێت ( بۆ جەختکردن ) بۆنە ڕێزمانییەکەش لە گەڵیدا دەگۆڕێت . وەك :

سوار لە گیاکەدا ون دەبوو .

گیاکە سواری تێدا ون دەبوو .

زۆرجار گۆڕانی شوێنی کەرتە پێکهێنەکان واتای ڕستەکە بە تەواوی دەگۆڕێ . لەبەر ئەوە ڕیزکردن دەورێکی سەرەکی هەیە بۆ گەیاندنی واتاکە . وەك :

ئازاد لە نەوزادی دا .

نەوزدا لە ئازادی دا .

بە گشتی جیگۆڕکێ لە ڕستەی ڕاگەیاندندا سنووردارە ، ئەوەش زیاتر لە نێو چەند کەرەستەیەکی ڕستەکەدا دەبێت . وەك : کردار لەگەڵ بەرکار ، کە دەتوانن شوێنی خۆیان بگۆڕن .

←

کار + کردار

←

یان کارا + بەرکار + کردار

٤ ــ لە ڕستەی هەواڵگەیاندندا ئاخێوەر سەرچاوەی زانیارییە و زانیارییەکە دەدات بە گوێگر و کاردانەوە لە گوێگر ڕوونادات ، تەنیا زانیارییەکەی پێدەگات .

٥ـ ئەم جۆرە ڕستەیە ، گەر بە وتن دەربېڕرێت ، ئاواز لە دوا بڕگەی هێزدارەوە بەرەو سەرەوە دەڕوات و یەکسەریش دوای ئەوە نزم دەبێتەوە .

واتا ئاوازی بەرەوخوار وەردەگرێت . ڕستەی وەها لە کاتی نووسینیدا کۆتاییەکەی بە خاڵ نیشان دەدرێت .

٦ـ ڕستەی هەواڵ گەیاندن دوو شێوەی هەیە : ( ئەرێ ) و ( نەرێ ) ، کە هەردووکیان زانیاری . هەواڵ دەگەیەنن . وەك :

ئەمرۆ ڕۆژنامەم کڕیوە .

ئەمرۆ ڕۆژنامەم نەکڕیوە .

لە ڕووی ڕۆنانیشەوە چەند جۆرێکی هەیە ، وەك : سادە و لێکدراو و ئاوێتە .

## ڕستەسازی علم النحو Syntax

= سینتاکس

زاراوەی ئەم زانستە لە ( Syntaxis )ی یۆنانییەوە کەوتۆتەوە ، کە واتای ( دانان ، ڕێکخستن ) دەگەیەنێ . بەو پێیە ڕستەسازی لێکۆڵینەوەیە لە یەکگرتنی وشە لە ئاخاوتن و ڕستەدا .

ڕستەسازی وەك بەشێکی ڕێزمان لە دەستەواژە و ڕستە دەدوێ . ڕستەسازی باسی فۆرمی زمانیی ڕستە دەکات و بەپێی خاسیەتی جۆربەجۆر ڕستە دابەش دەکا و جیادەکاتەوە . بەوێنە لە ڕستەسازیدا ـ ڕستەی سادە و ڕستەی ناسادە ، ڕستەی سەرەکی و ڕستەی شوێنکەوتوو ؛ ڕستەی هەواڵ گەیاندن و ڕستەی پرس کردن و ڕستەی فەرماندان و ڕستەی سەرسوڕمان ... جیادەکاتەوە . وێڕای ئەوە ، لە زمانناسیدا ڕستەی جۆربەجۆری ئەم زمان یان ئەو زمان باس دەکرێت .

ڕستەسازی لە نێو ڕێزماندا ناوەڕاستی گرتووەتەوە ، هەروەك لەو شێوە ساکارەی خوارەوەدا ڕوونکراوەتەوە :




ڕستەسازی و وشەی فەرهەنگی فۆرمی ئەو دوو دانەیەن ، کە دەستەلآتیان بەسەر دوو پێکهاتنی سەربەخۆدا هەیە ، کە یەکێکیان فۆنۆلۆژی و ئەوی دییان سیمانتیکە .

ڕێزمانووسانی ڕێبازی کلاسیکی ، کە لە ڕستەیان کۆڵیوەتەوە ، لەنێو بەشەکانی ئاخاوتندا ڕوونیان کردووەتەوە ، بەواتا بەشەکانی ئاخاوتن و بەشەکانی ڕستەیان هەر لەنێوان یەك بابەتدا باسکردووە ، بۆیە فرێزی ناوی و فرێزی کرداری دۆخی سینتاکسی ڕستەیان لەپاڵ ناو و جێناو و ئاوەڵناو ... دا باسکردووە . ئەم ڕێبازە تا سالآنێکی زۆر دوور و درێژ پێڕەوکراوە .

( پانینی )ی ڕێزمانووسی ناوداری هیند ، کە بە کۆنترین ڕێزماننووسی سآنسکریتی دەژمێررێت ، لەنێو بەشەکانی ڕستەدا هێمای بۆ ( نیهاد ) و ( گوزارە ) کردووە .

ئەرستۆ ، کە هاوچەرخی پانینی بووە ، ئەویش لە نووسینەکانیدا هێمای بۆ هەمان ئەو بەشانەی ڕستە کردووە ، کە پانینی ناوی بردوون .

تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست لێکۆڵینەوەی ڕستەسازی گەلێ پێشکەوتن و گۆڕانی بەخۆوە دی ... لە سەرەتای نیوەی دووەمی هەمان سەدەدا ئەو زانستە سەرکەوتنێکی گەورەی وەدەست هێنا و ئەویش ئەوەبوو چۆمسکی تیۆری ( Transformation generative )ی داڕشت ، کە لای ئەو ڕستەسازی هەر ئەوە نییە ، ڕستە لە ڕووی ڕووکەشی بەرەوەیدا شی بکرێتەوە . بەڵکو شیکردنەوەی ڕستە دەبێ واتای زمان بەگشتی لە

ئاستی فۆنۆلۆژی و دارشتن و سیمانتیکیشدا بگرێتەوە . هەروا لای چۆمسکی زمان ڕەگەزێکی داهێنەرە لەگەڵ ئەوەی لە چەند دەنگێکی دیاری کراو پێکهاتووە ، کەچی بۆی هەیە ڕستەی ڕادەبەدەر دابڕێژێ و ڕستەسازییش لەسەر چەند بنج و بنەماییکی دیاریکراودا ڕستە پێکدێنێ و ئەم بنجانە بۆیان هەیە ڕستەی لە ڕادەبەدەر بهێننە کایە .

چۆمسکی لەم تیۆرییەیدا چەند ڕێبازێکی شیکردنەوەی ڕستەسازی گرتووەتەبەر ، سەرەتاکەی ( Finite State Grammar ) بوو . لەم بۆچوونەیدا ، ئەوە ڕوون دەکاتەوە ، کەوا ڕەگەزی دەستپێکی ڕستە کاریگەری لەسەر پەیدابوونی جۆری ڕەگەزی دوای خۆی هەیە .

بەدوا ئەمەدا ، چۆمسکی ڕێبازی ( Phrase stucture )ی بەکارهێنا . لەم بارەدا ئەو ڕەگەزانەی ڕستەی داناوە ، کە بەر لەویشدا لە شیکردنەوەی ڕستەدا بەکارهاتوون ، وەك ڕەگەزی کارا و کردار بەرکار و .. هەوڵیداوە بەیارمەتیی مەنتیق بگاتە چەند دەستوورێکی زانستانە بۆ شیکردنەوەی ڕستە ...

لە دوای لێکدانەوە ، چۆمسکی ئەوەی بۆ دەرکەوت ، کەوا دەستووری ئەم ڕێبازە ، نابێتە پێوانە بۆ هەموو زمانێك ، بۆیە ڕووی لە ڕێگەی سێیەم کرد ، کە ڕێبازی ( Transrormational Grammar )ە . لەم ڕێبازەیدا لە ڕۆنانی ژێرەوەی ڕستە دەکۆڵێتەوە ، بە واتا دیوی ناوەوەی شیدەکاتەوە و ئەوجا ڕووکەشی دەرەوەی لێکدەداتەوە .

ڕشتە　　　　الجهاز　　　　Organ

- ڕشتە ئاخاوتن　　　　الجهاز النطق　　　　Organs of speech

= ڕشتەی وتن ، ئەندامەکانی ئاخاوتن .

ڕشتەی ئاخاوتن ئەندامی تایبەتی بەرهەمهێنان و وەرگرتنی دەنگەکانی ئاخاوتن نییە . گەلێ ئەندامی لەشی ئادەمیزادیش ، کە ئەرکی بایۆلۆجیی رووتیان بەجێدەهێنا و بەجێدەهێنن ، وەك ڕشتەی هەناسەدان و هەزم ... هتد . بەلاّم لە ڕەوتی مێژووی کۆمەڵی ئادەمیزاددا ، ئەو ئەندامانە پێشکەوتن و بەرەو پەیداکردنی وزەی دەربڕین و وەرگرتنی دەنگ گەشەیان سەند . ئەوك کە ئەرکی هەناسەدان و قووت دانی بەجێدەهێنا ، بووە ئەندامی ڕشتەی تەلەفوزکردن ـ ئەو دیاردەیەش بایۆلۆجی کۆمەلاّیەتییە . کە ئەمەش بە بەڵگەی بوونی بنکەی وتنی زمان ئاسان ئیسپات دەکرێ .

ڕشتەی ئاخاوتن ـ ئەو ئەندامانەی لەشی ئادەمیزادن ، کە وزەی بەرهەمهێنان و وەرگرتنی ئاخاوتنیان هەیە ( بەر لە هەر شت ـ دەنگی ) . بە واتایێکی فراوانتر ، ڕشتەی ئاخاوتن و سیستەمی دەمارە ناوەندییەکان و ئەندامانی ( بیستن و بینین ) ، کە بۆ وەرگرتنی دەنگ پێویستن و ئەندامانی وتن ، کە بۆ بەرهەمهێنانی دەنگەکانی ئاخاوتن گرنگن ، دەگرێتە خۆ . لەباری فیزیۆلۆژییەوە ، ئاخاوتن وەك یەکێك لە ئەرکەکانی سیستەمی دەمارە ناوەندییەکانی مرۆ خۆی دەنوێنێ . لە لایەکەوە ، سیستەمی دەمارەکان دەبێتە هۆی پەیدابوونی دەنگەکانی ئاخاوتن ، لە لایکی دیشەوە لە بیستنی دەنگەکانی ئاخاوتن لە دەرەوە و هەستپێکردنیاندا بەشداری دەکا . بە واتایێکی دی لەباری بەرهەمهێنانی دەنگدا وزەی دەمارەکان دەبێتە کارێکی ئامێرایەتی و لەباری وەرگرتن و تێگەیشتنی ئاخاوتنیشدا وزەی ئامێرایەتی دەگۆڕێ بۆ دەماری .

ـ ڕشتەی دەنگ  جهاز الصوت  Vocal apparatus

ـ ڕشتەی وتن

بـ.: ڕشتەی ئاخاوتن

- ڕشتەی هەناسە الجهاز التنفسي Organ of windpipe

ڕوخسار

بـ.: ٢ـ شێوە

ڕۆخی زمان

بـ.: لێواری زمان

ڕۆنان البنية ، التركيب Structure

- ڕۆنانی دەرەوە البنية الخارجية / الظاهرية
External structure

- ڕۆنانی ناوەوە البنية الداخلية / العميقة
Internal (inner ) structure

ڕوودان حدث Action

بەوێنە (دەمرێ) ، ( مرد) ، ( دەمرد ) ، (مردووە) ... وشەی جیاواز نین و فۆرمی جیاوازی یەك وشەن و پێوەندێتیی فۆرم کۆیان دەکاتەوە .

لەگەڵ ئەوەشدا ، کە هەریەك لەو فۆرمانە خاوەنی واتای خۆیەتی ، بەلآم هەموویان خاوەنی واتایێکی هاوبەشن ، کە ئەویش ڕوودانە . جا (( واتای گشتیی ڕوودان )) ، کە هەموو ئەو فۆرمانە دەگرێتە خۆ ، بە تایبەتێتیی گشتیی ڕێزمانییەوە بەندە . هەر تایبەتێتی ڕوودانیشە جیایان دەکاتەوە لە

وشەی ( مردوو)ی هاوبنەمای واتا یەکجار نێزیك لێیانەوە . دەشێ بوترێ ( واتای گشتیی ڕوودان )) تایبەتێتی هەموو فۆرمێکی کردارە .

| | | |
|---|---|---|
| ڕووکەش | العارض | Sham |
| ڕێباز | الطريقة | Method |
| ڕێڕەو | اتجاه ، مسار | Tendency |
| ڕێزمان | قواعد | Grammar |

= دەستوور

ڕێزمان ( grammar ) وەك ماددەیێکی زانست یەکێکە لە بەشە پێکهێنەرەکانی زماننناسی و بریتییە لە کۆمەڵێ یاسا و دەستوور لە بارەی گۆڕینی وشە و چوونە پاڵ یەکدی وشە لە ڕستەدا . زاراوەی ( grammar ) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و وەك ئاشکراشە ، بناغەی ڕێزمانی زانستی لە یۆنانی کۆندا دامەزراوە . بە زمانی یۆنانی بە ڕێزمان دەڵێن ( grammatika ) ، کە واتای (( هونەری نووسین )) دەگەیەنێ . بەم جۆرە زانایانی ڕووی ڕێزمان وا تەماشای ڕێزمانیان دەکرد ، کە دەبێ بەر لە هەرچی لە ڕووی (( ڕێنووس )) و لە ڕووی شێوازەوە ، مرۆڤ فێری ڕاستنووسی بکات .

هەر زمانێك خاوەنی ڕێزمانی خۆیەتی ، لەبەر ئەوە ڕێزمان وەك زانستێك لەسەر کەرەستەی چەسپاوی ئەو زمانە دادەڕێژرێ ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ماددەیێکی زانست ڕێزمانی گشتی هەیە ، ئەویش کە مەبەستی ڕێکخستنی شێوازی گشتییە لە لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی ڕێزماندا . هەرچەندە

هەر زمانە خاوەنی کەرەستەی تایبەتی و شێوەی جیاواز و بەکارهێنانی سەربەخۆیە و ئەو تایبەتییانە لە زمانانی جیاوازدا دەبینرێن ، کەچی سەرەڕای ئەوەی ، هەندێ بنەما هەن ، کە پێویستە بخرێنە نێو بناغەی لێکۆڵینەوەی هەر زمانێکەوە .

وشەسازی ( مۆرفۆلۆژی) و ڕستەسازی ( سینتاکس ) دوو بەشی گرنگ و هاوسەنگی ڕێزمانن . ڕێزمانیش ئەو زانستەیە ، کە لە پێکهاتنی وشە و ڕستە دەدوێ :

ب . : ١- وشەسازی

٢- ڕستەسازی

- ڕێزمانی بەرهەمهێنان     النحو التوليدي

Generative grammar

- ڕێزمانی زێنەکی

زاراوەی ( ڕێزمانی بەرهەمهێنان ) لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا لەلایەن چۆمسکییەوە هێنرابە ناوانەوە . ئەمڕۆ ، بە دوو واتای جیاوازەوە بەکاردەبرێت . بە ناوەڕۆکە بنجی و تەسك و تەکنیکییەکەیەوە ، ناو لە کۆمەڵێك یاسا دەنێت و دیاری‌یان دەکات ، کە ژمارەیێك لە چەشنی جوراوجۆر لە ڕژێمەکانی زمان پێناسە دەکات .

واتا فراوانەکەی ، کە دەشێ زاراوەی ( بەرهەمهێنانیی ) بۆ بەکاربرێت ، پەیوەستە بە بینایەکی تیۆری و ڕێبازیی تەواوەوە سەبارەت بەو گریمانە و بۆچوونە بنجییانەی دەربارەی دروستەی زمان هەن و دەکرێن .

چۆمسکی تەنیا داڕێژەری ناوەڕۆك و سیمای ڕێزمانی بەرهەمهێنان نییە ، کە لە زانستی زماندا بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی وەدەست هێناوە ، بەڵکو سەرقافڵە و ڕابەری هەڵگران و نوێنەرانی بەرهەمهێنانیشە.

ڕێزمانی بەرهەمهێنان کۆمەڵێکە لە یاسا ، کە کار بە ژمارەیێکی کۆتاییدار و دیارکراو لە یەکەی فەرهەنگی دەکات و کۆمەڵەیەکی بێکۆتایی ، یان کۆتاییدار لە یەکە تەکنشینییەکان بەرهەمدێنێت ( هەر دروستە تەکنشینییەك لە ژمارەییێکی کۆتاییدار لە یەکە پێکهاتووە )و هەر دروستە تەکنشینییەك لە ڕێی ئەو زمانەوە وەك فۆرم دروست پێناسەدەکرێت ، کە بە ڕێزمان پەسنکراوە . ئەوەی لە ڕێزمانی بەرهەمهێناندا بۆ زمانەوان گرنگە ، ئەوەیە کە ڕێزمانی بەرهەمهێنانەکە خۆی پەسنکردنێکی دروستەیی گونجاو دەخاتە پاڵ هەر یەکێك لە دروستە تەکنشینییە فۆرمدروستەکان ( بەتایبەتی پاڵ هەر یەك لە ڕستە فۆرمدروستەکان)ی لەلایەن ڕێزمانی بەرهەمهێنانەکە خۆیەوە بەرهەمهێنراوە . ئەم پێناسەیەی ڕێزمانی بەرهەمهێنان ، کە لێرەدا دراوە ، لە هەندێك ڕووەوە لەوەی چۆمسکی گشتیترە . پێناسەکە خۆی زاراوەی (( دروستەی تەکنشینی )) بەکاردەبات ، لە کاتێکدا ڕەنگە چۆمسکی لەبری ئەوە ، لە (( زنجیرە )) ، یان دانەی یەك لە دووی یەك بدوێت . دروستە تەکنشینییەك ، کە بریتییە لە لێکدان و خستنەپاڵیەکی گونجاو لەباری یەکە ناسراوە ڕێزمانییەکان ( لە فۆنۆلۆژیدا خستنەپاڵیەکی کەرەستە سەرەتاییەکان ) ، کە پێویست ناکا و مەرج نییە زنجیرەیی و یەك لەدووی یەك ڕێزکرابن ، یان ڕیزبکرێن . ڕاستە چۆمسکی پێناسەی ڕستە و فرێز وەك زنجیرەی دروستبوو یان خاوەن دروستە پێناسە دەکات ، بەڵام ژێرانەیە و لەگەڵ بۆچوونە کلاسیکییەکەدا دەگونجێت ، ئەگەر ئێمە وەك دروستەی تەکنشینیان ببینین ـ واتە بێتو وەك ئەو کۆمەڵانەی یەکە ناسراوەکانیان تەماشا بکەن ، کە لە پێکهاتوویەکی تایبەتیدا هێنراونەتە پاڵ یەکدی . ئەوەی لە ڕێزمانی کلاسیکیدا وەك پێکهاتووی جۆراوجۆر و جیاواز ناوبراوە . لە ڕێزمانی بەرهەمهێناندا لە ڕێی ئەو جیاوازییەوە دەرخراوە ، کە بە پەسنکردنی دروستەوە بەندە . ناسنامەی جیاوازییەکانی پێکهاتووەکان ، جیاوازییەکانی نێوان دروستەکان و پەسنکردنەکانیانن .

زاراوەی ( بەرهەمهێنـان ) کە لە پێناسەکەدا هاتووە ، بەو واتایەوە لێـی تێدگەین ، کە لە بیرکاریدا هەیەتی . ئەمە بەم نموونەیە ڕوون دەکرێتەوە : گریمان ، کە نرخی هەرامەی (X) یەکێك لە ژمارە سروشتییەکانی ( ١ ، ٢، ٣ ...)یە . ئەمجا گۆکردنی ( $X + X_2$ + ١) ، (کە ئێمە وەك کۆمەڵەی یاساکان یان ئۆپەراسیۆنەکان دەیانهێنینە بەرچاومان ) کۆمەڵەی ژمارەی ( ٣ ، ٧، ١٣) بەرهەم دێنن : دەتوانن ڕستەکانی زمانێك بەرهەمبهێنن . لەمە پتر ناچێتە نێو بواری بیرکارییەوە . گرنگ ئەوەیە کە ئەو زاراوەی بەرهەمهێنانەی وەها لێی تێدەگەین ، بە ڕەوتی پرۆتسێسی بەرهەمهێنانی هیچ ڕستەیەك لەلایەن ئاخێوەرەوە ( یان مەکینەوە ) نەبەستراوە . ڕێزمانێکی بەرهەمهێنان پەسنکردنێکی تەواوی بیرکاریی دروستەی ڕێزمانیی ئەو ڕستانەن ، کە خۆی بەرهەمیان دێنێت .

- ڕێزمانی بناخەگر

ب.: ڕێزمانی بناغەگر

- ڕێزمانی بناغەگر النحو البنيوي Structural grammar

= ڕێزمانی بناخەگر

فێردیناند دێ سوسسور - زمانناسی خەڵکی ژینێڤ ، یەکەمین کەسێکە بیروڕای نوێی زمانناسیی نوێی گەڵاڵەکرد و لە دەرزوتنەوەکانی خۆی لە زانستگەدا لە نێوان ساڵانی ١٩٠٦ تا ١٩١١ زمانناسی لەسەر بناغەیەکی نوێ پێڕەو کرد . هەر بۆیەشە زۆرکەس ئەو بە ((گەورەبابی زمانناسیی نوێ)) دادەنێن . کتێبە بەناوبانگەکەی فێردیناند بەناوی (( دەورەی زمانناسیی گشتی )) دوای مردنی بڵاوبووەوە . بیروڕاکانی سوسسور لە دیاریکردنی ڕێبازی زمانناسیی نوێدا زۆر کاریگەر بوون و دوای ئەو زۆر قوتابخانەی

جیاوازی زمانناسی سەریان هەڵدا ، کە لە هەموویان گرنگتر قوتابخانەکانی کازان و مۆسکۆ و پراگ و کۆپنهاگن و ئەمەریکایی ...ن . ئەو قوتابخانانە ، کە ریشەیان لەبیروڕاکانی سوسسورەوە سەرچاوەیانگرتووە ، دوایی هەر یەکە ڕێبازی جیاوازی وەبەرگرت . ئەگەرچی سوسسور زاراوەی بناغە ( Structure)ی بەکارهێنا ، بەلاّم لەبەر ئەوەی ، ئەو قوتابخانە زمانناسییانەی بە شوێن ئەودا چوون بەگشتی ناوی بناغەگر (Structuralist) و ڕەوندی کاریان بناغەگری ( Structuralism ) ناونرا . بەو پێیە سوسسور بە دەستپێشکەری زمانناسیی بناغەگر دادەنرێ .

ئێستاش هەندێك زانیاری لە ڕوانگەی بناغەگرانەوە ، سەبارەت بە ڕێزمانی پێشکەش دەکەین :

سوسسور سنوورێکی ئاشکرای لە نێوان زمانناسیی نێوزەمانی ، یان زمانناسیی مێژوویی و زمانناسیی هاوزەمانی ( کە جارجاریش پێی دەڵێن : زمانانسیی وەسفی ) کێشا و ئەوەی دەربڕی ، کە ئەو دوانە نابێ تێکەڵ بکرێن .. زمانناسیی مێژوویی باسی ئەوە دەکا ، کە زمانێکی تایبەتی چۆن ئالوگۆڕی بەسەردا هاتووە و بەرەو پێش چووە تا گەیووەتە دۆخی ئێستاکە و ئەم ڕۆژگارەی خۆی ، لە کاتێکدا زمانناسیی هاوزەمانی باسی دۆخی ئێستاکەی زمان دەکا بەبێ ئەوەی پێشینە و چۆنیەتیی مێژوویی ئاڵوگۆڕبوونی لەبەرچاو بگرێ . بەو پێیە لێ وردبوونەوەی مێژوویی نابێ ببێتە پێوانەی باسکردنی دۆخی هاوزەمانیی زمان ... جا تێکەڵکردنی ئەو دوو لایەنە یەك كزەکانی ڕێزمانە کۆنەکانە . بەو پێیە دەمەتەقێ و لێدوان لەسەر ئەوەی ئەمڕۆ بەتایبەتی لە ناوچەی سلێمانیدا دەنگی (د)ی ژمارەکانی ( یازدە ، دوازدە ، سیازدە ، پازدە ، شازدە ، حەڤدە ) سواوە و دەوترێ ( یانزە ، دوانزە ، سیانزە ، پانزە ، شانزە ، حەڤڤە ) . لەبەر ئەوەی تێچوونی ئەم (د)ە بووە بە هۆی قورسیی دەربڕینی ئەو وشانە ، بۆیە ئاخێوەر بۆ سووككردنی ئەو نالەبارییە ناچاربووە دەنگی (ن) بێنێتە ناو

( یازه ، دوازه ، سیازه ، پازه ، شازه )ەوه و (ڤ)ی (حەڤە)ش دووبارەبکاتەوه ... پرس و باسی لەم بابەتە و بابەتی دیی مێژوویی هەموویان سەر بە ڕێزمانی مێژوویی زمانی کوردین و لە ڕێزمانێکدا کە بۆ کوردیی سەردەم دەنووسرێ شوێنێکیان نییە .

لە لێکۆڵینەوه و توێژینەوەکانی کۆنی زمانناسیدا ئەو ڕاستییە بەتەواوی ساغ نەکرابووەوه ، کە زمان دەزگایەکی بەیەکەوه لکاوه و دەبێ وەك گشت و نەك جوێبەجوێ لەبەرچاو بگیرێ . هەر بۆیەش ئەو ناساندنە زمانییانەی لە ڕێزمانەکانی کۆندا هەن بڕبڕ و ورده ورده بابەتن و هیچ ناساندنێکی تەواویان سەبارەت بە دەزگای زمان بەجارێك و لە گشتدا تێدا نییە . سوسسور لە سەرانسەری کتێبەکەی خۆیدا تێدەکۆشێ تا نیشانیبدا ، کە زمان کۆمەڵەیەك لە دەنگ و وشە نییە ، بەڵکو دەزگایەکە لە پێوەندییان ، کە لەسەر یەك نەزم یان سیستەم پێکدێنێ .

سوسسور زاراوەی ڕووکار ( Form) بۆ ناولێنانی ئەو ڕایەڵەی پێوەندییان یان نەزمی زمانی بەکاردەهێنێ ، بۆ ئەوەی لە دەنگ کە کرۆکی ماددیی زمانە و بە بیروڕای ئەو بەشێك لە زمان نییە ، جوێی بکاتەوه . پێداگرتنی سوسسور لەسەر دەزگابوونی زمان وای کرد ، کە زمانناسان بە شوێن دیتنەوەی بناغەی ئەو دەزگایەدا بگەڕێن . ئەوەش یەك لەو هۆیانەیە ، کە ناوی بناغەگری بەسەر ئەو قوتابخانانەی زمانناسیدا بڕا ، کە لە بیروڕاکانی سوسسورەوه سەرچاوەیان گرتووه .

یەکێکی دیکە لە بیروڕاکانی سوسسور ، کە نزیکەی لە هەموو قوتابخانەکانی بناغەگریدا بوو بە بنچینەی لێکدانەوه ، ناسین یان لەیەککردنەوەی توخمەکانی پێکهێنەری ڕستەیەك (یان هەر بەشێکی زمانی) بەپێی دوو جۆره پێوەندی بوو ، کە پێیان وتووه ( پێوەندیی جێنشینی ) و ( پێوەندیی هاونشینی ) . پیوەندی هاونشینی نیشان دەدا ، کە ئەو توخمانەی لەسەر زنجیری ئاخاوتندا دەکەونە تەنیشت یەکتری ، چ

پێوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە ، لە کاتێکدا پێوەندیی جێنشینی ئەوە نیشان دەدا . توخمێکی کە بە کردەوە لە شوێنێکی زنجیری ئاخاوتندا بەدیارکەتووە چ پێوەندییەکی لەگەڵ ئەو توخمانەدا هەیە ، کە دەیانتوانی لەو شوێنەدا بن . بۆ وێنە ئەگەر لە زمانی کوردیدا ڕستەی ((ئازاد ڕۆیشت)) لەبەرچاوبگرین ، ئەوە ئەو ڕستەیە لە ڕووی لێك هەڵاوردنی وشەوە ، لە دوو بەش یان دوو توخم پێکهاتووە ، چونکە جێنشینی لە دوو شوێندا دەکرێ . ئێمە بۆمان هەیە لە جیاتی (( ئازاد )) وشەی دیکەی وەکو (( ئەو ، منداڵ ، پیاو ، ماشێن ... )) و زۆر وشەی دیکەی ، کە هەموویان چینێك پێکدەهێنن بخەینە کار هەروەها دەتوانین لە بریتی ( ڕۆیشت )) وشەی دیکەی وەکو (( هات ، هەڵستا ، فڕی ... ) و زۆر وشەی دیکە ، کە لەسەر یەك چینێکی تر پێکدەهێنن بخەینە کار . وشەی (( ئازاد ) لەگەڵ ئەو وشانەی لە ڕێگەی جێنشینییەوە دەناسرێنەوە ، پێوەندی جێنشینی هەیە ( هەروەها وشەی (( ڕۆیشت )) لەگەڵ ئەو وشانەی ، کە دەتوانن شوێنی ئەو بگرنەوە) . هەرچی دوو وشەی (( ئازاد )) و (( ڕۆیشت ))ە ، کە لەسەر زنجیری ئاخاوتندا دەکەونە تەنیشت یەکتری پێوەندیی هاونشینییان بەیەکەوە هەیە ( لەو وێنەیەدا دەبێتە پێوەندیی نیهاد و گوزارە ) ... جا ئەو دوو جۆرە پێوەندییە . بنچینەی لەیەك هەڵاوردن و لێکالاکردنەوەی زمان لە گشت قوتابخانە بناغەگرەکانی زمانناسیدایە .

## - ڕێزمانی چاولێکەری النحو التقلیدي

## Traditional grammar

= ڕێزمانی سوننەتی

لە سەدەی چوارەمی بەر لە زایین ، ئەرستۆ کە دەکرێ ، بە یەکەم ڕێزماننووسی ڕۆژئاوایی دابنرێ ، بناغەی ڕێزمانێکی دانا ، کە دواتر بە هۆی یۆنانیی دیکە پەرەی پێدرا و لە ڕێگەی ڕۆمانەکانەوە لە ڕۆژئاوای

ئەورووپا برەوی پێدرا و بوو بە سەرمەشقتێك بۆ ڕێزمان نووسینی ئەویَ ، بە شێوەیەکی ئەوتۆ ، کە ئەمڕۆ دوای تێپەڕبوونی بیست و چەند سەدەیەك هێشتا بنچینەکان و دابەشکراوەکانی ئەو ڕێزمانە لەگەڵ وەرگێڕاوی لاتینی ، زاراوەکانی لە زوربەی خوێندنگاکانی بە دەرز دەوترێتەوە .

ئەو هەمان ڕێزمانە کە پێی دەڵێن ( ڕێزمانی چاولێکەری . Traditional grammar ) . ئەفلاتوون لە کتێبی ( سوفیست )دا ، ناو و کرداری لەیەك جیاکردووەتەوە . ئەرستۆ وردەیەکی لیَزیاد کرد و بەشەکانی ئاخاوتنی لە زمانی یۆنانیدا بەناو و کردار و پیت دابەشکرد .

دوای ئەرستۆ ، فەیلەسووفە ڕەواقییەکان درێژەیان بە لێکۆڵینەوەکانی ئەو دا . ( زەنوون ) ـ دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە ، بۆ خۆی بەشێکی گەورەی لە ڕێزمانی چاولێکەری کۆکردەوە . ئەگەرچی لێوردبوونەوە لە دۆخەکانی ناو لە سەردەمی ئەرستۆوە دەستی پیَکردبوو ، بەڵام ئەوە ڕەواقییەکان بوون ، کە چوار دۆخی : کارایی ( Nominative ) ؛ بەرکاری ( Accusative ) ؛ بەرکاری بەسەردا ( Dative) ؛ ئیزافە ( Genetive)یان دیاریکرد و لەیەك جیاکردەوە و ناوی ئەوتۆیان لێنان ، کە وەرگێڕراوە لاتینییەکەیان ئێستاش هەر بەکاردێنریَ . ئەو کەسەی ڕێزمانی هەرە تەواوی یۆنانیی نووسی ( دیونیسیوس تراکس ) بوو ، کە نزیکەی سەد ساڵ بەر لە زایین ژیاوە . ئەو بۆ یەکەمین جار ڕێزمانی بە زانستێکی سەربەخۆ دانا . کتێبەکەی ئەو سەرەڕای کورتبوونی ، بوو بە سەرمەشقی گشت ڕێزماننووسانی یۆنانی و لاتینی ، کە بەدوای ئەودا هاتن . ئەو بۆ یەکەم جار بەشەکانی ئاخاوتنی بە هەشت بەش دابەشکرد و ئەوە هەر ئەو دابەشکردنەیە ، کە تا ئەمڕۆش لە ڕێزمانە چاولێکەرییەکاندا ماوەتەوە .

ڕۆمانییەکان لە باری ڕێزمانیشەوە وەك زۆر لە باتەکانی دیکەی زانست دەستیان کرد بە لاساییکردنەوە و وەرگێڕانی شوێنەواری یۆنانییەکان ، بەڵام

بۆ خۆیان زۆر کەمیان لێ زیاد کرد ، بۆ وێنە هەشت بەشی ئاخاوتنیان ڕاستەوخۆ لە یۆنانییەوە وەرگێڕا . . .

لێرەدا دەبێ ئاماژەی دوو ڕێزماننووسی بەناوبانگی ڕۆمانی بکرێ ، کە کتێبەکانیان بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بەردەوام بوون بە کتێبی دەرزوتنەوە . یەکەمیان ( ئیلیوس دوناتوس )ە کە لە سەدەی چوارەمی پاش زایین لە ڕۆم دەرزی دەوتەوە . ئەم ڕێزمانە تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا دەگوترایەوە و ئەوەندە بە برەو بوو ، کە یەکەم کتێب بێ بەپیتی دار لە چاپ‌درا ڕێزماننووسێکی بەناوبانگی دیکە ( پریسکیانوس )ە لە سەدەی شەشەم لە قوستەنتەنییە ژیاوە . کتێبەکەی ئەم لە بیست بەش پێکهاتووە و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە باوەڕپێکراوترین و کامڵترین ڕێزمانی لاتینی دادەنرا .

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کاتێك زمانی لاتینی شێوەی دەگۆڕا و دەبوو بە زمانە ڕۆمانییەکانیی ئەم ڕۆژگارە (فەرەنسەیی ، ئیتالیایی ، ئیسپانیایی...)، زمانی لاتینیی کلاسیك وەکو خۆی ، وەك زمانی زانست و فەرهەنگ مایەوە و کەسانێك لە خوێندنگە ئەو زمانە وەك زمانی دووەم فێردەبوون . بەڵام ئەگەرچی زانایان بە لاتینییان دەنووسی و پێی دەئاخەوتن ، ئیتر لاتینی وەکو ڕابردوو زمانی قەومێك نەبوو ، بەڵکو زمانێك بوو ، کە بە هۆی کەشیشان و زانایان بە شێوەیەکی دەستکرد بەزیندوویی ڕاگیرابوو ..

نووسینی ڕێزمان بۆ زمانەکانی ڕۆژئاوای ئەورووپا لە سەروبەندێکدا دەستی پێ‌کرد ، کە ئەو زمانانە بەرەبەرە بایەخ و نرخێکیان پەیدا کرد تا وەك زمانی نەتەوایەتی و ئەدەبی بەکاربهێنرێن . بۆ وێنە یەکەمین ئەو ڕێزمانانەی بۆ زمانی فەرەنسایی نووسران ، سەر بە سەروبەندی ڕێنیسانسە ڕێزماننووسانی نیشتمانپەروەری ئەو دەمە ، بۆ ئەوەی بتوانن لە بایەخ و سەنگی فەرەنسایی زیاد بکەن و ئەو زمانە لەبەرچاو کەسانێکی ، کە ئەویان بەهاوتای زمانێکی ئەدەبی و زانستی وەك لاتنیی دانەدەنا بەرێز

نیشان بدەن ، بە لاسارییەکی تەواو تێکۆشان بسەلمێنن ، فەرەنسایی تەواو ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە کە زمانەکانی لاتینی و یۆنانی بوویان و لە ڕاستیدا لەگەڵیان یەکدەگرێتەوە . بۆ وێنە هەوڵیان دا ، ژمارەی پیرۆزی هەشت ، کە یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان بۆ بەشەکانی ئاخاوتنیان پەسەندکردبوو لە فەرەنسایشدا بپارێزن ... بەم پێیە ڕێزمانی فەرەنسایی لە ڕووی سەرمەشقی لاتینییەوە سازکرا و کەم و زۆر هەمان دیمەنی خستە ڕوو ، کە ڕێزماننووسانی لاتینی لەسەر زمانی خۆیان دەریان بڕیبوو . ئەم چاولێکەرییەی ڕێزمانووسیی فەرەنسا مایەوە و ئێستاش چاولێکەرییەکانی فەرەنسا وتە و دابەشکردنەکەی خۆیان بە ڕوونان لە لاتینی دەسەلمێنن .

لە سەدەی هەژدەیەمدا بوو ، زمانی ئینگلیزی گەیشتە ئەو پلە و پایەی ڕێزمانی بۆ بنووسرێ ڕێزماننووسانی ئەو سەروبەندە ، بۆ نووسینی ڕێزمانی ئینگلیزی دوو سەرچاوەیان لەبەرچاو بووە :ژیربێژی و ڕێزمانی لاتینی ...

ڕێزماننووسانی سەرەتایی ئینگلیز بە پێڕەوی کردن لە شێوەی بیرکردنەوەی چاخی خۆیان ، زۆر لە بابەتەکان و دابەشکردنەکانی لاتینی ، کە لەگەڵ زمانی ئینگلیزی نەدەگونجان ، بەسەردا دابڕی و ڕێزمانێکیان بۆ زمانی خۆیان سازکرد کە جلوبەرگی ئالۆوالآی لاتینی لەبەردا بوو . بەوێنە ، بۆ ناو بە شێوەی لاتینی هەندێك دۆخیان دانا و هەمان زاراوەشیان بۆ ناولێنانیان بەکارهێنا . لە کاتێکدا ناو لە زمانی ئینگلیزیدا بە پێچەوانەی لاتینی ، دۆخی ڕواڵەتی جیاوازی نییە . هەروەها بۆ ئینگلیزی جنسی نێر و مێیان دانا ، لە کاتێکدا نێر و مێ لەو زمانەدا بەپێچەوانەی لاتینی و فەرنسایی و زمانەکانی دیکەی ڕۆمانی ، جیاوازییەکی ڕێزمانی نییە ، بەڵکو وەکو دیالێکتی خوارووی کوردی جیاوازییەکی واتاییە ...

- **ڕێزمانی زێنەکی**

**ب- ڕێزمانی بەرهەمهێنان**

- **ڕێزمانی سوننەتی**

**ب- ڕێزمانی چاولێکەری**

- **ڕێزمانی گەشتەکی**

**ب- ڕێزمانی گواستنەوە**

- **ڕێزمانی گواستنەوە النحو التحويلي**

Transformational grammar

**= ڕێزمانی گوێزانەوە ، ڕێزمانی گەشتەکی**

**ڕێزمانی بناغەگر تێدەکۆشێ ڕستەکانی زمان بە توخمی پێکهێنەر یان توخمی وردتر دابڕێ و ئەوان لە پێوەندی لەتەك یەکدیدا کەڵەکە بکا . چۆمسکی ئەم تایبەتمەندییە بە خاڵی وەکو یەکی هەموو دیمانەکانی بناغەگر دادەنێ و هەموویان ، سەرەڕای ئەو جیاوازییانەی ، کە لەگەڵ یەکتردا هەیانە لە ڕیزێکدا دادەنێ و زاراوەی ( Phrase Structure Grammar )یان بۆ بەکاردەهێنێ و ئێمەش ئەم زاراوەیە بەپێی مەفهوومی ڕێزمانی بنجی وەردەگرین .**

**چۆمسکی گەیشتە ئەو ئەنجامەی ، کە ڕێزمانی بنجی لە وزەیدا نییە ، ئەو پێوەندییە زۆر گرنگانەی ، کە لە نێوان ڕستەکانی زماندا هەن دەربڕێ . هەڵبەت مەبەست ئەوە نییە ، کە ڕێزمانی بنجی پێی نەکرێ ، ئەو وێکچوون و جیاوزییانەی لە نێوان ڕستەکانی زماندا هەن شیبکاتەوە . بۆ وێنە ، ئەگەر ئەم دوو ڕستەیەی خوارەوە لەبەرچاو بگرین :**

ئێوه كتێبتان كڕی

ئێوه كتێبتان دەكڕی .

دوای دابڕكردنی بنجی و بەیەككگرتنی ئەو دوو ڕستەیە دەردەكەوێ ، كە ئەو دوانە لە هەموو بارێكەوە وێكدەچن ، جگە لەوە نەبێ لە دووەمیاندا كرداری (( دەكڕی )) هاتووە و لە یەكەمیاندا (( كڕی )) . لە دووەمیاندا مۆرفێمی (دە) ، كە واتای بەردەوامی دەگەیەنێ هەیە ، لە كاتێكدا لە ڕستەی یەكەمدا ئەو مۆرفێمە نییە . بەڵام هەموو زمانان پڕن لە ڕستەی زۆری ئەوتۆ ، كە ئاخێوەرانی زمان لە ڕووی بۆچوونی زمانی خۆیانەوە هەستیان پێدەكەن ، پێوەندیی زۆر پتەویان لەگەڵ یەكدی هەیە . لەگەڵ ئەوەشدا ، ناكرێ بەپێی ڕێزمانی بنجی پێوەندییەكانی نێوان ئەوان دەربـبڕدرێن و بسەلمێن .

بڕواننە ئەو نموونانەی خوارەوە :

١ـ١ ماڵەكەیان پێش دووسێ ڕۆژ فرۆشت

١ـ٢ ماڵەكە دووسێ ڕۆژ لەمەوپێش فرۆشرا .

٢ـ١ دوكانەكەی ئەویان لەبەر گرانفرۆشی داخست .

٢ـ٢ دوكانەكەی ئەو لەبەر گرانفرۆشی داخرا .

هەموو كوردی زمانێك بەپێی بۆچوونی زمانی خۆی دەیسەلمێنێ ، دوو ڕستەكەی یەكەم لە لایەكەوە و دوو ڕستەكەی دووەم لە لایەكی دیكەوە پێوەندییان بە یەكەوە هەیە ـ واتە جگە لەوەی ئەندامەكانی هەر جووتەی لەتەك یەكدیدا هاومانان ، لە باری بناغەییشەوە پێوەندییان بەیەكەوە هەیە ، بە شێوەیەكی ئەوتۆ ، كە دەكرێ بڵێین دووەمیان بە هەندێك ئاڵوگۆڕەوە لە ڕووی یەكەمیانەوە سازكراوە و یان بە ئیحتیمال هەردووكیان لە ڕواڵەتێكی بنیاتی ترەوە كەوتووەتەوە . بەڵام لەبەر ئەوەی بناغەی كەڵكەپێدان لە ڕێزمانی بنجیدا پێوەندی و نیشانەی ئاشكرا و بەرچاوە ، ئەم ڕێزمانە ناتوانێ ئەو پێوەندییانەی لە نێوان ئەندامەكانی هەر كام لەو جووتانەدا هەیە

بسەلمێنێ و شیبکاتەوە . بۆ نموونە (( ماڵ ) لە ژمارەی (١ـ١) دا بەرکار و لە ژمارەی (٢ـ١)دا کارایە و ئەم جیاوازییەی ڕۆڵە بە دەرکەوتنی (یان) لە ڕستەی یەکەمدا و نەبوونی ئەو جێناوە لکاوە لە ڕستەی دووەمدا دیاریکراوە . بەپێی ئەوە ـ ((ماڵ)) لە ڕووی ڕێزمانی بنجییەوە لەم دوو ڕستەیەدا بە شێوەی جیاواز کەڵکە دەکرێ . لەگەڵ ئەوەشدا ، لە باری ماناوە دەوری (( ماڵ )) لە هەردوو بابەتدا یەکسانە و هەموو کوردێك بەپێی بۆچوونی زمانی خۆی هەست بەم خاڵە ناسکە دەکا . هەمان بەڵگە هێنانەوە لەسەر (( دوکان )) لە جووتە ڕستەی دووەمیشدا دەردەکەوێ .

وتەی چۆمسکی ئەوەیە ، ئەگەر بڕیار وابێ ڕێزمان بتوانێ بە باشی ڕاستەقینەکانی زمانی شیبکاتەوە و بتوانێ پێوەندییەکانی نێوان ڕستەکانی زمان ڕوونبکاتەوە ، هەر ئەوەندە بەس نییە ، کە تەنیا خۆی بە نیشانە و پێوەندییە دیار و بەرچاوەکانەوە خەریك بکا ، بەڵکو دەبێ بتوانێ ئەو پێوەندییە شاراوانەش ، کە لە بناغەی ڕستە بەرچاوەکاندا هەیە ، دەربخا و بیسەلمێنێ . لەبەر ئەوە ، ئەو بۆ هەر ڕستەیەك دوو بناغە دادەنێ : یەکێکیان بناغەی قووڵ ـ واتە ( دیوی ناوەوە ) ، کە لە ڕاستیدا لەسەر پێوەندیی مانایی و ژێربێژیی بەشەکانی ڕستە بڕیاردەدا . ئەوی دییان ڕووبناغە ـ واتە ( دیوی دەرەوە ) ، کە شێوەی دەرەوە و بەرچاوی ڕستە نیشان دەدا و پێویست ناکا لەتەك بناغەی قووڵدا بگونجێ . لە لایەکی دیکەوە ، لەسەر ئەو باوەڕەیە ، بناغەی قووڵی ڕستە بە ڕێگەی چەند ڕێوشوێنێکەوە ، کە پێیان دەڵێ ڕێوشوێنی (( گواستنەوە )) دەبن بە ڕووبناغە ، ڕێوشوێنی گواستنەوە بە ڕێگەی : دەرهاویشتن ؛ گۆڕین ؛ لێزیادکردن ؛ یان جێگۆڕکێ پێکردن ... پێوەندیی بناغە قوڵی دەکاتە پێوەندیی ڕووبناغەیی بەهەر کامێك لەو ئاڵوگۆڕانە ، یان بەشێك لەوان ، کە بە یارمەتیی ڕێوشووێنێك ئاڵوگۆڕیان بەسەر دێ ، دەڵێ (( گواستنەوە )) ...

بـه نیشـاندانی چــەند نموونەیــەك ، ئــەو مەفهوومــەی ســەرەوە ڕوون دەکەینەوە :

وەك لەسەرەوە باس کرا ، لە هەموو زمانێکدا ڕستەی ئەوتۆ هەن ، کە لە بــاری مانــاوە وێکدەچــن ( ئەگــەرچی لەوانەشــە جیــاوازیی شــێوە و بەکارهێنانیان لە نێواندا هەبێ ) و لە باری بناغەشەوە جۆرێك پێوەندییان هەیــە . ئــەو جــۆرە ڕســتانە بەیارمــەتیی ڕێوشــوێنە گواســتنەوەکان لــە بناغەیەکی تاقانەوە کەوتوونەتەوە .

من ئەوم بە زیرەك دەزانی

من وام دەزانی ، کە ئەو زیرەکە

پێوەندیی ئەو دوو ڕستەیە دەکرێ لەوەوە بزانرێ ، کە هەردووکیان لــە بناغەیەکی قووڵەوە کەوتوونەتەوە . لە بناغەی قووڵی ئەو دوو ڕستەیەدا ، دوو ڕستەی بچووکتر جێیــان بووەتــەوە ـ واتــە ( ئــەو زیرەکــە ) و ( مــن وام دەزانــی ) شێوەی لێکدراوی ئەو ڕستانە لــە بناغــەی قووڵــدا ، دەکــرێ ئــاوا بنووسرێ : من ئەوم (ئەو زیرەکە) وا دەزانی .

یەکێك لە بەڵگەکانی ، کە بۆ سەلماندنی جیاوازیی نێوان بناغەی قووڵ و ڕووبناغە دەکرێ بهێنرێتە گۆڕێ ، بوونی ڕستەی لێڵە . بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئەوە لەبەرچاو بێ ، کە ڕستە هەموویان یەك جۆر نین . لێڵ بوونــی هێندێك لە ڕستە ، ڕەنگە لەبەر هەندێ وشە بێ ، کە لە ڕستەیەکی بەرباسدا زیاتر لــە مانایــەکی هــەبێ . بــۆ نموونــە ، ڕســتەی (( لێــی کــەوت )) لێڵــە و لێڵییەکەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێ ، کە دوو مانای هەیە : یەکێکیان بە مانای ( شتێ لێی کەوت ) و ئەوی دیکەیان بە مانای ( پاڵی لێدایەوە ) .

... هتد

ڕێژە الصيغة
Aspect (Mood) , Derived form

ڕێژە بەو حاڵەتە ڕێزمانی‌یە دەوترێ ، کە پێوەندیی ڕووداان (یان هەل و مەج) بە واقیعەوە دەردەبڕێ . ڕێژە یەکێکە لە فۆرمە بنەڕەتی‌یەکانی دەربڕینی پێوەندیی گوزارەیی . بۆ تەواو دیاریکردنی ، دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین ، کە ڕێژە وەنەبێ پێوەندیی خودی ڕووداانەکە بە واقیعەوە ڕابگەیەنێ، بەڵکو ئەو پێوەندی‌یە نیشان دەدا ، کەوا لە ڕستەدا لە نێوان ڕووداان و کارادا پەیدادەبێ .

لە زمانی کوردیدا ڕاست وایە تەنیا ئەو ڕێژانە جیابکەینەوە ، کە لە ڕووی وشەسازی‌یەوە جیاوازییان لە نێواندا هەیە و بە فۆرمی ، پێکهاتنی یان شیکاری دەردەبڕرێن .

جیاوازیی پرسیار ئەرێتی ( مثبت ) ، یان ئەرێتی و نەرێتی ( منفی) سەر بەو بواری واتایەن ، کە ڕێژە ڕایان دەگەیەنێ ، چونکە هەموو ئەو جیاوازییانە بریتین لە جیاوازیی پێوەندی بە واقیعەوە . بەلآم لە زمانی کوردیدا نە پرسیار و نە نەرێتی لە فۆرمی کرداردا بە ڕێی وشەسازی دەرنابڕرێن . پرسیار بە ئاوازی تایبەتی ڕادەگەیەنرێ یان بە یاریدەی ئامرازی پرسیار دەردەبڕرێ ( ڕوونکردنەوەی پێوەندیی ئەو کەرەستانە دەکەوێتە باسی ڕستەسازی‌یەوە ) . بەلآم جیاوازیی ئاواز خاسیەتی سەرپاکی ڕستەکە دیاری‌دەکا ، نەك چەند ئەندامێکی ( ئاواز ـ واتە گۆڕینی دەنگ لە بەرز و نزمیی دەربڕینی وشەیەکدا دەشێ تەنیا لە ڕێی پێوەندیی گۆڕینی هێز و ئاوازی دەنگەوە لە سەرلەبەری ڕستەیەکدا دیاری بکرێ) .

سەرباری ئەوەش ، وەنەبێ گۆڕینی ئاواز تەنیا پێوەندیی بە واقیعەوە ڕابگەیەنێ ، بەڵکو چەند لایەنێکی دیش دەگرنەوە ... ئامرازی پرسیاریش ناتوانرێ وەك ماکێکی پێکهێنی فۆرمی کردار تەماشابکرێ ( تەنانەت لە ڕووی شیکاری‌یشەوە ) ، چونکە مەرج نی‌یە تەنیا بە کردارەوە بەند بێ ، بەڵکو دەشێ بەهەر ئەندامێکی ڕستەوە پێوەند بێ . هەرچی نەرێتی‌یشە ، وەك پرسیار بە یاریدەی ئامراز ڕادەگەیەنرێ . هەروەها وەنەبێ تەنیا بە فۆرمی کردارەوە بەندبێ و وەك ماکێکی پێکهێنی فۆرمی کرداریش خۆی نانوێنێ .

بەڵام فۆرمی کردار بە نیشانەی ( بـ ـ bi )ەوە بە ڕێژەیێکی تایبەتی دادەنرێ ، ئەویش بەپێی ئەو بەڵگەیەی کە ئەو نیشانەیە لە ڕستەدا هەر دەورێك بینێ ، هەمیشە پێوەندی بە فۆرمی کردارەوە هەیە ، نەك بە وشەیێکی دی‌یەوە .

لە دیاری‌کردنی ڕێژەدا پێویستە ئەو فۆرمە جیاوازنەی کردار لەبەرچاو بگرین ، کە پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕادەگەیەنن . کەچی زوو لە لێکۆڵینەوەی هەندێ زماندا بە ڕێژەیێکی نەناسراو تەماشادەکرا . تا ماوەیێکی درێژیش هەر بەو چەشنە باو بوو . بەڵام لە ڕاستیدا چاوگ تەنیا ناوی ڕوودانێك ڕادەگەیەنێ و پەنجە بۆ پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕاناکێشێ .

لە دەست نیشان کردنی ڕێژەکانی کردار لە زمانی کوردیدا ناتوانین ئەو فۆرمانەی خاوەنی یەك پێکهاتنی ڕێزمانین بە ڕێژەی جیاواز دابنێین ، ئەگەرچی پێوەندیی جیاوازی ڕوودانیش بە واقیعەوە ڕادەگەیەنن ، چونکە ئەم حاڵەتە مەسەلەی واتای جۆربەجۆری یەك ڕێژەیە ، بۆ نموونە یەك‌گرتنی فۆرمی ڕابوردوو لەگەڵ نیشانەی ( بـ ـ bi )دا واتای مەرجیش و ئارەزووش .. دەدا . بەڵام جیاوازیی وشەسازی لە نێوان ئەو حاڵەتانەدا نی‌یە و بۆیە

ئێمە ئەو فۆرمانە وەك یەك ڕێژە تەماشا دەکەین و واتای ، جۆرەبەجۆریان ناکەینە بنەمای جیاوازیی ڕێژەیان .

لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا لە ڕووی وشەسازیی‌یەوە دەتوانین سێ ڕێژە جیابکەینەوە : ( ١ـ ئیخباری ؛ ٢ـ ئینشائی ؛ ٣ـ داخوازی ) . ئەم سێ ڕێژەیە لەگەڵ یەکتردا خاوەنی یەك پێوەندی نین . هەروەها دەشێ ڕێژەی ئیخباری بە ڕێژەی ڕاستەوخۆ ناوببرێ و دوو ڕێژەکەی دیش بە ڕێژەی تیان :

لە هەندێ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و زمانانی‌دی‌دا وا نیشان دراوە ، ڕێژەی ئیخباری ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە لە ڕاستیدا ڕوودەدات یاخود ڕووی داوە . ئەم جۆرە دیاری‌کردنە ناتەواوە . لە ناوەڕۆکی ڕێژەی ئیخباریدا پێوەندیی ڕوودان بە واقیعەوە ڕاناگەیەنرێ . ئەگەر ئەم پێوەندی‌یە لە ڕستەدا ڕابگەیەنرێ ، ئەوە بە هۆی فۆرمی ئیخباری‌یەوە نی‌یە ، بەڵکو بە وەسیلەی دی‌یە ـ واتە بە یاریدەی وشەی سەر بە بارودۆخ یان ئامراز یان ئاواز . دوو ڕێژەکەی دی بە تەواوی نیشانی ئەوە دەدەن ، کە لە واقیعدا هیچ ڕووی نەداوە ، بەڵام دەبێ شتێك ڕوو بدات ، یاخود دەبوایە لە بارودۆخێکی زانراودا ڕووی بدایە.

لە ڕووی وشەسازی‌یەوە ڕێژەی ئیخباری هیچ نیشانەیێکی تایبەتی نی‌یە ، بەڵام لەوەدا لە ڕێژەکانی دی جیادەبێتەوە ، کە ڕێژەی ئیخباری بە ڕێك‌وپێکی بەپێی کات دەگۆڕێ ، بەڵام ڕێژەکانی دی بەو شێوەیە نین .

ڕێژەی ئینشائی بەر لە هەر شت ئەو ڕوودانە ڕادەگەیەنێ ، کە لە واقیعدا بەجێ‌نایەت ، بەڵام لە هەل و مەرجێکی ناسراودا دەکرا بەجێ بێت یان بەجێ بهێنرێت لەبەر ئەوەی ئەو فۆرمە تەنیا ڕوودانێك ڕادەگەیەنێ ، کە لە هەل و مەرجێکی ناسراودا بەجێ بێت ، بۆیە زاراوەیێکی بێ‌لایەنی ( ئینشائی )مان بۆ پەسەند کرد ، ئەگەرچی دەشزانین ( Modus coniunctivus)ی لاتینی ( ڕێژەی بەیەك گەیاندن ، بەیەکەوە بەستن ) دەگەیەنێ .

( بـ ـ bi ) کە نیشانەی هەرە گرنگی ڕێژەی ئینشائییە لە کرداری (بوون)ەوە وەرگیراوە ( ڕەنگە ڕەگی کاتی ئێستای کردارەکە بێت) .

ڕێژەی داخوازی لە ڕووی کاتەوە تەنیا ئێستا و ئایندەی هەیە و ڕابردووی نییە . لە ڕووی کەسەوە تەنیا فۆرمی کەسی دووەمی تاك و کۆی هەیە و کەسی یەکەم و سێیەمی نییە . ئەم ڕێژەیە نیشانە و پێکهاتنی تایبەتیی خۆی هەیە .

- ڕێژەی ئیخباری الصيغة الاخبارية Indicative mood

ب . : ڕێژە

- ڕێژەی ئینشائی الصيغة الانشائية

Subjunctive mood , Thought – mood

لە زمانی کوردیدا ( بـ ـ bi ) و ( با ) و ( ایە ) سێ نیشانەی گرنگی ئەم ڕێژەیەن .

هـ . ، بـ . : ڕێژە

- ڕێژەی داخوازی صيغة الطلب ، صيغة التمني

Imperative mood

واتای گشتیی ڕێژەی داخوازی ، فەرمان و داوا و تکا و وریاکردنەوەیە بۆ بەجێهێنانی کارێك لەلایەن کەسێکەوە ( تاك ) ، یان چەند کەسێکەوە (کۆ) . لە ڕووی کاتەوە تەنیا ئێستا و ئایندەی هەیە و ڕابوردووی نییە . لە ڕووی کەسەوە تەنیا فۆرمی کەسی دووەمی تاك و کۆی هەیە و کەسی یەکەم و سێیەمی نییە . ئەم ڕێژەیە نیشانە و پێکهاتنی تایبەتیی خۆی هەیە . کەرەستەی پێکهێنانی برتییە لە ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار و نیشانەی

( بـ b ، بـ hi ) لە پێشییەوە و جێناوی کەسیی لکاو لە دوایەوە (( ە )) بۆ کەسی دووەمی تاك و (( ن ـ n ، ن ـ in ) بۆ کەسی دووەمی کۆ ) . وەك :

بـ + وەست ( وەستان ) + ە / ن = بوەستە / بوەستن

بـ + هێن ( هێنان ) + ە/ن = بهێنە / بهێنن

هەروەها بـ .: ڕێژە

## ڕێککەوتن    المطابقة    Agreement

## ڕێنووس    الاملاء    Orthography

( Orthography ) لـە دوو وشـەی ( orthos ــ ڕاسـت ) و ( grapho ــ دەنووسـم )ەوە پـەیدابووە ، کـە لـە کوردیـدا واتـای ( ڕاستنووسـی ، دروستنووسی ) دەگرێتەوە .

ئەگەر لەبەر ڕووناکیی ئەو پێناسانەی لە گەلێك کتێب و فەرهەنگدا بـۆ ( زانست ) دانراون ، لە (ڕێنووس) یان بە واتایەکی تـەواوتر لـە ( تیۆریی ڕێنووس) وردبینەوە ، بۆمان دەردەکەوێ ڕێنووس بەشێکە لە زانستی زمان ، هـەروەك چۆن ئەتۆم بەشێکە لە زانستی فیزیـا ... چـۆن لەهـەر زانسـتێکدا ئەرکی دۆزینـەوە و گەشەپێدان و چەسپاندنی شـت لـە ئەسـتۆی زانایـان و پسپۆڕاندایە . هەربەوچەشنە ڕێنووسیش کاری زمانەوانە ..

لە بەراوردکردنی ڕێنووس لەگەڵ زانستی‌تردا ، ئەوە بەدیاردەکەوێ کـە ڕێنووس خاوەنی تایبەتێکی خودی‌یە ، ئەو تایبەتی‌یەتی‌یەش لەوەدایە کە هەموو کەسێکی خوێندەوار ـ واتە هەر کەسێك بیەوێ بنووسێ ـ پێویستی بـە زانینـی دەسـتوورەکانی ڕێنووسـە ، چونکـە هـەر لـە سـەرەتای دەستکردنەوە بە خوێندن تا کۆتایی ژیان دەنووسێ و دەخوێنێتـەوە ... کەچی هەرشتێکی نوێ لە هەر زانستێکدا دەدۆزرێتەوە ، ئەگەرچی کەڵکی بۆ سەرپاکی ئادەمیزادیش هەبێ ، ڕەنگە زوربەی خەڵك بەکاری نەهێنن ، یاخود

ئەگەر بەكاریشی بێنن بیێ بیركردنەوە بەكاری دێنن . بەوێنە یەكێك كە مەكینەی ڕیش‌تاشینی كارەبا یان ئوتووی كارەبا بەكاردێنێ ، دەشێ هیچ لە یاساكانی فیزیا نەزانی ، یاخود ئەگەر بیشیزانێ شتێكی كەمی لێ بزانێ ... كەچی تەنانەت بۆ نووسینی شتی سەرەتاییش ، پێویستە هیچ نەبێ دەستووره سەرەكییەكانی ڕێنووس بزانێ - واتە بێ شارەزایی ڕێنووس ، خوێندنەوە و نووسین كارناكەن و خوێندەوار كاتێك كەڵك لە نووسین وەردەگرێ كە سەر لە دەستووره سەرەكییەكانی دەركات . جا چالاكیی بەكارهێنان ئەو تایبەتی‌یەتەیە كە ڕێنووس لە زانستی تر جیادەكاتەوە . دیارە هەر ئەو تایبەتی‌یەتەشە بووە و دەبێ بە هۆی سازكردنی موناقەشەی گەرم لە باسی هەر كێشەیەكی ڕێنووسدا .

بەڵام وەك چۆن زانینی ڕاكێشانی تەلی كارەبا و چاككردنەوەی ، باش شارەزایی لە واقیعی یاساكانی فیزیا ناگەیەنێ ، هەر بەوچەشنە پەیداكردنی ئاشنایەتی لە دەستوورەكانی ڕێنووسیش نیشانەی باش چوونە ناو ئەو زانستە نییە .

ڕێنووس بریتییە لە كۆمەڵێك دەستوور كە بە هاریكارییان ئاخاوتنی ئێمەیان پێ‌دەنووسرێ . ئەوەی دەنووسێ ئەگەر لە دەستوور لابدا ، هەڵەی ڕێنووس دەكات . ئەو جۆرە هەڵانەش كوسپ دێننە ڕێگەی خوێندنەوەی تێكست . ئەو كۆسپانەش سەرنجی خوێنەر لە تێگەیشتنی ناوەرۆك كەم دەكەنەوە .

ڕێنووسی هەر زمانێكیش یاسا و دەستووری تایبەتی خۆی هەیە ، كە لەسەر بناغەی دیاریكراو دامەزراوە . بەوێنە ڕێنووسی زمانی كوردی لەسەر ڕێبازی فۆنەتیكی سازكراوە ؛ لە ڕێنووسی زمانی ڕووسیدا ڕێبازی فۆنەتیكی و مۆرفۆلۆژی كاریگەرن ، ڕێنووسی ئینگلیزی و فەرەنسی پەیڕەوی ڕێبازی چاولێكەری دەكەن ، كە هۆی نووسینی گەلێك وشە بەو

شێوەیەی ئێستا وا ڕوون دەکەنەوە گوایا باووباپیرانیان بەوجۆرە نووسیویانە ..

هەر ڕێنووسێك بە زۆری ، ڕەنگی تایبەتی‌یەتەکانی ئەو زمانە دەداتەوە ، کە ڕێنوسەکەی بۆ دانراوە . جا بۆیە ئاسان نییە ڕێنووسی زمانێك بەسەر زمانێکی دیدا دابڕێ ، هەروەك چۆن جلی یەکێك پڕ بەبەری یەکێکی تر نییە بۆیە لە لێکۆڵینەوە و دەستکاری کردنی ڕێنووسدا پێویستە تایبەتێتی و یاساکانی ئەو زمانە بە باشی ڕەچاوبکرێن ..

ئەگەر ئەلفوبێ لەسەر بناغەی یەکسانی لە نێوان ژمارەی پیت و ژمارەی فۆنێمدا دابمەزرایە ، ئەوسا کێشەی ڕێنووس نیوەی نەدەما . لەبەر ئەوەی ئەلفوبێی کامڵ نییە و تێپەڕینی بە دەوری مێژوویی درێژدا کێشەی بۆ سازکردووە ، بۆیە ڕێنووس . ( Orthography ) پێویستی بە دەستوورە . هەرچەندە ڕێنووسی هەر زمانێك بگری بنەمای جۆربەجۆری تێدایە و چەند بنەمایەکیشی بوونەتە سەرەکی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سازبوونی ڕێنووسدا بنەمای گشتی هەن و پێویستە پەیڕەوی بکرێن .

## ڕیز . منطقة Zone

ڕیز ـ بەو دەنگە دەوترێ ، ڕاستتر ئەو بەشەی زمان ، کە بۆ دروست بوونی دەنگێکی دیاری کراو هەڵدەکشێ . سێ ڕیز بزوێن جیادەکرێتەوە : پێشەوە : ناوەڕاست ؛ پشتەوە . بەنموونە لە زمانی کوردیدا (ی) و(ێ) بزوێنی ڕیزی پێشەوەن ؛ ( i ) و (و) و (ە) ـ ڕیزی ناوەڕاست ؛ (وو)و (و) و (ا)ش ڕیزی پشتەوە .

## ڕیزبەر

ب : بیژۆک

١ ـ زار

بـ .: ١ـ دەم

٢ـ زار

بـ.: دیالێکت

زاراوە مصطلح Term

زارەکی الشفوي Oral

زانست العلم Knowledge , Science

ـ زانستی زمان

بـ . : زماناسی

ـ زانستی نووسین علم الكتابة Paleography

= پەلیۆگرافی

( Paleopgraphy ، لـە زمـانی یۆنانیـیـەوە وەرگـیراوە و لـە دووبـەش :

( Pleo ـ دێریـن ) و graphy ــ دەنووسـم ) پێکـهاتووە . بـەو چالاکیـیـە

یاریدەدەرە فیلۆلۆژیـیە مێژوویـیـیە دەوترێ ، کە لە یادگاری نووسراوی کۆن

دەکۆڵێتەوە . بۆ ئەوەی کات و شوێنی پەیدابوونیان نیشان بدا . پەلیۆگرافی دابەش دەبێ بەسەر ( Epergraphy ـ لە نووسینی سەر دار و بەرد و کانزا دەکۆڵێتەوە ) و ( Sphragis . لە زمانی یۆنانیەوە وەرگیراوە و واتای (( چاپ )) دەگەیەنێ ـ واتە لێکۆڵینەوەی نووسینی چاپ دەگرێتە خۆ ) و ( Numisma ـ وشەیێکی لاتینییە و بە یۆنانی واتای (( دراو )) دەگەیەنێ و لە نووسنیی سەر دراو دەدوێ ) .

**زایەند**

بـ .: جنس

| **زەنگ** | **الجرس** | Timbre |
|---|---|---|

**زبان**

بـ.: زمان

| **١ـ زمان** | **اللسان** | Tongue |
|---|---|---|

= زبان ، زووان

| **ـ زمانەبچکۆلە** | **اللهاة** | Uvula |
|---|---|---|

= زمانەچکۆلە ، زمانۆکە

**ـ زمانەچکۆلە**

بـ .: زمانەبچکۆلە

ئەم زمانـە دەستکردەی بە چەشـنێك دانا . هیچ حاڵـەتێکی بیژۆکی تێدا نەبێ . وشەکان چۆن دەنووسران واش دەخوێنرانەوە .. هێز هەمیشە لەسـەر دوا برگەی وشـە بـوو . زوربەی زۆری وشـەکانی بە شـێوەیەکی سـەرەکی لـە رەگـی ئینگلیزییـەوە وەرگرتبـوو و بەشێکیشـیان لـە ئەڵـمانی و لاتینــی و فەرەنسـی‌یەوە .. بـۆ نموونــە بـۆ (جیـهان ) ـ ( Vol) ی دانـابوو ، کـە لـە ( World)ی ئینگلیزییـەوە وەری‌گرتبوو . بۆ (زمان ) ـ ( Puk) لە (Speak)ی ئینگلیزییەوە . لەم دوو وشەیەشەوە ناوی زمانەکەی داڕشت ـ (Volapuk) ، واتە ـ (زمانی جیهانی)

کڵێسەی کاسۆلیکی بە پەرەۆشەوە یارمـەتی شلایشـەری دا و پشـتیوانیی ئـەم پرۆژەیـەی کـرد . بـۆ لێکۆڵینـەوە و بڵاوکردنـەوەی زمـانی ڤۆلاپـوك کۆمەلـەیێك دامـەزرا ... کۆنگرەی بۆ بەسـترا ... کڵێسـە یارمـەتی ئـەوەی دا ڤۆلاپوك لە گەڵ ولاتـی ئەوروپا و ئەمـەریکا بڵاوببێتـەوە . شلایشـەر خـۆی سەرۆکایەتی کۆمەڵەی ڤۆلاپوکی دەکرد .

لە ساڵی ۱۸۹۹دا بنکەکانی کۆمەڵەی ڤۆلاپوك گەیشتە ۲۸۳ . ژمارەی ئەو گوڤـار و ڕوژنامانـەی بـەم زمانـە دەردەچـوون (۲۵) بـوون . زیـاتر لـە هـەزار مامۆستا و پسپۆڕ کەوتنە پڕوپاگندە کردن و بڵاوکردنـەوەی ئەم زمانـە ... سەدەها کتێب و نامیلکە بەم زامانە دەردەچوو ...

لەگـەڵ ئـەم هـەموو هـەوڵدان و ئـەرك کێشـانەدا پـرۆژەی ڤۆلاپـوك سـەری نــەگرت و بــەرەو نشوســتی و کوژانــەوە ڕۆی . شلایشــەر گونـاهی ئــەم سەرنەگرتنەی خستە ئۆبالْ ئـەو هاوڕێیانـەی لەبـەر هـۆی شەخسـی بوونـە تەگەرە و نەیانهێشت پرۆژەکەی سەرکەوێ .

بەو شێوەیە زمانی ڤۆلاپۆك پشت گوێ خرا و بەدوا ئەمەشدا لـە سـاڵی ۱۹۱۲دا شلایشەریش مرد .

- زمانی لەیەکتر گەیشتنی نەتەوەیی        لغة الاتصال الدولي
Intrelanguage

= زمانی نێومیللەتان

زمانی لەیەکتر گەیشتنی نێونەتەوەیی ، بەو زمانە دەوترێ ، کە وەك وەسیلەی پێوەندیبەستنی کەسانی نەتەوە ، یان میللەت ، یان نەژادی جیاواز بەکاردێنرێ ، پێویستی بوون بە زمانی پێوەندی بەستنی نێونەتەوەیی لە ئەنجامی پێوەندیی هەمیشەیی گەلانەوە دێتە مەیدان ، بەتایبەتی لەو دەوڵەتانەی لە یەکگرتنی چەند نەتەوەیێك پەیدابووە .

- زمانی نەتەوەیی        اللغة القومية        National language

زمانی نووسراو        اللغة المكتوبة        Written language

زمانی نووسین

بـ .: زمانی ئەدەبی

- زمانی نێو میللەتان

بـ.: زمانی لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوەیی

زمانی هونەری        لغة شكلية        Formal language

پێناسەی (ڕێزمانی بەرهەمهێنان) بەکارهێنانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان تەنها بە زمانە سروشتییەکانەوە نابەستێت . لە ڕاستیدا لەم ڕێزمانی بەرهەم هێنانەدا دەرنەبڕاوە ، کە ڕێزمانەکە واتاییکی بۆ پەسنکردنی زمانە سروشتیبەکان هەبێت . کۆمەڵی ئەو دروستە ئەو تەکنشینییانەی ، کە لە ڕێی ڕێزمانی بەرهەمهێنانەوە پەسەندەکرێن ، لە زمانی بەکارهێنانی لۆژیکدا ، ناوی ((زمانی هونەری))ی لێنراوە .

له نێو خاسیەتە زۆرەکانی زمانی ئەدەبی هەر میللەتێکدا ، بەر لە هەرشت پێویستە ئەمانەی خوارەوە دەست نیشان بکرێن :

١ـ توانستی دەربڕینی سەرجەمی ئەو زانیارییانەی لە گشت بوارێکی چالاکیی مرۆڤایەتی دا کەڵەکە بووە و هەمەکی واتایان ، کە زەمینەی تێکڕای مەیدانەکانی ئاخاوتن خۆش بکا .

٢ـ پێویستیی بوونی گشتێتی‌ی کێش وەك نموونە بۆ هەموو ئەوانەی دەیزانن و بەکاری دێنن ، بێ بوونی پێوەندی بە باری کۆمەڵایەتی و پیشەیی و ناوچەیی‌یانەوە .

٣ـ دەوڵەمەندیی شێواز شتێکی بنەڕەتی‌یە بۆ ڕاگەیاندنی یەك مەبەست بە شێوەی جۆر بەجۆر

زمانی ئەدەبی دەقاودەق واتای (( زمانی نووسین )) دەگەیەنێ . لە زمانی لاتینی‌دا ( littera ) بە مانای (نامە) دێ و ( Litterae )یش ـ ( نووسین ) . له زمانانی دیشدا ئەم زاراوەیە جووت و هاوشانی لاتینی‌یەکەیە . بەوێنە لە ئەڵمانیدا ( Schriftsprache ) ـ ( زمانی نووسین ) ؛ لە چیکیدا ( Spisovny jszyk ) ـ ( زمانی نووسین )ە .

بەڕاستی زمانی ئەدەبی بە نووسین جێگیر دەکرێ و دەچەسپێنرێ . بەڵام یەکسانی کردنی مەفهوومی ( زمانی نووسین ) و ( زمانی ئەدەبی ) شتێکی ڕاست نی‌یە : ١) هەموو نووسراوێکی تۆمارکراو زمانی ئەدەبی نی‌یە : ٢ ) زمانی ئەدەبی تەنیا لە فۆرمی نووسیندا خۆی نانوێنێ ، بەڵکو لە فۆرمی ئاخاوتنیشدا دەردەکەوێ ـ واتە زمانی ئەدەبی خاوەنی دوو فۆرمە .

زمانی ئەدەبی ـ تەنیا زمانی نووسین ( بەرهەمی هونەری ، لێکۆڵینەوەی زانستی ، ڕۆژنامە و گۆڤار ) نی‌یە ، بەڵکو زمانی ئاخاوتنی دەوڵەت و دەزگای کۆمەڵایەتی : قوتابخانە و شانۆ ، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشە . زمانی ئەدەبی هەروەها لە کاروباری ڕۆژانە و پێوەندی و تێکەڵیی خێزانی‌دا بەکاردێ .

له نێوان زمانی نووسین و زمانی ئاخاوتندا جیاوازیی شێواز و پێکهاتن هەیە . لەو حاڵەتانەدا ، کە لە نێوان نووسین و ئاخاوتنی زمانی ئەدەبیدا تەنیا جیاوازیی شێواز و ئەرکبینین بەدی دەکرێ ، نووسین پتر و وردتر خاسیەتی گوێ بە یاسادان و هەڵبژاردنی وشە و داڕشتنی ڕستە دەدات .

جیاوازیی نێوان فۆرمی ئاخاوتن و نووسنیی زمانی ئەدەبی دەشێ لەوەش زیاتر بێ . بەوێنە لە زمانی چیکیدا جیاوازیی نێوان زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین ئەوەندە زۆرە ، هەندێ لە زمانەوانان وەك پێکهاتنی جیاواز تەماشای دەکەن ، واتە وەك ـ زمانی نووسینی چیکی و زمانی ئاخاوتنی چیکی . فر . تراڤنیچك لە پێشەکی کتێبی "ڕێزمانی زمانی ئەدەبی چیکی "دا ، بەتایبەتی ئەو باسە دێنێتە ناوانەوە ، گوایا "زمانی ئەدەبی ئاخاوتن بەشی خۆی وا گرتووەتە خۆی ، کە تایبەتی ڕێزمانیيە سەرەکیيەکانی دەچنە نێو کەرەستەی دەربڕینی زمانی ئەدەبیی گشتیيەوە . یان ناچنە نێوی و گەڵێ جار لە شێوەی پەراوێزدا دەردەکەون .

جیاوازیی فۆرمی ئاخاوتن و نووسینی گشتیی زمان دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی زمانی زگماك دا (ئەمە وەك لە چین و ژاپۆن دەبینرێ) دەقی هەڵبژاردە بە دوو شێوە ـ نووسینی ئەدەبی و ئاخاوتن ـ بەکاربهێنرێ . جیاوازی لە نێوان ئاخاوتنی میللی و زمانی نووسیندا بەتایبەتی لە هیندستان تەواو بەرچاوە . لە وڵاتە عەرەبیيەکاندا ئەو جیاوازیيە تەنیا لە وشەدا نیيە بەڵکو لە ڕێزمانیشدایە . بۆ نموونە ، لە زمانی نووسینی عەرەبیدا فۆرمی دۆخی ناو پتر پێڕەوی دەکرێ : ( كتابٌ ) ، ( كتاباً ) ، ( كتابٍ ) ، بەلاّم لە ئاخاوتندا تەنیا فۆرمی ( كتاب ) بەکاردێنرێ .

**زمانی ئەسپیرانتۆ لغه الاسپرانتو Esperanto language**

زمانێکی دروستکراوی نێو میللەتانە ، کە لەلایەن ل . م . زامینگۆڤ ( ١٨٥٩ ـ ١٩١٧ )ی پزیشکی فرەزمانزانەوە دانراوە . ناوی ئەم زمانە

لەو ناوە خواستە وەرگیراوە ، کە ساڵی ١٨٨٧ لە یەکەم کتێبیدا " Lingva internacia " ( زمانی نێومیللەتان ) دایناوە . Espernato واتای ( ئاوات خواز ، هیوادر ) دەگەیەنێ . هەر لەو ساڵەدا لە وارشۆ ژمارەیێك کتێب بۆ خوێندن و فێربوونی ئەو زمانە دروستکراوە ، بڵاوکرایەوە . زامینگۆڤ فەرهەنگ و کتێبی دەقی ئەدەبی دانا ؛ (پشکنەر)ی گۆگۆل و ( جۆرج داندێن )ی مۆلێر و ( هاملێت )ی شکسپیر ... ی وەرگێڕایە سەر ئەو زمانە نوێیە .. زامینگۆڤ ئەوەشی بۆ کرێکاران و جوتیاران ڕوون کردەوە ، کە زمانی نوێی یاریدەدەر خاسیەتی لەیەکترگەیشتنی میللەتیشی گرتووەتە خۆی .

لە نێو زمانە دروستکراوەکاندا ، ئەسپیرانتۆ پتر ناوبانگی دەرکرد و زۆرتر بڵاوبووەتەوە ، بەتایبەتی لە بەلگاریا و ڤێتنام و ژاپۆن و پۆلۆنیا و وڵاتەکانی ئەسکەندەناڤیا و ئینگلستان و ڕۆمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا و فەرەنسا . یەکێتی ئەسپیرانتۆی نێو میللەتان نزیکەی پەنجا یەکێتی زمانی نەتەوەیی دەگرێتە خۆ و پێوەندی بە هەشتا وڵاتەوە هەیە و کۆنگرە و کۆنفرانسی نێومیللەتانی بۆ دەگیرێ . بیست و پێنج ئێستگە بە ڕێكوپێکی بە زمانی ئەسپیرانتۆ بەرنامە بڵاودەکەنەوە . بەم زمانە ڕۆژنامە و گۆڤار دەردەچێ . ئەسپیرانتۆ نەك تەنیا ئەدەبی ڕەسەنی گرتووەتە خۆ ، بەڵکو ڕۆمان و شانۆنامە و شیعری وەرگێڕاو و بەرهەمی زانستی و نامەی دوکتۆریشی لە ئامێزگرتووە گەورەترین کتێبخانەی ئەسپیرانتۆ لە لەندەن ، پتر لە سی هەزار سەرچاوەی تێدایە . یەکێتی ئەسپیرانتۆ لە یەکێتی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٢١ەوە هەیە . ئێستا ئەسپیرانتۆناسەکان لە وڵاتی سۆڤێت لە دەزگا ڕۆشنبیری و یانەکان ، لە خوێندنگا بەرزەکانی سەرلەبەری وڵات کاردەکەن .

سیستەمی ئەسپیرانتۆ ئاسان و ژیربێژانەیە . زمانەکە هەمووی (١٦) یاسای ڕێزمانی و نزیکەی ( ٤٠ ) پێشگر و پاشگر و پێشبەندی هەیە . هەر

وشەیێك چۆن دەنووسرێ وا دەخوێندرێتەوە ، لەبەر ئەوە بۆ هەر فۆنێمێك پیتێکی سەربەخۆی لاتینی دانراوە :

( a , b , c , ĉ , d , e , f , g , ĝ , h , ĥ , I . j , ĵ, k ,I , m , n , o , p , r , s , ŝ , t , u , û , v , z )

هێز ( النبره - Stress ) هەمیشە دەکەوێتە سەرپێش دوابڕگەوە .

وشەگۆڕی و فۆرم ڕۆنان و وشەڕۆنان بە ڕێبازی پێوەلکانی گیرەکەوە ئەنجام دەدرێ بەشەکانی ئاخاوتن و فۆرمیان بە فۆرم و ڕۆنانی پاشگرییەوە دەناسرێتەوە . بەوێنە ئەگەر وشەیێك کۆتایی بە ( ۆ ) بێت ، ئەوە ناوە ، وەك : " پاترۆ ( باوك ) ؛ " ڤێلیچۆ " ( شادمانی ) ... بێتو کۆتایی بە ( ا ) بێت ، ئەوە ئاوەڵناوە وەك :" پاترا " ( باوکانە ) ؛ " ڤێلیچا " ( شادمان ) . هاتوو ( یٚ ) بووە کۆتایی وشە ، ئەوە دەبێتە ئاوەڵکردار ، وەك " پاترێ " ( باوك ئاسایی ) ؛ " ڤێلیچێ " ( بەشادمانی ) .

جنس فۆرمی نییە . کۆ بە پاشگری ( ـ چ ) نیشان دەدرێ : " ڤیلیچاچ پاترۆچ " ( باوکی شادمان ) . دۆخی سادە هەیە ، ئەویش دۆخی بەرکارێتییە و بە نیشانەی ( ـ ن ) دەردەبڕرێ . فۆرمی دۆخەکانی دی بە یاریدەی پێشبەند سازدەبێ . دۆخی جەر ( دێ ) وەردەگرێ ...

فۆرمی کەس و ژمارەی کردار بە ڕێگەی شیکاری پێك دێنرێ ـ واتە بەهۆی جێناوی " می " (من) ؛ "سی" ؛ ( تۆ ) ؛ " لی " ( ئەو ـ بۆ نێر ) ؛ " شی " ( ئەو ـ بۆ مێ ) ؛ " جی " ( ئەو ـ بۆ بێلایەن ) ؛ " تی " ( ئێمە ) ؛ " یلی " ( ئێوە ) ؛ " ۆنی " ( ئەوان ) خستنەسەر فۆرمی کات یان ڕێژە . فۆرمی کارا دیاری و کارا بزریش بە ئیزافەکردنی پاشگر ئەنجام دەدرێ .

ئەگەر فۆرمی کاتی ئێستا و ڕابوردوو و ئاینده پاشگری ( ـ نت )ی بۆ ئیزافە بکرێ . فۆرمی کارا دیار دروست دەبێ و بە پاشگری ( ـ ت )ش فۆرمی کارا بزر سازدەبێ . بەزیادکردنی کۆتایی ( ـ ا) ناوی کارا و ناوی بەرکار پێك دێ : " لێگانتا " خوێنەر ) ...

وشەڕۆنان بە یاریدەی پێشگر و پاشگر ئەنجام دەدرێ . لە هەندێ ڕەگ لە بیست تا شەست وشەی ناسادە ڕۆدەنرێ . ئەمەش نموونەی چەند پاشگر و پێشگرێك :

**١ـ پاشگر**

" ـ ار " ( كۆبوونەوەی شتی هاوڕەگەز ڕادەگەیەنێ ) ، وەك :

" ئاربارۆ " ( دارستان ) لە " ئاربۆ " ( درەخت )ەوە ، " ڤاگۆنارۆ " ( شەمەندەفەر ) لە " ڤاگۆنۆ " ( واگۆن )ەوە ...

" ـ ین " ، وەك : " فیلینۆ " ( كچ ) بەرانبەر " فیلۆ " ( كوڕ ) ؛ " پاترینۆ " ( دایك ) بەرانبەر " پاترۆ ( باوك ) ... " ـ ید " ، وەك : " باڤیدۆ " ( گوێرەكە ) بەرانبەر " باڤۆ " ( گا ) ... هتد .

**٢ـ پێشگر**

" ڕێ " ـ ( بۆ دووپات بوونەوەی ڕووداو و گەڕانەوە ) وەك : " ڕێدۆنی " ( دانەوە ) بەرانبەر " دۆنی " ( دان ) ... " ماڵ ـ " ( دژواتایی و بارودۆخ و چۆنێتی ڕادەگەیەنێ ) ، وەك : " ماڵ ـ " ماڵفێرمێ " ( كردنەوە ) بەرانبەر " فێرمێ " ( داخستن ) : " ماڵبۆنێ ( خراپ ) بەرانبەر " بۆنێ " ( باش ) .

زمانی دروستكراوی نێومیللەتان لەگەڵ هەموو كاری ژیربێژییانەی و بیروردی و سیستەمی ڕێك‌وپێكیشدا ناتونێ دەوری زمانی فرەئەركی ئادەمیزاد جێ‌بەجێ‌بكات . زمانی دروستكراو دەوری زمانی یاریدەدەر دەبینێ . زیاتر بڵاوبوونەوە و پەل هاویشتنی ئەسپیرانتۆ دەبێتە هۆی پەیدابوونی جیاوازیی شێوەی ڕێنووسین و سەرهەڵدانی هاوواتایی وشە و وشەڕۆنان ؛ دابەش‌بوونی زمانی گشتیی بەسەر دیالێكتدا ... بە واتایێكی‌دی ئەركی زمانی ئەسپیرانتۆ ، وەك زمانی گشتیی وای لێ دێ هەمان ڕێگەی پرۆتسێسی هەنگاو بە هەنگاوی پێكشەوتن و تەواو بڵاوبوونەوەی زمانەكانی هاوچەرخ بگرێتە بەر .

- زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە نظام العد العشري
Algorithmic language

زمانێکی دروستکراوی نێو دەوڵەتانە ، ساڵی ١٩٦٠ کۆنفرانسی نێومیللەتان لە پاریس ، زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە ( نظام العد العشري - Algorithmic language)ی پەسەند کرد . ئەم زمانە پێوارەتی (الرمزية)یە بریتییە لە وەرگرتنی دەستەیێك پیتی ( لاتینی - گەورە و بچووك ) ؛ ژمارەی عەرەبی لە " ٠ " ەوە تا "٩" ؛ نیشانە و خشتەی ڕاستیی بنچینەیی و نیشانەی پێوارەتیدی (نیشانەی کردە ، دابەشکردن ، کەوانە) . هەروەها چەند وشەیێکی یاریدەدەر ( بە زمانی ئینگلیزی ، بە نموونە ( if - ئەگەر ) ، ( then - ئەوجا ) . زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە لە دانانی دەدە ژماردن و بەرنامە بۆ ئامێری ژمارەژمێری ئەلەکترۆنیشدا بەکاردەبرێ .

- زمانی پێناو لغة الوسيط Mediator ( madiating , intermediate , intermediary) language

زمانی جیهانی اللغة العالمية Weltsprache , World language , Universal language

لەتەك زمانانی لەیەکتر گەیشتنی نێونەتەویی ، زمانانی سنوور فراوانتر و ئەرك هەمەڕەنگتر پەیدادەبن . بەم جۆرە زمانانە دەوترێ زمانی نێومیللەتان ، یاخود زمانی جیهانی ( Weltsprache ,World Language ) . زمانی جیهانی لە ئەنجامی هەرەس‌هێنانی سنووری نەتەوایەتیدا پەیدا دەبێ ، کە خاسیەتی پێشکەوتنی ئابووری و ڕامیاری و کولتووریی دوا سەدەکانە . لە سەدەکانی ١٧ - ١٨دا زمانی ئیسپانی و فەرەنسی و ئەڵەمانی بڵاوبوونەوەی نێومیللەتانیان وەدەستهێنا . لە سەدەی ١٩دا زمانی ئینگلیزی . زمانی ڕووسیش لە سەدەی ٢٠دا ، ئەگەرچی لە سەدەی (١٩)ەوە بووبووە

سەرنج ڕاكێش ، ئەویش وەك . ف . ئێنكلس دەڵێ : نەك تەنیا لەبەر خودی زمانەكە . بەڵكو لەبەر تێگەیشتنیشی لە ئەدەبەكە .

هـ . ، بـ .: زمانی نێومیللەتان ؛

زمانی نێونەتەوەیی .

- زمانی دایك لغة الأم Primary language

= زمانی شیری ، زمانی زگماك

زمانی دەستكرد اللغة الاصطناعية Artifical language

لە ڕژێمی هێما و ڕەمزەكانی زمانێكدا یان لە ڕژێمەكانی بیركاری و كیمیا و فیزیا دا زانایان بۆ مامەڵەكردن لەگەڵیان و وەگەڕخستنی كەرەستە و زانیارییەكانیان ، زۆر جار بۆ مەبەستی تایبەتیی خۆیان ، هێما و ڕەمز دەهێننە كایەوە ، ئیتر ڕەوا و ڕاست بن ، یان نا ، دەبنە زمان . بە زۆری ئەم زمانانە بەرهەمی هونەرین و دەستكردی مرۆڤن و سروشتی نین . ئەم جیاكردنەوە و سنووربۆدانانە بۆ زمانی ئەسپیرانتۆش ( بـ .: زمانی ئەسپیرانتۆ ) دەشێ ، كە لە كۆتایی سەدەی نۆزدەدا بۆ گفتوگۆكردن و لەیەكترگەیشتنی میللەتانی جیاواز دروست كرا . لەگەڵ ئەوەشدا ، كە زمانی ئەسپیرانتۆ لەسەر بنەمای زمانە ئەوروپاییەكان دروست كرابوو ، كەچی هەر بە زمانی سروشتی دانانریت . بەم پێیە تەنانەت زمانی ئەسپیرانتۆش ( زمانێكی دەستكردە ) و سروشتی نییە

هـ. ، بـ .: زمانی ڤۆلاپوك

زمانی زگماك

بـ .: زمانی دایك

**زمانی سروشتی** **اللغة الطبيعية** Natural language

**زمانی شیری**

**ب .: زمانی دایك**

**- زمانی ڤۆلاپوك** **لغه الفولاپوك** Volapuk

**ئەو زمانە نێونەتەوەیی‌یە دەستکردەیە ، کە ساڵی ١٨٧٩ شلایشەر وەك زمانێکی یاریدەدەری یەکگرتوو ، بۆ گشت میللەتانی جیهان پێشنیازی کردووە .**

**لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٨٧٠ دا جۆهان مارتن شلایشەر ، کە قەشەیەکی کاسۆلیکی بوو و لە کوێرەدێیەکی وڵاتی باڤاریا دەژیا لە مێشکیدا بیری دانانی زمانێکی یەکگرتوو گەڵاڵە بوو ، کە گشت میللەتان تێی بگەن و پێی بنووسن .. ئەم هزرەشی لە ئەنجامی گەڕاندنەوەی ئەو نامەیەوە سەری هەڵدا ، کە دراوسێیەکی بۆ کوڕێکی ناردبوو ، کە لە ئەمەریکا دەژیا و لەو وڵاتە لە زمانی ئەڵمانی تێنەدەگەیشتن و نەیاندەتوانی ناویشانەکە بخوێننەوە . بۆیە نامەکەیان ناردەوە .**

**ئەم ڕووداوە وای لە شلایشەر کرد بیر لە دانانی ئەلفوبێیەکی جیهانیی وا بکاتەوە هەموو زمانێکی پێ بنووسرێ ... ئەم هزر و پرۆژەیەی خستە قالبێکی ئاینی‌یەوە و وتی چۆن هەموو جیهان پێویستی بە بڕوا و ئیمانێکی یەکگرتوو هەیە . بەو چەشنەش پێویستی بە ئەلفوبێیەکی یەکگرتوو هەیە .**

**شلایشەر لەم پرۆژەیەیدا زیاتر ڕۆیی و لە ساڵی ١٨٧٩ دا نەك هەر ئەلفوبێیەکی جیهانی دانا . بەڵکو زمانێکی جیهانیشی سازکرد و ناوی نا (ڤۆلاپوك ).**

ئەم زمانە دەستکردەی بە چەشنێك دانا . هیچ حاڵەتێکی بیژۆکی تێدا نەبێ . وشەکان چۆن دەنووسران واش دەخوێنرانەوە .. هێز هەمیشە لەسەر دوا برگەی وشە بوو . زوربەی زۆری وشەکانی بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕەگی ئینگلیزییەوە وەرگرتبوو و بەشێکیشیان لە ئەڵەمانی و لاتینی و فەرەنسی‌یەوە .. بۆ نموونە بۆ (جیهان ) ــ ( Vol) ی دانابوو ، کە لە ( World)ی ئینگلیزییەوە وەریگرتبوو . بۆ (زمان ) ـ ( Puk) لە (Speak)ی ئینگلیزییەوە . لەم دوو وشەیەشەوە ناوی زمانەکەی دارشت ـ (Volapuk) ، واتە ـ (زمانی جیهانی)

کڵێسەی کاسۆلیکی بە پەرەۆشەوە یارمەتی شلایشەری دا و پشتیوانیی ئەم پرۆژەیەی کرد . بۆ لێکۆڵینەوە و بلاوکردنەوەی زمانی ڤۆلاپوك کۆمەلەیێك دامەزرا .. کۆنگرەی بۆ بەسترا ... کڵێسە یارمەتی ئەوەی دا ڤۆلاپوك لە گەڵ ولاتی ئەوروپا و ئەمەریکا بلاوبێتەوە . شلایشەر خۆی سەرۆکایەتی کۆمەڵەی ڤۆلاپوکی دەکرد .

لە ساڵی ١٨٩٩دا بنکەکانی کۆمەڵەی ڤۆلاپوك گەیشتە ٢٨٣ . ژمارەی ئەو گوڤار و ڕۆژنامانەی بەم زمانە دەردەچوون (٢٥) بوون . زیاتر لە هەزار مامۆستا و پسپۆڕ کەوتنە پڕوپاگندە کردن و بلاوکردنەوەی ئەم زمانە ... سەدەها کتێب و نامیلکە بەم زامانە دەردەچوو ...

لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵدان و ئەرك کێشانەدا پرۆژەی ڤۆلاپوك سەری نەگرت و بەرەو نشوستی و کوژانەوە ڕۆی . شلایشەر گوناهی ئەم سەرنەگرتنەی خستە ئۆباڵ ئەو هاورێیانەی لەبەر هۆی شەخسی بوونە تەگەرە و نەیانهێشت پرۆژەکەی سەرکەوێ .

بەو شێوەیە زمانی ڤۆلاپۆك پشت گوێ خرا و بەدوا ئەمەشدا لە ساڵی ١٩١٢دا شلایشەریش مرد .

**ـ زمانی لەیەکتر گەیشتنی نەتەوەیی        لغة الاتصال الدولي**
Intrelanguage

= زمانی نێومیللەتان

**زمانی لەیەکتر گەیشتنی نێونەتەوەیی ، بەو زمانە دەوترێ ، کە وەك وەسیلەی پێوەندیبەستنی کەسانی نەتەوە ، یان میللەت ، یان نەژادی جیاواز بەکاردێنرێ ، پێویستی بوون بە زمانی پێوەندی بەستنی نێونەتەوەیی لە ئەنجامی پێوەندیی هەمیشەیی گەلانەوە دێتە مەیدان ، بەتایبەتی لەو دەوڵەتانەی لە یەکگرتنی چەند نەتەوەیێك پەیدابووە .**

**ـ زمانی نەتەوەیی        اللغة القومية**        National language

**زمانی نووسراو        اللغة المكتوبة**        Written language

**زمانی نووسین**

بـ .: زمانی ئەدەبی

**ـ زمانی نێو میللەتان**

بـ.: زمانی لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوەیی

**زمانی هونەری        لغة شكلية**        Formal language

**پێناسەی (ڕێزمانی بەرهەمهێنان) بەکارهێنانی ڕێزمانی بەرهەمهێنان تەنها بە زمانە سروشتییەکانەوە نابەستێت . لە ڕاستیدا لەم ڕێزمانی بەرهەم هێنانەدا دەرنەبڕاوە ، کە ڕێزمانەکە واتاییێکی بۆ پەسنکردنی زمانە سروشتییەکان هەبێت . کۆمەڵی ئەو دروستە ئەو تەکنشینییانەی ، کە لە ڕێی ڕێزمانی بەرهەمهێنانەوە پەسەندەکرێن ، لە زمانی بەکارهێنانی لۆژیکدا ، ناوی ((زمانی هونەری))ی لێنراوە .**

- زمانی هونەریی ئەدەبی          اللغة الأدبية الفنية

نووسەران دەوری گەورەیان لە ڕەگ داکوتان و بڵاوبوونەوەی کێشی ئەدەبیدا هەیە . ئەدەب لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەندێ جار بیر بۆ ئەوە ڕادەکێشێ ، کە زمانی ئەدەبی - زمانی هونەری ئەدەبی بێت . بێگومان ئەمەش شتێکی ڕاست نییە .

زمانی بەرهەمی هونەری وەنەبێ تەنیا ئاخاوتنی ئەدەبیی کێشدار بگرێتە خۆ ، بەڵکو شێوازی تاکایەتیی نووسەر و پاڵەوانانی چیرۆك ( کە لەلایەن نووسەرەوە دانراون )یشیان تێکەڵ کراوە ، شێوازی هونەریی دەق و قسەی بەشداران ئەگەرچی لە کێش لادانە ، بەڵام کەرەستەی ڕازاندنەوەی بەرهەمە . بۆ نموونە ، ئەوەتە دالگە ) لە ڕۆمانی " کۆردەرە "ی مامۆستا خوسرەو جافدا دەڵێ : " بێناموس ، گەل .. ڕیامە گۆڕ باوك ئەو کەسە منی دایە شوی .. ئەڕا زینەگیم . ڕۆڵە .. ڕۆڵە ڕۆڵە ئەڕاتان کەم .. چەند گلە وتم نان مەدرن .. ( ل٧) .. " ڕۆڵە دەردتان بکەفێتە تەوق سەرم قەزاتان لە لێم کەفێت ئیلاهی " ( ل ٨ ) ..

خوێنەر لە وتەکانی ( دالگە )دا هەست بەلادان لە کێشی زمانی ئەدەبی دەکا . ئەمە کە خاسیەتی کەسێتی ( دالگە ) نیشان دەدا ، لە هەمان کاتدا دەبێتە بەڵگەی بوونی کێشی زمانی ئەدەبی . هەر لەم ڕۆمانەدا ، نووسەر نەك تەنیا لە گێڕانەوەی قسەی بەشدارانی ڕۆمانەکەیدا ، بەڵکو هەندێ جار لە وتەکانی خۆشیدا و وشە و دەستەواژە و یاسای ڕێزمانیی ناوچەیی بەکارهێناوە ": .. بە سکی برسییەوە دەهاتین بە حاڵ و گلێر دەبووینەوە .. چاوی بێ ڕەمەقەوە .." ( ل٧) .. " بە تەمابووین ڕیشووی لە قولاییدا بچێنێ و چڵەکانی جووزەرە دەرکا و گڵا دەربهێنێ و لەژێر سێوەری پڕوکڕدا منداڵە وردیلەکان کۆببنەوە " ( ل ١٨٥ ) .

زمانەوان

بـ : زمانناس

زمانەوانی

بـ : زمانناسی

زمانزان عارف بلغات متعددة Polyglot , Multilingual

ئەو کەسەی زمان زۆر بزانێ بە زمانزان بەناوبانگە .

زمانناس عالم اللغة ، لغوي Linguist

= زمانەوان

زمانناس بە پسپۆڕی بواری زمان دەوترێ .

زمانناسی علم اللغة Linguistics

= زمانەوانی ، زانستی زمان

زمانناسی ئەو زانستەیە ، کە لە زمان دەدوێ و سروشتی کۆمەڵایەتی و ئەرکی پێکهاتنی ناوەوەی ، دەستووری کارکردنی ، پێکشەوتنی مێژوویی و دابەش بوونی زمانانی دیاریکراو ڕوون دەکاتەوە .

زمانناسی لە لێکۆڵینەوە ئەوروپاییەکاندا بە زۆری بە ( زمانناسیی گشتی) ، یان ( سەرەتاییێکی زماناسی ) .. ناوبراوە .

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ، دەبێ هەوڵی تێگەیشتنی ئەوە بدەین ، ئایا لە زمانانی جیاوازدا شتی گشتی هەیە ، کە بۆ سەرجەمیان خاسیەت و بوونیان لەبەك ڕادەدا بێ . بۆ نمونە : ئایا ئەرکی کۆمەڵایەتیی زمانی کوردی و ئینگلیزی و فەرەنسی .. وەك یەکن ، یاخود جیاوازن ؟ بێگومان

وەك یەكن : هەر یەكێك لەو زمانانە و هەر زمانێكی دیش ، وەك ئامێری لەیەكترگەیشتن بەكاردێنرێ ... نمونەیێكی دی : ئایا دەشێ وا بیربكەینەوە ، كە بوونی دەنگ و وشە و ڕستە .. تەنیا خاسیەتی زمانی كوردی نی‌یە و خاسیەتی زمانانی دی‌بشە ؟ تەجروبەی ئاخاوتن و زانست گومانیان لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا نەهێشتۆتەوە .

بۆ پێسەلماندنی ڕای بوونی گشتێتی ئەو جۆرە لایەن و دیاردە و بەڵگە و ڕاستی‌یانە ، لە زمانانی جیاواز و سەرجەمی زماناندا نموونەی دی یەكجار زۆرە .

زمانناسیی گشتی ، بەتایبەت ئەو زانستەیە ، كە لە كێشەی گشتیی زمانانی جیاواز دەكۆڵێتەوە . ئەم زانستە ، بە واتایێكی ئاشكراتر دەشێ بە زانستی زمان بە گشتی و زانستی سروشت و چییەتی ( الماهیة — Essnece)ی زمان ( لایەنەكانی ، بەش و دانە پێكهێنەكانی ) ناوببرێ .

ئەو كێشە گرنگانەی ئەم زانستە چارەسەریان دەكا چین ؟

بەر لە هەرشت ، چۆنیەتی سروشتی زمان دیاری دەكا ـ واتە لەوە دەدوێ ، كە ئایا زمان دیاردەیێكی كۆمەڵایەتی‌یە ، یان بایۆلۆژی‌یە ، یان فیزیاوی‌یە ، یان دەروونی‌یە . زمانناسیی گشتی لە هەمان كاتدا دەمەتەقێ لەسەر دووەم كێشەی گرنگ دەكا ، كە ئەویش مەسەلەی چییەتیی زمانە ـ واتا ئەو جیاوزاییە بنەڕەتی‌یانەی زمان لە دیاردەكانی دی ژیان جیادەكاتەوە .

بەم شێوەیە ، یەكەم كێشەی زمانناسیی گشتی ـ كێشەی سروشت و چییەتیی زمانە ، كە مەسەلە گرنگەكانی پێوەندی زمان بە كۆمەڵ و بیر و هۆشەوە دەگرێتە خۆ .

دووەم كێشە پتر بەربڵاوە و باس و مەسەلەی زۆر لێكدەداتەوە و بەندە بە تێگەیشتنی پێكهاتنەوە ـ واتە پێكهاتنی زمانەوە : لایەنە سەرەكی‌یەكانی زمان كامانەن ؟ لایەنی دەنگیی زمان لە چیدایە ؟ لە چ بەش و دانەیێك

سازبووە ؟ دەنگەکانی ئاخاوتن چین ؟.. لێکسیك یاخود وشەکانی زمان چی‌یە ؟ چۆن پێکهاتووە ؟ وشە بەچی دەوترێت ؟... پێکهاتنی ڕێزمانیی زمان چی‌یە ؟ خاوەنی چ دیاردە و تایبەتێتی‌یەکە ؟ بەشەکانی ئاخاوتن و ئەندامەکانی ڕستە و ڕستە چین ؟...

سێیەم کێشەی زمانناسیی گشتی ئەو باسانەن کە پێوەندییان بە سیستەمی زمانەوە هەیە ـ واتە ئەو پێوەندی‌یە زۆر و هەمەجۆرەی ماکەکانی پێکهاتنی زمانیان لە چوارچێوەیێکی پتەودا پێکەوە بەستووە . زمان کۆکردنەوەی دەنگ و وشە و ئاواز و ڕستە ...ی لابەلا نی‌یە . زمان بریتی‌یە لە سیستەمێکی تەواو ڕێك وپێك ، بە هاوجووتیی و هاوشانیی بەش و دانەکانی یەکێتی‌یەکەی پێکهێناوە . هەر لایەنێکی بەش و دانەکانی پێوەندییان بە گەلێ لایەنی دی بەش و دانەوە هەیە . ئەم سیستەمە ڕێك و پێکە ، یەکێتی ناوەکی گونجاوی زمانە و زمانناسی گشتی لێی دەکۆڵێتەوە .

کێشەی چوارەمی ئەم زانستە گەلێ کێشەی گەورە و بچووکی گەشەسەندنی زمان بەپێی پێوەندی بە پێشکەوتنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی‌یەوە شی دەکاتەوە : چۆن و بە چ ڕێگاییێك و بەپێی پێوەندی بەچی‌یەوە زمان بە گشتی گۆڕانکاری بەسەردا دێت ؟ یاسای ناوەکیی گەشەسەندنی زمان چی‌یە و تا چ ڕادەییێك لە تەئسیری دەرەکیی زمان جیایە ؟ فۆرمی بنەڕەتیی بوون و پێشکەوتنی هەر زمانێك چی دەگرێتە خۆ ـ زمانی میللی ، زمانی ئاخاوتن و شێوەی ناوچەیی ، زمانی ئەدەبی .. ؟ قۆناغە سەرەکی‌یەکانی زمانی مرۆڤ هەر لە سەرەتای پەیدابوونی‌یەوە تا ئێستا کامانەن ؟ لە کۆتاییشدا ، چۆن و کەی و لەچ هەل و مەرجێکدا ئاخاوتنی مرۆ پەیدابووە و سەرەتای پێشکەوتنی زمانان بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە ؟

لە کێشەی چوارەمەوە ، کێشەی پێنجەم دێتە ناوان : پەیدابوون و پێشکەوتنی نووسین . وەك دەزانین کۆمەڵی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ خاوەنی چەند جۆرە نووسینێکی جیاوازە . ئەو جۆرانە چۆن پەیدابوون ؟ تایبەتێتی هەر

یەکێکیان چی‌یە ؟ بە گشتی چییەتیی نووسین بەپێی پێوەندی بە زمانی دەنگی‌یەوە لە چیدایە ؟ چ حۆرە ئەلفوبێ‌یێك لە ئادەمیزاد ئاشکرایە و ئەو ئەلفوبی‌یانە چۆن پەیدابوون ؟ ڕێنووس چی‌یە و بنەماکانی چین ؟..

کێشەی شەشەم دەکرێ ناوبنرێ کێشەی دابەش‌کردنی زمانان . ئێستا لەسەر ڕووی ئەم زەمینە پتر لە دوو هەزار زمان هەیە . هەندێ لەو زمانانە زۆر لە یەکدی نیزیکن ( بە وێنە : کوردی و فارسی و تاجیکی .. یان عەرەبی و عیبری .. ) وێك چوون و " خزمایەتی "یان یەکجار بەرچاوە . بەشێکی دی زمانان وا پی‌دەچێ هیچ وێك چوونێك لە نێوانیاندا نەبێ و لەگەڵ یەکدی تەواو نامۆ بن ، وەك ( کوردی و چینی ) .. جا ئەمە وایە ؟ ئایا دەکرێ بە گشتی زمانان بە پی‌ی خاسیەتی گشتی خێزان و گرووپ و دەستە دابەش بکرێن ؟ ئەگەر ئەمە بکرێ ، ئەوە ئەو دابەش‌کردنەی زمان چۆن خۆی دەنوێنێ و تەنیا یەك دابەش‌کردن کار مەیسەر دەکات ؟ ئەگەر تاکە دابەش‌کردنێك نەبێ ، کەواتە چەند دابەش‌کردن هەیە و دابەش‌کردنی جیاواز بۆ دانراوە .

بۆ کێشەی حەوتەمی زمانناسی گشتی دەتوانین ئەوە بێنینەوە یاد و بیخەینە پێش چاو ، کە هەر زانستێك دەمێ لە بابەتەکەی خۆی دەدوێ ، ڕێگە و ڕێبازی دیاری‌کراوی لێکۆڵینەوەی خۆی دەگرێ . بەوێنە لە لێکۆڵینەوەی سروشتناسیدا ڕێبازی تەجروبە و تاقیکردنەوە فراوان لە کاردایە ، ڕێبازی بەراوردکاری لە زانستی هەمەجۆردا باوە ... زمانناسیش لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا ڕێبازی زانستی جۆربەجۆری ( بەراوردی ، مێژوویی ، وەسفی ، ئەزموونگەری ، چەندەکی ... ) هێناوەتە ئەنجام . زمانناسیی گشتی کۆششی‌کردووە بە شێوەی تیۆری چییەتی هەر ڕیبازێك ڕوون‌بکاتەوە و سنووری بەکارهێنانی دیاری بکا .

کێشەی هەشتەمی زمانناسیی گشتی ساڵ بە ساڵ پتر جی‌پێی خۆی فراوان دەکات . ئەم کێشەیە بریتی‌یە لە خستنە پێش چاوی زانیاریی

زانستی لە بارەی زمانەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەرکی کارەکیی جۆربەجۆر ، کە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆدا سەرهەڵدەدات ( قوتابخانە و زمانناسی ، زمانناسی و وەرگێڕانی دەستی و ئامیری ، تەکنیك لە خزمەتی زماندا ... ) تیۆریی لێکدانەوە و ساغکردنەوەی ئەو کێشانە بە زمانناسی بە سەرداگونجاندن ناسراوە .

نۆیەم کێشە لەبارەی پێویستیی بارودۆخ و دەورووبەر و کارکردنی لە زمانناسی و پێوەندی بە زانستەکانی دییەوە دەدوێ . زمانناسی هەر لە زووەوە بە مێژوو و ژیربێژی و دەروونناسی و ئەدەبناسییەوە بەندە . لەم دواییەشدا پێوەندییێکی فراوان لە نێوان زمانناسی و بیرکاریدا پەیدابووە و بنجی داکوتاوە .

ئەو نۆ کێشەیە و هەندێکی دی بابەت و کەرەستەی زمانناسیی گشتین .

- زمانناسیی بەرانبەر یەك ڕاگرتن

ب .: زمانناسیی بەراوردی

- زمانناسیی بەراوردی      علم اللغة المقارن

Comparative linguistics

لە زمانناسیی بەراوردیدا دوو ، یان چەند زمانێ ، یان چەند شێوەیێك ، یان هەمان زمان ، یان هەمان شێوە لە دوو قۆناغی جیاوازدا لەیەك یان چەند ڕوویەکەوە بەراورد دەکرێن .

زانستی زمانی بەراوردی دوو لقە . یەکەم بەراوردکردن لەسەر بنەمای پێوەندیی مێژوویی لە نێوان دوو یان کۆمەڵێك زمان و نیشاندانی ڕادەی پێوەندیی مێژوویی و خزمایەتیی نێوان ئەم زمانانە و دووری و نێزیکییان لە یەکدی و دۆزینەوەی ئەو زمانانەی سەر بەیەك بنەماڵەن . دووەم ــ بەراوردکردنی دوو یان چەند زمانێك بۆ نیشاندانی لایەنە جیاواز و

ویکچووەکانیان ، بێ ئەوەی گرنگی بدرێتە پێوەندیی مێژوویی نێوانیان ..
بۆ بەراوردکردنی دوو شێوە ، یان دوو زمان ، پێویستە پێشتر ئەو دوو شێوەیە ، یان ئەو دوو زمانە هەر یەکە بەجیا شیبکرێنەوە و ئەوجا بەراوردبکرێن .

زمانناسیی بەراوردی وەك زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی سەریهەڵدا و پشتی بە بەراوردی دەنگسازی و وشەسازیی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان بەستبوو .

لە زمانناسیی بەراوردیدا ، پێویستە زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی و زمانانسیی بەرانبەر یەك ڕاگرتن جیابکرێنەوە ، چونکە دوو ڕێبازی جیاوازن و هەر یەکەیان خاوەنی شێواز و مەبەستی خودی خۆیەتی ئەگەر زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی زمانانی خزم و خاوەن یەك بنەچە و یەك سەرچاوە لەگەڵ یەك بەراورد بکا ، ئەوە زمانناسیی بەرانبەر یەكڕاگرتن زمانانی جیاواز و دوور لەبەکتر بەیەك دەگرێ .

- زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی

ب .: زمانناسیی بەراوردی

- زمانناسیی تایبەتی علم اللغة الخاص

زمانناسیی تایبەتی زانستێکە لە بارەی تاکە تاکەی زمانەوە . بۆ نموونە زانستی زمانی کوردی ؛ زانستی زمانی ڕووسی .

لە دەمێکی یەکجار زوودا ، زمانناسی وەك کۆمەکی پەرش و بڵاوی زمانناسی تایبەتی بوو : زانستی زمانی گرێکی ؛ زانستی زمانی سانسکریتی . ژمارەی ئەو جۆرە زمانناسییە تایبەتییانە وردە وردە زیادی کرد و لە ئەنجامدا لێکۆڵینەوەی گشتی لە بارەی زمانەوە پەیدابوو : لە ڕێزمانی ئەرنۆ و لانسلۆ و کارەکانی بۆپ و هومبۆلدتدا سروشتی زمان و

سیستەمی دیاریکراوە و دابەشکردنی زمانەکانی جیهان و دانانی شێواز و لێکۆڵینەوەی خراوەتە بەرچاو .

هەر زمانناسییێکی تایبەتی بە دانانی فەرهەنگ و نووسینی ڕێزمانەوە دەست پیدەکات ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارانە ، لەتەك زانیاری تایبەتیدا ، زانیاریی تیۆریی کێش ( Norm)یش پێویستە . لە ناوەرۆکی هەر زمانناسییێکی تایبەتیدا ، خاسیەتی زمان بە گشتی هەیە . ڕاستە لە زانستی زمانی کوردیدا دەنگسازی و ڕێزمان جیادەکرێتەوە ، بەڵام ئەمە بۆ زمانناسیی تایبەتی و زمانناسیی گشتییش بە هەمان چەشنە . بەڵێ هەروەها ڕاستە لە هەموو زمانێکدا دەنگەکانی ئاخاتن بەسەر بزوێن و کۆنسۆنانتدا دابەش دەبن ؛ لە نێو بەشەکانی ئاخاوتندا ناو و کردار دیاری کراون .

بەڵام هەر زمانناسییێکی تایبەتی لە ناوەرۆکیدا بەڵگەی ئەوتۆ هەیە ، کە تەنیا بۆ زمانی باس لێکراو ڕاستە و وەنەبێ بۆ هەموو زمانێکی دی بگونجێ .

## - زمانناسیی دەرەکی علم اللغة الخارجي

External linguistics

زمانناسیی دەرەکی وەك دیاردەیێکی لە یەکتر گەیشتن لە زمان دەکۆڵێتەوە و هەر لەبەر ئەوەشە بە کۆمەڵایەتیی زمانیش ناسراوە .

جارجارەش بە زمانناسیی ئەرکی ناودەبرێ ، چونکە لە کۆمەڵایەتی و ئەرکی بیری زمان دەدوێ .

زمانناسیی دەرەکی لە زمانناسیی کۆمەڵایەتی و زمانناسیی تاکایەتی پێكدێ .

- **زمانناسیی کارەکی** **علم اللغة العملي**

Practical lingusitics

- **زمانناسیی گشتی** **علم اللغة العام**

General liguistics

**زمانناسیی گشتی زانیاری لەبارەی هەموو زمانێکەوە دەخاتەڕوو و تیۆریی وایان بۆ ڕۆدەنێ ، کە لە لێکۆڵینەوەی زمانانی جیاوازدا کەڵکیان لێوەربگیرێ ، زمانناسیی گشتی وەك بەشێکی زانست لە بارەی زمانەوە خاوەنی ئەنجامی خۆیەتی : ١) دیاری کردنی سروشتی زمانی و بوونی ؛ ٢) دەست نیشان کردنی بابەتە بنەڕەتی یەکانی زمانناسی و ئاسۆکانی زمان و هەروەها لێکۆڵینەوەی وشەسازی و لێکسیکۆلۆژی .. هتد ؛ ٣ ) خستنە پێش چاوی پێکهاتنی زمانان و دابەش کردنیان ؛ ٤) سازکردنی شێوازی لێکۆڵینەوەی زمانناسی .**

- **زمانناسیی مێژوویی** **علم اللغة التاريخي**

Historical linguistics

= زمانناسیی نێوزەمانی

ب ـ : ڕێزمانی بناغەگری

**لێکۆڵینەوەیە لە پەرەسەندن و گۆڕینی زمان بە تێپەڕبوونی کات و ڕێگە و هۆی ئەم گۆڕینە لە کاتێکەوە بۆ کاتی دۆزینەوە و دەست نیشان کردنی ئەو هۆیانەی کاردەکەنە سەر زمان و دەیگۆڕن .**

**ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە دەبێ لەسەر بناغەی نیشاندانی لایەنە وێکچوو و جیاوازەکانی هەمان زمان لە دوو یان چەند قۆناغێکی جیاوازادا دامەزرابێ .**

- زمانناسیی ناوەکی        علم اللغة الداخلي

Internal linguistics

زمانناسیی ناوەکی لە سیستەمی ناوەوەی زمان دەکۆڵێتەوە ، دانەکان و حاڵەتەکانی نیشان دەدا ، ڕادە و ئاسۆ و پێکهاتنیان دیاری دەکا . بەشە سەرەکییەکانی زمانناسیی ناوەکی بریتی‌یە لە فۆنۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژی و ڕێزمان . ئەمانیش بەسەر بەشی بچووکتردا دابەش دەبن .

- زمانناسیی نێوزەمانی        علم اللغة الدايكروني

Diachronic linguistic

= زمانناسیی مێژوویی

بـ . : زمانناسیی بناغەگری

- زمانناسیی هاوزەمانی        علم اللغة السنكروني

Synchronic liguistics

= . : زمانانسیی وەسفی

بـ .: ڕێزمانی بناغەگری

زنجیرە        سلسلة        Chain

زووان

بـ.: زمان I

- زووانەکی        الأسلي        Lingual

- زووانەچکۆلەیی        اللهوي        Uvular

ژمارە | العدد | Numeral

بەشە ئاخاوتنی ژمارە ئەو کۆمەڵە وشەیەیە کە وا ئەرکی تەجریدی ناوی ژمارە (دوو + سێ = پێنج) دەگەیەنێ ، یان چەندێتی بەسەریەکەوە (هەشت کراس) ، یاخود کەرتێکی شتی دیاریکراوی هاوڕەگەز (سێیەکی گەنمەکە) نیشان دەدات . پلەی شتێك لە ڕێزدا (نهۆمی سێیەم) دیاری دەکا .

ژمارە وەك بەشە ئاخاوتنێك خاوەنی خاسیەتی واتای ژمارەیە بە گشتی ، کە وەك دیاردەیێکی تایبەتی - واتە وەك ژمارە بەتەنیا یان ژمارەی شتێك ... واتای گشتی ئەم بەشە ئاخاوتنە لە خاسیەتی ڕێزمانییدا ڕەنگدەداتەوە . وێڕای ئەوە ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە خاوەنی تایبەتێتییێکی دیاریکراوی وەهایە . کە لە بەشە ئاخاوتنەکانی دی جیادەکاتەوە .

لە باسی ژمارەدا پێویست دەکا جارێکی دیش بەتایبەتی ئەوە دووپات بکرێتەوە ، کە ئەوەی لە دیاریکردنی گرووپی وشەدا گرنگە و لەسەر بنەمای دابەشدەکرێن بەسەر بەشە ئاخاوتنی جیاوازدا ، ئەوەیە کە پێویستە پێوەندی هاوخاسیەتی ڕێزمانی لە نێوان وشەکانی هەر گرووپێکدا هەبێ . وا پێویست دەکا گرنگییێکی تەواو بەم لایەنە بدرێ . لێرەدا پەنجە بۆ ئەوە ڕادەکێشین ، کە هەندێ جار ئەم لایەنە لەبەرچاو ناگرن و تەنیا لە ڕووی خاسیەتی واتاوە بەشە ئاخاوتنی ژمارە جیادەکەنەوە و وەك وشەیێك کە واتای ژمارە بدات یان پلەی ژمارە ڕابگەیەنێ ، دیاریدەکەن . بەوپێیە هەندێ وشە کە واتای ژمارەیان تێدایە ، دەکەونە ئەم بەشە ئاخاوتنەوە . بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جۆرە وشانە تەنیا واتای ژمارەیان تێدایە ، دەنا ژمارە

نین ، بەوێنە ئەگەر تەماشای وشەکانی ((حەفتە)) ، ((سەدە))...و ((حەفت)) ، ((سەد)) بکەین ، دەبینین هەرچەندە لە هەردوو دەستەدا وەك یەك مانای ژمارە هەیە . بەڵام لە ڕووی خاسیەتی ڕێزمانی‌یەوە جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە و سەر بە بەشە ئاخاوتنی جیاوازن .

لە ڕاستیدا لە باری خاسیەتی ڕێزمانی‌یەوە وشەی ((حەفتە))و هەروەها ((سەدە))ش جیاوازییان لەگەڵ هیچ ناوێکی ئاسایی‌دا نی‌یە . چۆن دەوترێ ((چوار پیاو)) ، هەر بەو چەشنەش دەشێ بوترێ ((چوار حەفتە)) ، ((چوار سەدە)) . چۆن دەوترێ (( پیاوێك ، پیاوەکان ...)) بەهەمان جۆر دەشوترێ ((حەفتەیەك ، حەفتەکان .. سەدەیێك ، سەدەکان ..)) .. هتد .

ئەگەرچی لەباری چەندێتی‌یەوە ((حەفتە)) لەگەڵ ((حەفت)) و ((سەدە)) لەگەڵ ((سەد)) وەك یەکن ، بەڵام ((حەفت)) و ((سەد)) ژمارەن و ((حەفتە)) و ((سەدە))ش ناون و لە ژمارەوە بوونەتە ناو .

بۆ پتر ڕوونکردنەوە ، ئەوەش دەڵێین ، کە ژمارە لەباری واتاوە بریتی یە لە تەجریدی ناوی ژمارە بێ ئاڵۆزبوونی واتا . بەوێنە وشەی ((چل)) و ((چلە)) چەندێتی ڕادەگەیەنن ، بەڵام تەنیا وشەی ((چل)) دەکەوێتە نێو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە . هەرچی ((چلە))یە سەر بە بەشە ئاخاوتنی ناوە . وشەی ((چل)) ژمارەیە ، چونکە واتای تەجریدی ژمارەی تێدایە . ئەم وشەیە یەك مانای هەیە و ماناکەی لە چوارچێوەی نیشاندانی ژمارەیێك لە ژماردنی دانەی دیاری‌کراودایە . وشەی ((چلە)) ، ئەگەرچی دیسان واتای چەندێتی هەڵگرتووە ، بەڵام مانای لە سنوورێکی بەرین و فراواندا پێوەندی بە زۆر شتەوە هەیە : ١) بە ژماردنی ((چل)ەوە ، ٢) تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر لەدایك‌بوونی منداڵێکدا یان مردنی یەکێکدا یان هێنانی بووکێکدا ، ٣) چل ڕۆژ لە ناوەڕاستی هاوین و زستاندا ... هتد . ڕاگەیاندنی واتای چەندێتی لە وشەی ((چلە))دا بێ‌بەشە لەو خاسیەتی تەجریدەی لە ژمارەدا هەیە .

ژمارە کاتێ لەگەڵ ئەو جۆرە ناوانەدا دێ . کە لە ژمارەوە وەرگیراوە دەبێتە دیارخەری . وەك : چوار حەفتە ـ حەفتەی چوارەم ، حەوت سەدە ـ سەدەی حەوتەم ...

لە زمانی کوردیدا دەتوانین سێ جۆر ژمارە دیاری بکەین :

١ـ ژمارەی بنجی .

٢ـ ژمارەی پلەیی .

٣ـ ژمارەی کەرتی .

## ـ ژمارەی بنجی العدد الأصلي Radicl number

ژمارەی بنجی کە دەشێ ژمارەی چەندییشی پێ بوترێ ، ئەو ژمارانە دەگرێتە خۆ ، کە وا بە گشتی لە تەواوی دانەکاندا تەجریدی ژمارە رادەگەیەنێ (دوو کەرەت دوو چوار) ، یان ژمارەی دیاریکراوی شتی هاورەگەز نیشان دەدا (شەش کتێب) ...

تایبەتێتی وشەسازیی ژمارەی بنجی پێوەندە بە واتا لێکسیکییەکەوە؛ . ژمارەی بنجی خاوەنی حاڵەتی تاك و کۆ و ناسیاوی ... نییە ، چونکە لە مانایدا ئەو دیاردەیە هەیە . ژمارەی بنجی هەروەها دۆخییشی نییە ، چونکە واتای شت ناگەیەنێ . نەبوونی حاڵەتی تاك و کۆ و ناسیاوی و دۆخ بەشە ئاخاوتنی ژمارە لە بەشە ئاخاوتنی ناو جیادەکاتەوە . بەپێی پێوەندیی و وشەرۆنان لە نێو ژمارەی بنجیدا ، وشەکانی : یەك ، دوو ، سەد ، هەزار ... پتر دیار و چالاکن .

ژمارەی بنجی ئەگەر بەبێ ناو بەکاربهێنرێ ، ئەوە تەنیا ناوی ژمارەیێك رادەگەیەنێ ، بەلام کە لەگەڵ ناوێکدا دێت ، ئەوە دەتوانی ببێتە دیارخەری چەندێتی ناوەکە و ناوەکەش دەبێتە دیارخەری ژمارەکە : (یەك دار ؛ هەزار منداڵ) ژمارە لەم بارەدا نە دەبێ بە ئاوەڵناو و نە

دەشتوانیٚ ببیٚ بە دیارخەری ئاوەڵناو . ئاوەڵناویش نابیٚ بە دیارخەری شتی ژمارەکە .

تایبەتیٚتی ژمارەی بنجی لە نووسیندا ئەوەیە ، کە دەشیٚ بە ڕەقەمیش دەربڕریٚ ، وەك (چل ـ ٤٠) ، (سەد ـ ١٠٠) ، بەلاٚم هەرچی ئەو ناوانەیە ، کە واتای چەندیٚتی‌یان تیٚدایە ، وەك : (چلە) ، (حەفتە) ، (سەدە) ... ناشیٚ بە ڕەقەم نیشان بدریٚن . ئاوەڵناو دەتوانیٚ ببیٚتە دیارخەری ناوی چەندیٚتی ، بەلاٚم ناتوانیٚ ببیٚ بە دیارخەری ژمارەی بنجی .

وشەی ((یەك)) ، جگە لە واتای چەندیٚتی ژمارە : ( یەك ساڵ ؛ یەك ژن ...) ، دەتوانیٚ واتای دیش بگەیەنیٚ . بۆ نموونە :

١)بە واتای ناو . وەك ((یەك لە ئیٚمە دەرناچیٚ)) ؛ ٢) بە واتای جیٚناو ـ ئاوەڵناو ، وەك ((ئیٚمە پیٚکەوە یەك قوتابخانەمان تەواوکردووە)) ؛ ٣) بە واتای جیناوی دیار ، وەك ((من و ئازاد لە یەك ڕیٚگاوە هاتووین)) ...

وشەی ((هەردوو ، هەرسیٚ ...)) لە ژمارەی بنجی ((دوو ، سیٚ ...)وە نزیکن و هەرهەمان ئەندازە ڕادەگەیەنن . بەلاٚم واتای بنەڕەتیی ((هەردوو ، هەرسیٚ ...)) ڕاگەیاندنی چەندیٚتی نی‌یە ، بەڵکو تەنیا پەنجە بۆ نیشاندانی چەندیٚتی ڕادەکیٚشیٚ . وشەی ((هەردوو ، هەرسیٚ ...)) ناکەونە نیٚو بەشە ئاخاوتنی ژمارەوە ، بەڵکو سەر بە جیٚناون . ئەم جیٚناوانەش کە لە ژمارەی بنجی و جیٚناوی (( هەر )) پیٚکهاتوون ، واتای کۆکردنەوە دەگەیەنن ، وەك :

هەردوو ژنەکە ڕۆیشتن .

هەرسیٚ کتیٚبەکەم خویٚندەوە .

## ـ ژمارەی پلەیی العدد الرتبوی Ordinal number (numeral)

ژمارەی پلەیی بەو وشانە دەوتریٚ ، کە لە ژماردندا ڕیزی شتی هاوڕەگەز ڕادەگەیەنن . وەك : (پرسیاری یەکەم ؛ کتیٚبی دووەم ؛ شەوی سیٚیەم ؛ کوڕی چوارەم ...) .

لە زمانی ئاوێستادا بۆ ژمارەی پلەیی ((یەکەم)) ، ئاوەڵناوی (( فرە ـ تەرە)) بەکاردێ ، کە واتای ((پێشین ـ (یەکەمی دوان) )) دەگەیەنێ .

((فرە ـ تەمە))ش واتای (یەکەمی فرە ، یەکەمی کۆمەڵێکی زۆر ) دەدات .
ئەمە بە زمانی هیندیی کۆن دەبێتە ((پرە ئەمەس)) .

لە زمانی ئاوێستادا دە ژمارەی سەرەتای پلەیی بە یاریدەی پاشگری جیاواز سازدەبن . بەوێنە :

دڤیتیە ـ دووەم

تریتیە ـ سێیەم

ك(تووریە) ـ چوارەم

بنکثە ـ پێنجەم

خشتڤە ـ شەشەم

هەبتەثە ـ حەوتەم

ئەشتەمە ـ هەشتەم

نەڤەمە ـ نۆیەم

دەسەمە ـ دەیەم

بۆ ناوی ژمارەی پلەیی (یازدەیەم) تاکو (نۆزدەیەم) ، ناوی ژمارە بنجی‌یەکە بەکاردێنرێ و وەك جۆری قەدی (ا)دار گەردان دەکرێ . وەك :

یازدە ـ پەنچەدەسە

یازدەیەم ـ پەنچەدەسە

لە زمانی هیندیی کۆندا ژمارە پلەیی‌یەکان ئەم شێوانەیان هەیە :

دڤیتیە ـ دووەم

تریتیە ـ سێیەم

توریە ـ چوارەم

پەنچەمە ـ پێنجەم

شەشثە ـ شەشەم

سەپتەتە ـ حەوتەم

ئەشتەمە ـ هەشتەم

نەڤەمە ـ نۆیەم

دەچەمە ـ دەیەم

ئەگەرچی لە زمانی ئاوێستا و زمانی هیندیی کۆندا هەندێ ژمارەی پلەیی بە جۆری جیاواز سازدەبن ، بەلام لە نموونەکاندا ئەوەش بەدی دەکەین ، کە بەشێکی زۆریان بە یارمەتیی نیشانەی (ـ ەمە)ەوە پێکهاتوون . هەرچی ئەو نیشانەیەی ( ـ ەمە )یشە تا دێ پتر پەرە دەستێنێ و زیاتر بەکاردێنرێ . بەوێنە ئەگەر لە زمانی ئاوێستا و زمانی هیندیی کۆندا لە پێکهاتنی ژمارەی (هەشتەم ، نۆیەم ، دەیەم ...)دا بەشداریی کردبێ ، ئەوەتە لە زمانی فارسیی کۆندا بە ئاشکرایی چووەتە سەر ژمارەی (حەوت)یش... ((حەوتەم)) لە زمانی ئاوێستادا ((هەپتەڤە))یە و لە زمانی هیندیی کۆندا ((سەپتەتە))ن ، بەلام لە زمانی فارسیی کۆندا ((هەپتەمە))یە

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ژمارەی پلەیی بە یاریدەی نیشانەی (ـ وم) سازدەبێ ، وەك :

چەهاروم ـ چوارەم

پەنجوم ـ پێنجەم

شەشوم ـ شەشەم

لەگەڵ ئەمەشدا بۆ ژمارەی (یەکەم) و (دووەم) و (سێیەم) ، بەم وشانەش دەوترێن :

فرەتوم ـ یەکەم

دیت ـ دیتیکەر ـ دووەم

سیتیکەر ـ سێیەم

لە زمانی کوردیدا ژمارەی پلەیی بەم ڕێگایانەی خوارەوەدا پەیدا دەبێ :

یەك ـ بە یاریدەی نیشانەی ( ـ ەم) ، کە دەخرێتە سەر ژمارەی بنجی ، وەك :

یەك + ەم = یەکەم

دوو + ەم = دووەم

......

دە + ەم = دەیەم

دوو ـ بە هاریکاری نیشانەی ( ـ ەمین) ، کە ئیزافەی سەر ژمارەی بنجی دەکرێت ، وەك :

یەك + ەمین = یەکەمین

دوو + ەمین = دووەمین

......

دە + ەمین = دەیەمین

## ـ ژمارەی پێکەوەبەستراو الاعداد المترابطة

Additive numeral

ژمارەی پێکەوەبەستراو لە یەك‌کەوتنی چەند ژمارەیەك پێك دێت کە بە یاریدەی (و)ی پێوەندی پێکەوە دەبەسترێن . وەك :

سەد و چوار ؛ سەد و بیست و حەوت ...

ئەم جۆرە ژمارەیە لە ئەنجامی یەکگرتنی ژمارەی سادە و ناسادەدا دروست دەبێ بە پێی پلە . وەك (هەزار و سێ‌سەد و چل و شەش ) ... ، کە ڕێگای کۆکردنەوەیە .

## ـ ژمارەی چەندی

ب . : ژمارەی بنجی

- ژمارەی داڕێژراو العدد المشتق Derivtional numeral

ب . : وشەی داڕێژراو

وەك : حەفتا ، هەشتا ...

- ژمارەی سادە العدد البسيط Simple numeral

ب . : وشەی سادە

وەك : یەك ، دوو ، سێ .. دە ، بیست ، سی ، چل ، سەد ، هەزار ...

- ژمارەی کەرتی العدد الكسري Fraction numeral

ژمارەی کەرتی ئەندازەی کەرت ڕادەگەیەنێ ـ واتە چەندێتی ئەم یان ئەو بەشی دانەکە نیشان دەدا و دەردەخا ، وەك ( سێ یەك ، چوار یەك ... ) . لە پێکهاتنی ژمارەی کەرتی‌دا ناوی پارچەکانی لە واتای پلە بێبەرن .

لە زمانی کوریدا ژمارەی کەرتی ( سێیەك ، چواریەك ... ) ، کە جۆری هەرە دیار و باون ، وشەی لێکدراون و لە دوو ژمارەی بنجی پێکهاتوون : ( سێ + یەك ؛ چوار + یەك ... ) . لە دیالێکتی ژووروشدا بە هەمان شێوە دەوترێ ( سێیەك ، چاریەك ... ) . وێنەی ئەم پێکهاتنە لە زمانە ئێرانی‌یەکانی دی‌یشدا بە هەمان جۆر بەرچاو دەکەوێ . بەوێنە لە زمانی فارسیی نوێدا دەوترێ : (( چهاريك ، صديك ... ) و بە زمانی بلووجیش ( سەیەك ) هتد .

ئەم جۆرە پێکهاتنەش تەنها لەو ژمارانەدا ڕەنگ دەداتەوە . کە ژمارەی دووەمیان (یەك) بێت ... بەلاّم ئەگەر ژمارەی دووەم ژمارەی (یەك ) نەبێت ، ئەوە ژمارە کەرتی‌یەکە وەك وشەییێکی لێکدراو یەکدا ناوە ، بەڵکو لە شێوەی دەستەواژەیەکدا دەردەکەوێ ، کە دەشێ دەربڕینی وەسفی پێبوترێ . بۆ سازبوونی ئەمەش لە زمانی کوریدا چەند حاڵەتێك بەرچاودەکەوێ :

بـه يارمــەتيى پێشـبـەندى (لـە) . ئـەميش بـە دوو چەشــن دەبيــنرێ

أ) پێشبەندى ( لە ) لە سەرەتاى دەستەواژەكەوە دێت ، بە واتاييێكى دى لە پێش ژمارەى يەكەمەوە دەبێ . ژمارە گەورەكە لە پێشدا دێت و بە دوايدا ژمارە بچووكەكە ـ واتە ژمارە گەورەكە دەبێتە يەكەم و بچووكەكەش دووەم .

وەك :

لە دە پێنج

لە سەد دە

لە هەزار دوو

... هتد .

زۆر جار لەم پێكهاتنەدا دوو دياردە سەرهەڵدەدەن :

يەك ـ

ژمارەى يەكەم نيشانەى (ان)ى كۆ وەردەگرێ . وەك :

لە دەيان پێنج

لە سەدان دە

لە هەزاران دوو

دوو ـ

بۆ تـەواوكردنى پێشـبەندى (لـە) پاشـبەندى (دا) دەچێتـە سـەر كۆتـايى ژمارەى يەكـەم و لـە شـێوەى كـورتكـراوەدا ، واتـە وەك (ا) بەدەردەكـەوێ .

وەك :

لە دەدا (دەيا) پێنج

لە سەددا (سەدا) چل

لە (هەزارا) دوو

ئـەم دوو دارشــتنە لــە ديــالێكتى كرمــانجيى ژووروودا بەهــەمان شـێوە دەبينرێ ، تەنيا ئەوەندە هەيە (ژ) لە بريتى (لە) بەكاردێنرێ و ژماەى يەكەم هەميشە نيشانەى كۆى (ان) يان (ا) وەردەگرێ . وەك :

ژ پێنجان سێ

ژ دەهان چار

لەم پێکهاتنەدا گەلێ جار لە دیالێکتی خوارووددا وشەی ( بەش ، کەرت ) و لە دیالێکتی ژووروودا وشەی ( پار ، سەلەف ...) بەشداری دەکەن وەك :

لە شەش بەش سێ بەش

لە دە کەرت چوار کەرت

ژ چار پارا سێ پار

ژ حەفتا سێ پار / ژ حەفت پارا سێ

ژ سەدان نەه سەلەف

دەه سەلەف ژ سەدا

.... هتد .

ب) لە سەرەتادا بچووکەکە و لە ناوەڕاستدا پێشبەندی (لە) و لە کۆتاییدا ژمارە گەورەکە . وەك :

پێنج لە سەد

سەد لە هەزار

هەندێ جار لەم پێکهاتنەدا ئەو دیاردەیەش سەرهەڵدەدا ، کە دوا ژمارە ، بەواتایێکی دی ژمارە گەورەکە نیشانەی ( ـ ان )ی کۆ وەردەگرێ :

یەك لە چلان

٢ـ بە هاریکاریی وشەی ( لەسەر ) ، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ژمارەکەوە . هەرچی ژمارەکانیشە ، بچووکەکەیان لە سەرەتاوە دێت و لە کۆتاییدا ژمارە گەورکە . وەك :

دوو لەسەر پێنج

چوار لەسەر هەشت

پێنج لەسەر بیست

تێبینی :

ئەم چەشنە دەربڕینە و دەربڕینی جۆری (ب)ی خاڵی یەکەم پتر لە بیرکاریدا باوە . بەوێنە :

کە دەوترێ (پێنج لە سەد ) مەبەست ( ٥ ٪ ) .

کە دەوترێ ( سەد لە هەزار ) مەبەست (١٠٠٪) .

.......................

کە دەوترێ (دوو لەسەر پێنج مەبەست (٢/٥ )ە .

کە دەوترێ (چوار لەسەر هەشت ) مەبەست (٤/٨) ە .

.......................

٣ـ بە یاریدەی نیشانەی ئیزافەی (ی) ، کە بە ژمارەی یەکەمەوە دەلکێ . لەم بارەدا لە سەرەتادا وشە گەورەکە دێ و ئەنجا بە دوایدا وشە بچووکەکە . وەك :

سەدی هەشت

سەدی چوار

... هتد .

## ـ ژمارەی لێکدراو العدد المركب

Compound numeral

ب . : وشەی لێکدراو

وەك : یازدە ، دوازدە ... چواردە ، نۆزدە .

دووسەد ، چوارسەد ... نۆسەد

کۆمەڵی یەکەمیان ـ (یازدە ...) گۆڕانی فۆنەتیکی‌یان بەسەردا هاتووە و بە ڕێبازی کۆکردنەوە دروست بوون . هەرچی کۆمەڵی دوومیانە ـ (دووسەد ...) هیچ گۆڕانێکی فۆنەتیکی‌یان بەسەردا نەهاتووە و لە ڕێگای لێکدانەوە سازکراون .

ژێدەنگ

بڕ : دەنگەژێ

ژێرخان البنية التحتية ، اساس Basis

ژێربێژی المنطق Logic

- س -

سازان التكيف Adaptation

سەرخان البنية الفوقية Superstructure

سەرکار

بڕ : نیهاد

**سەری زمان** **اسل اللسان ، مقدمة اللسان** Front of Tongue , Tip of the Tongue

= **پێشەوەی زمان ، نووکی زمان**

**سوورِ**

**بـ . : خول**

**سی** **الرئة** The lung

**سیستەم** **النظام** Systeme

**سیستەم - بریتی‌یە لە یەکێتیی کۆمەڵە ماکێکی جۆر و هەل مەرج وێکچوو .**

**بە هیچ چەشنێك ناشێ واتای سیستەم بگۆڕێ بە واتای ڕێکهێنانی ڕوخساری میکانیکی . هەر بەم جۆرەش زمان کە ئامێری لە یەکتر گەیشتن و پێوەندی بەستنە لە ئامێری بەرهەم جیادەبێتەوە . لە ڕووی ڕوخسارەوە ڕێکهێنانی چۆنەکی هەر ماکێك بە سەرجەمەوە بەند نی‌یە . ( ئەگەر کورسی چوار - چوار یان هەشت - هەشت ڕیز بکەین و گشتیان ببن بە ٣٢ یان ٦٤ کورسی ، ئەوە هەر کورسی‌یێك وەك ئەو شێوەیە دەمێنێتەوە ، ئەگەر بە تەنیا دابنرایە ) .**

**ئەندامەکانی سیستەم بە پێچەوانەوە پێکەوە بەندن و سەرجەم هاو هەل و مەرجن ، بۆیە ژمارەی ماکەکانی و پێوەندیی نێوانیان لە هەر ماکێکی ئەو سێستەمەدا ڕەنگ دەداتەوە . خۆ ئەگەر ماکێك بمێنێتەوە ، ئەوە ئەو سیستەمە پووچ دەبێتەوە . بەوێنە سیستەمی گەردان کاتێ دەبێ ، کە هیچ نەبێ بە لایەنی کەمەوە دوو دۆخ هەبێ (بە نموونە لە جێناوی he – him ی**

ئینگلیزی‌دا) . سیستەمی گەردان لەباری بوونی تاکە یەك دۆخدا پەیدا نابێ .
بە نموونە لە زمانی کوردیدا تەنیا کاتێ کرداری تێپەڕ دەبێ ، کە لەو سیستەمی ڕێزمانەدا کرداری تێنەپەڕ هەبێ .

سیستەمی پێکهاتنی ڕیزە جیاجیاکانی زمان کار لە یەکتر دەکەن و سیستەمێکی گشتیی ئەو زمانە ساز دەکەن .

**سیستەمی زمان** **نظام اللغة** Systeme of a language

**سینانترۆپ** Sinanthropos

ب . : مەیموونی سەرەتایی

**سینتاکس**

ب . : ڕستەسازی

## - ش -

**شاڕستە**

ب . : ڕستەی سەرەکی

| English | Arabic | Kurdish |
| --- | --- | --- |
| Spectrum | طيف | شەبەنگ |
| Sound spectr | طيف الصوت | ـ شەبەنگی دەنگ |
| Sectrograph | مرسمة الطيف | شەبەنگنووس |
| Wave | موجة | شەپۆل |
| Sound wave | موجة صوتية | ـ شەپۆلی دەنگ |
| Jaw , Maxilla | الفك | شەویلە |
| Style | الاسلوب | شێواز |
| Styleistics | علم البلاغة | شێوازناسی |
| | | ١ـ شێوە<br>بـ . : دیالێکت |
| Form | الشكل | ٢ـ شێوە |
| | | شێوەگۆڕ<br>= خۆگۆڕ |
| Variation | تغير ، الانحراف | شێوەگۆڕی |

شێوەناسی   دراسة الملامح   Physiognony

شێوەی فۆنێم

بـ . : ئەلەفۆن

ـ شێوەی فۆنێمی پەیوەند   نمط الفونيم الشرطي
Dependent (conditimned) Allophone

شیکردنەوە

بـ . : لێکدانەوە

شیمانە   الاحتمال   Probability

ـ ف ـ

فەرمان   الأمر   Imperative

فەرهەنگ قاموس ، معجم Vocabulary , Dictionary

فەرهەنگ ـ ئەو کتێبەیە ، کە وا وشەی تێدا تۆمارکراوە . جگە لە ڕیزکردنی وشە ، هەروەها لێی کۆڵراوەتەوە و مانای ڕوون کراوەتەوە و شیکراوەتەوە و زانیاری دەربارەی چۆنێتیی نووسینی و بە دەمداهاتنی و پەیدابوونی ... دراوە

هەرچەندە فەرهەنگ جۆری زۆرە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ دوو جۆری سەرەکی جیابکرێتەوە : یەك ـ فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی ؛ دوو ـ فەرهەنگی فیلۆلۆژی . فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی سەبارەت بە ڕووداو و دیاردە و خەڵك ... هتد دەدوێ . هەرچی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە لە وشە دەکۆڵێتەوە ، واتە وشە کە دانەی زمانە ، کەرەستەی سەرەکی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە .

لە فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیدا خاسیەتی ڕێزمانیی و نیشانداتی چۆنێتیی بەکارهێنانی و پەیدابوونی و دروستبوونی و چۆنێتیی دەوری لە ڕستەدا ... بەرچاو ناکەوێ ، بەڵکو کاری سەرەکی لە لێکدانەوەی وشەدا ، ڕوونکردنەوەی ئەو دیاردەیەیە ، کە وشەی لێوە هاتووە ... بەلام لە فەرهەنگی فیلۆلۆژیدا بە شێوەیێکی سەرەکی ، گرنگی بە وشەکە خۆی دەدرێ و مانای لێك دەدرێتەوە و حاڵەتی ڕێزمانی دەنووسرێ و سەرچاوەی پەیدابوونی نیشان دەدرێ و چۆنێتی بەکارهێنانی بەدیار دەخرێ .

فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیی جۆری زۆرە : ئینسکلۆپیدیی گەورە ؛ ئینسکلۆپیدیی بچووك ؛ ئینسکلۆپیدیی پزیشکی ؛ ئینسکلۆپیدیی تەکنیکی ... هتد .

فەرهەنگی فیلۆلۆژی بەپێی مەبەست و شێوەی لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی کەرەستەی زمان دەتوانرێ بەسەر چەند جۆرێکدا دابەش بکرێ :

ئەو فەرهەنگانەی بە کەرەستەی زمانی زگماك ، مانای وشەی زمانێکی بێگانە لێك دەدەنەوە ، یاخود بەپێچەوانەوە ـ واتە بە کەرەستەی زمانێکی بێگانە ، مانای زمانی زگماك لێك دەدەنەوە . ئەم جۆرە فەرهەنگانە ، چۆن بۆیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دی بن ـ واتە دوو زمان بن ، هەروەها بۆشیان هەیە لە زمانێکەوە بۆ چەند زمانێکی دیکە بن ـ واتە فرەزمان بن .

لەتەك ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها فەرهەنگ هەن ، کە وشەی زمانێك بە کەرەستەی هەمان زمان لێك دەدەنەوە . ئەم فەرهەنگانەش چەشنی جیاوازیان هەیە .

**ـ فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی**

ب . : فەرهەنگ

**ـ فەرهەنگی فیلۆلۆژی**

ب . : فەرهەنگ

| | | |
|---|---|---|
| **فەرهەنگنووس** | **مؤلف معاجم (قواميس)** | Lexicographer |
| **فەرهەنگنووسی** | **علم وضع القواميس ، علم تصنيف المعاجم** | Lexicography |
| **فرەواتا** | **كثير المعاني ، تعدد المعاني** | Polysemantic |
| **فراژۆ** | **النمو ، التطور** | Development progress |

فرمان

ب . : کردار

**فریز** **العبارة (العقدة)** Phrase

= دەستەواژە

فریز بەو دانە سادە سینتاکسییە دەوترێ ، کە لە دوو یاخود چەند وشەیێکی سەربەخۆ پێکهاتبێ و ڕێزمان بە یەکەوەی بەستبێ .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر فریز هەیە :

١ـ فریزی بەرەڵلاّ

٢ـ فریزی گیراو

فریزی بەرەڵلاّ ئەوەیە ، کە بە ئاسانی و بەپێی پێویست دابڕێژرێ ، یاخود لە ڕستە دەربهێنرێ . بەوێنە لە ڕستەی ((تۆ دیمەنی بەهار و جەژنی نەورۆزت دیوە))دا دەتوانرێ دوو فریزی بەرەڵلاّ : ((دیمەنی بەهار)) و ((جەژنی نەورۆز)) وەربگیرێ .

هەرچی فریزی گیراوە پێی دەوترێ (فریزیۆلۆژی ، ئیدیەم ، ئیدیۆم) . کاتێ لە یەکگرتنی هەندێ وشەدا واتای تایبەتی پەیدا دەبێ ، ئەوە ئەو جۆرە فریزانە دەبنە (فریزیۆلۆژی ...) ـ واتە پێکهاتنی ئاڵۆز ، وەك (( شووڵ لێ هەڵبڕین)) ؛ ((کای کۆن بەباکردن)) ؛ ((برین کولانەوە)) ... هتد . چونکە ئەمانە لە سیستەمی زماندا بە مانایێکی دی دێن ـ واتە مانا ڕاستەوخۆکە ناگەیەنن .

خاسیەتی سەرەکیی فریزی گیراو ، ئەوەیە کە بە شێوەیێکی بنەڕەتی لەگەڵ فریزی بەرەڵلاّدا جودایە و لە هەمان کاتدا لە وشە نێزیك دەبێتەوە . فریزی بەرەڵلاّ لە کاتی ئاخاوتندا دروست دەبێ ، هەرچی فریزیۆلۆژییە لە کاتی ئاخاوتندا دروست نابێ ، بەڵکو دانەی پێکەڵ و ئامادەی زمانە .

بەوێنە . لە کاتی ئاخاوتندا کە دەوترێ : (( کامەران هێندەی ڕست ، سەرم ئاوسا )) . ئەوە لەم ڕستەیەدا (( سەرم ئاوسا )) ، کە فریزیۆلۆژی (ئیدیەم . فریزی گیراو))ە وەنەبێ لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا دروستبووبێ ، بەڵکو لە شێوەیێکی ئامادە و پێکەڵدا لە زماندا هەبووە و بەر لەم کاتە داڕێژراوە . پێویست بە بیری خاوەنی ڕستەکەیدا هێناوەتەوە و ئەویش وەك کەرەستەیێکی ئامادە هەستی خۆی پێ دەربڕیوە ... هەرچی فریزی بەرەڵلایە لە کاتی ئاخاوتندا لە وشەی جودا دادەڕێژرێ . بە نموونە ، کە دەوترێ : (( منیش پاش چەند ساڵێك تووشی لاوێکی ڕووناکبیر هاتم)) . ئەوە لەم ڕستەیەدا ((لاوێکی ڕووناکبیر)) ، کە فریزی بەرەڵلایە ، لە کاتی ئەم ئاخاوتنەدا لە وشەی جودا دروستبووە .

لێرەدا پرسیارێك دێتە گۆڕێ : بۆچی کێشەی فریزی گیراو لە بەشی لێکسیکۆلۆژیدا تەماشا دەکرێت ؟ ... ئاشکرایە ، کە فریز پارچەیەکە لە ڕستە ـ مەفهوومی سینتاکسییە و ئەمە ڕاستە و بەم پێیە دەبێ فریز لە بەشی سینتاکسدا لێی بکۆڵرێتەوە . بەلام کێشەی فریزی گیراو (فریزیۆلۆژی) لە سنووری سینتاکس دەردەچێ و لە لێکسیۆلۆژی نزیك دەبێتەوە . زۆر جار دەبینین ، کە بە مانا و واتا وەك یەك وشەیە . بە وێنە ، فریزی گیراوی : ((ئەسپێ لە گیرفانیدا سەوزەڵە خانم دەڵێ)) ـ بە مانا و واتای وشەی ((لات . هەژار)) دێت . یاخود ئیدیەمی {(نانی لەسەر ساج سووتاوە)) ـ بەرانبەر بە وشەی ((پەلەکەر)) دەوەستێ ...هتد .

لە زمانی کوردیدا فریز هەن ، کە هەمیشە بەرەڵلان ، وەك ((کچی جوان)) ؛ ((پیاوی ئازا)) ؛ ((کتێب خوێندنەوە)) ... فریزیش هەن ، کە هەردەم گیراون . وەك : ((گوڵۆڵەی کەوتە لێژی)) ؛ ((لووت تێژەنین)) ؛ ((دایە کێو)) ... هتد .

هەروەها فریزیش هەن ، کە دەکرێ بەرەڵلاش و گیراویش بن . ئەمەش پێوەندی بە مانا و مەبەست و بەکارهێنانیانەوە هەیەو لە ڕستەدا دەردەکەوێ . بەوێنە ، فریزی : ((شووڵی لێ هەڵبڕی)) ـ مانا

ڕاستەوخۆکەی ، ئەوە دەگەیەنێ کە ((یەکێك شوولٚ لت یەکێك هەڵبڕێ)) .
بەم پێیە ، ئەمە فریزێکی بەرەڵاڵیە . بەڵام بە مانای تیانی ـ واتە ((لە تامی دەرکرد ؛ لە ڕادەی تێپەڕاند)) ـ دەبێ بە فریزێکی گیراو . یاخود فریزی ((دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکا)) ـ مانا ڕاستەوخۆکەی ئەوە نیشان دەدا ، کە (( یەکێك دۆ بهێنێ و لەگەڵ دۆشاودا تێکەڵی بکا)) ئەمە فریزێکی بەرەڵاڵیە .
هەرچی مانای تیانی ئەم فریزەیە بۆ ئەوە دەوترێ ، کە ((یەکێك لە وتووێژێکدا ، یاخود لە کارێکدا ... تووڕە دەبێ و قسەی نابەجێ دەکا و لە ڕادەی تێدەپەڕێنێ)) ـ بەم مانایە فریزێکی گیراو دروست دەبێ .

بەپێی قوتابخانە ڕێزمانییە نوێیەکان ، بەتایبەتیش ڕێزمانی زێنەکی ـ گەشتەکی (بەرهەمهێنان و گواستنەوە) ، ڕۆنانی ڕستە ، کە گەورەترین دانەی ڕستەسازییە ، واتە پێکهاتە و نابێتە پێکهێنی دانەیێکی لە خۆی گەورەتر ، لە کاتی شیکردنەوەیدا بۆ دانە پێکهێنەکانی یەکەمجار ، ڕستەکە دابەش دەبێ بۆ ڕۆنانی پێکهێنی ڕاستەوخۆ . بەم پێکهێنە ڕاستەوخۆیانە دەڵێن فریز . دواتر ئەمانەش دابەش دەبن بۆ ڕۆنانی پێکهێنی ڕاستەوخۆی دی ، کە وشەکانن . ئەمانەش بۆ مۆرفێم و هەروەها تا دەگاتە قووڵایی ، واتە دوا پێکهێن ، کە ئیتر لەمە بچووکتر ناکرێنەوە .

فریز لە ڕووی ڕۆنانەوە لە ڕستە بچووکترە ، بەوەی کە شوێنی ڕۆنانێکی نزمتر لە ڕستەدا دەگرێت لە ڕیزبوونی هەرەمیدا . لە وشەش گەورەترە بەوەی کە وا شوێنی ڕۆنانێکی بالاتر لە وشە دەگرێت . کەواتە فریز پێکهێنێکی ناوەندییە و دەکەوێتە نێوان وشە و ڕستە . بە واتایەکی دی ، ڕستە لە فریز پێك دێت و فریزیش لە وشە و مۆرفێم . بۆیە ئەگەر لە ڕوانگەی ڕیزبوونی هەرەمییەوە نەڕوانینە ڕۆنانی پێکهێنەکان ، بەتایبەتیش فریز ، ئەوا یەکێك لە خاسیەتەکانی فریز ، ئەوەیە کە وا کورت دەکرێتەوە بۆ تاکە وشەیەك ، یان فراوان دەکرێت ، بە هۆی کەرەستەی ترەوە . یان جاری وا هەیە ، فریزێك لەگەڵ فریزێکی دیدا یەك دەگرێت و فریزێکی لێکدراو پێکدێنن . بەوێنە :

١ـ کوڕ هات

٢ـ هەر هەموو کوڕانی زیرەك و ئازا هاتن

سادەترین ڕێگا بۆ پێکهێنانی فرێز بریتییە لە لێکدان (بە زاراوەیێکی تەکنیکی واتە یەکگرتن)ی دوو کاتیگۆری . مەبەست لە کاتیگۆرییش پۆلەکانی دەربڕینە ، واتە بەشەکانی ئاخاوتنە ، کە هەر یەکەیان خاوەنی کۆمەڵێك خاسیەتی وشەسازی و ڕستەسازی و واتاسازین .

مەبەست ئەوەیە ، کە ئەو بۆچوونە لە وشەوە دەست پێ‌دەکات و بۆ ڕۆنانی گەورەتر دەچێت ، کە فرێز و ڕستەیە ، بۆ نموونە ، بەلایەوە فرێز بریتییە لە یەکگرتنی دوو وشە ، پارچە (لاڕستە)ش بریتییە لە یەکگرتنی دوو فرێز .

سەبارەت بە دیاریکردنی فۆرمی ئەو پێکهێنە ڕاستەوخۆیانەش ، واتە (جۆرەکانی فرێز یان پۆلەکانی فرێز) ، هەر دەبێ بە هۆی کاتیگۆرییەکانی وشەوە بێت ، واتە بەپێی بەشە ئاخاوتنەکانی وەك (ناو ، ئاوەڵناو ، ئاوەڵکردار ، کردار ...) .

واتە ئەو کاتیگۆرییانەی وشە لە کاتی شیکردنەوەی ڕستەیەك بۆ دانە پێکهێنەکانی بەپێی ڕیزبوونێکی هەرەمی ، ئەگەر کەوتنە ڕۆنانێکی بالاتر لە وشە ئەوا پێیان دەوترێت ( فرێزی ناوی ، فرێزی ئاوەڵناوی ، فرێزی کرداری ...) .

- فرێزی ئاوەڵکاری

ب . : فرێزی ئاوەڵکرداری

- فرێزی ئاوەڵکرداری العبارة الظرفية Adverbial phrase

= فرێزی ئاوەڵکاری

- فریزی ئاوەڵناوی العبارة الوصفية Adjective phrase

- فریزی بەرەڵلاّ

ب . : فریز

- فریزی کاری

ب . : فریزی کرداری

- فریزی کرداری العبارة الفعلية Verb phrase

= فریزی کاری

فریزی کرداری پێکهێنێکی ڕاستەوخۆی ڕۆنانی ڕستەیە و ئەرکێکی گەورە و دیاریکراو لە سازدانی ڕستەدا دەبینێ . فریزی کرداری لە جۆرەکانی دی فریز گرنگترە و لە بواری بینای ڕستەدا ناکرێ پشت گوێ بخرێ . بە بەڵگەی ئەوەی ، کە دەشێ فریزەکانی دی ، وەك (ناوی و بەند) یان (کارا و بەرکار) لە ڕۆنانی سەرەوەی ڕستەدا دەرنەکەون و پاشماوەیان لە نێو فریزی کرداریدا بەجێبمێنێت و خوێنەر یان گوێگر بە هۆی فریزە کرداری‌یەکەوە لە ڕۆنانی ژێرەوەی ڕستەکە بگات . بەڵام ئەم دیاردەیە بەسەر فریزی کرداریدا پیادە نابێت . واتە ڕستە هەرگیز بێ بوونی ئەم فریزە لە زمانی کوردیدا دروست نابێ .

فریزی کرداری لە زمانی کوردیدا خاوەنی پێکهاتەیێکی ئاڵۆزی ناوەکی و دەرەکییە و شێوەی جیا جیا وەردەگرێت . فریزی کرداری یان پێکهاتووە لە کردارێك ، کە ڕەگەزێکی سەرەکییە و بوونی لە ڕۆنانەکەدا ناچارییە و ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت . بەنموونە :

ئازاد هات

هێمن نوست

یان لە کردارێك و هەموو ئەو وشە و مۆرفێم و پۆلە وشانەی ، کە لە دەوروبەری کردارەکەدا کۆدەبنەوە ، واتە بۆ بەشی کرداری ڕستەکە دەگەڕێتەوە . وەك :

ئازاد لە ماڵی مامی نوست

لەو ڕستەیەی سەرەوەدا فرێزە کرداری‌یەکە پێکهاتووە لە کردارێك و کۆمەڵێك وشە و مۆرفێم . وەك : (لە ماڵی مامی نوست) .

مەبەست لە ڕۆنانی ناوەوەی فرێزی کردارییش ، پێکهاتنی کردارێکە ، بەپێی هەموو ئەو مۆرفێمە جۆراوجۆرانەی هاوبەشی لە داڕشتنی کردارەکەدا دەکەن .

هەروەها بڕ . : فرێز

## - فرێزی گیراو

= فرێزیۆلۆژی ، ئیدیەم ، ئیدیۆم

بڕ . : فرێز

## - فرێزی ناوی العبارة الاسمية Noun phrase

بە شێوەیێکی گشتی هەموو فرێزێکی ناوی بریتییە لە ڕۆنانێك ، کە پێکهاتووە لە ڕەگەزێکی سەرەکی (سەرە) ، کە بە ناوێك دەناسرێتەوە و لەگەڵ وشەیێکی شوێنکەوتووش یان زیاتر ، کە بە ئارەزووە . ئەمەش ئەو جۆرە فرێزە ناوییانە دەگرێتەوە ، کە لە ڕۆنانی سەرەوەی ڕستەدا لانەدراون و لە شێوەی ( مۆرفێمێکی بەند ) لە ناو فرێزێکی کرداریدا چێنرابن . ڕیزبوونێکی فراوانی ئەم شوێنکەوتووانەش هەیە و ناتوانرێت سنوورێك بۆ ئەوە دابنرێت ، کە وا چەند لەو شوێنکەوتووانە دەشێن لە تاکە فرێزێکی ناویدا هەبن . لە زمانی کوردیشدا هەندێ لەو شوێنکەوتووانە

دەتوانن لە شێوەی وشەیێکی سەربەخۆدا دەرکەون و بکەونە پێش ناوی سەرە و بێ نیشانەی خستنەسەریش لەگەڵ ناوەکەدا لێك بدرێن ، واتە بە هۆی پەیوەستی لێکدەری سینتاکسیدا لێك بدرێن . بەم وشانەش دەڵێن دیارخەرەکانی پێش سەرە . بڕوانە ئەو ڕۆنانانەی خوارەوە :

ئەو کوڕە هات .

هەندێك کوڕ هاتن .

هەر کوڕێك هات .

هەندێکی دیش دەکەونە دوای ناوی سەرەوە . ئەمانەش دوو جۆرن :

یان لە شێوەی مۆفێمێکی بەندا بە ناوی سەرەوە دەلکێن و پێیان دەوترێت دیاریکەر . وەك (مۆرفێمەکانی ناسیاوی و نەناسیاوی و کۆ و...) :

کوڕەکە ، کوڕێك ، کوڕان ...

یان لە شێوەی وشە و فرێز و پارچەدا دەردەکەون و دەکەونە دوای ناوی سەرە و بەهۆی نیشانەکانی خستنەسەرەوە لەگەڵ ناوەکەدا لێك دەدرێن و بەمانەش دەڵێن دیارخەرەکانی یان وەسفکەرەکانی دوای سەرە .

بەوێنە :

کچێکی جوان هات .

ئەو دوو کوڕە هاتن .

کوڕی خوشکی ئازاد هات .

هەروەها ب . : فرێز

**فرێزیۆلۆژی** الكناية ، العبارت الاصلاحية Phraseology

= ئیدیەم ، ئیدیۆم ، فرێزی گیراو

ب . : فرێز

## ـ فریزیۆلۆژی تێکچڕژاو          الكناية الملتحمة

Phraseological concretion

فریزیۆلۆژیی تێکچڕژاو ، ئەو فریزانەن کە مانای گشتییان بە هیچ جۆرێك بەند نییە بە مانای ئەو وشانەوە ، کە فریزەکەیان پێکهێناوە . لەم ڕووەوە فریزی تێکچڕژاو بەرانبەر بە فریزی بەرەڵلاّ ڕاستەوخۆ دژ دەوەستێ .

کاتێك ، بەشێك لە فریزێك بریتی بێ لە وشەیێك ، کە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆی نەبێ ، ئەوە پێوەندی لە نێوان مانای وشەکان و تێکڕای فریزەکەدا نابێ . بەوێنە لە زمانی کوردیدا ، وشەی ( مولّ ) سەربەخۆ نابینرێ ، لەبەر ئەوە مانای فریزی ((گولّ و مولّ)) ناتوانرێ لە سەرپاکی مانای هەردوو وشەکە وەربگیرێ ، چونکە بەشێك لەو فریزە ـ واتە یەکێك لەو دوو وشەیە ـ واتای نییە . بەلاّم تێکڕای فریزەکە واتای ئاشکرایە .

هەر لەبەر ئەو هۆیە ــ ( واتە چونکە لە هەندێ فریزدا وشەی وا ڕێدەکەوێ ، کە بە تەنیا مانای نییە) ـ دەتوانرێ ئەو فریزانەی خوارەوە لە خانەی فریزیۆلۆژیی تێکچڕژاودا دابنرێن . وەك :

هاتەران پاتەران ـ ((هاتەران)) بە مانای (وڕێنە)) دێت ، بەلاّم ((پاتەران)) بە تەنیا مانای نییە .

گێژ و وێژ ـ ((گێژ)) بە مانای (بێهۆش)) دێت ، هەرچی ((وێژ))ە بە تەنیا واتای نییە .

... هتد .

هەروەها لە زمانی کوردیدا فریزی وا هەن ، کە وشەی مردە (الكلمة الميتة ـ Obsolete)یان تێدایە . لە زانستی زماندا ئەو جۆرە فریزانەش هەر بە فریزیۆلۆژیی تێکچڕژاو دەژمێررێن ، چونکە گشتیی فریزەکە ناتوانرێ لە ڕێگای سەرپاکی مانای وشەکانەوە وەربگیرێ . ئەویش لەبەر ئەوە مانای بەشێکی فریزەکە (کە وشەی مردەیە) ئاشکرا نییە ... بەشەکەی تری ڕوونکردنەوەی مانای فریزەکەی گرتووەتە ئەستۆی خۆی . جا کە مانای

فرێزێك لە ڕێگای بەشێکییەوە وەربگیرێ ، ئەوە مەودای ئەوەمان دەدات ، کە ئەو جۆرە فرێزانە بە فرێزیۆلۆژیی تێکچڕژاو لە قەڵەم بدەین .

## - فرێزیۆلۆژیی تێكئالأو          الكناية المعقدة

Phraseological collocation

فرێزیۆلۆژیی تێكئالأو ئەو جۆرە فرێزانەن ، کە یەکێك لە وشەکانی بەندە و لە بەکارهێناندا گیراوە و تەنیا لە فرێزێکدا بەکاردەهێنرێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مانای سەربەخۆی خۆی هەیە . بەوێنە ، ئەگەر فرێزی ((خۆ لە تەل دان)) وەربگرین ، ئەوە دەبینین ، کە تێکڕای پارچەکانی ئەم فرێزە واتادارن ، بەلأم ((لە تەل دان)) تەنیا لەم فرێزەدا بەکاردەهێنرێ .

لە فرێزیۆلۆژیی تێكئالأو تەنیا پارچەیێکی فرێزەکە گیراوە ، ئەگینا پارچەکەی دیکەی بەرەڵأیە و دەتوانێ بە هەمان واتا لەگەڵ وشەی دیدا یەك بگرن ، وەك ((خۆ کەڕ کردن)) ، ((خۆ گێل کردن)) ... هتد .

جیاوازی فریزیۆلۆژیی تێكئالأودا لەگەڵ فریزیۆلۆژیی تێکچڕژاودا ، ئەوەیە کە یەکەمیان - فرێزیۆلۆژیی تێكئالأو - ئەو پارچەیەی گیراوە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆیەتی . بەلأم دووەمیان - واتە فرێزیۆلۆژیی تێکچڕژاو - ئەو پارچەیەی کە گیراوە مانای سەربەخۆی خۆی نییە .

## - فرێزیۆلۆژیی یەکگرتوو          الكناية الموحدة

Phraseological unity

فرێزیۆلۆژیی یەکگرتوو ئەوەیە ، کە مانای لە ڕێگای واتای سەرپاکی ئەو وشانەوە (پارچانەوە) پێکیان هێناوە ئاشکرا دەبێ . بە وێنە فرێزی ((زمان درێژ)) ، کە بە مانای ((زۆر بلێ)) دێت ، لە ((زمان)) و ((درێژ)) پێکهاتووە . لێرەدا هەردوو وشەکە واتادارن . بەم چەشنە مانای فرێزی ((زمان درێژ)) لە

سەرپاکی وشەی ((زمان)) و ((درێژ))ەوە پەیدا دەبێ . یاخود فرێزی ((کلك و گوێ کردن)) . کە فرێزیۆلۆژیی یەکگرتووە ، گشت پارچەکانی مانایان هەیە و سەرجەمی ماناکانی ئەو وشانە (پارچانە) مانای تەواوی فرێزەکە بە دەستەوە دەدەن .

جا جیاوازیی نێوان فرێزیۆلۆژیی تێکچڕژاو و فرێزیۆلۆژیی یەکگرتوو ئەوەیە ، کە یەکەمیان ـ واتە فرێزیۆلۆژیی تێکچڕژاو ـ واتاکەی بەند نییە بە واتای تێکڕای ئەو پارچانەوە ( وشانەوە ) دروستیان کردووە ، بەڵکو واتای لە ڕێگای بەشێکییەوە ئاشکرا دەبێ . دووەمیان ــ واتە فرێزیۆلۆژیی یەکگرتوو ـ واتاکەی لە سەرپاکی ئەو وشانەوە پێکیان هێناوە دەردەکەوێ و وشەی بێواتای تێدا نییە .

لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری ئەو وشانەی فرێزیۆلۆژیی زمانی کوردییان پێکهیناوە ، وشەی واتادارن ، بۆیەکا بە ڕاشکاویەوە دەتوانین بڵێین ، کە زوربەی فرێزیۆلۆژیی زمانی کوردی لە خانەی فرێزیۆلۆژیی یەکگرتوودا دابنێین . بەڵگەشمان بۆ ئەوە ، ئەو نموونانەی خوارەوەن :

((ناوی بە گەرووی ئاشا چێ)) ؛ ((ناوی بە قوڕا چێ)) ؛ ((دەستی داری گرتووە)) ؛ ((دەستە ئەژنۆ)) ؛ ((چنگ لەسەر شان)) ؛ ((پشت ئەستووری)) ؛ ((زمان لێ دەرهێنان)) ؛ ((چوار پێ)) ؛ ((مل لە چەقۆ سوین)) ؛ ((دووکەڵ لە ماڵی هەڵناسێ)) ؛ ((داری بەسەر بەردیەوە نەماوە)) ؛ ((تفەنگ بە تاریکە شەوەوە نان)) ؛ ((دایە کێو)) ؛ ((کای کۆن بە با کردن)) ؛ ((گولۆلەی کەوتە لێژی)) ؛ ((ناوی خۆی نازانێ بنووسێ)) ؛ ((کەولە کۆن)) ؛ ((لووت تێژەنین)) ؛ (( مووی سەری ڕەپ بوو)) ...و گەلێکی دی .

**فشار**

ب . : : تەوژم

فۆرم شكل ، قالب Form

= قاڵب

فۆنەتیك علم الاصوات Phonetics

= دەنگسازی

(فۆنەتیك) لە وشەی (Phonetikos ـ دەنگی) یۆنانی‌یەوە کەوتووەتەوە ، کە لە ( Phone ـ دەنگ)ەوە وەرگیراوە . فۆنەتیك ئەو بەشەی زمانناسی‌یە ، کە لە دیوی دەنگیی زمان دەکۆڵێتەوە . جیاوازی لەگەڵ بەشەکانی دی زمانناسیدا لەوەدایە ، ئەم (واتە ـ فۆنەتیك) تەنیا لە ئەرك و دەوری زمانی نادوێ ، بەڵکو ئاوڕ لە ڕووی مادیی بابەتەکەش دەداتەوە : کاری ڕشتەی ئاخاوتن : خاسیەتی دەنگیی دیاردەی بیستن ... لەبەر ئەوە فۆنەتیك هەروەها پێوەندی بە چالاکیی نازمانی‌یشەوە هەیە : ئەنەتۆمی و فیزیۆلۆژیی پەیدابوون و دروست بوونی ڕشتەی ئاخاوتن و بیستنەوە . فۆنەتیك وەك زمانناسی بە گشتی پێوەندی بە دەروونناسی‌یەوە هەیە ، چونکە چالاکیی ئاخاوتن بەشێکە لە چالاکیی دەروونیی ئادەمیزاد .

هەروەها دەتوانین بڵێین ، فۆنەتیك ـ بەشێکە لە زانستی زمان ، دەربارەی دەنگەکانی زمان دەدوێ و لە سیستەم و یاسایان دەکۆڵێتەوە .

ـ فۆنەتێکی ئەزموونگەری علم الاصوات التجريبي
Experimental phonetics

= فۆنەتیکی تاقیکردنەوە

فۆنەتیکی ئەزموونگەری بەشێکی گرنگی زانستی دەنگە ، چونکە بەکارهێنانی ئامێر دەگرێتەوە بۆ گەیشتن بە ڕاستیی دەنگ لە ڕووی فیزیکی و جوولانەوەی ماسوولکەکانی ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە لە کاتی

دروست بوونی دەنگدا . ئەو ئەنجامەی لێرەدا وەدەست دەهێنرێ ، دەتوانرێ بکرێ بە بەڵگەیێکی سەرەکی ، چونکە شیکردنەوە بەپێی ئامێری تایبەتی لە قاڵبی تیۆری دەچێتە دەرەوە و شێوەی (تطبيقی) دەکرێت بە بەردا .

- فۆنەتیکی بیستن علم الاصوات السمعي
Auditory phonetics

فۆنەتیکی بیستن ئەرکی گوێ و گەیاندنی ئەو دەنگانەی ، هەڵگری زانیاریین ، بە مێشك دەگرێتەوە . بە شێوەیێکی گشتی فۆنەتیکی بیستن لە چۆنیەتیی کارکردنی گوێ و ئەندامەکانی گوێ دەکۆڵێتەوە .

گوێی ئادەمیزاد لە بیستندا سێ ئەرکی تایبەتی هەیە :

١- کۆکردنەوەی دەنگ ، کە هەڵگری زانیارییە .

٢- گواستنەوە ، یان گەیاندنی ئەو زانیارییانە .

٣- شیکردنەوەی زانیارییەکانی .

گوێ بریتییە لە سێ بەش : گوێی دەرەوە و گوێی ناوەڕاست و گوێی ناوەوە .

گوێی دەرەوە ، هەموو یەکێك لە ئێمە دەیبینێ ، چونکە وەك هەر ئەندامێکی دیی بینراوی لەش بە دەرەوەیە . ئەم بەشەی گوێ بریتییە لە پارچەیەك ئێسقان و دەوری مایکرۆفۆن دەبینێ . گوێی دەرەوە کونێکی بچووك بە پەردەی گوێوەی دەبەستێ . ئەم پەردەیە پارچە گۆشتێکی زۆر تەنکە و پلەی حەساسیەتی یەکجار بەرزە و بە بچووکترین و نزمترین دەنگ دەجووڵێتەوە . ئەو کونەی گوێی دەرەوە بەم پەردەیەوە دەبەستێتەوە ، هەمیشە پڕی هەوایە و دەورێکی گەورە دەبینێ لە ئاسانکردنی ئەو لەرینەوە و ئاوازەیەی دەچێتە نێو گوێوە ، پێش ئەوەی بگاتە پەردەی گوێ - واتە ئەو هەوایەی لە نێو ئەو کونەدایە وەك فیلتەرێك دەور دەبینێ و ئەو دەنگەی لە دەرەوە دێ و گوێی دەرەوە وەری‌دەگرێ ، پێش ئەوەی بگاتە

پەردەی گوێ ، ئەو هەوایەی نێو ئەو کونە دەیپاڵێوی و ئەگەر پاڵەپەستۆی ئەو دەنگەش بەرز بێ ، کەمێك نزم دەبێتەوە ، بۆ ئەوەی کار لە پەردەی گوێ نەکات .

گوێـی ناوەڕاسـت دەکەوێتـە دوای پـەردەی گوێـوە . گوێـی ناوەڕاسـت شەقێکی بچووکی پڕ لە هەوایە و سێ ئێسقانی وردی تێدایە و بە پەردەی گوێوە بەستراون و لە بەری ناوەوەش بە گوێی ناوەوە لکاون . ئیش و کاری ئەم سێ ئێسقانە وردە ، ئەوەیە لەرینەوەی دەنگ و هەر لەرینەوەیێکی دیکە بگوێزنەوە ، واتە ـ لەرینـەوەی دەنگ لە پەردەی گوێوە دەگەیەنن بە گوێی ناوەوە . ئەم سێ ئێسقانە بەیەکەوە دەلەرێنـەوە و کەمێك لەرینـەوە پـەردەی گوێ نەرم یان نزم دەکەنەوە ، ئەویش پێش ئەوەی بەسەریاندا تێپـەڕی و بەرەو گوێی ناوەوە بچێ .

گوێـی ناوەڕاسـت هـەروەها بـە هـۆی کونـی ئۆسـتاکییەوە بـە لووتـەوە بەستراوە . هەر کاتێك پلەی جیاوازی نێوان تەوژمی هەوای دەرەوە و هـەوای نێـو گـوێ تێـك بچـێ ، ئـەوە کونـی ئۆسـتاکی تەوژمی‌هـەوای نێـو گوێـی ناوەڕاست لەگـەڵ تـەوژمی هـەوای دەرەوەدا یەکسـان دەکـا . گوێـی نـاوەوە بازنەیێکی پێچاوپێچە و بە شێوەیێکی تەواو داخراوە و قایم کراوە . لە بەری ژوورەوە بە ناوەوە توند چەسپ کراوە و ئاوێکی لینجی تێدایە . ئەم بازنـە پێچاوپێچـە لـە بـەری دەرەوە ـ واتـە سـەرە ئەسـتوورەکەی ، بـە گوێـی ناوەڕاستەوە لە بەری ژوورەوە بەستراوە ، کە بریتییـە لـە دەمـاری یـەکجار ورد و بە مێشکەوە بەستراون .

گوێـی نـاوەوە بـە درێـژی بـە پـەردەیێکی تـەنك کـراوە بـە دوو بەشـەوە ، ئـەویش هـەر لـە سـەرە ئەسـتوورەکەی بازنـەی گوێـی نـاوەوە تـاوەکو سـەرە وردەکـان . دوو کونـی بچـووك لـە گوێـی ناوەڕاسـتەوە چوونەتـە نێـو گوێـی ناوەوە . هەریەکێك لەم دوو کونە کەوتووەتە لایـەکی ئـەو پەردەیەوە ، کە بە درێژی گوێی نـاوەوەی دابەش‌کـردووە . هـەر سـێ ئێسـقانە وردەکـەی گوێـی

ناوەڕاست چوونەتە نێو ئەو کونە بچووکەیەوە ، کە لە شێوەی هێلکەئاساییدایە و بە هۆی لەرینەوەی ئەم سێ ئێسقانەوە لەرەی دەنگ دەگاتە نێو ئەو ئاوە لینجەی لە گوێی ناوەوەدایە . کونە بچووکەکەی دیکە شێوەی خڕە و بە پارچەیێکی خاو داپۆشراوە و دەوری ئاسایی‌کردنی تەوژمی نێو ئەو ئاوە لینجەی گوێی ناوەوە دەبینێ . ئەم پارچە خاوە ، کە ئەو کونە خڕەی داپۆشیوە ، دەست دەکا بە لەرینەوە . کاتێ لەرەی دەنگ بەو ئاوە لینجەدا تێدەپەڕێ ، ئینجا ئەو لەرەیە بەهۆی دەمارەکانی بیستنەوە ، کە بەستراون بە بەری ژوورەوەی گوێی ناوەوە ، دەچنە نێو مێشکەوە . ئەو لەرەیەی دەگاتە مێشك جیاوازە لەگەڵ هەمان لەرەدا ، کە یەکەم جار گوێی دەرەوە وەری‌دەگرێ .

- فۆنەتیکی تاقیکردنەوە

ب . : فۆنەتیکی ئەزموونگەری

- فۆنەتیکی درکاندن علم الأصوات النطقي

Articulatoy phonetics

فۆنەتیکی درکاندن چۆنیەتیی کارکردن و جووڵانەوەی ئەندامەکانی‌ئاخاوتن دەگرێتەوە . ئەو ئەندامانە ، هەر یەکە لە دروست کردنی هەر دەنگێکدا بە شێوەیێکی جیاواز دەجووڵێتەوە . فۆنەتیکی درکاندن باسی جووڵانەوەی هەر ئەندامێك دەکا و بەپێی ئەو جووڵانەوەیە دەست‌نیشانی سنووری هەر دەنگێك دەکرێ .

ئەندامەکانی ئاخاوتن ، کە دەنگیان پێ دروست دەکرێ ، دەکرێن بە سێ بەشی جیاوازەوە و هەر بەشێکیش لەم سێ بەشە ، بریتییە لە چەند ئەندامێکی تایبەتی ، ئەگەرچی لە یەکدییەوە نێزیکن :

یەکەم - ڕشتەی هەناسادان

ڕشـــتەی هەناســادان بریتییـــە لـــە هـــەردوو ســـییەکان و ناوپـــەنچك و پەراسووەکان . ئەم ئەندامانە جگە لەوەی کاری هەڵمژینی هەوا و فڕێدانی هەوا دەگێڕن ، بۆ دروست کردنی دەنگیش بەکار دەهێنرێن .

لە هەناسەداندا ، یان لە چوونەژوورەوە و دەرچوونی هـەوادا ، ناوپـەنچك یارمـەتیی بەرزبوونـەوە و نـزم بوونـەوەی سییەکان دەدا بۆ ئەوەی ئـەم کـارە بگێڕن . بە بەرزبوونـەوەی ناوپەنچـەك ، هـەوا لـە سییەکانەوە دێتـە دەرەوە و نزم بوونەوەی ناوپـەنچك ، هـەوا لـە دەرەوە دێتـە نـاو سییەکانەوە . هـەروەها چونکە پەراسووەکان بە هۆی چەند پارچەیێك گۆشت بەیەکەوە بەستراون ، توانستی کردنەوە و هاتنەوە یـەکیان هەیە . لـە کردنـەوەی پەراسووەکاندا ، سنگ فراوان دەبێتەوە و هەوا بە ئاسانی بۆ نێو سییەکان دێتە ژوورەوە . بە بەیەکهاتنـەوەی پەراسـووەکانیش ، هـەوا لـە سـییەکانەوە دێتـە دەرەوە ، هەروەکو لە باری بەرزبوونەوەی ناوپەنچکدا .

واتـە بەرزبوونـەوەی ناوپـەنچك و هاتنەوەیـەکی پەراسـووەکان بەیەکـەوە ڕوودەدەن و هـەوا لـە سـییەکانەوە دەردەچنـە دەرەوە و بـە نـزم بوونـەوەی ناوپـەنچك و کردنـەوەی پەراسـووەکان ، کـە بەیەکـەوە ڕوودەدەن ، هـەوا لـە دەرەوە دێتە نێو سییەکانەوە .

گشت دەنگەکانی زمان بەو هەوایە دروست دەبن ، کە لە سییەکانەوە دێنە دەرەوە و دەگمەن دەنگ بەو هەوایە دروست دەبێ ، کە لـە دەرەوە دێتـە نێو سییەکانەوە لێرەدا مەبەست لەو دەنگانەیە ، کە لە ئاخاوتندا بە شێوەییێکی ئاسایی دروست دەبن ، نەك ئەو دەنگانەی ، بە ئارەزوو دروست دەکرێن ... بـەڵام ئەمـە ، ئـەوە ناگەیـەنێ ، هیـچ زمـانێك نـەبێ ، بـەو هەوایـەی بـۆ نێـو سییەکان دەچێتە ژوورەوە ، دەنگی لـێ سازنەکرێ ... بەڵێ ئەم دیاردەیـە لـە زمانی زوولوو و گورجیدا هەیەو چەند دەنگێك بەو هەوایە دروست دەکرێن ، کـە بـۆ نێـو سـییەکان دەچێتـە ژوورەوە . بـەم چەشـنە دەنگانـەش دەوتـرێ (Ejective) .

دووەم ـ ئەوك و تاڵەباریکەکانی ئەوك

ئەوك بریتییە لە لوولەیێکی ئێسقانی ڕەقی ئەڵقە ئەڵقە . کاتێ هەوا لە سییەکانەوە بە ڕێگای ئەو لوولەیەدا دێتە دەرێ ، بەسەر تاڵەباریکەکانی ئەوکدا تێ‌دەپەڕێ . تاڵەباریکەکانی ئەوك بریتین لە دوو دەستە ماسوولکەی نەرم . ئەم دوو دەستە ماسوولکەیە بەرانبەری یەکدین و لە بەری سەرەوە و پێشەوە نزیکی یەکدی دەبنەوە . هەرچی لە بەری پشتەوە و پێشەوەیە بە شێوەیێکی ئەستوونی دەجووڵێنەوە . ئەم دوو دەستە ماسوولکەیە بە ئێسقانی لوولەی ئەوکەوە بەستراون . بە هۆی جووڵانەوەی ئەم ئێسقانەوە ، ئەم دوو دەستە ماسوولکەیە دەکرێنەوە و دیسان دێنەوە یەك .

لە ئەنجامی کردنەوەیاندا ، هەوا بێ‌تەگەرە و بێ ئەوەی ڕێگای لێ‌بگیرێ ، لە سییەکانەوە دێتە دەرەوە (لە کاتی چوونە ژوورەوەی هەوادا بۆ نێو سییەکان ، ئەم تاڵەباریکانە هەمیشە کراونەتەوە) . لە باری کردنەوەی ئەم دوو دەستە ماسوولکەیەدا بزوێنەکانی زمان و کۆنسۆنانتە گڕەکان دەدرکێنرێن . بەڵام لە کاتی هاتنەوەیێکی ئەم دوو دەستە ماسوولکەیەدا ، هەوا ڕێگەی لێ‌دەگیرێ و بە ئارەزووی خۆی و بۆ ماوەیێکی کەم ناتوانێ بەرەو دەرەوە بڕوات . لە کاتی دروست بوونی کۆنسۆنانتە کپەکاندا ، تاڵەباریکەکانی ئەوك بە شێوەیێکی ئاسایی دێنەوە یەك .

جگە لەم دوو جۆرە کردنەوە و هاتنەوەیەکەی ئەم دەستە ماسوولکەیە ، کە تاڵەباریکەکانی ئەوکیان پێ‌دەوترێ ، لە کاتی درکاندنی هەندێ دەنگی تایبەتیدا سێ جۆر کردنەوە و داخستنی دیکە دەست‌نیشان دەکرێ :

١ـ هاتنەوەیێکی تەواو (داخستن) :

وەکو لە درکاندنی ( ئ ) ـ ( هەمزە)دا

٢ـ نیوەداخراو

وەك لە حاڵەتی درکاندنی ( هـ )دا ... ئەمە (نیوەکراوە)شی پێ‌دەوترێ .

٣ـ کراوەی تەواو

وەك لە حاڵەتی درکاندنی (a) و ( i)دا ڕوودەدات .

سێیەم ـ بۆشایی زار و لووت .

بۆشایی زار و لووت لە سەرووی ئەوکەوە دەست پێدەکا تا دەگاتە هەردوو لێو . هەردوو لێویش هەمان دەوری تاڵەباریکەکانی ئەوك دەگێڕن . تاڵەباریکەکانی ئەوك لە بۆشایی ئەوکدا ڕێگە لە هەوا دەگرن و هەردوو لێویش لە بۆشایی زاردا ئەو دەورە دەگێڕن و دەبنە کلیلێ بۆ داخستنی بۆشایی زار و لێپرسراون بەرانبەر دروستکردنی هەندێ دەنگی تایبەتی ڕادەی بۆشایی زار بەپێی جووڵانەوەی زمان دەگۆڕرێ ، چونکە زمان بەشێکی گەورەی بۆشایی زاری داگیرکردووە و لە کاتی ئاخاوتندا بە شێوەیێکی زۆر خێرا بەرز و نزم دەبێتەوە ، بەڵام لە کاتی ئاخاوتندا زمان لە بۆشایی زاردا لەنگەر دەگرێ . زمان بە شێوەیێکی گشتی بەرانبەر بە درکاندنی گشت بزوێنەکانی زمان لێپرسراوە .

ئاسمانەی زار لە ددانەکانی ڕیزی سەرەوە و پاشی ئەم ددانانەوە دەست پێدەکات ، کە پێی دەوترێ (پووك) . لە دوای (پووك)ەوە (مەڵاشوو) دێت . ئەو بەشەی ، کە یەکسەر دوای پووك دەست پێدەکا ، پێی دەوترێ (ڕەقەمەڵاشوو) . ئەو بەشەش ، کە دوای (ڕەقەمەڵاشوو) دێت ، پێی دەوترێ (نەرمەمەڵاشوو) . نەرمەمەڵاشوو لە دروست کردنی چەند دەنگێکی زاری و هەموو دەنگە بیقلۆکییەکاندا دەورێکی گەورە دەگێڕێ . لە کاتی دروست بوونی دەنگە زارییەکاندا ، نەرمەمەڵاشوو بەرزدەبێتەوە و کونەلووت دەگرێ و نایەڵێ هەوای لێوە دەرچێتە دەرەوە و دەبێتە هۆی دروست بوونی کۆنسۆنانتە زارییەکان ، وەکو (پ) و (ب) ... هتد . هەروەها لە کاتی نزم کردنەوەی نەرمەمەڵاشوودا ، دەرگای بۆشایی زار دادەخرێ و هەوا ناتوانێ لە بۆشایی زارەوە دەربەڕێ و دەبێ لە بۆشایی لووتەوە بچێتە دەرەوە . ئەو دەنگانەی لەم هەل و مەرجەدا دروست دەبن ، پێیان دەوترێ دەنگی بیقلۆکی ، وەك (ن) و (م) .

زمـان لـه گۆڕینـی ڕادەی بۆشـایی زاردا دەورێکـی گـەورەرە دەبینـیٚ . لـە درکـاندنی دەنگەکانیشـدا ڕۆڵێکـی بـالاٚ دەگـێڕیٚ ... زمـان وەك ئـەندامێکی گرنگی ئاخاوتن دەکریٚ بە سیٚ بەشەوە :

١ـ سەری زمان

٢ـ ناوەڕاستی زمان

٣ـ پشتی زمان

سەری زمان لەگەڵ ئەندامێکی دیـی ئاخـاوتندا ، یـاخود لەگـەڵ بەشـێکی ئاسمانەی زاردا چـەند دەنگێکـی پیٚدروسـت دەکـریٚ . بـۆ نموونـە ، کـاتیٚ سەری زمان لە پـووك دەکـەویٚ ، دەنگـی (ت) و (د) سـازدەبیٚ ... ناوەڕاستی زمان لەگـەڵ ڕەقەمەلاٚشوودا ، دەنگـی (چ) پێكدێنـن ... پشـتی زمـان لەگـەڵ نەرمەمەلاٚشوودا ، دەنگی (ك) و (گ) دروست دەکەن .

ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایێکی دییەوە ، هەردوو لێو لە جووڵانەوەدا ، وەکو زمـان سەربەسـتن . هـەردوو لێـو لـە دروسـت کردنـی دەنگـی (پ) و (ب)دا بەشداری دەکـەن ... لێوی خـوارەوە لەگـەڵ ددانـەکانی سـەرەوەدا ، دەنگـی (ف) و (ڤ) سازدەکەن ... هتد .

- فۆنەتیکی فیزیاوی

= فۆنەتیکی فیزیکی

- فۆنەتیکی فیزیکی علم الاصوات الاکوستي

Acoustic phonetics

= فۆنەتیکی فیزیاوی

ئەم بەشەی فۆنەتیك ڕۆیشتن و پاڵەپەستۆی گەردیلەی هـەوا دەگرێتـەوە ، کە هەڵگری دەنگن .

فۆنەتیکی فیزیکی ڕواڵەت و ناوەرۆك و چۆنێتیی دروست بوونـی شـەپۆلی دەنـگ و چۆنیـەتیی ڕۆیشـتنی ئـەو شـەپۆلانە دەگرێتـەوە . دەنـگ لـە شـێوەی

شەپۆلدا بە هۆی جوولآنەوەی هەواوە دروست دەبیّ . جوولآنەوەی هەوا لە جوولآنەوەی یەکەم کۆمەڵی گەردیلەی هەواوە دەست پیّدکا ، کە نزیکی هەردوو لیوە ، یا نزیکی زارە . ئینجا کۆمەڵی یەکەمی گەردیلە ، بەرەبەرە کۆمەڵی دووەم دەبزوێنیّ و دووەمیش سێیەم دەخاتە گەڕ ...هتد . بەو شێوەیە دەنگەکان لە چەشنی شەپۆلدا تا مەسافەییێکی تایبەتی دەڕۆن و ئەوجا بەرەبەرە شەپۆلەکان بیّهێز دەبیّ و دادەمرکێنەوە . پێش ئەوەی ئەم شەپۆلانە دامرکێنەوە ، دەچنە گوێی ئەو کەسانەوە ، کە لە سنووری ڕادەی بڕکردنی ئەو شەپۆلانەدان .

دەنگ بریتییە لە کۆمەڵێك شەپۆل و بە هەوادا دەڕوات ... خێرایی ئەو کۆمەڵە شەپۆلەی دەنگ پێکدێنن ـ دەورروبەری (١١٠٠) پێیە لە یەك چرکەدا . بەم جۆرە شەپۆلی دەنگ بە هۆی لەرینەوەی ئەم تەنەوە یا لە شێوەییێکی ڕێکوپێکدا پێكدێت ، هەروەك دروستبوونی هەر دەنگێکی زمان ، یاخود لە شێوەییێکی ناڕێکدا سازدەبیّ ، وەکو (هەرا) ، یان (گڤە گڤ) . جگە لەمەش لەرینەوە ، یا با بڵێین شەپۆل ... ساکارە یان ئاڵۆزە .

لە ئاخاوتنی ئاساییدا شەپۆلەکانی دەنگ بە ئاڵۆزی پێكدێن . ئەم شەپۆلانە ساکار بن ، یا ئاڵۆز بە خول دەڕۆن . ڕۆیشتنی یەکەم گەردیلەی هەوا و گەڕانەوەی بۆ شوێنەکەی خۆی پێی دەوتریّ (خول ـ Cycle) .

هەروەها پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین ، کە هەر تەنێك جوولآنەوە و لەرینەوەی تایبەتی خۆی هەیە و ڕادە و چۆنیەتیی لەرینەوەی هەر تەنێکیش دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی ئەستووریی و قورسیی و بۆشایی ئەو تەنە . بەم جۆرە ڕادەی لەرینەوەی تەنێك کاردەکاتە سەر ئاوازەی لەرینەوەی ئەو تەنە . بۆ نموونە ، ئەگەر لەرەی جوولآنەوەکە بەرزبوو ، ئەوا ئاوازەکەش بەرز دەبیّ و ، ئەگەر نزم بوو ، ئەوا ئاوازەکەش نزم دەبیّ . جگە لەمەش ڕادەی لەرینەوە چەند درێژ بیّ ، ئەوەندە هێزی دەنگەکە زیاد دەکا و ئەم هێزەش بە (وات) دەژمێرریّ .

بێگومان ڕادەی بیستنی گوێی مرۆڤ بەپێی بەرزی و نزمیی لەرینەوە دەگۆڕێ . بۆ نموونە ، ئەگەر خولی هەر دەنگێك لە چرکەیەکدا لە (٢٠) خول کەمتر بوو ، ئەوا ئەو دەنگە بە چاکی نابیسترێ و بێتو لە چرکەیەکدا لە (٢٠٠٠٠) خول زیاتریش بوو ، ئەوا دەنگەکە ئەوەندە بەرز دەبێ ، گوێی مرۆڤ ناتوانێ بە باشی وەریبگرێ .

هەروەك وتمان ، دەنگ لە ئاخاوتندا بریتییە لە چەندان شەپۆلی بەیەکداچووی ئاڵۆز . لەبەر ئەمە توێژینەوە لەو شەپۆلانە زۆر گرانە ...

لەبەر ئەمە ، شەپۆلەکانی دەنگ کەرت دەکرێن و دابەش دەکرێن بەسەر چەند شەپۆلێکی سادەدا و ئەوجا هەر شەپۆلێکی سادە شیدەکرێتەوە . ئەو فیلتەرانەی لە ئاخاوتندا شەپۆلەکانی دەنگ جیادەکەنەوە ، ئەوك و زمان و لێو ... ن . هەروەها بەپێی گوێ ئاوازەکان لە یەك جیادەکرێنەوە .

لە ڕاستیدا دەنگەکانی زمان هیچیان بە ڕێکوپێکی نادرکێنرێن ـ واتە خولەکانی دەنگەکان بە شێوەییێکی تەواو یەك لە دوای یەکەوە نایەن ، بەتایبەتی کۆنسۆنانتەکان . لەبەر ئەم هۆیە بە کۆنسۆنانتەکان دەوترێن ـ (دەنگە ناڕێکەکان) . هەرچی بزوێنەکانە ، تا ڕادەییێك خولەکانیان بە شێوەییێکی ڕێکوپێك و یەك لە دوای یەکەوە دێن . لەبەر ئەمە بە بزوێنەکان دەوترێن ـ (دەنگە ڕێکەکان) . یان هەر نەبێ لەرەی بزوێنەکان دەتوانرێ دەستنیشان بکرێن . بەم جۆرە کۆنسۆنانت و بزوێن لە فۆنەتیکی فیزیکدا جیادەکرێنەوە .

## فۆنۆلۆژی — علم نظم الصوت — Phonology

= دەنگسازی

(فۆنۆلۆژی) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و لە ( Phone ـ دەنگ) و (Log ـ زانست) پێکهاتووە و بەشێکە لە زمانناسی . زانستێکە دەربارەی پێکهاتنی دەنگی زمان و لە دروست بوون و ئەرکی بچووکترین دانەی

بیٚواتای زمان (فۆنێم ، برگە) دەکۆڵێتەوە . جیاوازی فۆنۆلۆژی لە فۆنەتیك لەوەدایە ، کە فۆنۆلۆژی گرنگی بەوە نادات دەنگەکانی ئاخاوتن لە ڕووی فیزیۆلۆژییەوە بناسێنێ ، بەڵکو مەبەستی نیشاندانی دەور و ئەرکی ئەو دەنگانەیە ، کە لە ئاخاوتندا بەرگوێ دەکەون ، واتە کە دەبنە ماك و کەرەستەی دانەی ئاڵۆزتر و واتاداری وەك (مۆرفێم ، وشە) . هەر لەبەر ئەوەشە ، هەندێ لە زانایان فۆنۆلۆژییان بە (فۆنەتیکی ئەرکی) ناوبردووە .

**فۆنێم** **الفونيم ، الوحدة الصوتية** phoneme

گەرچی بیری فۆنێم لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە لە کارە زمانەوانییەکانی ئەوروپا و ئەمەریکادا بەدی دەکرێ ، بەڵام لە سەرەتای پەیدابوونیدا پتر وەك دیاردەیێکی فۆنەتیکی تەماشادەکرا و بە واتای (فۆن)ی ئێستا بەکار دەبرا . زاراوەی ( فۆنێم ) بۆ یەکەم جار لە کارێکی زمانەوانی پۆڵەندی ( بۆدوئێن دێ کورتەنی ) ـ سەدەی هەژدەدا بەرچاودەکەوێ .. بەڵام بەدوای ئەم داهێنانەشدا ، بیرەکە تا چەند ساڵێکیش هەر وەك خۆی مایەوە و کەس هەوڵی دیاریکردن و پێناسەکردنی دیاردەکەی نەدا . بیری فۆنێم دیسانەوە لە کارە مێژوویيەکەی ( دی سۆسیور )یشدا هەستی پێدەکرێ ، هەرچەندە ناوی زاراوەکە نەبراوە . هەروەها لە کارە زمانەوانییەکانی ئەمەریکاییەکانی ساڵانی بیستی سەدەی بیستەمیشدا هەوڵی ئەوە دراوە دەنگی گرنگ و ناگرنگ لەیەکدی جیابکرێنەوە ( ئەمەش بنەمای ڕۆنانی فۆنۆلۆژییە ) ، بەڵام نەبوونی پێناسەیەکی وردی فۆنێم بووەتە هۆی نانەوەی گێژاوێکی گەورە لەم کارانەدا . لە کۆتایی بیستەکاندا بۆ یەکەم جار پێناسەیەکی وردی فۆنێم لە لایەن دامەزرێنەرانی قوتابخانەی پراگەوە خرایە ڕوو و بەتایبەتی پێناسەکەی ( تروبیتسکی)ی زمانەوانی ڕووس ، ئەو یاسایانەی بۆ دیاریکردن و کێشەی ناسینەوەی فۆنێمی ڕەواندەوە . ئەمەش کاری کردە سەر هەموو کارەکانی دوای خۆی .

کەواتە فۆنیم بەو دەنگانە دەوترێ ، کە لە زماندا وشە پێك دەهێنن و بە گۆڕان و لاچوونیان واتا دەگۆڕێن . بۆ نموونە ، ئەگەر فۆنێمی ( ا ) لە وشەی ((بان))دا بگۆڕرێت بە (ە ، ۆ ، ێ ...) ، ئەوە ئەم وشانە ((بەز ، بۆز ، بێز ...)) پەیدا دەبن ، کە جیاوازییێکی تەواو لە مانایاندا هەیە ـ واتە لێرەدا فۆنێمی ( ە ، ۆ ، ێ .. ) دەوری گۆڕینی مانای وشەی (( باز )) دەبینن . ئەگەر فۆنێمی (ز)یش لە وشەی ((ناز))دا بگۆڕرێت بە (ن ، ڵ ، ڤ ، خ ..) ، ئەوە ئەم وشانە ((نان ، ناڵ ، ناڤ ، ناخ ...)) دروست دەبن ، کە هەر یەکەی مانای تایبەتیی خۆی هەیە ـ واتە بەم جۆرە دەبینین ، کە فۆنێمی ( ن ، ڵ ، ڤ ، خ ..) مانای وشەی (( ناز )) دەگۆڕن .

هەرچەندە فۆنێم کاری جیاکردنەوە و گۆڕینی مانا بەجێ دەهێنێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆی بەتەنیا خاوەنی مانا و واتا نییە .

هەست کردن بە بیری فۆنێم و گرنگیی دیاردەکە کارێکی گران نییە و زمانەوانی ناوێ . هەموو کەسێك بەسەلیقە دەتوانێ هەست بکات کام دەنگ لەو دەنگانەی لە زمانەکەیدا هەیە ، گرنگە و کامیان گرنگ نییە ؛ یان کام لەو دەنگانە لەیەکتر دەچن و کامیان جیاوازن . بەوێنە ، گشت کوردێ بە سەلیقە هەست بەوە دەکات ، کە دەنگی / ب / لە دەنگی ( پ ) نێزیکە و لەدەنگی / د /ەوە دوورترە یان دەنگی / ج / لە / چ / ەوە نێزیکە ، بەڵام لە دەنگی /ب/ەوە دوورە . بەڵگەمان بۆ ئەم هەست پێکردنە ، ئەوەیە کە دانەرانی ڕێنووسی کوردی لە پیتی ( ب ) و ( ج )ەوە نیگاریان بۆ نواندنی دەنگی /پ/ و /چ/ داتاشیوە . هەروەها لە پیتی ( ز ) و ( ف )ەوە وێنەیان بۆ دەنگی /ژ/ و /ڤ/ سازکردووە . ئەمەش بەڵگەیە ، کە ئەو دانەرانەی ڕێنووس دوور و نێزیکی ئەم دەنگانەیان هەست پێکردووە و ناسیوەتەوە .

دیسانەوە هەموو کوردێ هەست بەوە دەکات ، کە هەر یەك لە وشەی ( با ) و ( بێ ) لە دوو دەنگ پێکهاتووە و دەنگی دووەمیان لە یەکدییان جیادەکاتەوە و ( واتای جیاوازیانی دەداتێ ) . ئاشکرایە ، وەستانی ئەم

دوو دەنگی /ا/ و /یَ/یە بەرانبەر یەکتری لەم شوێنەدا بووەتە هۆی دروست بوونی جیاوازیی واتایی لە نێوان دوو وشەکەدا و بە شێوەیێکی گشتی بەم جۆرە دەنگانە دەوترێ ( فۆنێم ) . بە واتای ئەو دەنگانەی جیاوازیی واتایی پێك دێنن ، یان دوو وشە لە ڕووی واتاوە لەیەکتر جیادەکەنەوە .

بێگومان ئەو دەنگانەی لە زمانێکدا بە فۆنێم دادەنرێن ، مەرج نییە لە زمانانی دییشدا هەمان پایەیان هەبێ ، بەراوردکردنی دوو وشەی کوردیی ( پەلە ) و ( پەڵە ) ، یان ( برین ) و ( بڕین ) تێمان دەگەیەنێ ، کە دەنگی ( /ل/ ـ /ڵ/ ) و ( /ر/ ـ /ڕ/ ) فۆنێمی جیاوازن ... بەڵام ئەم دەنگانە لە زمانێکی وەك عەرەبیدا هەرچەندە هەن و هەست بە بوونیان دەکرێ ، کەچی پلەی فۆنێمیان نییە و بە هەردووکیان ـ واتە چ دوو/ل/ەکە و چ دوو /ر/ەکە یەك فۆنێم پێکدێنن ، چونکە لە عەرەبیدا دوو وشە نییە ، ئەم دەنگە بە تەنیا لە یەکتری جیابکاتەوە .

## فیزیۆلۆژی الفسیولوجی physilogy

زانستی ئەرکی ئەندامی لەش

ڕشتەی ئاخاوتن و دەربڕینی دەنگەکانی ئاخاوتن خاوەنی بناغەیێکی فیزیۆلۆژین ، چونکە لە پرۆتسێسی ئاخاوتندا ئەندامەکانی هەست و ڕشتە ماسوولکەییەکان و ڕشتەی دەمارە ناوەندییەکانی مرۆڤ بەشداری دەکەن .

بەتایبەت ئەوەی بەلای زمانناسییەوە گرنگ بێ ، تیۆریی دانەوەی کاری ئاخاوتنە ، کە زانایانی ڕووسی فیزیۆلۆژی : ی . م سێچنۆڤ و ی . پ . پاڤلۆڤ دایانناوە . وشە ، کەوا مرۆ دەیبیسێ و دەیبینێ ، بریتی‌یە لە دووەم سیستەمی ئیشارەت ، سیستەمەکەی دی ئیشارەتی ئیشارەتە . گشتێتی یەکەم و دووەم سیستەمی ئیشارەت ، بریتی‌یە لە دانەوەی بناغەی فیزیۆلۆژی و ڕەنگادنەوەی ڕاستی .

فیشکەیی الاصوات المكتومة Hushing sound

فیکەیی الصفيري Whisting ( sibilant )

فیلۆلۆژی فقه اللغة Philology

وشەی فیلۆلـۆژی ( philoiogy ) کـە لـە زمـانی یۆنانیـیـەوە وەرگـیراوە ، پێکهاتووە لە :

( philo ـ خۆشـم دەوێ ) و ( Logos ـ وشـە ) . لـە یۆنـانیی کۆنـدا زاراوەی ( philologs ) ئەو مانایەی ئێستای نەدەگەیاند و وێڕای ئەوەش بە رێزماننووسیان دەوت ( philolog ) .

بەرانبەر یەکتر وەستانی زاراوەی فیلۆلـۆج و رێزماننووس لە رۆمای زوو سەری هەڵدا . ئەگەر بۆ ئەرکی فیلۆلۆج لیکۆڵینەوی فۆرم و ناوەرۆکی ئەدەب دەست نیشان کرابێ ، ئەوە بۆ رێزماننووس ئەرکی لێکۆڵینەوەی رێنـووس و کێشی تێکست دانراوە . لە سـەردەمی راپـەڕین و رۆشـنبیریدا فیلۆلۆژیـی کلاسیکی پەیدابوو ، کە نەك تەنها لە زمان و ئەدەبی دەکۆڵییەوە ، بەڵکو لە مێـژوو و یاسـا و ئـابووری و ئـاین و فەلسـەفەش دەدوا . دواتـر بـەهۆی بزووتنـەوەی ئـازادیخوازیی نەتەوایەتییـەوە ، بابـەتی فیلۆلـۆژی سـنووری تەسك کرایەوە و تەنیا زانستی ئەدەب و زمانی گرتەوە .

## قاڵب

ب .: فۆرم

## قەدی کردار

ب .: بنەمای کردار

ئەگەر لە ڕوانگەی چاوگەوە ، بەدوا قەدی کرداردا بگەڕێین ، دەبینین هەر چاوگێك بێ ئەوەی هیچ بیرۆکێك هەبێ ، کە ( ن )ی چاوگی لێبکرێتەوە ، ئەوەی دەمێنێتەوە قەدە . وەك :

| | چاوگ | | قەد | |
|---|---|---|---|---|
| تێنەپەڕ | وەستان | - ن = | وەستا | وەستام |
| | لەرزین | | لەرزی | لەرزیم |
| | چوون | | چوو | چووم |
| | مردن | | مرد | مردم |
| | کەوتن | | کەوت | کەوتم |
| تێپەڕ | هێنان | - ن = | هێنا | هێنام |
| | کڕین | | کڕی | کڕیم |
| | درووն | | دروو | درووم |
| | خوێندن | | خوێند | خوێندم |
| | گرتن | | گرت | گرتم |

قـەدی کـردار لـە زمـانی کوردیـدا بنـەمای گشـت جـۆرە ڕابوردوویێکـی ( نزیـك ، بـەردەوام ، تـەواو ، دوور )ی ڕیـژەی ئیخبـاری و ئینشـائی‌یە و هـەروەها کەرەسـتەی پێکـهێنی نـاوی کـارا و نـاوی چـاوگ و نـاوی جێگایشە .

| قەفەزی سنگ | قفص الصدر | Thorax |
|---|---|---|

**قسە**

بـ . : ئاخاوتن

**قسەکەر**

بـ .: ئاخێوەر

**قوڕگ**

بـ .: ئەوك

| قۆناغ | المرحلة | Phase |
|---|---|---|

**کات** **الزمن** **Tense**

= تاف ، دەم

کات وەك دەوروبەر یەکێکە لە فۆرمەکانی هەبوونی واقیعی جیهان . بە باوەڕی ئێنگلس (( کرۆکی دەوروبەر و کات فۆرمی بنەڕەتیی هەموو هەبوونێکن ، هەبوون بە بێ کات هەمان بێ مانایی گەورەی هەبوونە بە بێ دەوروبەر )) . ڤ . ئی . لینین‌یش گەشەی بەم ڕایە داوە و وتوویە :

(( ... چۆن شت و تەن دیاردەی سادە و کۆمەکی دەرك نین ، بەڵکو واقیعی مەوزوعین و کار دەکەنە سەر هەستمان ، بە هەمان چەشن دەوروبەر و کاتیش فۆرمی سادەی دیاردە نین ، بەڵکو فۆرمی واقیعی مەوزوعیی هەبوونن . لە جیهاندا جگە لە ماددەی بزوێن هیچ شتێکی دی نی‌یە و ماددەی بزوێنیش بەبێ دەوروبەر و کات ناتوانێ ببزوێ )) .

لە پێکهاتنی وشەسازیی زمانی کوردیدا پێوەندیی دەوروبەر بەتایبەتی لە فۆرمی جۆربەجۆری کاتی کرداردا بەباشی دەبینرێ . بەم جۆرە ، کاتی ڕێزمانی وەك یەکێك لە فۆرمەکانی ڕەنگ‌دانەوەی واقیعی‌ی مەوزووعیی هەبوونی کات لە زماندا خۆی دەنوێنێ .

ئێمە لە هەر هەواڵێك لە ڕووی پێوەندی بە کاتەوە وردببینەوە ، هەمیشە کەڵك لە مەودای جیابوونەوە وەردەگرین . لە ڕێزماندا ئەو مەودای جیابوونەوەیە بریتی‌یە لە دەمی ئاخاوتن بەپێی ئەو بۆچوونە دەشێ بڵێین

کاتی ڕێزمانی بەندە بە هۆش و ئاگای ئاخێوەرەوە . کاتی ئێستا وەك یەككەوتن لەگەڵ دەمی ئاخاوتندا تەماشا دەكرێ . کاتی ڕابوردوو ـ وەك پێش ئەو دەمە ؛ کاتی ئایندەش وەك دوای . لە ڕاستیدا جیاکردنەوەی کاتەکانی ڕێزمانی بەپێی مەبەستی ئاخێوەر ( یان نووسەر ) دیاری دەکرێن .

با تەماشای ئەو نموونەیە بکەین :

خۆ تاکو دەمرم لێم نابێتەوە

کەواتە ، واتەی چیم لێ‌بێتەوە

( پیرەمێرد ، ل ١١٠ )

ئەم وشانە بۆ ئەو دەمەی پیرەمێرد نووسیونی ، کاتی ئایندەیان ڕاگەیاندووە ( واتە ـ دوای نووسینی وشەکان ) ، بەڵام بۆ ئێمە بوونەتە ڕابوردوو . لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ، ئەوە لەبەرچاو بگرین ، کە خودی دەمی ئاخاوتن دەمێك نی‌یە خۆیەکیەتی دیاری بکرێ و بەتەواوی پێوەندی بە هۆش و ئاگای قسەکەرەوە هەبێ ، بەڵکو ڕەنگدانەوەی پێوەندیی هەبوونی مەوزووعی‌یە بەبێ ئاخێوەر . دەمی ئاخاوتن ، واتە ئەو دەمەی شتێك دەوترێ یان دەنووسرێ و بەپێی کاتی ڕوودان هاوجووت دێن و کاتی ئێستا ڕادەگەیەنێ . ئەوەی پێشیشی دەکەوێ کاتی ڕابوردووە و ئەوەش کە بە دوایدا دێ کاتی ئایندەیە . هەرچی دەمە پێوەندی هەر بە هۆش و ئاگای قسەکەرەوە نی‌یە ، بەڵکو بەو کەسانەشەوە هەیە کە ڕووی قسەکردنیان تێ‌دەکرێ . ئەم دەمەش بەپێی تێ‌پەڕبوونی مەوزووعیی کاتەوە دەشێ بە تەواوی ، دیار بێ .

بۆ لێکۆڵینەوەی کاتی ئێستا لەباری واتاوە ، بەر لە هەر شت پێویستە سنوور لە نێوان کاتی ڕەها ( المطلق ) و پێوەند ( النسبي ) دابنرێ . کاتی ڕەها ڕاستەوخۆ پێوەندیی پرۆتسێس بە دەمی ئاخاوتنەوە ڕادەگەیەنێ . کاتی پێوەند پێوەندیی پرۆتسێس بە کاتەوە وا ڕادەگەیەنێ ، کە جێ بەجێ

بوونی بە کردارێکی دی دەربڕرابێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو فۆرمە لە بارێکدا دەتوانێ واتای کاتی ڕەها بدا و لە بارێکی دیدا واتای کاتی پێوەند بگەیەنێ . هەرسێ کاتە بنەڕەتییەکەی زمانی کوردی ، بەر لە هەرشت واتای ڕەهایان هەیە ، بەڵام لە حاڵاتی دیاریکراودا دەتوانن واتای پێوەندیش ڕابگەیەنن . پێویستە سنوور لە نێوان بەکارهێنانی کات لە ڕستەی سەرەکی و ڕستەی شووێنکەوتوودا دابنرێ . واتای کاتی پێوەند بە زۆری لە ڕستەی شوێنکەوتوودا دەردەکەوێ .

کاتی ئێستا پتر خاوەنی واتای جۆربەجۆرە . دوو واتای بنەڕەتی هەیە : یەکەم - ڕووداندنێك ڕادەگەیەنێ ، کە لەگەڵ دەمی ئاخاوتنندا یەك بکەوێ ؛ دووەم - ڕووداندنێك ، کە بە بەردەوامی جێ بەجێ دەکرێ ، لە گشت کاتێکدا و لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ دەمی ئاخاوتنندا یەك دەکەوێ .

کاتی ئێستا لەتەك ئەو دوو واتا بنەڕەتییەدا ، گەلێ جاریش بۆ دەربڕینی ڕووداندنێك بەکاردێنرێ ، کە لە ڕابوردوودا ڕووی دابێ ، یان بۆ ڕووداندنێك کە لە ئایندەدا ڕوو بدات . بەکارهێنانی کاتی ئێستا بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵێك ، کە لە زوودا ڕووی دابێ ، زیندوویەتییێکی گەورە بە گێڕانەوەی چیرۆك دەدات و لە لاتینیدا بۆ ئەم جۆرە دەربڕینە زاروەی (Prasens historicum) - واتە ( کاتی ئێستای مێژوویی ) بەکاردەبرێ .

کاتی ئێستا هەروەها بۆ دەربڕینی واتای کاتی ئایندەش بەکاردێنرێ : ( سبەینێ دەچین بۆ سەیران ) . وشەی بارودۆخی ( سبەینێ ) بە ئاشکرایی ڕووداندن لە ئایندەدا نیشان دەدا .

کاتی ئایندەش بۆ ڕاگەیاندنی کاتی ڕابوردوو بەکاردێنرێ . کاتی ڕابوردووش وێڕای واتای ڕاستەوخۆی ، کە ڕاگەیاندنی ڕووداندنی بەسەرچووە ، هەروەها دەتوانێ کاتی ئێستا یان ئایندەش نیشان بدا .

- کاتی ئاینده    المستقبل    **Future tense**

ب . : کاتی ڕانەبردوو

- کاتی ئێستا    المضارع    **Present tense**

بـ.: کاتی ڕانەبوردوو

- کاتی ڕابوردوو    الماضي    **Past tense**

کرداری ڕابـوردوو ئـەو کردارەیـە ، کـە پرۆتسێسـی ڕوودانەکـەی پێـش ئاخاوتن بکەوێ .

لە زمانی کوردیدا کرداری ڕابوردوو چوار جۆری هەیە :

١- ڕابوردووی نزیك    بـ.: کاتی ڕابوردووی نزیك

٢- ڕابوردووی بەردەوام    بـ.: کاتی ڕابوردووی بەردەوام

٣- ڕاوبردووی تەواو    بـ.: کاتی ڕابوردووی تەواو

٤- ڕابوردووی دوور    بـ.: کاتی ڕابردووی دوور

- کاتی ڕابوردووی بەردەوام    الماضي المستمر

Past continuous

ئەم جۆرە فۆرمە ڕوودانێکی وا ڕادەگەیەنێ ، کە پرۆتسێسەکەی بەردەوام بێ و کۆتایی دیار نەبێ و بەتایبەت :

١- بۆ دووبارە بوونەوەی کارێك لە ڕابوردوودا .

٢- لە بارودۆخی مەرجیی نەهاتنەدی ڕوودانێك .

کەرەسـتەی بنـەڕەتیی فۆرمـی کـاتی ڕابـوردووی بـەردەوام بریتییـە لـە نیشانەی ( دە / ئە ) و قەدی کردار و جێناوی لکاو :

أ) ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بێ بەهەمان شێوەی ڕابوردووی نزیک جێناوی لکاوی بێهێز وەردەگرێ و جێناوەکەش لە هەموو شێوە ڕۆنانێکی کردارەکەدا هەر دەکەوێتە دوای قەدەوە .

ب) کرداری ڕابوردووی بەردەوامی تێپەڕ هەروەك کرداری ڕابوردووی نزیك جێناوی لکاوی بەهێز وەردەگرێ ، بەڵام :

* ئەگەر کردارەکە سادە بێ ، جێناوەکە دەکەوێتە پێش قەدی کردارەکە و دوای نیشانەکە .

* بێتو کردار داڕێژراو یان لێکدراو بێ ، ئەوە جێناوەکە لە پێش نیشانەکەوە دێت .

## ـ کاتی ڕابوردووی تەواو الماضي التام Present perfect

ئەم جۆرە فۆرمەی ڕابوردوو ، ئەگەرچی دەتوانێ چەند حاڵەتێکی جۆراوجۆر دیاری بکا ، بەڵام بە زۆری ئەنجامی ڕووداوێك ڕادەگەیەنێ ، کە ئەسەر و ئەنجامی لە کاتی ئێستادا هەبێ .

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی ڕابوردووی تەواو بریتییە لە قەدی کردار و نیشانەی (وو) و جێناوی لکاو . یاخود دەشێ بوترێ لە گەشەپێدانی فۆرمی ناوی کاراوە دروستبووبێ :

أ) ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بێ بەهەمان چەشنی ڕابرودووی نزیك و بەردەوام جێناوی لکاوی بێهێز وەردەگرێ و جێناوەکەش لە گشت چەشنە ڕۆنانێکی کرداردا هەر لەپاش قەدەوە دێت ـ واتە :

قەد + نیشانەی ( وو ) + جێناوی بێهێز

ب) کرداری ڕابوردووی تەواوی تێپەڕ ، وەك ڕابوردووی نزیك و ڕابوردووی بەردەوام تەنیا جێناوی بەهێز وەرناگرێ ، بەڵکو لەیەك کاتدا هەردوو جۆرەکە ـ واتە بەهێزیش و بێهێزیش وەردەگرێ .

## ـ کرداری ڕابوردووی دوور الماضي البعيد Past perfect

فۆرمی کرداری ڕابوردووی دوور ڕوودانێك ڕادەگەیەنیٚ ، کە ڕوودانەکەی پێش ڕوودانی کردارێکی دی بکەویٚ .

بەوێنە . کە دەڵێین : ( کاتیٚ چووین بۆ لای ئازاد ، نوستبوو ) ، ئەوە ئاشکرا دیارە ، کە ( نوستن )ی ئازاد پێش ( چوون )ی ئێمە کەوتووە ـ واتە بەر لەوەی بچینە لای ئازاد ، ئەو نوستبوو .

فۆرمی کرداری ڕابوردووی دوور تەنیا هەر ڕوودانێك ڕاناگەیەنیٚ ، کە ڕوودانەکەی پێش ڕوودانی کردارێکی دی کەوتبیٚ ، بەڵکو ئەوەش نیشان دەدا ، کە ئەو ڕوودانە دەشیٚ پێوەندی بە کاتێکی دیاریکراوەوە هەبیٚ . لەم هەل و مەرجەدا دەکریٚ ، لە پێش فۆرمی ناوبراوەوە وشەی سەر بە بارودۆخی وەك : ( دوێنیٚ ، پێریٚ ، پار ، پێرار .. ) بەکاربهێنریٚ :

ئازاد پار هاتبوو بۆ بەغدا

کەرەستەی بنەڕەتیی ڕابوردووی دوور بریتییە لە قەدی هەر کردارێك و قەدی کرداری ( بوون ) و جێناوی لکاو :

أ) ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بیٚ :

قەدی کردارێکی تێنەپەڕ + قەدی کرداری ( بوون ) + جێناوی بیٚهێز

ب) بێتو کردارە ڕابوردووە دوروەکە تێپەڕ بیٚ :

سادە : قەدی هەر کردارێکی تێپەڕ + قەدی کرداری ( بوون ) + جێناوی بەهێز .

داڕێژراو : پێشگر + جێناوی بەهێز + قەدی هەر کردارێکی تێپەڕ + قەدی کرداری ( بوون ) .

لێکدراو : وشەی واتادار + جێناوی بەهێز + قەدی هەر کرادرێکی تێپەڕ + قەدی کرداری ( بوون ) .

## ـ کاتی ڕابوردووی نزیك          الماضي القريب          Simple past

ئەم جۆرە فۆرمە ـ واتە کاتی ڕابوردووی نزیك ، بە گشتی ڕوودانێك ڕادەگەیەنیٚ ، کە لە کاتی ڕابوردوودا ڕووی دابیٚ و کۆتایی هاتبیٚ :

( ئازاد چوو بۆ قوتابخانە ) .. لە ناوەرۆکی ئەم فۆرمەدا واتای کورتی و درێژی ، بەردەوامی و کۆتایی نەهاتن نییە ، بەڵام هەندیٚ جار مەبەستی ڕستە و بوونی وشەی خاوەن واتای باروودخ وای لیٚدەکەن واتای بەردەوامی و کۆتایی نەهاتن بگەیەنیٚ . وەك : ( هەزار جار هات و هیچی نەکرد ) ؛ ( مام شاسوار چەند ساڵێك لەسەر جێگە کەوت ) .

وشەی سەر بە بارودۆخ دەتوانیٚ کار بکاتە سەر فۆرمی کاتی ڕابوردووی نزیك و واتای ئایندەی پیٚڕابگەیەنیٚ :

کەمیٚ بووەستە ، واهاتم .

ئەگەر سبەینیٚ هاتم . گلەیی مەکە .

کەرەستەی بنەڕەتیی فۆرمی کاتی ڕابوردووی نزیك قەدی کردار و جێناوی لکاوە :

أ) ئەگەر کردار تێنەپەر بیٚ ، ئەوە جێناوی دەستەی بیٚهێز وەردەگریٚ . کردارەکەش چ سادە و چ داڕێژراو و چ لێکدراو بیٚ ، جێناوەکە دەکەوێتە دوای قەدەکەیەوە .

ب) هەرچی کرداری تێپەڕە جێناوی لکاوی بیٚهێز وەردەگریٚ ، بەڵام :

* ئەگەر کردارەکە سادە بیٚ جێناوەکە دەکەوێتە دوای قەدەکەیەوە .

* بێتو کردار داڕێژراو یان لێکدراو بیٚ ، ئەوە جێناوەکە لە پێش قەدی کردارەکەوە دێت .

## ـ کاتی ڕانەبوردوو          زمن الحال وزمن الاستقبال

## Present and future tense

کرداری ڕانەبوردوو ئەو کردارەیە ، کە پرۆتسێسی ڕوودانێك لـە دەمـی ئاخاوتن یاخود دوای ئاخاوتندا نیشان دەدا .

لـە دیـالێکتی کرمـانجیی خـوارووی کوردیـدا کـردار چ تێپـەڕ بـێ و چ تێنەپـەڕ ، چ سـادە و چ داڕێـژراو و چ لێکـدراو بـۆ پێکـهێنانی فۆرمـی ڕانەبوردووی نیشانەی (دە/ئە) دەخرێتە پێش ڕەگی کاتی ڕانەبوردوویەوە و بەدوا ڕەگەکەشیدا جێناوی لکاوی جۆری بەهێز دادەنرێ .

فۆرمی کاتی ڕانەبوردوو دەکرێ بۆ ئەم مەبەستانە بەکاربهێنرێ :

١ـ پرۆتسێسی ڕوودان لە کاتی ئاخاوتندا .

٢ـ پرۆتسێسی ڕوودان لە کاتی ئایندەدا .

٣ـ گێڕانەوەی ڕوودانێك لە ڕابوردوودا ڕووی دابێ .

٤ـ پرۆتسێسی درێژەپێدان و بەردەوامی دووپات بوونەوە .

٥ـ پرۆتسێسـی ڕوودانـی کـارێك ، کـە ڕاسـتی‌یێك نیشـان بـدا . ئـەو ڕاستی‌یەش دەشێ هەمیشـەیی بێ و هـەر سێ کاتەکە ( ئێسـتا و ئـایندە و ڕابوردوو ) وەك یەك بگرێتەوە .

کاتی ڕانەبوردووش دوو جۆرە :

أ ـ کاتی ئێستا .

ب ـ کاتی ئایندە .

لـە بەشێکی زۆری زمانـەکانی جیهاندا ئەو دوو کاتـە ( ئێستا و ئـایندە ) فۆرمی جیاوازیان هەیە . لە دیالێکتی خوارووی کوردیـدا لـە ڕووی فۆرمـەوە جیاوازی لە نێوان فۆرمی کاتی ئێستا و کاتی ئایندەدا نی‌یە و هـەردووکیان هەر یەك قاڵبیان هەیە و جیاکردنەوەیان یان لە ڕستەدا دەردەکەوێت یان بە هۆی باری دەوروبەری‌یەوە ئاشکرا دەبێت ، یان لە ڕێـی بەکارهێنانی وشـەی تایبەتی‌یەوە ڕوون دەبێتـەوە . بـەڵام لـە دیالێکتی کرمـانجیی ژووروودا نـەك

هەر بە ئاسانی جیاوازی لە نێوان فۆرمی کاتی ئێستا و کاتی ئایندەدا دەکرێ ، بەڵکو بۆ جیاکردنەوەیان نیشانەی مۆرفۆلۆژی‌یش هەیە .

لە کرمانجیی خوارووداا بۆ جیاکردنەوەی کاتی ئێستا و کاتی ئاینده هیچ نیشانەییێکی وشەسازی نی‌یە . جیاکردنەوەیان بە ڕێگەی لێکسیکی ـ واتە بە یاریدەی هەندێ وشە ـ ( بەتایبەتی ئاوەڵکردار)ەوە مەبەست دەردەبڕێ .

بەوێنە بۆ پتەوکردن و نیشاندانی بەجێ‌هێنانی پرۆتسێسی ڕوودان لە دەمی ئاخاوتنندا گەلێ جار ( وا ، ئەوا ، ئێستا ، هەنووکە ... ) بەکاردێنرێ . وەك :

وا دێم

ئەوا دێم

ئێستا دێم

هەنووکە دێم

... هتد .

بۆ بەجێ‌هێنانی کارێکیش لە ئایندەدا وشە و دەستەواژەی وەك : ( سبەینێ ، دووسبەی ، بەیانی ، دووبەیانی ، ساڵێکی‌دی ، ساڵێکی تر ، هاوینێ ، بەهارێ ، ئەم هاوینە .. تۆزێکی‌تر ، پاش ماوەیەك ... ) بەکاردێنرێ . وەك :

ساڵێکی دی دەڕۆم بۆ هەندەران

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا وەك وتمان ، بۆ جیاکردنەوەی کاتی ئێستا و کاتی ئاینده نیشانەی وشەسازی هەیە :

* کاتی ئێستا :

نیشانەی ( د ـ di ) + ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار + جێناوی لکاوی بێ‌هێز :

ئەز دنڤیسم = د + نڤیس + م

ئەز دکەڤم = د + کەڤ + م

* کاتی ئاینده :

نیشانەی ( دێ ، وێ ) + ڕەگی کاتی ڕانەبوردووی کردار + جێناوی لکاوی بێهێز :

ئەز رێ کەڤم

ئەز وێ کەڤم

واتە نیشانەی ( د ـ di ) بۆ کاتی ئێستایە و ( دێ ) و ( وێ)یش هی کاتی ئایندەیە .

کار

بـ .: کردار

ـ کاری داڕێژراو

بـ .: کرداری داڕێژراو

| کارا . | الفاعل | Subject |
|---|---|---|

= بکەر

| کارەکی | العملي | Practical |
|---|---|---|

| کاسەی سەر | الجمجمة | Skull , Cranium |
|---|---|---|

= کەللەسەر

کەپوو

بـ .: لووت

**کەرت**

بـ .: پارچە

**کەللەسەر**

بـ .: کاسەی سەر

**کەناری زمان**

بـ.: لێواری زمان

**کەوانەی دووتایی (( )) علامە التنصیص**

**Inverted commas , Quotation marks**

دەقی وەرگێراوی بێدەستکاری دەخرێتە نێوان کەوانەی دووتایی‌یەوە ـ واتە کەوانەی دووتایی نیشانی قسەی ڕاستەوخۆ دەدات . لەم حاڵەتەدا دەشێ بڵێین ئەرکی تاڕادەیەك بریتییە لە خستنە پێش چاو و دەرخستنی بەشێکی تێکستەکە .

بۆ نموونە :

ئێمە لە کوردەواریدا بەم جۆرە دەڵێین : (( گورگەزێ )) ..

( دمدم ، ل ٤٢ )

دوکانداران بانگیان دەکرد : (( وەرن برا وەرن ، وەرن کاکە وەرن ، ماڵی چاك و هەرزان بکڕن )) ...

( دمدم ، ل٢٦)

ئەو قژە زەردە ، ئەو چاوانە ڕۆ !

ئەو نەغمەی (( دایە )) و ( بابە )) جوانە ڕۆ !

( گۆران ، ل٩٤ )

کاتیَ ناوی کتیَب ، گۆڤار ، ڕۆژنامە ، وتار ... ناوی کۆمەڵە ، لیژنە . دەزگا ... بە کەوانەی دووتایی جیادەکریَنەوە و دیاری دەکریَن . ئەوە کەوانەی دووتایی دەبیَتە وەسیلەی ڕازاندنەوە و بیَدەستکاری نیشاندانیان .

کتیَبی ((کوردستان و کورد)) شاکاری قاسملووە .

( میَژوو ، ل ٢١٥ )

گۆڤاری (( هاوار ))یش بەشی خۆی بایەخی بە میَژوو داوە .

( میَژوو ، ل١٣٧ )

میَژووی کورد لە ڕۆژنامەی (( تیَگەیشتنی ڕاستی))دا باش ڕەنگی داوەتەوە .

( میَژوو ، ل١٣٦ )

وتارە نایابەکانی خوالیَخۆشبوو ئیسماعیل حەقی شاوەیس ... وەك : ((کۆمەڵی کوردستان)) و ((ناودارانی کورد . مەلا سەلیم ئەفەندی)) و ((کۆمیتەی ئیستقلالی کوردستان)) ...

(میَژوو ، ل١٤٨)

یەکیَکیش لە بڕیارەکانی کۆنگرە دەربارەی دامەزراندنی ((کۆمەڵەی کوردناسیی جیهانی)) بوو .

(میَژوو ، ل٢٤٤)

لە لیژنەی ((ئیمپریالیزم و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی))دا .

(میَژوو ، ل٢٤٢)

... هتد .

کپ المهموس Voiceless

## کردار | الفعل | Verb

= کار ، فرمان

کردار بەشێکی گرنگی ئاخاوتنە و چ بە چەندێتی و چ لە دەور و چالاکیدا دیار و بەرچاوە .

کردار لە زمانی کوردیدا خاوەنی تایبەتێتیی حاڵەتی کەس ( یەکەم ، دووەم ، سێیەم ) ؛ ژمارە ( تاك ، کۆ ) ؛ کات ( ڕانەبوردوو : ئێستا ، ئایندە . ڕابوردوو : نزیك ، بەردەوام ، تەواو ، دوور ) ؛ ڕێژە : ( ئیخباری ، ئینشائی ، داخوازی ) ؛ ئەرێتی و نەرێتی ؛ تێپەڕی و تێنەپەڕێتی ؛ کارا دیاری و کارا بزری ؛ سادەیی و ناسادەیی ( داڕێژراو ، لێکدراو ) ؛ ڕەگ و قەدە ...

کردار لە پێکهاتنی ڕێزمانیی کوردیدا جێگەیێکی دیار و گرنگی هەیە ، وەك : مەودای بەرفراونیی بەکارهێنانی و فۆرمی زۆر و جۆربەجۆری و دەوری لە سازکردنی ڕستەدا ... وێڕای بایەخی گەورەی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی پێکهاتنی ڕێزمانی بە گشتی و تێگەیشتنی یاسای ناوەکی و پێکشەوتن و گەشەکردنی بەتایبەتی ، هەروەها لە پێشخستنی کاری فەرهەنگنووسیشدا جێپەنجەی لێکۆڵینەوەی کردار بە ئاشکرا دیارە .

ئەو کێشە گرنگانەی لە لێکۆڵینەوەی سیستەمی کرداری کوردیدا خۆیان دەنوێنن ، ئەمانەن :

١ـ کێشەی سنووری کردار وەك دانەیێکی لێکسیکی .
٢ـ کێشەی سیستەمی حالاتی کردار .
٣ـ کێشەی سیستەمی فۆرمی ڕێزمانیی کردار .
٤ـ کێشەی پێکهاتنی وشەسازی ( مۆرفۆلۆژی)ی کردار .

## ـ کرداری بوون | افعال الکینونة | Verb to – be

## ـ کرداری تێپەڕ الفعل المتعدي Transitive verb

کرداری تێپەڕ واتای چالاکیی کارا و ڕێچکەی بەرەو بەرکار نیشان دەدا : زەوی دەکێڵین ؛ ڕۆژنامە دەخوێنمەوە .. ئەم جۆرە ڕوودانانە ناشێ بەبێ بەرکار بێ : ( کێڵان ) ناکرێ ، ئەگەر ( زەوی) نەبێ . (خوێندنەوە) پێك نایە ، ئەگەر ( ڕۆژنامە ) یان (کتێب) یان هەر کەرەستەییێکی دی خوێندنەوە نەبێ . بەرکار واتای ئەو کردارانە ڕوون دەکاتەوە و دەچەسپێنی . گەلێ جار بەبێ بەرکار واتای تەواو ناگەیەنێ . بۆ نموونە : ( قوتابی‌یەکە خوێندییەوە ) ؛ ( ئازاد هێنای ) ...

کرداری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

١ـ ئەو کردارەی پێویستی بە یەك بەرکار هەیە و تاوی ناڕوا بۆ دووەم . وەك :

گورگ مەڕ دەخوات : ( مەڕ ) ـ بەرکارە

زەویم کێڵا : ( زەوی ) ـ بەرکارە

٢ـ ئەو کردارەی پێویستی بە پتر لە بەرکارێك هەیە :

پارەت دەدەمێ : ( پارە ) و ( ت : تۆ ) بەرکارن .

## ـ کرداری تێنەپەڕ الفعل اللازم Intransitive verb

کرداری تێنەپەڕ پێوەندیی ڕوودان بە کاراوە ڕادەگەیەنێ : ( منداڵەکە نوست ) ؛ ( پووشەکە سووتا ) ... ئەم جۆرە کردارانە پێویستیان بە بەرکار نییە .

جیاوازی لە ڕووی پێوەندی بە بەرکارەوە ، دەبێتە تایبەتێتی‌ییێکی ڕستەسازیی دوو دەستە کرداری تێپەڕ و تێنەپەڕ .

لە زمانی کوردیدا کرداری تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە :

١ـ تێنەپەڕی خوازەکی ( الارادی )

لەم جۆرە کردارانەدا دەوری کارا شتێکی ئاشکرا و ئیرادییە . وەك :

ئازاد هات

کوڕەکە ڕۆیشت

٢ـ تێنەپەڕی ڕوودان

لەم جۆرە کردارانەدا کارا دەورێکی تایبەتی خۆی نییە بەو واتایە ، کە ئیشەکە بەبێ خواهیشتی کارا دێتە دی . وەك :

ئاوەکە ڕژا

شووشەکە شکا

ـ کرداری تێنەپەڕی خوازەکی

بـ .: کرداری تێنەپەڕ

ـ کرداری تێنەپەڕی ڕوودان

بـ.: کرداری تێنەپەڕ

ـ کرداری داڕێژراو      الفعل المشتق      Derivational verb

= کاری داڕێژراو

بـ .: وشەی داڕێژراو

لە زمانی کوردیدا نزیکەی ( ٢٠ ) پێشگر و ( ٢ ) پاشگر هەن ، کە دەچنە سەر کرداری سادە و دەیکەنە کرداری داڕێژراو .

أـ پێشگر

١ـ ( دا ـ ) : دابەزین ، داگرتن ، داتەکاندن ...

٢ـ ( ڕا ـ ) : ڕاهاتن ، ڕامالین ، ڕاکردن ...

٣ـ ( هەڵ ـ ) هەلچوون ، هەلمالین ، هەلگەڕان ...

٤ ـ ( ڕۆ ـ ) : ڕۆکردن ، ڕۆچوون ، ڕۆنان ...

٥ - ( وەر - ) : وەرگێڕان ، وەرچەرخان ، وەرگرتن ...

٦- ( پێ -) : پێکەنین ، پێزانین ، پێناسین ...

٧- (تێ - ) : تێکردن ، تێگەیشتن ، تێگرتن ...

... هتد .

ب - پاشگر

١- ( - وە / - ەوە ) : چوونەوە ، کردنەوە ، خواردنەوە ...

٢- ( - اندن )) : سووتاندن ، ڕووخاندن ، دڕاندن ...

- کرداری کارا بزر الفعل المبني للمجهول Passive

= کرداری کارا نادیار

لە فۆرمی کرداری کارا بزردا پرۆتسێسی دیاریکردنی کردار بۆ ئەو شتە ئاراستەکراوە ، کە وشە تەرخان کراوەکە لەگەڵ فۆرمی کردارەکە هاوجووت بێ و لە ناوەوە بەرەو دەرەوە بچێ .

لە ڕستەی ( نامەکە لەلایەن ئەوانەوە نووسرا )دا ، کردارەکە لە فۆرمی کارا بزریدا خۆی دەنوێنێ و پرۆتسێسی دیاریکراوی هاوجووتی لە وشەی ( نامە )وە نییە ، بەڵکو بۆی ئاراستە کراوە . لەم نموونەیەدا ، هەروەها ئەوەش ئاشکرایە ، کە سەرچاوەی ڕوودان لە کوێوە هەڵدەقوڵێ :

لێرەدا کارکەر بە ڕستەی تەواوکەری ( لەلایەن ئەوانەوە ) دەربڕراوە لەگەڵ ئەوەدا( دیاریکردنی کارکەر ) شتێکی پێویست نییە . ئەگەر دیاریکردنی کارکەر لە ناواندا نەبێ ، ئەوە لە حاڵەتێکی یەکجار زۆردا فۆرمی کردار بە شێوەی سست دەمێنێتەوە .

کرداری کارا بزر لە ڕووی واتاوە هاوشانی کرداری کارا دیارە ، بەلام خاوەنی خاسیەتی وشەسازی و ڕستەسازیی خۆیەتی . لە زمانی کوردیدا کرداری کارا بزر بە زۆری بە لکاندنی پاشگری ( - ر ) بەکرداری کارا دیارەوە دەردەبڕێ و ئەمەش ڕێگەی وشەسازییە . وێڕای ئەمە ڕێگەی

ڕستەسازی و شیکاریش هەیە ، کە لە ئەنجامی جیاوازیی ڕستەسازی لە دەربڕینی کارا و بەرکاری ڕووداندا ، یان بوونی بەرکاری ڕوودان و نەبوونی یەکجارەکی . یاخود جیاوازیی فۆرم و واتای ئەو ناوانەی کردارەکە ئاراستەدەکەن ... پێکدێ .

نیشانەی کارا بزری کاتی ئێستا لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا پاشگری ( ـ یە )ە . کاتی ئێستای کارا بزر بە لکاندنی ئەو پاشگرە بە ڕەگی کرداری کاتی ئێستاوە دروست دەبوو و بە دوا ئەویشدا کۆتایی پێویست دادەنرا . بەوێنە کرداری (( کارتان )) ( کردن ) بۆ کەسی سێیەمی تاکی کرداری کارا بزری کاتی ئێستا دەبێ بە (( کونیهێت )) . کرداری (( خوارتان ))( خواردن ) لە کەسی سێیەمی تاکی کارا بزری کاتی ئێستادا دەبێ بە ((خواریهێت)) ... کاتی ڕابوردووی کارا بزریش ، هەروەها لە ڕەگی کرداری کاتی ئێستا و هەمان پاشگری کارا بزریی ( ـ یە ) سازبووە ، بەڵام کۆتایی تایبەتی ( یست )ی وەرگرتووە . بۆ نموونە ، کرداری (( داتان )) ( دان ) لە کەسی سێیەمی تاکی کارا بزری کاتی ڕابوردوودا دەبێ بە ( داهیهێست )) . کرداری (( کارتان )) ( کردن ) لە ڕابوردووی کارا بزریدا ڕەگی کۆنی بەکاردێ ـ کاریهێست )) .

لە زمانی فارسیی نوێدا ئەگەرچی (( شد )) و (( گشت )) و (( گردید )) یاریدەی سازکردنی کرداری کارا بزر دەدەن ، بەڵام ((شد)) پتر بەکاردێنرێ . بۆ نموونە (( بردەشد )) ( برا )) ، ( ( خوردەشد ) ( خورا )) . (( زردەشد )) ( لێدرا ) .

لە دیالێکتی ڕۆژئاوای زمانی بلووجیدا کارا بزر بە هاتنی چاوگ لەگەڵ فۆرمی گەردان کراوی کرداری (( بایاگ )) ( بوون )دا دروست دەبێ . بۆ نموونە (( مان کوشاگا بان )) ( من دەکوژرێم ) ، (( ئێ کوشانگا بیت )) ( ئەو دەکوژرێ ) ... هتد . لە دیالێکتی ڕۆژهەڵاتیشدا کارا بزر لە فۆرمی ڕەگی

کاتی ئێستای کردار و پاشگری ( ـ یژ )ی لە زمانی هیندییەوە وەرگیراو و کۆتاییەکانی کردار پێك دێت .

لە زمانی پشتۆدا حاڵەتی کارا بزر لە کرداری تێپەڕەوە دروست دەبێ . بۆ پێکهێنانی ئەم ڕێژەیە ، کرداری یاریدەدەری ( کیدل ) و هاوتاکانی ( سول . شول ) دەوردەبینن .

کارا بزر لە زمانی ڕووشانیدا لە ڕەگی کاتی ڕابوردووی کردار + پاشگری ( ـ اك ) + کرداری یاریدەدەری (( ساو ، سوت )) ( بوون ) پێك دێ .

لە زوودا بەکارهێنانی پاشگری ( ـ ر ) وەك کەرستەی سازکردنی حاڵەتی کارا بزری بە تایبەتێتییێکی زمانی گرووپی ئیتالی تەماشا دەکرا ، بەڵام دواتر زمانناسان لە قووڵبوونەوەی لێکۆڵینەوەی بەراوردی ڕێزمانی زمانە هیند و ئەوروپاییەکاندا تا دەهات ڕوونتر پێوەندیی و نزیکیی ئەو زمانانەیان ئاشکرا دەکرد . یەکێك لەو دۆزینەوانە نیشاندانی خاسیەتی بەکارهێنانی هەمان پاشگری ( ـ ر )ە لە زمانە کەلتییەکاندا . ئەم وێکچوونە بووە هەوێنی وەدەست هێنانی ئەنجامی گەورەتر .

لە لێکۆڵینەوەی بەراوردیی تایبەتێتی ڕێزمانی زمانە هیند و ئەوروپاییەکاندا بەڵگەی هەندەکی (الجزئي) هاوجووتی ئەوتۆ سەرنج ڕادەکێشێ ، کە نەك سەرجەمی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان ، بەڵکو بەشێکیان دەگرنەوە . یەکێك لە نموونەی ئەو دیاردەیە ، بریتییە لە پێکهاتنی حاڵەتی ناوەندیی کارا بزری بە یاریدەی ( ـ ر ) ، کە تا دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی تۆخاری و هیتی ، تەنیا وەك تایبەتێتی خاسیەتی گرووپی زمانی ئیتالی و کەلتی تەماشادەکرا .

لە زمانی لاتینیدا فۆرمی کرداری کارا بزر بە ڕێگەی ئیزافەکردنی کۆتایی بۆ سەر ڕەگی کردار پێك دێ . ئەگەر کردارەکە بەر گەردانی یەکەم یان دووەم یان چوارەم بکەوێ ، کۆتایی ( ri ) وەردەگرێ ، بەڵام بێتو سەر بە گەردانی سێیەم بێت ، ئەوە ( i )ی دەخرێتە سەر .

## ـ کرداری کارا ... الفعل المبني للمعلوم Active

فۆرمی کارا دیار نیشانی دەدا پرۆتسێسی دیاریکردنی کردار لەو شتەوە دێ ، کە بۆ ئەو وشەیە تەرخان کرابێ و لەگەڵیدا فۆرمی کردارەکە هاوجووت بێ و لێیەوە بەرەو ناوەوە بچێ .

بۆ نموونە لە ڕستەی ( ئازاد نامەی نووسی ) دا ، کردارەکە فۆرمی دیاری هەیە و واتای پرۆتسێسێك دەگەیەنێ ، کە لە کەسێکی ناسراو ( ئازاد )ەوە پەیدا بووبێ و ئاراستەی ناوەوە کرابێ . ئەوەی پێوەندی بە نیشانەی بەرکارەوە هەبێ ، لەم بارەدا هەرگیز شتێکی پێویست نییە . ڕستەی ( ئازاد دەتوانێ بنووسێ ) ئەگەرچی ڕێژەی کارا دیارە ، بەڵام هیچ ئیشارەتێك بۆ بەرکار نەکراوە ( لەبەر نەبوونی تەواوکەری ڕاستەوخۆ ) . بەم جۆرە بوونی تەواوکەر ( ئیشارەت کردن بۆ بەرکاری ) لە دیاریکردنی کارا دیاری و کارا بزریدا شتێکی پێویست نییە ، بەڵام بوونی تەنیا لە جیاکردنەوەی تێنەپەڕی و تێپەڕیدا دەور دەبینێ .

ئەو کردارە تێپەڕانەی واتای ڕووداوێك ، کە کارا ئەنجامی دابێ و چالاکانە ئاراستەی بەرکار کرابێ ، بەکارا دیار ناودەبرێن . حاڵەتی کارا دیاری خاوەنی ئەو خاسیەتە ڕستەسازییەیە ، کە کارای ڕوودان نیهادە و بەرکاریش ـ گوزارەیە .

## ـ کرداری کارا نادیار

بـ : کرداری کارا بزر

## ـ کرداری لێکدراو ... الفعل المركب ... Compound verb

بـ : وشەی لێکدراو

لە زمانی کوردیدا کرداری لێکدراو بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو پێك دێ :

١ـ بەیاریدەی ناو .

ناو ( مادی بیّ یا مەعنەوی ) دەتوانیّ لە پیّکهیّنانی کرداری لیّکدراودا بەشدار بیّ . وەك : ( دەست برِین ؛ پیّگرتن .. بیرکرنەوە ؛ شەرم کردن ) .

نـاوی دارِیّـژراو و لیّکدراویـش وەك نـاوی سـادە دەتوانـن یارمـەتیی پیّکهیّنانی کرداری لیّکدراو بدەن :

أ- ناوی سادە . وەك :

مل + نان = ملنان

سەر + شکاندن = سەرشکاندن

ب ـ ناوی دارِیّژراو . وەك :

جیّگە + کردنەوە = جیّگەکردنەوە

ریّگا = گرتن = ریّگاگرتن

ج ـ ناوی لیّکدراو . وەك :

چڵکاو + خواردن = چڵکاوخواردن

ماستاو + کردن = ماستاوکردن

ئاوەڵناویش ( سادە بیّ یا دارِیّژراو یا لیّکدراو ) هـەروەك نـاو دەتوانـیّ لـە رۆنانی کرداری لیّکدراودا بەشدار بیّ :

أ- ئاوەڵناوی سادە . وەك :

سوور + بوون = سووربوون

بڵند + کردن = بڵندکردن

ب ـ ئاوەڵناوی دارِیّژراو . وەك :

نەخۆش + کەوتن = نەخۆشکەوتن

بەهیّز + بوون = بەهیّزبوون

جـ . ئاوەڵناوی لیّکدراو .وەك :

سەرخۆش + بوون = سەرخۆشبوون

رِووڕەش +کردن = رِووڕەشکردن

و هەندیّ حاڵەتی دیّ .

### . کرداری یاریدەدەر الفعل المساعد Auxiliary

ئەرکی ڕێزمانیی کرداری یاردەدەر بریتی‌یە لە نیشاندانی پێوەندیی شتێك یان دیاردەیێك بە خاسیەتی‌یەوە : ئەو ئازا بوو ؛ ئەو بوو بە ماموستا ... هتد . لە دەربڕینی ئەم پێوەندی‌یەدا واتای ڕێزمانیی کرداری یاردەدەر هاوبەشە . وێڕای ئەوە ، هەر یەکەشیان خاوەنی تایەتێتی واتای سەربەخۆی خۆیەتی .

بێگومان ، ئەو کردارەی واتای جۆربەجۆری هەیە ، دەشێ بە تایبەتی پێوەندیی نێوان واتای و دۆخی ڕێزمانی‌یەکەی وەك یەك نەبن .

لە باری ڕوونیی واتای لێکسیکی‌دا ، واتای ڕێزمانی دەکەوێتە پلەی دووەمەوە ، بەڵام لە حاڵەتی کزبوونی واتای لێکسیکی‌دا دێتە پلەی یەکەم . بەو پێیە ، ئەگەر کرداری خاوەن واتای تەواو دەوری یاریدەدەری ببینێ ، ئەوە بە واتای لێکسیکیی ڕوونەوە خۆی دەنوێنێ و واتای هاوبەشیان زۆر ئاشکرا نی‌یە ... لە زمانی کوردیدا ئەگەرچی ژمارەیێك لەو جۆرە کردارانە بەرچاو دەکەون ، بەڵام ڕادەی هەرە دیاری کزبوونی واتای لێکسیکی لە کرداری ( بوون )دا دەبینرێ .

( بوون ) چاوگێکی تێنەپەڕە .

قەدی ئەم کردارە ، وەك هەموو چاوگێکی کوردی بە لێکردنەوەی ( ن )ی چاوگ سازدەبێ :

بوون - ن = بوو

هەرچی چۆنێتیی وەرگرتنی ڕەگەکەیەتی ، وەك کرداری ( چوون )ی تێنەپەڕی هاوەڵی بەر ڕێگە بنەڕەتی‌یەکە دەکەوێ ـ واتە لابردنی ( ن )ی چاوگ و دەنگەکەی پێشەوەی ( وو ) ـ

بوون - وون = بـ

( بوون ) وەك کرداری بوونەك ( فعل الكينونة ) بە مانای ( كان ، اصبح ، صار ... ) دێت ، واتە ( كان واخواتها )ی عەرەبی دەگرێتەوە .

کرداری ( بوون ) بە هەر واتاییك بێت و وەك کردارێکی تەواو لە مەیداندا بێ ، یان وەك کردارێکی یاریدەدەر دەور ببینێ ، لە ڕووی ڕێژە و کات و نەرێتییەوە وەك گشت کردارێکی تێنەپەڕی دی خۆی دەنوێنێ .

**کرۆك** اللب ، الجوهر **Kernel , Essence , Substnace**

**کڕکڕاگە** الغضروف **Cartilage , Gristle**

**کشانەوە** الانسحاب ، التراجع **Off – glide , Withdrawal**

کشانەوە ـ وتن بریتییە لە گۆڕینی ئەندامەکانی ئاخاوتن بۆ دۆخی هێمنی ، یان بۆ هەڵمەتی وتنی دەنگێکی دی . بەوێنە ، کشانەوە لە باری وتنی ( ت ) لە وشەی ( ترۆزی )دا لەوەدایە کە سەری زمان بەرەو ئاسمانە ڕەقە بەرز دەبێتەوە ، هەرچی دەنگەژێکانیشە لێك نزیك دەکەونەوە و درێژ دەبنەوە . کشانەوەی خێرا خۆی بۆ هەڵمەتی دەنگەکەی دواتر ئامادە دەکا و لەرینەوە ڕودەدات .

**کورتەبزوێن**

بـ.: بزوێنی کورت

**کۆ** الجمع **Plural**

ناوی کۆ

لە زوربەی زمانەکانی جیهاندا حاڵەتی کۆ هەیە ، بەلآم شێوەی کۆ لە زمانانی جیاوازدا وەك یەك نین ، بەوێنە لە زمانی ( مالایی)دا دووپاتکردنەوە ، نیشانەی کۆیە ، وەك : (( Orang )) ـ ( مرۆڤ ) ،

(( Orang - Orang )) ـ ( مرۆڤان ) . لە زمانی ( شیلووکی ) ئەفەریقادا گۆڕینی ئاواز ( Intonation ) کۆ دەردەخات ، وەك : (( jit ـ ژیت )) ئەگەر بە ئاوازی بەرز دەربڕری ، ئەوە بە واتای ( گویٚ ) دیٚت ـ واتە تاکە . بەلاّم کاتیٚ بە ئاوازی نزم بەدەمدا بیٚت ، ئەوسا بە واتای ( گویٚیان ) دیٚت ـ واتە لەم حاڵەتەدا کۆیە . لە زمانی ئەڵەمانیدا گۆڕینی دەنگی بزویٚنی ڕەگی وشە حاڵەتی کۆ دیٚنیٚتە ئەنجام ، وەك : (( Mutter )) ( دایك ) ، (( MÛtter )) ـ ( دایکان ) ؛ یاخود گۆڕینی نیشانەش هەر دەوری کۆکردنەوە دەبینیٚت ، وەك : (( die Fenster)) ـ (پەنجەرە) ، (( das Fenester )) ـ (پەنجەران) . لە زمانی ڕووسیدا گۆڕینی کۆتایی وشە حاڵەتی کۆ پیٚك دیٚنیٚ ، وەك : (( کنیگا )) ـ ( کتیٚب ، (( کنیگی )) ( کتیٚبان ) . لە زمانی (ناسس)دا کۆ بە چوار چەشنی جیاواز خۆی دەنویٚنیٚ : زوربەی ناو و کردار حاڵەتی کۆیان بە دووپاتکردنەوە پەیدا دەبیٚ ـ واتە بەشیٚك لە ڕەگ دووبارە دەکریٚتەوە ، وەك : (( gyat )) ( مرۆڤ ) ، (( gyigat )) ـ ( مرۆڤان ) ؛ چەشنی دووەم بە یاریدەی هەندیٚ پیٚشگر سازدەبیٚ ، وەك : (( on 'an)) (دەست) ، (( ka –on 'an )) ( دەستان ) ، (( Wai)) ـ ( سەوڵ ) ، (( lu –wai )) ـ ( سەولاّن ) . کۆ هەروەها بەهۆی گۆڕینی دەنگی بزویٚنی ڕەگەوە پیٚك دیٚ ، وەك : (( gwula)) ( پاڵتۆ ) ، (( gwila)) ـ ( پاڵتۆیان ) لە کۆتاییدا بەشی چوارەمی کۆ بە هاریکاریی پاشگر دیٚتە ئەنجام ، وەك (( waky)) ـ (برا) ، (( wakykw)) ـ ( برایان ) .. هتد .

لە زمانی فارسیی ناوەڕاست ( پەهلەوی)دا بۆ پیٚکهیٚنانی حاڵەتی کۆ دوو نیشانەیان ( ان ) و ( یها ) بەکاردەهیٚنا . نیشانەی ( ان ) لە کۆتاییی زووی حاڵەتی جەڕی کۆی ( انان )ەوە هاتووە . لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا ئەو کۆتایییە واتای ڕەسەنی خۆی ون کردووە و بووە بە نیشانەی کۆ . ئەم نیشانەیە ـ واتە ( ان ) ، ئیٚجگار زۆرتر لە (یها) بەکاردەهیٚنرا و بە کۆتاییی هەموو ناویٚکەوە دەلکا ، بیٚئەوەی جیاوازی لە نیٚو ناوی گیاندار یان

ناوی بیّ گیاندا بکات ، وەك : (( پتاران )) ـ ( باوکان ) ؛ (( داناکان )) ـ ( دانایان ) ؛ (( کۆسپەندان )) ـ ( مەڕان )) ؛ ( ئاتەخشان )) ـ ( ئاگران )) ؛ (( ئاپان )) ـ ( ئاوان ) ؛ (( مێنشنان )) ـ ( فکران ) ... نیشانەی ( یها )ش دەگەڕێتەوە بۆ دەوری کۆتاییی پەهلەوی . لە سەرەتادا تەنیا بۆ ناوی بیّگیان بەکاردەهات . ئەم نیشانەیە زۆر کەمتر لەگەڕدا بوو ، وەك نیشانەی ( ان ) .

لە زمانی فارسیی نوێدا دوو نیشانەی ( ها ) و ( ان ) کۆ سازدەکەن . هەرچەندە جیاوازی لە نێوان واتا گەیاندنی ئەو دوو نیشانەیەدا نییە ، بەلاّم لە چالاکیدا وێك ناچن . نیشانەی ( ها ) دەتوانیّ بە هەموو ناوێکەوە بلکیّ ( بیّ ئەوەی حالّەتی بیژۆکی تێدابیّ ) . هەرچی نیشانەی ( ان )ە تەنیا توانای لکاندنی بە کۆمەڵێکی کەمتر لە وشەوە هەیە . لێرەدا سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، کە لە مەسەلەی نیشانەی کۆدا ، زمانی فارسیی نویّ لە زمانی فارسیی ناوەڕاست دوور دەکەوێتە و جویّ دەبێتەوە ، کەچی زمانی کوردی لە زمانی فارسی ناوەڕاست نێزێك دەبێتەوە .

لە زمانی ڕووشانیدا ( ێن ) نیشانەی کۆیە .

لە زمانی ئەفغانیدا ( ونا ) و ( ان ) نیشانەی کۆی جنسی نێرن . ( ی ) و ( انی)یش نیشانەی کۆی جنسی مێن .

لە زمانی بلووجیدا نیشانە و حالّەتی کۆ بە گوێرەی دەور و خۆنواندنی ناو لە ڕستەدا دەگۆڕێت .

* * *

هەرچەندە لە زمانی کوردیدا هەندیّ نیشانە هەن ، کۆ پێك دێنن و هەروەها هەندیّ حالّەت هەن مانای کۆ دەگەیەنن ، بەلاّم نیشانەی ڕەسەن و سەرەکیی کۆی ناو ـ (ان)ە .

وەك وتمان ، جگە لە ( ان ) هەندیّ نیشانەی دی هەن ، کە کۆ سازدەکەن . وەك ( ات ) ، ( ەها ) ، ( گەل ) ...

| کۆسپەك | المعوق | Obstrunents |
|---|---|---|
| کۆکەرەوە | الجامع | Collector , Gather |
| کۆما ( ، ) | الفارزة | Comma |

کۆما بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی سادە لەناو ڕستەی لێکدراودا ؛ بۆ جیاکردنەوەی پارچەیەك لە ڕستەیەکی تێکەڵ ؛ بۆ جیاکردنەوەی ڕستەی شوێنکەوتوو لە ڕستەی سەرەکی ؛ بۆ جیاکردنەوەی ئەندام ( وشە یان دەستەواژە )ی هاوچەشنی ڕستە ؛ جیاکردنەوەی وشەکانی بانگهێشتن و ڕووی دەم تێکردن و بەرپەرچ دانەوە ... دادەنرێ . ئەم ئەرکانەی کۆما لە پلەی یەکەمدا ئەرکی ڕێزمانین و لێرەدا ڕێزمان بەجۆرێکی چڕ پێوەندی بە واتاوە هەیە ، لەبەر ئەوەی تەنیا ڕێزمان سنووری ڕستە نییە ، بەڵکو واتاش سنوورێتی . ئەگەرچی ئەندامەکانی ڕستە بریتین لە کۆمەڵێ وشەی دیاری کراو ، بەڵام بەرێکەوت نییە ، کە دیاریکردنی ئەندامەکانی ڕستە بە مەسەلەی واتاوە بەندە .

چەند نموونەیەك :

* جیاکردنەوەی ڕستەی سادە لەناو ڕستەی لێکدراودا :

من بۆ خۆم بانگی یەك لە بەگزادان دەکەم ، بۆمان چاکا ...

( دمدم ، ل٦٩ )

* جیاکردنەوەی پارچەیەك لە ڕستەیەکی تێکەڵ :

لەوەتی هەم خواردنم لە خواردنی دەشت و دەران بەتام و خۆشتر ، بەتایبەتی قلیانە شوانانە ، نەخواردووە .

(دمدم ، ٣١٨ )

* جیاکردنەوەی ڕستە شوێنکەوتوو لە ڕستەی سەرەکی :

وەك ئاشكرایە ، لە زمانی كوردیدا ژمارەیەك ئامرازی سینتاكسی هەیە :
( بەلاّم ، چونكە ، هەرچی ، كە ، تا ، بەلْكو ، وەكو ، نەوەكو ، ئینجا ، ئەگینا ، ئەگەر ... ) كە ڕستەی شوێنكەوتوو دەگەیەننە ڕستەی سەرەكی ، پێویستە لە پێشیانەوە كۆما دابنرێ . وەك :

مزگەوتەكە دوو ساڵ دەبوو بینا نرابوو ، بەلاّم هێشتا هەر بێ مەلا بوو ..

( دمدم ، ل٥١ )

لە كاتی مازووچنیندا كەس لێمان ناگرێ و بە شوورەیی دانادرێ ، چونكە بووە بە دەستووری هەموو لایەك .

( دمدم ، ل٢١٣ )

عەشیرەتی مللا لە دیاربەكرەوە نێزیك بوون ، هەرچی ئێمە بووین تەواوێ دوور بووین .

(دمدم ، ل٢٨)

بۆ هەر سەر لقێ چەند ئێشكچییەكی دانا ، كە بە نۆرە یەكی سێ سەعاتان ئێشك بگرن ، تا ئیشكگرەكانیش بحەسێنەوە ...

( دمدم ، ل١٨٥ )

هتد ...

گەلێ جار ڕستەی شوێنكەوتوو و ڕستەی سەرەكی بە بێ ئامراز بەیەك دەگەن . بێگومان لەم حاڵەتەشدا دیسان دانانی كۆما پێویستە بۆ جیاكردنەوەیان . بەوێنە :

ئەوێ ڕۆژی نەك هەر خەڵكی شار ، خەڵكی قەزا و ناحیە و گوندەكانیش جێژنانە و دیاری خۆیان هێنابوو .

( دمدم ، ل٦٠ )

* جیاكردنەوەی وشە ئەندامی هاوچەشنی ڕستە :

قومی كە لەم فكرە بیبش بی دائما بریشانە ، اسیرة ، بیدسەلاتە .

( تێگەیشتنی ڕاستی ، ژ٣ ، ل١ ، س١ ، د٨ ـ ٩ )

* جیاکردنەوەی دەستەواژە ئەندامی هاوچەشنی ڕستە :

قژکاڵی ، لێوئاڵی ، پرشنگی نیگا کاڵ ،

ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێك ئاڵ !

( گۆران ، ل٤٥ )

* بانگهێشتن و ڕووی دەم تێ کردن :

یوسف ، ڕۆستەم ، ڕەب وا ناگیرێ ، ڕمبەکانتان چاك لە کەلەکەتان بچەسپێنن .

( دمدم ، ل٧١ )

فەرموون ، جارێ بەرکوڵێکی بکەن تا قلیانە شوانەکە پێ دەگا .

( دمدم ، ل٦٧ )

* بەرپەرچدانەوە :

نەخێر ، ئەم نێچیرە لە هەموو نێچیرەکانی دیکە چاکترە ...

( دمدم ، ل٦٧ )

وێڕای ئەوە ، باری تایبەتی ئەوتۆ هەیە ، کە دانان یان دانەنانی کۆما بە واتاوە بەستراوە .

دەربارەی کۆما هەرچی‌یەك بنووسی هەر کەمە . هێندە ئەرك و دەور دەبینێت . کە لێرەدا بە کورتیش مەودای لێدوانی نییە . جا تەنیا ئەوە دەڵێم ، کە بەداخەوە زوربەی زمانەوانانی ئەمڕۆی کورد نەك هەر لە زۆر شوێنی ئاشکرا و پێویستدا داینانێن ، بەڵکو لە شوێنی ئەوتۆشدا قوتی دەکەنەوە ، کە دەبێتە هۆی تێکچوونی پێکهاتن و واتای ڕستەکە . بەڵێ (( تێگەیشتنی ڕاستی ))یش لە شوێنی پێویستدا کۆما دانانێ ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستی‌یە لەبیرنەکەین ، کە لەگەڵێ جێدا نووسیوێتی و لە دیاریکردنی شوێنیدا هەڵەی نەکردووە .

چەند نموونەیەك :

هەزاران مال ویران بو ، سوتا ، وەك جكری خانەخوی بو بە کوی زوخال .
( ژ١ ، ل١ ، س١ ، د١٥ ـ ١٦ )

کەلی کس ایوارە بیچرا دەما ، شەو بی شیو سەریان انایەوە . ( ژ١ ، ل١ ، س١ ، د١٨ ـ ١٩ )

قومی کە لەم فکرە بیبش بی دائما بریشانە ، اسیرە ، بیدسەلاتە . ( ژ ٣ ، ل١ ، س١ ، د٨ ـ ٩ ) .

...هتد .

## کۆمای خاڵدار ( ؛ ) الفارزة المنقوطة

کۆمـای خـاڵدار کـاتێ دادەنـرێ ، کـە پارچـەکانی ڕسـتە نیـهادەکانیان جیاکردبێتەوە ؛ یاخود لە نێو ڕستەدا نیشـانەی خاڵبـەندیی دی هەبێ . لەو حاڵەتانەدا لە ڕێگەی هۆی ڕێزمانی ، یان پێکاهتنەوە دەکرێ باسی کۆمای خاڵدار بکرێ ، ئەگەرچی ئەم جۆرە بەکارهێنانەی کۆمای خاڵدار وەنەبێ دژی تێدا خوێندنەوەی واتا بێ . بەوێنە :

یەکێك جوانیی وەك هەتاوە ،
تین و تیشکی لە پێش چاوە ؛
یەکێك مانگی شوخ و شەنگە ،
سیحری جوانیەکەی بێدەنگە ؛
جوان نییە ، بەڵام جوان پۆشە !...

( گۆران ، ل٥٣ ـ ٥٤ )

ئەگەر کۆمای خاڵدار لە جێی کۆما دابنرێ ، ئەوە دەوری واتا بەسەر دەوری ڕێزماندا زاڵ دەبێ ، چونکە کۆمای خاڵدار هەندێ پتر نیشانی جیاکردنەوەی بیر دەدات ، بەوێنە :

ئێوە لە سەرێکەوە هەقتانە ؛ کاتێکی شاعەبباس لەشکری لێکردن ، وە جواب نەهاتن ؛ خەریکی گا و گەردوون کردن بوون ، بەڵام کە لەشکری لەمەش کرد ئەویٚ ڕۆژێش هیچتان نەکرد .

( دمدم ، ل٥٥ )

هەندیٚ جار کۆمای خاڵدار تەنانەت دەتوانیٚ لە گەیاندنی واتادا سەرەکی بێت ، وەك :

ئەو میللەتانە موسڵمان نین ، کافر و دین دژمنن ؛ دەبیٚ پیر و لاو و ژن و منداڵ و ورد درشتیان قڕکەین ، ئەگەر ماڵ و کلووریشیان تالاٚن و بڕۆکەین گوناه نیە و لێمان حەلاڵە ..

( دمدم ، ل٦٢ )

## کۆمەڵە خاڵ ( ... ) علامة الحذف Dots , Dots , Dots

ئەم نیشانەیە بە واتاوە بەندە . کۆمەڵە خاڵ واتای شتێکی تەواونەکراو دەگەیەنیٚ .

بۆ نموونە :

ـ برا دەفەرموو دابەزە ، تۆ میوانی ، هیچ نەبیٚ نانیٚ ، ئاویٚ ...

( دمدم ، ل١٣٣ )

سەربازانی کورد کە بەم نەنەر و دەستدرێژییەیان زانی هێندەی دیکە ئاگریان گرت و زاتیان بزووت و ئەوەی کردیان ، کردیان ...

(دمدم ، ل٣١٨ )

نووسەر لە ناوەڕاستی ڕستەدا کۆمەڵە خاڵ دادەنیٚ ، بۆ ئەوەی خوێنەر بۆ شتێکی چاوەڕوان نەکراو یان سەیر ئامادەبکات . وەك :

گومان لە ڕاست ، بەڵام باوەڕ
بەدرۆ .. ( ئاخ دیاری خوای شەڕ ! )

( گۆران ، ل١٩٦ )

لە وتەی قارەماندا کۆمەڵە خاڵ نیشانەی بڕینە ( لە بیرکردنەوەدا ، لە گەڕاندا بە شوێن وشەی لە باردا ، گومان کردندا ، شێواندا ... ) وەك :

ـ وەی بەسەر چاوان هاتی ، کاکە خورشید ، ئەمریٚ ... خزمەتیٚ ... فەرموو بڵێ ..

( دمدم ، لـ ٣٨)

سوتۆ بەگ زمانی چووە کلیلە و هەرچەندی کرد نەیتوانی وەڵامی حوسێن خانی بداتەوە ، زمانی بەیەکدا ئاڵا و گوتی :

ر ، ر ، ر ...

زۆر جار کۆمەڵە خاڵ لە جێی ئەو وشانە دادەنرێ ، کە لە دەقێکی وەرگێراودا نەنووسراونەتەوە . وەك :

زۆر جار (( تێگەیشتنی ڕاستی )) دەکەوتە باسی (( خۆشەویستی ))و (( دڵسۆزی )) بیٚ هاوتای ئینگلیز بۆ کورد . بە گەرمی دەیگوت : (( حکومەتی ئینگلیز کوردانی زۆر خۆش دەویٚ ... چونکە دەزانیٚ لە تاریخی عالەمدا کوردان ناوێکی گەورەیان هەیە و بە مەردی و ئازایی هەتا ئێستا خۆیان ڕاگرتووە . حەزناکا وا بلاْوبمێننەوە و خزمەتی ئەم و ئەو بکەن ... هەڵبەتە حکومەتی موعەزەمەی ئینگیلتەرە کە کوردانی لە هەمو کەس زیاتر خۆش دەویٚ وەکو ئیشی ئەقوامی تری ئاسان کرد ئیش بۆ ئەوانیش ئاسان دەکا ... ( د . کەمال مەزهەر ) .

کۆمەڵەخاڵ لە سەرەتای هەندیٚ ڕستەوە دادەنریٚ ، بۆ نیشاندانی دەست پیٚکردنی باسێکی نویٚ . وەك :

... زۆر سەیرە ئەم کوردانە چییان لیٚبەسەرهات ، ئەڵێی عەرز قووتیداون ... بۆ سبەینیٚ کە ڕۆژبووەوە و قەلاْ بە دیارکەوت ، سەردار لێی ڕوون بووەوە کە کوردان خۆیان لە حەسار داوە .

(دمدم ، ل ٣٣٧)

کۆنسۆنانت الحروف الصحيحة ، الصوت الصامت
**Consonants**

= نەبزوێن

کۆنسـۆنانت بـەو دەنگانـە دەوترێـن ، کـە لـە دەربڕینیـاندا هـەندێ لـە ئەندامانی ناودەم لێك نزیك دەکەونەوە و دەبنە بەرهەڵست بۆ ئەو لووزەوی هەوایەی لە سییەکانەوە دێ . لە ئەنجامدا لە دەربازێکەوە دێنە دەرێ .

دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردی :

( ب ، پ ، د ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، و ـ w ، ه ، ی ـ y ) .

کونسۆنانتی ئاسمانە الصوامت الحنكية **Palatal consonant**

کۆنسۆنانتی ئاوازەدار الصوامت الصائنة
**Voiced consonant**

ـ کۆنسۆنانتی ئەوکی الصامت الحلقي
**Glottal consonant**

کۆنسۆنانتی ئەوکی بە شێوەیێکی گشتی لە تەقنیەوەی گەروویی‌دا خۆی دەنوێنـێ . وەك دەنگـی سـەربەخۆی ئاخـاوتن لـە زمـانی عـەرەبیدا هەیـە و هـەمزەی پیٚ‌دەوتـرێ . ئـەم کۆنسـۆنانتە کپـە کۆسـپەکە بـە هێنانەوەیـەکی دەنگەژێکان دەردەبڕێ : تـەوژمی هـەوا بەیـەك گوژمـی تیـژ دەربـاز دەبـێ ؛ ژاوەژاوێکی لاوازی تەقینەوە سازدەکا . دەنگـی ئـەوکی پتر وەك تەواوکـەری وتنـی بزوێـن و کۆنسـۆنانت خۆی دەنوێنـێ . بەوێنە لـە تەلـەفوزکردنی ئـەو وشە ئەڵەمانی‌یانەدا ، کە بە بزوێن دەست پیٚ‌دەکەن ، ژاوەژاوی کپی ئەوکی ،

که له پچڕی لەناکاوی هاتنەوەیەکی دەنگەژێکان دەبینرێ . بەم جۆرە وتنە دەوترێ هەڵمەتی توند .

## کۆنسۆنانتی پشتەکی الصامت الظهري ، الصامت القصي ( من اقصى اللسان )

## Dorsal consonant

کۆنسۆنناتی پشتەکی ـ dorsal ( له (( dorsum ))ی لاتینییەوە بە واتای (( پشت )) وەرگیراوە ) بە نزیک کردنەوەی بەشی پێشەوەی پشتی زمان له ددانەکانی سەرەوە ئاسمانەی پێشەوە دەوترێ . پشتەکی ـ dorsal زوربەی دەنگەکانی ڕیزی پێشەوەی زمان دەگرێتەخۆ : س ، د ، ن ...

## ـ کۆسۆنانتی پشتەوەی زمان صامت مؤخرة اللسان

## Dorsum consonant

کۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان دابەش دەبێ بەسەر ناوەڕاستی ئاسمانە و پشتەوەی ئاسمانەدا . کۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان کۆسپەك و خشۆك و بیڤلۆکی هەیە ... هەروەها بەسەر زوانەچکۆلەیی و گەروویی و ئەوکیشدا دابەش دەبێ .

## ـ کۆنسۆنانتی پۆپەیی سمك القد Cocominal consonant

کۆنسۆننانتی پۆپەیی cocominal له (( căcumen )) (( پۆپە ))ەوە بە هەڵبڕینی سەری زمانی بەرەو سەروو چەماوە دەوترێ . کۆنسۆنانتی پۆپەیی ـ cocomunal دەنگی لەرزۆك و فیشکەیی و نیمچەکۆسپەك دەگرێتەخۆ .

- کۆنسۆنانتی تەوژمۆک    الصامت الانفجاري
**Plosive consonant**

بـ : کۆنسۆنانتی کۆسپەك

- کۆنسۆنانتی خشۆك    الصامت الاحتكاكي
Fricative consonant

دروستبوونی کۆنسۆنانتی خشۆك ئەنجامی لێخشانی لوورەوی هەوایە لە دیواری ئەو تێپەڕگەیەی لە نزیك‌بوونەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتنی بۆشایی دەم پێك دێ . بۆیە کۆنسۆنانتی خشۆك بە درێژەپێدراو ، فووتێکراو ، ڕەوان ... )یش ناودەبرێ . دەنگی ( ڤ ) ، ( ف ) ، ( ز ) ، ( ژ ) ، ( س ) ( ش ) ( ع ) ، ( خ ) ، (غ ) ، ( ح ) ( ه ) ( و ـ W ) ، ( ی ـ y ) خشۆکن . لە نێو ئەو دەنگە خشۆکانەدا (و ـ W ) و (ی ـ y) بە کەم‌دەنگ ناودەبرێن و هەموو ئەوانی دی بە گڤۆگ .

- کۆنسۆنانتی دووتوێ    الصوامت المزدوجة الثنائية
**Double consonant**

- کۆنسۆنانتی ڕەق    الصوامت الصارمة    **Hard consonant**

- کۆنسۆنانتی ڕیزی ناوەڕاستی زمان    الصامت الوسطي
**Medial cosonant**

کۆنسۆنانتی ڕیزی ناوەڕاستی زمان لە ئەنجامی نزیك‌کردنەوەی ناوەڕاستی زمان لە ئاسمانەڕەقە پەیدا دەبێ . ( y ـ ی ) دەنگێکی کۆنسۆنانتی ناوەڕاستی زمانە و لە تەلەفوزکردنیدا سەری زمان لە ددانەکانی خوارەوە گیردەبێ : هەردوو تەنیشتی زمان دەکەونە سەر ددانەکانی تەنیشت ؛ ناوەڕاستی پشتی زمان بەرەو ئاسمانەڕەقە بەرزدەبێتەوە ؛

درزێکی یەکجار تەسك پێکدێنی ، کە دەنگی پێدا ڕەت دەبێ . وتنی کۆنسۆنناتی ( y - ی ) لە وتنی بزوێنی ( i - ی ) نێزیکە .

کۆنسۆنانتی ( y — ی ) لە سەرەتای برگەی هێزداردا ڕوون تەلەفوز دەکرێ ، بەهەمان چەشن لەدوای کۆنسۆنانتیشەوە : یار .. دیاری ... بەلاّم لە کۆتایی برگەدا وەك (ی)ی نابڕگەیی تەلەفوز دەکرێ . وەك : لای ...

## ـ کۆنسۆنانتی زرینگۆگ الصامت الرنان

## Resonant consonant

لە نیۆ کۆنسۆنانتە زرینگۆکەکانی زمانی کوردیدا ( م ) و ( ن ) بیڤلۆکین و ( ل ) و ( ڵ ) و ( ر ) و ( ڕ )ش لەرۆکن . وتنی کۆنسۆنانتی زرینگۆکی لەرۆك دەمێك بەجێ دێ ، کە لووزەوی هەوا لە کۆسپ دەرباز دەبێ و بە درزێکدا تێدەپەڕێ . بەلاّم لە تەلەفوزکردنی کۆنسۆنانتی زرینگۆکی بیڤلۆکدا بەرهەڵست تێك ناچێ و دەمێنێتەوە ، چونکە بەشێك لە لووزەوی هەوا بە کونەلووتدا تێدەپەڕێ . دەنگی ( م ) ، ( ن ) بیڤلۆکین .

## ـ کۆنسۆنانتی زوانەچکۆلەیی الصامت اللهوي

## Uvular cosenant

بۆ نموونەی کۆنسۆنانتی زوانەچکۆلەیی دەشێ دەنگی ( ر)ی زمانی فەرەنسی بکرێتە نموونە . لە تەلەفوزکردنی ئەم دەنگەدا سەری زمان لە ددانەکانی خوارەوە توند دەکرێ ؛ بەشی پشتەوە دەچێتە یەك و بەرەو ئاسمانەی دەم بەرزدەکرێتەوە و لووزەوی هەوا زوانەچکۆلە دەهێنێتە لەرە و لەرزە و ناوەناوە لە پشتی زمان دەکەوێ و بڕین دەخاتە لووزەوی هەواوە و ژاوەژاو دروست دەکات ، وەك (( Frěre )) (برا) ؛ (( Paris )) (پاریس) ... بەلاّم لە خاسیەتی تەلەفوزی دانیشتوانی پاریس‌دا ، ئەو دەنگە بێ لەرە و لەرزەیە ـ واتە وەك کۆنسۆنانتی خشۆك دەوترێ .

- کۆنسۆنانتی زوانەکی          الصامت اللسانی

**Lingual consenant**

دەنگە کۆنسۆنانتە زوانەکی‌یەکان بەسەر ڕیزی پێشەوە و ناوەڕاست و دواوەدا دابەش دەبن . کۆنسۆنانتی ڕیزی پێشەوە ، بە شوێنی دەربڕینیاندا دەشێ ددانەکی و پێشەوەی ئاسمانەی دەم بن ، بەوێنە : س ، ش ، چ ... بەپێی سەرنجی وتن ، کۆنسۆنانتە ددانەکی‌یەکانی ڕیزی پێشەوە بە (فیکەیی) ناودەبرێن . هەرچی ئەوانی پێشەوەی ئاسمانەشن (فیشکەیی)یان پی‌دەوترێ . لە پێکهێنانی کۆنسۆنانتەکانی سەری زماندا هەموو ڕێگاکانی وتن کاریگەرن . لە نێوانیاندا کۆسپەك و نیمچەکۆسپەك و خشۆك و بیڤلۆکی و لەرۆك هەیە .. بە کورتی ئەو دەنگانەن ، کە زمان دەورێکی چالاك بۆ دەربڕینیان دەبینێ .

- کۆنسۆنانتی فیشکەیی   الصامت المکتوم

**Hushing consonant**

ب . : زوانەکی

- کۆنسۆنانتی فیکەیی   الصامت الصفیري

**Whistling (siblant) consonant**

ب . : کۆنسۆنانتی زوانەکی

- کۆنسۆنانتی کەم دەنگ

ب . : کۆنسۆنانتی خشۆك

- کۆنسۆنانتی کپ          الصوامت المتنفسة ، الصوامت الخافت

**Breathed consonant**

- کۆنسۆنانتی کۆسپەك          الصامت المعوق

Obstruent consonant

کۆنسۆنانتی کۆسپەك لە ڕێگەی تەقنیەوەی بەرهەڵست بە لووزەوی هەوا دروست دەبێ ، ، بۆیە کۆنسۆنانتی کۆسپەك بە ( تەقینەوە)ش ناودەبرێ . دەنگـــــی ( ب) ، ( پ ) ، ( د ) ، ( ت ) ( گ ) ، ( ك ) ، ( ق) ، ( ج ) ، ( چ ) کۆسپەکن . کۆنسۆنانتی کۆسپەکیش دوو جۆرە : ١ـ لەرزۆك ، کە دوو دەنگی ( ج ) و ( چ ) دەگرێتە خۆ ؛ ٢ـ تەوژمۆك ـ سەرجەمی ئەوانی دین .

- کۆنسۆنانتی گەروویی     الصامت الحنجري

Throat consonant

کۆنسۆنانتی گەروویی بە ڕێگەی بزوتنەوەی ڕەگی زمان بۆ دواوە و کورت بوونەوەی ماسوولکەی دیواری گەروو دەوترێ . کۆنسۆنانتی گەروویی ؛ کۆسپەك و خشۆکی هەیە . کۆسپەکی ئاوازەداری گەروویی لە زمانی ئاڤاریدا هەیە و گەروویی خشۆکیش بە زۆری لە زمانی ئوکرانییدا بەرگوێدەکەوێ .

- کۆنسۆنانتی گڤۆك          ذو جلبة          Noisy consonant

ب.: کۆنسۆنانتی خشۆك

- کۆنسۆنانتی لەرزۆك          الصامت الاهتزازي ، الصامت المتذبذب

Vibrant consonant

ب.: کۆنسۆنانتی کۆسپەك .

- کۆنسۆنانتی لوتکەیی        الصامت القممي

**Aprical consonant**

کۆنسۆنانتی لوتکەیی  aprical  ( لە (( ăpex ))ی لاتینییەوە بە واتای (( لوتکە )) کەوتووەتەوە  بە نزیک کردنەوە ، یان گیرکردنی سەری زمان لە ددانەکانی سەرەوە دەوترێ ، وەك : ل . د ...

- کۆنسۆنانتی لێوە ـ ددانەکی          الصامت الشفوي سني

**Labia – Dental consonant**

ب.: کۆنسۆنانتی لێوەکی

ئەو دەنگانەی بە هاوبەشیی ددانەکانی سەرەوە و لێوی خوارەوە دەوترێن . وەك : ( ڤ . ف ) .

- کۆنسۆنانتی لێوە ـ لێوەکی        الصامت الشفوي / الشفتاني

**Bilabial consonant**

ب.: کۆنسۆنانتی لێوەکی

ئەو دەنگانەی بۆ دەربڕینیان هەردوو لێو بەشداری دەکەن .

وەك : ( ب ، پ ، و ـ W ، م ) .

- کۆنسۆنانتی لێوەکی                الصامت الشفوي

**Labial consonant**

لە نێو  کۆنسۆنانتی لێوەکیدا ، پتر لێوەکی ـ لێوەکی ( هەردوو لێو ) ـ ( bilabial ) دەردەکەوێ و کەمتریش لێوە ـ ددانەکی ـ   Labiodental . لە وتنی کۆنسۆنانتی لێوە ـ لێوەکیدا لەیەك نێزیك بوونەوەی هەردوو لێو ، یاخود لێوە ـ ددانەکیشدا لێوی خوارەوە لە دانەکانی سەرەوە نێزیك دەبێتەوە ، وەك لە تەلەفوزکردنی گڤۆکی ( ڤ ) ، ( ف )دا دەبینرێ .

ـ کۆنسۆنانتی نەرم    الصوامت المسهلة    Lax cosonant

( غير صارمة )

ـ کۆنسۆنانتی نیمچەکۆسپەك    الصامت الانفجاري الاحتكاكي

Affricate consonant

دروستبوونی نیمچەکۆسپەك بەندە بە درێژیی کۆنسۆنانت و تەواوکەری وتنەوە . لە زمانی کوردیدا کۆنسۆنانتی دووتویێ لە بەیەکگەیشتنی مۆرفێمدا پەیدا دەبێ . وەك : (( ن )) (( بردماننەوە )) : ( ن )ی یەکەم کۆتایی جێناوی کەسی یەکەمی کۆی دەستەی بەهێز ( مان ) ، کە کارایە . ( ن )ی دووەم جێناوی کەسی سێیەمی دەستەی بێهێزە ، کە بەرکارە ؛ (( ت )) ـ (( کوشتت )) : (ت)ی یەکەم کۆتایی قەدی چاوگی ( کوشتن)ە و ( ت )ی دووەم جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی بەهێزە ؛ (( کورتتر )) : ( ت )ی کۆتایی مۆرفێمی ( کورت ) + ( ت )ی سەرەرتای مۆرفێمی ( تر ) ؛ (( م ))ی (( مۆمم )) : (م)ی کۆتایی وشەی ( مۆم ) + (م) ی جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکی دەستەی بێهێز ؛ ((ك)) ـ ((چاککەر)) : ( ك )ی کۆتایی مۆرفێمی ( چاك ) و ( ك )ی سەرەتای مۆرفێمی ( کەر ) ؛ (( پاککەر )) : ( ك )ی کۆتایی مۆرفێمی ( چاك ) و ( ك )ی سەرەتای مۆرفێمی ( کەر ) ؛ (( پاککەر )) : ( ك )ی کۆتایی مۆرفێمی ( پاك ) و ( ك )ی سەرەتای مۆرفێمی ( کەر ) ؛ هەروەها (( پەککەوتن )) و (( چاککردن )) ... هتد .

ـ کۆنسۆنانتی نێوددانی    الصامت بين الاسناني

Interdental consonant

کۆنسۆنانتیزم    Consonantism

Confix کۆنفیکس

بە بەکارهێنانی پێشگرێك و پاشگرێك لەیەك وشەدا دەوترێ کۆنفیکس ، کە لە وشەی ( Confixum )ی لاتینییەوە وەرگیراوە ، کە بەمانای ( بەیەکەوەهاتن ، پێکەوەهاتن .. ) دێت . وەك :

نە + خۆش + ی = نەخۆشی

بەر + دان + وە ( ەوە ) = بەردانەوە

وەر + گەڕ + اندن = وەرگەڕاندن

Norm المعيار کێش

Problem القضية کێشە

Normative المعياري کێشەکی

Cojugation , Inflection تصريف گەردانکردن

گەروو

بـ .: ئەوك

Optimist التفاؤل گەشبینایەتی

| | | |
|---|---|---|
| گریمانه | الافتراضات | Assumptions |
| گشت | العموم | Univercal |
| گشتی | العام | Universality |
| گشتی‌یایەتی | الشمولية | Universalim |
| گڤۆك | ذو جلبة | Noisy |
| گوته | المقولة | phrase |

گوتن

= ئاخاوتن

| | | |
|---|---|---|
| گوزاره | الخبر ، المسند | Predicate |

= وشەی کردار ، وشەی کار

گوزاره ئەو بەشەیە لە ڕستەدا ، کە هەواڵی کردنی کارێك دەداتە پاڵ نیهاد .

گومان | الشك ، الظن | Doubt

=دوودڵی

گونجان | التوافق | Adjustment

- گونجانی دەنگ

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ، کە دوو دەنگ حەز بە خزمایەتیی یەکدی بکەن و زۆر پێکەوە بێن و یەکتر بپارێزن .

بەوێنە ، لە زمانی کوردیدا دەنگی /د/ بەدوا /ر/دا زۆر دێت . وەك :

برد ، کرد ، مرد ، کورد ، دەرد ، هەرد ، بەرد ، گرد ، پرد ، گەردن ، ورد ، بێگەرد ...

هەروەها دەنگی /ر/ لەگەڵ دوو دەنگی /ت/ ، /م/دا باش دەگونجێ و گەلێ وشە هەیە ، کە تێیاندا ئەو دەنگانە پێکەوە هاتوون . وەك :

کورت ، کەرت ، گرت ، خرت ، قۆرت ، پەرت ..

گەرم ، نەرم ، شەرم ، کرم ، درم ، یارم ..

یا خود دەنگی /ت/ زۆر لەگەڵ /س/ ، /ش/دا دێت . وەك :

ماست ، دەست ، بیست ، مەست ، هەست ، ڕست ..

کوشت ، ڕشت ، مشت ، بڕشت ، هەشت ، گەشت ..

... هتد .

١- گونجاندن | المماثلة الجزئية | Accommoldation

ئەمە کارتێکردنی دەنگی دراوسێی بزوێن و کۆنسۆنانتن . بەوێنە لە زمانی کوردیدا کاتێ دەنگی ( ك ، گ ) دەکەونە پێش دەنگی ( ێ ، ی ، وێ ، وی )یەوە ، شێوەی دەربڕینیان دەگۆڕرێت و تا ڕادەیێك لە تەلەفوزی دەنگی

( چ ، ج ) نێزێك دەبێنەوە : گێڕ ، گێلاس ... كیسە ، گیسك ... گوێ ... هەنگوین ..

ھ. ، ب.: پرۆتسیسی فۆنەتیكی دەوربەر .

**٢ـ گونجاندن** **التوفیق** **Adjust**

**گۆڕین** **تباین** **Dissimilation**

گۆڕین دژی وێكچواندنە و وتنی دەنگە دراوسێكان دەگۆڕێ . بەوێنە لە زمانی كوردیدا لە وشەكانی ( گەستی ) ، ( كوشتی ) دا ( س ، ش ) لە ئەنجامی گۆڕینی ( ز ، ژ ) ؛ ( گەزی ) ؛ ( كوژرا ) بە تەئسیری كۆنسۆنانتی (ت) دەنگی ( ز ، ژ ) ئاوازەدارێتی‌یان نەما .

**گۆكردن**

ب.: تەلەفوزكردن

**گیرەك** **اللاصقة**

**Affix , Bound morpheme**

= مۆرفێمی بەند ، مۆرفێمی ئافیكسی

بە سەرپاكی سێ زاراوەی ( پێشگر ) و ( پاشگر) و ( نیشانە) دەوترێ ( گیرەك ـ Affix ) . ئافیكس لە وشەی ( Affixus)ی لاتینییەوە وەرگیراوە و بە مانای ( گیر ، چەسپاو ، لكاو ، نووساو .. ) دێت .

ب .: مورفێمی وشەداڕێژ ؛ مۆرفێمی وشەگۆڕ ؛ پێشگر ؛ پاشگر ؛ نیشانە .

# - ل -

| لاوەکی | جانبی | Lateral |
|---|---|---|
| لەرە | ذبذبة | Pitch |

دەنگەکانی ئاخاوتن لە بەرزی و تین و درێژیدا لەیەکتر جیادەبنەوە . بەرزیی دەنگ بە ژمارەی لەرینەوە ـ واتە بە ژمارەی پارچە شەپۆلە دەنگییەکان ـ دیاریدەکرێ . بۆ بزوێنەکانی ( ۆ ) و ( وو ) پلەی بەرزیی لەرە نزیکەی ٤٠٠ هێرزە . هەرچی ( ا )شە دەگاتە ٨٠٠ هێرز . لە ئاخاوتندا بەرزیی دەنگ بەندە بە درێژی و کشاندنی دەنگەژێکانەوە . بەرزی بۆ خاسیەتی دەنگەکانی ئاخاوتن گرنگە . دەنگی پتر بەرز خاوەنی شەپۆلی کورتە و لەبەر ئەوەشە کە بەهێزترە .

تینی دەنگ بە پەلهاویشتنی لەرینەوە دیاری دەکرێ ـ واتە درێژیی شەپۆل ، کە بەندە بەفشاری لووزەوی هەوا و گەورەیی رووی تەنی دەنگ پێکهێنەوە . لە نەزەری وەرگرتنی رشتەی بیستنەوە ، تینی دەنگ بە ( بڵندی ) ناودەبرێ ، کە تەنیا بەزەبری شەپۆل دیاری ناکرێ ، بەڵکو بە بەرزیشی : دەنگی خاوەن یەك تین و دەنگی خاوەن بەرزیی جیاواز ، وەك دەنگی خاوەن بڵندیی جیاواز وەردەگیرێن . تینی دەنگ بۆ روونی گەیاندن و

وەرگرتنی ئاخاوتن دەورێکی گەورەی هەیە بەتایبەتی لەباری دیاریکردنی جۆری هێز ( النبرە ـ Strees )دا .

ئاخاوتن لە ڕووی بیستنەوە ئاڵۆزە ، چونکە تەنیا ئاوازە بنەڕەتییەکان ناگرێتە خۆ ، بەڵکو ئاوازی لەرینەوەش دەگرێتەوە .

لەرینەوە بریتییە لەوەی ، تەنێ توانستی بۆ زرنگاندنەوە هەبێ ( بە لەرەساز ناودەبرێ ) ، کاتێ شەپۆلی دەنگی وەردەگرێ ، دەست بە زرنگاندنەوە دەکات ، بەتایبەتی بە لەرەی وێکچوو ، لەرەساز لەگەڵ دیواری نەرم و شێداردا ( ڕشتەی ئاخاوتن بەر ئەمە دەکەوێ ) بەئاسانی لەرزە بە لەرە دەدا ، بێسەختی لەگەڵ ئاوازی تایبەتییدا جووت دەبێ ، ئەگەرچی لەرینەوەی تایبەتی لەسەرخۆ دادەمرکێتەوە . ئەم خاسیەتە بیستنە ـ فیزیۆلۆژییانە بایەخێکی گەورەیان لە بیستنی ئاخاوتندا هەیە ، بەتایبەتی لە دیاریکردنی مەفهومی بنەڕەتیی ( زەنگ ـ Timbre )دا .

دەنگی ئاخاوتن پێکهاتووە لە ئاوازی بنەڕەتی و بریتییە لە هەرە بەتین و ئاوازی سەروو ، کە لە ژمارەی تەواویدا لە ئاوازی بنەڕەتی بەرزترە . لەلای دەنگەکانی ئاخاوتن ئاوازی سەرووی لەرە نێزیکی بۆشایی دەم و لووتە ئەوکی بەندن بە باری زمان و لێو و نەرمەمەلاشووەوە . هاودەنگیی نێوان ئاوازی بنەڕەتی و ئاوازی سەروو خاسیەتی چۆنەکی دەنگ پێکدێنێ ـ کە زەنگەکەیەتی . زەنگ دەنگێك لە دەنگێکی دی جیادەکاتەوە و هەروەها دەنگی کەسێك لە دەربڕینی کەسانی دی ، دەنگی کەمانچە لە ئۆرگان ، لوورەی گورگ لە وڕە و گڤەی با ..

بەو پێیە دەنگی بزوێن لە دەنگ و دەنگگۆڕین پێکدێ ، کە لە مەلاشووەوە دروست دەبێ و لێرەدا پرۆتسێسی بەهێزبوونی لەرە ڕوودەدات ، شەبەنگی دەنگ و پارچە پێکهێنەکانی سازدەبێ . لەزوودا پارچە پێکهێنەکان بە بیستن جیادەکرانەوە ـ بەیاریدەی زەنگ و لەرە و لە پەیدابوونی ئامێری کارەبایی بیستنەوە ، بەتایبەتی کەڵك لە ئامێری

تایبەتی ، وەك لەرەنووس و شەبەنگنووس ... وەرگیرا . شیکردنەوەی شەبەنگیی بزوێن ، ئەوە نیشان دا ، کە پارچەی پێکهێن بریتی نییە لە تاکە لەرەییێك ، بەڵکو هەرێمی پارچەیە .

| | | |
|---|---|---|
| لەرەساز | الران (مسبب الرنين ) | Resonator |
| لەرەنووس | راسم الذبذبات | Oscillograph |
| لەرزۆك | الاهتزازی | Vibrant |
| لەرینەوە | رنين | Resonance |
| لەمپەر | الحواجز ، العوائق | Barriers |

**لق**

ب . : لك

| | | |
|---|---|---|
| لك | الفرع | Section |

= لق

| | | |
|---|---|---|
| لوتکەیی | القمي | Apical |
| لووزەو | التيار | Jet , Spurt , Spirt , Stream |

لووت　　　　الانف　　　　Nose

= کەپوو ، بێقل

لێکدان　　　　الترکیب

Composition , Compounding

لێکدانەوە　　　　التحلیل　　　　Analysis

= شیکردنەوە

لێکدانەوەی ژیربێژەکی　　　　التحلیل المنطقي

Logical Analysis

لێکسیکۆلۆژی　　　　علم المفردات القاموسیة　　　　Lexicology

وشەی لێکسیکۆلۆژی (Lexicology) کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، پێکهاتووە لە : ( lexikos ـ وشەکانی زمان ، وشەی فەرهەنگی ) و ( logos ـ زانست ) . بەم جۆرە وشەی لێکسیکۆلۆژی بە مانای ـ زانستی وشە ـ دێت .

لێکسیۆلۆژی بەشێکە لە زانستی زمان و لە بارەی باری ئێستا و ڕابوردووی وشەوە دەدوێ . لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی یاسای وتووێژی ئەمڕۆ و دوێنێ و شێوەی پەیدابوون و پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانەکەمان و پێوەندی لەگەڵ مێژووی گەلی کوردمان بۆ دەردەخا و ڕوون دەکاتەوە .

کاکڵ و کەرەستەی لێکۆڵینەوەی لێکسیکۆلۆژی بەر لە هەموو شتێك وشەیە . وەك ئاشکرایە وشەسازی (مۆرفۆلۆژی )یش هەر لە وشە دەدوێ ،

بەلاّم لێرەدا دەیکاتە هۆ بۆ لێکۆڵینەوە لە دەستوور و ڕێزمان . کەچی لە لێکسیکۆلۆژیدا پێویست و گرنگ زانین و ناسینی وشە و وشەکانی زمانە .

بەوینە ئەگەر لە باری مۆرفۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژییەوە تەماشای وشەی ((پاك)) بکەین ، دەبینین ئەوەی بە لای مۆرفۆلۆژییەوە گرنگە ئەمەیە ، کە ئەم وشەیە ( ئاوەڵناو )ە ، ( ئاوەڵناوی سادە )یە ، لە ( پلەی بەراورد )دا دەبێ بە (( پاکتر )) و لە ( پلەی بالاّ)دا دەبێ بە (( پاکترین )) ... هتد . بەلاّم بە نیسبەت لێکسیکۆلۆژی‌یەوە ، ئەوەی پێوەندی بە وشەی ((پاك))ەوە هەبێت ، ئەوەیە کە ئەم وشەیە لەگەڵ ((پاقژ)) و ((پاکژ)) و ((خاوێن))دا هاوواتایە و ، لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکاری دەهێنن و ، لەگەڵ وشەی (( پاك)) ـ کە بە مانای ((تێکرا ، هەموو )) دێت ، هاوبێژە ... هتد .

| | | |
|---|---|---|
| لێکۆڵینەوە<br>= توێژینەوە | التحليل ، البحث | Analysis |
| ـ لێکۆڵینەوەی مەیدانی | البحث الميداني ، دراسة ميدانية | |
| لێو | الشفة | Lip |
| ـ لێوە ـ ددانەکی | الشفوي سني | Labiodental |
| ـ لێوە ـ لێوەکی (هەردوو لێو ) | الشفتاني | Bilabial |
| ـ لێوەکی | الشفوي | Labial |

**- لێوی بانین**

بـ . : لیوی سەرەوە

**- لێوی خوارەوە** **الشفة السفلى** **Lowerlip**

= لێوی ژێرین

**- لێوی ژوورو**

بـ . : لێوی سەرەوە

**- لێوی ژوورین**

بـ . : لێوی سەرەوە

**- لێوی ژێرین**

بـ . : لیوی خوارەوە

**لێوی سەرەوە** **الشفة العليا** **Upperlip**

= لێوی ژوورو ، لێوی ژوورین ، لێوی بانین .

**لێواری زمان** **حافة اللسان** **Edg of Tongue**

= ڕۆخی زمان ، کەناری زمان

لێوخڕکردن التدوير للشفة ، (لفظ مصحوب باستدارة الشفتين)
Labialization

ئەو تەلەفوزکردنەی کۆنسۆنانتە ، کە بە ژاوەژاوی لێو بەڕێ دەکرێ و لە لووزەوی ئاخاوتندا لە ژێر کاریگەریی بزوێن ، یان کۆنسۆنانتی دراوسێیدا پەیدا دەبێ .

ماسوولکە العضلة Muscle

مانا المعنى Meaning

=واتا

- مانای پێچەکی

ب . : مانای تیان

- مانای تیان المعنى المجازي ، المعنى غير المباشر
Transferred meaning , Indirect meaning

= مانای مەجازی ، مانای پێچەکی

مانای تیان بەو مانایە دەوترێ ، کە ڕاستەوخۆ دیاردەیێکی مەوزووعیی واقیعی نیشان نادات ، بەڵکو لە ڕێی پێوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانا دەدات .

بەوێنە مانای دووەمی وشەی ((ئاگرنانەوە)) ـ واتە (( هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشووبنانەوە ، مانایێکی ناڕاستەوخۆیە و ڕاستەوخۆ دیاردەیێکی مەوزووعی واقیعی نیشان نادات ، چونکە ئاشکرا دیارە ، کە لەم ڕووداوەیاندا (گڕگرتن و سووتاندن)ی تێدا نییە ، بەڵکو ئەم کارە کە

(ناخۆشی و وێرانی و خراپی ...) لە دوایە ، لە ئەنجامی ( گڕگرتن و سووتاندن )ەوە نزیکە .

ـ مانای حەقیقی

بـ . : مانای ڕاستەوخۆ

ـ مانای داڕێژە المعنى الاشتقاقي

Derivational meaning

ـ مانای ڕاستەوخۆ المعنى الحقيقي ، المعنى المباشر

Direct ( proper) meaning

= مانای حەقیقی

مانای ڕاستەوخۆ بەو مانایە دەوترێ ، کە ڕاستەوخۆ دیاردەیێکی مەوزووعی واقیعی نیشان دەدات .

بەوێنە مانای یەکەمی وشەی ((ئاگرنانەوە )) ـ واتە ((ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسووتێ)) مانایێکی ڕاستەوخۆیە و ئاشکرا دیارە ، کە ڕاستەوخۆ دیاردەیێکی مەوزووعی واقیعی نیشان دەدات .

ـ مانای مەجازی

بـ . : مانای تیان

ـ مانای نیسبی المعنى النسبي

Relational meaning

مایەکی المادي Material

| | | |
|---|---|---|
| مایەکیەتی | المادیة | Materialism |
| مەرجایەتی | الشرطي | Conditionalty |

مەردوومی جاوە (پیتی کانترۆپ) Pithecanthrope

ب . : مەیموونی سەرەتایی

| | | |
|---|---|---|
| مەلاشوو | الحنك | Palate |
| ـ ڕەقەمەلاشوو | الحنك الصلب | Hard palate |
| ـ نەرمەمەلاشوو | الحنك اللين | Soft palate |

ب . : ئاسمانە

| | | |
|---|---|---|
| مەلاشوویی | الحنكي | Palatal |

مەیموونی سەرەتایی (شەمپازی ) Proconsul

مرۆڤ لە ئەنجامی بارگۆڕین و پێشکەوتن و گەشەکردنی دووروودرێژی جیهانی بوونەوەردا پەیدابوو ، بەتایبەتی لە مەیموونی لە مرۆچووەوە . مەیموونی سەرەتایی (کە Proconsul ـ شەمپازیی زووی پێ دەوترێ) نزیکەی ٢٥ـ ٤٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لەسەر زەوی دەژیا . لویس لیکی زانای ئەنترۆپۆلۆژیی ئینگلیز و خێزانی لە ناوچەی گۆمی ڤیکتۆریا (لە کینیا) بەردەنی (متحجر) پاشماوەی کەللەسەری گیانلەبەرێکی ١٤ ملیۆن ساڵی بەر لە ئەمرۆیان دۆزییەوە .

ددانەکانی ژێر چاوی ئەم گیانلەبەرە کەمێك لە ددانەکانی تری درێژتر بوون (ئەم ددانانەی مەیموونی مرۆئاسایی زۆر لەوانی تری نزمترن ) . لە ئێسك و پرووسکی ئەم گیانلەبەرەدا ئەوەش بەدی کراوە ، کە ژێر چاو تەنیا خاسیەتی مرۆڤە و تەنانەت لە مەیموونی مرۆئاسایی‌یشدا نییە) . ئەم نیشانانە ڕێگەیان بە دوکتۆر لیکی دا وای لێکبداتەوە ، کە ئەو گیانلەبەرەی ١٤ ملیۆن ساڵی بەر لە ئێستا ، دەبێ بەرەو بەئادامیزادبوون گەشەی کردبێ ، ئەگەرچی لە ڕەسەندا مرۆڤ نەبووە . ئەو جۆرە گیانلەبەرانە هەر لە (pithekos australis ــ ئاوسترالۆپیتیك )ەوە تا (Pithecanthrope ــ مەردوومی جاوە ) ماوەیێکی دوورووودرێژ (نزیکەی ١٢ ملیۆن ساڵ) لە پێشکەوتن و گەشەکردندا بوون بۆ بارگۆڕین بەرەو بە ئادەمیزادبوون .

تەمەنی مرۆڤی هەرە زوو (جۆری Sinanthropos) نزیکەی دوو ملیۆن ساڵ دەبێت[*] . لەچاو مرۆڤی ئەمڕۆ (home sapiens ـ مرۆڤی هوشیار)دا ، کاسەی سەری سینانترۆپ مێشکی کەم تێدابوو ، بەڵام لە تەنیشتی‌یەوە ئامێری بەردینی ساکاری لێ‌بوو ، کە بە ئاشکرایی ئەوە نیشان دەدەن دەستکردی خۆی بوون و زانیوێتی بەکاریان بهێنێ .

پێشکەوتن و گەشەکردن بەرەو بە ئادەمیزادبوون و پێکهاتنی کۆمەڵ بە سێ قۆناغدا تێ‌پەڕیوە :

١ـ قۆناغی یەکەم دەستەی پێشکەوتووی ئاوسترالۆپیتیکە ، کە لە بە چوار پەل ڕۆیشتنەوە کەوتە ئەوەی تەنیا لەسەر پێکانی بڕوا و وەك ئامێر کەڵك لە دار و بەرد و ئێسکی گیانلەبەران وەربگرێ . ئەمە درێژترین قۆناغە و دووریی لە ئێمەوە دەگرێتەوە بۆ ٢ ـ ٣ ملیۆن ساڵ .

---

[*] ئەگەر ئەو دۆزینەوەیەی لە ئەفریقا و ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە تەرمی قوڵەڕشەش (زنجەنترۆپ) کراوە ، وەربگرین ، ئەوە تەمەنی دێرینترین (homo habilis) دەکاتە دوو هەزار و پێنج سەد هەزار ساڵ .

٢ـ قۆناغی دێرینترین و دێرینی مرۆڤ ـ پـەلیانترۆپ (پیتی کانـترۆپ ، سینانترۆپا ، نیاندرتـال) ، کـە ئامێری باش و کۆخیان دروست دەکرد و بـە کۆمەڵ ڕاوی گیانلەبەری گـەورەیان دەکرد . دووریـی ئـەم قۆناغـە لـە ئێمـەوە نزیکەی ملیۆنێك ساڵ دەبێت .

٣ـ قۆناغی مرۆڤی هاوچەرخی بە وزە . ئەم قۆناغە ٤٠ ـ ٥٠ هـەزار ساڵێك لە ئێمەوە دوورە .

**مرۆڤی هۆشیار الانسان (بوصفة نوعا بیولوجیا)**

**Homo sapiens**

بـ . : مەیموونی سەرەتایی

**مرۆناسی علم الانسان Anthropology**

**مۆرفۆلۆژی**

بـ . : وشەسازی

**مۆرفێم المورفیم Morpheme**

مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە .

مەبەست لـە مۆرفێم ـ بچووکترین دانـەی واتـادار ، ئەوەیـە کـە نـاتوانرێ بچووکتر بکرێتەوە بە مەرجێ واتای نەفەوتێ . بەوێنە ، وشەی ( مۆمدان ) لە دوو مۆرفێم : (( مۆم + دان )) دروسـت بـووە و هـەر یـەکێك لـەو مۆرفێمانـە بچووکترین پارچەی واتاداری ئەو وشـەیەن و نـاکرێ بچووکـتر بکرێنـەوە و ماناش ببەخشن . بێگومان ، ئەگەر یەك دەنگیان لـێ لابرێ ، بێواتا دەبن و ناتوانرێ پێیان بوترێ مۆرفێم ... هەروەها وشەی (( پەری )) بریتییە لە یەك

مۆرفێم یاخود دوو بڕگە ، یاخود چوار فۆنێم . لێرەدا ((پەری)) بچووکترین دانەی واتادارە و لەوە بچووکتر ناکرێتەوە ، بە مەرجێك واتای ون نەبێ . ئەگەر بکرێتە (( پە ، ری )) واتای نامێنی کە واتاش نەما بە مۆرفێم ناژمێررێت .

دەشی سێ جۆر مۆرفێم جیابکرێتەوە .

١- مۆرفێمی ڕیشەیی

بـ . : مۆرفێمی ڕیشەیی

٢- مۆرفێمی وشەداڕێژ

بـ . : مۆرفێمی وشەداڕێژ

٣- مۆرفێمی وشەگۆڕ

بـ . : مۆرفێمی وشەگۆڕ

- مۆرفێمی ئافیکسی

= مۆرفێمی بەند ، گیرەك

بـ . : گیرەك

- مۆرفێمی بەند

= مۆرفێمی ئافیسکی ، گیرەك

بـ . : گیرەك

- مۆرفێمی پێوەندی

بـ . : ناوبەند

## ـ مۆرفێمی ڕیشەیی    المورفيم الجذري    Root morpheme

= مۆرفێمی سەربەخۆ

بچووکترین بنکەی وشە ، کە مانای سەرەکیی وشە هەڵگریٚ ، لە زانستی زماندا بە مۆرفێمی ڕیشەیی ناسراوە . بەوێنە ((ڕەش)) لە وشەی ((ڕەشایی))دا بنکەیە و مۆرفێمی ڕیشەیییە ؛ لە وشەی ((چڵکن))دا ــ ((چڵك)) بچووکترین بنکەیە و مانای سەرەکیی وشەکەی هەڵگرتووە ؛ لە وشەی ((بەهێن))دا ــ ((هێن)) بنکەیە ؛ ((هات)) لە وشەی ((هاتن))دا ؛ ((چوو)) لە وشەی ((چوون))دا مۆرفێمی ڕیشەیین ... هتد .

هەروەها بەشی هەرە زۆری ئەم مۆرفێمانە بە شێوەی سەربەخۆش خۆیان دەنوێنن و واتا دەبەخشن . هەر لەبەر ئەوەشە هەندیٚ جار لە زانستی زماندا مۆرفێمی ڕیشەیی بە (مۆرفێمی سەربەخۆ) ناودەبریٚ .

بەوێنە ، وشەی ((شار)) مۆرفێمێکی سەربەخۆیە و مانای هەیە و خۆی بەتەنیا بەکاردێت ... هەر بەو چەشنەش سەدان وشەی دی ، وەك : مار ، باڵ ، ساڵ ، دار ، چاو ، ئاسن ، بڵند ، کەم ، زۆر ، جوان ، سەر ، سەوز ، پایز ، بزن ، گەرم ... هتد .

## ـ مۆرفێمی سەربەخۆ

ب . : مۆرفێمی ڕیشەیی

## ـ مۆرفێمی وشەدارێژ    المورفيم المكون للكلمة

## Derivational morpheme

هەرچەندە ڕەگی وشە مانای سەرەکیی وشە هەڵدەگریٚ ، بەڵام هیچ زمانێك ئەو توانستەی نییە تەنیا بە ڕەگ و وشەی سادە مەبەست دەربڕیٚ .

ڕەگی وشە و وشەی سادە بە یاریدەی پێشگر و پاشگر دەتوانن سەدان وشە دروست بکەن و سەدان مانا و مەبەست دەربڕن . بەوێنە ، پاشگری ( ێنە ) کە دەچێتە سەر وشەی (( نیسك ، ماش ... )) ، دوو وشەی نوێ دادەڕێژێ : (( نیسکێنە ، ماشێنە ... )) . پاشگری ( ین ) کە بە وشەی سادەی ( سەر ، نەرم ... ))ەوە دەلکێ ، ئەو دەمە وشەی داڕێژراوی (( سەرین ، نەرمین ... )) سازدەبێ . پاشگری ( ار ) کە بە ڕەگی کرداری (( وتن ، کوشتن ... ))ەوە دەنووسێ ، وشەی ( وتار ، کوشتار... ) پێكدێنێ ... پێشگری ( ڕا ) کە دەچێتە سەر کرداری سادەی (( هاتن ، بوون ... )) ، دەیانکاتە ( ڕاهاتن ، ڕابوون ... )) کە کرداری داڕێژراون . پێشگری ( بێ ) کە بە ناوی سادەی (( هۆش ، هێز ... ))ەوە دەلکێ ، دەیانکاتە ئاوەڵناوی داڕێژراوی ( بێهۆش ، بێهێز ... )) . پێشگری (پێ) کە بە ڕەگی کرداری سادەی ( ویستن ، خەفتن ...))ەوە دەنووسێ ، ناوی داڕێژراوی (( پێویست ، پێخەف ... ))یان لێسازدەکا ... هتد .

بەم چەشنە ، ئەو پێشگر و پاشگرانەی دەوری وشەڕۆنان دەبینن ، جۆرێکی تایبەتین لە مۆرفێم و لە زانستی زماندا بە ( مۆرفێمی وشەداڕێژ ) ناسراون .. ئەم جۆرە مۆرفێمە لەبەر ئەوەی بە شێوەی سەربەخۆ کارناکا و واتا نابەخشێ ، بۆیە بە ( مۆرفێمی بەند ) ، یاخود (مۆرفێمی ئافیکسی)یش ناودەبرێ .

گەلێك لە زانایانی زمان لەو ڕایەدان ، کە بەشی زۆری پێشگر و پاشگر لە زوودا وشەی سەربەخۆ بوون و بە تەنیا مانایان داوە و لە دواییدا بۆ دەربڕینی مانای نوێ لەگەڵ وشەی دیدا یەکیان گرتووە و وشەی لێکدراویان هێناوەتە کایەوە .. ئەنجامی وشە لێکدان بووەتە هۆی گۆڕینیان . دیارە بە تێپەڕبوونی کات و زۆر بەکارهێنان هەندێکیان لێسواوە و بەرە بەرە فۆرمی تازەیان وەرگرتووە .

بێگومان هەر زمانێك لە چەشنی بەکارهێنانی پێشگر و پاشگردا خاوەنی خاسیەتی تایبەتی خۆیەتی . بەوێنە ، زمانی وا هەیە ، وەك زمانی ( تۆرانێکان ، ئوگۆرە ـ فینی ) کە پێشگر بەکار ناهێنن و هەموو ڕێزمانیان بە هۆی پاشگرەوە دەردەبڕن . بەم جۆرە ، تێکڕای وشەکانی ئەو زمانانە لە ڕەگی وشەوە دەست پێدەکەن و لە کۆتاییەوە بەپێی پێویست زنجیرەیێك پاشگر دێت . زمانی دیکەش هەیە بە پێچەوانەوە پێشگر بەکاردەهێنن و پاشگر ( لە هەندێ حاڵەتی بیژۆکدا نەبێ ) بەکارناهێنن ، وەك ( زمانی سواحیلی )ی کە لە خێزانی ( بانتوو )ە ـ ( ناوەڕاستی ئەفەریقا ) .

زمانە هیند و ئەوروپاییەکان ، کە زمانی کوردییش یەکێکە لەو خێزانە ، هەردووك ـ واتە پێشگر و پاشگر ـ بەکاردەهێنن . بەوێنە (( بەربوونەوە )) لە پێشگری ( بەر ) و کرداری ( بوون ) و پاشگری ( وە / ەوە ) پێکهاتووە . وشەی (( بێهێز ) لە پێشگری ( بێ) و ( هێز ) کە ناوە پەیدابووە . (( ئاسنگەر )) لە وشەی ( ئاسن ) و پاشگری ( گەر ) دروست بووە ... هتد .

پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ئەو دەورەش دەبینن ، کە وشەیێك لە بەشێکی ئاخاوتنەوە بکەنە بەشێکی دیکەی ئاخاوتن ، واتە ناو دەکەنە ئاوەڵناو ، یاخود بە پێچەوانەوە ئاوەڵناو دەکەنە ناو ... هتد . بەوێنە وشەی (( هێز )) ناوە و (( بەهێز )) کە ئاوەڵناوە بە یاریدەی پێشگری ( بە ) دروست بووە . وشەی (( زێڕ )) ناوە ، دەمێ پاشگری ( ین )ی دەخرێتە سەر دەبێتە ئاوەڵناو ـ (( زێڕین )) . وشەی (( ورگ )) ناوە ، کاتێ پاشگری ( ن ـ in )ی لەگەڵ بەکاردەهێنرێ ـ ((ورگن)) پەیدادەبێ کە ، ئاوەڵناوە . وشەی ((درێژ)) ئاوەڵناوە ، کە پاشگری ( ی) پێوەدەلکێ دەبێتە (( درێژی )) کە ناوە . وشەی ( ڕەش )) ئاوەڵناوە ، کە پاشگری ( ایی ) دەچێتە سەر دەبێتە ((ڕەشایی)) و ئاوەڵناوەکە دەگۆڕێ بۆ ناو . وشەی (( زەرد )) ئاوەڵناوە و بە یاریدەی پاشگری ( ێنە ) وشەی (( زەردێنە )) پێك‌دێ و ناو پەیدا دەبێ ... وشەی ((هۆش)) کە ناوە ، کاتێ پێشگری ( بێ)ی پێوەدەلکێ دەبێتە

ئاوەڵناو - ((بێهۆش)) ، کەچی ئەگەر پاشگری (ی)یشی بخرێتە سەر ئەوە سەرلەنوێ دەبێتەوە ناو - (( بێهۆشی )) ... هتد .

بـ .: گیرەك

## - مۆرفێمی وشەگۆڕ       المورفيم المغير للكلمة

## Inflexional morpheme

وشەکانی زمان لە نێو خۆیاندا پێوەندیی هەمیشەیی‌یان هەیە . ئەو وشانەی فرێز و ڕستە پێك‌دەهێنن پێوەندیی ئاشکرا و دیاری‌کراویان لەگەڵ یەکتردا هەیە . بۆ دەربڕینی هەر مەبەستێك ، وشەکان بەگوێرەی دەستووری ئەو زمانە دەچنە پاڵ یەك و فۆرمەی پێویستی خۆیان وەردەگرن و ڕستە پێك دەهێنن و مەبەستی دیاری‌کراو دەگەیەنن .

وەك :

* ئەو کوڕە ناوی سەردارە

سەردار کوڕی خاڵە شاسوارە

کوڕەکەی خاڵە شاسوار ناوی سەردارە

لە نێو کوڕانی خاڵە شاسواردا سەردار دیارە

سەردار کوڕێکی چاکە

... هتد .

* سەردار چوو بۆ قوتابخانە

سەردار دەچوو ( ئەچوو ) بۆ قوتابخانە

سەردار بچۆ بۆ قوتابخانە

... هتد .

بەو نموونانەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ ، کە یەکێك لە هۆ کاریگەرەکانی ڕێکخستنی وشە ، مۆرفێمی وشەگۆڕە . مۆرفێمی وشەگۆڕ دەچێتە سەر وشە و حاڵەتی جیاوازی ڕێزمانی پێك دێنێ . مۆرفێمی

وشەگۆڕ ، کە بریتییە لە نیشانە ، وەك پێشگر و پاشگر بەسەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێن . لە بەشی یەکەمی ئەو نموونانەی سەرەوەدا ، نیشانەی (ە ، ی ، ەکە ، ی ، ان ـ ی ، ێك ، ی) بە کۆتایی وشەی ((کوڕ))ەوە لکاون و حالەتی جیاوازی ڕێزمانییان دەربڕیوە . لە وشەکانی بەشی دووەمیشدا ( دە ، ئە ، بـ ) ، کە لە سەرەتاوە هاتوون ، هەمان ئەرکیان بەجێهێناوە .

بەم چەشنە بۆمان ڕوون بووەوە ، کە لە زمانی کوردیدا دو جۆر مۆرفێمی وشەگۆڕ هەیە و پێیان دەوترێ ( نیشانە ) . ئەو نیشانانەی بە کۆتایی وشەوە دەلکێن بە ( Inflexion ) ناسراون . نیشانەی کۆتایی لە زوربەی زمانەکانی جیهاندا باوە . هەرچی جۆری دووەمی نیشانەیە ، کە بە سەرەتای وشەوە دەلکێ و لە زمانی کوردیدا باوە . لە زانستی زماندا ( Augment)ی پێدەوترێ . ئەم جۆرەیان لە کەم زماندا بەدی دەکرێ . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزی و ڕووسیدا نییە ، بەلام لە زمانی یۆنانیی کۆن و سانسکریتیدا دەبێتە نیشانەی کرداری ڕابوردووی سادە و دوور .

ئەم جۆرە مۆرفێمە ـ واتە مۆرفێمی وشەگۆڕ لەبەر ئەوەی بە شێوەی سەربەخۆ کارناکا و واتا نابەخشێ لە زانستی زماندا بە (مۆرفێمی بەند) یاخود ( مۆرفێمی ئافیکسی )یش ناودەبرێ .

بـ .: گیرەك

| مێشك | الدماغ | Brain |
|---|---|---|

| میتافۆر | المجاز | Metaphor |
|---|---|---|

= ئاوەڵواتا ، خوازە ، خواستن .

زۆر کەس لەو باوەڕەدان ، کە میتافۆر زادەی ئەندێشەی شاعیرە و زەخرەفەیێکی ڕەوانبێژییە و ، ئامرازێکە لە زمانی نائاسایی ، نەك ئاساییدا

پتر بەدی دەکریٚ . هەروەها بە تیٚڕوانینی هەندیٚ ، میتافۆر تایبەتی‌یەکی زمانە و پیٚوەندی بە وشەوە هەیە ، نەك بەچالاکی و بیرکردنەوەوە . هەر لەبەر ئەمەشە ، بڕیٚك وا بیردەکەنەوە ، کە بەبیٚ میتافۆریش ژیان دەچیٚتە سەر . بە پیٚچەوانەی ئەم بۆچوونانەوە میتافۆر بە دیاردەییٚکی زۆر بلاٚو ، نەك هەر لە زمانی ڕۆژانەدا ، بەلٚکو لە چالاکی و بیرکردنەوەشدا خۆی دەنویٚنیٚ .

سیستەمی یان پیٚڕەوی بیریی ئاسایی مرۆڤ ، کە شیٚوەی بیرکردنەوە و چالاکی دیاری دەخات ، لە بنەڕەتدا سروشتیٚکی میتافۆری هەیە .

ئەو مەفهوومانەی بەسەر بیردا زالٚن تەنیا پیٚوەندییان بە هۆشەوە نییە . جگە لە بیریش ، هەموو چالاکییەکی ڕۆژانەشمان ، تا وردەکارییەکانیشی دەبەن بەڕیٚوە . ئەو مفهوومانە ڕۆنان دەدەن بەو شتانەی پەی پیٚدەبەین ، ئەگەر ڕاست بین لەوەدا ، کە پیٚڕەوی بیرمان میتافۆرییە لە سروشتدا ، ئەوا شیٚوەی بیرکردنەوە شیٚوەی پەی بە شت بردن هەموو چالاکیی ڕۆژانەمان بە زۆری بە میتافۆر دەکریٚ .

دەبیٚ ئەوەش بەبیربهیٚنینەوە ، کە پیٚڕەوی بیریی شتیٚك نییە لیٚی بەئاگابین . زوربەی ئەو چالاکییانەی ڕۆژانە دەیکەین ، بە شیٚوەییٚکی میکانیکی و خۆرسکی بەڕیٚوە دەڕوات . بۆ ئەوەی لەم شیٚوە میکانیکی و خۆڕسکییە بگەین ، دەبیٚ لە زمان وردبینەوە . لەبەر ئەوەی گەیاندنیش هەر بەندە بەو پیٚڕەوە بیرییەوە ، کە لە بیرکردنەوە و چالاکیی دیدا بە کاری دیٚنین ، زمان سەرچاوەییٚکی بەلٚگەیە بۆ بوون و چۆنیەتی ئەو پیٚڕەوە بیرییە .

هەر بە بەلٚگەی زمانیدا دەردەکەویٚ ، کە پیٚڕەوی بیریی ئاسایی لە سروشتدا میتافۆرییانەیە و ئەمەش سەرەتای ناسینەوەی ئەو میتافۆرانەیە ، کە ڕۆنانی بیرکردنەوە و کارکردن و پەی‌پیٚبردن بە دەوروبەر دیاری دەکەن .

بۆ پتر ڕوونکردنەوەی ئەو بیرەی ، کە مەفهوومەکان میتافۆرین و سنوور بۆ ڕۆنان و شێوەی چالاکیی ڕۆژانە دەکێشن ، با لە چەمکی کات بکۆڵینەوە و لەو میتافۆرە بیرییە بدوێین ، کە ( کات پارەیە ) .

ئەم میتافۆرە لە دەیان دەربڕینی ڕۆژانەی کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە ، کە ئەمانە هەندێکیانن :

( ١ـ کاتم نییە بۆ تۆی تەرخان بکەم ؛ ٢ـ کاتت بەچی سەرف دەکەی ؟ ؛ ٣ـ کارەکە سەعاتێکی برد ؛ ٤ ـ کاتی نییە بۆ ئەو کارەی دانێ ؛ ٥ـ کاتمان لێبرا ؛ ٦ـ کاتێ تەرخان بکە بۆ یاری ؛ ٧ـ کارەکە ئەو هەموو کاتە ناهێنێ ؛ ٨ـ کاتت چەند ماوە ؟ ؛ ٩ ـ کاتت چەند بەدەستەوەیە ؟ ؛ ١٠ ـ دەبێ کاتی بۆ قەرز بکەین ؛ ١١ ـ کاتەکەت بە فیڕۆدا ؛ ١٢ ـ کەڵکی لە کاتەکەی نەدی ؛ ١٣ـ کاتمان زۆر لە کیس چوو ؛ ١٤ـ سوپاس بۆ ئەو کاتەی داتینێ ؛ ١٥ـ دوو سەعات لە کاتی خۆتم بدەرێ ... ) .

ئەو ڕستانەی سەرەوە ، ئەوە ڕوون دەکەنەوە ، کە کۆمەڵی کوردی وەك هەموو کۆمەڵێکی پیشەسازیی دی (نەك هەموو کۆمەڵێك) ، کات ـ بە پارە ؛ بە سامان ؛ بەشتومەکێکی بەبەها دەبینێ ..

ئەو ڕستانە میتافۆرن ، چونکە شارەزایی ڕۆژانەی خۆمان لەگەڵ پارە و سامان و کەلوپەل بەکارهێناوە بۆ پەیبردن بە کات و ئەمە بەندە بە شارستانییەتی خۆمانەوە . مەرج نییە ، هەموو کۆمەڵە کەسێك کات بەم جۆرە ببینن ، شارستانێتی وەها هەیە ، کە بەم جۆرە بۆ کات ناچێت . بڕوانە ، چۆن لە پارە دەدوێن ، هەر واش لە کات دەدوێن . پارە سەرف دەکرێ ؛ دەدزرێ ؛ دەبرێ ؛ تەرخان دەکرێ ؛ لەکیس دەچێ ؛ بەفیڕۆدەدرێ ؛ قەرز دەکرێ ؛ دەدرێ ... کاتیش بەهەمان شێوە .

میتافۆر دیاردەیەکی زمانیی بڵاوە . لە زۆر شێوەی گەیاندنی زمانیدا دەبینرێ : ئاخاوتنی ڕۆژانە ؛ گوتاری ڕۆژنامە ؛ گوتاری دینی ؛ باسکار ؛

نووسـینی فەلسـەفی و ڕۆمـان و شـیعر و ... بڕوانـە ، ئـەم نموونانـەی خوارەوە :

(١ـ دارا ئاگری بن کایە ؛ ٢ـ پیاو گورگە ؛ ٣ـ قولاپی چاوەکان ؛ ٤ـ ڕۆژانی سـەخت ؛ ٥ـ پەپوولـەی ئـارەزوو ؛ ٦ـ گوڵدانـی بێدەنگـی ؛ ٧ـ شـیعرێکی سپی ؛ ٨ـ تەنها لە ئاشتیدا خەونەکان باڵ دەگرن ؛ ٩ـ بۆنی خیانەت و بۆنی کەلاکی تۆپیو یەك بۆنن ؛ ١٠ـ قافییە ئاسنینەکانی تۆ ... ) .

میتافۆر چۆن لە نامیتافۆر جیادەکرێتەوە ؟ یەکێك لەو نیشانانەی ، کە لە زوربەی بۆچوونـەکاندا ئاماژەی بۆ دەکرێ ، لەگەڵ جیاوزیشیاندا ، ئەوەیـە کە میتـافۆر ڕەگـەزی نـامۆیی و ڕامـانی تێدایـە . هێنـل ، بـۆ نموونـە ، لـەو باوەڕدایە ، کە لـە ڕوانگـەی گوێگر / خوێنـەرەوە ((دیـارترین تایبەتمـەندیی میتافۆر جۆری ئەو (صدمە)یەیە ، کە دەیهێنێتە ئەنجام)) . هەروەها ڕانسەم ، وای بۆدەچـــێ میتـــافۆر تـــەنیا تـــەنی نـــامۆ ، واتـــە (نـامۆیی) دەهێنێتـە نێو باری گوتنـەوە . دیسان بیردسـلی ، بـاوەڕی وایـە ، جیاوازیی نێوان دەربڕینی میتافۆری و نامیتافۆری لەو دژایەتییەدایە ، کە لە دەربڕینی میتافۆریدا هەستی پێدەکرێ . وایـنزیش ، میتـافۆر بـەو وشـەیە دەزانێ ، کە هاتنی لە باری گوتندا شتێکی چاوەڕوان نەکراوە .

**نائاگایی**    **اللاشعور**    **Irresponisible**

**ناڕاستەوخۆ**

ب.: تیان

**ناساندن**    **التعریف**    **Definition**

**ناو**    **الاسم**    **Noun**

ناو ئەو وشەیەیە کە ناوی گیاندارێك یان بێگیانێك یان بیرێك یان کارێك دیاری دەکات . وەك : ژن ، ئازاد ، ئەسپ ، کۆتر ، ماسی .. بەرد ، چیا ، گوڵ ، زەوی ، ترێ .. خەم ، بڕوا ، منداڵی ، جوانی ، تاریکایی ... دروومان ، کۆکە ، سووتەمەنی ، خۆراك ، کوتەك ...

**- ناوی ئامێر**    **اسم الألة**    **Instrument**

ئەو ناوانەن ، کە لە چاوگەوە وەردەگیرین و لەلایەن مرۆڤەوە وەکو ئامێرێك بۆ جێبەجێکردنی کار بەکاردەهێنرێن .

لە زمانی کوردیدا ناوی ئامێر لە ڕووی ڕۆنانەوە دوو جۆرە :

١- ناوی ئامێری داڕێژراو

٢ـ ناوی ئامێری لێکدراو

له هەردوو جۆرەکەشدا قەد بەشداری ناکا و تەنیا ڕەگ کاریگەرە .

* داڕێژراوە :

أ)پێشگر + ڕەك :

پیٚخەف ، پیٚنووس ـ ، پیٚخۆر ...

ب )ـ ڕەگ + پاشگر

کوتەك ، بڕەك ... کوتك ، پێچك ... پێچکە ... بێژنگ ... فڕۆکە ... ماڵە ...

* لێکدراو :

أ) ناو + ڕەگ :

بەفرماڵ ، دەستکێش ، قەڵەمبڕ ، ملپێچ ، چاپاڵێو ...

ب) ناو + ڕەگ + زیادی ( ناوبەند ، پێشگر ... ) :

دەستەسڕ ... پاژنەهەڵکێش ...

ج) ئاوەڵکردار + ڕەگ :

بەرماڵ ـ بەربەست ، دووربین ..

د) ئاوەڵکردار + ڕەگ + ە

لاگیرە ، بەرچنە ...

ـ ناوی بەرکار اسم المفعول Participle

ناوی بەرکار ناوێکی گشتییە لە چاوگەوە وەردەگیرێ و کاراکەی تێدا بەدی ناکرێت و ڕووادوەکەی دەکەوێتە سەر و بە هۆی واتا و بەردەوامیی کردەوە کەوتووەکەی سەری ، بۆی بۆتە سیفەت و دۆخێکی هەمیشەیی . کەس و کاتیشی تێدا نییە .

لە زمانی کوردیدا ناوی بەرکار لە ڕووی ڕۆنانەوە دوو جۆرە :

١ـ ناوی بەرکاری داڕێژراو

٢ـ ناوی بەرکاری لێکدراو

ناوی بەرکاری داڕێژراو ئەگەرچی لە قەد و ڕەگی کردارەوە بە یاریدەی پاشگر سازدەکرێ ، بەڵام قەد لەو کارەدا زۆر چالاکترە :

ا) قەد + پاشگر :

مردوو ، پاراستوو ، بردوو ... سووتاو ، پۆشیو ، کێڵراو ، چاندراو ... کوشتە ، کردە ، گرتە .

ناوی بەرکاری لێکدراو

ا) وشەیێکی واتادار + قەد + پاشگر :

خواگرتوو ، ئاوبردوو ...

ب) وشەی واتادار + ڕەگ :

بەرکوڵ ، بنکڕ ...

جـ ـ وشەی واتادار + ڕەگ + پاشگر :

مەلاخۆرە ، کوردکوژە ...

ـ ناوی بەرکاری داڕێژراو

بـ. ناوی بەرکار

ـ ناوی بەرکاری لێکدراو

بـ.: ناوی بەرکار

ـ ناوی بکەر

- ناوی بیٚلایەن الاسم المحاید **Neuter noun**

ناوی بیٚلایەن ئەو ناوەیە ، کە لە بنەڕەتدا جنسی نێر و مێی نییە ، وەك : ژوور ، نان ، دار ، ترێ ، هەنار ، خوێ ، سەر ، لووت ، چاو ، خوێن ، بەرد ، گەنم ، جۆ ...

بـ.: جنسەکانی ناو

- ناوی تایبەتی الاسم الخاص ، اسم عام

**Proper noun**

ناوی تایبەتی بەو ناوە دەوترێ ، کە بەسەر گیاندارێك یان بیٚگیانێکی دیاریکراودا دابڕابێ .

چۆن لە گشت زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردییشدا بەشێکی زۆری ناوی تایبەتی ، ناوی مرۆڤە ، وەك : نەسرین ، شیرین ، پەروین ، گولاڵە ، پرشنگ ، چنار ، هاژە ، شنە ، هێرۆ ... شێرکۆ ، هیوا ، ئامانج ، شێرزاد ، خەبات ، دلێر ، سەردار ...

هەروەها ناوی تایبەتی دەلوێ چیا و ڕوبار و شار و دێ و وڵات و میللەت و ... هتد بێت ، وەك : ( بێستوون ، سیروان ، تانجەرۆ، هەولێر ، باراو ، کورد ... ) ، کە ناوی شتی ناسراو و دیاریکراو نیشان دەدەن .

- ناوی جێگا اسم المکان **Locative**

ناوی جێگا ئەو ناوانەن ، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و شوێنی ڕوودانی کردار لە ئیش و کارێکی تایبەتیدا دیاری دەکەن و تایبەتن بە کارێکی دیاریکراوەوە ، نەك بۆ زۆر شت .

بۆ نموونە ( ڕوانگە ) : شوێنی ڕوودانی سەیرکردن و ڕوانینی تایبەتییە تەنها بۆ ئەو ئیشە ، بەڵام ئەو ناوی جێگایانەی لە ناوەوە پێك دەهێنرێن ،

بەپێچەوانەی ئەوانەی لە کردارەوەن بۆ شوێنی گشتین و ئیش و کاری جۆربەجۆر و جیاواز لەیەکتری تیادا دەکرێت .

- بۆ ڕۆنانی ناوی جێگا لە ڕەگەوە تەنیا پاشگری ( ـ گە / ـ گا ، ـ ەن ) بەشداری دەکەن :

لەوەڕگە / لەوەڕگا ، فرۆشگە / فرۆشگا .. سووتەن ، ڕێژەن ...

هەرچی قەدە دەوری سستە و تەنیا لە چەند وشەیێکی کەمدا دەبینرێ .

پاشگری ( ـ گە /ـ گا ) و ( ـ مان )یش پاشگری ئاشکرا و دیاری ئەو پێکهاتنەن :

خوێندنگە ... نیشتمان ...

## ـ ناوی چاوگ      اسم المصدر      Action noun

ناوی چاوگ ئەو ناوانەن ، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای تەواوی چاوگەکانیان هەڵدەگرن ، بەڵام وەك چاوگ ڕوودان و کردنیان تێدا نییە و بەهۆی واتایانەوە دەزانرێ ناون و بوونی سەربەخۆیان نییە و لە شتیدیدا هەن . لەم ڕووەوە لە ناوی واتا نێزیك دەبنەوە .

- بۆ پەیدابوونی ئەو ناوی چاوگانەی قەد لە ڕۆنانیاندا هاریکاری دەکا ، تەنیا ڕێگەی پێوەلکانی پاشگر هەیە . وەك :

کوشتار ، وتار ... وتە ، کوشتە ... کردەوە ، پاشماوە ... خواردەمەنی ، سووتەمەنی ...

ئەو ناوی چاوگانەی ڕەگ دەبێتە بنەمایان لە دوو ڕێگەوە دروست دەبێ :

١ـ ڕەگ بێ هیچ زیادیێك :

ئێشان > ئێش

خەوتن > خەو

...

پرسین > پرس

چێژتن > چێژ

٢ـ بە یاریدەی پاشگر :

لەرزە ، کۆکە ، فرە ... بێژە ، کێشە ، پرسە ... توانست ، زانست .

## ـ ناوی داڕێژراو   الاسم المشتق   Derivational noun

ب.: وشەی داڕێژراو

ناوی داڕێژراو لە زمانی کوردیدا بە زۆری بەیارمەتیی پاشگر پێكدێ .بۆ ڕۆنانی ناوی داڕێژراو نزیکەی ٧٠ــ٨٠ پاشگر و ٥ــ٦ پێشگر هەن ، کە دەچنە سەر ( ناو یا ئاوەڵناو یا کردار یا ئاوەڵکردار )ی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو :

أ. ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ناوی سادە و دەیانکەنە ناوی داڕێژراو :

١ـ ( ـ گەر ) : ئاسنگەر ، مزگەر ... ٢ـ(ـ دار ) : گیاندار ، دوکاندار ...

٣ـ ( ـ ساز) : دانساز ، چەخماخساز ... ٤ . (ـ بەند) : ناڵبەند ، کەمەربەند ...

٥ـ ( ـ وان / ـ ەوان ) : گاوان ، باخەوان ... ٦ـ( ـ کەر) : نانکەر ، سواڵکەر ...

... و گەلێکی دی .

ب ـ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و دەیکەنە ناوی داڕێژراو :

ا. ( ـ ی ) : درێژی ، جوانی   ٢ـ ( ـ ایی ) : قووڵایی ، پانایی ...

٣ـ ( ـ ێنە ) : زەردێنە ، سپێنە ...   ٤ـ ( ـ ە) : خراپە ، ڕاستە ...

٥ـ ( ـ ەمەنی ) : ساردەمەنی ، مزرەمەنی ... ٦ـ ( ـ کە ) : پیسکە ، ڕەشکە ...

... هتد .

جـ ـ ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ڕەگ و قەدی کردار و ناوی چاوگ و ناوی داڕێژراوی لێدروست دەکەن :

ا. ( ـ ار ) : وتار ، کوشتار ٢.( ـ ەر ) : نووسەر ، دانەر ...

٣ـ (ـ مان) : دروومان ، نیشتمان ... ٤ ـ ( ـ ۆکە ) : فڕۆکە ...

٥ـ( ـ اك ) : خۆراك ... ٦ـ (ـ گە) : لەوەڕگە ، بڕگە

.. هتد

جگە لەوە چەند پێشگرێکیش هەن ، کە بە ڕەگی کردار یان ناوەوە دەلکێن و ناوی داڕێژراو ڕۆدەنێن :

١ـ( پێ ـ): پێویست ، پێخەف ...

٢ـ( ڕا ـ) : ڕایەخ ...

٣ـ( بەر ـ ) : بەرچنە ، بەرکوت ...

٤ـ ( هاو ـ ) : هاوڕێ ، هاوولات ...

## ـ ناوی دوولایەن الاسم المشترك Common noun

= ناوی هاوبەش

ناوی دوولایەن ئەو ناوەیە کە بۆ نێر و مێ بەکاردێت . وەك :

کۆتر ، مراوی ، کەو ، ڕیشۆلە ، هەلۆ ، گیسك ، بەرخ ، دوژمن ، هاوڕێ ، دۆست ، شاگرد ، بەرگدروو ، مامۆستا ، قوتابی ، هەڤاڵ ... هتد .

بەشێك لە ناوی دوولایەن لە ڕێگەی بەکارهێنانی وشەیەکەوە لەگەلیدا ، دەتوانرێ بەلایەکدا بخرێت و جنسی بۆ دیار بکرێت . وەك :

| ناوی دوولایەن | بۆ نێر | بۆ مێ |
|---|---|---|
| کەر | نێرەکەر | ماکەر |
| کەو | نێرەکەو | ماکەو |
| ورچ | نێرەورچ | دەلەورچ /دێلەورچ |
| بەرخ | بەرخەنێر (بەرخی نێر ) | بەرخە مێ (بەرخی مێ) |
| گیسك | گیسکەنێر (گیسکی نێر ) | گیسکە مێ (کیسکی مێ) |

... هتد .

بەم جۆرە وشەکانی ( نێر ، گوڵ ... ) یاریدەی دیاریکردنی جنسی نێر دەدەن و ، وشەکانی ( ما / مێ ، دەڵ / دێڵ ... ) هاریکاری پێکهێنانی جنسی مێدەدەن .

بـ.: جنسەکانی ناو

- ناوی سادە — الاسم البسيط — Simple noun

بـ.: وشەی سادە

ژن ، کچ ، دار ، شار ، دێ ، ڕۆژ ، شەو ، خۆر ، شاخ ، مەڕ ، بزن ، چاو ، برۆ ، دەم ... هتد .

- ناوی کارا — اسم الفاعل — Participle

= ناوی بکەر

ناوی کارا بەو وشانە دەوترێن ، کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای ڕووداوێك لەلایەن ئیشکەرەوە دەگەیەنن و توانست و تایبەتێکەیان سیفەتێکی بەردەوام و هەمیشەییان پێدەبەخشێت .

لە زمانی کوردیدا ناوی کارا لە ڕووی ڕۆنانەوە دوو جۆرە :

١ـ ناوی کارای داڕێژراو

٢ـ ناوی کارای لێکدراو

ناوی کارای داڕێژراو لە ڕووی چەشنی چاوگەکەیەوە دوو جۆرە :

أ) ناوی کارای داڕێژراو لە چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە ( انتقالی )وە .

ب) ناوی کارای داڕێژراو لە چاوگی تێپەڕەوە .

<u>ناوی کارای داڕێژراو</u> ـ ئەو ناوەیە لە چاوگی سادە و داڕێژراوی تێنەپەڕ و تێپەڕەوە بە یاریدەی پێشگر و پاشگرەوە وەردەگیرێت . وەك :

١ـ پێشگر + ڕەگی کردار :

بوێر ، بکوژ ، بڕ ... نەمر ، نەبەز ، نەترس ، نەزان ...

٢ـ ڕەگی کردار + پاشگر :

خوێنەر ، نووسەر ، چێنەر ... زانا ، توانا ، بینا ... کڕیار ، فرۆشیار ، زانیار ... پارێزگار ... گەڕۆك ... ترسنۆك ... نووسەك ... گەزندە ... دیدە ...

٣ـ قەدی کردار + پاشگر :

خەوتوو ، کەوتوو ... داماو ، گەڕاو ... بووە ، مردە ... خوێندەوار ... کردگار ...

... هتد .

ناوی کارای لێکدراو ـ ئەم جۆرانە بریتین لە وشەیێکی واتادار و ڕەگ یان قەدی چاوگی تێپەڕ ( بە تێپەڕکراویشەوە) و تێنەپەڕ . ئەگەرچی ئەم ڕەگانە واتاکانیان ڕوون نین ، بەلاّم بنەمای پاراستنی واتای چاوگ و کردارەکانن و دەبنە هۆی مانەوەی واتاکانیان و دەورێکی چاك و چالاك دەبینن لە کێشەی وشەسازیدا .

جۆری پێکهاتنی :

١ـ وشەیێکی وتادار + ڕەگی کردار :

سەرتاش ، پیاوکوژ ، ماسیگر ، کاکێش ، زورناژەن ...

٢ـ وشەیێکی واتادار + قەدی کردار + پاشگری ( ـ و ، ـ وو ) :

ماڵ شێواو ، کۆست کەوتوو .

ـ ناوی کارای داڕێژراو

ب.: ناوی کارا

ـ ناوی کارای لێکدراو

ب.: ناوی کارا

## ـ ناوی کۆمەڵ الاسم الجمعي Collective noun

ناوی کۆمەڵ ئەو ناوەیە کە لە ڕواڵەتدا تاك و لە ناوەڕۆکدا کۆ نیشان دەدات ، وەك : گەل ، میللەت ، هۆز ، کۆمەڵ ، پۆل ، لەشکر ، چین ، دەستە و ... گەلێکی دی .

ئەو جۆرە وشانە لە ڕواڵەتدا تاکن ، بەڵام لە ناوەڕۆکدا کۆن ـ واتە کە وترا ( گەل ، میللەت ... ) ، ئەوە تێکڕا ئەو کەسانە و ئەو شتانە مەبەستن ، کە لە واتای ( گەل ) و ( میللەت )دا هەن .

## ـ ناوی گشتی الاسم العام Common noun

ناوی گشتی بەو ناوە دەوترێ ،کە بەسەر ئەو هەموو گیاندار و بێگیان و بیر و کارانەدا دابڕاوە ، کە خاوەنی یەك ڕەگەز و یەك جنسن . وەك : ناوی کەسان ( دایك ، کچ ، ژن ، باوك ، کوڕ ، مامۆستا ... ) ؛ ناوی گیاندار و باڵندە ( شێر ، ئەسپ ، کۆتر ، کەو ... ) ؛ ناوی شت ( دار ، بەرد ، خانوو ، ڕووبار ، چیا ... ) ؛ ناوی بیر و مەفهووم و کار ( بڕوا ، هێز ، شەرم ، جوانی ، پاکی ، منداڵی ، خۆراك ، دروومان ... ) ... هتد .

بەنموونە وشەکانی ( دایك ) و ( کچ ) دوو ناوی گشتین ، چونکە بە گشت دایکێ دەوترێ ( دایك) و بە گشت کچێ دوترێ ( کچ ) ... وشەی ( ئەسپ ) ناوێکی گشتییە ، چونکە بە هەموو ئەسپێك دەوترێ ( ئەسپ ) ... وشەکانی ( خاك ) و ( ڕێ) و( پێ ) هەموو ناوی گشتین ، چونکە بە هەموو خاکێك دەوترێ ( خاك ) و بە هەموو ڕێیەك دەوترێ ( ڕێ ) و بە هەموو پێیەك دەوترێ ( پێ ) ... وشەکانی ( شین) و ( ماتەم ) و (خەم) و ( پیاوەتی ) ، کە مانای تەجرید دەدەن ، سەرپاکیان ناوی گشتین .

لە واقیعدا دەبینین ( خانوو ) جۆری ئێجگار زۆرە : خانووی بەرد ، خانووی خشت ، خانووی قوڕ ... خانووی یەك نهۆم ، خانووی فرە نهۆم ... رەنگی جیاواز و شێوە و فۆرمی جۆراوجۆر ... کەچی بە هەموویان دەتوانین بڵێین (( خانوو )) . ئێمە دەتوانین دوو ( خانوو )ی سەرتاپا وەك یەك بێنینە بەرچاو ، بەڵام بە هیچ جۆرێك دوو ((مرۆڤ))ی وەك یەك نابینین ، هەر مرۆڤێك جیاوزای یەکی لەگەڵ مرۆڤانیتردا هەیە ، کەچی وشەی (( مرۆڤ )) بۆ هەموو (( مرۆڤێك )) بەکاردەهێنرێ . ئەمەش تەجریدی واتای وشەیە ـ واتە واتای گشتیی وشەیە .

لە زمانی کوردیدا ناوی گشتی دەتوانێ ببێتە ناوی تایبەتی ـ واتە وای لێ بێ کە مەبەست ناوی کەسێك بگەیەنێ ، بە وێنە وشەی ( ڕووبار ، تاڤگە ، هەڵۆ ، قومری ، شەپۆل ، شەماڵ ، شنە ، هاژە ، ئاهەنگ ...)) کە لە بنەڕەتدا ناوی گشتین ، ئێستا وەك ناوی تایبەتیش دەبینرێن ، ئەویش ئەوەیە کە بوونەتە ناوی کچ و کوڕ و مەبەستی ناوی کەسێك دەگەیەنن .

بە پێچەوانەشەوە ، ناوی تایبەتی دەتوانێ ببێ بە ناوی گشتی ، ئەگەر وای لێ بێ کە مەبەست کۆمەڵێ کەس یاخود کۆمەڵی شتی هاوڕەگەز و هاوخاسیەت بگەیەنێ . ئەمیش پتر واتای مەجاز و ئیدیۆم وەردەگرێ . بە وێنە (( بەکر مەرگەوەڕ ) ناوی قارەمانێکی داستانی (( مەم و زین ))ە و ناوێکی تایبەتییە ، بەڵام ماناکەی وای لێهاتووە کە هەموو کەسێکی فیتنە و پیاو خراپ بگرێتەوە و بەو جۆرە وەك ناوێکی گشتی کاردەکات .

## ـ ناوی لێکدراو الاسم المركب Compound noun

بـ.: وشەی لێکدراو

لە زمانی کوردیدا بۆ ڕۆنانی ناوی لێکدراو پازدە حاڵەت هەیە :

١ ـ دوو ناوی سادە . وەك :

شاهەنگ ؛ ماستاو ؛ گوڵاو ؛ گاسن ...

٢ـ دوو ناوی ساده به یاریدەی یەکێك لەم ناوبەندانە :

أ ـ (ە) وەك :

بەردەنوێژ ؛ مانگەشەو ؛ گوڵەگەنم ؛ چەرمەگا .

ب ـ ( و ) . وەك :

هێلکەوڕۆن ؛ لەرزوتا ...

جـ ـ ( بە ) . وەك :

کولێرەبەڕۆن ؛ سەربەگێچەڵ ...

٤ ـ ناوێکی سادە و ئاوەڵناوێك بە یارمەتیی ناوبەندی ( ە ) . وەك :

مێرگەسوور ؛ کێلەسپی ...

٤ ـ ئاوەڵناو + ناو . وەك :

ڕەشماڵ ؛ زەرداو ...

٥ ـ ناوێکی سادە و ڕەگی کردار . وەك :

دارتاش ؛ ڕۆژهەڵات ؛ لێفەدروو ؛ مووکێش ...

٦ـ ئاوەڵکردارێك و ناوێکی سادە . وەك :

بەرماڵ ؛ ژێرپیاڵە ؛ ژێرکراس ؛ بنباخەڵ ...

٧ـ ئاوەڵناوێك و ناوێکی سادە ، بە یارمەتیی یەکێك لەم ناوبەندانە :

أ ـ (ە) . وەك :

ڕەشەبا ؛ سەوزەگیا ؛ تەڕەپیاز ...

ب ـ ( و ) . وەك :

گەندوگو ...

...هتد .

**ـ ناوی مادی          الأسم المادي          Material noun**

ناوی مادی ناوی ئەو شتانە دەگرێتەوە ، کە بەر یەکێك یاخود پتر لە پێنج هەستی مرۆڤ بکەوێ . وەك : کەو ، دار ، گوڵ ، ئاسمان ، زەوی ، گەنم ،

پەنیر ، شەونم ، گیا ، ئاسۆ ، دەنگ ، کۆکە ، با ، شنە ، هەور ، تریشقە ، گۆشت ، خوێن .

**ـ ناوی مەعنەوی** **الأسم المعنوي** **Abstract noun**

= ناوی واتا

ناوی مەعنەوی ناوی شتێکە ، کە بوونی سەربەخۆی نییە ، بەڵکو لە شتی بەر هەست ، یا لە بیر و خەیاڵدا پەیدا دەبێ . وەك : هۆش ، بڕوا ، خەم ، شەرم ، هێز ، جوانی ، پیاوەتی ، شادی ...

لە زمای کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر ناوی مەعنەوی دەست نیشان بکرێ :

١ـ ناوی مەعنەویی بنجی :

ناوی مەعنەویی بنجی ئەو ناوانە دەگرێتەوە ، کە هەر لە بنچینەدا بۆ واتا دانراون ، وەك : خەم ، بڕوا ، شەرم ، هێز ، هۆش ...

٢ ـ ناوی مەعنەویی ڕۆنراو :

ناوی مەعنەویی ڕۆنراو ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە لە وشەیەکی مادی یان مەعنەویی‌یەوە وەرگیراون و بەیاریدەی پاشگر سازبوون .

ناوی مەعنەوی ڕۆنراویش بە زۆری لە ناو و ئاوەڵناوەوە وەردەگیرێ :

أ ـ ناو +پاشگری (ی ، ەتی / ێتی ، ایەتی ، ێنی ) .

منداڵ + ی = منداڵی

پیاو + ەتی = پیاوەتی

دز + ێتی = دزێتی

دۆست + ایەتی = دۆستایەتی

کچ + ێنی = کچێنی

ب ـ ئاوەڵناو + پاشگری ( ی ، ەتی / ێتی ، ایەتی ، ایی ) .

جوان + ی = جوانی

گەورە +ەتی = گەورەیەتی

بەرز +ێتی = بەرزێتی

بڵند + ایەتی + بڵندایەتی

قووڵ + ایی = قووڵایی

- ناوی مەعنەویی بنجی

بـ.: ناوە مەعنەوی

- ناوی مەعنەویی ڕۆنراو

بـ.: ناوی مەعنەوی

- ناوی مێ        الأسم المؤنث        **Feminine gender**

ناوی مێ ئەو ناوەیە ، کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ جنسی مێ دانرابێت .

لە زمانی کوردیدا ناوی جنسی مێ لەو پۆلە وشانەی خوارەوە پێك دێ :

١) ناوی کەسانی مێینە . وەك :

ژن ، کچ ، خوشك ، بووك ، پوور ، دایك ، خەسوو ، باوەژن ، نەنك ، خاڵۆژن ، ئامۆژن ، براژن ، هێوەرژن ...

٢) ناوی تایبەتیی کچان . وەك :

نەسرین ، شیرین ، نازدار ، پرشنگ ، گوڵاڵە ، پەروین ، گوڵزار ، شاناز ، هێرۆ ، چرا ، جوان ...

٣) ناوی گیانلەبەری مێ . وەك :

مریشك ، ماین ...

٤) ناوی هەندێ پیشەی ژنانە . وەك :

نانکەر ، جلشۆر ، کارەکەر ، مامان ، دایەن ، بەربووك ...

... و هەندێکیتر .

بـ .: جنسەکانی ناو

- ناوی نێر	الأسم المذكر	**Masculine gender**

ناوی نێر ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ جنسی نێر دانرابێت .

لە زمانی کوردیدا ناوی جنسی نێر لەو پۆلە وشانەی خوارەوە پێك دێ :

١ ـ ناوی کەسانی نێرینە . وەك :

پیاو ، باوك ، کوڕ ، برا ، خاڵ ، مام ، زاوا ، باپیر ، مێرد ، زڕباب (زڕباوك) ، خەزوور ...

٢ ـ ناوی تایبەتیی کوڕان . وەك :

شێرکۆ ، نەژاد ، بەختیار ، هێمن ، وریا ، هیوا ، گۆران ، سەردار ، سمکۆ ، نەوزاد ، ئازاد ...

٣ـ ناوی گیانلەبەری نێر . وەك :

ئەسپ ، کەڵەشێر ، بەران ، کەڵ ...

٤ ـ ناوی هەندێ پیشەی پیاوانە . وەك :

نانەوا ، خزمەتکار ، نۆکەر ، سەپان ، شوان ... و هەندێکی دی .

بـ.: جنسەکانی ناو

- ناوی واتا	الأسم المعنوي	**Abstract noun**

بـ.: ناوی مەعنەوی

- ناوی هاوبەش

بـ . ناوی دوولایەن

ناوەڕاستی زمان	وسط اللسان	**Sentrolor tongue**

ناوەکی	الداخلي	**Inside , Interior**

**Interfixus** **ناوبەند**

= ئینتەرفیکس ، مۆرفێمی پێوەندی

ناوبەند ئەو مۆرفێمە یاریدەدەرانەن کە مانای خودی خۆیان نییە ، بەلاّم لە لێکدانی وشەدا هاریکاری دەکەن . ئەم جۆرە مۆرفێمانە کە دەکرێ پێیان بوترێ ـ مۆرفێمی پێوەندی ، لە وشەی لێکدراودا بەدی دەکرێن . لە زمانی کوردیدا چەند ناوبەندێك هەیە ، وەك :

١ ـ ( ە ) :

بەردەنوێژ ، مزرەسێو ، بووکەشووشە ، گوڵەباخ ...

٢ ـ ( و ) :

لەرزوتا ، هێلکەوڕۆن ...

٣ ـ ( ەو ) :

بانەوبان ، شارەوشار ، دارەودار ...

٤ ـ ( او ) :

ڕەنگاوڕەنگ ، دەماودەم ، چەماوچەم ...

٥ ـ ( ان ) :

بەرانبەر ، سەرانسەر ...

٦ ـ ( بە ) :

چاوبەکل ، گوڵبەدەم ، جێبەجێ ...

**Diaphragm** **الحجاب الحاجز** **ناوپنچك**

**Infix** **الداخِلة ، الواسطة** **ناوگر**

ئەو جۆرە ئافیکسانەن کە لە ناوەندی ڕەگی وشەدا دادەنرێن . بە وێنە لە زمانی تاگالیدا ، کە لە خێزانی زمانە هێند و ئەوروپاییەکانە ، ناوگری ( um ) لە وشەی (( sulat )) ـ (( نامە ))دا نییە ، بەلاّم کاتێ لەو وشەیەوە ،

وشەی ((s - um – ulat)) ـ (( نووسین )) دادەڕێژرێ ، ئەوسا ناوگری ( um ) دەچێتە ناوەندی ڕەگەکەیەوە .

لە زمانی کوردیشدا :

((بواردن )) ـ لە ( بوردن )ەوە هاتووە . دەنگی ( ا ) لە نێوان ( و ، ر )دا پەیدابووە و کردارەکەی کردووە بە تێپەڕ .

(( شەبەق )) ـ بە واتای ( شەق بردنێکی گەورە ) . وا پێدەچێ لە وشەی ( شەق ) وەرگیرابێ .

(( برێشگە )) ـ لە ( برژان )ەوە هاتووە . دیارە دەنگێکی (ێ) لە لاوە هاتووە بۆ ناوئاخنی وشەکە .

... هتد .

هەر یەك لەو نموونانە دەنگێك یا زیاتری لە لاوە بۆ هاتووە ، وەك : ( ا ) لە وشەی (( بواردن ))دا ؛ ( بە ) لە وشەی (( شەبەق ))دا ؛ ( ێ ) لە وشەی (( برێشکە ))دا ... و دەوری ناوگر دەبینن .

نەبزوێن

بـ.: کۆنسۆنانت

| نەرمەئاسمانە | الحنك الرخو | Soft palatal |
|---|---|---|

بـ.: مەلاشوو

| نەرمەمەلاشوو | الحنك اللين | Soft palate |
|---|---|---|

| نەرێ | النفي ، المنفي | Negative |
|---|---|---|

= نەفی

شێوازی نەرێ ڕوونەدان و نەبوونی شتێك ، یان نەبوونی بارێك باس

دەكات :

ئازاد سێو ناخوات .

هەنارەكە ترش نییە .

... هتد .

ه . ، بـ .: ڕستەی نەرێ .

| نەسازاو | المتناقض | Contradictory |
| --- | --- | --- |
| نەسازی | التناقض | Contradiction |

## نەگونجانی دەنگ

نەگونجانی دەنگ بە نەهاتنی دەنگێك لە هەندێ شوێنی وشەدا ، یاخود ڕێكنەكەوتنی دوو دەنگ لەگەڵ یەكدی ، یاخود سستیی بوونی دەنگێك لە زارێكدا دەوترێ .

ئەوەتە لە زمانی كوردیدا لە سەرەتای وشەدا ( ر )ی لاواز نایەت و هەمیشە بە /ڕ/ی قەڵەو دەست پێدەكات . بە پێچەوانەشەوە /ڵ/ی قەڵەو لە سەرەتادا نایەت و هەردەم لاوازە ـ واتە /ر/ ، /ڵ/ بە هیچ جۆرێك ناگونجێ لە سەرەتای وشەدا بەكاربهێنرێن .

یاخود دوو دەنگی /ل/ ، /ڵ/ هەڵناگرن بخرێنە پێش دەنگی /ڕ/ەوە . بەپێچەوانەشەوە كورد /ر/ لە پێش /ڵ/ەوە ناهێنێ ( جگە لە چەند وشەیێكی كەم نەبێت ) .

لە دیالێكتی كرمانجیی ژووروودا /ڵ/ی قەڵەو نییە ، لەگەڵ ئەوەدا ، كە لە كرمانجیی خواروودا یەكجار زۆرە ...

لە كرمانجیی خواروودا دەنگی /ڤ/ زۆر كەمە و بەپێچەوانەوە لە كرمانجیی ژووروودا یەكجار زۆرە .

...هتد .

## نزيك كەوتنەوە    توحيد ، عملية التكامل    Intergration*

نزيك كەوتنەوە ئەو پرۆتسێسە مێژوویی‌یەیە ، کە یەك‌گرتن و یەك‌بوونی زمانان و دیالێکت جێ‌بەجێ‌دەکا . نزیك کەوتنەوە ژمارەی زمان کەم دەکاتەوە . حاڵەتی تایبەتی نزیك‌کەوتنەوە بریتیی‌یە لە پێوەندیی زمانان ، کە دەبێتە هۆی لە یەك وەرگرتنی وشە و پێکهاتنی وشەی هاوبەش لە نێوانیاناندا ( بە شێوەییێکی بنەڕەتی لە بواری زاراوەدا ) .

هەروەها بـ . : ترازان

## نووسین    الكتابة    Writing

لە بەراوردکردنی ئاخاوتنەوە لەگەڵ نووسین ، ئەوە دەردەکەوێ کە ئاخاوتن زۆر لە نووسین کۆنترە . تەمەنی ئاخاوتن لە ( ٤٠٠ ـ ٥٠٠ ) هەزار ساڵ کەمتر نییە ، بەڵام تەمەنی نووسین هەر هەشت نۆ هەزار ساڵێك دەبێ .

نووسین هۆیەکە بۆ لە یەکتر گەیشتن و تەواوکەری ئاخاوتنە . پێویستی ئادەمیزاد بۆ لە یەکتر گەیشتن لە دوورەوە و لە کاتی جیاوازادا بووە بەهۆی پەیدابوونی نووسین . دیارە قسە ئەگەر بەهۆی نیشانەی تایبەتی‌یەوە لەسەر شتێك نەنووسرێ ، ئەوە نە کەسێکی دوور دەتوانێ لێی ئاگادار ببێ و نە بۆ دەمێکی دواتریش دەمێنێتەوە .

پەیدابوون و بوونی نووسین وەك وەسیلەیەکی تایبەتی بۆ لە یەکتر گەیشتن ، دەورێکی دیاری بووە و هەیەتی . نووسین یارمەتی ئادەمیزادی داوە لە کورتکردنەوەی دووری و کاتدا ، تەجروبەی ئادەمیزادی

---

* لە (intergrare)ی لاتینی‌یەوە کەوتووەتەوە و مانای (یەك‌خستن ، بەیەك‌کردنەوە) دەدات .

پاراستووه و دەپـارێزێ و لـه نەوەیەکەوە بـۆ نەوەیـەکی دی هێشتۆتەوه و دەهێڵێتەوه و له گەلێکەوه بۆ گەلێکی تری گەیاندووه و دەگەیەنێ . به هۆی نووسینەوه هەر مرۆڤێك دەتوانێ کەڵك له تەجروبەی مرۆڤایـەتی وەربگرێ و گەشەی پێ بدا .

هەرچی دیاردەیەکی گەورەی سیاسی یان ئەدەبی یان زانستی هەیە ، که لـه ناوچەیـەکدا لـەدایك بـووه ، بـه هـۆی نووسـینەوه گەیشـتووەته هــەموو جیهان .

دەنگـی ئادەمیزاد به بێ‌ئامرازی تایبـەتی وەك : تەلـەفوون و ڕادیـۆ و ... هتد تەنیا له سنوورێکی تەسکدا دەمێنێتەوه و له چوارچێوەی گوێ‌لێبووندا کاردەکات .

ئەوەی پێوەندی به مانەوەشییەوه هەیە له ڕووی کاتەوه ، دەمێکه قسـەی نەستەقی وا وتراوه که نووسینی بەگرنگتر له ئاخاوتن داناوه . بۆ نموونـه ڕووسـەکان دەڵێـن : (( وشـه چۆڵەکـه نییـه ، کـەچی دەشـفڕێ و ناگـیرێ )) بەڵام (( ئـەوەی به قەڵـەم نووسـراوه ، بـه تـەوریش نابڕرێتـەوە )) . ئەمـەش نزیکــی لەگــەڵ ئــەو قســه نەســتەقه لاتینیـیــەدا هەیــه ، کــه دەڵــێ : ((Verba volant – scripta manent)) واتـه (( وشـه دەفـڕێ ، نووسـین دەمێنێتەوه )) .

ڕاست وایـه پـەیدابوونی نووسین بگەڕێنینـەوه بـۆ ئـەو سـەردەمانەی کـه قسەکەران پێویستیان بەوه بووه ، زەحمەتیی گەیاندنی دەنگـی خۆیـان بـه هۆزێك یان نەوەیەکی دی ئاسان بکەن . بۆیه له ڕووی ئەرکەوه جۆری هـەره دێرینی نووسین ، نامه و نووسـراوی سـەرکێلی گـۆڕ بـووه ، بەڵام ئـەم جـۆره نووسـینەش هـەر وەك زمـانی ئاخـاوتن زوو بەســەرچوو . بــەدوا ئەمــەدا نووســراوی هەڵکــەنراوی ســەر بــەرد و دیــواری ئەشــکەوت و تــاقی سـەرکەوتن ... هتد هاتـه کایـەوه . لەگـەڵ پێشـکەوتنی کۆمـەڵی ئـادەمیزاددا نووسینیش پێش کەوت و ئەرکی پاشان ورده ورده فراوانتر بـوو و جـۆری

نوێی لێپەیدا بوو . ئەو نووسینانەی ئەمڕۆ دەیانبینین لە ئەنجامی هەوڵ و تەقەلای دوور و درێژ و بەردەوامیی شەن و کەو کردنی ئەوەی زووتر لەو بارەیەوە کراوە ، هاتۆتە بەرهەم .

نووسین کە کەرەستەیەکی تەواوکەری زمانی ئاخاوتن و لەیەکتر گەیشتنە ، لە شێوە و جۆری هەمەچەشنی خۆیدا لە سەردەمی جیاوازدا بە چەشنی جیاواز پێوەندی لەگەڵ زمانی گفتوگۆدا بووە .

لەگەڵ یەکنەبوونی بیر و ڕای هەندێ زاناشدا ، بەر لە هەر شت پێویستە گومانی پەیدابوونی نووسین لە پێش زمانەوە بڕەوێنینەوە . ئەگەر مرۆڤ زمانی نەبێ ، نووسینیشی نابێت . نووسین لە هەموو پلەکانی پێشکەوتنی ئادەمیزاددا تەواوکەری ئاخاوتنە ـ واتە دووەم وەسیلەی لەیەکتر گەیشتنە . دەربڕینی زمان بە هۆی ئەلفوبێوە هی دەورێکی زۆر درەنگی پێشکەوتنی نووسینە .. وا دیارە لە سەرەتادا پەیام پەیدا بووە . لەم بارەیەوە هیرادۆتی مێژوونووسی یۆنانی ( سەدەی ٥ی پ . ز ) نووسیوێتی ، کە وا کاتێ ئەسقووفەکان لەگەڵ فارسەکاندا شەڕیان دەکرد پەیامێکیان بۆ ڕەوانە کردن کە لەم گیاندارانە : (بۆق ، مشك ، مەل) و پێنج تیر پێکهاتبوو ، کە واتای (( ئەگەر ئێوەی فارس وەك بۆق لە زەلکاودا قونەقون بکەن و وەك مشك لە کوندا خۆتان بشارنەوە و وەك مەل بفڕن ، ئەوە وەك گەڵای دار بە تیرەکانمان دەتانخەین )) . ئەم نموونەیە نیشانەیەکی ڕەمزی‌یە ، کە هەر شتێك تێیدا ڕاستەوخۆ ڕەمزێك نیشان دەدا ، وەك ( مەل ـ فڕین ... هتد ) . مانای گشتیی ئەو پەیامە لەلایەن ڕەبەنەکانی دارای پادشای فارسەوە لێكدرایەوە .

لەتەك ئەو نیشانە ڕەمزی‌یە ، هەروەها نیشانەی مەرجیش هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە شتەکان هیچ دەرنابڕن ، بەلام وەك نیشانەی مەرجی بەکاردەهێنرێن . بەوێنە پەیامێکی بە ( کیپو ) بەناوبانگی ناوچەی پیرۆ ( لە خوارووی ئەمەریکا ) کە بریتیە لە : دارێك پەتی هەمەڕەنگی پێدا هەڵواسراوە و گرێی جۆربەجۆریان لێ دراوە ؛ یاخود پەیامێکی خێڵی

ئیرۆکیزی ، کە بە ( وامپۆم ) ناسراوە بریتییە لت : پشتێنێك و گوێچکە ماسیی هەمەڕەنگی گەورە و بچووکی پێوە کراوە .

ئەم جۆرە پەیامانە بە زۆری هەواڵی بەلاّ و وێرانییان دەگەیاند ... لەبارەی واتای گرێی پەتەکان و دانانی گوێ ماسییەکانەوە ، بێگومان پێویستە زووتر ئەوە بزانرێ کە کێ نامەی وا دەنووسێ و کێ وەری دەگرێ . جا ڕەبەنەکان ئاگاداری ئەوە بوون و بۆیە بە ئاسانی لە مەبەست تێدەگەیشتن .

بەم جۆرە بە واتایەکی فراوان ، دەتوانرێ هەموو شێوەیەکی لە یەکتر گەیشتنی مرۆڤ بە یاریدەی نیشانەی بینراوەوە دەربڕرێ - واتە بە هەر نیشانەیەك کە چاو ببینێ ... ناوەرۆکی ئەم دیاری کردنە تەنیا نووسین و چاپ ناگرێتەوە ، بەڵکو هەموو نیشانەیەکی تری وەك : نیشانەی هاتوچۆ و نیشانەی سەر قوتوی شیر و گۆشت ... یش دەگرێتەوە .

زانست سێ جۆری سەرەکیی نووسینی لێئاشکرایە ، کە بەپێی پلەی مێژوو بەدوا یەکدا هاتوون :

١- نووسینی وێنەیی الكتابة التصويرية Pictograpohy
٢- نووسینی بیر ( ئیدیۆگرافی ) Ideography
٣- نووسینی هیرۆگلیف Hieroglyphoi

## - نووسینی بیر الايدوگرافي ( الكتابة الرامزة للفكرة ) Ideography

لەگەڵ پێشکەوتنی ئادەمیزاد و گەشەکردنی بیر و هەستیدا ، پێویستی وا هاتە ناوەوە کە ئیتر نووسینی وێنەیی نەتوانێ ئەو ئەرکە بەجێبێنێ و ئەو دەمە نووسینی ئیدیۆگرافی ( Ideography ) - واتە ( نووسینی بیر ) هاتە مەیدان .

ئیدیۆگرافی ـ Ideography لە دوو وشەی (idea ــ بیر ) و (grapho ـ دەنووسم )ی یۆنانی‌یەوە سازبووە .

لەم جۆرە نووسینانەدا نیشانەکان واتای ڕاستەوخۆی دیاردەکان نادەن ، بەڵکو ئەو بیرە ڕادەگەیەنن کە لە مێشکی ئادەمیزاددا پەیدا دەبێ .

پەیدابوونی نووسینی ئیدیۆگرافی پێوەندی بە پێویستی دەربڕینی ئەو شتانەوە هەیە کە نەدەتوانرا لە ڕێگەی وێنەوە نیشان بدرێن . بەوێنە ، بۆ گەیاندنی واتای ( بینین ) ، وێنەی ئەو ئەندامەی لەش ( واتە ـ چاو ) دەکرا کە شت بە هۆیەوە دەبینرێ . بەم جۆرە لە هەنگاوی یەکەمی ئیدیۆگرافی‌دا هەمان ڕێگەی پیکتۆگرافی ـ واتە ڕێگەی وێنە ـ دەگیرا ، بەڵام لە گەیاندنی واتادا جیاوازی هەبوو : لە نووسینی پیکتۆگرافی‌دا وێنەی چاو واتای ((چاو))ی دەگەیاند ، کەچی لە ئیدیۆگرافی‌دا مانای (( بینین ))ی دەدا ـ واتە لە ئیدیۆگرافی‌دا وێنە واتای ئەرك یاخود ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو شتەی مەبەست بوو . هەر بەم شێوەیە دەکرێ واتای (( دۆستایەتی )) بە هۆی وێنەکردنی دوو دەستەوە دەربڕرێ ، یاخود دەشێ مانای (( دوژمنایەتی )) بە وێنەی دوو چەك بگەیەنرێ کە لە شێوەی خاچێکدا لێك‌درابن ... هتد .

لەم بارانەدا وێنە لە شێوەی مەجازدا مانا دەگەیەنێ . ئەم واتا مەجازی‌یانەی وێنە زۆر لە ئیستیعارەی هەندێ وشە دەچن . بۆ نموونە ( زمان ــ لسان ) ؛ ( زمان ــ لغة ) ... هتد . لەم قۆناغەی پێشکەوتنی نووسیندا ، یەك وێنە وەك چۆن واتای ڕاستەوخۆ دەگەیەنێ ، هەروەها مانای مەجازیش نیشان دەدا ، جا بۆیە خوێندنەوەی ئەو جۆرە نووسینانە ئاسان نییە . پێویستی خێرایی نووسین و پێویستی دەربڕینی تێکستی ئاڵۆز چ لە ڕووی ناوەرۆك و چ لە ڕووی ڕوخسارەوە بوونە هۆی ئەوەی ڕێگەی دەربڕینی مەبەست بەهۆی وێنەوە بگۆڕێت بە نیشانەی مەرجی ـ هیرۆگلیف ( Hieroglyph ) .

## ـ نووسینی فۆنەتیکی          الكتابة الصوتية

**Phonological writing**

نووسنی هەرە لە بار و گونجاو نووسینی فۆنەتیکی‌یە ، چونکە ئەمە قالبێکی وای داوە بە نووسین ، کە نەك تەنیا لە ڕووی پێکهاتنی ڕێزمانی‌یەوە ئاوێنەی زمان بێ ، بەڵکو لە ڕووی قەوارەی فۆنەتیکیشەوە وشەی تێدا ببینرێ .

کاتی خۆی میسری‌یەکان و بابلی‌یەکان هەوڵی ئەوەیان دا نووسین بخەنە سەر ڕێی فۆنەتیکی . بابلی‌یەکان وشە ناسادەکانیان کەرت دەکرد و بەم پێیە لەو دەمەدا هیرۆگلیف وای لێهات کە بە بڕگە (المقطع ـ Syllable) مانا بدات . بەم جۆرە هەنگاوی یەکەمی پێشکەوتنی نووسینی فۆنەتیکی نرا .

باشترین نموونەی شێوەی نووسینی بڕگەیی ، نووسینی هیندیی کۆنە ، کە تێیدا هەر نیگارێك ، وەك دەستوور نیشانەی کۆنسۆنانت لەگەڵ بزوێنی (ا)ی دەدا ، واتە بڕگەی ( دا ، ڕا ، شا ، زا ... هتد ) ؛ بۆ ئەوەی بزوێنێکی تر بخوێندرێتەوە نیگارەکە دەگۆڕرا ؛ ئەگەر بویسترایە تەنیا کۆنسۆنانتەکە بخوێندرێتەوە ، ئەوە نیشانەی ( قەدەغە ))ی لەگەڵ دادەنرا ؛ بۆ کۆبوونەوەی چەند کۆنسۆنانتێکیش لە بڕگەیەکدا نیشانەی (( پێکەوەبەستن ) بەکاردەهێنرا .

نووسینی بڕگەیی کە نیشانەکانی هێندەی بڕگەکانن ، ژمارەیان ئێجگار زۆر نییە و بۆیە ئەم شێوە نووسینە تا ڕادەیەك ئاسانە .

هەنگاوێکی تر لە پێکشەوتنی نووسینی فۆنەتیکی‌دا لە نووسینی کۆنی جوولەکە و فینیقی‌یەکاندا نرا ، کە وا کۆنسۆنانتەکانی ڕەگی وشەیان تێدا بە پیت دەردەبڕرا و ئەو بزوێنانەش کە فۆرمی ڕێزمانی بەجێ‌دێنن بە نیشانەی تایبەتی جیا دەکرانەوە ( لە عیبریدا بە (( شوا )) و لە عەرەبیدا بە ((حەرەکات)) دەردەبڕران ) . ئەم جۆرە نووسینانەش لە زانستی زماندا بە

نووسنیی (( کۆنسۆنانتی )) ناسراون .

دوا هەنگاوی نووسینی فۆنەتیکی لەلایەن یۆنانەکانەوە نرا ، ئەویش ئەوەبوو رێبازی بەکارهێنانی ئەلفوبیٚیان لە فینیقی‌یەکان وەرگرت . بەلاٚم ئەمان پیتیان هەر بۆ دەنگە کۆنسۆنانتەکان دانەنا ، بەلٚکو بۆ بزوێنەکانیشیان سازکرد ، چونکە وەك ئاشکرایە ، لە زمانی یۆنانیدا ، لە پێکهاتنی رەگ و ئافیکسدا تەنیا کۆنسۆنانت بەشداری ناکات ، بەلٚکو بزوێنیش هەیە . یۆنانەکان هاتن بۆ بەشێك لە دەنگی بزوێنەکانی زمانەکەیان وێنەی ئەو دەنگە کۆنسۆنانتە فینیقی‌یانەیان دانا ، کە لە یۆنانیدا نین .

بەم چەشنە ئەلفوبێی یۆنانی بەو دەستکاری کردنەوە ، یەکەم ئەلفوبیٚیە کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگ سازکرابیٚ و لە دواییشدا بووە بە بناغەی دانانی ئەلفوبێی لاتینی و سلاڤی و گەلێکی تر . پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین ، کە وەنەبیٚ پیتەکانی ئەم جۆرە ئەلفوبیٚیانە بە شێوەیەکی ساکار هەر وێنەی دەنگ بن ، بەلٚکو بە شێوەیەکی سەرەکی وێنەی فۆنێمن .

هەرچەندە نووسینی سەرەکی و باوی ئەمڕۆ نووسینی فۆنەتیکی‌یە ، کە لەسەر بناغەی وێنەی دەنگەکان سازبووە ، بەلاٚم لەگەلٚ ئەوەشدا هەندیٚ شێوازی دی تێکەلٚ بووە . بەوێنە لە نووسینی ڕووسیدا لەگەلٚ بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی فۆنێم ، هەروەها بەکارهێنانی پیت وەك نیشانەی بڕگەش لە ئاواندایە .

باشترین ئەلفوبیٚ کە لەسەر بناغەی فۆنەتیك دانرابیٚ ، ئەوەیە کە ژمارەی پیتەکانی هێندەی ژمارەی فۆنێمەکانی ئەو زمانە بیٚ .

لەبەر ئەوەی نووسین بە دەورێکی مێژوویی درێژدا تیٚپەڕیوە و گەلێك پاشماوەی کۆنی تێدا ماوە ، ئەلفوبێی کاملٚ نییە . ئەلفوبێی هەرە ناسراو و پتر بەکارهێنراو و لەبار ئەلفوبێی لاتینی‌یە . هەرچەندە ئەم ئەلفوبیٚیە لەگەلٚ فۆنەتیکی زمانی لاتینیدا باش دەگونجا ، بەلاٚم پڕ بە پڕی زمانە

ئەوروپاییەکانی دی نەبوو ، چونکە ئەو (٢٤) پیتەی بۆ زمانی لاتینی دانرابوون بەشی ئەو زمانە ئەوروپاییە نوێیانەی نەدەکرد کە پێویستیان بە ( ٣٦ ـ ٤٠ ) پیت بوو . بە پێنج پیتی بزوێنی ( a , e , o , u , I ) و دواتریش (٧) نەدەکرا ئەو هەموو بزوێنانەی لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و زمانە ئەوروپاییەکانی دیدا هەن دەربـبڕێن . یاخود ژمارەیەك دەنگی کۆنسۆنانتی ئەوتۆ لە هەندێ زمانی ئەوروپاییدا هەن کە لە لاتینیدا نەبوون و پێویستیان بە نیشانە بوو ... جا بۆ پڕکردنەوەی ئەو ناتەواوییانە ـ واتە لە دانانی پیت بۆ ئەو دەنگانەی لە لاتینیدا نەبوون ـ هەوڵی هەمەجۆر درا ، وەك : دانانی چوکڵە لە سەر یان لە ژێر ؛ گەیاندنەوەیەکی هەردوو سەری پیتێك ؛ لێکدانی دوو پیت ... هتد .

## ـ نووسینی وێنەیی الكتابة التصويرية Pictography

یەکەم جۆری نووسین لـە مێژووی ئادەمیزاددا ، نووسینی وێنەیی ( Pictography ـ الكتابة التصويرية )یە . نموونەی نووسینی پیکتۆگرافی چ لە لایەن زانایانی ئاسەوار و چ لە لایەن ئەتنۆگرافەکانەوە دۆزراوەتەوە .

پیکتۆگرافی ـــ Pictography لـە دوو وشـەی ( Pictus ـــ جـوان ، قەشەنگ)ی لاتینی و ( grapho ـ دەنووسم )ی یۆنانی پێکهاتووە . بەم جۆرە وشەی پیکتۆگرافی بە مانای ـ جوان نووسین ـ دێت .

لە نووسینی وێنەییدا وێنەی مرۆڤ ، بەلەم ، گیانلەبەر ... بە خەت کێشراوە . بێگومان چ ئەوانەی بە مێژووی هونەر و چ ئەوانەی بە ئەتنۆگرافیاوە خەریکن ، لێکۆڵینەوەی ئەو جۆرە وێنانەیان بەلاوە گرنگە ، چونکە هونەر و نووسین لەم ڕووەوە بەیەکەوە بەستراون ، بەڵام لە ڕووی ئەرکی نووسینەوە ، مەسەلەی هونەری گرنگ نییە .

وێنەی ژمارە (١) کە (( یادداشت ))ی ڕاوکەرێکی ئەسکیمۆیە و وێنەی ژمارە (٢) کە (( داواکاری ))ی هیندییەکانە ، دوو نموونەی جوانی نووسینی

وێنـەیین . یەکـەمیان خوێندنـەوەی ئاسـانترە ، چونکـە ناوەرۆکەکـەی بـاش دیارە (( مرۆڤێك چوو بۆ ڕاو ، پێسـتی دڕندەیـەکی دەسـت کـەوت ، دواتـر پێستێکی تریش ، ڕاوی فیلی ئاویی کرد ، لەگـەڵ ڕاوکـەرێکی دیـدا سواری بەلـەم بوون ، شـەو مایـەوە )) . لێرەدا ڕیـزی هێڵەکانی وێنەکە واتای ڕیـزی هێڵەکانی ڕووداوەکە نیشان دەدەن .

وێنــەی دووەم داواکـاریی خێڵـە هیندییەکانــە لـە سـەرۆکەکەیان ، کــە دەیانــەوێ ڕێگـەیان بـدات بچـن لـە ناوچـەی دەریاچـە جێنشـین بـبن . ئـەم پیکتۆگرافییـە خوێندنـەوەی گرانـترە ، چونکـە جگـە لـە باسـی گیـاندار ، هـەروەها مەبەسـتی واتـای داخوازیـی خێڵـە هیندییـەکان باسـەکە فراوانـتر دەکات .



وێنەی ژمارە (١)



وێنەی ژمارە (٢)

بۆ تەواو ڕوونکردنەوەی ئەم جۆرە نووسینە با بۆنموونە دوو هاوڕێی ئەم سەردەمەش بێنینە پێش چاومان ، کە ویستوویانە نامەی وێنـەیی بۆ یەك بنووسن . یەکێکیان وێنەی مانگ لە تاریکاییدا دەکا و ئنجا ڕۆژ لە کەلـەوە ،

بەدوا ئەمەشدا وێنەی ئەسپێك لەسەر ئاوی سەرچنار .. دووەمیان ـ وێنەی ڕۆژ دەکا لە کەلەوە ئنجا مانگ لە تاریکاییدا ، بەداو ئەمەدا وێنەی پیاوێك لەسەر مێزێك و بوتڵێ لەبەردەمیدا . وابزانم نووسراوی یەکەم دەڵێ : (( سبەینێ بەیانی بە سواری ئەسپ دەچم بۆ سەرچنار )) . دووەمیشیان دەڵێ : (( ئەمڕۆ ئێوارە دەخۆمەوە )) .

لە بەراوردکردنی ئەو نموونانەوە ، دیارە کە لە نووسینی وێنەیی‌دا هەموو ئەوەی لە بەرچاوە واتای ڕاستەوخۆ دەگەیەنێ ، بەڵام هەرچی واتای گشتی‌یەتی بەگران لێك دەدەرێتەوە .

نووسینی وێنەیی پێوەندی بەئەلفوبێوە نییە ـ واتە بریتی نییە لە کۆکردنەوەی نیشانەی دیاری‌کراو و هەروەها بەفێرکردنی خوێندنەوەشەوە بەند نییە ، چونکە مەبەست ، گەیاندنی واتای پێویستی‌یەکە ... بێ پێوەندێتی نووسینی وێنەیی بە زمانێکی دیاری کراوەوە ، بووەتە هۆی ئەوەی بتوانێ ببێ بە وەسیلەیەکی لەبار بۆ لە یەکتر گەیشتنی هۆزی خاوەن زمانی جیاواز .

هەرچەندە ئێستا نووسینی وێنەیی وەك چەشنێکی سەرەکی نووسین لە کاردا نەماوە ، بەڵام لە هەندێ بواردا بە کاردێنرێ ، بەوێنە : لە جامخانە و پڕۆپاگندە و .. دا .

نووکی زمان

ب.: سەری زمان

نیاندارتال

ب.: مەیموونی سەرەتایی

## ١ـ نیشانە العلامة Marker , Articles

نیشانە ئەو مۆرفێمەیە ، کە بە سەرەتا و کۆتایی وشەوە دەلکێ و مانای جودا جودای ڕێزمانی دەردەبڕێ .

بـ.: مۆرفێمی وشەگۆڕ

## ـ نیشانە پراگماتیکییەکان العلامات التداولية

ئەو وشانەن ، یان ئەو بەشانەی ئاخاوتنن ، کە لە هەندێك باردا ، بە هۆی دەوروبەرەوە ، کات و شوێن و کەسانی وتن دیاریدەکەن . بۆ نموونە :

ئەو دوێنێ هات

لەو ڕستەیەدا ، ئەگەر گوێگر لە بەشداربووانی بۆنەی ئەو وتنە نەبێت ، یان لە شوێن و بۆنە و کەسانی بەشداربووی گوتنەکە و دەمی گوتنەکە بەئاگا نەبێت ، ئەوە نازانێت ( ئەو ) کێیە .

هەر لەو ڕستەیەشدا ، وشەی ( دوێنێ ) ، بەبێ ئاگاداربوون لە ڕۆژی وتراوەکە ، ئاماژە بۆ کاتی مەبەست ناکات . واتە تەنیا کاتێك دەزانرێت (دوێنێ) کەی بووە ، کە بزانرێت ڕۆژی ( وتن)ەکە ، کەی بووە ، بە واتاییێکی دی ، ئەگەر گوێگر زانیاریی لەبارەی ڕۆژی وتنی ڕستەکەوە نەبێت ، ناتوانێت ڕۆژی (ڕۆیشتن)ەکەی ( ئەو ) بزانێت .

بەو پێیە وشەکانی (ئەو) و (دوێنێ) ، کە یەکەمیان لە ڕێزماندا جێناوە و دووەمیان ئاوەڵکرداری کاتە ، دەبنە نیشانەی پراگماتیکی ، چونکە سیمانتیك و ڕێزمان لە توانستیاندا نەبوو ، مەبەستی تەواوی ڕستەکە بەدەستەوە بدەن ـ واتە نە واتای کەرەستەکان و نە پێوەندیی نێوانیان لە ڕستەکەدا نەیانتوانی ، نە ( ئەو) کە کارای ڕستەکەیە و نە ( دوێنێ) ، کە ئاوەڵکرداری کاتی ڕستەکەیە و دەبوو مەفهوومی کاتی وتنەکە بەدەستەوە بدات ، دیاری بکەن .

هەر بۆیە دەڵێن بەبێ ئاگادار بوون لە چوارچێوەی ئەو وتنە ، واتە لە کاتی وتن و بۆنەکەی و شوێنی وتنەکە و هاوبەشەکانی وتنەکە ، ئەو کەرەستانە واتای تەواو ناگەیەنن . ئەمەش هۆی ئەوەیە ، کە ئەو کەرەستانە وەك نیشانەی پراگماتیکی بەکارهێنراون . ( کریستیڤا ) ڕای وایە ، کە : (( دەق بریتییە لە بەرهەمهێنان و وەك ئامێرێکیش دیاریدەکرێت ، کە هەر لە ڕێی زمانەوە ، پێڕەوی زمان دادەڕێژێتەوە ، بە هۆی بەستنەوەیەوە بە وتراوە گەیاندییەکانەوە . ئامانجیشی هەوڵدانی ڕاستەخۆیە لە نێوان زۆر جۆر لە گۆکراوەکانی پێشترییەوە ، یان ئەوانەی کە لە گەڵیدا هاوکاتن )) . واتە وتنەکە دابڕاو نابێت لە وتراوی پێش خۆی ، هەر بۆیە ئەو وشانەش ، کە لە ڕستەکەی سەرەوەدا پێکەوە ئەو مەفهوومەیان بەدەستەوەدا ، لە دەوروبەرێکی دیدا جۆرێکی تر دەبێت ، بەپێی هەلومەرجی ئەو دەمە . بۆ نموونە ، هەر ئەو ڕستەیەی پێشوو ، کە (ئەو دوێنێ ڕۆیشت) بوو ، دەشێ لە دەوروبەرێکدا وترابێت ، کە مەفهوومی هەوڵدانی هەبووبێت بە گوێگر . جا ئەگەر چوارچێوەیەك بهێننە بەرچاو و لەوێدا قسەکەر و گوێگر ، یان ڕاستتر بڵێین بەشداربووانی بۆنەکە ، قسە لە نێرراوێك بکەن ، کە بۆ ئەنجامدانی کارێك ، لە شارێکی ترەوە داواکرابێت و ئەو کاتەی کە بۆی دیاریکرابووبێت ، بۆ چوونەکەی ، نێرراوەکە چەند ڕۆژێك دواکەوتبێت . ئا لەو دەمەدا ئەگەر ئەمان مەبەستیان بووبێت ، کە نێرراوەکە زووتر بڕوات و ئەو خۆی دواخستبێت . لەوێدا دەربڕینی ئەم ڕستەیە ، مەفهوومی گلەیی و گازندە و نارەزایی لەخۆ دەگرێت ، نەك هەوڵدان ، بەتایبەت ئەگەر بەشداربووەکانی وتن ، لە تەواوی هەلومەرجەکان بەئاگابن . واتە دەشێ خودی ئەو ڕستەیە چەندین مەفهوومی جیاواز بەپێی دەوروبەری وتنەکە لەخۆبگرێت . ئەمەش بێگومان جۆرێك لە چالاکی بە زمان دەبەخشێت . نەك هەر ئەوەش ، بەڵکو کاری دەستپێوەگرتن و

ئابووریکردنیشە لە زماندا ، وەك ئەوەی کە بە کەرەستەی کەم ، مەفهوومی زۆر دەربپرێت .

نیشانە پراگماتییەکانیش بەپێی واتا ، بریتین لە :

١ـ نیشانە کەسییەکان .
٢ـ نیشانەکانی شوێن .
٣ـ نیشانەکانی کات .
٤ـ نیشانە کۆمەڵایەتییەکان .

## ـ نیشانەی ئیزافە　　علامات الأضافة　　Izafet marker

نیشانەی ئیزافە بەو نیشانەیە دەوترێ ، کە دیارخەر و دیارخراو بە یەکەوە دەبەستێت و پێوەندیی وەسفی و خاوەنێتیی و چۆنیەتیی نێوانیان نیشان دەدات .

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروودا ( ی ، ە ... ) و لە کرمانجیی ژووروودا ( ا ، ە ، یٚ ، ی ، ێد / ێت ، ێن ... ) نیشانەی ئیزافەن .

نیشانەی ( ی ) :

هەندێ ( بەڵگە وادەگەیەنن ئەم نیشانەیە لە جیٚناوی هەیی ( الضمیر الملکی relative pronoun ) هی (ئی)یەوە کەوتبێتەوە :

هەرچەندە وشەی هی (ئی) لە تێکستی کۆن و نوێی کوردیدا ، بە شێوەیەکی سەرەکی وەك جیٚناوی هەیی بەرچاو دەکەوێ ، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا دەبینرێ کە دیارخەر و دیارخراوی پێکەوە بەستووە ـ واتە دەوری ئیزافەی بینیوە .

لە زمانی فارسیی ناوەڕاستدا (ئی) جیٚناوی هەیی بووە و هەروەها کاری ئیزافەشی بەجیٚهێناوە ــ واتە یاریدەی دانەپاڵ یەکتری دیارخەر و دیارخراوی داوە .

جیّناوی هەیی ، کە لە ئاوێستدا ( یە / یا ) ، ( یەت / هیەت ) بووە ، لە هەمان کاتدا وەك نیشانەی پێکەوە بەستنی دیارخەر و دیارخراو خۆی نواندووە .

ئەم نیشانەیە کە لەوانی دیکە چالاکتر و پتر لە کاردایە ، بە دیارخراوەوە دەلکیّ :

**نیشانەی (ە) :**

هەرچەندە (ە)ش هەر نیشانەی ئیزافەیە ، بەلاّم لە بەکارهێنان و گەیاندنی واتادا هەندێك جیاوازیی لەگەلّ نیشانەی (ی)دا هەیە .

ئەم نیشانەیە کە لە (ی) کەمتر لەکاردایە ، هەروەها بە دیارخراوەوە دەلکیّ .

بە هۆی ئەو دوو نیشانە سەرەکییە و هەندیّ نیشانە و تایبەتێتیی دییەوە ، لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووودا ئیزافە سازدەبیّ . لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروشدا نیشانەی ( ا ، ە ، ی ، یّ ، ێد / ێت ، ێن ) و هەندێکی دی ئیزافە پێك دێنن .

ئەوەی نیشانەی ئیزافە لە دوو دیالێکتی سەرکیی کوردیدا لە یەك جیا بکاتەوە مەسەلەی ژمارە و جنسە . لە دیالێکتی خوارووودا وەك بینیمان نیشانەی ئیزافە بە ژمارە و جنسەوە بەند نییە . هەموو نیشانە ناوبراوەکان لە حالّەتی تاك و کۆ و نێر و مێی دیارخراودا جیا نابنەوە . هەرچی دیالێکتی ژووروە نیشانەکانی ئیزافە بەپێی ژمارە و جنس خۆیان دەنوێنن تیایدا : نیشانەی (ا ، ە) بە دیارخراوی ژمارەی تاکی جنسی مێوە دەلکێن . نیشانەی (یّ ، ی) ئیزافەی دیارخراوی ژمارەی تاکی جنسی نێر سازدەکەن . هەرچی ( ێد / ێت ، ێن ... )یشە بەدیارخراوی کۆی نێر و مێوە دەنووسێن . وەك لەو خشتەیەی خوارەوەدا دەبینریّ .




ه. ، ب.: ئیزافە

### ـ نیشانەی پرسیار علامة الاستفهام

### Question – marks , Sign of intrragation

نیشانەی پرسیار هەر وەك خاڵ ، لە یەك کاتدا دوو ئەرك بەجیٚدیٚنیٚ . ئەم نیشانەیە ، کە لە کۆتایی ڕستەدا بەکاردیٚنریٚ ، سنوور لە نیٚوان ڕستەیەك و ڕستەیەکی دیدا دادەنیٚ و کۆتایی ڕیٚزمانی دیاری دەکا ـ ئەمە ئەرکی سینتاکسی‌یەتی . جگە لەوە خاسیەتی هەواڵگەیاندنیٚکی تایبەتی نیشان دەدا ـ ئەمەش ئەکری واتایی‌یەتی .

نیشانەی پرسیار ( ؟ ) ، بۆ پرسیار بەکاردیٚ ... ڕستەیەك لە کۆتاییەکەیدا نیشانەی پرسیار دانرابیٚ ، بە ئاوازیٚکی تایبەتی پرسیار دەردەبڕریٚ . بەویٚنە :

ـ زاڵم ئەمر دەکات خاچۆ گیان ، من ئەمر بەسەر تۆدا ناکەم ، بەلاٚم دویٚنیٚ خانۆ ڕایسپاردم کە بیٚمە کن جەنابت لیٚت بپرسم چەندت ئاسن پیٚویستە بۆ کار تا بنیٚرین بۆت بکڕین ؟

( دمدم ، ل٣٧ ـ ٣٨ )

نیشانەی پرسیار هەروەها دەلوێ لە ناوەندی ڕستەدا بەکاربهێنرێ .
بەتایبەتی لە بارێکدا دابەش‌کردنی واتای پرسیار مەبەست بێ . بەوێنە :

کام ڕەشی ئەگا بە ڕەشیی چاوی ؟
برژانگی ؟ بڕۆی ؟ ئەگریجەی خاوی ؟

( گۆران ، ل١٠ )

لە پاڵ یەك دانانی دوو نیشانەی پرسیار ( ؟ )و سەرسامی ( ! ) بۆ کۆکردنەوەی چەند واتایەك دەگونجێ ، بە واتایەکی‌تر ، کاتێ ئەو پرسیارەی دەکرێ جێی خۆشی یان ناخۆشی یان سەرسامی .. بێت . بەوێنە :

دوکانداران کە دیتیان گوتیان : (( دەك بەخێر نەیێت ، ئاخۆ دیسان چ بلێ ؟! )).

(دمدم ، ل٢٩)

واتای نیشانەی پرسیار هێندە دیار و ڕوون و ئاشکرایە ، کە دەشێ بە یاریدەی ئەو نیشانەیە ، تەنانەت بە بێ وشەش مەبەست دەرببڕرێ . بەوێنە :

- ؟
- سبەینێ

## - نیشانەی سەرسامی علامة التعجب Exclamation marks

نیشانەی سەرسامی ، هەروەك خاڵ ، لە یەك کاتدا دوو ئەرك بەجێ‌دێنێ . ئەم نیشانەیە ، کە لە کۆتایی ڕستەدا بەکاردێنرێ ، سنوور لە نێوان ڕستەیەك و ڕستەیەکی دیدا دادەنێ و کۆتایی ڕێزمانی دیاری دەکا - ئەمە ئەرکی سینتاکسی‌یەتی . جگە لەوە خاسیەتی هەواڵ گەیاندنێکی تایبەتی نیشان‌دەدا - ئەمەش ئەرکی واتایی‌یەتی .

نیشانەی ( ! ) بۆ خۆشی و شادی ، خەم و خەفەت ، سەرسوڕمان و سەرسام بوون ، بڕوا و گومان ، سکالاّ و دوعا ، هەڕەشە و تووڕەبوون ... بەکاردێ . ڕستەیەك لە کۆتاییەکەیدا نیشانەی سەرسامی دانرابێ ، بە ئاوازێکی تایبەتی سەرسامی دەردەبڕێ . بەوێنە :

قژکاڵی ، لێو ئاڵی ، پرشنگی نیگا کاڵ ،
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختی ئاڵ !

( گۆران ، ل٤٥)

مەلی ناو فەزای ناموتەناهیم !
دڵی لاوم ڕۆ !

( گۆران ، ل٢٥)

(مەترۆ)ت ئەڵێی نوێنگەی نیگارە ،
(مەیدانی سوور ) جێی هەزاران هەزارە !

( گۆران ، ل٣٠٢ )

نیشانەی سەرسامی ، هەروەها دەلوێ لە ناوەندی ڕستەدا بەکاربهێنرێ ، بەتایبەتی لە بارێکدا دابەش‌کردنی واتای سەرسامی مەبەست بێ . بەوێنە :

کەڕووی لێنیشت گەردی شیعرم ،
هەی جوانەمەرگ خۆم ! هەی بمرم !

( گۆران ، ل٣٩ )

لە پاڵ یەك دانانی دوو نیشانەی ( ؟! ) بۆ کۆکردنەوەی چەند واتایەك دەگونجێ ، کاتێ ئەو پرسیارەی دەکرێ جێی خۆشی یان ناخۆشی یان سەرسامی ... بێت . بەوێنە :

لە چاپەمەنیدا ، هەروەها دانانی دەستەیەك نیشانەی سەرسامی بەرچاو دەکەوێ . بەوێنە :

هەمزە چاوەش بۆ خۆی لە دوورەوە وەستابوو ، بە دەنگێکی نێرانە بانگی ڕاهێشت :

- ئامادە بن !!

(دمدم ، ل٧٠)

- ئەی قولی خان کوا ؟

- لە شەڕدا کوژرا !!

(دمدم ، ل٢٣٩)

## - نیشانەی ناسیاوی علامة التعریف Definite articles

نیشانەی ناسیاوی ئەو نیشانەیەیە ، کە بە دوای ناوەوە یا ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ ، بۆ ئەوەی بکرێ بە ناسیاو .

لە زمانی کوردیدا (ەکە)و (ە) نیشانەی ناسیاوین .

نیشانەی ( ەکە ) :

نیشانەی (ەکە) هەرچەندە بەدوای ناو و ئاوەڵناوەوە دەلکێنرێ ، بەڵام لەگەڵ ناودا چالاکترە ، بەتایبەتی لەگەڵ ناوی گشتیدا . هەرچی لەگەڵ ناوی تایبەتیشدایە ناتوانێ خۆی بنوێنێ .

نیشانەی ناسیاوی ( ەکە ) کاتێك دەچێتە سەر وشە ، دەتوانێ مانا و مەبەستی شتێك ئاشکرا بکا کە لە پێشدا ناوی هاتبێ ، وەك (( ئازاد شیری دایە دەستم ، منیش بە شیرەکە کەوتمە ناویان ... )) . یاخود دەتوانێ ناسراوی بەدیاربخا ، بەوێنە کە دەوترێ (( پیاو هات )) ، ئەوە نازانرێ کێیە یا کێن ، چونکە نەناسێنراوە ، هەموو پیاوێك دەگرێتەوە ، بەڵام ئەگەر بوترێ (( پیاوەکە هات )) ، ئەوە بەدیار دەکەوێ و ناسراوە کێیە .. یاخود لە فرێزی (( کچی جوان ))دا ، ئاشکرا نییە کێیە یان کێن ، لەبەر ئەوەی نەناسێنراوە ، هەموو کچێکی جوان دەگرێتەوە ، بەڵام کە وترا ( کچە

جوانەکە )) ، ئەودەمە دەردەکەویٚ و ناسراوە کیٚیە . واتە ئەو کچەیە کە مەبەستمانە و قسەی لیٚ دەکەین .

نیشانەی (ە) :

(ە)ش هەروەك (ەکە) نیشانەی ناسیاوی‌یە ، بەلاّم لە واتا و بەکارهیٚنانندا جیاوازی‌یان هەیە .

## ـ نیشانەی نەناسیاوی علامة التنكير Indefinte articles

نیشانەی نەناسیاوی ئەو نیشانەیەیە کە بەدوای ناو یا ئاوەلٚناوەوە دەلکیٚنریٚ بۆ ئەوەی بکریٚ بە نەناسیاو .

تایبەتیٚتیی نیشانەی نەناسیاویی زمانی کوردی لەوەدایە ، کە جگە لە نەناسروای ( مجهولية ) ، هەروەها تاکایەتی ( افرادية )یش نیشان‌دەدا .

لە ناوچەی سلیٚمانی و موکریان ... دا ( یٚك ) و ( یٚ ) نیشانەی نەناسیاوین . هەرچیٚ (یٚ)یە ، گومانی لیٚناکریٚ ، کە کورتکراوە و ئاسان بووی (یٚك)ە .

لە دیالیٚکتی کرمانجیی ژووروو و گەلیٚك ناوچەی سۆراندا (ەك) نیشانەی نەناسیاوییە .

لە هەندیٚ بەشە دیالیٚکتی کرمانجیی ژووروودا ( ن ـ in ) و شیٚوەکانی دیکەی ( ن ـ n ، نە ـ ine ، نە ـ ne ) هەر بۆ نیشاندانی نەناسراوی بەکاردیٚن .

هەرچی نیشانەی نەناسیاوی ( یٚك / یٚ ، ەك )ە لە ژمارەی ( یەك )ەوە پەیدابووە . نیشانەی نەناسیاویی ( ن ـ in ) و شیٚوەکانی دیکەی لە جیٚناوی چەندیٚتی ( هند ـ هەندیٚك )ەوە کەوتوونەتەوە .

## ٢ـ نیشانه          السمة          Trait

زاراوەی نیشانە دەشێ بەپێی ئەو چەند خاڵانە بەسەر زماندا دادەبڕێ ، لێك بدرێتەوە :

١ـ نیشانە دەبێ مادی بێ ـ واتە وەك هەموو شتێك بە ئاسانی هەست و دەرکی پێبکرێ .

٢ـ نیشانە واتای نییە ، بەڵام ئاراستەی واتا کراوە و هەبوونی لەبەر بەجێهێنانی ئەو ئەرکەیە . بۆیە نیشانە ـ دووەم ئەندامی سیستەمی ئیشارەتە .

٣ـ ناوەرۆکی نیشانە لەگەڵ خاسییەتە مادی‌یەکاندا یەك ناگرنەوە ، ئەوسا وەك ناەرۆکی شت لە خاسیەتە مادی‌یەکانی دوور دەکەوێتە .

٤ـ ناوەرۆکی نیشانە بە خاسیەتە جیاکەرەوەکانیدا دەردەکەوێ ، کە بە رێگەی شی‌کردنەوەدا جیادەکرێتەوە و لە جیانەکراوەکاندا جیادەکرێتەوە .

٥ـ نیشانە و ناوەرۆکی بەجێگە و دەوری ئەو نیشانەیە لە سیستەمی شی‌کردنەوەی بە دوایەکدا هاتنی نیشانەدا دیاری دەکرێ .

ئەمە دەشێ بەو جۆرە نموونانە ڕوون‌بکرێتەوە . ئەگەر (پەڵە) و (پیت) ، کە سروشتی مادییان وەك یەکە و هەردووکیان بەر توانای ئەندامەمەکانی هەست دەکەون ، بەراورد بکرێن ئەوە ئاشکرا دەبێ ، کە بۆ خاسیەتەکانی (پەڵە) هەموو خاسیەتە مادی‌یەکانی : بارست ، شێوە ، ڕەنگ ، پلەی کاڵی و تۆخی ... وەك یەك گرنگن . بەڵام بۆ پیت تەنها ئەوە گرنگە ، کە ئەم پیتە لە پیتێکی تر جیابکرێتەوە : پیتی ( ا ) دەشێ گەورە بێ‌یان بچووك ، کاڵ بێ یان تۆخ ، ڕەنگی هەمەچەشن بێ ... بەڵام هەر (ا)یە ، کەچی لە گۆڕینی ئەو خاسیەتانەدا ( پەڵە ) جیا دەبێتەوە . ( پەڵە ) هیچ ناگەیەنێ ، بەڵام پیت دەیگەیەنێ ، ئەگەرچی واتای خۆی نییە . (ا) لەبەر ئەوەی بوونی هەیە . کەوا لە ( ۆ ، ی ... هتد ) جیابکرێتەوە ، تاکو ( مار ) لەگەڵ ( مۆر ، میر ... ) تێکەڵ نەکرێن ... هتد . پیت دەشێ شێوەی ماددی بگۆڕێ ، بە وێنە : جـ ،

جـ ، جـ ، ج ، ج ... جـ ؛ ج ، ج ، ... بەلاّم ئەمە بە نیسبەت ( پەڵە )وە ، کە شێوەی بگۆڕێ دەبێ بە پەڵەی جیاواز . لێرەدا مەسەلە ئەوەیە ، کەوا نیشانە بریتی‌یە لە ئەندامی دیاریکراوی سیستەمی نیشانە .

توانستی نیشانە ، کە بەجیٚ‌هێنانی ئەرکی جیاکردنەوەیە ، لەسەر ئەوە دامەزراوە کە نیشانە لە سنووری ئەو سیستەمی نیشانەیەدا (ئەلفوبێ ، پێکهاتنی دەنگیی زمان ) خۆی جیادەبێتەوە یان بە تێکڕایی یان بە یاریدەی تایبەتێتی‌یەك . ئەمەش دیسان ئاسانترە لەسەر پیت نیشان بدرێ . بە وێنە ( ۆ ) و ( ن ) بە تێکڕایی لە یەك جیاوازن و هیچ شتێکی گشتی لە نێوانیاندا نی‌یە . بە پێچەوانە (س ) و ( ش ) هەموو شتێکیان وەك یەکە ، جگە لە تایبەتێتی‌یەك کە (( سێ خاڵ ))ە لەسەر ( ش ) .

ئەگەر نیشانەیێك بگوێزرێتەوە بۆ سیستەمێکی تر ئەوە دەبێ جێگە و ئەرکی لە سیستەمدا بگۆڕرێ . بە وێنە ( p ) لە ئەلفوبێی ڕووسیدا — نیشانەی فۆنێمی ( ڕ)ە ، بەلاّم لە لاتنیی دا ( p ) نیشانەی فۆنێمی ( پ )ە . وەك ((شت)) یەکن ، بەلاّم وەك نیشانە جیاوازن .

لە نێو زانایاندا لە بارەی نیشانەوە لە زماندا ڕاییێکی یەکگرتوو نی‌یە و زۆریان ئەو تێگەیشتنە بە جۆری جیاواز لێکدەدەنەوە .

ف . ف فۆرتۆناتۆڤ زاراوەی ( نیشانە ))ی بەلاوە پەسەندبووە و زۆری بەکارهێناوە و نوسوێتی : (( زمان بریتی‌یە لە هەمەکی نیشانە ، بە شێوەییێکی سەرەکی بۆ بیر و دەربڕینی بیر لە ئاخاوتندا . جگە لەوەش ، لە زماندا هەروەها نیشانە بۆ دەربڕینی هەستیش هەیە )) . فۆرتۆناتۆڤ هەروەها نیشانەی بۆ دەربڕینی پێوەندییش تەماشا کردووە : (( ... دەنگەکانی وشە بریتین لە نیشانەی بیر ، بەتایبەتی نیشانە وەك ئەوەی بۆ بیر دێن ( واتە ـ نیشانەی شتەکانی بیر ) ، وەك ئەوەی بیر دەیهێنێت ( واتە ـ نیشانەکانی ئەو پێوەندییانە کەوا لە بیردا دەکرێنەوە لە نێوان بەشەکانی بیردا یان لە نێوان تێکڕای بیردا ) . دواتر فۆرتۆناتۆڤ

تەماشای کاری هاوبەشیی نیشانەی هەمەچەشنەی لە زماندا کردووە ، کەوا لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی فۆرمی وشە و تێگەیشتنی واتای هاوسەنگی نیشان دەدا . فۆرتۆناتۆڤ باسی ئەو جۆرە خزمایەتی‌یەی لایەنی دەنگیی زمان دەکات ، کەوا هەستی پێدەکرێ ( لەو نیشانانەی زماندا کە خراونەتە ڕوو ) وەك واتاگۆڕیی ئەو نیشانانە کە لەگەڵیان یەك دەگرن و چونکە وەك دروستکەرانی ئەم نیشانانەی لە نیشانەی تر خۆیان بریتین لە جۆری نیشانەی ناسراو لە زماندا ، بەتایبەتی نیشانە لەگەڵ واتای شێوەیی و واتای ناشێوەیی نیشانەکانی زمان لە پێوەندی‌یاندا لەگەڵ واتای ماددی یاخود واقیعی ناوەدەبرێن ) .

نیمچەبزوێن                نصف الطليق ، شبه الصائت

**Semi – vowel**

نیمچە بزوێن بە دەنگێك دەوترێ لە حاڵەتێکدا بزوێن بێ و ، لە حاڵەتێکی دیکەدا کۆنسۆنانت .

لە زمانی کوردیدا دوو نیمچەبزوێن هەیە :

١ ـ و ـ w

٢ـ ی ـ y

نیمچەکۆسپەك                الانفجاري الاحتكاكي                **Affricate**

نیهاد                المبتدأ ، المسند اليه                **Subject**

= سەرکار

نیهاد ئەو بەشەیە لە ڕستەدا ، کە کارێك دەکات ، یاخود کارێکی دەدرێتە پاڵ ، یان سیفەتێ .

**واتا**

بـ : مانا

**- واتای پێچەکی**

بـ: مانای مەجازی

**واتاسازی**

بـ: واتاناسی

**واتاناسی** **علم معاني الالفاظ** **Semasiology**

= واتاسازی

زاروەی ( Semasiology ) لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە و لە ( Sēmasia ـ واتا ، مانا ) و ( Logy ـ زانست ، لێکۆڵینەوە ) پێکهاتووە .

بەم جۆرە ( واتاناسی ـ Semasiology ) بەشێکی سەرەکییە لە زانستی وشە و لە گشت ئەو مەسەلە و کێشانە دەکۆڵێتەوە ، کە پێوەندییان بە مانای وشەوە هەیە .

| | | |
|---|---|---|
| **وەستان** | **توقف** | **Pause** |

**بـ.: ئاواز**

| | | |
|---|---|---|
| **وەسفی** | **الوصفي** | **Descriptive** |

**وتە**

**بـ. : گوتە**

**وتن**

**بـ.: ئاخاوتن**

| | | |
|---|---|---|
| **وزە** | **الطاقة** | **Energy** |
| **ـ وزەی هۆشەکی** | **الطاقة العقلية** | **Mental energy** |
| **وشە** | **الكلمة** | **Word** |

**هەرچەندە وشە دانەیێکی زمانی یەکجار دێرین و بلاو و ئاشنایە ، بەلام تا ئێستا پێناسەیێکی ورد و قوول و تەواوی نەخراوەتە ڕوو . زانایێکی وەك مالینۆڤسکی ، وشە بە دانەیێکی خەیاڵی دادەنێ و باوەڕی بەوە نییە ، کە بوونێکی لە زماندا هەبێ . لە شێوازی ئاخاوتنیشدا وشە بە دوای یەکدیدا دێن و هیچ شتێکی نێوانیان سنووری وشەمان بۆ دیاری ناکات .**

**یەکێك لە پێناسە بلاوەکانی وشە ، ئەوەیە کە وشە بریتییە لە چەند مۆرفێمێك ، کە جێگۆڕکێ ناکەن . کەڵکی ئەم پێناسەیە لەوەدایە ، کە**

جیاوازی‌یێکی گرنگ لە نێوان ڕستە و وشەدا دەخاتە ڕوو . بۆ نموونە وشەیێکی وەك ( بوێرانە ) لە چەند مۆرفێمی (بـ + وێر + انە) پێکهاتووە ، کە بە جۆرێك بە دوای یەکدیدا ڕیزبوون ، هەر گۆڕانێك لەم ڕیزبوونەدا بکەین ، دانەکە دەشێوێنین . بەپێچەاونەی ئەمەوە ، پاش و پێش‌خستنی کەرەستەی ڕستە شتێکی ئاساییە و ڕستە تێك‌نادات . بۆ نموونە ، ئەم ڕستانەی خوارەوە یەك واتایان هەیە :

* ئەو چوو بۆ بازاڕ
* ئەو بۆ بازاڕ چوو

لە لایێکی دیشەوە کەرەستەی وشە توندتر بەیەکەوە گرێدراون و وەك کەرەستەی ڕستە ناترازێن .

بە ڕای هەندێ زمانەوانیش ، وشە بچووکترین دانەی زمانە ، کە توانستی جیابوونەوەی تێدا بێ . ئەم توانستە لە نووسینی زۆر زماندا ڕەنگی داوەتە و ، ئەویش بەوەدا بۆشایی‌یێکی بچووك لە نێوان سنووری دوو وشەدا بەجێ دەهێلرێ .

## - وشەی بەرەڵاً     الكلمة المطلقة     Free word

بەو جۆرە وشانە دەوترێ ، کە لەگەڵ ژمارەیێکی زۆری وشەدا پێوەندییان هەبێ . بەوێنە ، وشەی (( مێز )) لە ڕووی ئەندازەوە دەتوانرێ بوترێ ( بچووك ، گەورە ... ) ؛ لە ڕووی شێوەوە ( خڕ ، درێژ ، کورت ، پان ، چوارگۆشە ... ) ؛ لە ڕووی ڕەنگەوە ( سپی ، سوور ... ) ؛ لە ڕووی پێویستییەوە ( نان خواردن ، نووسین ... ) ؛ لە ڕووی ئەوەی لە چی ماددەیێك دروست کراوە ( ئاسن ، دار ... ) ؛ لە ڕووی بەکارهێنان و چۆنێتی‌یەوە ( باش ، جوان ... ) ... هتد .

- وشەی تەواو		الكلمة التامة

Aurosemantic word

بـ: وشەکانی ئاخاوتن

- وشەی داڕێژراو		الكلمة المشتقة

Dervational word

وشەی داڕێژراو - ئەو وشە ناسادەیەیە ، کە لە مۆرفێمێکی ڕیشەیی و مۆرفێی وشەداڕێژ پێکهاتبێ ، ئەوجا مۆرفێمە وشەداڕێژەکە پێشگر یا پاشگر ، یا هەردوو ( پێشگر و پاشگر ) پێکەوە بن . وەك :

١- پێشگر + مۆرفێمێکی ڕیشەیی

پێ + ویست ( ویستن ) = پێویست

ڕا + یەخ ( خستن ) = ڕایەخ

بێ + هۆش = بێهۆش

بە + هێز = بەهێز

هاو + ڕێ = هاوڕێ

دا + بەزین = دابەزین

هەڵ +ماڵین = هەڵماڵین

ڕۆ + کردن = ڕۆکردن

... هتد .

٢- مۆرفێمێکی ڕیشەیی + پاشگر

ئاسن + گەر = ئاسنگەر

پیاو + ەتی = پیاوەتی

گوڵ + دان = گوڵدان

کورد + ستان + = کوردستان

دۆ + ینە = دۆینە

زێڕ + ین = زێڕین

پێش + ەوا + = پێشەوا

زان (زانین) + ا = زانا

... هتد .

٣ـ پێشگر + مۆرفێمێکی ڕیشەیی + پاشگر

نە + خۆش + ی = نەخۆشی

بەر + دان + ەوە = بەردانەوە

وەر + گەڕان + اندن = وەرگەڕاندن

بێ + هێز + ی = بێهێزی

پێ + ویست ( ویستن) + ی = پێویستی

نە + مر (مردن) + ی = نەمری

هاو + ڕێ + ەتی = هاوڕێیەتی

... هتد .

وشەی داڕێژراو به گوێرەی بەشەکانی ئاخاوتن دەتوانرێ دابەش بکرێ بەسەر ئەم جۆرانەدا :

١ـ ناوی داڕێژراو ( بـ.: ناوی داڕێژراو )

٢ـ ئاوەڵناوی داڕێژراو ( بـ. : ئاوەڵناوی داڕێژراو )

٣ـ کرداری داڕێژراو بـ.: ( بـ. : کرداری داڕێژراو )

٤ـ ئاوەڵکرداری داڕێژراو ( بـ.: ئاوەڵکرداری داڕێژراو )

## ـ وشەی دژواتا الاضداد Antonym

وشەی دژواتا بەو وشانە دەوترێ ، کە لە مانادا بەرانبەر یەکتر دژ وەستاون . وەك :

گەورە ـ بچووك

زۆر ـ کەم

بەرز ـ نزم

چاك ـ خراپ

دوور ـ نزيك

ڕووناك ـ تاريك

... هتد .

- وشەی زڕەڕێژ كلمة مقتبسة بالقياس

**Calque , Translation Loan – Word**

لە وشەكانی هەر زمانێكدا وشەی زڕەڕێژ بەرچاو دەكەون ، كە لە ڕێگای داتاشین و ماناوە وەرگیراون .

وا ڕێ دەكەوێ وشەیێكی بێگانە لە ڕووی وشەسازییەوە لە چەند بەش پێكهاتبێ و چوون دروست بوبێ و مانا و واتای چی بێ ، لە وەرگرتن و وەرگێڕاندا بۆ سەر زمانێكی دی ، پێكهاتن و دروست بوون و مانا و واتای ڕەچاو كراوە . لە ڕووی دروستبوونی وشەسازییەوە لە زمانە بێگانەكەدا چۆن بووە ، لە زمانەكەی دیشدا هەر بەو جۆرە داتاشراوە. هەروەها لە ڕووی لێكسیكۆلۆژیشەوە مانای چی بووە ، هەر بەو شێوەیە مانای بەخشیوە . بەوێنە وشەی ( pronoun )ی ئینگلیزی ، كە لە ( pro ـ جێ ؛ لە جێی ؛ لە باتی ... ) و ( noun ـ ناو ) پێكهاتووە بە ( جێناو ) ، كە لە (جێ) و ( ناو ) پەیدا بووە ، ڕۆنراوە . هەروەها وشەی ( شرق شناس ؛ خاوەرشناس )ی فارسی ، كە لە (شرق ؛ خاوەر) ـ (ڕۆژهەلات) و (شناس) ـ (ناس) پێكهاتووە و كراوە بە ( ڕۆژهەلاتناس ) .

بەم جۆرە دەبینین ، ئەو زڕەڕێژانە كە لە زمانی بێگانەوە وەرگیراون و وەرگێڕراون ، لە كەرەستەی كوردی ڕۆنراون ، بەلام شێوەی پێكهاتنیان تیشكدانەوەی ، یاخود كۆپیی وشەی بێگانەن .

- وشەی سادە الكلمة البسيطة **Simple word**

وشەی سادە بەو وشانە دەوترێن ، کە لە تاکە مۆرفێمێکی ڕیشەیی پێکهاتبن . وەك :

کوڕ ، کچ ، شێر ، مار ، خاك ، زەوی ، ترێ ، شووتی ... من ، تۆ ، ئەو ... شۆخ ، بەرز ، نزم ... ڕاست ، چەپ ... یەك ، دوو ...

- وشەی فرەواتا من جوامع الكلم ، الكلمات ذات المعاني الكثيرة **Polysemantic**

ئەو وشانەی مانایان زۆرە بە وشەی فرەواتا ناسراون . جا ئەو مانایانەش لە یەك نێزیکن ، وەك :

جۆش سەندن :

١ـ هاتنە کوڵی شتی شل لەسەر ئاگر ؛

٢ـ بریتی‌یە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ؛

٣ـ گەرم‌بوونی یەکێك لە کارێکدا .

- وشەی کار

بـ.: گوزارە

- وشەی کردار

بـ.: گوزارە

- وشەی گیراو الكلمة المقيدة **Liuked word**

بەو جۆرە وشانە دەوترێ ، کە توانستی ئەوەیان نییە لەگەڵ ژمارەیێکی زۆر وشەدا یەك بگرن و لەبەر ئەوە شێوەی بەکارهێنانیان لە قالبێکی تەسکدا

ماوەتەوە . بەوێنە ، وشەی (( کەڕ ، کۆتەرە ... )) لە زمانی کوردیدا ئەو توانست و بەربلاوی و سەربەخۆییەیان نییە ، کە لەگەڵ ژمارەیێك پۆلی جیاوازی وشەدا ڕێك بکەون و بەکاربهێنرێن .

## - وشەی لێکدراو الكلمة المركبة Compound word

وشەی لێکدراو - ئەو وشە ناسادەیەیە ، کەوا بەلای کەمەوە دوو مۆرفێمی ڕیشەیی تێدابێ .

وشەی لێکدراو دەتوانرێ بە گوێرەی بەشەکانی ئاخاوتن دابەش بکرێ بەسەر ئەم جۆرانەدا :

١- ناوی لێکدراو (بـ.: ناوی لێکدراو )
٢- ئاوەڵناوی لێکدراو ( بـ.: ئاوەڵناوی لێکدراو )
٣- کرداری لێکدراو (بـ.: کرداری لێکدراو )
٤- ئاوەڵکرداری لێکدراو ( بـ.: ئاوەڵکرداری لێکدراو )

## وشەی مردە الكلمة الميتة Obsolete

ئەو وشانەی لە کاردەکەون و پەکیان دەکەوێ و کۆن دەبن و بەرەو سوان دەڕۆن بە وشەی مردە ناسراون .

لەکار کەوتن و نەمانی وشە کارێکی گرانە و یەکسەر ڕوونادات ، بەڵکو لەسەرخۆ دەبێت . دوای ئەوەی لە ڕێگای هۆی تایبەتییەوە بەکارهێنانی هەندێ وشە کەم دەبێتەوە و لە بەشی چالاکەوە دەچنە بەشی سستەوە ، ئەوجا وردەوردە کەمتر بەکاردەهێنرێن و لە کۆتاییشدا یەکجاری لەسەر زار دەکەون و زمان بەجێدەهێڵن .

لە نێوان وشەی مردەدا جیاوزی هەیە . هەندێك لەو وشانە بە جۆرێك لە کارکەوتوون و هێندە لە مێژە لەسەر زمان نەماون ، کە بەرەی ئەم سەردەمە

نەیان بیستووە و تەنیا لە ڕێگای توێژینەوەوە ئاشکرا دەبن . ئەم چەشنە وشانەش بریتین لە :

١ـ ئەو وشانەی بە تەواوی لە زمان چوونەتە دەرەوە و بە هیچ جۆرێک بەدی ناکرێن و تەنانەت لە پێکهێنانی وشەی لێکدراویشدا ئەسەریان نییە .

٢ـ ئەو وشانەی بەشێك لە ڕێژەکانیان لە زماندا نەماون . بە وێنە لە زمانی کوردیدا وشەی (( پەروەردە )) ــ وەك ناوی بەرکار ماوە ، بەلاّم ڕێژەکانی دی نەماون . کەچی ئەگەر تەماشای زمانی فارسی بکەین ، دەبینین کە ڕێژەکانی تری ئەم وشەیە ، وەك : ( پروورِیدەن ؛ میپروراند ؛ پرووش ... ) ماون .

## ـ وشەی ناتەواو      الكلمة الناقصة      Syntactic word

بـ.: بەشەکانی ئاخاوتن

## ـ وشەی ناسادە      الكلمة غير البسيطة      Simplex word

وشەی ناسادە بەو وشانە دەوترێن ، کە لە ڕۆنانیاندا لە مۆرفیمێك پتر بەشدارییان کردبێ ، بە واتایەکی دی ئەو وشانە دەگرنەوە ، کە بەسەر مۆرفیمدا دابەش دەبن . وشەی ناسادەش لە دوو جۆر پێك دێ :

١ـ وشەی داڕێژراو . وەك :

کارگە ، زستانی ، تێچوون ، بەهێز ، ڵسەندنەوە ، هەڵگرتنەوە ...

بـ.: وشەی داڕێژراو .

٢ـ وشەی لێکدراو . وەك :

بەردەنوێژ ، گوڵەگەنم ، دڵشاد ، ڕەش پۆش ...

بـ.: وشەی لێکدراو

## ـ وشەی نوێباو            الكلمات المولدة            Neologism

وشەی نوێباو ـ ئەو وشانەن ، کە وا بۆ مانایێکی ناسراوای دانەیێك لە زمان بەکاردەهێنرێن و تازە هاتوونەتە زمانەوە و هێشتا نەچوونەتە ڕیزی وشەی چالاکی ئەو زمانەوە .

ئەو جۆرە وشانە ، تا ئەو دەمەی بە تەواوی ڕەگ دانەکوتن و جێگیر نەبن و بڵاونەبنەوە و نەچنە ڕیزی وشەی چالاکەوە ، هەر بە نوێباوی دەمێننەوە و ڕەنگی تازەییان تێدا دەبینرێ . بەوێنە وشەی (( ڕێزمان )) ـ هەرچەندە ماوەی (٤٠) ساڵێك دەبێت لە زمانی کوردیدا پەیدابوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتەواوی بڵاوبووەتەوە و جێگیر بووە و ڕەگی داکوتاوە و ڕەنگ و بۆی نوێباوی پێوە نەماوە ، هاتووەتە ڕیزی وشەی چالاکی کوردییەوە .

هەروەها (( نووسەر )) ، (( خوێنەر )) ، (( گۆڤار )) ، (( چیرۆك )) ... و گەلێکی دی ، لەگەڵ ئەوەدا ، کە لە مێژ نییە لە زمانی کودیدا هاتوونەتە ناوانەوە ، بەڵام چونکە تێکڕای خەڵکەکە وەریان گرتوون ، لەبەر ئەوە لە نوێباوی دەرچوون و لە ڕیزی وشەی چالاکی کوردیدا وەستاون .

بەم جۆرە ، وەنەبێ هەموو وشەیێکی نوێ ـ واتە هەر وشەیێك ، کە تازە لە زماندا پەیدابووبێ ـ دەبێ نوێباو بێ . وشەی نوێ بە نوێباو دەژمێرێت تا ئەو کاتەی ڕەنگ و بۆی تازەیی پێوە بێ و بەتەواوی جێگیر نەبووبێ و نەکەوتبێتە سەر زاری بەشی زۆری هەڵگری ئەو زمانە . بەوێنە ، ئەو زاراوانەی لەم ساڵانەی دواییدا لە زمانی کوردیدا پەیدابوون ، بەشێکیان بەتەواوی چەسپاون ، بەڵام بەشێکی دییان هێشتا بە باشی جیگیرنەبوون و بەتەواوی بڵاونەبوونەتەوە . ئەمیش ئەگەرچی هۆی ئەوە بێ ، ئەو وشانە زاراوەی ئەو زانستانە بن ، کە تەنیا بۆ پسپۆڕی ئەو بوار و مەیدانە بێت و پێوەندی بە تێکڕای خەڵکەکەوە نەبێ ؛ یاخود هۆی ئەوە بێ شێوازی دانان و داڕشتنیان لەبار و گونجاو نەبێ و نەچنە دڵی خەڵککەوە ... ئەم دوو

هۆیه بن ، یاخود هۆی بەجێی دیکە ، باری کارەکە ناگۆڕن و گرنگ ئەوەیە ، بە هەرجۆرێك بێ ، ئەو وشانە هێشتا بەتەوای جێی خۆیان لە زمانی کوردیدا نەکردووەتەوە و بۆن و بەرامەی نوێباوییان لێدێت .

هەرچی وشەی نوێباوە پەیدا دەبێ لە ئەنجامی :

١ـ هاتنەکایەی شت و مانا و دیاردەی نوێ .

٢ـ سەرهەڵدانی ناوی نوێ بۆ ئەو مانایانەی ناویان هەبووە .

بێگومان پەیدابوونی وشەی نوێ لە ڕێگای یەکەمەوە ، بۆ زمان کارێکی پێویستە ، چونکە ناکرێت ئەو شت و مانا و دیاردە نوێیانە بێ ناو بمێننەوە ، لەبەر ئەوەی میللەت و زمان پێویستیان بە بەکارهێنانیان هەیە .

پەیدابوونی وشەی نوێ لە ڕێگای دووەمەوە ، هەرچەندە وەك ڕێگای یەکەم پێویست و گرنگ نییە ، بەڵام هۆیەکی گرنگە لە پێشخستن و گەشەپێدانی زماندا . پەیدابوونی وشەی نوێ بۆ ئەو مانایانەی ناویان هەبووە لە ئەنجامی هەستکردنی خاوەنی ئەو زمانەوەیە بۆ هێنانە کایەی وشەی نوێ .

## ـ وشەی هاوبێژ   المشترك اللفظي   Homonym

= وشەی هاودەنگ

چۆن لە گشت زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن ، کە بە وتن و خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە . وەك :

ئازار ـ ئێشی ئەندام .

ئازار ـ مانگی مارت .

باو ـ دەستوور : فیسار شت بووە بە باو .

باو ـ باوك

باو ـ زیادەی شتێك بەسەر شتێکی دیدا .

بیٚگومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین ، کە مانایان زۆرە ، بەڵکو ئەو وشانەن کە تەنها لە وتن و خوێندنەوە و نووسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتا و پەیداوبونیاندا جیاوازن ، وەك : ( ((ئـازار)) ـ ئێشی ئەندام ) ، کە وشەییکی کوردییە ، زۆر دوورە لە ( (( ئازار )) ـ مانگی مارت ) ، کە وشەییکی کوردی نییە و لە پەیدابوون و دروست بووندا سەرچاوەییکی دی هەیە . یاخود ((باو)) دەبینین سیٚ وشەن ، کە مانایان جیاوازە و لەیەك دوورن . هەرچەندە هەرسێکیان لە ڕەسەندا کوردین ، بەلاّم پەیدابوون و دروست بوونیان لە ڕێگای جیاوازەوە هاتووە . جا ئەم جۆرە وشانە ، کە لە لێکسیکۆلۆژیدا وشەی هاوبێژ ( Homonym )یان پیٚ دەڵێن ، پێویستە لەگەڵ وشەی فرەواتا ( polysemantic )دا جیابکرێنەوە و تێکەڵ نەکرێن .

ـ وشەی هاوەدەنگ

= وشەی هاوبێژ

ـ وشەی هاوواتا المرادف Synonym

بەو وشانە دەڵێن ، کە یەك مانا دەبەخشن ، یاخود مانایان لێك نێزیکە ، بەلاّم لە وتن و خوێندنەوە و نووسیندا جیاوازن . وەك :

لێڕ ـ دارستان ـ جەنگەڵ

ئاوارە ـ پەڕیوە ـ دەربەدەر

کەلاك ـ تەرم ـ جەندەك ـ کەلەش

تووش ـ دژوار ـ سەخت ـ ناخۆش

... هتد .

## ـ وشەی یەك‌واتا        الكلمات ذات المعنى الواحد
## Monsemous word

ئەو وشانەی تەنیا یەك مانایان هەیە لە لێكسیكۆلۆژیدا پێیان دەڵێن وشەی یەك‌واتا . بەوێنە وشەكانی (شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ... هتد ) لە یەك مانا زیاتریان نییە .

## وشەڕۆنان        بناء الكلمة        Word – formation

وشەڕۆنان لە زانستی زماندا بەو بەشە دەڵێن ، كە لە چۆنیەتی پێكهاتن و یاسای دروستبوونی وشەكانی ئەمڕۆی زمان دەكۆڵێتەوە .

هەر وەك كەرەستەی لێكسیكۆلۆژی بریتییە لە وشە ، هەروها وشەڕۆنانیش هەر لە وشە دەدوێ ، بەڵام لێرەدا لە ڕووی واتا و ماناوە لێی ناكۆڵێتەوە ، بەڵكو كاری پێویست و گرنگ نیشاندانی چۆنیەتیی پێكهاتن و دروست‌بوونی وشە و دیاری‌كردنی پارچەكانێتی . بۆ نموونە ، ئەگەر لەباری وشەڕۆنانەوە تەماشای وشەی (( كوردستان )) بكەین ، دەبینین لە وشەی (( كورد )) و پاشگری ( ستان ) پێكهاتووە . بەم جۆرە لە وشەی (( كوردستان ))دا دوو پارچەی واتادار هەیە ، كە هەر پارچەیەكیان دەكرێ لەگەڵ پارچەی تردا بەكاربهێنرێ . بۆ نموونە (( كوردایەتی ؛ كوردپەروەر ... )) ؛ (( گۆڕستان ، ئەرمەنستان .. )) . لێرەدا جگە لە نیشاندانی شێوەی دروست‌بوونی وشە ، پێویستە مانای ئەو پارچە جودا جواد واتادار ( مۆرفێم )انەش ، كە وشەكە پێك‌دەهێنن ، دەست‌نیشان بكرێت : (( كورد )) ناوی میللەتێكە ؛ ( ستان ) لە زمانی كوردیدا پاشگرێكە شوێن و جێگە نیشان دەدات ... بەم شێوەیە ، كە پاشگری ( ستان ) دەچێتە سەر وشەی (( كورد )) ، وشەی (( كوردستان )) پەیدا دەبێ و مانای ( مەڵبەندی كوردان ) بە دەستەوە دەدات .

**وشەسازی** **علم الصرف** **Morphology**

= مۆرفۆلۆژی

زاراوەی (مۆرفۆلۆژی) ، کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە لە ( morphe ـ شێوە ، فۆرم ) و ( Logos ـ زانست ، لێکۆڵینەوە ) پێکهاتووە . بەم جۆرە مۆرفۆلۆژی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لەبارەی وشەوە ، لە ڕووی پێکهاتن و گۆڕانەوە .

بەشەکانی ئاخاوتن باسی هەرە سەرەکیی وشەسازین . لە لێکدانەوەی کێشەی بەشەکانی ئاخاوتنەوە باسی ڕێزمانی هەموو زمانێك دەست پێ‌دەکات .

ب.: بەشەکانی ئاخاوتن

**وێکچواندن** **المماثلة** **Assimilation**

وێکچواندن لە ئەنجامی کار لە یەکدی کردنی کشانەوە و هەڵمەتی دەنگە دراوسێکاندا ، کە قورسایی‌یان لەسەر یەکدی هەیە ، پەیدا دەبێ . وشەی ( assimilatio )ی لاتینی خۆی دەتوانێ ببێتە نموونەی وێکچواندن . ئەم وشەیە لە : ( assimulo ) ـ ( وێکیان دەچووێنم ، یەکیان دەخەم )ەوە دروست‌کراوە . ئەم کردارە لە پێشگری ( as < ad ) و کرداری ( Simulo ) پێکهاتووە . ئەگەر لەگەڵ ( assimilis ) ـ (لێ‌چوو)دا بەراوردی بکەین ، دەبینین لە دروست بوونیدا پێشگر ( ـ ad ) : ( ad ـ similis ) هەیە . کۆنسۆنانتی ( d)ی پێشگر بە تەئسیری هەڵمەتی دەنگی ( s) ئاوازەدارێتی و کۆسپەکی لە دەست دەدا ... وێکچواندن بریتی‌یە لە کارتی‌کردنی دەنگەکانی دراوسێ لە کۆمەکی وتندا ، پتریش لە هەر شت کۆنسۆنانت لە ڕووی ئاوازەداری و کپی ، نەرمی و توندی‌یەوە دەکەوێتە ژێر باری کارتی‌کردنەوە ... وێکچواندنی هەمەکی ( الکلی) و وێکچواندنی هەندەکی (الجزئی) هەیە ...

- وێكچواندنی پێچەوانە      المماثلة الرجعية ( العكسية )
Regressive assimilation

- وێكچواندنی تەواو
ب. : وێكچواندنی هەمەكی .

- وێكچواندنی ڕاستەوخۆ      المماثلة التقدمية
Progressive assimilation

- وێكچواندنی ناتەواو
ب.: وێكچواندنی هەندەكی

- وێكچواندنی هەمەكی      التماثل الكامل      Equalization
= وێكچواندنی تەواو

وێكچواندنی هەمەكی بەو حاڵەتە دەوترێ ، كە هەردوو دەنگەكە بە تەواوی وەك یەكیان لێبێت . بۆ نموونە ( كردتان ) بە ( كرتتان ) تەلفوز دەكرێ ـ واتە ( د ) بە كارتێكردنی (ت)ی دوایەوە ، دەبێ بە (ت) . لێرەدا لە سەرێكەوە دەنگی (د) لە ئاوازەداریەوە دەبێ بە كپ و لە سەرێكی دییەوە وەك (ت)ی دواوەی لێدێ .

ئەم حاڵەتە لە شێوەی سلێمانیدا زۆر دەبیسترێ و گەلێ دەنگ دەگرێتە خۆ ، كە لە نێوانیاندا فۆنێمی (د) یەكجار بەرچاوە . بەوێنە:

أ- لە وشەیێكی نادەسادا گەر مۆرفێمی یەكەم كۆتایی بە دەنگی ( ز ، م ، ڤ ، ن ، ڵ ، و ، ر ... ) هاتبێ و یەكەم دەنگی مۆرفێمی دووەمی (د) بێ ، ئەوە ئەو (د)ە ، وەك ئەو دەنگانەی مۆرفێمی یەكەمی لێدێ .




ب ـ دەنگی (د) نەك هەر كە دەكەوێتە دوای ئەو دەنگانەی ناومان بردن ، بەر یاسای گونجاندنی هەمەكی دەكەوێ ، بەڵكو لە پاش یان لە پێش دەنگی (ت)شەوە دێت ، دیسان تووشی هەمان گۆڕان دەبێت .

یەكەم ـ كاتێ لە پاش دەنگی (ت)ەوە دێت .

واتە . ت د > دد . وەك :

ماتدان > ماددان

خەتدار > خەددار

دووەم ـ دەمێ دەكەوێتە پێش دەنگی (ت)ەوە :

واتە ـ دت > تت

كردتان > كردتتان

بردتان > برتتان

## ـ وێكچواندنی هەندەكی الماثلة الجزئية Partial assimiation

= وێكچواندنی ناتەواو

وێكچواندنی هەندەكی بەو حاڵەتە دەوترێ ، كە لەیەك ڕووەوە گۆڕان بەسەر دەنگدا بێ . بەوێنە لە وشەی ( گەستی )دا ( ز ) تەنیا لە باری كپ بوونەوە كەوتووەتە ژێر كارتێكردنی (ت)ەوە و بووە بە ( س ) ، نەك بە (ت) .

چەند نموونەیێکی وێکچواندنی هەندەکیی زمانی کوردی :

١ـ گۆڕینی دەنگێکی ئاوازەدار بە کپ .

أ ـ ز > س

گەڵێ جار دەنگی (ز) ، کە ئاوازەدارە لەبەردەم هەندێ دەنگی کپ . بەتایبەت ( ت ، ك )دا وەك ( س ) دەوترێ ، کە ئەمە دەنگە هاوەڵە کپەکەیەتی . وەك :

پارێز > پاراستن ، پاراستی

گەزین > گەستن ، گەستی

ناز + ك > ناسك

ب ـ ژ > ش

دەنگی (ژ)ی ئاوازەداریش ، دەمێ لە پێش (ت)ی کپەوە دێت ، بە (ش )ی کپی بەرانبەری دەردەبڕرێت . وەك :

کوژران > کوشتن ، کوشتی

ڕۆژ + تان > ڕۆشتان

جـ ـ ب > پ

بەتایبەت ، کە دەکەوێتە پێش ( چ ، ك )ەوە

بچۆ > پچۆ

چ بکەم > چ پکەم

٢ـ گۆڕینی دەنگێکی کپ بە ئاوازەدار .

أ ـ س > ز

دەست + گا > دەزگا

مس + گەر > مزگەر

ب ـ ش > ژ

هەشت + دە > هەژدە

پشت +دەر > پژدەر

## ـ وێکچواندنی هەندەکی پێچەوانە

= بەرەو دواوە

وێکچواندنی هەندەکی پیچەوانە ئەوەیە قورسایی هەڵمەت لە کۆنسۆنانتی دواوە دەکەوێتە سەر هەڵمەتی کۆنسۆنانتی پێشەوەی . وەك :

هەشت + دە > هەژدە

پشت + دەر > پژدەر

## ـ وێکچواندنی هەندەکی ڕاستەوخۆ

= بەرەو پێشەوە

وێکچواندنی هەندەکی ڕاستەوخۆ ئەوەیە قورسایی هەڵمەت لە کۆنسۆنانتی پێشەوە بۆ کشانەوەی ئەو کۆنسۆنانتەی بە دوایدا دێ ڕوودەدات . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا نیشانەی ( s )ی بەدوا دەنگی ئاوازەداردا ، وەك (z) دەوترێ

readz < reads, Hands < Handz

## ـ هـ ـ

| | | |
|---|---|---|
| هاوبێژ | مشترك اللفظي | Homonym |
| هاوپێوەندی | الارتباط | Correlation |
| هاودەنگی | الترابط | Correspondence |
| هاوڕێژە | متبادل العلاقة | Correlative |
| هاونشینی | | Syntagmatic |

بـ: ڕێزمانی بناغەگر

•

| | | |
|---|---|---|
| هاوتایی | التعادل | Synonymic , Synonymous |
| هاوواتایی | المرادف | Synonym |

**Rise , Paising** | **الرفع** | **هەڵبڕین**

هەڵبڕین ـ بە ڕادەی بەرز و نزمیی زمان لە دروستبوونی دەنگێکی دیاریکراودا دەوترێ . سێ ڕادەی هەڵبڕین جیاکراوەتەوە : سەروو ؛ ناوەڕاست ؛ خواروو . بە بزوێنی ڕادەی هەڵبڕینی سەروو دەوترێ تەنگ ؛ ڕادەی دەربڕینی مامناوەند ـ ناوەڕاست ؛ ڕادەی هەڵبڕینی خواروو ـ فراوان . بە باری لێو بزوێن دابەش دەبێ بەسەر لێوەکی و نالێوەکیدا .

ـ هەڵبڕینی خواروو — **Low rise**

ـ هەڵبڕینی سەروو — **High rise**

ـ هەڵبڕینی ناوەڕاست — **Midle rise**

**Sublimation** | **الاعلاء** | **هەڵکشان**

**On – glide , Attack** | **الانزلاقي البدئي** | **هەڵمەت**

هەڵمەتی وتن پێکهاتووە لەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتن لە دۆخی هێوەرییەوە ، یان پێش وتنی دەنگەوە دێنە باری پێویستی دەربڕینی دەنگ . بەوێنە هەڵمەتی وتنی دەنگی (ت) لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە ، کە دەنگەژێکان دەبزوێن و خاودەبنەوە ؛ پەردەی ئاسمانەی دەم هەڵدەبڕێ و بە کۆتایی پشتی گەرووەوە دەنووسێ ؛ سەری زمانیش بۆ لای ددانەکانی سەرەوە دەچێ .

| | | |
|---|---|---|
| هەڵێنجان | الأستنباط | Deduction |
| هەمەکی | الكلي | General , Universal |
| هەندەکی | الجزئي | Partial |
| هەندەکیەتی | الجزئية | |
| هەناسەدان | التنفس | Breathing |
| هەناسەدانەوە | الزفير | Expiration |
| هەناسەکێشان | الشهيق | Inspiration , inhalation |

هەناسەبەربوون انطلاق النفس ( عند انتاج الصوت الانفجارى )
Aspiration

بە لێخشاندنی هەوا لە دەنگەژێکان ، کە درزی ڕێڕەوی پێ تەسک دەبێتەوە دەوترێ ( aspiration ) .

| | | |
|---|---|---|
| هۆش | الذهن ، العقل | Mind |
| هۆشەکی | الذهني ، العقلي | Mental |

**Belongingness** **الانتماء** **هۆگری**

**Hertz , Hz** **الهرتز** **هێرز**

هێرز ( Hz ) : بە دانەی لەرەی دەنگ دەوترێ . یەك لەرە لە چرکەیەکدا . (هێرز)یش ناوی ئەو پسپۆرە ئەڵەمانی‌یەی فیزیایە ، کە ئەو تێوری‌یەی ئەنجام داوە .

دەنگەکانی ئاخاوتن لە سروشتی فیزیاوی‌یاندا بریتیین لە لەراندنەوە و بزواندنی هەوای دەوروبەر لەلایەن ڕشتەی ئاخاوتنەوە . بەڵام دەنگەکانی ئاخاوتن بە ڕشتەی بیستنەوە ، چونکە بە هۆیەوە ئەوە وەردەگیرێ ، کە ڕشتەی ئاخاوتن دەیهێنێتە بەرهەم . گوێی ئادەمیزاد توانستی ئەوەی هەیە لەرەی دەنگ لە سنووری ١٦ تا ٢٠٠٠٠ هێرزدا وەربگرێ . دەنگەژێکان لە چرکەیەکدا دەتوانن نزیکەی ٤٠ تا ١٧٠٠ لەرینەوە ئەنجام بدەن . لە تاقی‌کردنەوەی کێشی دەنگی مرۆدا ، ئەوەش دەرکەوتووە : لە٨٠ هێرزەوە ( نزمترین ئاوازی دەنگی گڕ ) تا ١٣٠٠ ( بەرزترین ئاوزای دەنگی ناسك ) دەڕوات ؛ لە ئاخاوتندا کێشی دەنگی مامناوەندی لای پیاو ٨٥ ــ ٢٠٠ هێرزە و لای ژنیش ١٦٠ ــ ٣٢٠ هێرز . کەواتە مرۆ سەرجەمی توانستی دەنگیی خۆی بەکارنەهێناوە و تەنانەت ئەو دەنگانەش ، کە دەتوانێ بیانهێنێتە بەرهەم و وەریشیان گرێ بەتەواوی بەجێی نەگەیاندوون .

**Stress** **النبرة** **هێز**

هێز بە دەرخستنی دەنگێك ، یان بڕگەیێك ، یان وشەیێك دەوترێ ، کە لە ڕێگەی تین‌دان بە گرژبوونی ماسوولکە و تەوژمی لوورەوی هەواوە ، یان گۆڕینی ڕادەی بەرزیی دەنگەوە ئەنجام دەدرێ . بەپێی بابەتِ دەرخستنی هێز دەشێ بڕگەیی ، وشەیی ، ڕستەیی بێت . بەپێی خاسیەتی بیستن و

وتنیش هێزی یەك ئاواز . ( Monotonic srtess ) و هێزی فرەئاواز ـ ( polytonic srtess ) جیادەکرێنەوە .

هێز بە شێوەیێکی پتەو بەندە بە وشەوە و بریتی‌یە لە خاسیەتی هێزی وشە بە دەرخستنی یەکێك لە بڕگەکان و دەستەڵاتی بەسەر گشت ئەوانی دی بێ‌هێزدا دەوترێ . بڕگەی هێزدار دەتوانێ بە تین و درێژی و چونیەتی بزوێن لە بڕگەی بێ‌هێز جیابێتەوە . لە وشەی فرەبڕگەییدا ، بەتایبەتی لە دوو بنەمایی‌دا ، لەتەك هێزی سەرەکی‌دا ، هێزی ناسەرەکیش پەیدا دەبێ ، کە دەشێ هێزی دووەمی پێ بوترێ . لە وشەی ناسادەی زمانی ڕووسیدا ، هێز دەکەوێتە سەر دووەم یان دوا بنەما ، بەلام لە زمانی ئەڵەمانیدا بە پێچەوانەوە دەکەوێتە سەر یەکەم بنەما .

بەپێی شوێنی هێز لە وشەدا دەشێ هێزی هەمیشەیی ( بەند ) و هێزی بەرەڵلا جیابکرێتەوە . هێزی هەمیشەیی بۆ گشت وشەکانی زمان جێ‌گیرە . بەوێنە لە زمانی چیکی و لیتوانی و هەنگاری‌دا لەسەر یەکەم بڕگە دەپارێزرێ . لە زمانی فەرەنسی و زوربەی زمانە تۆرانی‌یەکاندا دوا بڕگە وەری دەگرێ . لە زمانی پۆلۆنیدا هەمیشە دەکەوێتە سەر بڕگەی پێش کۆتایی .

لە باری هێزی بەرەڵلادا هەندێ وشەی چەسپیو هێزی جێگیریان هەیە ، بەلام بەگشتی هێز جێ‌گۆڕکێ دەکات و بزێو خۆی دەنوێنێ و هەر لەبەر ئەوەشە بەهێزی بەرەڵلا ناودەبرێ . ئەم جۆرە هێزە هەندێ جار بە شێوەی فۆنێم دەوری گۆڕینی واتا و فۆرمی وشە دەبینێ .

زمانی ڕووسی خاوەنی هێزی بەرەڵلایە . هێز لەم زمانەدا دەشێ بکەوێتە سەر بڕگەی یەکەم ، یان دووەم ، یان سێ‌یەم ، یان کۆتایی ، یان پێش کۆتایی ... ئەو وشە چەسپیوانەش کە لە مێژەوە هێزی جێگیریان لەسەر جێگیربووە ، گەلێ جار تەنانەت لە گۆڕینیشیاندا هێز لە شوێنی خۆی نابزوێ .

لـه زمـانی ڕووسـیدا لەتـەك هـێزی جێگـیردا ، وشـەش هەیـە لـەباری وشەڕۆنان ، یان گەردان ، یان گۆڕاندا هێز دەبزوێ و شوێنی خۆی دەگۆڕێ .

هێز لە زمانی کوردیدا بە زۆری دەکەوێتـە سـەر دوابڕگـەی وشـە ... لـە هەندێ حاڵەتدا وا ڕوودەدات ، هێز لە یەك وشەدا شوێنی لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیێکی دیکە دەگوێزرێتەوە بێ‌ئەوەی کار بکاتە سەر مانای وشەکە . بەڵام هەندێ جاریش لە گواستنەوەی هێزدا مانای جیاواز پەیدادەبێ .

بەوێنە وشـەی ((سـەوزە)) ئەگـەر هێز لەسـەر دوا دەنگـی دابـنرێ ، ئـەوە ماناکەی (( هەموو جۆرە شینایێك دەگرێتـەوە کە ڕوابی )) . خۆ ئەگـەر هـێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بە مانای (( ڕەنگی سەوز )) دێت . وەك بووترێ (( ئەو مەرەکەبە سەوزە .. )) . وشەی (( تەختە )) ئەگەر هێز لەسـەر دوادەنگی دابنرێ ، ئەوە ماناکـەی ( لوح)ی عـەرەبی دەگرێتـەوە . خۆ ئەگـەر هێز بخرێتە سـەر دەنگـی دووەمـی ، ئەوسا بـەمانای ( انـە مسـتو او عـدل )ی عەرەبی دێت . بێ‌گومان هەردوو وشەی (( سەوزە)) و (( تەختە)) لـە حاڵـەتی دووەمدا هـەر بە ڕواڵـەت وشـەن ، دەنـا هـەردوویان ڕستەی تـەواون . بەمـەدا دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە لە زمانی کوردیدا دەوری واتـاگۆڕیـی هـێز لەگـەڵ هـەندێ زمـاندا دوور دەکەوێتـەوە . ئـەو دوور کەوتنەوەیـەش ، ئەوەیـە کـە گواستنەوەی هێز لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگـەیێکی دی بە زۆری وشـەکە دەکاتـە ڕستە و هەمان وشە نامێنێت .

بەم جۆرە دەبینین ، کە لێرەدا گواستنـەوەی هێز دەبێتـە هـۆی پـەیدابوونی مانای جیاواز . بەڵام واش ڕوودەدات ، کە گواستنەوەی هێز کار ناکاتە سـەر گۆڕینـی مانـا . بەنموونـە ، وشـەی (( پـەردە)) ــ هەرچـەند لـە ڕەسـەندا هـێز بەسەر دوادەنگەوەیە . بەڵام ئەگەر لەسەر بزوێنی یەکەمین دابـنرێ مانا هـەر نـاگۆڕێ . لـە وشـەی (( دارا ))دا هـێز لەسـەر بزوێنـی یەکـەم یـاخود دووەم دابنرێ مانای وشەکە ناگۆڕێت ... هتد .

هەر زمانێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە بگرین ، دەبینین کە خاوەنی چەندین تایبەتێتی ئەوتۆیە ، کە لە زمانەکانی دیکەی جودادەکاتەوە ، یاخود ڕوی وای هەیە نزیکی دەخاتەوە . خۆ ئەگەر لە زمانی کوردیدا لە هێز وردببینەوە و لەگەڵ چەند زمانێکدا بەراوردی بکەین ، ئەوە هەندێ ڕاستیمان بۆ ئاشکرا دەبێ . بەوێنە هێز لە زمانی کوردیدا وەك گەلێ زمانی دیکەی سەر ڕووی ئەم زەمینە ، دەخرێتە سەر بزوێن ، دەکرێ لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیێکی دی بگوێزرێتەوە ؛ دەتوانێ دەوری واتاگۆڕی ببینێ ... هەر بەو چەشنە لە زمانی فارسی و ئینگلیزی و ڕووسی و ئیتالیایی ... دا کار دەکات .

<u>هێزی ڕستەیی</u> یان <u>ژێربێژی</u> بە ناوەڕۆك لە هێزی بڕگەیی و وشەیی جیادەبێتەوە . هێزی ڕستەیی ئەرکی دەنگسازی و واتایی ـ ڕستەیی بەجێدێنێ و وشە لە وتە و ڕستەدا بەیەکەوە دەبەستێ . هێزی ژێربێژی ( واتایی ) لە دابەش کردنی چالاکانەی ڕستەدا ، وشە و گوتە دەردەخا . هێزی ڕستەیی بە ئاوازەوە بەندە و دەبێتە بەشێکی .

گەلێك جار ، وا ڕێدەکەوێ کە هێزی ڕستە ، یەك ڕستە بە چەند مانایێکی جیاواز دەردەبڕێ ( لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بەگوێرەی دەنگەکان و هێزی وشە وەك یەکن و جیاوازییان لە نێواندا نییە ) . بەوێنە لە ڕستەی پرسی ـ (( مامم هات ؟ ))دا ، ئەگەر هێزی ڕستە بەسەر وشەی (( مام )ەوە بێت ، ئەوە پرسیاری کەسێك نیشان دەدا . بەڵام ئەگەر هێزی ڕستە لەسەر وشەی (( هات )) دابنرێ ، ئەو کاتە هەواڵی ڕووداوێك یاخود کارێك دەپرسێ .

**ـ هێزی بەند　　　　النبر المقيد**

**Bound stress , Restricted stress**

- هێزی بەرەڵڵا          النبر الحر

Free stress Movable stress

- هێزی چەسپیو

ب . : هێزی هەمیشەیی

- هێزی دووەم          النبر الثانوي          Secondary stress

= هێزی ناسەرەکی

- هێزی ڕستە          النبر الجملة          Phrasal stress

- هێزی سەرەکی          النبر الرئيسي          Primary stress

- هێزی فرەئاواز          نبرة متعددة النغمات          Polytonic stress

هێزی فرەئاواز خاسیەتی گۆڕینی بەرزیی ئاواز و سازی مۆسیقی‌یە . هێزی فرەئاواز لە زمانی یۆنانیی کۆن و هیندیی کۆندا هەبووە و لە زمانی سێرب و کەروات ، لاتینی ، چینی ، ڤێتنامی ، ژاپۆنی و ژمارەیێکی دی زۆری زمانەکانی ئاسیا و ئەفەریقاشدا هەیە . بۆ نموونە لە زمانی چینی‌دا بەشێکی زۆری وشەی یەك‌بنجی بە بزووتنەوەی ئاوازی برگەیی جیادەبنەوە . وەك :

ما - بە ئاوازی ڕێك ، واتای (دایك) دەگەیەنێ

ما - ئاوازی هەڵکشاو - ( ناوی ڕووەکێکە)

ما - بە ئاوازی داکشاو - (سەرزەنشت )

ما - بە ئاوازی داکشاو - هەڵکشاو - (ئەسپ )

- هێزی ناسەرەکی

بـ . : هێزی دووەم

- هێزی وشە　　نبرة الكلمة　　Word stress

- هێزی هەمیشەیی　　النبر الثابت

Fixed stress (or accent )

- هێزی یەكئاواز　　نبرة ذات النغمة الواحدة

Monotonic stress

هێزی یەكئاواز لەگەڵ ئەوەی خاوەنی خاسیەتی یەکێتی بەرزییە ، خاوەنی گۆڕین و تین و درێژیی دەنگیشە . هێزی یەكئاواز وەك شتێکی عادەتی لە هەموو زمانێکدا توانستی شێوەگۆڕیی دانەی بنەڕەتیی ئاوازی زۆر نییە . هێزی یەكئاواز دەلویٚ تیندار ، یان چەندێتی بیٚ . زەبری لووزەوی هەوا بڕگە لە هێزی تینداردا جیادەکاتەوە . درێژیش هێزی چەندێتی دیاری دەکا . گەلیٚ جار خاسیەتی تینداری و چەندێتی لەگەڵ یەکدی ڕیٚ دەکەون . بەوێنە لە زمانی ڕووسیدا بڕگەی هێزدار جیاوازی لەگەڵ بڕگەی بیٚهێزدا تەنیا لە تاووتیندا نییە ، بەڵکو لە درێژیشدایە . لەم ڕووەوە سەرنجڕاکیش ئەوەیە ، هەڵگرانی ئەو زمانانەی بزوێنی درێژ و دیفتۆنگیان هەیە ، وا هەست بە هێزی ڕووسی دەکەن ، کە درێژی بیٚ . بەوێنە یاکووتەکان هێزی ڕووسییان بە درێژی بزۆین وەرگرتووە و بزوێنی هێزداریان بە بزوێنی درێژ یان بە دیفتۆنگ گۆڕیوە : لامپە : لامپە ( چرا ، گلۆپ ) .

## ـ هیرۆگلیف          الهیروغلیف          Hieroglyphoi

هیرۆگلیف له وشەی ( Hieroglyphoi )ی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، کە بە واتای ( نووسینە پیرۆزەکان ) دێت . دەقی تەواویشی (نەقشی ڕەبەنەکان)ە . بۆیەش بە (نەقشی ڕەبەنەکان) ناونراوە ، چونکە ڕەبەنەکان :
١ ـ نەیاندەنووسی ، بەڵکو لەسەر ئێسقان و شتی دی نەقشیان دەکرد ؛
٢ ـ ئەوان نهێنییەکانی نووسینی هیرۆگلیفیان دەزانی .

پێشکەوتنی تەکنیکی نووسین ـ واتە دۆزینەوەی کەرەستەی لەبارتری لەسەر نووسین و ئامرازی نووسین ـ بووە هۆی ئەوەی لەبریتی بەرد و پارچەدار و توێکڵەدار ، ئامرازی تایبەتی بەکاربهێنرێ . لە میسر لە قامیش تەبەقی گەورەی لوولکراویان هێنایە بەرهەم ؛ لە وڵاتانی تر پێستی هەمەچەشنەیان خۆشدەکرد ؛ سەرئەنجامیش لە چین ، کاغەز دروست کرا . لە بریتی ئامرازی نەقش و نەقاڕی ، ئامرازی نووسین پەیدا بوو و توانرا بە مەرەکەبی چینی و بە فڵچە زۆر خێراتر نیگاری نیشانەکان بکێشرێن .

نووسینی هیرۆگلیفی لەوەدا لەبارە کە نیشانەکانی دەتوانن بە ڕوخساریش و ناوەرۆکیش نیشان بپێکن . ئاشکرایە بۆ ئەوەی شت بنووسرێ و بخوێنرێتەوە ، پێویست بە کۆمەڵێك نیشانەی دیاریکراو هەیە و ئەمە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی مەسەلەی ئەلفوبێ . بەڵام نیشانەکانی هیرۆگلیفی ناتوانن بە باشی ئەم ئەرکە بەجێبێنن ، چونکە هێندە زۆرن لەبیرنەکردنیان زەحمەتە .

هەرچەندە نیشانەکانی نووسینی هیرۆگلیف وشە لە ڕووی فۆنەتیك و ڕێزمانەوە سازناکەن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو جۆرە نووسینێکی هیرۆگلیفیدا ، ڕیشەی نیشانەی دەنگ هەیە ، جا بۆیە لە لێکدانەوەی نووسینی ئەو دەمەدا مەینەتێکی نوێ پەیدا دەبێ ، چونکە هەر ئەو نیگارە ئیدیۆگرافییە لە هەمان کاتدا دیاردەیەکی فۆنەتیکیش ( بڕگە ؛ دەنگ ) نیشان دەدات .

| | | |
|---|---|---|
| Permanent , Permanently | القطعي | یەکجارەکی |
| Equality , Uniformity | التساوي | یەکسانی |
| Directly | المباشر | یەکسەر |

## ـأـ

الابجدية

انظر : الالفباء

| | | |
|---|---|---|
| الابدال ١٥٨ | دەنگەگۆڕكی | Replacement |
| ١ـ الاتجاه ٦٩ | بەریان | Direction |
| ـ اتجاه النمو ٦٩ | بەریانی فراژۆبوون | Developmental direction |
| ٢ـ اتجاه ، مسار ٢٠٠ | ڕێڕەو | Tendency |
| الاتيمولوجيا (علم اصل الكلمة وتاريخها) ٦٧ | ئێتیمۆلۆژی | Etymology |
| الاثبات ، المثبت ٥٨ | ئەریێ | Affirmative |
| احادي النغمة ١٦ | ئاوازی یەكئاواز | Momotonic |
| الاحتمال ٢٦٠ | شیمانە | Probability |
| الاداة ١٢ | ئامراز | Particles |
| اداة التعجب ١٣ | ئامرازی سەرسوڕمان | Interjection particles |

- اداة التمني والدعاء ١٢ ئامرازى ئاوات‌خواستن Subjunctive particles

- اداة التنبية ١٤ ئامرازى ورياكردنه‌وه Hortatory particles

- اداة العطف ، ادوات الوصل / الربط ١٣ ئامرازى پێوه‌ندى
Conjunction particles

- اداة النداء ١٢ ئامرازى بانگهێشتن Vocative particles

- ادوات الربط

انظر : اداة العطف

- ادوات الوصل

انظر : اداة العطف

ادغام حرف علة ، الصائت المركب ١٦٥ ديفتۆنگ ، بزوێنى دوولانه
Diphthong

الارداة ١٥٥ خواز Volition

الاردای ١٥٥ خوازه‌كى Voluntary

١ـ الارتباط ١٠٧ پێوه‌ندى ، په‌يوه‌ندى Communication

٢ـ الارتباط ٤٠٩ هاوپێوه‌ندى Correlation

ارتفاع

انظر : علو

| | | |
|---|---|---|
| ١ـ اساس ٧٧ | بنەما | **Stem** |
| ـ اساس الفعل ٧٧ | بنەمای کردار | **Verbal stem** |

٢ـ اساس

انظر : البنية التحتية

| | | |
|---|---|---|
| الاستنباط ٤١١ | هەڵێنجان | **Deduction** |

اسل اللسان ، مقدمة اللسان ٢٥٧ سەری زمان

**Front of tongue , Tip of the tongue**

| | | |
|---|---|---|
| الاسلوب ٢٥٩ | شێواز | **Style** |
| الاسلي ٢٤٤ | زووانەکی | **Lingual** |
| الاسم ٣٥١ | ناو | **Noun** |
| ـ اسم الالة ٣٥١ | ناوی ئامێر | **Instrument** |
| ـ الاسم البسيط ٣٥٨ | ناوی سادە | **Simple noun** |
| ـ الاسم الجمعي ٣٦٠ | ناوی کۆمەڵ | **Collective noun** |
| ـ الاسم الخاص ، اسم علم ٣٥٤ | ناوی تایبەتی | **Proper noun** |
| ـ الاسم العام ٣٦٠ | ناوی گشتی | **Common noun** |

ـ اسم علم

انظر : الاسم الخاص

| | | |
|---|---|---|
| ـ اسم الفاعل ٣٥٨ | ناوی کارا ، ناوی بکەر | Participle |
| ـ الاسم المادي ٣٦٢ | ناوی مادی | Material noun |
| ـ الاسم المحايد ٣٥٤ | ناوی بێلایەن | Neuter noun |
| ـ الاسم المذكر ٣٦٥ | ناوی نێر | Masculine gender |
| ـ الاسم المركب ٣٦١ | ناوی لێکدراو | Compound noun |
| ـ الاسم المشترك ٣٥٧ | ناوی دوولایەن | Common noun |
| ـ الاسم المشتق ٣٥٦ | ناوی داڕێژراو | Derivational noun |
| ـ اسم المصدر ٣٥٥ | ناوی چاوگ | Action noun |
| ـ الاسم المعنوي ٣٦٣ | ناوی مەعنەوی ، ناوی واتا | Abstract noun |
| ـ الاسم المعنوي ٣٦٥ | ناوی واتا | Abstract noun |
| ـ اسم المفعول ٣٥٢ | ناوی بەرکار | Participle |
| ـ اسم المكان ٣٥٤ | ناوی جێگا | Locative |

| | | |
|---|---|---|
| Feminine gender | ناوی مێ | ـ الاسم المؤنث ٣٦٤ |
| Teeth | ددان | ـ الاسنان ١٦٠ |
| Lower teeth | ددانی ژێرین | ـ الاسنان السفلى ١٦٠ |
| Upper teeth | ددانی بانین | ـ الاسنان العليا ١٦٠ |
| Derivation | دارشتن | الاشتقاق ١٥٦ |

الاصوات المدغمة الصاعدة ١٦٧ ديفتۆنگی هەڵکشاو
Rising diphthong

الاصوات المدغمة المنسحبة (المنبسطة) ١٦٧ ديفتۆنگی داکشاو
Outgoing diphthong

الاصوات المدغمة المنبسطة
انظر : الاصوات المدغمة المنسحبة

| | | |
|---|---|---|
| Hushing sound | فيشكەيی | الاصوات المكتومة ٢٨٦ |
| Izafet , Postpositional attributive group | ئيزافە | الأضافة ٦٧ |
| Antonym | دژواتا | الاضداد ١٦١ |
| Antonym | وشەی دژواتا | الاضداد ٣٩٥ |

| English | Kurdish | Arabic |
|---|---|---|
| Velarization | دەمنووقاندن | الاطباق ١٥٧ |
| | | الاعتقاد<br>انظر : العقيدة |
| Additive numeral | ژمارەی پێکەوەبەستراو | الاعداد المترابطة ٢٥١ |
| Organs of respiration (breahing) | ئەندامەکانی ئاخاوتن | اعضاء التنفس ٦٥ |
| Organs of speech | ئەندامەکانی ئاخاوتن | اعضاء النطق ٦٤ |
| Sublimation | هەڵکشان | الاعلاء |
| Assumptions | گریمانە | الافتراضات ٣٢٨ |
| Verb to - be | کرداری بوون | افعال الكينونة ٣٠١ |
| Horizontol | ئاسۆیی | الافقي ١١ |
| Coupling | جووتهاتن | الاقتران ١٢٥ |
| Parts of speech | بەشەکانی ئاخاوتن | اقسام الكلام ٧٠ |
| Alphabet | ئەلفوبێ | الألفباء ، الأبجدية ٦٠ |
| Daktylos | ئەلفوبێی دەستی | الالفبائية اليدوية ٦٠ |

الألفون ، نمط الفونيم (عضو الوحدة الصوتية) ٥٩ ئەلەفۆن ، شێوەی فۆنێم
Allophone

الالومورف (عضو الوحدة الصرفية) ٦١ ئەلۆمۆرف Allomorph

الآلية ١٤ ئامێرایەتی Mechanism

الامر ٢٦٠ فەرمان Imperative

الامكانية

انظر : القدرة

الاملاء ٢١٨ ڕێنووس Orthography

الانتماء ٤١٢ هۆگری Belongingness

انثروبولوجيا (علم المجتمعات البشرية) ٦٣ ئەنترۆپۆلۆژی
Anthropology

الانحراف

انظر : تغير

الانزلاق البدئي ٤١٠ هەلمەت On – glide , Attack

الانسان (بوصفه نوعاً بيولوجيا) ٣٤١ مرۆڤی هۆشیار
Homo sapiens

| | | |
|---|---|---|
| Off – glide , Withdrawal | کشانەوە | الانسحاب ، التراجع ٣١٠ |
| Enclitic , Syneclitic | بەرگر | الانطوائي ، يطوق ، يحبس ٦٩ |
| Reflex | تەکدانەوە | الانعكاس ١١٠ |
| Nose | لووت | الانف ٢٣٤ |
| Affricate | نیمچەکۆسپەك | الانفجاري الاحتكاكي ٣٩٠ |
| Vocal gords | دەنگەژێ | الاوتار الصوتية ١٥٨ |
| Vibrant | لەرزۆك | الاهتزازي ٣٢٣ |
| Ideography | نووسینی بیر | الايدوگرافي (الكتابة الرامزة للفكرة) ٣٧٢ |
| Breath group , Rhythm | تریە | الايقاع ١١٢ |

- ب -

البحث

انظر : التحليل

| | | |
|---|---|---|
| Stylistics | ڕەوانبێژی | البلاغة ١٧٢ |

بناء الكلمة ٤٠٣ وشەرۆنان Word - formation

البنية ، التركيب ١٩٩ رۆنان Structure

ـ البنية التحتية ، اساس ٢٥٦ ژێرخان Basis

ـ البنية الخارجية / الظاهرية ١٩٩ رۆنانی دەرەوە
External structure

ـ البنية الداخلية / العميقة ١٩٩ رۆنانی ناوەوە
Internal (inner) structure

ـ البنية الظاهرية
انظر : البنية الخارجية

ـ البنية العميقة
انظر : البنية الداخلية

ـ البنية الفوقية ٢٥٦ سەرخان Superstructure

## ـ ت ـ

التبادل الوظيفي ٥٨ ئەرك‌گۆری Function change

تباين ٣٣٠ گۆرین Dissimilation

التجويف الانفي

انظر : الخيشوم

التجويف الفمي ٧٨ بۆشایی دەم Oral cavity

التحليل ٣٣٤ لێکدانەوە Analysis

التحليل ، البحث ٣٣٥ لێکۆڵینەوە Analysis

ـ التحليل المنطقي ٣٣٤ لێکدانەوەی ژیربێژەکی Logical analysis

التدوير للشفة (لفظ مصحوب باستدارة الشفتين) ٣٣٧ لێوخڕکردن
Labialization

الترابط ٤٠٩ هاودەنگی Correspondence

التراجع

انظر : الأنسحاب

التركيب ٣٢٤ لێکدان Composition , Compounding

التساوي ٤١٩ یەکسانی Equality , Uniformity

التصحيف ١١٣ تێچوونی دەنگ Metaplasm , Misspelling

تصريف ٣٢٧ گەردانکردن Cojugation , Inflection

| | | |
|---|---|---|
| Diminutive | بچووك كردنەوە | التصغير ٧٢ |
| Classification | پۆل كردن | التصنيف ١٠٣ |
| Think , Conaider | بۆچوون | التصور ٧٨ |
| Accordance , Conformity | پێكەڵبوون | التطابق ١٠٦ |

التطور
انظر : النمو

| | | |
|---|---|---|
| Synonymic , Synonymous | هاوتايی | التعادل ٤٠٩ |

تعدد المعاني
انظر : كثير المعاني

| | | |
|---|---|---|
| Definition | ناساندن | التعريف ٣٥١ |
| Variation | شێوەگۆڕی | تغير ، الانحراف ٢٥٩ |
| Peation | ئاوێتەبوون | التفاعل ٥٥ |
| Optimist | گەش بينايەتی | التفائل ٣٢٧ |
| Differentiation | ترازان | التفكك ١١٢ |
| Imitation | چاولێكەری | التقليد ١٥١ |

| | | |
|---|---|---|
| Integration | ڕەخسین | التكامل ١٦٩ |
| Adaptation | سازان | التكيف ٢٥٦ |
| Pronunciation | تەلەفوزکردن ، دەربڕین ، گۆکردن | التلفظ ١١١ |
| Equalization | وێکچواندنی هەمەکی ، وێکچواندنی تەواو | التماثل الكامل ٤٠٥ |
| Possessive | خاوەنێتی | التملك ، الملكي ١٥٥ |
| Contradiction | نەسازی | التناقض ٣٦٨ |
| Breathing | هەناسەدان | التنفس ٤١١ |
| Alternation , Gradation | جێگرتنەوە | تناوب ١٢٦ |
| Variation | خۆگۆڕ | تنوع ١٥٦ |
| Adjustment | گونجان | التوافق ٣٢٩ |
| Intergration | نزیك كەوتنەوە | توحيد ، عملية التكامل ٣٦٩ |
| Adjust | گونجاندن | التوفيق ٣٣٠ |
| Pause · | وەستان | توقف ١٥ |

| | | |
|---|---|---|
| Pause | وەستان | توقف ٣٩٢ |
| Jet , Spurt , Spirt , Stream | لووزەو | التيار ٣٢٣ |

## ـ ث ـ

| | | |
|---|---|---|
| Dualism | دوولاگرایەتی | الثنوية ١٦٤ |

## ـ ج ـ

| | | |
|---|---|---|
| Collector , Gather | کۆکەرەوە | الجامع ٣١٣ |
| Lateral | لاوەکی | جانبي ٣٢١ |
| Root | ڕەگ | جذر ١٧٠ |
| Roots of verb | ڕەگی کردار | ـ جذر الفعل ١٧٠ |
| Timber | زەنگ | الجرس ١٥ |

الجرس ٢٢٢ — زەنگ — Timber

جزء

انظر : قطعة

الجزئي ٤١١ — هەندەكی — Partial

الجسم ١١١ — تەن — Figure , Body

الجمجمة ٢٩٨ — كاسەی سەر ، كەللەسەر — Skull , Cranium

الجمع ٣١٠ — كۆ — Plural

الجملة ١٧٣ — ڕستە — Sentence

- الجملة الاخبارية ١٩٣ — ڕستەی هەواڵگەیاندن — Indicative sentence

- الجملة الاستفهامية ١٧٨ — ڕستەی پرسكردن — Interrogative sentence

- الجملة الامرية ١٨٨ — ڕستەی فەرماندان — Imperative sentence

- الجملة البسيطة ١٨١ — ڕستەی سادە — Simple sentence

- الجملة التابعة ١٨٥ — ڕستەی شوێنكەوتوو — Subordinate clause

- الجملة التابعة الاضطرارية ١٨٦ — ڕستەی شوێنكەوتووی پێچەوانە — Subordinate emepgent

| English | Kurdish | Arabic |
| --- | --- | --- |
| Matrix sentence | ڕستەی سەرەکی | ـ الجملة الرئيسية ١٨٣ |
| Positive sentence | ڕستەی ئەرێ | ـ الجملة المثبتة ١٧٧ |
| Compound sentence | ڕستەی لێکدراو | ـ الجملة المركبة ١٩٠ |
| Composite sentence | ڕستەی ئاوێتە | ـ الجملة المعقدة ١٧٦ |
| Negative sentence | ڕستەی نەرێ | ـ الجملة المنفية ١٩٢ |
| Gender | جنس ، توخم | الجنس ١١٦ |
| Natural gender | جنسی سروشتی | ـ الجنس الطبيعي ١٢٣ |
| Grammatical gender | جنسی ڕێزمانی | ـ الجنس النحوي ١٢٠ |
| | | الجوهر |
| | | انظر : اللب |
| Organ | ڕشتە | الجهاز ١٩٧ |
| Organ of windpipe | ڕشتەی هەناسە | ـ الجهاز التنفسي ١٩٩ |
| Vocal apparatus | ڕشتەی دەنگ | ـ جهاز الصوت ١٩٨ |
| Organ of speech | ڕشتەی ئاخاوتن | ـ الجهاز النطق ١٩٧ |

| | | |
|---|---|---|
| Edg of tungue | لێواری زمان | حافة اللسان ٣٣٦ |
| Case | دۆخ | الحالة ١٦١ |
| | | حالة التمني<br>انظر : الطلب |
| Aphasia | دەنگبڕان | الحبسة ١٦٠ |
| Diaphragm | ناوپنچك | الحجاب الحاجز ٣٦٦ |
| Action | ڕووداان | حدث ١٩٩ |
| Intuition | بەهرە | الحدس ٧٢ |
| Intuitional | بەهرەکی | الحدسي ٧٢ |
| Letter | پیت | الحرف ١٠٧ |
| Preposition | پێشبەند | حرف الجر ١٠٤ |
| Vowel | بزوێن | حرف العلة ، الصوت الصائت ٧٥ |

| | | |
|---|---|---|
| Short vowel | بزوێنی کورت | الحركة ٧٧ |
| Consonants | کۆنسۆنانت | الحروف الصحيحة ، الصوت الصامت ٣١٩ |
| Throat | ئەوك | الحلق ، الحنجرة ٦٦ |

الحنجرة

انظر : الحلق

| | | |
|---|---|---|
| Palate | ئاسمانه | الحنك ، سقف الفم ١١ |
| Palate | مەلأشوو | الحنك ٣٣٩ |
| Soft palatal | نەرمەئاسمانه | ـ الحنك الرخو ٣٦٧ |
| Hard palate | ڕەقەمەلأشوو | ـ الحنك الصلب ١٦٩ |
| Hard palate | ڕەقەمەلأشوو | ـ الحنك الصلب ٣٣٩ |
| Soft palate | نەرمەمەلأشوو | ـ الحنك اللين ٣٣٩ |
| Soft palate | نەرمەمەلأشوو | ـ الحنك اللين ٣٦٧ |
| Palatal | مەلأشوويی | الحنكي ٣٣٩ |
| Barriers | لەمپەر | الحواجز ، العوائق ٣٢٣ |

- ح -

| | | |
|---|---|---|
| الخارجي ١٥٦ | دەرەکی | Outsider , Stranger |
| الخاصة ، الخصوصي ١٠٨ | تایبەتی | Special |
| الخبر ، المسند ٣٢٨ | گوزارە | Predicate |

الخصوصي
انظر : الخاصة

| | | |
|---|---|---|
| خليط ٥٤ | ئاوێتە | Mixed |
| الخيشوم ( التجويف الانفي ) ٧٩ | بۆشایی لووت ، کونەلووت | Nasal cavity |

- د -

| | | |
|---|---|---|
| الداخلة ، الواسطة ٣٦٦ | ناوگر | Infix |
| الداخلي ٣٦٥ | ناوەکی | Inside , Interior |
| دراسة الملامح ٢٦٠ | شێوەناسی | Physiognony |

**ـ ذ ـ**

| | | |
|---|---|---|
| Noisy | گڤۆك | ذو جلبة ٣٢٨ |
| Noisy consonant | كۆنسۆنانتی گڤۆك | ذو جلبة ٣٢٤ |
| Mind | هۆش | الذهن ، العقل ٤١١ |
| Mental | هۆشەكی | الذهني ، العقلي ٤١١ |

## - ر -

| | | |
|---|---|---|
| The lung | سی | الرئة ٢٥٧ |
| Conective , Relation | پێبەست | الرابطة ١٠٣ |
| Oscillograph | لەرەنووس | راسم الذبذبات ٣٣٣ |
| Resonator | لەرەساز | الران (مسبب الرنين) ٣٣٣ |
| Reaction formation | بەرتەك | رد فعل ٦٨ |
| Reaction | دژەكردار | رد الفعل ١٦١ |
| Desire | ئارەزوو | الرغبة ١١ |

| | | |
|---|---|---|
| الرفع ٤١٠ | هەڵبڕین | Rise , Paising |
| الرمز ١٠٦ | پێوار | Symbol |
| الرمزية (مذهب) ١٠٧ | پێوارەتی | Symbolism |
| رنين ٣٣٣ | لەرینەوە | Resonance |

-ز-

| | | |
|---|---|---|
| الزفير ٤١١ | هەناسەدانەوە | Expiration |
| الزمن ٢٨٩ | كات | Tense |

- زمن الحال وزمن الاستقبال ٢٩٦ كاتی ڕانەبوردوو
Present and future tense

-س-

| | | |
|---|---|---|
| السابقة ١٠٦ | پێشگر | Prefix |
| السرعة ١٥ | خێرایی | Quickness |

| | | |
|---|---|---|
| السرعة ١٥٦ | خێرایی | Quickness |

سقف الفم
انظر : الحنك

| | | |
|---|---|---|
| سلسلة ٢٤٤ | زنجیره | Chain |

سمة
انظر : صفة

سمة
انظر : خلق

| | | |
|---|---|---|
| السمة ٣٨٨ | نیشانه | Trait |
| سمعي ٨٠ | بیستن | Acoustic |
| سمك القد ٣٢٠ | کۆنسۆنانتی پۆپەیی | Cocominal consonant |
| السنخي ١٠٣ | پووکی | Alveolar |

سير
انظر : عملية

## ـ ش ـ

| العربية | الكردية | English |
|---|---|---|
| الشاذ ٨٠ | بيرۆك ، ڕيزپەڕ | Irregular |
| شبه الصائت<br>انظر : نصف الطليق | | |
| شخصي<br>انظر : فردي | | |
| الشدة ١١٥ | تين | Strenghth , Force |
| الشرطة ١٠٩ | تەقەڵ ( ـ ) | Hyphen |
| الشرطي ٣٣٩ | مەرجايەتی | Conditionalty |
| الشعبة ٧٨ | بۆريچە | Bronchial tubes |
| الشعور ، الوعي ١٢ | ئاگا | Consciousness |
| الشفة ٣٣٥ | لێو | Lip |
| ـ الشفة السفلى ٣٣٦ | لێوی خوارەوە | Lowerlip |
| ـ الشفة العليا ٣٣٦ | لێوی سەرەوە | Upperlip |

| | | |
|---|---|---|
| الشفتاني ٣٣٥ | ليّوه ـ ليّوهكى (هەردوو ليّو) | Bilabial |
| الشفوي ٣٣٥ | ليّوەكى | Labial |
| الشفوي ٢٢١ | زارەكى | Oral |
| الشفوي سني ٣٣٥ | ليّوه ـ ددانەكى | Labiodental |
| الشك ، الظن ٣٢٩ | گومان | Doubt |
| الشكل ٢٥٩ | شيّوه | Form |
| شكل ، قالب ٢٧٣ | فۆرم ، قاڵب | Form |
| الشمولية ٣٢٨ | گشتىيايەتى | Universalim |
| الشهيق ٤١١ | هەناسەكيّشان | Inspiration , Inhalation |

ـ ص ـ

| | | |
|---|---|---|
| الصائت الامامي ٧٦ | بزويّنەكانى ريزى پيّشەوه | Fornt vowel , Slender vowel |
| الصائت الخلفي ٧٦ | بزويّنەكانى ريزى پشتەوه | Broad vowel |

الصائت الخلفي ٧٦ بزوێنەكانی ڕیزی پشتەوە
Broad vowel , Deep vowel

الصائت الطويل

انظر : المد

الصائت العالي ٧٦ بزوێنەكانی سەروو High vowel

الصائت المتوسط ٧٦ بزوێنەكانی ڕیزی ناوەڕاست Abnormal vowel

الصائت المتوسط ٧٧ بزوێنەكانی ناوەڕاست Intermediate

الصائت المركب

انظر : ادغام حرف علة

الصائت المنخفض ٧٥ بزوێنەكانی خواروو Low vowel

الصامت الاحتكاكي ٣٢١ كۆنسۆنانتی خشۆك Fricative consonant

الصامت الانفجاري ٣٢١ كۆنسۆنانتی تەوژمۆك Plosive consonant

الصامت الانفجاري الاحتكاكي ٣٢٦ كۆنسۆنانتی نیمچەكۆسپەك
Affricate consonant

الصامت الاهتزازي ، الصامت المتذبذب ٣٢٤ كۆنسۆنانتی لەرزۆك
Vibrant consonant

الصامت بين الاسناني ٣٢٦ كۆنسۆنانتی نێوددانی
**Interdental consonant**

الصامت الحلقي ٣١٩ كۆنسۆنانتی ئەوكی **Glottal consonant**

الصامت الحنجري ٣٢٤ كۆنسۆنانتی گەروویی **Throat consonant**

الصامت الرنان ٣٢٢ كۆنسۆنانتی زرینگۆك **Resonant consonant**

الصامت الصفيري ٣٢٣ كۆنسۆنانتی فیکەیی
**Whistling (siblant) consonant**

الصامت الشفوي ٣٢٥ كۆنسۆنانتی لێوەکی **Labial consonant**

الصامت الشفوي / الشفتاني ٣٢٥ كۆنسۆنانتی لێوی / لێوەکی
**Bilabial consonant**

الصامت الشفوي سني ٣٢٥ كۆنسۆنانتی لێوە ـ ددانەکی
**Labia – Dental consonant**

الصامت الظهري ، الصامت القصي ٣٢٠ كۆنسۆنانتی پشتەکی
**Dorsal consonant**

الصامت القصي

انظر : الصامت الظهري

الصامت القممي ٣٢٥ كۆنسۆنانتی لوتکەیی **Aprical consonant**

الصامت اللساني ٣٢٣ كۆنسۆنانتی زوانەکی Lingual consonant

الصامت اللهوي ٣٢٢ كۆنسۆنانتی زمانەچكۆڵەيی Uvular consonant

•

الصامت المتذبذب

انظر : الصامت الاهتزازي

•

الصامت المعوق ٣٢٤ كۆنسۆنانتی كۆسپەك Obstruent consonant

الصامت المكتوم ٣٢٣ كۆنسۆنانتی فیشكەيی Hushing consonant

صامت مؤخرة اللسان ٣٢٠ كۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان
Dorsum consonant

الصامت الوسطي ٣٢١ كۆنسۆنانتی ڕیزی ناوەڕاستی زمان
Medial consonant

الصبر ١١ ئارام Petention

صريح ١١ ئاشكرا Indicative

١ـ صفة ، سمة ، خلق ١١ ئاكار Feature

٢ـ الصفة ، النعت ، مضاف اليه ١٦٥ دیارخەر
Attributive (adherent) adjunct , Attribute

•

٣ـ الصفة ٣٤ ئاوەڵناو Adjective

| | | |
|---|---|---|
| Simple adjective | ئاوەڵناوی سادە | ـ الصفة البسيطة ٤٥ |
| Derivational adjective | ئاوەڵناوی داڕێژراو | ـ الصفة المشتقة ٤٤ |
| Qualitative adjective | ئاوەڵناوی چۆنێتی | ـ الصفة الكيفية ٣٩ |
| Indefintite adjective | ئاوەڵناوی نادیار | ـ الصفة المبهمة ٤٧ |
| Compound adjective | ئاوەڵناوی لێکدراو | ـ الصفة المركبة ٤٦ |
| Relative adjective | ئاوەڵناوی نیسبی | ـ الصفة النسبية ٥٢ |
| Whisting (sibilant) | فیکەیی | الصفيري ٢٨٦ |
| Class | پۆل | صنف ١٠٢ |
| Palatal consonant | کۆنسۆنانتی ئاسمانە | الصوامت الحنكية ٣١٩ |

،

الصوامت الخافت

انظر : الصوامت المتنفسة

| | | |
|---|---|---|
| Voiced consonant | کۆنسۆنانتی ئاوازەدار | الصوامت الصائتة ٣١٩ |
| Breathed consonant | کۆنسۆنانتی کپ | الصوامت المتنفسة ، الصوامت الخافت ٣٢٣ |

الصوامت المزدوجة الثنائية ٣٢١ كۆنسۆنانتی دووتویٚ
Double consonant

الصوامت المسهلة (غير صارمة) ٣٢٦ کۆنسۆنانتی نەرم
Lax consonant

الصوامت الصارمة ٣٢١ کۆنسۆنانتی ڕەق Hard consonant

الصوامت غير صارمة
انظر : الصوامت المسهلة

الصوت ، الصوت اللغوي ١٥٧ دەنگ Phone

ـ الصوت الصائت
انظر : حرف العلة

ـ الصوت الصامت
انظر : الحروف الصحيحة

ـ الصوت اللغوي
انظر : الصوت

ـ الصوت الكمي ١٥٨ دەنگی چەندەکی Laut quantitaten

ـ الصوت الكيفي ١٥٨ دەنگی چۆنەکی Lautqualitaten

| Arabic | Kurdish | English |
|---|---|---|
| الصيغة ٢١٤ | ريْژه | Aspect (mood) , Derived from |
| ـ الصيغة الاخبارية ٢١٧ | ريْژەی ئيخباری | Indicative mood |
| ـ الصيغة الانشائية ٢١٧ | ريْژەی ئينشائی | Subjuctive mood , Thought - mood |
| ـ صيغة التمني<br>انظر : صيغة الطلب | | |
| ـ صيغة الطلب ، صيغة التمني ٢١٧ | ريْژەی داخوازی | Imperative mood |

ـ ض ـ

| Arabic | Kurdish | English |
|---|---|---|
| الضرورة ١٠٧ | پيْويستی | Necessity |
| الضغط ١١١ | تەوژم ، فشار | Pressure |
| الضمير ١٢٨ | جيْناو | Pronoun |
| ـ ضمير الاستفهام ١٣٢ | جيْناوی پرسيار | Interrogative pronoun |
| ـ ضمير الاشارة ١٤٣ | جيْناوی نيشانه | Demonstrative pronoun |

- ضمير التوكيد ١٢٧ جێناوی دیار Emphatic pronoun

- ضمير الشخصي المتصل ١٣٩ جێناوی کەسیی لکاو Enclitic pronoun

- ضمير الشخصي المنفصل ١٢٧ جێناوی کەسیی جودا Personal pronoun

- الضمير العاكس ١٤٥ جێناوی هەیی Relative pronoun

- ضمير الكمي ١٣٦ جێناوی چەندێتی Quantitative pronoun

- الضمير المتبادل ١٤٥ جێناوی هاوبەشی Peciprocal pronoun

- ضمير مستتر ١٤٣ جێناوی نادیار Indefinite (hidden) pronoun

- ضمير الملكية ١٣٦ جێناوی خۆیی Possessive pronoun

- ضمير النفي ١٤٣ جێناوی نەفی Negative pronoun

- ضمير الوصل ١٤٢ جێناوی لێکدەر Conjunctive pronoun

## - ط -

الطاقة ٣٩٢ وزە Energy

| | | |
|---|---|---|
| ـ الطاقة العقلية ٢٩٢. | وزەی هۆشەکی | Mental energy |
| الطريقة ٢٠٠ | ڕێباز | Method |
| الطلب / حالة التمني ١٥٦ | داخوازی | Subjunctive |
| طور ١٦٨ | دیو | Phase |
| الطول ١٦١ | درێژی | Length |
| طيف ٢٥٩ | شەبەنگ | Spectrum |
| طيف الصوت ٢٥٩ | شەبەنگی دەنگ | Sound spectr |

ـ ظ ـ

| | | |
|---|---|---|
| ظاهرة ١٦٥ | دیاردە | Possession |
| الظرف ١٧ | ئاوەڵکردار | Adverb |
| ـ الظرف الاسمي ٣٢ | ئاوەڵکرداری ناوی | Noun adverb |

- الظرف البسيط ٢٧ ئاوەڵکرداری سادە Simple adverb

- الظرف التكراري ٢٦ ئاوەڵکرداری دووبارەکردنەوە
Recursiveness adverb

- الظرف التوكيدي ١٩ ئاوەڵکرداری تەئکیدی Affirmative adverb

- ظرف الزمان ٣٠ ئاوەڵکرداری کات Adverb of time

- ظرف السببي والمقصود ٣٤ ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست
Adverb of circumstance

- الظرف شبه الجملة ٢٤ ئاوەڵکرداری دەستەواژەیی Cyntactic adverb

- الظرف الشكلي او كيفية التحقق ٢٨
ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێبەجێبوون Adverb of manner

- الظرف الضميري ٢٠ ئاوەڵکرداری جێناوی Pronominal adverb

- الظرف العددي ٢٦ ئاوەڵکرداری ژمارەیی
Numeral (number) adverb

- الظرف الفعلي ٣١ ئاوەڵکرداری کرداری Deverbative adverb

- ظرف الكمية ٢٠ ئاوەڵکرداری چەندێتی Qualitative adverb

- ظرف الكيفية ٢٢ ئاوەڵکرداری چۆنێتی Quantitative adverb

| | | |
|---|---|---|
| ـ الظروف المركبة ٣٢ | ئاوەڵكردارى لێكدراو | Compound adverb |
| ـ ظرف المكان ٢٧ | ئاوەڵكردارى شوێن | Adverb of place |
| ـ الظرف النفي ٣٣ | ئاوەڵكردارى نەفى | Negative adverb |
| ـ الظرف الوصفي ١٩ | ئاوەڵكردارى ئاوەڵناوى | Adverb adjective |
| ـ الظروف المشتقة ٢٣ | ئاوەڵكردارى دارێژراو | Derivational adverb |

الظن

انظر : الشك

| | | |
|---|---|---|
| ظهور الصوت ٨٢ | پەیدابوونی دەنگ | Appearance the sound |

ـ ع ـ

| | | |
|---|---|---|
| العارض ٢٠٠ | ڕووكەش | Sham |
| عارف بلغات متعددة ٢٣٦ | زمانزان | Polyglot , Multilingual |
| عالم اللغة ، لغوي ٢٣٦ | زماننـاس ، زمانەوان | Linguist |

| | | |
|---|---|---|
| العام ٣٢٨ | گشتی | Universality |
| العبارة (العقدة) ٢٦٣ | فرێز | Phrase |
| ـ العبارة الاسمية ٢٦٨ | فرێزی ناوی | Noun phrase |
| ـ العبارة الظرفية ٢٦٦ | فرێزی ئاوەڵکرداری | Adverbial phrase |
| ـ العبارة الفعلية ٢٦٧ | فرێزی کرداری ، فرێزی کاری | Verb phrase |
| ـ العبارة الوصفية ٢٦٧ | فرێزی ئاوەڵناوی | Adjective phrase |
| ـ العبارة الاصلاحية<br>انظر : الكناية | | |
| العدد ٢٤٥ | ژمارە | Numeral |
| ـ العدد الاصلي ٢٤٧ | ژمارەی بنجی | Radical number |
| ـ العدد البسيط ٢٥٢ | ژمارەی سادە | Simple numeral |
| ـ العدد الرتبوي ٢٤٨ | ژمارەی پلەیی | Ordinal number (numeral) |
| ـ العدد الكسري ٢٥٢ | ژمارەی کەرتی | Fraction numeral |
| ـ العدد المركب ٢٥٥ | ژمارەی لێکدراو | Compound numeral |

| | | |
|---|---|---|
| ـ العدد المشتق ٢٥٢ | ژمارەی داڕێژراو | Derivtional numeral |
| العضلة ٣٢٧ | ماسوولکە | Muscle |
| العضو ٦٣ | ئەندام | Organ |

ـ عضو الوحدة الصرفية

انظر : الالومورف

ـ عضو الوحدة الصوتية

انظر : الألفون

العبارة

انظر : العبارة

العقل

انظر : الذهن

العقلي

انظر : الذهني

العوائق

انظر : الحواجز

| | | |
|---|---|---|
| العقيدة ، الاعتقاد ٧٥ | بڕوا | Belief |
| العكس ١٠٣ | پێچەوانە | Invers , Contray |

